## ناوەڕۆك

## پێشەکی:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الْحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بالله مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَـٰأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢].

﴿يَـٰأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ [النساء: ١].

﴿يَـٰأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١].

أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ الله، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّد صلى الله عليه وآله وسلم، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارْ، اللهم طهر قلوبنا من الشبهات والشهوات وأعمالنا من الرياء يا رب العالمين.

خۆشحاڵ و بەختەوەرین کە دەست دەکەین بە شەرح وڕاڤەی مەتنێک لە مەتنەکانی عەقیدە و بیروبڕوا، هی زانا و دانایەکی بەڕێزی جێگای متمانە کە ابن تیمیەیە -رحمە اللە- کە مەتن و پەرتوکەکە بەناوی (العقيدة الواسطية)یە، بە پشتیوانی اللە تعالی ڕاڤەیەکی پوخت و جوانی دەکەین بەگوێرەی ڕێڕەوی ئەهلی سونە و جەماعە، ئەو بۆچونانەی کە ابن تیمیة -رحمە اللە- هەیبوە کە ئیقتیدای کردوە بە پێشینانی چاک و ئەوانیش بە دڵنیاییەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) و لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و لە تابیعی و لە تابیعی تابیعی وەریانگرتوە هەتا گەیشتوەتە دەستی ئێمە.

## هۆكاری ناونانی ئەو پەرتوكە بە (العقيدة الواسطية):

(العقيدة) وەرگیراوە لە (العقد)، عەقدیش بۆ نمونە هەندێک جار بە واتای (عقد الحبل) دێ واتە لێک گرێدان و بەستنەوەی پەت، (وسميت بذلك لأنها مما يجب أن يعقد عليه القلب) جا عەقیدە چ پەیوەندیەکی بە گرێوە هەیە (گرێ لە پەت بدرێ)؟ ئەوە بۆچی ئەو ناوەی لێ وەرگیراوە و کراوەتە باسی بیروبڕوا؟ دەڵێن لەبەر ئەوەیە زانایان چونکە ئەو بیروبڕوا و بابەتانەی ئیمان لەوانەیە کە واجبە و پێویستە گرێی لێ بدرێ و دڵی پێوە ببەسترێتەوە و لەناو دڵدا ببەسترێتەوە و گرێ بدرێ و بمێنێتەوە لەو پێناوەدا ئەو ناوەی بە خۆیوە هەڵگرتوە و لە باس و خواسی ئیمان و بیروبڕوا پێی دەگوترێ (العقيدة).

لەبەرچی ناوی لێنرا (الواسطية)؟ کە ئەو بۆچونە زەعیفە بۆچونی یەکەم لەسەر ئەوە دەڵێن لەبەر ئەوەیە چونکە عەقیدە و بڕوایەکی وەسەتە و نێوەندی گرتوە وەکو خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً﴾ [البقرة: ١٤٣] واتە ئێوەم کردۆتە ئومەتێکی نێوەند و ناوەڕاست لەناو ئومەتەکانی تر، عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەش نێوەند و ناوەڕاستە لەنێوان هەموو تاقم و کۆمەڵەکانی تر هەر ئەو عەقیدەیە کە الله تعالى پێی ڕازیە کە پێغەمبەر لەسەری بوە (ﷺ) هاوەڵان لە پێغەمبەریان (ﷺ) وە -رضي الله عنهم- وەرگرتوە.

بۆچوونی دووەم کە ئەوەیان زیاتر باسی کراوە و زۆربەی هەرە زۆری زانایان هەر ئەوە دەڵێنەوە و ئەوەشیان لە ابن تيمية بیستوە و گێڕاوەتەوە کە بۆخۆشی فەرمویەتی، ئەویش ئەوە بوە پیاوێک هەبوە بە ناوی رضي الدين الواسطي کە یەکێک بوە لە هاوەڵانی ڕێڕەو و مەزهەبی ئیمامی شافعی -رحمهم الله-، دەڵێ هاتوە بۆ حەجی ماڵی الله تعالى ابن تيميةی بینیوە و داوای لێکردوە بە پێداگرتنەوە کە عەقیدەیەکی بۆ بنوسێتەوە کە هی ئەهلی سونە و جەماعە بێ چونکە عەقیدە ئەوکات کێشە و گیروگرفتی زۆری کەوتبوە سەر وە ئەوەی بەربڵاو بوو لەنێو ئومەتی ئیسلام و موسڵمانان دیارە جگە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و

جەماعە بوو کەمێکی کەم مابونەوە لە زانایان و پەیڕەوانی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە و پێشینانی چاک هەر کەسە خڵت و کێشە و گیر و گرفتی وەگەڵ عەقیدە هاتبوە پێش لەو بوارەدا، ابن تیمیةش پێی دەفەرموێ تۆ بڕۆ عەقیدە و بیروبڕوای یەک لەو پەرتوکانە هەڵبژێرە کە پێشینانی چاک باسیان لێکردوە و پێویست ناکات من بۆت بنوسمەوە بەڵام دیارە ئەو پێداگری دەکات ئەو پێداگریەی وا دەکات ابن تیمیة لەدوای نوێژی عەسر دەست بکات بە نوسینەوەی ئەو مەتنی (العقیدة الواسطیة) کە بە لەبەرەوە نوسیەوە و (والله أعلم) تا نوێژی مەغریب لە یەک داتیشتندا کۆتایی پێ دەهێنێ و هەموی تەواو دەکا، کە بە دەیەها ڕاڤەی کراوە ئینجا خەڵک ئاسان لێی تێدەگا و حاڵی دەبێ هەموو عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە هێناویەتیەوە زیاتر بایەخی بە لایەنی ئەسماء و سیفات داوە چونکە ئەوکاتە کێشە و گیروگرفت لەسەر ئەوە زۆر بوە الله پاداشتی بداتەوە و هەموی بۆ ببێتە سەدەقە و خێر و چاکە و بۆی بچێت بە بەردەوامی.

ئەم پیاوە خەڵکی (واسط) بوە (واسط) شارێکە لە عێراق دیارە ئەو شارە کاتی خۆی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی دروستی کردوە کە دەکەوێتە نێوان بەغدا و بەسڕای شارەکانی عێراق، لە ساڵی هەشتا و چواری کۆچی بنیاتی نا لە ساڵی هەشتا و شەشی کۆچی کۆتایی پێ هێنا و تەواو بوو لەبەر ئەوەش ئەو ناوەی لێنرا چونکە کەوتە ناوەڕاستی سێ شاری عێراق کوفە و وە لە پاشان بەغدا و بەسرا لەو ناوەڕاستە بون کە بە ئەندازەی یەکتر لەو ناوەڕاستە لە شارەکان دورە مەسافا و نێوانەکانی[١].

## ئەهلی سونە و جەماعە کێن:

هەرچی ڕاست دەبێتەوە و بەسەر زمانیدا دێ دەڵێ من ئەهلی سونە و جەماعەم بەڵام بەڕاستی ئەگەر شی بکەینەوە ئەهل بە مەعنای خاوەن و ساحێب دێ، سونەش بە مەعنای ڕێباز و تەریقەت و ڕێگا دێ، جەماعەش بە مەعنای کۆمەڵ دێ.

[١] **ئەو باس و خواسە لە** (**البدایة والنهایة، ابن کثیر**) (**ج: ٩، ص: ٥١**) **باسی لێکراوە، لە** (**معجم ما استعجم**) (**ج: ٤، ص: ١٣٦٣**) **بە هەمان شێوە باس کراوە، لە** (**معجم البلدان**) (**ج: ٥، ص: ٣٤٨**).

کەواتە ئەهلی سونە بەو مانایە دێ شوێنکەوتەی ڕێبازی پێغەمبەر بونە (ﷺ) خاوەنی ئەو ڕێبازەن و دەستیان پێوە گرتوە وە جەماعەش (المجتمعون عليها) دێ واتە ئەوانەی دەوریان داوە لەو ڕێبازە کە ڕێبازی پێغەمبەرە (ﷺ) لەسەر حەق ورەوان ئەو عەقیدە و بیروبڕوایەیان هەیە و پەیڕوییان لێ کردوە و دەکەن کە هی پێغەمبەر بوە (ﷺ) هی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر بوە (ﷺ) وە پێشینانی چاک بوە کە تەبیعی و تابیعی تابیعیش دەگرێتەوە.

**(العقيدة الواسطية) بابەتەکانی کورت هەڵدێ لەم خاڵانەدا:**

یەکەم سەبارەت بە ناسینی الله تعالى -جل شئنه- وە بنەماکانی ئیمانی باسکردوە و لە یەکەم دەستی پێکردوە ڕوکنەکان و کۆڵەکەکانی ئیمان کە شەشن یەکەمیان (الإيمان بالله) لەسەری دواوە و دەدوێ و وە باس و خواسێکی تەواوی ئەهلی سونە و جەماعەی لەسەر دەهێنێتەوە بە بەڵگەکانی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر و (ﷺ) وە بە بۆچونە ڕاست و دروستەکان ابن تيمية دەربارەی الله ناسی و جێگیر کردنی ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالى و سیفاتە بەرزەکانی لە قورئان و وە لە فەرمودەی سەحیحی پێغەمبەردا (ﷺ)، وە باسی بنەمای دوەمی کردوە بیروبڕوابون بە مەلائیکەت و فریشتەکان لە کۆڵەکەکانی ئیمان، وە باسی کۆڵەکەی سێیەمی کردوە ئەویش بیروبڕوابون بە پەرتوکە ئاسمانیەکان، وە هی چوارەمیش بڕوابون بە پێغەمبەران و ڕەوانە کراوان (عليهم الصلاة والسلام)، وە پێنجەمیشیان بڕوابون بە ڕۆژی دوایی لە مردنەوە باسی لێوە کردوە تا قیامەت و مەیدانی حەشر و حیساب و ئەو دیمانەی لەوێشدا ڕوودەدەن ئەو خاڵانەی پەیوەند و پەیوەستیشن بەو بابەتە، وە لە پاشان باسی قەدەری اللەی کردوە بە خێر و شەڕەکەیەوە وە ئیرادەی خوای رب العالمين بە ئیرادە کەونیەکە و وە ئیرادە شەرعیەکەیەوە.

خاڵی دوەم لە (العقيدة الواسطية) کە باسی کردوە و بابەتێکە تێیدا، باسی ئیمامەتی و وە سەرکردایەتی و گەورایەتی و خەلیفایەتی موسڵمانانی کردوە، کە چۆن خەلیفەی

موسڵمانان ئیمانی موسوڵمانان دەبێ کێ بێ؟ و وە لە بواری سەمع و تاعە بۆ هەبونی دەبێ لە چ ئاستێک بێ؟ و سیفەتەکانی بە کورتی باسی کردوە لە دیدگای بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعە و ڕێڕەوی ئەهلی سونە و جەماعەوە.

وە لە پاشان باسی فەرمان بە چاکە و ڕێگری و نەهی لە خراپە و مونکەر وە قسە و باسیشی کردوە دەربارەی قسەی سەحابەکان لەو بوارەدا کە باسیان هەبوە و باسیان لێوە کردوە لە کۆتایەکەشیدا ابن تیمیة لە (العقيدة الواسطية) دیارە باسی ڕەوشت و ئەخلاقی ئەهلی سونە و جەماعەی کردوە.

عەقیدەی کورت ئەهلی سونە و جەماعەی هەڵهێناوە لەو سێ خاڵەدا کە باسمان کرد.

لە کۆتایشدا باسی ڕەوشتی ئەهلی سونە و جەماعەی کردوە.

## گرنگی خوێندنەوەی پەرتوکەکانی ابن تیمیة -رحمه الله-:

پەرتوکەکانی ابن تیمیة وە نوسراوەکانی زۆر گرنگن بایەخی پێبدەین و تایبەتمەندی خۆی هەیە جیاواز لە پەرتوکی زانایەکانی تر بۆ سەردەمی ئێمەی ئێستاش زۆر سود و کەڵکی لێ وەردەگرین ئەگەر بایەخی تەواوی پێبدەین.

یەکەمیان لەبەر ئەوەی ابن تیمیة -رحمه الله- کەسێک بوە بە تەواوەتی تێگەشتوو بوە لە بیروبڕوای ئەو زانایانەی پێشینی خۆی کە هاتونە و لەسەر ڕێڕەوی ئەهلی سونە و جەماعە بونە، هەمویان حاڵی بوە و تێگەشتوە و دایڕشتوەتەوە بە داڕشتنەوەیەکی زۆر جوان قسە و گوتنەکانیان وە بەڵگەکانیان وە مانا و واتاکانیان بە ئاسانتر ئێمە تێیدەگەین لەوەی کە بگەڕێین لە پەرتوکە جیاواز جیاوازەکانی ئەو زانا بەڕێزانە و هەتا باس و خواسەکان دەبینینەوە و لێی تێدەگەین.

وە تایبەتمەندی دوەمی پەرتوک و نوسراوەکانی ابن تیمیة لەوەدایە کە جێگای خۆیەتی زۆر بایەخی پێبدرێ و بخوێندرێنەوە -رحمه الله- ئەویش ئەوەیە ئەو زۆر بە چاکی و لەوپەڕی تێگەیشتن تێگەیشتوو بوە لە دەقەکانی قورئان و سونەی پێغەمبەر (ﷺ)، کە

هەر هەموو ئەوانەی ئینسافیان هەبوە لەسەردەمی خۆی و ناسیویانە ئەوانەی لەدوای خۆیشی ئەو بڕیارەیان داوە و ئەو شاهێدیەیان داوە و ئەو ڕاستیەیان بۆ ابن تيمية جێگیر کردوە.

جا لە پاشان ابن تيمية کاتێ کە نوسراوەکانی نوسیوە یان فتواکانی داوە و قسەکانی لێ گێڕدراوەیە کەسێک بوە هەر لە خۆڕا قسەی لەسەر بەرامبەرەکانی نەکردوە، هەر لە خۆڕا باسی تاقم و کۆمەڵەکانی دژ بە ئەهلی سونە و جەماعەی نەکردوە قسەکانی ئەوان لە پەرتوکە دیار و جێگای متمانە بوە لەلای فیرقەکان لەوانەوە خوێندویەتیەوە و تێگەیشتوە و وەریگرتوە ئینجا لە پاشان هاتوە شیکردوەتەوە و نوسیویەتیەوە و فتوای لەسەر دەرکردوە.

کەواتە لە پەرتوکەکانی ابن تيمية تۆ ڕاستەوخۆ بە ڕێیەکی ڕاست و دروت بەبێ ماندوبونێکی زۆر تێدەگەی لە عەقیدە و خاڵەکانی تاقم و کۆمەڵەکانی تری جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە ئاسانتر بەسەریان ڕادەگەی بەبێ ئەوەی سەرت لێ بشێوێ و ڕاستیەکان دەدۆزیتەوە.

لە پاشان لە پەرتوکەکانی ابن تيمية سودێکی تر کە تایبەتمەندیەکە لە تایبەتمەندیەکانی نوسراو و پەرتوکەکانی ابن تيمية ئەویش ئەوەیە هەندێک لە خاڵەکانی کە موجمەلن زۆر کورت و پوختن پێویستیان بە شەرح و ڕاڤەی تەواو هەیە تێگەیشتنی تەواو هەیە هەستاوە ابن تيمية لەو خاڵ و بنەمایانەی ئەهلی سونە و جەماعە هی پێشینانی چاک هێناوێتی موجمەلەکان کورتە پوختەکانی درێژ کردوەتەوە و ڕونیکردوەتەوە و زیاد لەسەری ڕۆیشتوە و ڕونکردنەوەی چاکی لەسەر داوە وە لە پاشان نمونەی زۆریشی بۆ هێناوەتەوە. لەوەوە دەردەکەوێ کە ابن تيمية زانایەکی فرە زانا بوە وە زۆر تێگەیشتوو بوە ئاستی بەرز بوە لە ئاستی عیلمیەوە، لەبەر ئەوە پێویستە پەرتوکەکانی ابن تيمية بایەخی تەواوی پێبدرێ لەلایەن قوتابیانی زانستە شەرعیەکان ئەو کاتە حاڵی دەبن و تێی دەگەن، هەر

لەخۆیەوە و لە پەرتوكەكانیشیەوە ابن تيمية دەناسن ئینسافیان بۆ دروست دەبێ هەر لە خۆڕا قسەی لەسەر ناكەن.

## گفتوگۆی نێوان ابن تيمية و هەندێك لە زاناكانی سەردمی خۆی:

لە پاشان ابن تيمية لەسەر (العقيدة الواسطية) توشی كێشە و گیروگرفتی زۆر بوە، یەكێك لە گفتوگۆكانی ابن تيمية لەگەڵ زانا و خەڵكانێكی سەردەمی خۆی كە لەسەر (العقيدة الواسطية) بۆیان دروستكردوە نوسراوەیە تۆماركراوە، لەوانە شێخ علوم الدين دەفەرموێ ابن تيمية لە كۆڕی سەڵتەنەی ئەفرەم دەربارەی عەقیدە باسی لەگەڵ كرایەوە و پرسیاری لێكرا و ڕاكێشرایە ئەو مەجلیسە، ئەوەبوو كە ماوەیەك بوو ابن تيمية ئەو عەقیدەی نووسیبووەوە و لەسەری بڵاوكرایەوە كە ابن تيمية (پەنا بە خوای رب العالمين) گومڕاكراوە، ابن تيمية دیارە لەو گفتوگۆیەدا لە كۆتاییەكەیدا بە هەرهەمویان دەسەلمێنێ كە ناتوانن ڕەخنەی لێبگرن وە مۆڵەتی سێ ساڵان دەداتە هەر هەمویان، دەڵێ لەپاش ئەو سێ ساڵەش ئامادەم ئێوە لە ماوەی ئەو سێ ساڵە یان لە پاشتریش یەك خاڵ و بڕگە و گوتەی ناو (العقيدة الواسطية) لێم بگرن بە ڕەخنە و بڵێن تێك ناكاتەوە لەگەڵ عەقیدە و بیروبڕوای پێغەمبەر (ﷺ) و سەحابەكان -رضي الله عنهم- وە لەگەڵ پێشینانی چاك.

دیارە لە كۆتایدا هیچێك لە زاناكان نەیانتوانی ڕەخنەیەكی وا بێننەوە و بیگرن لەسەر ابن تيمية، لەبەر ئەوە ابن تيمية سەركەوتوو بوو لەو گفتوگۆیانە، وە زۆربەی هەرە زۆری جارەكان ئەگەر مێژوو بخوێنینەوە دەردەكەوێ ابن تيمية بە ئەدەبێكی زۆر جوانەوە بە پابەندبون بە بنەما شەرعیەكان و لە چوارچێوەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەوە زۆر بەڕێز و ئەدەب و عیلمیانەوە گفتوگۆكانی ئەنجام داوە و كردویەتی، وە لە كۆتایەكەشدا قسەی هەر هەموانی بڕیوە و كەسیان نەیانتوانیوە بە تەواوەتی ابن تيمية چۆك پێدا بدەن لە عیلم و زانستیەكەیەوە وە ابن تيمية بەسەریاندا سەركەوتوبوە.

## کورتە پوختێك دەربارەی ابن تیمیة:

ابن تیمیة -رحمه الله- ئەو زانا بەرێزەیە کە خاوەنی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە، ئەو پیاوە بەرێزەیە بەناوی أَبُو الْعَبَّاسِ أَحْمَدُ بن عَبْدِ الْحَلِيمِ بن عَبْدِ السَّلَامِ الْحَرَّانِيُّ، کە نازناوەکەشی بەناوی (تَقِيُّ الدِّينِ)ە و (شيخ الإسلام)یشی پێ گوتراوە وە بە کرداریش (شيخ الإسلام)یش بوە، بەو مانایەی زۆر زانا بوە و فتوای لێ وەرگیراوە و لە هەموو بوارەکان شارەزا بوە، وە کە پێی دەگوترێ (ابن تیمیة) لەبەر ئەوەیە دەڵێن دایکی باپیری کە باپیری ناوی موحەمەد بوە ناوی (تیمیة) بوە، ئافرەتێکی زۆر الله ناس بوە وە ئاستی هەبوە و وتاربێژ بوە و ئامۆژگاری خەڵکەکانی کردوە، ابن تیمیة لە حران لە ساڵی شەش سەد و شەست و یەکی کۆچی لە مانگی (ربیع الأول) لەدایک دەبێ، لە پاشان هێواش هێواش پێدەگا و ئەو پیاوە بەرێزەیە کە زانایان زۆر زۆر لەسەریان نوسیوە بە ئینسافەوە ئەوانەی لێی نزیک بونە و لەگەڵی ژیاون و بینیویانە، لەوانە ئیمامی زەهەبی زۆر بە باشە باسی دەکات کە یەکێک بوە لە قوتابیەکانی ابن تیمیەش، وە ئیمامی بەزار لەگەڵی ژیاوە و لەو سەردەمە بوە، ئەوانە زۆر بە رێک و پێکی باسی ابن تیمیة دەکات، ئینجا ابن تیمیة دیارەلە مانگی (ذُو القَعْدَة) لە ساڵی حەوت سەد و بیست و هەشتی کۆچی وەفات دەکات. ئەو پیاوە بەرێزە لە ژیانیدا زۆرجار زیندانیکراوە وە شکایەتی لێکراوە ئەزیەتدراوە بانگ کراوە دەرسی پێ بڕدراوە و وای لێهاتوە کە نەهێڵن دەرس بڵێتەوە، ئەوەبوو ئەو پیاوە بەرێزە لە ساڵی حەوت سەد و بیست و هەشت لە (جمادی الآخرة) جارێکی تر بڕیاری گرتنی درا، ئەو پیاوە بەرێزە لە سجن و زیندانەکەیدا عیبادەتی اللهی دەکرد زۆر قورئانی دەخوێندەوە، دەڵێن لەو جارەی کۆتایدا کە لە زیندان بوو کە کۆتا ژیانی بوو ابن تیمیة هەشتا جار قورئانی خەتم کرد -رحمه الله- گەیشتە سەر ئەو ئایەتە و لێی دەگێڕنەوە لەسەر ئەو ئایەتە وەفاتی کرد لە جاری هەشتایەمینی قورئان بوو کە الله تعالی فەرمویەتی: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ * فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ﴾ [القمر: ٥٤-٥٥] لەسەر ئەو

ئایەتە گیانی دەرچوو و ئەجەلی هات و گەڕایەوە لای الله، الله تعالی لەوانی حیساب كردبێ مەگەر ئەوەش ئەگەر هەر شتێک بێ لە خێر و چاكە نیشانەی كۆتا خێری ابن تیمیەیە -رحمه الله- كە لەسەر قورئان خوێندن و وە لەسەر ئەو ئایەتەش كە الله دەفەرموێ بەڕاستی موتەقی و لە الله ترسەكان لە بەهەشتەكان و ناز و نیعمەتەكاندان لەنێو ڕووبارەكاندان وە لە پلەی بەرزی ڕاستگۆییدان لەلای پادشا و دەسەڵاتدار و خاوەنێكی زۆر بە دەسەڵات كە الله تعالی یە -جل شئنه-.

ابن تیمیة -رحمه الله- زۆر بە باشی ناوی دەخوێندرێ لەوانە ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ: (نشأ في تصوّن تام) دەفەرموێ ابن تیمیة لە ڕێک و پێكی و تەواویەكی تەواو نەشونمای كردبوو خۆپارێز بوو (وعفاف، وتألُّه، وتعبد) بەڕاستی زۆر زمان پارێز بوو داوێن پارێز بوو لە گوناح و تاوانەكان وە تەواو اللەی ناسیبوو عیبادەت و پەرستشی اللەی دەكرد (واقتصاد في الملبس والمأكل) بەڕاستی خۆگربوو لە شمەک و جل و بەرگدا لە خواردنەوە خواردندا زاهید بوو دونیا نەویست بوو (وكان يحضر المدارس، والمحافل في صغره) دەفەرموێ بەشداریدەكرد لە قوتابخانەكان لە شوێنی كۆبونەوەی زانا و قوتابیانی شەرعی لە منداڵیەوە (ويناظر، ويفحم الكبار) دەفەرموێ هەندێک جار گفتوگۆی هەبوو چۆكی دادەدا بە زانا گەورەكانیش لە موناقەشە لە بچوكایەتیەوە دەیتوانی بدوێ لەگەڵیان لە سنوری شەرعی و وە لە چوارچێوەی ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەكاندا (ويأتي بما يتحير منه أعيان البلد في العلم[١]) هەندێک جار هەبوو شتی وایدەگوت و بەسەر زمانیدا دەهات و تێدەگەیشت لە عیلم و زانستی كە زۆر زانا دیارە یەكە یەكەكانی ئەو وڵاتە فكریان بۆ نەدەچوو یان بۆیان نەدەهات.

وە لە پاشان ئیمامی بەزار دەربارەی خاكیەتی ابن تیمیة دەفەرموێ: (وأمّا تواضعه؛ فما رأيتُ ولا سمعتُ بأحدٍ من أهل عصره مثله في ذلك) دەڵێ دونیا نەویستی و خۆبەكەم گرتن و

[١] العقود الدرية ، ص: ٤-٥.

خاكيايەتی ابن تيمية دەڵێ هيچ كەسم نەبينيبوو ئيمامی بەزار دەفەرموێ وە نەشم بيستبوو لە هيچ كەسێک لەسەردەمی ئەو نمونەی ئەو هەبێ وە نەشبوە (كان يتواضع للكبير والصغير) خۆی بەكەم دەگرت بەرامبەر خەڵكی گەورە و بەتەمەن بەرامبەر خەڵكی منداڵ و بچوک (والجليل والحقير) بەرامبەر خەڵكی شكۆدار و پلە بەرز وە خەڵكی هيچ و بێ ئاست (والغني الصالح والفقير) وە دەوڵەمەندی پياوچاک و فەقير و هەژاری پياوچاک (وكان يُدْني الفقيرَ الصالح ويُكرمُه ويؤنسه ويُباسطه بحديثه[1]) خەڵكە فەقيرە هەژارە چاكەكانی لەخۆی نزيک دەخستەوە دڵی دەدانەوە ئارامگری دەكردن وە قسەی زۆر لەگەڵ دەكردن ووە لە پاشانەكە ڕێزی لێدەنان.

لە كۆتايی ژيانی ابن تيمية هەر ئەوەندە دەڵێين كە ئيمامی بەزار دەفەرموێ زۆر جێگای سەرسوڕمان بوو لە ژيانی ابن تيمية كە چەند زانا بوە ئەوە دەری دەخا ئەو خاڵە كە (ومن أعجب الأشياء في ذلك: أنه في محنته الأولى بمصر لمّا أُخِذَ وسُجن) لە يەكەم جار لە ميسر لە ميحنەت و لە بەڵا بەسەريهات لە يەكەم جارەكەيدا لە ميسر ابن تيمية كە زيندانيكرا (وحيل بينه وبين كتبه) وە پەردە خسترايە نێوان ئەو و پەرتوكەكانی نەدەهێشترا هيچ پەرتوكێک و نوسراوێكی بەدەست بگا ئينجا (صنف عدّة كتب صغارًا وكبارًا) جا لەناو زينداندا بەبێ ئەوەی هيچ سەرچاوەيەكی لەبەر دەستبێ هەر لەبەری خۆی چەندين پەرتوک و نامەی نوسيوە هی گەورە و بچوک (وذكر فيها ما احتاج إلى ذكره من الأحاديث والآثار) جا هەر بەلەبەرەوە بەڵگەكانی لە فەرمودەكانی پێغەمبەر و (ﷺ) لە ئەثەرەكان دەهێنايەوە بەبێ ئەوەی هەڵەی تێدا بكا هەموشيان ڕاست بون لەگەڵ پەرتوكەكان (وأقوال العلماء وأسماء المحدِّثين والمؤلفين) وە لەگەڵ ئەوە لە پەرتوكەكانيدا ناوی زاناكانيشی هێناوەتەوە و بۆچونەكانيشيان وە ناوی فەرمودە ناسەكان و دانەری پەرتوكەكانيش بەبێ ئەوەی هەڵە بكا (وعزا كلَّ شيء من ذلك إلى ناقليه) جا هەريەک لە وتەكانيشی پاڵدەدا و

[1] كتاب الأعلام العلية في مناقب ابن تيمية - ط عطاءات العلم، [أبو حفص البزار] ص: ٧٦٨.

بەرزی دەکردەوە بۆ ئەو کەسێک کە گێڕاویەتیەوە لەو زانا و لەو کەسە بەبێ ئەوەی هەڵەی لێبکا (كلُّ ذلك بديهة من حفظه[١]) هەموو ئەوانە لەبەری خۆیەوە بەبێ ئەوەی کە پەرتوک و سەرچاوەیەکی لەبەردەستدابێت.

ڕەحمەتی الله لەو زانا بەرز و بەڕێزە الله پاداشتی دابێتەوە هی ئەو ئەو هەموو پەرتوک و نوسراوەی وە ڕونکردنەوەی ڕێڕەوی ئەهلی سونە و جەماعە کە یەکێک بوو لە سەدەکانی خۆیدا و لە چاخی خۆیدا توانی کە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە جارێکی تر زیندو بکاتەوە وە گەشەی پێبدا و بڵاوی بکاتەوە چاونەترسانە بوێرانە، وە ابن تيمية کەسێکیش بوو لە مەیدانی جەنگ و جیهاد و عەمەلیشدا بەشداری دەیەها جەنگ و جیهادی کردوە و ڕوداوی کردوە و بە تایبەت لە دژی تەتەر و مەغۆلەکان لە شام هەندێک جار هەبوە هەر خۆی سەرکردە بوە فتوا دەر بوە وە لە مەیدانی جیهاد دا شەڕیشی کردوە و بە دەیەها و سەدەها و هەزارەها گەنجی موسڵمانی موجاهید لە دەوروبەری بونە، الله پاداشتی هەموو کردەوەکانی دابێتەوە هی هەموو عیلم و زانستی و بڵاو کردنەوەکانی وە لە هەموو گوناح و تاوانەکانی ئەو و تێکڕای زانایانی ڕابردوی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوانەی وەفاتیان کردوە لێیان خۆش بوبێ وە ئێمەش وا لێبکا الله تعالى کار ئاسانیمان بۆ بکا کە هیدایەت و ڕێنموێنیمان ببێ ئیقتیدا بکەین بەو زانا بەرز و بەڕێزانەوە کە ئەوانیش ئیقتیدایان کردبوو بە پێغەمبەر و (ﷺ) وە بە پێشینانی چاک.

## شەرح و ڕاڤەی زانایان بۆ (العقيدة الواسطية):

دیارە (الواسطية) شەرح و ڕاڤەی یەکجار زۆری هەیە کە زانایان باسیان لێوەکردوە، لەوانە: (شێخ عبد الرحمن بن ناصر السعدي شەرح و ڕاڤەیەکی کورتی پوختی لەسەر هەیە، وە شێخ عبدالعزیز محمد السلمان شەرحێکی دور و درێژی لەسەر هەبوە دوایە کورت کردوەتەوە کردویەتیە پرسیار و وەڵام لەسەر (الواسطية)، وە شێخ محمد خليل هراس شەرح

[١]كتاب الأعلام العلية في مناقب ابن تيمية - ط عطاءات العلم، [أبو حفص البزار] ص: ٧٤٥.

و ڕاڤەیەكی لەسەر هەیە، وە شێخ محمد بن صالح العثيمين، وە شێخ عبد العزيز بن باز، وە شێخ صالح فوزان بن عبد الله الفوزان، وە لە پاشان شێخ عبد الله كوڕی جبرين لەسەری هەیە بەناوی (التعليقات الزكية على العقيدة الواسطية)، وە لە پاشان صالح بن عبدالعزيز بن محمد بن إبراهيم آل الشيخ لەسەری هەیە بەناوی (اللالئ البهية في شرح العقيدة الواسطية...) وە شەرح و ڕاڤەی زانایانی تری زۆریشی لەسەر هەیە بە كورتی و پوختی هەر ئەوانەمان گوت ئێمە.

جا لە پاشان با بزانین محمد خليل هراس چۆن شەرحەكەی لەسەر دانا و ابن تيميةی خۆشویست، دیارە محمد خليل هراس لە پێشتردا وانەبوە كەسێكی خاوەن عەقیدە و بیروبڕوای ئەشعەری بوە، وە لە پاشان وە یەكێك بوە لەو مامۆستا بەڕێزە جێ متمانانەی ئەزهەر ئەوكات داوایان لێكراوە كە بۆخۆی دەگێڕێتەوە كە شێخ جامی یەكێك بوە لە قوتابیەكانی هەڕاس دەگێڕێتەوە و دەڵێ مامۆستاكەم هەواڵی بە ئێمەدا، فەرموی من مامۆستایەك و وانەبێژێكی پلەداری خاوەن زانستییەكی زۆر بوم لە فەلسەفە و مەنتیقدا لە جامیعەی ئەزهەر، زانایان و ئەو خەڵكانەی كە كەیفیان بە ابن تيمية نەدەهات بۆیان پێشنیار كردوە كە وەڵامی ابن تيمية بنوسێ و بداتەوە ڕەخنەی لێ بگرێ، كە ابن تيمية خەڵكی وایاندەزانی و وایان دەگوت كە دوژمنی فەلسەفەیە، جا هەڕاس دەڵێ هەستام و پەرتوكەكانی ابن تيميةم كۆكردەوە هەتا تەواو لێیان حاڵیبم و بیانخوێنمەوە و توانای ئەوە بە دەست بێنم وەڵام و ڕەدی لەسەر بنوسم، ئینجا هەڕاس دەفەرموێ لەپاش ئەوەی پەرتوكەكانی ابن تيميةم تەواو خوێندەوە و تێیگەیشتم لەجیاتی دژایەتی بكەم چاك چاك تێگەیشتم زانستیم پەیدا بوو كە من تا ئێستا ئیسلامم بەگوێرەی ڕاستی و حەقیقەتی خۆی نەناسیوە لە پەرتوكەكانی ابن تيميةوە زانیم ئیسلام چیە، لە پاشانەكە لەجیاتی دژایەتی بكەم هەستام بە بەرگریكردن لە ابن تيمية كە پێم كەسێكی ستەملێكراو بوە ئینجا پەرتوكێكم نوسی بەناوی (ابن تيمية السلفي)، لەو كاتەی كە خوێندن هەبوو لە وەرزی

خوێندنی ئەو كاتدا دابەشم كرد بەسەر قوتابیەكان، جا شێخ جامی دەفەرمویٚ باس و خواسی ژیاننامەی هەڕاسیش لە ڕاڤەكەی لەسەر (النونية)ی ابن القيم الجوزية لەویٚ زۆر بە درێژی باسیكراوە.

جا بەڵێ ئێمەش دەڵێین ئەگەر زانایانی ئێمەش ئێستا وە قوتابیانی زانستە شەرعیەكان بێن لە پەرتوكەكانی ابن تيمية وردبنەوە و كۆیان بكەنەوە و بیانخوێننەوە ئینجا ئەوكاتە حاڵی دەبن ابن تيمية چ زاتێک بوە چەند بەرز و بەڕێز بوە، نەک بچن لە پەرتوكی ئەوانەی دژایەتی ابن تيميةیان كردوە یان هەندێک جار شتە و ئێمە بەدڵنیاییەوە وای تێدەگەین هەڵبەستراوە بە زانا گەورەكانی وەكو ابن حجر الهيتمي ش كە گوایە گوتویەتی ابن تيمية ضاله موضله وایە وایە... هەندێک قسە كە لە زانایان ناوەشێتەوە بیڵێن و بیكەن، پێی هەڵبەستراوە چونكە سەنەدی ئەو كەسانەش دیار نیە لە (الفتاوى الحديثية)ی ابن حجر الهيتمي ش كێیە گوێی لە ابن حجر بوە و بە سەنەدەوە و جێی متمانە بوبن و ئەهلی عەدل بوبن و لێیان بیستبیٚ و گێڕدراوەبیٚ و گەشتبێتە دەستی ئێمە كە ئەو زاتە بەڕێزە ابن حجر الهيتمي بۆچونی دەربارەی ابن تيمية -رحمهما الله- وابوە، ئەگەر سوء تێگەشتن و هەندێک هەڵە و پەڵەشیان لە یەكتر گرتبیٚ و وەكو موناقاشە و گفتوگۆیان لەسەر كردبیٚ ئەوانە زانای بەرز و بەڕێز بونە لە ئاستی یەكتر نزیک بونە نابیٚ بگاتە ئەو ئاستە و لەناو ئێمەدا هەر بمێنێت و ئێمە هەر بیڵێینەوە بەبیٚ ئەوەی بچین كیتابەكانی ابن تيمية -رحمه الله- بخوێنینەوە ئەوە ئینساف نیە ئەوكاتە هەر نقڵكردن و قسە هێنانەوەی لە خۆڕایە.

**مێژوی ئەو كۆمەڵانەی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعەن زۆر بە كورت و پوختی:**

لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) عەقیدە و بیروبڕوا هیچ كێشەی گیروگرفتی نەبوە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر هەبوە (ﷺ) لە اللهوە الله ناسی وەرگرتوە ناو و سیفەتەكانی وەرگرتوە وە بڕگەكانی ئیمان و شەریعەتی ئیسلامی وەرگرتوە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ﴾ [النَّجْم: ٣]

هەموو ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویێتی هەر هەموی لە اللەوە بوە و الله تعالی پێیداوە دەربارەی عەقیدە و بیروبڕوا دەربارەی شەریعەت.

جا لە پاشان هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دڵنیابون لە عەقیدە و بیروبڕوا و هیچ کێشە و گیروگرفتیان نەبوە گومانیان لەدڵ نەماوە لەبەر ئەوەی ئەوەی پێویست بوبێ پرسیویانە لە پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوانیش چاک چاک لە زمانی عەرەبی دەگەیشتن لەلەهجە و قیرائەت و خوێندنەوەی قورئان تێدەگەیشتن ئەوانیش کێشەیان نەبوو هەتا وای لێهات هیچ پێچەوانەیەکی عەقیدە و بیروبڕوای پێغەمبەر (ﷺ) دروست نەبوو، تەنها یەکێک لە ئەعڕابییەکان بەناوی ذو الخویصرة کە ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێ: «قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) -وَهُوَ يَقْسِمُ قَسْمًا- أَتَاهُ ذُو الْخُوَيْصِرَةِ» دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) دابەشی دەکرد هەندێک لەو کەل و پەل و غەنیمەت و شتانەی دەستکەوت بوو بەسەر مسوڵمانەکان ذو الخویصرة هات «وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ» ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێ ذو الخویصرة کە پیاوێک بوو لە بەنی تەمیمیەکان بوو «فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اعْدِلْ» گوتی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) عەدالەت بکە لەو دابەشکردنە (پەنا بە الله) «قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ؟» بە هیلاک چون بۆتۆ ئەگەر من عەدالەت و دادوەری نەکەم کێ دادوەری دەکا؟ «قَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ» جا من ئەگەر عەدالەت و دادوەری نەکەم زەرەرمەند دەبم، جا پێغەمبەر (ﷺ) لەوپەڕی دادوەران دادوەر بوە کەس نەبوە لە دادوەری و عەدالەت بگاتە پێغەمبەر (ﷺ) لە مرۆڤ و بەدیهێنراوەکان، ئینجا عومەری کوڕی خەتاب فەرموی «يَا رَسُولَ اللَّهِ، ائْذَنْ لِي فِيهِ؛ أَضْرِبْ عُنُقَهُ» مۆڵەتم پێبدە دەربارەی ذو الخویصرة با لەسەری بدەم «قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): دَعْهُ، فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَلاَتِهِمْ» فەرموی لێی گەڕێ ئەوانە کەس و هاوەڵانێکی پەیدا دەبن هەریەک لە ئێوە نوێژەکانی خۆتان پێ هیچ نیە لە چاو نوێژەکانی ئەوان «وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ» وە ڕۆژوەکانی خۆتانتان بەرامبەر بە ڕۆژوەکانی ئەوان پێ هیچ نیە «يَقْرَءُونَ

الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ» قورئان دەخوێنن بەڵام لە مل و سەریانەوە دەرناچێ و بەرز نابێتەوە «يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ [1]» ئەوانە لە ئیسلام دەرچونە و دەردەچن هەروەکو تیر لە کەوان دەردەچێ.

جا کەواتە یەکەمجار ئەوانە پەیدابون لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ذو الخويصرة کە بە یەکەم کەسی خەواریج دادەنرێ، جا لەسەردەمی ئیمامی عەلیش -رضي الله عنه- دیارە کۆمەڵەی خەواریج و تاقمەی خەواریج پەیدابون، کە خەواریجەکان کێن؟ ئەوانە ئەو کەسانەن کە لە فەرمان و تاعەتی وەلی ئەمری دەردەچن وە خەڵکی موسڵمان بە گوناحی گەورە ئەگەر ئەنجامی بدەن کافریان دەکەن لە ئیسلام دەیانبەنە دەرەوە وە خوێنیان حەڵاڵ دەکەن ماڵیان بە غەنیمەت دەگرن، یەکەم جار کە خەواریجەکان پەیدابون لە سەردەمی ئیمامی عەلی بوو، ناویان لێ نراوە (كلاب النار)، وە لە پاشان ئەوانە لە دین دەردەچن، وە لە پاشانەکە زانایانی ئیسلام و ئەهلی سونە و جەماعە ئێمەیان لە شەڕی ئەوان ئاگادار کردوەتەوە لە عەقیدە و بیروبڕای ئەوانیش ئاگاداریان کردوینەتەوە، لە پاشان ئەوە بەوە دەناسرێنەوە خاڵی هەرە سەرەکی خەواریجەکان کە لە سەمع و تاعەی خەلیفەی موسڵوانان دەردەچن، وە لە پاشان موسڵمانان بە گوناحی گەورە کافر دەکەن دەڵێن (التكفير بالكبائر، واستحلال الدماء والأموال بغير حق) ئەوان دەڵێن بە گوناحی گەورە ئەگەر کەسێک زینای کرد بڕوای بە حەڵاڵی زیناش نەبێ هەر کافر دەبێ بە کردنی زیناکە یان قەتڵی کرد یان ڕیبای خوارد بەو کردەوە دەڵێن کافر دەبێ، تەنها یەکێکی تر لە خاڵە بیدعە و داهێنراوەکانیان ئەوەیە دەڵێن ئێمە تەنها بڕوا بە قورئان دەهێنن ئەوەی لە سونەت هاتوە وەکو (مسح على الخفين) بڕوایان پێی نیە.

[1] أخرجه البخاري برقم (٣٣٤٤) في الأنبياء، باب: قول الله تعالى: وإلى عاد أخاهم هودا ومسلم برقم (١٠٦٤)- ١٤٣ في الزكاة، باب: ذكر الخوارج وصفاتهم، عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه.

وە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکی تر لە وەسفیاندا فەرموی: «يَقْتُلُونَ أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَيَدَعُونَ أَهْلَ الْأَوْثَانِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ[١]» فەرموی ئەوانە شەڕ و جەنگ دەکەن لەگەڵ مسوڵمنان و ئەوانەی خاوەن ئیسلامن دەیانکوژن وە ئەوانەی بت پەرستن وازیان لێ دەهێنن و لەگەڵیان دەبن هەندێک جار ژێر بە ژێر یان تەنسیقیان لەگەڵ دەکەن یان وازیان لێ دەهێنن وە ئەوانە لە ئیسلام دەرچونە هەروەکو تیر لە کەوان دەردەچوبێ.

جا لە پاشان قەدەریەکان پەیدابون لەکۆتایی سەدە و چاخی سەحابە و هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) یانی تەقریبەن لەپاش ساڵانی حەفتای هیجری، کە ئەوانەش نەفی عیلمی الله تعالی یان کرد و ڕەتیان کردەوە کە الله تعالی عیلمی بە هەموو شتەکان هەبێ لە ئەزەل و ئەوەلەوە، وە دەڵێن هەموو شتێک لە خۆیەوە کە تازە پەیدا دەبێ و دروست دەبێ ئینجا الله عیلمی پێی دەبێ لە کار و کردەوەی مرۆڤەکانیش (پەنا بە خوای رب العالمين) وای دەردەخەن کە الله تعالی لەپێشتر هیچی نەزانیوە ئەوانەش دیارە لە عێراق سەریان هەڵدا زیاتر و پەیدابون، سەرۆک و گەورەیان معبد الجهني بوو، وە غيلان القدري بوو.

معبد الجهني یەکەم کەسە کە دەربارەی قەدەر قسەی کردوە لەپاش ناوەڕاستی سەدەی یەکەمی سەحابەکان، وە لە پاشان معبد لەوەوە وەریگرتوە کە پیاوێکی نەسڕانی بوو ناوی سەوسەن بوو وە موسڵمان بوو لە پاشان گەڕایەوە سەر نەسڕانیەت، وە معبد یەکەم کەس بوو لەناو خەڵکیدا ئەو عەقیدە و بیروبڕوایەی بڵاوکردەوە و پەرەی پێدا، وە لە مەعبەدیشەوە غيلان الدمشقي وەریگرت، و وە غەیلانیش لەگەڵ ئەوەدا کە مورجیەئەش بوو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز جارێک گێڕدراوەیە کە بانگی کردوە و گفتوگۆشی لەگەڵ کردوە ڕایگەیاندوە کە تەوبەی کردوە لەو ڕێباز و ڕێگایەی بەڵام درۆی کردوە

[١]أخرجه البخاري برقم (٣٣٤٤) في الأنبياء، باب: قول الله تعالى: وإلى عاد أخاهم هودا ومسلم برقم (١٠٦٤)- ١٤٣ في الزكاة، باب: ذكر الخوارج وصفاتهم، عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه.

ئەوەتا لە پاشان هاتوەتەوە سەر ئەو باس و خواسەی قەدەریەکان و بڵاوی کردوەتەوە و وە لە پاشان هیشامی کوڕی عبدولمەلیک کە هاتە سەر حوکم مەجلیسێکی بۆ دانا و گفتوگۆی لەگەڵکرد و کە لە گفتوگۆیەکەی سەلمێندرا ئەوە کەسێکی پیسی خراپە دژە بە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بڕیاری کوشتنی دەرکرا و کوژرا لە ساڵی سەد و پێنجی هیجری.

لە پاشان بیروبڕوای قەدەریەکان ئەهلی سونە و جەماعە هەر لە سەحابەکانەوە وەڵامیان هەبوە بۆیان و ڕەدیان داونەتەوە کە مابون لەوانە عەبدوڵای کوڕی عومەر و عوبادەی کوڕی سامیت وە جگە لەوانیش ڕەدی ئەو خەڵکانەیان داوەتەوە.

لە پاشان بیدعەی موڕجیئایەتی پەیدا بوو ئیڕجاء، موڕجیئایەتی و ئیڕجائیش کە پەیدابوو ئەو بیدعەیە دیارە لە کۆتایی قەڕنی یەکەم کە پەیدابون و ئەو کەسانە بون کە (جهم کوڕی صفوان، أبو محرز السمرقندي) کە جەهمیەکانیشیان پێ دەگوترێ و موڕجیئەکانیش دەبنەوە تیرەیەکیش لە جەهمییەکان، ئینکاری سیفاتی الله تعالى یان دەکرد وە نەفییان دەکرد بڕیاریان نەدەدا وە بینینی الله تعالى، وە لە پاشان بڕیاری ئەوەیان دەرکرد کە قورئان مەخلوق و بەدیهێنراوە (پەنا بە خوای رب العالمين) نەک سیفاتێکی زاتی و ئەوەلی الله تعالى بێ، وە لەبەر ئەوەش ناویان لێنرا موڕجیئە چونکە کرداریان لە ئیمان دوردەخستەوە دەیانگوت کردار بەشێک نیە لە ئیمان و بڕوا، ئەو شیعرە لەوانەوە گێڕدراوەیە و لەسەر ئەوان گوتراوە: (فكثر ما استطعت من المعاصي *** إذا كـان القـدوم على كريم [1]) چەند پێت دەکرێ تاوان و گوناحت زۆرکە چونکە مادەم ئیمانداری هیچ زەرەر و زیان ناگەیەنێ بە ئیمانەکەت تاوان و گوناح و کرداری خراپ مادەم دەگەڕێیتەوە و دەچی بۆلای خوایەکی کەریم، زۆرێک لە زانایانی تابیعی ئەوکاتە وەڵامی ئەوانیشیان دایەوە.

لە پاشان دیارە موعتەزیلەکان پەیدابون ئەویش لە سەرەتای قەڕن و چاخی دووەمی کۆچی، کە ئەو موعتەزیلانە سەرەتاکەیان دەگەڕێتەوە بۆ پەیدابونی (واصل کوڕی عطاء،

[1] تفسير ابن القيم، [لقمان: ٣٣].

الغزّال عمرو کوڕی عبید کوڕی باب) ئەوانە سەرچاوە بونە و وە پێشەوا بونە و لەوانەوە سەرچاوەی گرتوە عەقیدەی موعتەزیلایەتی، کە لە کۆڕ و مەجلیسی پێشەوا حەسەنی بەسڕی کە ماموستا بوە و دەرس و وانەی هەبوە، دیارە واصل کوڕی عطاء یەکێک بوە لە قوتابیەکان لەدوای ئەوەی ئیمامی حەسەنی بەسڕی ئەوەی لێ بیستوە و زانیویەتی و لێی هەست پێکردوە دەریکردوە لە مەجلیسەکەی خۆی ئەویش ئیعتیزالی کردوە و چوە لەلایەکی تر کۆڕ و مەجلیسی داناوە بۆ علم و بیروبڕواکەی خۆی کە موعتەزیلی بوە و بڵاوی بکاتەوە لەبەر ئەوە ناوی لێنراوە موعتەزیلە (حيث اعتزل مجلس الحسن البصري فسموا بالمعتزلة).

جا لە پاشان عمرو کوڕی عبید گوتمان ڕێگای واصل کوڕی عەطائی گرتەبەر، دیارە بیروبڕوای موعتەزیلەکان لە پێنج خاڵ و کۆڵەکەدا کۆدەبێتەوە وەکو لە پەرتوکەکان دیاریکراوە:

یەکەمیان (العدل) ئەوەش نەفی ڕەتکردنەوەی قەدەری پێدەکەن، دوەم کۆڵەکە (الوعد والوعيد) بە مەعنای ئەوەی چاکەکاربێ پاداشتی دەدرێتەوە وە واجبیش دەبێ ئەوەی تاوانباربێ تۆڵەی لێ بستێنرێتەوە ئەگەر الله تعالى لە گوناحکار بشبورێ ئەوە ئەوکاتە ستەمە ئەوەش (پەنا بە خوای رب العالمين) لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە الله تعالى: ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ [هود: ١٠٧] هەرچی بیەوێ دەبێ زۆریش بەخشەرە ئەگەر بیشبورێ لە بەندەکانی (فبفضله) لە گوناحکارەکان وە ئەگەر تۆڵەشیان لێ بستێنێتەوە (فبعدله)، لە پاشان بڕوایان بە کۆڵەکەی سێیەم (التوحيد)ە لەلای ئەوان تەوحیدیش نەفی و ڕەتکردنەوەی سیفاتەکانە وە گوتنی هەندێک لە سیفەتەکانی الله تعالى یە بەو مانایەی مەخلوقە بەدیهێنراوە وەکو (كلام الله) و وەکو قورئانی پیرۆز (پەنا بە خوای رب العالمين)، وە کۆڵەکەی چوارەمیان کە زۆر بەوە بەناوبانگن موعتەزیلەکان (المنزلة بين المنزلتين)ە واتە شوێنێک لە نێوان دوو شوێندا ئەویش مەبەستیان پێی چیە؟ دەڵێن ئەوانەی گوناحە

گەورەکان ئەنجام دەدەن لە موسڵوانان لە ئیسلام دەچنە دەرەوە بەڵام ناچنە ناو بازنەی کوفریش لەو ناوەدا دەمێننەوە وە لە قیامەتیشدا لە دۆزەخدا هەمیشەیی دەبن (پەنا بە خوای رب العالمین)، لە پاشان خاڵ و کۆڵەگەی کۆتایی موعتەزیلەکان فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپەش مەبەستیان پێی ئەوەیە هەر بە شمشێر دەربچن لەسەر سەرکردەکان و وەلی ئەمری مسوڵمانان ئەگەر شتەکەش ئەوە نەهێنێ ئینجا شەڕیان لەگەڵ بکەن هەتا ئەگەر کوفری بەواحیشیان لێ نەبینن و بە ئاشکراش لێیان نەبینن.

لە پاشان دیارە ئەشعەریەکانیش پەیدا بون لەدوای موعتەزیلەکان، کە ئەشعەریەکان أبو الحسن الأشعري علي کوڕی إِسْمَاعِيل کوڕی إِسْحَاق ئەو پیاوە بەڕێزە لە موعتەزیلایەتیدا هات بوە ئەشعەری، وە لە پاشان هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەگێڕنەوە لەویشەوە وازی لێهێنا و تەواو گەڕایەوە سەر ڕێڕەوی ئەهلی سونە و جەماعە بە تێگەیشتنی پێشینانی چاک دەربارەی ئەسماء و سیفات و عەقیدە و بیروبڕوای دەربارەی خوای رب العالمین و -جل شئنە- و هەموو خاڵەکانی تر.

وە ئەشعەریەکان تەنها حەوت سیفات بۆ الله تعالی بڕیار دەدەن (سەمع و بەصەر و کەلام و ئیرادە و قودرە و حەیات و عیلم).

وە لە پاشان ئەوانە پەیدابون کە نەفی سیفاتی الله تعالی یان دەکرد، ئەوەیش ئەوەیە کە ابن القیم لە نونیەکەیدا دەفەرموێ کە ئەوانەی جەهمی بون نەفی سیفاتی خوای رب العالمین یان دەکرد بە تەواوەتی یەکێک لەوانە جەعدی کوڕی درهەم بوو، کە جەعدی کوڕی درهەم یەکێک بوو لە مەولاکانی واتە عەبد و کۆیلەکانی سوید کوڕی غفلة کە ئەسڵ و بنچینە و ڕەچەڵەکی خەڵکی خۆراسان بوە لە دیمەشق دانیشتوە گومڕابوە دەیگوت قورئان مەخلوقە (پەنا بە خوای رب العالمین) جا بەنو ئومەیە بەدوایان نارد و ڕایکرد بەرەو کوفە، لەوێوە جەهمی کوڕی صەفوان تەقلیدی کرد لەو قسە، ئەوەبوو خالیدی قەسری کە

ئەمیر و والی كوفە بوو لە عێراق لە ساڵی سەد و بیست و چواری كۆچی ئەوكاتە بڕیاری سەربڕینیدا و بەدەستی خۆی سەری بڕی، ئەوەتا ابن القیم لە نونیەكەی دەفەرموێ:

(ولأَجلِ ذَا ضَحَّى بِجَعْدٍ خالدُ الـ *** ـقَسْرِيُّ يومَ ذَبائحِ القُرْبَانِ
إذْ قَالَ: إبْرَاهيمُ لَيْسَ خَليلَهُ *** كَلاَّ وَلاَ مُوسى الكَلِيمَ الدَّاني)

دەڵێ خالیدی قەسری بەدەستی خۆی كردیە قوربانی سەری بڕی لەبەر ئەوەی چی دەگوت ئەو دەڵێ چونكە دەیگوت ئیبراهیم (خلیل الله) نیە وە موساش (كلیم الله) نیە.

ئینجا ابن القیم دەفەرموێ ئەوەتا خالید گوتی:

(ضحوا تقبل الله ضحاياكم *** فإن مضح بالجعد كوڕی درهم)

خالیدی قەسری لە وتاری جەژنی قوربان بوو گوتی ئێوە قوربانیەكانتان بڕۆن سەرببڕن ئەوەتا منیش بە دەستی خۆم قوربانیەكەی ئەمڕۆم جەعدی كوڕی درهەمە و لەسەر میمبەر هاتە خوارێ و سەری بڕی.

ابن القیم دەفەرموێ:

(شكر الضحية كلُّ صاحب سنة *** للـه دَرُّك مـن أخي قربان[١])

جا لە پاشان جەبرییەكانیش پەیدابون كە (پەنا بە خوای رب العالمین) دەیان گوت كە الله تعالی بە جەبر و زۆرییەوە كار و كردەوەكان بە خەڵكی دەكا، دەیانگوت مرۆڤەكان لە كارو كردەوەكاندا وەكو پەڕە موچەیەك وان كە با دەیان جوڵێنێ هیچ ئیرادەیەك لەبەر دەستی خۆیان نیە و ئختیار و هەڵبژاردن لەبەر دەستی خۆیان نیە، وەكو ئەو شیعرەی كە مەشهورە دەڵێن:

(ألقاه في البحر مكتوفا وقال له *** إياك إياك أن تبتل بالماء[٢])

[١] انظر الكافية الشافية (نونية ابن القيم) ص ٣٤ الأبيات ٥٠ ، ٥١.

[٢] ثاني بيتين للحلاج في ديوانه (١٧٩)، و"وفيات الأعيان" (٢/ ١٤٣).

(پەنا بە الله) دەڵێن دەست و پێیان بەستاوەتەوە و لە ئاویان هاوێشتوە ئینجا دەڵێن ئاگاداربە ئاگاداربە تەڕنەبی (پەنا بە الله) ئەوە ڕەخنە گرتنە لە الله عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وانیە، وە الله تعالى عیلم و زانستی بە هەموو كردەوەكان هەیە ئختیاریشی داوەتە دەستی مرۆڤەكان پێغەمبەرانیشی ناردوە (عليهم الصلاة والسلام) ڕێنمونی هەموو لایەكی كردوە عەقڵ و هۆشیشی داوەتە ئێمە هیچ تاوان و خراپەیەك ناگەڕێتەوە سەر الله تعالى -جل شئنه-.

لە پاشان ئەهلی سونە و جەماعە وەڵامیان هەبوە بۆ سەر جەهمیەكان ئەوەتا ئیمامی ئەبو عثمان كوڕی سعيد الدارمي وەڵامی داوەتەوە (الرد على الجهمية) یەكێكە لە پەرتوكە نایابەكان بە بەڵگەی قورئان و سونە، وە لە پاشانەكە (رد الإمام الدارمي عثمان بن سعيد على بشر المريسي العنيد) ئەوەش پەرتوكێكی ترە، لەو كاتەوە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە كە بینیان ئەوانە پەیدابون و قسەیان هەیە و بڵاودەبێتەوە دەستیانكرد بە وەڵامدانەوە و نوسین لەسەریان و وە كیتابی چاك چاكیان دەركرد، ئیمامی أحمد كوڕی حەنبەلیش وەڵامی هەیە كە (الرد على الجهمية فيما شكت فيه من متشابه القرآن) یەكێكە لە نوسراوەكانی، وە ابن أبي يعلى بە هەمان شێوە هەیەتی، وە لە ئیمامی ئەحمەدیش دەگێڕێتەوە لەو پەرتوكانەی كە ئیمامی أحمد هەیبوە و ڕەدی ئەهلی بیدەعی داوەتەوە لە عەقیدە و بیروبڕوادا، وە زۆرێكی تریش لە زانایان وە هەتا گەیشتوەتە سەردەمی ابن تيمية، ابن تیمیەش -رحمه الله- یەكێك بوە لەو زانا بەرز و بەڕێزانەی كە وەڵامی زۆر چاك و لەجێی لە نوسراو و پەرتوكەكانی داوەتەوە هی هەموو ئەوانەی كە ئەهلی بیدەع بون لە عەقیدە و بیروبڕوادا.

## بۆچی هەندێك لە زانایان دژایەتی ابن تيمية دەكەن:

ئێمە لەكۆنەوە وا دەزانین ئەوەی دژایەتی كردبێ یان بێ ئینساف بوە حەسودی و ئیرەیی بە ابن تيمية بردوە یان ئەوەیە ابن تیمیەی نەناسیوە و پەرتوكەكانی نەخوێندوەتەوە لەپاش

ئەوەی خوێندویەتیەوە ڕێگای ڕاستی بۆ ڕون بوەتەوە بە قسەی ئەوانەی نەکردوە کە قسەیان بە ابن تیمیة هەڵبەستاوە چونکە قسەی زۆری لەسەر بوە، وە لە ئێستاشەوە ئەو مامۆستا بەڕێزانەی خۆمان زانایە بەڕێزەکانی ئێستا هاوچەرخن لەگەڵ ئێمە و لە خزمەتیاندا دەژین لە وڵاتی خۆمان و لە وڵاتەکانی تریش ئێمە یەک داوایان لێدەکەین ئەوە ئینسافە ئەوە سیفاتی ئەهلی عیلمە ئەوە هی زانا و مامۆستایانە بچن لە خودی پەرتوکەکانی ابن تیمیةوە، بۆچی لێی دەترسێن؟ خۆ تێنتی نیە بتەقێتەوە ابن تیمیة و پەرتوکەکانی؟ پێویستە بیخوێننەوە لێی ورد ببنەوە تێی بگەن حاڵیبن لە خۆیەوە ابن تیمیة بناسن ژیاننامەی بخوێننەوە ئەوکاتە بۆیان ڕوندەبێتەوە و ئینسافیشە هەر بڕیارێکی لەسەر بدەن، نەک لەو ڕیوایەت و گێڕانەوانەی کە ابن حجر گوایە لێی ڕیوایەت کراوە و وای بە ابن تیمیة گوتوە هیچی تریان بە دەست نیە مامۆستا و زاناکان لە قسەکانی ابن تیمیة، یان فڵان و سەنەدەکەی دیار نیە و فڵان کیتابی نوسیوە و ئەوە ئاوا چاپی کردوە و ئەوە بەڕاستی بێ ڕێزییە بێ ئینسافیە ئەو زاتە بەڕێزە کە مەلا زادە بوە لە ڕێی دایک و باوکیەوە باپیرەکانی و باوکەکانی زانا بونە پیاوێکی ئەوەندە بەڕێز بوە دڵسۆز بوە بۆ دین بەرامبەر بە تەتەر و مەغۆڵەکانی بەرامبەر بە سەڵیبیەکان لنگ چەقیو بوە سەرلەشکر بوە موجاهید بوە وە خەڵکی هانداوە لە بەرگریکردن لە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، غیرەتی زۆر چاک و لەجێ جوڵاوە بەرگری کردوە پەرتوکێکی نوسیوە (الصارم المسلول) بەڕاستی کیتابێکی زۆر نایابە لە حوکمی ئەو کەسانەی قسە دەڵێنە الله و پێغەمبەر (ﷺ) یان جوێن فرۆشی دەکەن بەرامبەر بە پێغەمبەر (ﷺ) لەوە دەردەکەوێ ئەو پیاوە چەند بەڕێز بوە چەند دڵسۆز بوە عەقیدە پاک بوە پێغەمبەری (ﷺ) چەند خۆشویستوە، نەک لەوانەوە و لەو شتانەوە ئێمە تەماشای ئەو پیاوە بکەین کە بۆی هەڵبەستراوە و لەسەری گوتراوە، بێ ئینسافیە بەڕاستی ئەو کاتە قسەی زێدەڕەویشی لەسەر دەکەین گوناحباریش دەبین ئەو پیاوە وەفاتیشی کردوە.

با وەکو محمد خلیل هراس بین، کە محمد خلیل هراس لە ڕابردودا باسمان لێوە کرد کە ئەو پیاوە بەڕێزە گوتی داوام لێکرا من دژایەتی ابن تیمیة بکەم و ڕەدی بدەمەوە کە ابن تیمیەی خۆش نەویستوە پەرتوکەکانی کۆ کردوەتەوە تا بە ئینسافەوە ڕەدی بداتەوە بە عیلمیانە، ئینجا لە ئەنجامی خوێندنەوەی پەرتوکەکان دەڵێ لە کۆتایی بۆم دەرکەوت کە من لە ئیسلام تێنەگەیشتومە زانیم شارەزای ڕاستیەتی و حەقیقەتی ئیسلام نەبومە هەتا ئێستا لە ابن تیمیەوە تەواوەتی ئیسلامم بۆ دەرکەوت و ناسیم لە جیاتی ئەوەی کە دژایەتی بکا، ئەمجارە دەیەها کیتابی لەبارەی مەدح و پێدا هەڵگوتنی ابن تیمیة نوسی و چوە سەر ڕێڕەوەکەی ئەو یەکێک لە کیتابە نایابەکانی محمد خلیل هراس دەربارەی ابن تیمیة ئەو پەرتوکەیە (باعث النهضة الإسلامية ابن تيمية السلفي نقده لمسالك المتكلمين والفلاسفة في الإلهيات).

کەواتە با ئێمەش بێین وەکو ئەو پیاوە بەڕێزە کیتابەکانی ابن تیمیة کۆبکەینەوە بیانخوێنینەوە وە لێیان تێبگەین، ئینجا بڕیاری خۆمان بدەین ئایە ابن تیمیة پیاوی باش بوە یان هەڵەی کردوە؟ ئەگەر باش بوبێ پێکابێتی دوو ئەجری دەست کەوتوە چونکە کەسێکی زانا بوە و موجتەهیدیش بوە، جا ئەگەر نەیپێکابێ و خەطەئی کردبێ دۆعای خەیری بۆ دەکەین لە هەڵەکەی الله تعالى لێی بوریبێ وە پاداشتێکیشی بۆ تۆمار کردبێ چونکە موجتەهید بوە زانا بوە لێوەشاوە بوە، ئەو کاتە ئینسافە و هەڵە و کەم و کورتیمان نەکردوە. جا بەڕاستی دەبێ ئێمە ئەدەب فێربین بەرامبەر زانا و عالمەکان، وە پێشینانی چاک وابونە وە سەلەفی سالح وابونە وە ئەهلی سونە و جەماعە بە بەردەوامی لە هەموو سەردەمەکان هەر وابونە و واژیاون، نەزانینمان و نەشارەزایمان بە ابن تیمیة و پەرتوکەکانی لە ڕێگایە ڕاستەکان لە ڕێگای قوتابیە دڵسۆزەکان وەکو ئیمامی زەهەبی و ابن كثير و ابن القيم الجوزية و ئەوانەی لەسەردەمی ئەو ژیاون ئیمامی بەزار، لەوەیەوە ئەوەمان بۆ دروست دەبێ هەندێک جار کە بێڕێزی لەگەڵ بکەین یان ڕەتیکەینەوە یان قسەی پێ هەڵبەستین.

## پێشەکی شیخ الإسلام ابن تیمیة:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

إبن تیمیة -رحمه الله- وەکو باقی زانایەکانی تر بە (بِسْمِ اللَّـهِ) دەستی پێکردوە، زانایان دەفەرمون ئەو زانایانە کە (بِسْمِ اللَّـهِ) دەکەن لەسەرەتای نوسینی پەرتوکەکانیان ئیقتیدایان کردوە بە قورئانی پیرۆز چونکە قورئانی پیرۆز لەسەرەتادا بە (بِسْمِ اللَّـهِ) دەست پێدەکا ئەوەلی سورەتی فاتیحە.

ئینجا فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) هەیە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «كل أمر ذي بال لم يبدأ بالحمدلة» يان «بالبسملة» «فهو أقطع» «أجذم» «أبتر» فەرمودەناسان دەفەرمون ئەو ڕیوایەتانە هەمویان سەحیح نین و هەر هەمویان زەعیف و لاوازن، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) بە کردار (بِسْمِ اللَّـهِ) نوسیوە لە هەموو نوسراوەکانی لەبەر ئەوەیە بوەتە سونەتێکی کرداری پێغەمبەر (ﷺ) زانایان نوسراو و پەرتوکەکانیان بە (بِسْمِ اللَّـهِ) دەست پێدەکەن ئەوەشیان بەڵگەیەکی تر.

جا (بِسْمِ اللَّـهِ) ئەگەر بێین بە کورتی شی بکەینەوە مانای چی دەگەیەنێ؟ حەرفی بایەکە چەندین واتای هەیە لە زمانی عەرەبی، لێرەوە زانایان دەفەرمون بە دوو مانا دێ، هەندێکیان دەفەرمون بە مانای ئیستیعانە دێ، واتە تۆ داوای یارمەتی لە الله تعالى دەکەی لە ناوی الله تعالى دەکەی کە دەڵێی (بِسْمِ اللَّـهِ).

ئیسمیش لە زمانەوانیدا دیارە هەر شتێکە کە بەڵگەبێ لەسەر موسەما و کاکڵ و ناوەڕۆکێک، هەندێکیش لە زانایانی زمانەوانی دەفەرمون، ئیسم دوو واتای هەیە:

واتایەکی ئەوەیە لە (سما، يسمو، سموا) هاتوە بە مەعنای (العلو والرفعة) یەعنی بەرزی، هەروەکو هەندێک جار لە هەواڵەکان گوێبیست دەبین دەڵێ: (صاحب السمو) یەعنی خاوەنی شکۆ و بەرزی، ئینجا ابن تیمیە ئەوە ڕاجیح و پەسەند دەکا وە ابن القیم الجوزیةش -رحمهما الله-.

وە هەندێکیش دەفەرمون ئیسم عەلامەت و نیشانەیە، واتە شتێک ئەگەر نیشانەبێ بەسەر شتێکەوە پێی دەگوترێ ئیسم، جا ئیسم لێرەدا کە بەکارهاتوە هەمزەکەی هەمزەی وەسڵە کە حەرفی بای چۆتە سەر، ئەگەر بایەکەی لێ ڕەش بکەینەوە هەمزەکە دێتەوە بەڵام لەبەر زۆر بەکارهێنان و نوسینی لە لای زانایان و وە لەلای عەرەبەکان کاتی خۆی ئەو هەمزەیان لاداوە و بەکاریان نەهێناوە (وەکو نوسین نەیان نوسیوە)، ئەگەر بایەکە لابدەین دەبێ بڵێین ئیسم ئەوکاتە هەمزەکە دەگەڕێتەوە، جا ئەگەر حەرفی بایەکەی پێوە بنوسێنین دەبێتە بیسم ئەوکاتە ئیسمەکە هەمزەکەی ناخوێندرێتەوە چونکە هەمزەی وەسڵ تەبیعەتی وایە لە زمانی عەرەبی ئەگەر کەوتە نێوان وشەیەک لەگەڵ وشەیەکی تر لەو نێوانەدا ناخوێندرێتەوە وەکو خوێندنەوە وە لە نوسینیش بەدیار دەکەوێ تەنها لە هەندێک شوێن نەبێ وەکو ئیسم کە حەرفی بای لەگەڵ بێ.

لە پاشان (الله) -جل شئنە- عەلەمە ناوە بۆ الله تعالى، بەڵکو ناوێکە لە هەموو ناوەکان بەرزتر و جوانتر و تەواوترە هەموو ناوەکانی تر لە خۆوە دەگرێ، بەڵکو هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن (إسم الله الأعظم)ە لە سەردەمیەکان شێخ عبد الله بن جبرین و دکتۆر عمر سليمان الأشقر پێیان وایە کە الله (إسم الله الأعظم)ە.

(الله) بە مەعنای چی دێ ئایە موشتەقە یان موشتەق نیە؟ موشتەق بە مەعنای ئەوەی ئایە وشەکە لە وشەیەکی تر وەرگیراوە لە زمانی عەرەبی؟ یان ئەوەیە لە هیچ وەرنەگیراوە و هەر تەنها ئەو وشەیە و هیچیشی لێوەرناگیرێ؟ کۆمەڵێک لە زانایانی پێشین دەفەرمون (الله) موشتەق نیە واتە نە لە هیچ وشەیەکی تر وەرگیراوە و نە هیچیشی لێ وەردەگیرێ، دەڵێن چۆن الله تعالى تاک و تەنهایە ئەو ناوە پڕ مانایەی الله تعالى ش -جل شئنە- دەبێ تاک و تەنهابێ نە لەهیچ وەرگیرابێ و نە هیچی لێ وەربگیرێ بەڵام بۆچونی ڕاجیح و پەسەند لە لایەن ابن تيميةوە -رحمه الله- وە ابن القيم الجوزية وە ابن كثير وە زۆرێکی تر لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن (الله) موشتەقە واتە وەرگیراوە لە وشەیەکی

تر، ئەگەر گوتمان وەرگیراوە لە وشەیەكی تر وشەكەی تر چیە كە لێی وەرگیراوە؟ دەڵێن لە (أله، يأله، مألوه) وەرگیراوە بە مەعنای (معبوداً) یەعنی كە دەڵێی (الله) یەعنی پەرستراوی ڕاستەقینە.

ئینجا (الرحمن) ناوێكی تری الله تعالى یە -جل شئنە- لەسەر وەزنی (فَعْلان)ە بە مەعنای (واسع الرحمة) یەعنی ڕەحمەتەكەی الله تعالى یەكجار فراوانە هەموو شتێك لە خۆوە دەگرێ.

وە (الرحيم) ناوێكی تری الله تعالى یە -جل شئنە- لەسەر وەزنی (فعيل)ە بە مەعنای (فاعل) دێت بۆ الله تعالى، واتە ڕەحم و بەزەیەكەی هەموو دەمێك و هەموو كاتێك بۆ هەموو كەسێك و لە هەموو شوێنێك لە توانایدا هەیە پێی بگەیەنێت و بیكاتە كردار.

وە هەندێكیش لە زانایان دەڵێن (الرحمن) گشتیە و بۆ دونیایە بۆ كافر و موسڵمانانە ڕەحمی الله تعالى، هی كافران بەوە ڕەحمیان پێدەكا ڕزق و ڕۆزیان دەداتێ مۆڵەتی ژیانیان پێ دەبەخشێ وە هی موسڵمان و ئیماندارانیش لەپاڵ ئەوانەش الله تعالى ڕەحمی ئەوەیان پێدەكات كە ڕێنمونی كردون وە سەریان دەخا، وە (الرحيم)یش تایبەتە بە ئیمانداران بۆ ڕۆژی دوایی ئەم بۆچونەش هەیە.

كەواتە چی لێ دێ؟ واتای (بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ) یەعنی داوا دەكەین لە ناوی الله تعالى پیت و بەرەكەت بخاتە ئیش و كارەكەمان، كەواتە لێرەدا دەبێ ئێمە وای لێك بدەینەوە بڵێین شتێك هەیە ڕەشكراوەیە لەناو ڕستەكە بەڵام تەقدیری دەكەین لە واتا هەتا ڕستەكەمان بۆ ڕاستبێ.

جا ئەو شتەی كە تەقدیری دەكەین ئایە ئیسمە یان فیعلە؟ جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان بەڵام بۆچونی پەسەند لەلای زانایانی زمانەوانیشەوە جگە لەوەی كە زانایانی شەرعیش وا دەفەرمون ئەوەیە فیعل بێ باشە نەك بڵێین ئیسمە، یانی دائیمەن نەڵێین (بِسْمِ اللَّـهِ) بە مەعنای (بِسْمِ اللَّـهِ) لە هەموو شتەكان نا بەڵكو فیعلەكەش فیعلێك بێ بگونجێ لەگەڵ

ئەو کارەی تۆ ئەنجامی دەدەی، بۆ نمونە دانەر ابن تيمية -رحمه الله- لێرە کاتێک (بِسْمِ اللَّـهِ) خوێندوە و نوسیوێتی مەعنای وای لێدێت کە فیعلەکەی بۆ تەقدیر بکەین یانی کە ئەنەهو گوتویەتی (باسم الله أكتب) واتە بەناوی الله تعالى وە داوای یارمەتی لە ناوی الله دەکەم کە بنوسم لەو نوسینەدا یارمەتیم بدا پیت و بەرەکەت بخاتە ناو نوسینەکەم، واتە داوای کۆمەکی دەکەم لە الله تعالى ی (الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ) ئەو خوایەی کە ڕەحمانە خاوەن بەزەییەکی فراوانە وە ڕەحیمیشە هەردەمێک بیەوێ بۆ هەرکەسێک لە هەر شوێنێک ڕەحم و بەزەییەکەی دەتوانێ بگەیەنێ.

جا (بِسْمِ اللَّـهِ) وشەیەکیشە و ڕستەیەکیشە زۆر بەکاردێ لە ژیانی بڕواداردا لەبەر ئەوەی تۆ لە هەموو ئیش و کارەکانی خەیرت دەبێ بە (بِسْمِ اللَّـهِ) دەستی پێبکەی لە هەموو نوسینەکان زانایانی ئیسلام زۆربەی هەرە زۆریان بە (بِسْمِ اللَّـهِ) دەستیان پێکردوە.

**سەرەتای بە حەمد دەستپێکردوە وەکو ئیقتیدا بە قورئانی پیرۆز:**

الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا.

---

جا دووبارە دەتوانین بڵێین ئیقتیدای کردوە بە قورئانی پیرۆز لەدوای ئەوەی کە (بِسْمِ اللَّـهِ) فەرموو بە (الْحَمْدُ لِلَّهِ) دوبارە دەستی پێکرد، هەروەکو سەرەتای قورئانی پیرۆز بە (بِسْمِ اللَّـهِ) دەست پێدەکا لەدوای (بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ) سورەتی (الفاتحة) سەرەتاکەی و یەکەم ئایەتی ئەگەر نەڵێین (بِسْمِ اللَّـهِ) یەکەم ئایەتێتی لەسەر بۆچونی هەندێک لە زانایان و توژێرەوانی قورئانی پیرۆز بە (ٱلحَمدُ لِلَّه) دەستی پێکردوە کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿ٱلحَمدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلعَٰلَمِينَ﴾ [الفاتحة: ٢].

جا (ٱلحَمدُ لِلَّه) واتای چی دەگەیەنێ؟ زانایان دەفەرمون ئەو (ال) لەسەر (ٱلحَمد)ە (ال) (كل استغراقي)، بە مەعنای ئەگەر (كل)ی لە شوێن دابنێی مانا دەگەیەنێ، یانی (كل حمد لله) ئەوەی حەمدە لە سەرتاسەری زەوی مانای حەمد و سوپاس و ستایش دەیگرێتەوە بۆ هەر مەحمودێک کرابێ هەر حامیدێک کردبێتی بە هەر سیغە و دەربڕینێک بێ ئەوانە

هەر هەموی شایستەیە بۆ الله تعالی دەربڕێ و وە هەموو حەمد و سوپاسەکان بۆ الله تعالی یە.

جا لە پاشان حەمد بە مانای چی دێ؟ حەمد لە زاراوەدا بەو مانایە دێت کە لە بەرامبەر ئەو سیفەت و کار و کردەوە زۆر جوان و ڕێک و پێکەکان تۆ سوپاس و ستایش دەکەی بۆ ئەو کەسە بە خۆشەویستیەوە یانی بەوپەڕی خۆشەویستیەوە بەوپەڕی بە گەورە گرتنەوە لە بەرامبەر ئەوەی زاتێک کە خاوەن سیفەتی زۆر جوان و ڕێک و پێک بێ وە سیفەتی تەواوبێ وە کار و کرداری چاکی هەبێ سوپاس و ستایش دەکرێت.

جا الله تعالی -جل شئنە- خاوەن سیفەتی تەواوە وە کردارەکانی لەوپەڕی تەواویە لەبەر ئەوە دەبێ بە خۆشەویستیەوە و بە مەزن و گەورە ڕاگرتنی الله تعالی سوپاس و ستایشی بکرێ، جا حەمدی الله تعالی هەندێک جار لەبەرامبەر ناز و نیعمەتەکانە کە لەگەڵ ئێمە کردویەتی دەیکەین ئەوکات واجبە و لەسەرمان پێویستە بیکەین، وە هەندێک جاریش هەر لە خۆڕا دەبێ حەمد و سوپاسیشی بکەین چونکە الله تعالی خۆی لە خۆیدا خاوەنی سیفاتی تەواوە وە کردارەکانی جوانە شایستەی ئەوەیە سوپاسی بکرێ ئەگەر هیچ ناز و نیعمەتێکیشی لەگەڵ نەکردباین، سەرەڕای ئەوەی ناز و نیعمەتەکاتی ناژمێردرێن کە لەگەڵ ئێمەی کردوە.

جیاوازی نێوان (الحمد، والشکر) چیە؟ جیاوازیان تەنها ئەوەندەیە حەمد لە دڵەوەیە و بەزمان دەگوترێ بەڵام شوکر لەدڵەوەیە و بە زمانیش دەگوترێ و دەبێ کار و کرداریشی لەگەڵدابێ ئینجا جێبەجێ دەبێ.

دواتر دەفەرموێ (لله) لامەکەی (لله) بۆ (إستحقاق)ە، بە مەعنای ئەوەی الله تعالی شایستەی ئەو حەمد و سوپاس و ستایشەیە کە دەیکرێ زاتێکە ئەوە نەبێ تەنها مەتحی بکرێ بەڵکو ئیلا حەمدی دەکرێ چونکە جیاوازی نێوان حەمد و مەدحیش ئەوەیە، مەتح هەندێک جار بە درۆش دەکرێ، کەسەکە شایستە نیە پێیدا هەڵبگوترێ لەگەڵ ئەوەدا

لەپێناو بڕە پارەیەک یان لە ترسان تۆ پێیدا هەڵدەڵێی و مەتحی دەکەی، بەڵام حەمد و سوپاس و ستایش ئیلا ئەوکاتانە دەگوترێ و دەردەبڕدرێ کە کەسەکەی بەرامبەر زاتەکەی بەرامبەر شایستەبێ.

کەواتە الله تعالی شایستەی هەموو حەمد و سوپاس و ستایشەکانە لەبەر ئەوە ابن تیمیەش -رحمه الله- فەرموی هەموو حەمد و سوپاس و ستایشەکان بۆ خوایەک کە شایستەی ئەو حەمد سوپاس و ستایشانەیە.

(الله) دوبارە گوتمان بەواتای مەعبودی ڕاستەقینە دێ

لە پاشان دەفەرموێ (الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ) حەمد و سوپاس و ستایش بۆ ئەو اللەیەی کە شایستەی ئەو حەمد و سوپاس و ستایشانەیە کە چی کردوە ئەو اللەیە -جل شئنه-؟ (أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ) ڕەوانەی کردوە پێغەمبەرەکەی خۆی موحەمەد (ﷺ) بە هیدایەت و ڕێنمونی وە بەدین و ڕێباز و ئاینێکی حەق و ڕەوا.

با بزانین (رَسُول) بە مەعنای چی دێ؟ ئینجا هیدایەت بە مەعنای چی دێ؟ وە (وَدِينِ الْحَقِّ) بە مەعنای چی دێ؟ یەکەو هەڵوێستەی کورتیان لەسەر بکەین.

ڕەسول ئەو زات و کەسەیە نێرینەبێ مەرجی یەکەمی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە واتە مێینە و ئافرەتان قەت نەبونەتە ڕەسول و پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام)، وە خاڵی دوەم دەبێ ڕەسول لە مرۆڤەکان بێ لە جنۆکەکان نەبێ واتە جنۆکە ناکرێ پێغەمبەربێ و ڕەسول بێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە، لە پاشان دەبێ کۆیلە نەبێ و ئازاد و حوڕبێ پێغەمبەران و وە ڕەسولەکان (علیهم الصلاة والسلام)، لە پاشان ڕەسول ئەو زاتەشە کە کەسێکی کۆیلە نەبێ و ئازادبێ، وە لە پاشانەکە جنۆکە نەبێ و مرۆڤبێ، وە لە پاشان پیاوبێ و نێرینەبێ و ئافرەت نەبێ و مێینە نەبێ، ئینجا فەرمانی پێکرابێ لەلای الله تعالی پەیامێکی تایبەتی بۆ هاتبێ و فەرمانی پێکرابێ ئەو پەیامە ڕابگەیەنێ بە کەسانێکی چ

دیاریکراو چ بە گشتی بە هەموو مرۆڤ و جنۆکەکان وەکو پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ)، ئەوە پێناسەی ڕەسولە.

لە پاشان هیدایەت دوو جۆری هەیە کە دەڵێ (بِالْهُدَى)، هیدایەتێكمان هەیە پێی دەڵێن (هداية الإرشاد) واتە هیدایەتی ڕێنوێنی کردن و بانگەوازی کردن، ئەو هیدایەتە پێغەمبەران پێیان کراوە (عليهم الصلاة والسلام)، وە ئەوەی شوێنکەوتەی پێغەمبەرانیش بێ (عليهم الصلاة والسلام) لە بانگخوازان پێیان دەکرێ و لە توانایاندا هەیە ڕێگاو ڕێبازەکە ڕونکەنەوە بۆ خەڵکی، بانگەوازی خەڵکی بکەن بەرەو ڕێنوێنی بەرەو ئیسلام و بەرەو قورئان و بەرەو الله تعالی، وەکو الله تعالی دەفەرموێتە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ [الشُّورَى: ٥٢] یان پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ: «لَأَنْ يَهْدِيَ اللَّهُ بِكَ رَجُلًا وَاحِدًا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ[١]» دەفەرموێ ئەگەر کەسێک لەسەر دەستی تۆ هیدایەت و ڕێنوێنی ببێ (پیاوێک) دەفەرموێت ئەو کاتە بۆ تۆ باشترە لە حوشتری سور، ئەوکاتە حوشتری سور زۆر بەنرخ بوە وە کڕین و فرۆشتنێکی زۆری لەسەر بوە لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) وای فەرموو.

واتە هیدایەت و ڕێنوێنی یەکەم ئیش و پیشەی پێغەمبەرانە (عليهم الصلاة والسلام) کە ئیرشادییە کە تەبلیغ کردنە وە ئیش و پیشەی داعی و بانگخوازانیشە هەتا ڕۆژی دوایی.

هیدایەت و جۆری دووەمی هیدایەت هیدایەتی تەوفیقیە: هیدایەتی تەوفیقی ئیلا بە دەست الله تعالی یە کەس ناکرێ ئەو هیدایەتەی لە دەست بێ و ئەنجامی بدا و بیکا ئیلا لە توانای اللەیە -جل شئنه-، کاتێک کە دەفەرموێتە پێغەمبەر (ﷺ) کە پێغەمبەر پێداگری دەکا (ﷺ) لە ڕێنوێنی کردنی مامی ئەبو تاڵیب کە الله تعالی [القصص: ٥٦] دادەبەزێنێ بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾

[١] **صحيح البخاري** (٢٩٤٢) (٣٠٠٩) (٣٧٠١)، **صحيح مسلم** (٢٤٠٦)، **مسند أحمد** (٢٢٨٢١).

تۆ ناتوانیٚ کەسێک ئەگەر خۆشت بویٚ[1] هیدایەت و ڕێنوێنی تەوفیقیشی بکەی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) واتە هیدایەت و ڕێنوێنی تەوفیقی تەنها لە دەست اللەیە کە هیدایەت و ڕێنوێنی ئەوەی بکا ببێتە موسڵمان لە دەست تۆشدا نیە ئەی موحەمەد (ﷺ) بەڵکو الله تعالی بیەویٚ کەسێک هیدایەت بدا و ڕێنوێنی بکا دەتوانیٚ بیکا و هیدایەت و ڕێنوێنی ئەنجام بدا بۆی.

جا لێرەوە پرسیارێک دێتە پێش، باشە الله تعالی بۆ هیدایەتی هەموو خەڵکی نەداوە و نادا؟ ئایە الله تعالی (پەنا بە الله) غەدر کەرە (ولله المثل الأعلى) حاشا لە الله تعالی؟ ئەو پرسیارە کە دەکریٚ بە تایبەت بیٚ بڕوایان مولحیدەکان هەندێک جار ئەو بابەتە شتانە دەوروژێنن. لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر، ئەو هیدایەتە تەوفیقیەش هۆکاری هەیە الله تعالی غەدری نەکردوە -جل شئنە- لە کەس وە غەدریش ناکا بەڵکو الله تعالی عەدالەت و دادوەرە دەزانیٚ عیلم و زانستی هەیە لە ئەزەلەوە بە هەموو شتەکان فڵانەکەسی کوڕی فڵانە کەس شایستەی ڕێنوێنی نیە لەبەر ئەوەی بە دەستی خۆی خراپە و تاوانەکان هەڵدەبژێریٚ بەردەوام دەبیٚ لەسەری پێداگری لەسەر دەکا گویٚ نادا بە ڕێنوێنیە ئیرشادیەکان بە ناردنی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بە ناردنی پەرتوکی خوایی و پەیامی خوایی لەبەر ئەوەیە الله تعالی ڕێنوێنی ناکا ئەگەرنا الله تعالی -جل شئنە- غەزەب ڕق حقد ئەوانە دورە لە الله تعالی بەرامبەر هیچ کەسێک لەبەر سەبەب و هۆکاری مەسڵەحەت و بەرژەوەندیەوە بەڵکو الله تعالی کاتیٚ کە غەزەبیش دەگریٚ کاتیٚ کە کەسێک ڕێنوێنیش ناکا لەوپەڕی عەداەت و دادوەرییە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى).

(وَدِينِ الْحَقِّ) بەواتای ئەوە دیٚ زیاتر ئەو عەقیدە و بیروبڕوایە وە ئەو پەیام و بەرنامە ئەو مەنهەجە خواییە کە الله تعالی بۆ پێغەمبەری ناردوە (ﷺ).

[1] **تیبینی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی خۆش بوە هیدایەت وەرگریٚ وەکو زانایان دەفەرمون نەک ئەوی خۆش ویستبیٚ.**

لە پاشان ئەو زاتە بەرِێزە دەفەرموێ (لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ) ئەوانەشی لە ئایەتی قورئانی پیرۆز وەرگرتوە دەفەرموێ بۆ ئەوەش ئەو پێغەمبەر و رِەوانە کراوەی کە موحەممەدە (ﷺ) بە رِێنوێنی و بە رِێباز و دینی حەق و رِەوا رِەوانەی کردوە تاوەکو ئاشکرای بکا بەسەر دین و ئاین و رِێبازەکانی تر واتە زاڵی بکا، چ ئەو دین و رِێبازانەی خەڵکان و ئومەتەکانی پێشتر وەکو هی جولەکە و دیانەکان بەسەر ئەودا زاڵیان بکات و ئاشکرایان بکات کە ئەوە رِاست و دروستە، چ هەر رِێباز و بەرنامەیەکی تر هی دەستکردی مرۆڤەکانیش بێت، چونکە دینی الله تعالى دینێکی حەقە و ئاوای ناردوە پێغەمبەر (ﷺ) وە خودی پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی و پەیامەکەی زاڵ بکات و ئاشکرای بکا بەسەر دین و رِێباز و بەرنامەکانی تر.

وە لە پاشان دەفەرموێ (وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا) بەسە بۆ الله -جل شئنە- کە شاهێدمانە وە شاهێدی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەدا (ﷺ) کە بە هیدایەت و رِێنوێنی رِەوانەی کردوە وە خاوەنی دینێکی حەق و رِەوایە ئەو شاهێدیە بەسە، جا لێرەدا هەندێک لە زانایانی زمانەوانی دەفەرمون (وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا) حەرفی (ب) زیادەیە، هەندێکیش دەفەرمون ناوەشێتەوە لە قورئانی پیرۆز کە زیادەی تێدابێ، جا ئەوانەی دەفەرمون زیادەیە کەواتە دەڵێن (وكفى الله شهادة) وا واتای دەکەن (والله أعلم بالصواب).

الله تعالى ئایەتی قورئانی ناردوە و ئەو زاتە بەرِێزە و دانەر لە ئایەتی قورئان وەریگرتوە کە ئەوەی بە نمونە هێناوەتەوە و کردویەتیە دەستپێکی پەرتوکەکەی کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا﴾ [الفتح: ٢٨].

**لەدوای حەمد دانەر شاهێدومانی دەهێنێ:**

وَأَشْهَدُ أَلَّا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ إِقْرَارًا بِهِ وَتَوْحِيدًا.

لە پاشان دانەر دەفەرموێ (وَأَشْهَدُ أَلَّا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ إِقْرَارًا بِهِ وَتَوْحِيدًا) دەفەرموێ وە شاهێدومانی دەهێنم کە هیچ پەرستراوێکی حەق نیە جگە لە الله ئەویش تاک و تەنهایە شەریک و هاوبەشی نیە وە داندەنێم بەوە و وە تەوحید و یەکتایی ئەو اللەیە ڕادەگەیەنم -جل شئنە-.

(وَأَشْهَدُ) کاتێک دەگوترێ شەهادەت مانای چیە؟ شەهادەت لە دڵەوەیە و بە زمانیش دەبێ بگوترێ واتە لە دڵدا دەبێ جێگیر ببێ وە بە زمانیش بگوترێ، زیاتر شەهادەتیش لە زمانەوانیەوە لە چیەوە هاتوە؟ شتێک کە بە چاو ببینرێ کە بەچاو تۆ بینیت بۆت یەکلایی بوەوە ئەو شتە سورە سپیە سەوزە مۆرە وە وەسف و سیفەتەکانی چۆن جێگیرە ئینجا ئەوکاتە تۆ شاهێدومانی لەسەر دەدەی بە مەعنای بەچاو بینیت لەلات دەبێتە شتێکی یەقینی دڵنیاکار ئینجا لە دڵت جێگیری دەکەی بە زمانیش دانی پێدا دەهێنی، ئێ باشە (لا إله إلا الله) شتێکی مەعنەویە زانایان دەفەرمون چۆن دەشێ و دەگونجێ کە ئەنەهو بڵێین بەچاو بینراوە؟ لەبەر حەقیقەت و ڕاستیەکەی بەهێزیەکەی کە ئەنەهو وا دانراوە الله تعالى ئەوەی بۆ بەکارهێناوە و پێغەمبەریش (ﷺ) بە چاو بینراوە و یەقینین ئێمە دڵنیاین لەوەی کە (لا إله إلا الله) هیچ پەرستراوێکی حەق نیە جگە لە الله لەبەر ئەوەشە ئەو وشەی شەهادە و ئەشهەدو بەکاردەهێنرێ بۆ (لا إله إلا الله) و وشەی تەوحید و الله بەیەکگرتن -جل شئنە-.

جا ئەوە سەرەتای دەرگای چونە ناو ئیسلامیشە، چونە ناو ئیسلام دیارە بە (أشهد أن لا إله إلا الله) دەبێ وە کەلیمەی تەوحیدی پێ دەگوترێ وشەیەکی یەکجار گرنگە، وە چیش دەگەیەنێ دەبێ ئێمە لە پێناسەی (لا إله إلا الله) وشەی حەقی بەگەڵ بخەین ئەگینا ئیلاە زۆرن ئیلاهی پڕوپوچ و بێ بناغە کە بە ناحەق ناویان لێنراوە و دەپەرسترێن لە بت سەنەمەکان لە زۆربەی سەردەم و کاتەکان ئەوانە ژمارەیان زۆرە، بەڵام ئیلاهی حەق کە تەنها ئەو شایستەی پەرستن بێ یەکە و تاکە کە الله یە -جل شئنە- کەواتە دەبێ بڵێین (لا

إله بحق إلا الله)، ئەگەر بڵێین (لا إله في الوجود) یان (موجود إلا الله) واتاکەی ڕاست و دروست نایە لەبەر ئەوەی ئیلاهە پڕوپوچ و پوچەڵەکان زۆرن مەوجودن هەن دەپەرسترێن بێجگە لە الله تعالى بت و سەنەمەکان، بەڵام ئەگەر گوتمان (لا إله بحق إلا الله) ئەو کاتە مانایەکەی ڕاست دێت یەعنی هیچ پەرستراوێکی حەق نیە جگە لە الله، جا (إلا الله) (الله) -جل شئنه- مانای ئەوە دەگەیەنێ تەنها ئەو شایستەی پەرستنە.

عیبادەت چیە؟ عیبادەت ئەوەیە وەکو ابن القيم الجوزية دەفەرموێ: (غاية الحب مع غاية الذل[1]) واتە ئەوپەڕی خۆشەویستی لەگەڵ ئەوپەڕی خۆ بەکەم زانین بەرامبەر زاتی الله -جل شئنه-، ئەوانە ڕوکنەکانی عیبادەتە و عیبادەتێکی تەواوت کردوە،

کەواتە عیبادەت خاص و عامی هەیە، بە مانایە خاصەکەشی ئەو شتانە ئەو ڕوکن و عیبادەتانە دەگرێتەوە الله بۆ ئێمەی داناوە وەکو (نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج و...) ئەوانە عیبادەتی خواییین بەمەعنایە خاص و تایبەتیەکەیە، بە مەعنایە گشتی و فراوانیەکەشی ابن تيمية چاکترین پێناسەی کردوە لە پەرتوکە زۆر نایابەکەی کە بە ناوی (العبودية)یە دەفەرموێ: (اسم جامع لكل ما يحبه الله ويرضاه من الأقوال والأعمال الظاهرة والباطنة[2]) واتە عیبادەت بریتیە لەو ناوە کۆکەرەوەی بۆ هەموو ئەو شتانەی الله تعالى خۆشی دەوێن و پێی ڕازییە لە قسە و گوتنەکان وە لە عەمەل و کردارەکان ئەوانەی زاهیر و ڕواڵەتن وە ئەوانەی باطین و پەنهانن، کەواتە بەو واتایەی هەموو ژیان و شتەکان لە ژیانتدا هەموو هەڵسوکەوتەکان هەموو قسە و گوتنەکان دەتوانی تۆ بیکەیتە عیبادەت بە مەرجی ئەوەی نیەتی دڵی وەگەڵ بخەی، دەتوانی ئاو خواردنەوەت بکەیتە عیبادەت بە نیەتی ئەوە بیخۆیتەوە هەتا وزە و تاقەت و توانا پەیدا بکەی و بژی تا کڕنۆش بەری بۆ الله تعالى.

[1] كتاب الداء والدواء (الجواب الكافي) ط عطاءات العلم، ص: ٣١٥.
[2] العبودية لشيخ الإسلام ابن تيمية ص ٨.

جا کەواتە عیبادەت ئەو کاتە دڵیش دەگرێتەوە زمانیش دەگرێتەوە وە ئەندامەکانی لاشەشت دەگرێتەوە، واتە ئەو کار و کردەوانەی ناو دڵ لە ئیخلاسەوە بیگرە تەوەکول و پشت بەستان بە الله تعالی وە ڕەجا و ئومێد بون بە الله تعالی و بە بەخششەکانی ئینجا ترسان لە الله تعالی کە ئەوانە پێیان دەگوترێ کرداره دڵیەکان، ئینجا کردارەکانی زمانیش دەگرێتەوە ئەوکات وەکو قسەکردن و زیکر و یادی الله تعالی ئینجا کردارەکانی ئەندامەکانی لاشەشت دەگرێتەوە وەکو ئەوانەی بە دەست دەکرێ و وە بە قاچ و پێ دەکرێ دەتوانین هەموی دەتوانی بکەیتە عیبادەت و عیبادەتن.

ئینجا فەرموی (وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ) تەئکید کردنەوەیە (وَحْدَهُ) بۆ (إِلَّا اللَّهُ) یەعنی تەئکیدی دەکەمەوە کە الله تعالی تاک و تەنهایە هەر ئەوشایستەی پەرستنە، (لَا شَرِيكَ لَهُ) تەئکیدکردنەوەیە و دڵنیاکارە بۆ (لَّا إِلَهَ) کە هیچ پەرستراوێکی حەق نیە ڕەتکردنەوەی هەموو طاغوتەکان و ئەندادەکان و ئەڕبابەکان و ئیلاهەکان کە ناحەقن و بت و سەنەمەکان (لَا شَرِيكَ لَهُ) ئەوەمان بۆ تەئکید دەکاتەوە.

(إِقْرَارًا بِهِ وَتَوْحِيدًا) (إقراراً) لێرەدا مەصدەرە مەفعولی موتڵەقە بە مانای ئەوە دێت ئەو ئیسم مەصدەرە کە بەکار هاتوە بۆ تەئکید کردنەوەی (أَشْهَدُ)ی‌ە، چونکە (أَشْهَدُ) دانپێداهێنانی تێدایە واتە دوبارە تەئکیدی دەکەمەوە کە من شاهێدی دەدەم و داندەنێم بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی حەق نیە جگە لە الله -جل شئنه-، (وَتَوْحِيدًا) دوبارە ئەویشیان تەئکید کردنەوەیە مەصدەرە بەکارهاتوە بۆ (إِلَّا اللَّهُ) یەعنی الله بەیەکگرتن -جل شئنه- کە بەکاری هێناوە ئەو دانەرە بەڕێزە -رحمه الله-.

جا تەوحیدیش مانایە سەرەکی و گشتیەکەی بەوە دێت الله تعالی بەیەک بگری، لە هەموو خاڵ و سیفەتەکانی تایبەتە، وە بە مانایە جۆرەیەکانیشی بەو مانایە دێ کە زانایان دەفەرمون سێ جۆرە تەوحید: (توحید الربوبیة، توحید الألوهیة، توحید الأسماء والصفات)، کە دەگەینە سەری (إن شاء الله) بە درێژی لە شوێنەکانی خۆی باسی دەکەین.

ئەو تەوحیدانەش بەڵگەمان لەسەری ئەوەیە بە ئیستیقراء لە کۆنەوە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە هەڵیان هێنجاوە لە ئایەتەکانی قورئانی ئەوە نەبێ شتێکی داهێنراوی ابن تیمیة بێ ئیمامی تەبەری و وە لەپێش ئەوانیشەوە و لەپاش ئەوانیشەوە ئەو وتانەیان فەرموە و تەوحید و الله بەیەکگرتنیان ئاوا دابەش کردوە بۆ سێ بەش، دەڵێن چەند ورد دەبیتەوە لە ئایەتەکانی قورئانی وە لە فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) الله بەیەکگرتن لەو سێ جۆرە خۆی دەنوێنێ.

جا (لا إِلَهَ إِلَّا اللَّه) دیارە چەندین هەڵوێستەی دەوێ لەسەری بکرێ یەکەمیان ئەو وشەیە ناگونجێ تۆ بڵێی سودم پێ دەگەیەنێ تەنها بەزمان بگوترێ، زۆرکەس هەیە (لا إله الا الله)ی لە ژمارە نایە ئەوەندە زۆر دەیڵێ بەڵام چونکە مەرجەکانی لێ ناهێتەجێ تەواو لە مانای (لا إله الا الله) نەگەیشتوە سودیشی پێ ناگا چونکە (لا إله الا الله) لەپێناو چی ڕەوانەکراوە و ناردراوە؟ لە هەموو وشە و زکرەکان گەورەترە لەپێناو ئەوەی کە تۆ پێی دەبیتە خاوەنی تەوحید پێی دەبیتە خاوەنی الله بەیەکگرتن -جل شئنە- ڕەتکردنەوەی هەموو شیرک و هاوبەشیەکانە وەسەلماندن و جێگیرکردنی خوایەتی الله یە -جل شئنە-.

کەواتە دەبێ بە واتاکانیەوە تێی بگەین چونکە (لا إله الا الله) چەند مەرجێکی هەیە هەندێک لە زانایان کۆیدەکەنەوە لە حەوت مەرج هەندێک لە هەشت مەرج ئەگەر ئەو مەرجانەی لێ نەیەتەجێ سودی نابێ:

یەکەم مەرجی ئەوەیە (لا إله الا الله) (العلم المنافي للجهل) واتا علمو زانست و زانیاری بون بە (لا إله الا الله) ئەو علیم و زانیاریەی کە جەهل و نەزانین ڕەت دەکاتەوە، بەڵگەش ئەوەیە کە الله تعالى دەفەرموێتە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ [محمد: ١٩] واتە: بزانە و شارەزابە و عیلمت هەبێ ئەی موحەممەد (ﷺ) کە هیچ پەرستراوێکی حەق

نیە جگە لە الله، کەواتە ئەوانەی عیلمیان پێی نیە و تەنها بە زمان دەیلێن سود و کەڵکیان پێ ناگەیەنێ ئەو (لا إله إلا الله)یە.

وە لە پاشان مەرجی دووەمی دەبێ یەقینیان هەبێ یەعنی دڵنیابن لەگەڵ (لا إله إلا الله)یەکە (الیقین المنافي للشك) ئەو یەقینەی کە گومان ڕەت بکاتەوە یەعنی تۆ دڵنیابی سەدا سەد هیچ بۆشاییەک نەمابێ لەناو دڵتدا بۆ گومان لە (لا إله إلا الله) واتە بە دڵنیاییەوە تۆ (لا إله إلا الله)ت قبوڵ بێ و وەریبگری ئەوە ئەو کاتە تۆ خاوەنی تەوحیدی (لا إله الا الله) تێگەیشتوی مەرجی دووەمت هێناوەتەجێ، ئەگەرنا (خوا نە خواستە) کەمترین گومان دەتخاتە بازنەی مونافقایەتی (پەنا بە خوای رب العالمین)،کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «أشهد أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله، لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما إلا دخل الجنة[1]» دەفەرموێ شاهێدومانیدان بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی حەق نیە جگە لە الله، وە شاهێدومانیدان بەوەی کە من پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ڕەسول و ڕەوانەکراوی اللهم، هیچ کەسێک نیە بەو وشە و شاهێدومانیانەوە بگاتە خزمەت الله تعالی بەبێ شک و گومان بێ لە دڵیەوە و یەقینی هەبێ ئیلا پێیوە دەچێتە بەهەشت.

وە مەرجی سێیەم بۆ (لا إله الا الله) (الإخلاص)ە یەعنی یەکلا بونەوە (المنافي للشرك) واتە ئەو ئیخلاص و یەکلابونەوەی کە شیرک و هاوبەشی ڕەتبکاتەوە، چونکە هەندێ خەڵک هەیە عیلمی هەیە بە (لا إله إلا الله) یەقینیشە بەڵام تەنها بۆ اللهی نیە شتی تریشی وەگەڵ دەخا خاتری شتی تریشی لەگەڵدا دەبێ، ئەو کاتە ئەوە قبوڵ نیە لەلای الله تعالی چونکە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ [البینة: ٥] وە پێغەمبەریش دەفەرموێ (ﷺ): «مَن قالَ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، خالِصًا مِن قَلْبِهِ، أوْ نَفْسِهِ» ئینجا دەفەرموێ «دخل الجنة[2]».

[1] أخرجه مسلم برقم (٢٧)- ٤٤ في الإيمان، باب: الدليل أن من مات على التوحيد دخل الجنة قطعا، عن أبي هريرة رضي الله عنه.

[2] صحيح البخاري (٦٥٧٠)، سنن ابن ماجه (٤٣٠٧)، مسند أحمد (٨٠٧٠) (٨٨٥٨) (١٠٧١٣).

وە مەرجی چوارەمیان (الصدق) ڕاستگۆیی لەگەڵ (لا إله إلا الله) (المنافي للكذب) واتە ئەوەی درۆ ڕەتدەکاتەوە ئەو بابەتە ڕاستگۆییە چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «مَا مِنْ أَحد يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ، إِلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ[1]» هیچ کەسێک نیە شاهێدومانی بهێنێ بەوەی هیچ پەرستراوێکی حەق نیە جگە لە الله وە دڵنیابێ لەوە، وە شاهێدومانیش بهێنێ کە موحەمەد (ﷺ) ڕاوانەکراوی اللەیە بەڕاستی لە دڵیەوە ئەو شاهێدومانیانە بهێنێ ئیلا الله تعالى حەرامی دەکا ئەو کەسە بچێتە ئاگری دۆزەخ.

وە مەرجی پێنجەمیان لەگەڵ (لا إله الا الله) ئەو کاتە سودی بۆمان دەبێ دەبێ خۆشەویستی لەگەڵدابێ (المحبة المنافية للكره والبغض) واتە تۆ وا (لا إله إلا الله)یەکەت خۆش بوێ و الله تعالى ت خۆشبوێ بە هیچ نەوعێک ڕق لێبونەوەی لەگەڵدا نەبێ بە هیچ نەوعێک ئەوەی لەگەڵدا نەبێ کە بیکەڕهێنی و خۆشت نەوێ و ڕقی لەگەڵدابێ، ئەگەرنا الله تعالى عیبادەت ئەگەر لەوپەڕی خۆشەویستی نەبێ وە لەوپەڕی خۆزەلیلکردن نەبێ ڕوکنەکانی عیبادەتی لێ نایەتەجێ وە ئەو کاتە لێت قبوڵ نابێ.

وە مەرجی شەشەمیان (الانقياد المنافي للتردد أو التكبر) دەبێ تۆ ملکەچ و دڵ کەچ بی بۆ (لا إله إلا الله) ئەو نەوعە ملکەچی و دڵ کەچیە کە ئەوە ڕەتبکاتەوە خۆت بەزل بزانی وە موتەکبیربی بەرامبەر بە (لا إله إلا الله) یان تەڕەددودت نەمێنێت دوو دڵی دەستێکت لەپاش بێ یەکت لەپێش بێ ئەگەرنا الله تعالى لێت قبوڵ ناکا.

وە مەرجی کۆتا کە حەوتەمە ئەویش (القبول المنافي للرد) دەبێ تۆ (لا إله إلا الله) وەربگری بە دڵێکی فراوانەوە وە ڕەتی نەکەیتەوە ئەو کاتە (لا إله إلا الله) وەرگیراوە لەلات، الله تعالى ش ئەو شاهێدیەی بۆخۆیداوە گەورەترین شاهێدیە کە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ

[1] صحيح البخاري (١٢٨) صحيح مسلم (٣٢)، مسند أحمد (١٢٣٨٤) (١٢٧٨٨).

الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ [آل عمران: ١٨] کەواتە شاهێدیدا الله تعالى بۆخۆی کە گەورەترین شاهێدییە دەفەرموێت هیچ پەرستراوێک حەق نیە جگە لە خۆم وە فریشتەکانیش ئەو شاهێدیەیاندا وە خاوەن عیلم و زانستەکانیش ئەو شاهێدیە دەدەن، ئەوە شاهێدیەکی تەواوە کە هیچ پەرستراوێکی حەق نیە جگە لە الله هەر اللەیە -جل شئنە- عەزیزە واتە زاڵە حەکیمە کار لەجێیە.

ئەو شاهێدی دانە دیارە چەند پلە و پایە و مەرتەبەیەکی هەیە زانایان دەفەرمون (شاهێدیدان بە لا إله إلا الله):

یەکەمیان دەبێ عیلم و مەعریفەتی لەگەڵدابێ ئەوکاتە شاهێدی دانەکەت دروست دەبێ بەبێ علم نابێ.

وە دوەمیان دەبێ بەزمانیش دانی پێدابێنی و بێتە سەر زمانت ئەوە نەبێ هەر لە دڵت بیهێڵیتەوە و هەر لە خەیاڵتدابێ.

وە سێیەمیان دەبێ ئەو شتەی کە هاتە سەر زمانیشت ڕونی بکەیتەوە بۆ خەڵک مەبەستت لێی چیە و تەواو تێیگەیشتبی.

وە چوارەمیشیان ئەوەی تێیدایە (لا إله إلا الله) و داواکارییە لە (لا إله إلا الله) واتە فەرمانەکان و کاکڵ و ناوەڕۆکی جێبەجێ بکەی لە ژیانی ڕۆژانەت.

**دانـنان بە ڕیسالەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):**

وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ تَسْلِيمًا مَزِيدًا.

---

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- دەفەرموێ: (وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وعلى آله وَسَلَّمَ تَسْلِيمًا مَزِيدًا) دەفەرموێ وە شاهێدیش دەدەم واتە لە دڵمدا جێگری دەکەم بەزمانیش دانی پێدا دەهێنم بێگومان موحەمەد بەندەی اللەیە وە ڕەوانەکراو و ڕەسولی اللەیە، سەڵاتی اللەی لەسەربێ وە لەسەر ئالی ئەو بێ وە لەسەر سەحبی ئەوبێ،

ئێستا دێین یەک یەک ئەو وشانە لەبەر ئەوە هەر بە عەرەبیەکان دەیڵێینەوە پێناسەیان دەکەین وە دەیانکەینەوە کوردی، وە سەلامەت بن بە سەلامەت بونێکی زۆر.

(وَأَشْهَدُ) گوتمان شاهێدومانی دوبارە لە دڵەوەیە و بەزمانیش دەبێ بگوترێ کە ئەنەهو بە چاو بینیوتە وە بێگومان بی لەوەی کە موحەممەد (ﷺ) بەندەی اللەیە وە ڕەسولی اللەشە، بەندایەتی گەورەترە لە ڕەسولایەتی لەبەر ئەوەیە ەندایەتیان بە پێش خستوە ئەو زانا بەڕێزە لێرە وەکو ئیقتیدائەن بە قورئانی پیرۆزیش کە اللە تعالى دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً﴾ واتە: ﴿بِعَبْدِهِ﴾ عەبد مەقامێکی ئێجگار گەورەیە پێغەمبەر (ﷺ) لەڕوی بەندایەتی بۆ اللە تعالى لەوپەڕی تەواوی بوە هیچ مرۆڤێک نەبوە بگاتە پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) لە ملکەچی و خۆشەویستی و عیبادەت کردنی بۆ اللە تعالى.

ئینجا لەبەرچی عەبد بە پێشیش دەخسترێ زۆر جاران وە لەبەر ئەوەی هەتا ئێمە بزانین فێڵمان لێ نەکرێ چاو نەکەین لە دیانەکان و جولەکەکان سیفەتی خوایەتی (پەنا بە خوای رب العالمین) بدەینە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوە گەورە بوە خۆشەویست بوە لەلای اللە تعالى لەوپەڕی عیبادەت عیبادەتی اللەی کردوە و یەکێکە لە بەندە هەرە ڕاستەقینەکانی اللە تعالى ئەوە نەبێ سیفەتی خوایەتی هەبێ (پەنا بە خوای رب العالمین)، وە ئینجا لەگەڵ ئەوەدا عەبدێکی زۆر تەواوی اللە بوە پێغەمبەر (ﷺ) وە ڕەسولی اللەش بوە واتە اللە تعالى ڕەوانەی کردوە وەکو ڕەسول پەیامێکی بۆ ناردوە فەرمانیشی پێکردوە بڵاوی بکاتەوە، ئەو پەیامەی پێغەمبەریش (ﷺ) بۆ هەموو جیهانیانە بە تێکڕا لە مرۆڤ و جنۆکەکان.

ئینجا فەرموی (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ) سەڵات لە اللەوە زانایان زانایان ئیختیلاف و جیاوازیان هەیە بە چەند مانا دێ:

هەندێكیان پێیان وایە بە مانای ڕەحمەت دێ كە دەڵێی سەڵات لە اللەوە مەعنای ڕەحمی الله داوا دەكەی تۆ ئەی الله تعالی ڕەحمی خۆت بنێرە بۆسەر پێغەمبەر (ﷺ)، كە ئەو بۆچونە لەلای ژمارەیەك لە زانایانی ئەهلی تەحقیق لاوازە.

بەڵام ئەوەیان سەحیح و دروستە لەلای شێخ موحەممەد خەلیل هەڕاس وە شێخ عبد الله بن جبرين وە محمد بن صالح العثيمين وە ژمارەیەكی تر لە زانایان دەفەرمون ئەوەیان ڕاست و دروستە بۆ مانای سەڵات كە ئەبو عالیە ڕیوایەت كراوە لێی كە گەورە تابیعی بوە یەكێك بوە لە موفەسیرە زۆر بەڕێزەكان و گەورە تابیعیەكانی دوای سەحابە هاتون ئەبو عالیە فەرمویەتی: «الصلاة من الله ثناؤه سبحانه وتعالى في الملأ الأعلى يعني ثناؤه لمن يصلي عليه [١]» واتە پێدا هەڵگوتن و سوپاس و ستایش كردنی اللەیە بۆ ئەو كەسەی كە ئەو سەڵاتەی لەسەر دەدرێ لەنێو فریشتەكان لە (الملأ الأعلى) ئەوەیان ڕاست و دروستترە ئەو زانایانەی كە ناومان ژماردن و هێنامان دەفەرمون لە پێناسەی سەڵات لە اللەوە -جل شئنه-.

كەواتە بەو مانایە چی لێ دێ لێرە سەڵات كە ابن تيمية فەرمویەتی بۆسەر پێغەمبەر؟ (ﷺ) واتە خوایە داوات لێ دەكەین بە پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) هەڵبڵێی و ثەنائی بكەی و مەتحی بكەی لەنێو فریشتەكان.

وە لە پاشان فەرموی (وعلى آله)، (آل)یش دیارە دوو واتا دەگەیەنێ (مانایەكی گشتی هەیە، وە مانایەكی تایبەتی هەیە).

مانایە تایبەتیەكەی ئەوەیە كە (آل) یانی (أهل البيت)ی پێغەمبەر (ﷺ) واتە هاوسەرەكانی وە منداڵەكانی ئیختیلاف و جیاوازیش هەیە لە سنور دانان و دیاریكردنی كێ (أهل البيت)ی پێغەمبەرە (ﷺ) لە نزیكەكانی.

[١] صحيح البخاري [كتاب التفسير] سورة الأحزاب. وقال مجاهد: صياصيهم: قصورهم. باب: قوله: إن الله وملائكته يصلون على النبي.

بەڵام مانایە گشتیەکەی بەو مانایە دێ یانی شوێنکەوتوانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانەی شوێنی پێغەمبەر دەکەون (ﷺ) بڕوایان پێی هێناوە هەتا ڕۆژی دوایی، ئەوکاتە سەحابەکانیش دەگرێتەوە وە (أهل بيت)ی پێغەمبەریشدەگرێتەوە (ﷺ) وە ئێمەش دەگرێتەوە و هەتا قیامەتیش کێ بڕوا بێنێ بە پێغەمبەر (ﷺ) شوێنیکەوێ دەیگرێتەوە.

جا زانایانی ئەهلی تەحقیق هەندێکیان دەفەرمون ئەگەر هاتوو (آل) بە تەنها هات ئەوکاتە باسی سەحابە نەکرا باسی (أهل البيت)ی پێغەمبەر نەکرا (ﷺ) بە تایبەتی لە سەڵاتەکان وە، باسی تابیعین و ئەوانە نەکرا بە مەعنای ئەتباع لێکی دەینەوە واتە شوێنکەوتوەکان باشتر و ئەولاترە ئەوکات هاوەڵان و سەحابەکانیش دەگرێتەوە -رضي الله عنهم- وە تابیعینیش دەگرێتەوە و تابیعی تابیعینیش دەگرێتەوە و هەتا دەگاتە سەر ئێمە و هەتا قیامەتیش شوێنکەوتوانی پێغەمبەر (ﷺ) لە بڕواداران دەگرێتەوە کەواتە دەڵێن ئەو فراوانتر و چاکترێکە.

بەڵگەشیان لەسەر ئەوەی کە (آل) بە مەعنای ئەتباع دێ ئەوەتا الله تعالى -جل شئنه- سەبارەت بە فیرعەون دەفەرموێ: ﴿أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾ [غافر: ٤٦] دەفەرموێ ئالی فیرعەون بخەنە ناو بەئێشترین و ئازارترین و توند و تیژترین عەزاب، ئالی فیرعەون لەوێ موفەسیرین دەفەرمون بە مەعنای ئەتباعی فیرعەون دێ ئەوانەی شوێنکەوتەی فیرعەون بونە کەواتە (آل) بە مەعنای ئەتباع و شوێنکەوتەش دێ.

یان پێغەمبەر (ﷺ) لەو فەرمودەی لەلای هەندێک لە زانایان یەک لەوانە ئەلبانیشە لە فەرمودەناسان دەفەرمون زەعیف و لاوازە هەندێکیش دەفەرمون ئیشی پێ دەکرێ گوایە پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): «سلمان منا آل البيت[1]» کەواتە سەلمان خۆ (أهل البيت) بە

[1] **أخرجه الحاكم في المستدرك (٣/ ٥٩٨) وقال الذهبي في التلخيص: سنده ضعيف، وضعفه الألباني وهو في ضعيف الجامع رقم (٣٢٧٢).**

مەعنای ئەوە نەبوە کە خزمی نزیکی پێغەمبەرە (ﷺ) لە (أهل البيت)ە بەو مانایەی شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی پێغەمبەر بوە (ﷺ).

وە لە پاشان دەفەرموێ (وَصَحْبِهِ) واتە سەڵاتەکە و پێدا هەڵگوتنەکە ئەی الله تعالی بۆسەر پێغەمبەربێ (ﷺ) لەناو فریشتەکان بۆ ئالی پێغەمبەربێ واتە (یان خزم و ئال و بەیتی پێغەمبەر (ﷺ) نزیکەکانی لە بڕواداران یان شوێنکەوتوانی پێغەمبەر (ﷺ)) (وَصَحْبِهِ)، ئەگەر بڵێین (آل) بە مەعنای ئەتباعە (وَصَحْبِهِ) دەڵێین عەتفی خاسە لەسەر عام چونکە ئەتباع سەحابەکانیش دەگرێتەوە ئینجا جارێکی تر سەحابەکان لەبەر پلە و پایەیان دوبارە ناومان هێنانەوە بۆ ئەوەی دڵنیابین لەوەی سەڵاتەکە هەتا ئەوانیش بگرێتەوە.

صەحب کێن (ئەصحابی پێغەمبەر (ﷺ))؟ صەحب و ئەصحاب پێناسەیان ئەوەیە: (من لقي النبي (ﷺ) وآمن به ومات على الإسلام[1]) هەرکەسێک بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتبێ (ﷺ) بڕوای بە پێغەمبەر هێنابێ (ﷺ) لەسەر ئیسلام مردبێ ئا ئەوەیان سەحابەیە ئەوە پێناسەیەتی، بۆچونی ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە بۆ پێناسەی سەحابەکان چیە؟ (من لقي النبي (ﷺ) وآمن به ومات على الإسلام) بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتبێ (ﷺ) بڕواشی پێ هێنابێ وە لەسەر ئیسلامیش مردبێ.

بۆچی ئەو سێ قەیدە؟ چونکە هەیە بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتوە (ﷺ) ئیمانی پێ نەهێناوە وەکو ئەبو جەهل، ئەبو جەهل سەحابە نیە دوژمنی پێغەمبەر بوو (ﷺ) فیرعەونی ئومەتی پێغەمبەر بوە (ﷺ) دوژمنی ئومەتی پێغەمبەر بوە (ﷺ) وەکو پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ)، لە پاشان (وآمن به) ئەبو جەهل و کافر و موشریکەکانی لێ بردە دەرەوە ئەوان بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتبون (ﷺ) پێغەمبەریان بینیبوو (ﷺ) بەس ئیمانیان پێ نەهێنابوو سەحابە نەبونە، وە لە پاشان دەفەرموێ (ومات على الإسلام) هەشبوە بە خزمەت پێغەمبەر گەشتوە

[1] نخبة الفكر - ت القاسم [ابن حجر العسقلاني] ص: ٦٣.

(ﷺ) وە لە پاشان ئیمانی پێ هێناوە بەس لەسەر ئیسلام نەمردوە دوایە مورتەد بوەتەوە ئەوانیش سەحابە نین.

جا لێرەدا لەطیفەیەکی خۆش هەیە ئیمامی زەهەبی باسی لێوە دەکا، ئایە سەحابەکان هەمویان وەفاتیان کردوە و مردون ئەوانەی ئەو سێ قەید و مەرجەیان لێ بێتەجێ؟ نەخێر هەمویان نەمردون، سەحابەیەک ئێستا ماوە ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ، ئەویش کێیە؟ عیسا پێغەمبەرە (ﷺ)، چونکە عیسا پێغەمبەر (ﷺ) هەم پێغەمبەری اللەیە هەم یەکێکیشە لە سەحابەکانی پێغەمبەری خۆمان موحەمەد (ﷺ)، ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ هەر سێ قەید و مەرجەکانی لێ دێتەجێ (من لقي النبي (ﷺ)) عیسا لە شەوی ئیسڕا و میعراج بە خزمەت پێغەمبەر گەیشت (ﷺ)، وە لە پاشان (وآمن به) عیسا پێش ئەوەی پێغەمبەربێ (ﷺ) ئیمان و بڕوای پێ هێنابوو (ومات على الإسلام) بە دڵنیاییەوە عیسا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئیسلامیش دەمرێ و وەفات دەکا وە کە دەشگەڕێتەوە سەر ڕوی زەوی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە حوکم دەکا و ئیش دەکا بە ئیسلام و بە قورئان ئیش ناکا بە ئینجیل و بە تەوڕات، کەواتە عیسا پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ یەکێکە لەو سەحابانەی کۆتا سەحابەیە لە سەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئێستا لە ژیاندایە و هەڵکێشراوە بەرەو ئاسمان و جارێکی تر دێتەوە سەر ڕوی زەوی و حوکم دەکا بە ئیسلام و بە قورئان.

وە لە پاشان فەرموی (تَسْلِيمًا مَزِيدًا) ئەوەش تەئکید کردنەوەیە ابن تیمیە -رحمه الله- بۆ ئەوانەی پێش خۆی واتە سەڵات و سەلامەکە سەڵاتبێ و سەلامەتیشی لەگەڵدابێ لە هەموو بەڵا و موسیبەتێک بپارێزرێن لە هی دونیا لە هەموو ناخۆشی و زەحمەتیەک وە لە هی قیامەتیش وە بە تەئکید و دڵنیاییەوە تەئکیدی کردوەتەوە و وە هەر لە زیاد بونیشدابێ.

## کۆمەڵی ڕزگاربوو:

**أَمَّا بَعْدُ، فَهَذَا اعْتِقَادُ الْفِرْقَةِ النَّاجِيَةِ الْمَنْصُورَةِ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ: أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ.**

جا لە پاشان دەفەرموێ (أَمَّا بَعْدُ)، وشەی (أَمَّا بَعْدُ) بەکار دەهێنرێ زۆرجار وەکو سونەتیشە (وبَعْدُ)ش بەکاردەهێنرێ (أَمَّا بَعْدُ) بەکاردەهێنرێ، (أَمَّا بَعْدُ) سونەتی ترە، (وبَعْدُ) بە واو بەبێ ئەما سونەتی نیە، چونکە نەبیستراوە و نەبینراوە لە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە سوپاس و ستایشی الله تعالی ی کردبێ و سەڵات و سەلامی بۆسەر خۆی ڕەوانەکردبێ پێغەمبەر (ﷺ) (وبَعْدُ)ی بەکارهێنابێ ئەگەر لە زمانەوانیدا ڕاستیش بێ و مانای هەبێ، بەس (أَمَّا بَعْدُ)ی بەکارهێناوە پێغەمبەر (ﷺ)، جا ئێمەش با ئیقتیدا بە پێغەمبەر بکەین (ﷺ) هەموو جارێک (أَمَّا بَعْدُ) بەکار بێنین لەبری (وبَعْدُ).

(أَمَّا بَعْدُ) مانای چیە؟ یەعنی (مهما يكن من شيء) واتە ڕستەیەک لە شوێنی ڕستەیەکی شەرتیە دانیشتوە، بە مەعنای ئەوە دێ یەعنی ئەوەی ڕابردو هەرچی هەبێ ئێمە مەبەستمان ئەوەی داهاتوە یەعنی لەپاش ئەوەی کە گوتمان (بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ) حەمد و سوپاس و ستایشی الله تعالی مان کرد سەڵات و سەلامان نارد بۆسەر پێغەمبەر (ﷺ) و ئالی پێغەمبەر (ﷺ) و سەحابە و هەتا ڕۆژی دوایی بۆ ئەتباعی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانە هەموی ڕۆیشت ئەگەر پەیوەندیان بەدوای خۆشیانەوە نەبێ ئینجا لەمەودوا ئەوەی مەبەستە دەیڵێین و دەیکەین.

جا دەفەرموێ (فَهَذَا اعْتِقَادُ الْفِرْقَةِ النَّاجِيَةِ الْمَنْصُورَةِ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ: أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ) دەفەرموێ ئەوە ئاماژە دەکا (هَذَا)، (هَذَا) لە زمانی عەرەبیدا بۆ شتێکی مەحسوس و بەرجەستەیە هەستی پێبکرێ لەبەرچاوان بێ لەبەردەستان بێ دەستی لێبدرێ.

ئێ جا باشە زانایان دەفەرمون بۆ هەموو ئەو موقەدیمانەی زانایان لە پەرتوکەکانیان دەینوسن خۆ هێشتا ئەگەر نە نوسرابێ پەرتوکەکە شتەکە مەحسوس نەبوە چۆن دەشێ و دەگونجێ (هَذَا)ی بۆ بەکار بەێنرێ؟ جا لێرەدا زانایان سێ بیروبۆچون

دەخەنە ڕوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە تا هاذایەکانی موقەدیمە و پێشەکیەکانی پەرتوکەکانی زانایانی ئیسلام ڕاست و دروست مانای بێ.

یەکەم دەڵێین یان ئاماژەیان کردوە (بما في ذهنهم) دانەرەکە ئاماژەی کردوە بۆ ئەوەی لەناو مێشکی هەبوە چونکە لەناو مێشکی ئەو مەحسوس بوە ئەو هەستی پێکردوە یانی کە دەڵێ (فَهَذَا اعْتِقَادُ الْفِرْقَةِ النَّاجِيَةِ) واتە ئەوەی لە مێشکی من کۆبوەتەوە و هەیە ئەوەیە بیروبڕوای کۆمەڵی ڕزگاربوو.

یان دەفەرمون (هَذَا) بۆ ئەوە بەکار دەهێنرێ بۆ ئەوە بەکار دەهێنرێ لە ئاخیرەوە موقەدیمەکەیان نوسیوە، وەکو ئێستا لەبواری عیلمی و ئەکادیمیەتەوە بەحسی عیلمی باشتر وایە پێشەکیەکەی لە کۆتایی بنوسی ئەوکات کێشە نامێنێ چونکە بونی دەبێ نوسراوەکە ئاماژەی بۆ دەکەی و لەبەر دەستانە و هەستی پێدەکرێ.

یان دەفەرمون بە ئیعتیباری خوێنەرەکان لەدوای ئەوەی کە دانراوەکە دادەنرێ ئێستا بۆ ئێمە هاذایەکە هیچ کێشەی نەماوە چونکە شتێکی مەحسوسە (عقيدة الواسطية) ئەو عەقیدە و بیروبڕوای کۆمەڵی ناجیە ئینجا ئاماژەی پێ دەکرێ، ئەو سێ بۆچونە هەیە (والله أعلم).

جا دەفەرموێ (فَهَذَا اعْتِقَادُ الفِرقَةِ النَّاجِيَةِ) واتە ئەوەی لەو پەرتوکە هاتوە (عقيدة الواسطية) بریتیە لە بیروبڕوای تاقم و کۆمەڵی ڕزگاربوو (المَنْصُورَةِ) سەرخراو (إِلى قِيَامِ السَّاعَةِ) تا بەرپابونی ڕۆژی دوایی (أَهلُ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَةِ) ئەوانە کێن؟ ئەهلی سونە و جەماعەن.

جا با بێین لێکی بدەینەوە ئەو وشانە فیرقەی ناجیە و تائیفەی مەنصورە کێن؟ وە لە پاشان چۆن دەشێ و دەگونجێ بڵێین هەتا ڕۆژی دوایی چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکدا فەرمویەتی قیامەت دانایە بەسەر باشی و خەڵکانێک کە لەسەر ڕوی زەوی مابن تەنها ئەگەر یەک کەسیش بێ بڵێ (الله، الله) لەسەر ڕوی زەوی ئیلا بەسەر خراپاندا دێ، چۆن

دەشێ و دەگونجێ بڵێین ئەوانەش بەردەوام دەبن هەتا ئەو ڕۆژە؟ لە وەڵامدا وەڵامیان هەیە زانایان و ئەوانەی ڕاڤەی (العقيدة الواسطية)یان كردووە.

جا (اعْتِقَادُ) لە عەقیدەوە هاتوە یانی دامەزراندن و گرێدانی دڵ لەسەر شتێک کاتێک تۆ دڵنیابی لێیەوە وە بڕوات پێی هەبێ ئیمانت پێی هەبێ، جا عەقیدە بەو مانایە دێ واتە (التصميم الجازم الذي ينشأ عن التصديق الجازم الذي لا يقبل الشك) واتە ئەو دامەزراندنەی کە جەزم دەکات سەدا سەد هیچ شک و گومان ناهێڵێتەوە بەڕاستدانانی شتەکان هیچ شک و گومان لە دڵدا نەمێنێ بەوە دەگوترێ عەقیدە بیروبڕوا.

ئینجا (الفِرقَةِ النَّاجِيَةِ المَنصُورَةِ إلى قِيَامِ السَّاعَةِ: أَهلُ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَةِ) بە سێ شت ابن تيمية -رحمه الله- ئەو عەقیدە و ئەو کۆمەڵ و تاقمەی وەسفکردوە:

یەکەمیان فەرمویەتی (النَّاجِيَةِ) واتە ڕزگاربونە ئەوانە، ڕزگاربونە لە چی؟ بە مانای ئەوە دێ ڕزگار بونە لە دونیا لە عەقیدەی پوچ و لادراو و بیدەع و خوڕافیات، وە سەرخراون مەنصورن هەتا ڕۆژی دوایی واتە الله تعالى سەریان دەخا پشتیان دەگرێ بەو عەقیدەی خۆیانەوە سەرکەوتونە ئینجا ئەوانە ئەهلی سونە و جەماعەشن یەعنی خاوەنی سونەتی ڕێگا و ڕێبازی پێغەمبەرن (ﷺ) وە کۆبونەتەوە لە دەوری ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ)، جا لە پاشان ناجیە بە مانای ئەوەش دێ لە قیامەتیش ئەوەی خاوەنی ئەو عەقیدەیەبێ ڕزگاری دەبێ لە ئاگری دۆزەخ دەچێتە بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەت، ئینجا لە قیامەتیشدا سەردەخرێن بە مەعنای ئەوەی لە دۆزەخ دور دەخرێنەوە: ﴿فَمَن زُحزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدخِلَ ٱلجَنَّةَ فَقَد فَازَ﴾ [آل عمران: ١٨٥] واتە: بە دڵنیاییەوە ئەوە بردنەوەی سەرکەوتنی ڕاستەقینەی تەواوە لە دۆزەخیان دور دەخاتەوە سەریان دەخا دەیانباتە بەهەشتی پان و بەرین وە لەژێر ئاڵای پێغەمبەر (ﷺ) ئەهلی سونە و جەماعە کۆ دەبنەوە وە لەدوای ئەوەوە دەوەستن، جا ئەوە واتاکانیەتی.

جا (الْفِرْقَةِ) بە کەسری فائەکە واتە ژێری ئەگەر بۆ دابنێیی بە واتای تاقم دێ کۆمەڵ دێ بەڵام لە ژمارە زۆر نەبن، (الفُرقة)با مەعنای کاتێ زەمە دابنێیی لەسەر فائەکە بە مەعنای پەرتەوازەیی دێ.

جا فیرقە لێرە لەبەرچی (الْفِرْقَةِ) بەکاردەهێنرێ بۆ ئەهلی سونە و جەماعە مادەم بە ژمارەی کەم دەگوترێ؟ لەبەر ئەوەی خاوەن عەقیدە پاکەکان لە هەموو سەردەم و کاتەکان تاقم و کۆمەڵی کەمن لە ژمارەوە ئەوەی تەواو یەکلا بوبێتەوە بۆ الله تعالی ئەوەی تەواو لە عەقیدە ساخ و ساف تێگەیشتبێ ئەوانە لە ژمارەدا زۆر نین و کەمن: ﴿وَأَكْثَرُهُمْ لِلحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾ [المؤمنون: ٧٠] الله تعالی دەفەرموێ زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەکان بۆ حەق بۆ عەقیدەی ڕاست و دروست پێیان خۆش نیە و ڕەتی دەکەنەوە کەمن ئەوانەی عەقیدە ڕاست و دروستیان هەبێ کە ئەهلی سونە و جەماعەن.

پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق، لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله تعالى وهم كذلك[١]» دەفەرموێ بەردەوام لا تزال لە زمانی عەرەبی بۆ سیغەیەکی بەردەوامیە یەعنی بەردەوام و بەبێ پچڕان کۆمەڵ و تاقمێک دەمێنن لە ئومەتی من پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ئەوانە ئاشکران و بەردەوامن لەسەر حەق و ڕەوایەتی لەسەر ڕێبازی ڕاستەقینە زەرەر و زیانیان پێ ناگەیەنێ هەر کەسێک پێچەوانەیان بکا و یان بیەوێ زەرەر و زیانیان پێ بگەیەنێ و بە کەمیان بگرێ هەتا ئەمر و فەرمانی الله دەگاتەجێ ئەوانە ئاوا بەردەوام دەبن لەسەر حەق و ڕاستیەتی.

جا ئەو تائیفە و کۆمەڵە کۆمەڵی سەرخراون وەکو زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون یەعنی تائیفەی مەنصورەن، تائیفەی مەنصورە ئەو کۆمەڵەن کە الله تعالی دەیانهێڵێتەوە و لێیان ڕازیە خاوەن عەقیدە و بیروبڕوای ڕاستەقینەن وە ئاڵای ئیسلامیان هەڵگرتوە و وە سیفەتیان ئەوەیە کە عیلمیان پێیە دەربارەی عەقیدە و بیروبڕوا و ئیسلام

[١] صحيح مسلم (١٩٢٠)، سنن أبي داود (٤٢٥٢)، سنن الترمذي (٢٢٢٩).

وە پێداگریشن و بەردەوامن لەسەری، وە لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان دەش فەرمویَ جەنگ و جیهاد و کوشتار و تێکۆشانیش دەکەن لەپێناو ئیسلام، جا ئەو تاقم و کۆمەڵە هەندێک دەفەرمون ئەهلی حەدیسن هەندێک دەفەرمون ئەهلی عیلمن هەندێک لە زانایان دەفەرمون تەنها موجاهید و ئەوانەن کە قیتال و کوشتار دەکەن لەپێناو الله تعالى، بەڵام ئیمامی نەوەوی -رحمه الله- دەفەرمویَ بەڵکو ئەو تاقم و کۆمەڵە مەرج نیە یەک ئاڵایان پێبیَ یان تاقم و کۆمەڵێکی دیاریکراوبن و چەند نەفەرێکبن لە یەک وڵات و شوێندا بژین، بەڵکو دەفەرمیَ هەندێکیان ڕەنگە هەر زیکر و یادی الله تعالى بکەن هەر ئەوەندەیان بۆ بکریَ بەڵام خاوەن عەقیدە و بیروبڕوان لەسەر ئیسلام بەردەوامن بەرگری دەکەن لە ئیسلام جا بە بە قسەش بیَ هەندێکیان خاوەن عیلمن زانستی شەرعی بڵاو دەکەنەوە هەندێکی تریان ڕەنگە هەبن کوشتار و جەنگ و جیهاد بکەن لەپێناو الله تعالى، هەمویان تەواوکەری یەکن و لە کۆتا کاتێک حوکمی ئیسلام دەگەڕێتەوە هەمویان دەگەنەوە یەک و دەبنە کۆمەڵ و جەماعەتێکی گەورە لەسەر زەوی دروست دەکەن[١]، ئەوە بۆچونی ئیمامی نەوەوییە -رحمه الله- ئەوەشیان (والله أعلم) ڕاست و دروستترە لە بۆچونەکانی تر.

لە پاشان پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «وستفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة، قالوا: من هي يا رسول الله؛ قال: الجماعة» لە ڕیوایەتێکی تر فەرموی «من كان على مثل ما أنا عليه اليوم وأصحابي[٢]» گوتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئومەتی من دابەش دەبیَ بەسەر حەفتا و سیَ کۆمەڵ و تاقمە فەرموی هەر هەمویان بۆ ناو ئاگری دۆزەخن ئیلا یەکیان نەبیَ، گوتیان: ئەو تاقمە کێنە ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) کە ناچنە ناو ئاگر؟ فەرموی: ئەوە جەماعەتن (جەماعەت مەبەستی پێی ئەهلی سونە و جەماعەیە). ینجا یان

[١] شرح النووي على مسلم، ج: ١٣ ص: ٦٧.

[٢] وهو حديث حسن صحيح.

ئەوەی من لەسەریم نمونەی ئەوە دەکەن و لەسەر ئەوە دەبن کە ئەمڕۆ من و سەحابەکان چی دەکەین و لەسەرینە.

جا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئایە ئەو تاقمانە کێن کە بۆناو ئاگری دۆزەخن؟ هەندێک دەفەرمون ئەو تاقمانە ئەوانەن کە لە عەقیدەدا پەیدابون (لە خەواریجەوە بیگرە هەتا جەهمیەکان و هەتاوەکو موعتەزیلەکان و...هتد) دەفەرمویٚ ئەوانە هەمویان بۆ ناو ئاگرن و دەیانژمێرن و کۆیان دەکەنەوە و دەیانگەیەننە حەفتا و دوو فیرقە جگە لە فیرقەی ئەهلی سونە و جەماعە، هەندێکیش لە زانایان دەفەرمون نا ئەوانە جگە لە موسڵوانانن واتە لە جولەکەکان و لە نەسڕانیەکان، بەس ئەو بۆچونە لاوازە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی لە ئومەتی من ئەوانە دەبنە ئەوەندە تاقم و کۆمەڵە (خەواریج و موعتەزیلە وئەو بابەتە فیرقانە لە ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) بون جیابونەوە و گەیشتنە ئەوەندە ژمارە و ئەو فیرقانە.

کەواتە ئێمە لەسەرمانە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر بڕۆین (ﷺ) وە سەحابەکان چیان کردوە لە عەقیدە و بیروبڕوا لە پاپەندبون بە سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو ئێمە بکەوینە ئەو بازنەیەوە، واتە ئەوەی عەقیدەی تەواوە ئەگەر کەم و کورتیەکی کەمیشی تێدابیٚ بەڵام اللەی تەواو ناسیبیٚ لە ئەسماء وسیفاتدا بنچینەکانی ئەهلی سونە و جەماعە جێبەجیٚ بکا لە قورئانی پیرۆز وەربگریٚ لە سونەتی سەحیحی پێغەمبەری دڵسۆز وەربگریٚ (ﷺ) لەو بازنانە دەرنەچیٚ ئەگەر تاوان و گوناحی تریشی هەبیٚ ئا ئەوە لەو تاقم و کۆمەڵە حساب دەبیٚ کە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبیٚ الله تعالی لەوانمان حیساب بکا یا ڕەبی.

لە پاشان دەگەینە سەر ئەوەی کیٚ بە ئەهلی سونە و جەماعە لە زانایانی پێشان دانراوە زۆر بە کورتی؟ سەحابەکان هەر هەمویان لەو تاقم و کۆمەڵەن کە ڕزگاربونە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەوانە ڕزگاریان دەبیٚ و دەچنە بەهەشت لە پاشان تابیعین زۆربەی هەرە

زۆریان کەمێکی کەم نەبێ کە بونە موعتەزیلە و خەواریج و هەندێکیان ئەگەرنا زۆربەی هەرە زۆریان لە ئەهلی سونە و جەماعەن زانایان دەفەرمون وە لە پاشان تابیعی تابیعین لە تابیعین کەمتر واتە فیرقەکان زیادیکرد لە سەردەمی تابیعی تابیعین بەڵام ئەوانیش ئەوانەی کە هەبونە زۆرن ژمارەیان بەرامبەر بە فیرقەکانی تر کە لە ئەهلی سونە و جەماعە بونە لەوانە دەیانژمێرن هەر چوار سەر مەزهەبەکە ئەهلی سونە و جەماعە بونە و عەقیدە پاک بونە (ئیمامی شافیعی، ئیمامی ئەبو حەنیفە، ئیمامی مالیک، ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) وە لە پاشان ئەوانەی فەرمودەیان گێڕاوەتەوە (ئیمامی بوخاری، ئیمامی موسلیم، ئیمامی ترمذي، ئیمامی نەسائی، ئیبنو ماجە) ئەوانە هەر هەمویان لەوانە حیساب دەکرێن کە ئەهلی سونە و جەماعەن وە زۆرێکی تریش لە زانایان، هەندێک لە زانایان بۆچونیان وایە دەڵێن ماتۆریدی و ئەشعەریەکانیش لە بازنەی ئەهلی سونە و جەماعەن لەوانە ئیمامی سەفارینی -رحمه الله- ئەو بۆچونەی هەیە دەفەرموێ ئەوانیش لەوە دەرناچن بەس باقی زاناکانی تر دەفەرمون ئەوان لە بازنەی ئەهلی سونە و جەماعەدا نین ئەگەر بێو نزیکترین تاقم و کۆمەڵیشن لە ئەهلی سونە و جەماعە بە تایبەتی ئەشعەریەت (والله أعلم بالصواب).

## شەش ڕوکنەکانی ئیمان:

وَهُوَ الإِيمانُ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ، والإِيمَانِ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ.

جا ابن تیمیة دێتەوە سەر مەتنەکە و دەفەرموێ ئەو عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کە لە ڕابردودا باسمان کرد کە فەرموی ئەوانە فیرقە و تاقمەی ناجیەن و واتە سەرخران وە سەرخراون لەلایەن الله تعالی ئەوانە خاوەن عەقیدەیەکن کە بریتیە لەو عەقیدەیە ئێستا باسی ڕوکنەکانی ئیمان دەکا دەفەرموێ (وَهُوَ الإِيمانُ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ، والإِيمَانِ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ) دەفەرموێ ئەوانە خاوەن ئەو بیروبڕوا و ئیمانەن کە ئیمان و بیروبڕابون بە الله، بە فریشتەکان، بە پەرتوکە ئاسمانیەکان، بە ڕەوانە

کراو و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە بە زیندوبونەوە لە دوای مردن، وە بیروبڕوابون بە قەدەری الله تعالی چ خەیربێ چ شەڕبێ.

جا لێرەوە پێویستە ئێمە هەڵوێستە بکەین و پێناسەی ئیمان بکەین ئینجا لەدوای پێناسەی ئیمان و دیاریکردنی ئیمان لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەچینە سەر ئەوەی بزانین ئایە ئیمان و بڕوابون بە الله چەند خاڵ دەگرێتەوە و مانای چیە.

الإيمان لە زمانەوانیدا بەمەعنای (التَّصْدِيق الْجَازِم) دێ (والإستسلام) دەبێ بەو مانایە بۆی لێک بدەینەوە نەک (التَّصْدِيق)ی ڕوت ەەر بڵێ‌ێن (التَّصْدِيق) و بەس چونکە ئیمان زیاترە لە (التَّصْدِيق) بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لە زمانەوانیش دەبێ ئاوای بۆ لێک بدەینەوە واتە بەڕاستدانانێکی سەدا سەدی وە تەسلیم بونی شتەکان بەوە دەگوترێ ئیمان لە زمانەوانیدا، لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە پێناسەی ئیمان ئەوەیە.

سێ ڕوکنی پێویستە ئیمان لێی بێتەجێ بۆی:

(التصديق بالجنان) هەندێکیش لە زانایان دەفەرمون لەجیاتی (التَّصْدِيق) بگوترێ (الإعتقاد بالجنان) باشترە چونکە (الإعتقاد) فراوانترە و پتەوترە، (التَّصْدِيق) بە مەعنای بەڕاستدانان دێ هەندێک لە کردار و کردەوەکانی دڵ دەگرێتەوە بەڵام ئەگەر گوتت (الإعتقاد) واتە بیروبڕوابون جێگیر کردنی لەناو دڵان سەبارەت بەو شتانەی الله تعالی فەرمویەتی و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی و هێناوێتی لەلای الله تعالی وە کەواتە بیروبڕوابون و بەڕاستدانانی دڵانە یەکەمجار.

ئینجا لە پاشان دەفەرمون (وَالإِقْرَار بِاللِّسَانِ) ئەوەی لەناو دڵت کە بیروبڕوات پێیە و جێگیری دەکەی ئینجا دانپێداهێنانی بە زمانیش واتە بە زمانیش دەبێ بیلێیەوە.

ئینجا سێیەمیان دەفەرمون (وَالعَمَل بالجَوَارِحِ وِالْأَرْكَانِ) وە کار و کردەوەکردن بە ئەندامەکانی لاشەت بەوەی لەناو دڵت کە جێگیرت کردوە و بڕوات پێبوە و بە زمان دانت پێداهێناوە.

جا لێرەدا ئایە کردەوە بۆ ئیمان مەرج و شەرتی صحەتە بەڕاستدانانە وە ڕاستیەتی و دروستیەتیە ئەگەر عەمەلی لەگەڵدا نەبێ ئیمان قبوڵ دەبێ یان نابێ ئینجا یان شەرت و مەرجی کەمالیەت و تەواویەتە؟ لێرەدا جیاوازی لەنێوان فیرقەکانی عەقیدە و بیروبڕوا هەیە، ئەو تاقمانە زۆربەی هەرە زۆریان کێشە و گیروگرفتیان دروستکردوە سەبارەت بە پێناسەی ئیمان لەگەڵ ئەهلی سونە و جەماعە بەڵام بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە ئیمان کردار تێیدا مەرجی صحەتیشە وە مەرجی کەمالیشە.

مەرجی صحەتە بە مەعنای ئەوەی ئیمان تەواو نابێ لەلای ئەهلی سونە و جەماعە و دروست نیە ئەگەر جنسی عەمەلی لێ نەیەتەجێ، جنسی عەمەل یانی خودی عەمەلی لە سەرەتاکەیەوە دەبێ لەگەڵیدابێ ئەگەر فەرد و جوزئەکانیشی کەم و کورتی هەبێ چونکە عەمەل یەک شت نیە هەندێک جار (نوێژ کردارە، ڕۆژو کردارە، چونە حەجی ماڵی الله تعالی کردارە، وە فەرمان بە چاکە نەهی لە خراپە کردارە)، جا کردارەکان هەندێک جار کرداری دڵانە هەندێکجار هی زمانە هەندێک جاریش هی ئەندامەکانی لاشەتە و لە ڕواڵەتدا پێتەوە دیارە.

کەواتە زۆرن فەردەکان و جوزئەکانی عەمەل لەبەر ئەوەی جنسی عەمەل دەبێ لەگەڵ ئیمان بێتەجێ ئەوە عەقیدە و بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعەیە، هەر یەکێک بڵێ من بڕوادارم بەدڵەوە وە جێگیری دەکەم لە دڵمدا ئەوەی لە اللەوە هاتوە -جل شئنە- بڕوام پێی هەیە ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگیراوە و فەرمویەتی بڕوام پێی هەیە بەڵام بە زمانیش وابڵێ بەس بڵێ کردەوەی پێ ناکەم، هیچ عەمەل و کردەوەی پێ نەکا ئەو کەسە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بڕوادار نیە ئەو کەسە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە موسڵمان نیە.

کەواتە عەمەل و کردار بۆ سەلماندنی بیروبڕوای ناو دڵان و دانپێداهێنانی زمان لە واقیعدا ئەوەیانە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا نیشانەیە و وە ئیمان و بیروبڕوای پێ تەواو دەبێ و وە دروست دەبێ و سەحیح دەبێ ئەگەرنا وەرناگیرێ.

وە بەو مەعنایەش عەمەل هەندێک جار مەرج و شەرتی کەمالیەت و تەواوکردنی ئیمان و بیروبڕوایە جوزئەکانی عەمەل وە فەردەکانی عەمەل ئەگەر هەموی هاتەجێ بە تەواوی و ڕێک و پێکی ئەوە ئەو کەسە خاوەن ئیمانێکی ڕاست و دروست و تەواوە، ئەگەر هەموی نەهاتەجێ بە ئەندازەی نەبونی یەکێک لە کردارەکان کە پێی کافر نەبێ پێی لە ئیسلام نەچێتە دەرەوە بۆ نمونە کەسێک گوناحێک دەکا یان کەسێک کەمتەرخەم دەبێ لە ڕۆژوگرتن یان ئەنجامی نادا و نایکا ئەوە ئەو کەسە پێی دەگوترێ ئیمانی تەواو نیە و ئیمانەکەی نوقسانی هەیە کامل نیە مەرج و شەرتی کەمالیەتی نەهێناوەتەجێ کە عەمەل و کردارەکە بە تەواوەتی بکا کەواتە بەو مانایەشەوە هەندێک جار عەمەل و کردار دەبێتە مەرجی کەمالیەت و تەواویەتی ئیمانیش.

بەڵام هەرچی مورجیئەکانن لە کۆن و لە نوێدا لە هەرکاتێک هەبوبن کردار دوردەخەنەوە لە ئیمان، دەڵێن ئیمان بەسە کە بڵێین دانپێداهێنانی دڵانە وە بە زمانیش بگوترێ ئەگەر کرداریشی لەگەڵ نەبێ قەیدی ناکا و ئەو کاتە ئیمانەکە ڕاست و دروستە، ئەوە بۆچونێکی هەڵەیە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە پێی ڕازی نیە (والله أعلم بالصواب).

جا لە پاشان الله تعالی لە قورئان دەفەرموێ و ئەوە لەوێ وەرگیراوە ئەو شەش ڕوکنەی ئیمان کە دەڵێین (الإيمانُ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ، والإِيمَانِ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ) کە ابن تیمیة لە (عقیدة الواسطیة) هێناویەتیەوە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿لَّيسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ﴾ [البقرة: ١٧٧] ئەوەش بەڵگە بۆ ڕیز کردنی ئەو ڕوکن و کۆڵەکانەی ئیمان و بیروبڕوا.

ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی کاتێک جوبرائیل دێتە لای و لەناو سەحابەکاندا لێی دەپرسێ لەو فەرمودە دور و درێژە کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە و وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە کە دەفەرموێ ئیمان چیە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامی جوبرائیلدا دەفەرموێ: «الإيمان أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره[1]» کەواتە پێناسەی ئیمانی بەوە کرد ئیمان پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئیمان بریتیە لەوەی بڕوابهێنی بە الله تعالى، وە بە فریشتەکان، وە بە پەرتوکە ئاسمانیەکان، وە بە ڕەوانەکراو و پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، وە بە ڕۆژی دوایی، وە بڕواش بێنی و ئیمانت هەبێ بە قەدەری الله بە خێر و بەشەڕی.

ئینجا با بزانین ئیمان بون بە الله تعالى مانای چی دەگەیەنێ؟ لە چەند خاڵدا خۆی دەنوێنێ؟ ئیمان بون بە الله تعالى یەکەمجار گوتمان ئیمان لە دڵەوە لە زمانەوانیدا بە مانای (التَّصْدِيق الْجَازِم والإستسلام) دێ کەواتە ئیمان بەڕاست دانانێکی سەدا سەدی بەبێ ئەوەی گومانت بمێنێ وە تەسلیمی بی.

ئینجا لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا گوتمان ئەو سێ ڕوکنەی پێویستە کەواتە ئیمان بون بە الله تعالى دەبێ یەکەمجار بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە تۆ بڕوات هەبێ لە دڵتدا جێگیری بکەی بە ڕاستی دابنێی یەکەمجار بون و وجودی الله تعالى ئینجا دوایە ڕبوبیەت و پەروەردگاریەتی الله تعالى ئینجا دوایە ئولوهیەت و خوایەتی الله تعالى لە پاشان ئەسماء و سیفاتەکانی چۆن هاتوە لە قورئانی پیرۆز بەبێ زیاد و کەم کردنی بەبێ گۆڕینی ماناکانی وە لەفز و وشەکانی وە بەبێ هاو نمونە هێنانەوە بۆی بەبێ چواندنی بە هیچێک لە ناو و سیفەتەکانی مەخلوق و دروستکراو و بەدیهێنراوەکانی وە بەبێ چۆنیەتی و کەیفیەت بۆ دانانی ئینجا ئەوەی لە حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەریش هاتوە

[1] **صحيح البخاري** (٤٧٧٧) (٥٠) (١٣٩٧)، **صحيح مسلم** (٩) (١٠) (١٤)، **سنن النسائي** (٤٩٩١).

(ﷺ) ئەوەش بە زمان دانی پێدابنێی وە بە کردەوەش بیسەلمێنی ئەو کاتە تۆ ئیمان و بڕوات هەبوە بە الله تعالی.

کەواتە یەکەم خاڵ پێویستە ئیمانمان بە بون و وجودی الله هەبێ، ئیمان بە بون و وجودی الله تعالی بیسەلمێنین الله بون و وجودی هەیە، بە چەند بەڵگە دەسەلمێنرێ؟ چونکە هەیە کەسی بڕوادار و موسڵمان نیە پێویستە تۆ بە بەڵگەی عەقڵی و جگە لە شەرعی و نقڵی بۆی بسەلمێنی الله بون و وجودی هەیە.

کەواتە ئێمە چوار بەڵگەمان لە دەستە بۆ سەلماندنی بون و وجودی الله تعالی:

بەڵگەی یەکەمیان بەڵگەی عەقڵیە عەقڵ و هۆش وە ژیری دەیسەلمێنێ الله بون و وجودی هەیە.

بەڵگەی دوەمان بەڵگەی حسیە بەڵگەی هەستەوەرییە بە هەستکردن دەیسەلمێنێ الله بون و وجودی هەیە.

بەڵگەی سێیەمان بەڵگەی فیطڕییە فیطڕەتی هەموو مرۆڤ و ئینسانەکان هی ئاژەڵ و حەیوانەکانیش دەیسەلمێنێ کە الله تعالی بون و وجودی هەیە.

بەڵگەی چوارەمان بەڵگەی شەرعی و نقڵییە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پەیامە ئاسمانیەکان دەی سەلمێنێ الله تعالی بون و وجودی هەیە، زۆر بە کورتی با هەریەک لەو بەڵگانە نمونەیان بۆ بێنینەوە.

بەڵگەی عەقڵی لەسەر بون و وجودی الله تعالی ئەو عەقڵەی الله تعالی داویەتیە مرۆڤ دەیسەلمێنێ الله تعالی بون و وجودی هەیە، لەبەرچی؟ یەکێک لە خاڵ و بەڵگە عەقڵیەکان ئەوەیە دەڵێ (الكلّ حادث محدث) هەرشتێک بەرپابوبێ هاتبێتەدی وە لە بوندابێ دەبێ شتێک هەبێ وە کەسێک هەبێ بەرپای کردبێ هێنابێتیە بون و وجود، مادەم عێمەی مرۆڤ و جنۆکەکان و کەون و کائینات و ئاسمان و زەوی و ئەستێرە و ئەو بابەتە شتانە هەمویان

لە بون و وجودن و لەبەرچاومانن دەبێ کەس و زاتێک هەبێ ئەو شتانەی هێنابێتە بون و وجود.

جا ئەگەر دەپرسین لە بێبڕواکانیش کێ دەتوانێ بیسەلمێنێ منم مرۆڤم هێناوەتە بون و وجود؟ منم ئاسمانم ڕاگرتوە و هێناومەتە بون و وجود؟ ئینجا ئەگەر کەس نەبوو ئەوە بسەلمێنێ و وە کەسیش نەیتوانیوە و ناتوانێ ئەو کاتە دەبێ ئێمە بڵێین زاتێک هەیە هێناویەتیە بون و وجود ڕایگرتوە و بەڕێوەی دەبا، وە ئەو زاتەش دەبێ لەوپەڕی توانا توانای هەبێ، توانای هەبێ ئەو شتە وردە بەو وردکاریەوە کە مرۆڤەکانن کە جێگای سەرسوڕمانە بیهێنێتە بون و وجود، واتە عیلمێکی تەواوی هەبێ وە خیبرە و شارەزاییەک و وردبینیەکی تەواوی هەبێ لە ئیش و کارەکاندا ئەوەشیان لە کێ دەوەشێتەوە؟ لە الله تعالى -جل شئنه- کە خاوەن سیفەتی کەمالە، جا ئەگەر شتێکی بچوک لە بون و وجوددا بەبێ بەدیهێنەر وە بەبێ وەستا وە بەبێ دروستکار بەدینەهێت و دروست نەبێت و نەیەتە بون و وجود چۆن دەکرێ و دەبێ ئەو هەموو بونەوەر و کەون و کائیناتە ئەو هەموو مرۆڤ و جنۆکە بەبێ زاتێک -جل شئنە- وە بەبێ بەدیهێنەرێک هاتبێتە بون و وجود؟ جارێکیان هەندێک لە مولحید و بێبڕواکان دەچنە لە سەردەمی ئیمامی ئەبو حەنیفە دەچنە لای، ئەو مولحید و بێبڕوایانە لەو کاتە پەیدا بون دەهریەکانیان پێ دەگوتن دەهریەکان بڕوایان نەبوو بون و وجودی الله تعالى هەیە وە پێیان وابوو شتەکان هەر لە سروشتەوە و لە خۆڕا خۆڕسکیە و دروستبوە (پەنا بە خوای رب العالمين) پێیان وانەبوو زیندوبونەوە هەیە چونکە مارکسیزمیەتیش وە ئەو بابەتە بیروبۆچونانە درێژە پێدەر و وە بەدیهاتنی دەهریەکانە لە سەردەمەکەی ئێمە و نوێکردنەوەی ئەوان بوو ئەوە نەبێ مارکس کەسێکی ئەوەندە بەتوانا بوبێ لەو سەردەمەدا هەر لە خۆڕا بیرێکی وا پوچەڵی کردبێتەوە، نا هەر درێژە پێدەری ئەوان بوە و ئەو شتەی نوێ کردەوە و هێنایەوە بون و وجود کە خۆشی پێی بەدبەخت کرد وە ژمارەیەکی زۆریش لە مرۆڤەکان پێی بەدبەخت بون، کە پرسیان لە

ئیمامی ئەبو حەنیفە، ئیمامی ئەبو حەنیفە زاتێکی زۆر زیرەک بوە (سرعة البديهة)ی هەبوە لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان یانی خێرا وەڵامی بۆ دەهات وەڵامی زۆر لەجێ بە تایبەت وەڵامی عەقڵی و ژیری، گوتیان باشە تۆ چۆن دەیسەلمێنینی الله بون و وجودی هەیە؟ دەڵێ لە یەک لە ریوایەتەکان ئەویش فەرموی ئێوە بڕۆنەوە دوایەکا وەڵامتان دەدەمەوە بیرێک لەو قسەتان دەکەمەوە، دەڵێ ئەوانیش ڕۆژێک دوو ڕۆژێکیان پێچوو هاتنەوە لای پێیان گوت دەی وەڵامان دەوێ، گوتی وەڵا من چەند بیرم کردەوە مەژغوڵ و سەرقاڵ بوم بە کارێکی تر لەبەر ئەوە نەمتوانی وەڵامی تەواو بۆ ئێوە بەدەست بێنم، گوتیان چیبوو ئەو ئیش و کارەی مەژغوڵ و سەرقاڵ بیو ئەوەندە گرنگ بێ، گوتی مەژغوڵ بوم بەوەی بیستم گوتیان کەشتیەک لەناو دەریادا شەپۆلی ئاو لێی دەدا کاتێک هاتە لێواری دەریاکە و هاتە وشکانی کۆمەڵێک شتی لەسەر بوو و باری هەڵگرتبوو تەماشایان کرد ئەو کەشتیە کەشتیوانی لەسەر نیە کەس نیە کەشتیەکە لێبوخڕێ هەر کەشتی بەخۆی هاتوە و ڕۆیشتوە و باری لەخۆی بار کردوە و هاتوەتە وشکانی، دەڵێ ئەوانیش گوتیان باشە ئەوە باسی چیمان بۆ دەکەی؟ شێت بوی دیارە تۆ ئەبو حەنیفە؟ کێ باوەڕ دەکا و چ عەقڵێک هەیە بڕوابکات کە کەشتی بەخۆی بگاتە وشکانی و بێتە لێواری دەریا کەسێک نەبێ کەشتیوان بێ و بیهاژوا؟ گوتی نەخێر من شێت نیم ئێوە شێتن، ئەگەر کەشتیەکی وا بچوک سەبارەت بەو بونەوەر و کەون و کائیناتە بەو مرۆڤ و جنۆکانە کەوا هەنە دەبێ کەشتیوانێکی هەبێ و بەڕێوبەرێکی هەبێ و لێخوڕێکی هەبێ ئینجا بگاتە وشکانی و لێواری دەریا، ئەی چۆن دەبێ ئەو هەموو کەون و کائینات و بونەوەرە ئەو مرۆڤ و جنۆکانە بەبێ زاتێک کە بەدیهێنابن و بەڕێوەیانەوە ببا، دەڵێ ئینجا ژمارەیەکیان لەوێ گوتیان (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله) بونە موسڵمان.

لە ڕیوایەت و جارێکی تر دەڵێ هەندێک زانای مولحید و بێبڕوای هندی بون هاتنە لای ئەبو جەعفەری مەنصور داوایان کرد کە یەک لە زاناکانی ئیسلام بێ گفتوگۆیان لەگەڵ

بکا دەڵێ مامۆستای ئەبو حەنیفە کە داوای لێکرا ئیمام ئەبو حەنیفە مێرد منداڵەیەک بوو ڕەوانەی کرد و ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵدا کردن.

کەواتە بەڵێ هەموو شتێک کە لە بون و وجود دابێ دەبێ بەدیهێنەرێکی هەبێ وەستایەکی هەبێ زاتێک هەبێ هێنابێتیە بون و وجود، جا بچوکترین شت ئەگەر قەڵەم و دەرزیەکیش بێ دەبێ وەستا و دروستکارێکی هەبێ ئەو بونەوەر و کەون و کائیناتەش دەبێ بەدیهێنەرێکی هەبێ بەڕێوبەرێکی هەبێ جا بەدیهێنەر و بەڕێوبەری ئەو بونەوەرە ئەوە دەبێ زاتێک هەبێ خاوەن عیلمێکی تەواوبێ دەسەڵات و توانایەکی تەواویشی هەبێ لەسەر ئەو هەموو ئیش و کار و بەدیهێنراوانە ئینجا لێی دەوەشێتەوە بەدیهێنابێ ئەویش هەیە و کێیە؟ اللەیە -جل شئنە- بەدیهێنەری هەموو بونەوەرە و مرۆڤەکان و جنۆکەکانە.

بەڵگەی دوەمیان بەڵگەی حسی و هەستەوەرییە، بە حسی و هەستەوەری دەسەلمێنرێ کە الله تعالی بون و وجودی هەیە، نمونەیەکی زۆر کورت دەبینی مرۆڤە بڕواداره موسڵمانەکان لە تەنگانە یان لە خۆشی واتە لە خۆشی و لە ناخۆشی هەندێک جار پەنا دەبەنە بەر الله تعالی لەبەری دەپاڕێنەوە و دۆعا و نزا دەکەن، ئەو دۆعا و نزایەش دەستبەجێ هەندێک جار دێتەجێ جێبەجێ دەکرێ جا ئەو کەسە لەبەر الله پاڕاوەتەوە جا ئەو دەسەڵات و ئەو ئیشە و جێبەجێ بونەکەشی هەندێک جار لە دەسەڵاتی مرۆڤ و هیچ کەسێکی تردا نیە، کە بۆی دێتەجێ ئەوە باشترین بەڵگەی هەستەوەرییە کە هەستی پێدەکرێ بەبەر چاوان کە الله تعالی بون و وجودی هەیە، ئەو داوای لە زاتێک کردوە کە اللەیە وە ئەو شتەی بۆ بێنێتەجێ شتەکەش هاتوەتەجێ، کەواتە ئەگەر الله بون و وجودی نەبێ (پەنا بە خوای رب العالمین) چۆن شتەکە هاتەجێ؟ خۆ ئەو داوای لە کەسی تر نەکردوە؟ وە کەسی تر دەستی تێدا نەبوە لە شتەکە و لەو دۆعا و پاڕانەوەی ئەو کە داوای کردوە بۆی بێتەجێ بیهێنێتەجێ؟ کەواتە ئەوە دەیسەلمێنێ بەڵگەیەکی هەستەوەری و حسیە هەستی پێدەکرێ کە الله تعالی بون و وجودی هەیە -جل شئنە-.

وە لە هەموو دروستکراوەکانیش دەسەڵاتی خوای رب العالمين دەدرەوشێتەوە بەبەرچاوان دیارە هەستی پێدەکرێ، ئەو ئاسمانە کێ توانیویەتی ڕاییگرێ؟ چونکە بەڵگەی حسی و عەقڵی هەندێک جار تێکهەڵکێشن لەگەڵ یەکیش دەگونجێن هەم بە بەڵگەی عەقڵی و هەم بە بەڵگەی حسی دەسەلمێنرێ و کە پرسیار دەکەین کێ لە توانای هەیە ئەو ئاسمانە ڕابگرێ؟ تۆ دەبینی سەقفێک سەبەیەک بۆ سەری خانویەک یان بینایەک ئەگەر بیست مەتر بە پەنجا مەتربێ چەندین دینگە و حیساباتی بۆ دەکرێ ئینجا بە ئاسانیش ڕاناوەستێ هەموو موهەندیسێک و ئەندازیارێکیش لەخۆیڕا نابینێ هەموو سەقفێک بڕیار بدات و ئەنجام بدرێ بەو ئەندازە کەمە بەو مەسافە کەمە یەعنی ئەوەندە مەترەبێ ئەی ئەو ئاسمانە هەزارەها و ملیۆنەها ئەوەندەی زەوییە یانی ئەگەر لێکی دەدەیەوە چۆن ڕاگیراوە ئەو ئاسمانە؟ کێ ڕایگرتوە؟ هەستی پێدەکەین، ئەوە بەڵگەیە لەسەر بون و وجودی الله تعالى. هەروەکو یەکێک لە ئەعڕابیەکان کە لێی دەپرسن تۆ بەچی و بەچ ڕێگایەک گەیشتیتە الله ناسی بون و وجودی اللەت سەلماند و بڕوات پێی هێنا، دەفەرموێ: (الأثر تدل على السير، والبعرة تدل على البعير) شوێنی پێی کەسان و مرۆڤان ئەگەر دیاربێ لە ڕێگا و شوێنێک بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕێبوار بەوێدا ڕۆشتوە و ئەگەر قشپلی حوشتریش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حوشتر لەوێ بونی هەبوە، دەفەرموێ الأرض ذات الفجاج، والسماوات ذات الأبراج، و والبحر ذات الأمواج، أفلا تدل على اللطيف الخبير؟) یان (على الواحد القهار) بە گوێرەی ڕیوایەتەکان، دەفەرموێ ئەو زەویە کە چەند دور و درێژە و کەلێنی هەیە کەلەبەری هەیە شاخی تێدایە بەرز و نزمی تێدایە، دەفەرموێ ئەو ئاسمانەی ئەو هەموو ئەستێرانەی پێوە دیارە، وە ئەو دەریا و بەحرەی کە ئاوا شەپۆل و مەوج دەدا خاوەنی شەپۆل و مەوجەکانە، ئایە ئەوانە بەڵگە نین نابنە بەڵگەی هەستەوەری و عەقڵ و ژیری لەسەر بون و وجودی خوای پەروەردگارێکی زۆر وردزانی کارلەجێ -جل شئنە-؟ خوایەکی تاک و تەنها؟ بەڵێ دەبنە بەڵگە.

ئینجا بەڵگەی فیطرە فیطرە و سروشتی ئینسان وە فرچکی ئینسان ئینسان هەر لە ئەوەڵەوە فرچکی بەوە گرتوە فیطرەی خاوەن تەوحیدە خاوەن الله بەیەکگرتنە -جل شئنه-، لە ئەوەڵەوە کاتێک الله تعالی لەپشتی باوکە ئادەمەوە زوریەتی ئادەمی دەرهێنا و بەڵێنی لەگەڵ بەست: ﴿أَلَستُ بِرَبِّكُم قَالُوا بَلَىٰ﴾ [الأعراف: ١٧٢] هەر هەموو مرۆڤەکان الله تعالی پێی فەرمون من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ گوتیان بەڵێ تۆ ئەوی، کەواتە بونە خاوەن تەوحید بونە خاوەن الله بەیەکگرتن بڕوایان هێنا.

فیطرەت و دڵی ئینسان یەکەمین جار الله بەیەکگرتنی تێدایە کە پێغەمبەریش دەفەرموێ (ﷺ): «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ» هەموو منداڵێک و کۆرپەلەیەک کە دەبێ لەسەر فیطرەتی الله بەیەکگرتن دەبێ -جل شئنه- یانی خاوەن تەوحیدە «وأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ[١]» واتە: ، بەڵام دایک و باوکی لە دوایی لە فیطرەت لایدەدەن یان دەیکەن بە جولەکە یان دەیکەن بە ئاگر پەرست یان دەیکەن بە دیان بە نەسرانی.

کەواتە فیطرەتی ئینسان لە چ کاتێکدا بەدیار دەکەوێ؟ لەو کاتە بەدیار دەکەوێ ئەو کەسەی کە دەڵێ هیچ بڕوام بە بون و وجودی الله نیە چونکە لەبنی هەرەبنی دڵی فیطرەتەکەی تەوحیدی تێدایە لە کاتی ساتمە کردنێک لە دونیا ناخۆشی هاتنە ڕێگایەک فیطرەتەکە بەدیار دەکەوێ هەموو پەردەکان و غوبار و ئەو شتانەی لە دڵیدا کۆبوەتەوە و فیطرەتەکەی شاردوەتەوە لە ئیلحاد و بێدینی و بێ بڕوایی دەرەوێتەوە نمونەمان زۆرن.

ئەو مولحید و بێدین و بێبڕوایانە هەندێک جار لە کاتی ساتمە بردنێک دەڵێن الله بون و وجودی نیە دەیەها پەرتوک و موحازەرەی لەسەر دەخوێننەوە و دەنوسن و دەدەن خۆیان و خەڵکی و لێ ڕادەهێنن ئینجا کە ساتمەیەک دەکەن بەسەر زمانیاندا دێ دەڵێ یا الله، ئێ یەگەر بون و وجودی نیە بۆچی هاواری لێ دەکەی؟ ئەی کەسی بڕوات بە کارل مارکس هەیە بۆ نمونە سەرۆکی (حیزبی شیوعی کوردستانی) (عەزیز موحەمەد) کاتێ کە

[١] صحيح البخاري (١٣٨٥) (١٣٥٨) (١٣٥٩)، صحيح مسلم (٢٦٥٨)، سنن أبي داود (٤٧١٤).

موئتەمەرێک بوو لە ساڵی (١٩٩٢) لە (سوریا) پێی لە داو و لە وایەری لاقیتەیەک ئاڵا کە چوو وتار بخوێنێتەوە ئەو هەموو خەڵکە و ئەندامانی حیزبی شیوعی هەموو دونیا دانیشتبون، کە تەقدیری الله تعالی الله تعالی دەیەوێ ئاوا پێیان بسەلمێنێ کە فیطرەتەکە لەگەڵ ئەوەدایە کە الله بون و وجودی هەیە کە پێی تێ ئاڵا دەمی گەیشتە لای لاقیتەکە و مایکرۆفۆنەکە گوتی یا الله، هەموو قاعەکە دەنگی دایەوە ئەوەی لە قاعەکە بوو هەمویان بڕوایان بە بون و وجودی الله نەبوو ئەندامانی حیزبی شیوعی هەموو دونیا بون ئەو کەسەش کەسێکە کە شیوعیەت یەکەم جار کە هاتوەتە عێراق و کوردستان ئەو هێناوێتی ئینجا لەگەڵ ئەوەدا هەموو لە قاقای پێکەنینیاندا هیچیان پێ نەمایەوە.

کەواتە پێویستە گەمەیان بە عەقڵی خۆیان بێت و بە هەڵسوکەوتی خۆیان بێ کە الله تعالی هەڵیدایەوە فیطرەتەکە بەڵێ ئەگەر الله تعالی بون و وجودی نیە بۆ هاوارت نەکرد یا کارل مارکس؟ ئەگەر الله تعالی بون و وجودی نیە بۆ هاواری ئەوانت نەکرد لەوێ ئەندامەکانی تر لە هانات بێن نەهێڵن بەربیتەوە؟ دیارە نەک بڕوات وایە الله تعالی بونی هەیە و فیطرەتت لەگەڵ ئەوەدایە فیطرەتت ئەوەش دەسەلمێنێ کە الله دەتوانێ لە هانات بێ بەرت نەداتەوە.

وەختی خۆی ستالینیش دەڵێ کچێکی هەبو وای ڕاهێنابوو لەگەڵ دەوروبەرەکەی، ستالین ئەو کەسەیە کە لەدوای لینین هاتە سەر حوکم لە ئیتیحادی سۆفیەتی، کە کارل مارکس ئەو نەزەریەی دانا لینین هات لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر (١٩١٧) کە قەیسەریەکانیان لە ڕوسیا لەناو برد هاتنە سەر حوکم، ئەوانە قوتابی کارل مارکس حیساب بون لەسەر ئەو ڕێبازە دەڕۆیشتن، گوتیان ئێمە ئیشدەکەین بە کارل مارکسیەت و مارکسزمیەت ئەو بەرنامەیان هێنا و ئیشی پێبکەن نەدەگونجا تەواو ئیشی پێبکرێ چونکە کەم و کورتی یەکجار زۆرە، هەستان هەندێکیان لێ بڕی و هەندێکیان لێ زیاد کرد، لینین ناوی لێنرا لینی نزمیەت، لەدوای ئەوە ستالینیش بە لینین ڕازی نەبوو لە هەموو ئیش و کارەکانی ئەوی لادا کە

خۆی هاتە سەر حوکم بوە سەرۆکی وەزیرانی ئیتیحادی سۆفیەتی ناوی لێنا ستالین نزمیەت، ستالین کەسێک بوو زۆر دیکتاتۆر و خوێن ڕێژ بوو دەیگوت ئەگەر هەموو دونیا بکەمە پێنج بەش یەک بەش ببێتە لینی نزم یان ستالینزم هەر چوار بەشەکەی تر هەموی قەتڵ و عامکەم لەلام زۆر ئاساییە، جەیشی ئەحمەڕیان هەبوو ئەگەر ناوی ستالین هاتبا دەبا تەحیە بکرابا نەک ببینرابا، ئینجا ڕۆژێک هەڵخلیسکا لە بەفردا لەبەر دەرگای ماڵیان سکرتێر و پیاو و حیمایەکانی هەموی لەگەڵیدابون، کچەکەشی لەگەڵیدابوو کە کچەکەی خۆی وا پەروەردەکردبوو وشەی الله نابێ بەسەر زمانت دابێ چونکە الله بون و وجودی نیە خوڕافیاتە موسڵمان وا دەڵێن ئاوا، لەبەر دەرگای خۆیان کچەکەی لە شوێنی دەڕۆیشت ستالین ساتمەی برد و هەڵخلیسکا لە بەفرەکە یەک بە دەنگی بە ڕوسی هاواری کرد گوتی یا الله! کچەکەی توند گرتی هێشتا هەڵنەستابۆوە گوتی باوکە ئەوە تۆ چەند ساڵە بە من دەڵێی نەڵێی الله ئەی تۆ بۆ هاواری اللەت کرد؟ دەڵێ ستالین وەڵامی نەبوو داماو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا هەستایەوە سەر پێیان، گوتی باوکە ئەی بۆ هاواری سکرتێرەکە و حیمایەکانت نەکرد لە پشتەوە؟ جا هەندێک دەڵێن کچەکەی لەو قۆناغەیەوە و لەسەر ئەو قسەیەوە کاری تێکرد و دوایە لە دڵدا بوو بوە موسڵمان بەس نەیوێرابوو خۆی ئاشکرا بکا بڕوای هێنابوو بە الله تعالى، ئەوەش فیطڕەت فیطڕەت سروشت فرچکی ئینسان دەیسەلمێنێ کە الله تعالى بون و وجودی هەیە.

ئینجا بەڵگەی نەقلی و شەرعی هاتنی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وە دابەزینی قورئانی پیرۆز ئەوانە هەر هەمویان بەڵگەن بەڵگەی نەقلی و شەرعیە لەسەر بون و وجودی الله چونکە پێغەمبەران دەڵێن پێغەمبەری اللەین ئیزافە دەکرێن بۆلای الله تعالى ئەوانی ڕەوانە کردوە و ناردویەتی، کەواتە دیارە الله بون و وجودی هەیە -جل شئنه- وە پەیامەکان دەڵێن پەیامی خوایی هی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) قورئان دەگوترێ (کلام الله) کەواتە هەموو قورئان و هەموو پێغەمبەران و ڕەوانە کردنیان و وە

پەیامەكانی كە هێناویانە پەرتوكە ئاسمانیەكان هەموی بەڵگەیە بەڵگەیەكی نەقڵی شەرعی لەسەر بون و وجودی الله تعالی.

لە پاشان دێینە سەر (الإِيمانُ بِاالمَلاَئِكَه) بیروبڕوابون بە مەلائیكەت و فریشتەكان، دەبێ لە دڵمان جێگیری كەین و بڕوامان وابێ كە مەلائیكەت و فریشتەكان بون و وجودیان هەیە، مەلائیكەت و فریشتەكان نە نێرن نە مێ، مەلائیكەت و فریشتەكان ژمارەیان لەبن نایە و نازانین ئێمە لە زۆرییان، وە مەلائیكەت و فریشتەكان بڕوامان وابێ دروستكراو و بەدیهێنراون لە نور و ڕوناكی كە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) مرۆڤەكان بەدی هاتون لە باوكە ئادەمەوە بوكە ئادەمیش لە خۆڵ و گڵ وە دەفەرموێ مەلائیكەت و فریشتەكانیش «خُلِقَتِ الْمَلاَئِكَةُ مِنْ نُورٍ[1]» ئەوانیش لە نور و ڕوناكی بەدی هاتون وە جنۆكە و شەیتانیش دەفەرموێ لە ئاگر دروست بونە و بەدی هاتون، ئینجا بیروبڕوامان وابێ مەلائیكەت و فریشتەكان توانایان زۆر زیاترە لە مرۆڤ و لە جنۆكەكانیش الله تعالی ئەو توانایەی پێ بەخشیون بە چركە و بە لەحزات دەتوانن لە ئاسمان بگەنە زەوی، بە چركە و بە لەحزات دەتوانن لە هەر شوێنێک دورترین شوێن بێ پێی بگەن الله تعالی ئەو توانایەی پێ بەخشیون، وە بیروبڕوامان وابێ هەم لە دڵەوە كە مەلائیكەت و فریشتەكان هەندێكیان ئیشی تایبەتیان پێ بەخشراوە و كە ناویشیان بۆ ئێمە دیاریكراوە، لەوانە جوبڕائیل گەورەی هەموو مەلائیكەت و فریشتەكانە ئیشی تایبەتی جوبڕائیلیش هێنانی وەحی خواییە بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، وە مەلائیكەت و فریشتەی سەرپەرشتیاری عەزابەكانی اللهشە -جل شئنە- كە عەزابی ئومەتەكان دەدا، وە لە پاشان ئیسڕافیل ئەویش مەلائیكەت و فریشتەیەكی گەورەیە لە دوای جوبڕائیل دێ كە ئەویشیان فوی نەفخی سوڕی بەدەستە الله تعالی ئەو ئەركەی پێ سپاردوە بۆ دونیا تێكچون و تێكدانی كە فوو دەكرێتە سوڕ ئەوە فوو دەكا، لە پاشان میكائیل كە مەلائیكەتێكی گەورەیە ئەویش ئەركی

[1] صحيح مسلم (٢٩٩٦)، مسند أحمد (٢٥١٩٤) (٢٥٣٥٤).

بارانی باران و وە هەور کە ئاوی لێ دابەزێ اللە تعالی پێی بەخشیوە، وە لە پاشان ملك الموت کە لە ناو ئێمە بە عزرائیل بەناوبانگە، کە عزرائیل وشەیەکە و ناوێکە نە لە قورئان هاتوە بۆ ملك الموت نە لە حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە نە لە ئەثەرێکی سەحیحیش هاتوە، تەنها هەندێک ئەثەر و قسەی زەعیف و لاوازی لەسەرە، وە نەگوترێ باشترە بەڵام بۆ ئەوەی خەڵک تێی بگا هەموو جار بڵێی کە لەناو ئێمە بەناو بانگە بە عزرائیل ئاوا بگوترێ ئاساییە بەڵام ناوی ڕاستەقینەی خۆی ملك الموت ە اللە تعالی بەوە ناوی دەرکردوە و بردوە، ئەویش ئیش و کاری کێشانی گیانی مرۆڤەکان و وە مەخلوق و بەدیهێنراوەکانی لە دەستە اللە تعالی پێی سپاردوە، ئینجا هەندێکیش لە مەلائیکەت و فریشتەکان هەڵگری عەرشی اللە تعالی ن (حملة العرش)ن، وە هەندێک لە مەلائیکەت و فریشتەکان سەرپەرشتیاری بەهەشتن، هەندێکیان سەرپەرشتیاری دۆزەخن، وە هەندێک لە مەلائیکەت و فریشتەکان ئیشی تریان پێ سپێردراوە کە نوسینی چاکەکانی مرۆڤەکان یان خراپەکانی مرۆڤەکان، هەریەک لەو مەلائیکەت و فریشتانە دەبێ و وجودیان هەیە ئەو خاڵانەی گوتمان هەیانە وە لە پاشان بڕوامان وابێ مەلائیکەت و فریشتەکان: ﴿لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾ [التحريم: ٦] سەرپێچی فەرمانی اللە ناکەن ئەوەی پێیان بگوترێ و فەرمانیان پێ بکرێ لەلای اللە تعالی دەستبەجێ جێبەجێی دەکەن، وە مەلائیکەت و فریشتەکانیش دەمرن بۆچونی ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوامان دەبێ وابێ ئینجا لە دوایی زیندو دەبنەوە بە هەمیشەیی نامێننەوە ئەو مەلائیکەت و فریشتانە جیهانێکی سەربەخۆن اللە تعالی دایناون وە بەدیهێنراوی اللە تعالی ن ئەوانیش دەبێ ئەو بیروبڕوایەمان وابێ.

لە پاشان دێینە سەر بیروبڕوابون بە پەرتوکە ئاسمانیەکان، پەرتوکە ئاسمانیەکان دەبێ ئێمە بیروبڕوامان وابێ کە اللە تعالی بۆ هەر ڕەوانە کراو و ڕەسولێک پەیامێکی ناردوە پەیامی تایبەت چونکە ئەو زاتەیە کە پێناسەمان کرد لە ڕابردو دەبێ نێرینەبێ بۆچونی ڕاجیحی

ئەهلی سونە و جەماعە مێینە و ئافرەت ڕەسولی تێدا نیە و نەبی تێدا نیە ئیختیلافی لەسەرە بەڵام ئەو بۆچونە بۆچونی ڕاجیح و پەسەند و زۆربەی ئەهلی سونە و جەماعەیە، وە لە پاشانەكە دەبێ لە مرۆڤەكان بێ لە جنۆكە نەبێ، وە لە پاشان ڕەسول پەیامێكی تایبەتی بۆ دێ لەلای الله تعالى فەرمانی پێدەكرێ ڕاییگەیەنێ ئەوە ڕەسولە.

ئەو ڕەسولانە ژمارەیان چەندە؟ هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون نابێ لە ژمارەیان بپێچرێتەوە بەڵام هەندێكیش لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون مادەم ڕیوایەتمان بەدەست هەبێ كە ئەگەر تەواو سەحیحیش نەبێ حەسەنیش بێ قبوڵە و وەرگیراوە لەلایەن ئەهلی سونە و جەماعە ژمارەیان دیاریكراوە كە سێ سەد و پازدە ڕەسولن لە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەفەرمون دروستە ئێمە بڵێین ژمارەشیان هەیە ئەوەش ئیختیلافی لە نێوان ئەهلی سونە و جەماعە لەسەرە.

جا هەر ڕەسولێک پەرتوک و پەیامێكی ئاسمانی بۆ هاتوە بە كورتی ئێمە دەبێ بڕوامان وابێ الله تعالى پەرتوک و پەیامە ئاسمانیەكان زۆر بونە بە ژمارەی ڕەسول و ڕەوانەكراوەكان بوە كە ناردویەتی بۆ سەر زەوی بەڵام ئەوەی لە ئێمە دیارە بە ناوەوە دەبێ ئەوانە بە ناوەوە بڕوامان پێی هەبێ ئەوانی تریش بە كورت و پوختی.

جا یەكەمیان سوحوفە سوحوفی ئیبراهیم وە سوحوفی موسا هەندێک دەڵێن تەوڕاتەكەیەتی لەبەر ئەوە دەڵێن پێنج پەرتوكی ئاسمانی هەیە ناوی دیاریكراوبێ، هەندێكیش دەڵێن سوحوف جیاوازە لەگەڵ تەوڕات سەرەتا سوحوفی بۆ هاتوە موسا ئینجا لە دوایە تەوڕاتی بەسەر دابەزیوە، ئەگەر گوتمان سوحوف جیاوازە لەگەڵ تەوڕات دەڵێین شەش پەرتوكی ئاسمانی هەیە كە ناویان دیاربێ لە ئێمە بیزانین بەسەر چ ڕەسول و ڕەوانەكراوێک دابەزیوە، ئەگەر بڵێین سوحوف هەر تەوڕاتە هی موسا دەڵێین پێنج پەرتوكی ئاسمانی هەیە ناویان دیاربێ و ناوی پێغەمبەر و ڕەوانەكراوەكانیش دیارە كە بۆیان ڕەوانە كراوە، یەكەم سوحوفی ئیبراهیم، دوەم تەوڕاتی موسا، سێیەم زەبوری داود،

وە چوارەم ئینجیلی عیسا، وە پێنجەم قورئانی پیرۆزی محمد المصطفی (ﷺ)، کە ئەوانە بەسەریان دابەزیوە لەلای الله تعالی.

تەنها قورئان الله تعالی بەڵێنی پاراستنی داوە و پاراستوشیەتی تاوەکو ئێستا باشترین بەڵگەیە ئەوە لەسەر ڕاستیەتی قورئان و وە هاتنی پێغەمبەر و (ﷺ) ئاینی ئیسلام، تا ئێستا کەس نەیتوانیوە نمونەی قورئان بێنێتەوە و وە قورئان تێکبدات و لێی بشێوێنێ لەبەر ئەوەی الله تعالی فەرمویەتی دەیپارێزم وە پاراستوشیەتی، بەڵام پەرتوکە ئاسمانیەکانی تر الله تعالی بەڵێنی پاراستنی نەدابوو لەبەر ئەوە کەم و کورتی هاتە ناو، جا ئێمە دەبێ ئاوا بە کورتی و پوختی ئیمانمان بە پەرتوکە ئاسمانیەکان هەبێ، وە قورئانیش زیاتر لە هەر هەمویان ئەرکیشە لەسەرمان بڕوامان پێی هەبێ کە مەنهەجی ژیانە ژیانی خۆمان وەکو کەتەلۆکێک لە قورئان تەماشا بکەین و بڕوانین و وەربگرین لەسەری بڕۆین، ئینجا لە پاشان پێمان وابێ قورئان (کلام الله) یە مەخلوق نیە واتە بەدیهێنراو نیە چونکە (کلام الله) سیفەتێکە لە سیفەتەکانی الله، الله تعالی چۆن زاتی مەخلوق نیە و خالیقە خۆی بەدیهێنەرە بەدیهێنراو نیە وە ئاواش سیفەتەکانیشی الله تعالی بەدیهێنراو نین و مەخلوق نین، کە موعتەزیلەکان دەیانگوت قورئان مەخلوقە (پەنا بە الله) هەر لەسەر ئەو وشەش بوو ئیمامی ئەحمەد کە دانەبەزی لە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعە دەیگوت قورئان مەخلوق نیە ئەو هەموو عەزاب و ئازار و ئەشکەنجەی بە دەستی موعتەزیلەکان بینی.

ئینجا قورئان دەبێ ئێمە زۆر ڕێزیشی لێ بنێین وە خوێندنەوەی عیبادەتە موعجیزەیە و دەستە وەسانکاری بەرامبەرەکانێتی لەوەی نمونەی ئەویان پێ نایەتەوە، وە بیکەینە مەنهەجی ژیانمان و ئیمان و بڕوایەکی تەواومان پێی هەبێ،

لە پاشان (الإِيمانُ بِالْرُسُل) دەبێ ئێمە بیروبڕوامان هەبێ لەدڵەوە و بە زمانیش بیڵێین و بەکردەوەش بیسەلمێنین کە ڕەوانەکراوانی الله تعالی کە هەم ڕەسولن هەم نەبین، جیاوازیشیان هەیە لەلای ئەهلی سونە و جەماعە، هەندێک لە زانایانیش پێیان وایە دەڵێن

یەک پێناسە هەردوکیان دەگرێتەوە بەڵام ئەوە ڕاجیح و پەسەندترە کە جیاوازیان هەیە هەریەک پێناسەی سەربەخۆی خۆی هەیە ڕەسول و نەبی.

ڕەسول ئەو زاتانەن کە ماوەیەک پێش ئێستاش بۆمان گوتن کە هەر نێرینەیەک لە بۆچونی ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە، وە مرۆڤبێ، وە لە پاشان ڕیسالەیەک و پەیامێکی خوایی بۆ دابەزیبێ، فەرمانی پێکرابێ ئەو پەیامە ڕابگەیەنێ ئەوە ڕەسولە بەڵام نەبی هەندێ لە زانایان دەفەرمون پێناسەی ڕەسول دەیگرێتەوە ئەوانی تر دەفەرمون نەخێر نەبی پەیامی سەربەخۆی بۆ نەهاتوە لەسەر پەیامی ڕەسولێک پێش خۆی فەرمانی پێکراوە خەڵکی ڕابگەیەنێ، هەندێکیش دەفەرمون نەخێر پەیامی بۆ هاتوە و بەس فەرمانی پێ نەکراوە خەڵکی ڕابگەیەنێ، جیاوازی هەیە لە نێوان زانایانی تانانەت ئەهلی سونە و جەماعەش.

جا دەبێ ئێمە بڕوامان هەبێ الله تعالی ڕەسول و نەبیەکانی ڕەوانە کردوە ئەوانە لە هەموو مرۆڤەکان گەورەترن لەلای الله تعالی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لە فریشتە و مەلائیکەتەکانیش بەرز و بەڕێز ترن ڕەسولەکان وە نەبیاکان، وە لەناو ئەو ڕەسولانەش ئەو نەبیانە و پێغەمبەرانەش (علیهم الصلاة والسلام) ژمارەیەکیان ڕەسولن وە زۆربەشیان نەبین، ڕەسولەکان پلەدارترن لە نەبیەکان لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە، لەناو ڕەسولەکانیشدا بیست و پێنجیان لە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە ڕەسول و نەبی لە قورئانی پیرۆز ناویان هاتوە ئەوانی تر ناویان نەهاتوە ئێمە بە موجمەلی و بە کورتی بڕوایان پێ دەهێنین هەر ئەوەندەی لێ دەزانین، ئینجا لەناو ڕەسولەکانیش لە هەمویان پلەدارتر ئولول عەزمن پێنج پێغەمبەرە دیاریکراوەکە (علیهم الصلاة والسلام) کە بۆچونی ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە و جمهور لەگەڵ ئەوەدایە ئەو ئولول عەزمانە ئەوانەن (نوح، ئیبراهیم، موسا، عیسا، محمد المصطفی (علیهم الصلاة والسلام))، وە لە

پاشان لەناو ئەو ئولول عەزمانەش دوانیان پلەدارترن لە سیانەکەی تر (ئیبراهیم (ﷺ)، وە محمد المصطفى (ﷺ)).

ئیبراهیم (أب الأنبياء)ە باوک و باپیرەی پێغەمبەرەکانی ترە زۆربەی پێغەمبەران نەوەی ئیبراهیم پێغەمبەرن (ﷺ) (عليهم الصلاة والسلام)، وە لە پاشان ئیبراهیم (خليل الله)ی ەهەرە خۆشەیستی الله تعالى یە -جل شئنه-. ئینجا لەنێوان ئەو دوانەشیان محمد المصطفى (ﷺ) پلە دارترە لە ئیبراهیمی باپیرەی (ﷺ) لەبەر ئەوەی (خاتم الأنبياء)ە محمد المصطفى (ﷺ) (سيد المرسلين)ە محمد المصطفى (ﷺ) وە کۆتای هەموو پێغەمبەرانە (ﷺ) (خليل الله)شە محمد المصطفى (ﷺ).

جا کە دەڵێین پلەدارترە ئەو پێغەمبەر و ڕەوانەکراوە لەوەی تر مەعنای ئەوە نیە ئەوی تر بە کەم تەماشا بکرێ ئەوە جائیز و دروست نیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە هەمویان لەوپەڕی پلەدان بەس هەندێکیان لەلای الله تعالى پلەیان بەرزترە ئەویتریش پلەدارە بەبێ ئەوەی کەم و کورتی بۆ بڕیار بدەین و بێتە ناو مێشکمان، بڕوامان پێیان هەیە هەر هەمویان ڕاستن الله تعالى ڕەوانەی کردون و هەر قەوم و نەتەوەیەک ڕەوانەکراوێکی خۆی بۆ ڕەوانە کراوە هەموشیان بانگەوازییان کردوە بۆلای الله تعالى کە تەنها الله بپەرستن لە طاغوت و شیرک و کوفر بەدور کەونەوە: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّـهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ [النحل: ٣٦] الله تعالى دەفەرموێ بێگومان ئێمە بۆ هەموو ئومەتێک و گەلێک ڕەوانەکراو و پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوە کە داوایان لێکردون لە گەل و نەتەوەکانیان وەرن تانها الله بپەرستن وە بە دورکەونەوە لە طاغوت و ئەو پەرستراوانەی جگە لە الله دەپەرسترێن -جل شئنه-.

ئینجا پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) مژدەدەر و ترسێنەرن: ﴿رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ﴾ [النساء: ١٦٥] پێغەمبەران موژدەدەرن بە بەهەشتی پان و بەرین بۆ ئەو کەسانەی شوێنیان دەکەون و بڕوا بە الله دەهێنن وە ترسێنەرن بە دۆزەخی

سوتێن و عەزابی الله تعالی بۆ ئەو کەسانەی سەرپێچی ئەمر و فەرمانەکانیان دەکەن شیرک و هاوبەشی پەیدا دەکەن گوناح و تاوان ئەنجام دەدەن بۆ ئەوەی خەڵک و مەردوم و مرۆڤەکان بەڵگە بە دەست نەبن بەسەر اللەوە -جل شئنە- بڵێن نەمانزانی کامە ڕێگای ڕاستە و پێی دەچینە بەهەشت کامە هەڵە و چەوتە و پێی دەچینە ئاگری دۆزەخ و جەهەنەم بەڵگەیان بە دەستەوە نەمێنێ لەبەر ئەوە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) الله تعالی ڕەوانەی کردن و وە لە پاشان پەیامی پێ ناردن و موژدەدەر و ترسێنەر بون.

ئینجا پێغەمبەری خۆمان موحەمەد (ﷺ) چەند ئەرکێکی لەسەرمان زیاتر هەیە (یەکەم پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) پێغەمبەری هەموو جیهانە و هی هەموو مرۆڤ و جنۆکەکانە دەبێ هەموو بڕوای پێ بێنن، ئەوەی بڕوای بە پێغەمبەر موحەمەد نەبێ (ﷺ) بڕوادار نیە بە کافر حیسابە وە دەچێتە دۆزەخ تەنانەت ئەگەر عیسا و موساش پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ)زیندوبان لەسەر ڕوی زەویان دەبا شوێنکەوتەی موحەمەد بکەون (ﷺ) نەک ئومەت و خەڵکەکانیان بەخۆشیان پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، ئەرکی سەرشانی ئێمە بەرامبەر بە پێغەمبەر (ﷺ) دەبێ پێغەمبەرمان پێ لە هەموو پێغەمبەران گەورەتربێ،وە بڕوای پێ بێنین کە ڕاستگۆ بوە لە هەموو گوتنەکانی وە شوێنی بکەوین ئیقتیدای پێ بکەین بیکەینە سەرمەشقی خۆمان، وە لە پاشان خۆشمان بوێ بە ئەندازەی خۆشویستنی الله نەبێ خۆشەویستیەکەی یەعنی پلەیەک لە خۆشەویستی الله نزمتربێ وە لە خۆشەویستی هەموو دەوروبەر و خۆشمانەوە زیاتربێ خۆشەویستیەکەی ئەو لەناو دڵمانەوە لە هەموو کەس و شتێکمان خۆشتر بوێ، ئینجا بەرگری دەبێ لێبکەین سونەتەکانی زیندو بکەینەوە وە بەرگری لە سونەتەکانیشی بکەین بانگەوازیشی بۆ بکەین) ئەوانە ئەرکی پێغەمبەرە (ﷺ) لەسەر شانی ئێمە کە ئێمە بیپارێزین و وە ئەنجامی بدەین بەرامبەر بە پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) وە گومانیش نەبەین و وە بڕواشمان وانەبێ پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو غەیبیشی زانیوە، ئەوە زۆرجار خەڵک هەڵە دەکا یان خۆشەویستی پێغەمبەر

دەباتە ئاستی خۆشەویستی الله (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەوە خاڵێکی یەکجار ورد و دەقیقە دەبێ لێی وردبینەوە ئێمە اللەمان لە هەموو کەس و شتێک خۆشتر بوێ تەنانەت لە پێغەمبەریش (ﷺ) دەبێ خۆشترمان بوێ ئینجا لە دوای ئەو پێغەمبەر موحەمەدمان خۆشبوێ (ﷺ) لە پێناو الله تعالی بە پلەی دوەم لە دوای خۆشەویستی الله تعالی، پێشمان وا نەبێ پێغەمبەر (ﷺ) غەیبی زانیوە ئیلا ئەو غەیبانەی کە الله تعالی پێی ڕاگەیاندوە ئەویش لە اللەوە بوە -جل شئنە- لە خۆیڕا نەبوە.

(الإِيمانُ بِالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ) ئیمان بەزیندوبونەوە، بۆچی ابن تیمیة -رحمه الله- نەیفەرموە (الإیمان بالیوم الآخر)؟ چونکە لە فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) (الإیمان بالیوم الآخر) هاتوە. (والله أعلم) زیاتر لەبەر ئەوەیە پێداگری لەسەر کردوە وەکو وەڵامدانەوەی هەندێک لە ئەهلی فەلسەفە، چونکە هەندێک لە ئەهلی فەلسەفە بۆچونیان وایە کە زیندوبونەوە وەکو ئەو زیندوبونەوەیەی ئەهلی سونە و جەماعە بڕوایان پێی هەیە لە قورئان باسکراوە و لە فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە ئەوان ئاوا ناڵێن و ئەو جۆرە بڕوایەیان پێی نیە، بەڵکو ئەوان بۆچونیان وایە کە دەڵێن (بالیوم الآخر) ڕۆژی دوایی هەیە بەڵام زیندوبونەوەکە زیندوبونەوەیە تەنها بۆ ڕۆح و گیان بۆ لاشە و جەستە نیە بەڵام لە عەقیدە و بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعە دیارە رۆژی دوایی زیندوبونەوەی تێدایە زیندوبونەوەش بۆ ڕۆح و گیانیشە بۆ لاشە و جەستەشە لەبەر ئەوە زیندوبونەوە پێی دەگوترێ (إخراج الناس من قبورهم أحياء يوم القيامة للقضاء والجزاء) واتە دەرچون و هاتنە دەری مرۆڤ و مەردومە لە گۆڕەکانیان کە زیندو دەکرێنەوە لە ڕۆژیی دوایی بۆ ئەوەی حیسابیان لەگەڵ بکەیێ و مەحکەمەی خواییان لەگەڵ بکرێ -جل شئنە- پاداشت بدرێنەوە ئەوانەی شایستەی پاداشتن تۆڵەیان لێ بستێندرێتەوە ئەوانەی شایستەی تۆڵە لێ سەندنەوەن، هەر لەو پێناوەیە (والله أعلم) ابن تیمیة وای فەرموە کە گوتویەتی (الإِيمانُ بِالْبَعْثِ) نەیگوتوە (الإیمان بالیوم الآخر).

کەواتە سەبارەت بە زیندوبونەوە و ڕۆژی دوایی دەبێ ئێمە بیروبڕوامان وابێ کە ڕۆژێک هەیە الله تعالی فەرمان دەکا بە ئیسرافیل فوبکا بە صوردا ئەوەی مردوە لەناو گۆڕەکانیدا زیندو دەکرێتەوە، یەکەمین کەس کە زیندو بکرێتەوە پێغەمبەری پێشەوایە (ﷺ) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێ من یەکەم کەسم لە گۆڕەکەم زیندو دەکرێمەوە و دەڕوانمە عەرشی الله تعالی دەبینم موسا لەوێ وەستاوە جا نازانم ئایە موسا مردنی بەسەردا نەهاتوە و ئیلا لەو کاتەی صەعقە گرتویەتیەوە کە الله تعالی فەرمانی کردوە لە کاتی ژیانی بوە صەعقەی ڕۆژی قیامەتی بەسەردا نەهاتوە و لەناو نەچوە یان ئەوەیە پێش من زیندو کراوەتەوە بە درێژی (إن شاء الله) بە پشتیوانی الله تعالی یەکێکە لەو بڕگانەی کە لە کۆتایی پەرتوکەکەیدا ابن تيمية -رحمه الله- باسی لێوە کردوە لەوێوە بە درێژتر باسی لێوە دەکەین ئینجا کە مەردوم و خەڵک و مرۆڤەکان وە جنۆکەکان کۆ دەکرێنەوە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا لەوێ حیسابیان لەگەڵدا دەکرێ هیچ شتێک وننابێ هیچ کەسێکیش ناتوانێ ڕابکات و خۆی بدزێتەوە و دزە لەو ڕۆژە بکا لەبەر ئەوەی الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَحَشَرْنَاهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحدا﴾ [الكهف: ٤٧] ئەو ڕۆژە هەر هەمویان کۆ دەکەینەوە کەسێک بەجێ ناهێڵین و لەبیرمان ناچێ هەر هەمویان دەهێنین لەوێدا دایاندەنێین و کەسێک ناتوانێ خۆی بشارێتەوە و حەشاربدا لەو ڕۆژە.

ئینجا دێینە سەر (الإِيمَانِ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ) دەبێ بیروبڕواشمان وابێ وەکو ئەهلی سونە و جەماعە بە قەدەری الله تعالی چ خەیر چ شەڕ، قەدەری الله تعالی وا پێناسەی دەکرێ زانایان دەفەرمون (هو علم الله تعالى بمقادير الأشياء وأزمانها قبل إيجادها ثم إيجادها) دەفەرمون زانست و زانیاری الله تعالی یە بەو شتانەی کە تەقدیر و ئەندازە کراوە هی زەمەن و کاتەکانیان وە خودی شتەکانیش پێشی هاتنەکایەوە و دروست کردنیان وە لە پاش درووستکردنیشیان.

جا کەواتە ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە بیروبڕوایەتی کە دەبێ ئێمە دان بنێین و بەڕاستی دابنێین بیروبڕوایەکی سەدا سەدیمان هەبێ کە الله تعالی خاوەن عیلم و زانست و زانیاریەکی ئەوەلی و ئەزەلیە کە دەوری هەموو شتەکانی داوە وە هەموو شتێک لە عیلمی الله تعالی دایە و الله تعالی هیچ شتێک نیە -جل شئنە- پێیوە شارەزانەبێ و عیلم و زانستی پێی نەبێ، کەواتە هیچ شتێک لە عیلمی الله تعالی بەدەرە نیە ئەوەی ڕابردوە و ئێستایە و داهاتوە، لەبەر ئەوەیە زانایانیش دەفەرمون ئەهلی سونە و جەماعە چەند مەڕتەبەیەک و پلە و پایەیەکمان هەیە بۆ قەدەری الله تعالی بە درێژی لە شوێنی خۆی لەو شوێنەی کە ابن تیمیة دەفەرموێ (وتؤمن الفرقة الناجیة أهل السنة والجماعة بالقدر خیره وشره ، والإیمان بالقدر علی درجتین) دەگەینە سەری (إن شاء الله) لەوێ بە درێژتر باسی دەکەین، وە الله تعالی ش دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ [الفرقان: ٢] الله تعالی هەموو شتێکی بەدی هێناوە.

خەلق مەعنای چیە؟ لەگەڵ سونع جیاوازی هەیە، خەلق بەو مانایە دێت (إیجاد شيء من العدم) شتەکان لە نەبونەوە بهێنیتە بون، ئەوە تەنها لە دەسەڵات و توانای الله تعالی یە بەڵام صونع (تحویل شكل إلی شكل آخر) صونع هەندێک جار لە وێنە و دیمەنێک دەیگۆڕێ بۆ وێنە و دیمەنێکی تر، ئەوە مرۆڤەکانیش الله تعالی ئەو توانایەی پێ بەخشیون، بۆ نمونە دارتاشێک کاتێک دار گوێزێک دەهێنێ لە نەبونەوە ئەو دار گوێزەی نەهێناوەتە بون، دەبێ بەو دارتاشە بگوترێ صانیع نابێ پێی بگوترێ خالیق، چونکە لە نەبونەوە دار گوێزەکە الله تعالی شینی کردوە و هێناویەتیە بون ئەو خالیقە -جل شئنە- بەڵام دارتاشەکە تەنها لە شێوە و شکڵێک دەیگۆڕێ بۆ شێوە و شکڵێکی تر کە دەیکاتە کورسی و مێزێک یان دەرگایەک لە دارەکە شێوە و شکڵەکەی دەگۆڕێ ئەو توانایەش الله تعالی پێیداوە.

جا هەر شتێک لە نەبونەوە کە الله تعالی هێناویەتیە بون ئەندازە و تەقدیرێکی بۆ داناوە هیچ شتێک نیە بەبێ تەقدیری الله تعالی وە بەبێ عیلمی الله تعالی وە بەبێ هێنانە کایەوەی الله تعالی لە خەیر و لە شەڕەکان بەڵام الله تعالی لە شەڕەکان بەرییە تەنها مۆڵەتێکە دەماندا و کاتێک ئێمە بە هەواو هەوەس و نەفسی خۆمان یان بە وەسوەسەی شەیتان یان بە دەستی خۆمان هەڵیدەبژێرن مۆڵەتمان پێدەدا و بۆمان دەهێنێتە کایەوە تاوەکو تاقیکردنەوەکە دروستبێ بە دەستی خۆمان هەڵمان بژاردوە و ئەو کاتە ئەگەر تۆڵەشمان لێ دەستێنێتەوە لەبەر ئەوەی پێغەمبەرانی ناردوە (علیهم الصلاة والسلام) حوجەی لەسەرمان کردوە ڕاست ڕەوانی وە خراپە و هەڵە چوتی و کوفر و شیرکی بە ئێمە نیشانداوە لە ڕێگای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئەوکاتە ئەوپەڕی دادوەرییە کە تۆڵەمان لێ بستێنێتەوە لەو کاتەی تاوان و خراپە دەکەین یان ڕێگای خراپ و نالەبار دەگرینەبەر.

ئا ئەوەبوو بەڕاستی شەش ڕوکنەکانی ئیمانی کە پێدەگوترێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کە لە ئایەتی پیرۆزی قورئان هاتوە وە لە فەرمودەی سەحیحی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ) تۆمار بوە و بۆمان خستنە ڕوو و تەفسیرمان کردن لە ڕابردودا، ئەوانە هەر هەموی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە بە کورتی و پوختی ئەو شەش کۆڵەکەیە هەموو بابەتەکانی عەقیدە و بیروبڕوا لەخۆوە دەگرێبە کورتی و پوختی ئەو شەش کۆڵەکەیە هەموو بابەتەکانی عەقیدە و بیروبڕوا لەخۆوە دەگرێ، لەبەر ئەوەیە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە کاتێک دەستیان کردوە بە نوسینەوەی عەقیدە هاتونە ئەو شەش کۆڵەکەیان هێناوە بایەخیان پێداوە تەفسیریان کردوە وە هەر پرسیارێک دروست بوبێ لە سەردەمەکانی خۆیان وەڵامیان بۆ داناوە بەڵگەیان لە قورئان و سونە بۆ هێناوەتەوە بە ڕاڤە و لێکدانەوەی سەلەفی ساڵحەوە ئەو کاتە هیچیان بۆ ئێمە نەهێشتوەتەوە چونکە عەقیدە و بیروبڕوا شتێکی دامەزراوە وە هەڵهێنجراوی قورئانی پیرۆز و سونەتی پێغەمبەری

دڵسۆزە (ﷺ) بە تێگەیشتنی پێشینانی چاک ئەو کاتە هیچ دوو دڵیەک نامێنێتەوە بۆ هیچ کەسێک بە تەواوەتی لێی حاڵی دەبین و تێدەگەین، وە ئیختیلاف و جیاوازیەکی ئەوتۆ نیە لە بواری عەقیدە و بیروبڕوا لە نێوان ئەهلی سونە و جەماعە ئەهلی سونە و جەماعە زۆربەیان و هەمویان یەک دەنگن بە تایبەت لەو شتانەی کە ئیختیلاف و جیاوازی بەخۆیەوە هەڵناگرێ وە تەنها جیاوازییان هەیە لەگەڵ تاقم و کۆمەڵەکانی تر ئەوانەی دەرچونە لە ڕێبازی ئەهلی سونە و جەماعە وە عەقیدە و بیروبڕوایان وەکو پێغەمبەر و (ﷺ) هاوەڵە بەڕێزەکان نیە جا ئەو پەرتوکێک یان هەر قسەیەک کە دەربارەی ئەو شەش ڕوکنانەبێ پێی دەگوترێ عەقیدە و بیریبڕوا یان پێی دەگوترێ ئیمان یان پێی دەگوترێ تەوحید یان پێی دەگوترێ (علم الكلام) کە زانایانی پێشان ئەو ناوانەیان بۆ بەکارهێناوە.

جا هەندێکیان هەن زیاتر هاتون بایەخیان بە ئەسماء و سیفات داوە چونکە لە سەردەمی ئەوان ئەو کاتە دیارە کێشە لەو بابەتە هەبوە تاقم و کۆمەڵەکان قسەیان لەو شتانە کردوە ئەوانیش وەکو وەڵامێک و ڕونکردنەوە بۆ عەهلی سونە و جەماعە و وە بۆ مرۆڤ و مەردوم و موسڵمانەکان و وەڵامێک بۆ تاقم و کۆمەڵەکان بایەخیان بەوە داوە، هەیانە زیاتر بایەخیان بە هاتنی ڕۆژی دوایی و وە زیندوبونەوە و عەزاب و خۆشیەکانی گۆڕ داوە وەکو وەڵامێک بۆ ئەهلی فەلسەفە و ئەوانەی لەو شتانە قسەیان کردوە.

کەواتە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە گومانی باشی ئەوەیان پێ دەبەین هیچ شتێکیان لە خۆڕا نەکردوە و بۆ خۆ هەڵکێشان و پێدا هەڵگوتن نەبوە کە پەرتوک و شتێکیان نوسیوە یان کار و کردەوەیەکیان کردوە ئیلا کارێک بوە لە لە جێگای خۆی بۆ وەڵامدانەوەی تاقم و کۆمەڵەکانی دژ بە ئەهلی سونە و جەماعە بوە یان بۆ ڕونکردنەوە بوە بۆ موسڵمانەکان تاوەکو بەرچاویان ڕوناک بێ و وە بە ڕێڕەوێکی ڕاست و ڕەوان و دروستدا بڕۆن.

جا ابن تيمية -رحمه الله- دێ سەبارەت بە بەشێک لە ئیمان بە الله تعالى کە تەوحیدی ئەسماء و سیفاتە دێ درێژەی پێدەدا و زیاتر و چاکتر بۆمان ڕوندەکاتەوە چونکە ئەو کێشە

لە سەردەمی ئەو کێشەیەکی گەورە بوە، تاقم و کۆمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە باس و قسەیان لەسەر هەبوە لەو پێناوەدا دێ شیدەکاتەوە زیاتر و بە وردتر تێمان دەگەیەنێ کە ڕێڕەوی ئەهلی سونە و جەماعە سەبارەت بە ئەسماء و سیفاتی الله تعالی چۆنە بۆمان لە قاڵب دەدا چوار چێوەیەکمان بۆ دادەنێ بە بەڵگە هێنانەوەی قورئان و وە سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کاتە چاکتر لێی حاڵی دەبین.

(الإِيمانُ بِاللهِ) وەکو لە ڕابردوش باسمان کرد گوتمان چوار خاڵ لەخۆوە دەگرێ: یەکەمیان (الإیمان بوجوده) بیروبڕوابون بە بون و وجودی الله تعالی، دوەمیان (الإیمان بربوبیة) بیروبڕوابون بە پەروەردگاریەتی الله تعالی، وە سێیەمیان (الإیمان بألوهیة) بیروبڕوابون بە خوایەتی الله تعالی کە تەنها ئەو شایستەی پەرستنە، وە چوارەمیان (الإیمان بأسمائه وصفاته) بیروبڕوابون بە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی و سیفاتە بەرزەکانی.

جا باسی ئەوەمانکرد تا ڕادەیەکی چاک کە (الإیمان بوجوده) مانای چیە، ئێستا لە پێشەکی ئەو بڕگەی ابن تیمیة پێش ئەوەی بخوێنینەوە دەڵێین (الإیمان بربوبیة) بزانین مانای چیە، (الإیمان بربوبیة) یان (توحید الربوبیة) ئەوە پێناسەکەیەتی بە کورتی و پوختی (إفراد الله سبحانه وتعالى بالخلق، والملك، والتدبير) ئەوە پێناسەیەکی کورت پوختە کە عثیمین یش هێناویەتیەوە -رحمه الله- لە شەرحی (العقیدة الواسطیة) کە دەفەرموێ واتە ئیمان و بیروبڕوابون لە دڵەوە جێگیری بکەی بە زمانیش دانی پێدا بێنی بە کردەوە بیسەلمێنی کە الله تعالی تاکو تەنهایە لە خالق و بەدیهێنان لە نەبوونەوە کە شت دەهێنێتە بون تەنها ئەو خالیقە تەنها ئەو بەدیهێنەرە تەنها ئەوە شتەکانی دروستکردوە و لە نەبونەوە هێناویەتیە بون، لە پاشان (والملك، والتدبير) مولکیش واتە الله تعالی خاوەنی ڕاستەقینەی شتەکانە هەر ئەویشە دەتوانێ تەسەڕوفیان تێدا بکا و هەرچیەکیان بەسەر بێنێ ئینجا الله تعالی -جل شئنە- خاوەنی تەدبیرە یانی بەتەدبیرکردن تەدبیر یانی بەڕێوەبردن، لەوپەڕی بە ڕێک و پێکیش الله تعالی یە ئەو شتانەی هێناویەتە کایەوە و ئەو خاوەنیانە و بەڕێشیانەوە دەبا،

شەو و ڕۆژی بۆ ئێمە لە ئەندازەیەکی زۆر ڕێک و پێکی گونجاو دادەهێنێت و هێناویەتیە کایەوە، ئاسمانی ڕاگرتوە الله تعالی، زەوی لە ژێر پێی ئێمە داناوە، ئێمەی دروستکردوە بە ئەندازەیەکی زۆر جوانی ڕێک و پێک کە کەس ناتوانێت شتێکی وا دروستبکا و بنیاد بنێ، کەواتە الله تعالی خاوەنی تەدبیرە بەڕێوبەرێکی لەوپەڕی تەواویەتە بۆ بەدیهێنراوەکانی.

هەندێکیش لە زانایان وای پێناسە دەکەن دەڵێن (إفراد الله سبانە وتعالی بأفعاله) واتە الله تعالی بە تاک و تەنها دابنێی لە کار و کردەوەکانی، چونکە تەوحیدی ڕبوبیە پەیوەندی و پەیوەستی هەیە بە کردارەکانی الله تعالی خەلق فیعلی الله تعالی یە کە لە نەبونەوە شت دەهێنێتە بون، موڵک فیعلی الله تعالی یە کە خاوەنێتیان دەکا، وە تەدبیر فیعلی الله تعالی یە کە بەڕێوەیانەوە دەبا، ڕزق و ڕۆزیدان فیعلی الله تعالی یە تاک و تەنهایە تێیدا کە ڕزق و ڕۆزی خەڵک دەدا، ژیاندن کاری الله تعالی یە کە گیانلەبەرەکان گیانی پێ بەخشین و دەیانژیەنێ، وە مراندن کاری الله تعالی یە کە گیانلەبەران کاتێکی دیاریکراوی بۆ داناون و دەیانمرێنێ وا پێیدا بڕۆ هەتا کۆتایی... هەموو فیعل و کارەکانی الله تعالی الله تعالی لێی بە تاک بگری ئەوەیە تەوحیدی ڕبوبیە.

کافر و موشریکەکان بڕوایان بە تەوحیدی ڕبوبیە هەبوە اللەیان پێ تاک و تەنها بوە لەڕوی دروستکردن و هێنانە کایەوەی مرۆڤ و بونەوەرەکان و جنۆکەکان و بەدیهێنراوەکان، تەنانەت ئەبو جەهلیش ئەو بیروبڕوایەی هەبوە، بەڵام کێشە لە تەوحیدی ئولوهیە هەبوە لەلایەن کافر و موشریکەکان لە دێرین زەمانەوە تا بە ئێستاش دەگا تا قیامەتیش دادێ زۆربەی هەرە زۆریان کێشەیان دیارە لە تەوحیدی ئولوهیە و ئەسماء و سیفات هەبوە بە تایبەت کافرەکان لە تەوحیدی ئولوهیە و لەناو موسڵمانانیشدا ئەو تاقم و کۆمەڵانەی دروست بون کێشەی زۆریان لە ئەسماء و سیفات هەبوو بەڵام لە تەوحیدی ڕبوبیە کێشەیەکی ئەوتۆ نیە، لەبەر ئەوەیە ئەهلی سونە و جەماعە ڕێڕەوی بابەتی وەکو ابن تیمیة

و ابن القيم الجوزية بایەخ زیاتر بە تەوحیدی ئولوهیە و ئەسماء و سیفات دەدەن بەڵام تاقم و كۆمەڵەكانی تر لەوانە ئەشعەریەكان بایەخ زیاتر بە تەوحیدی ڕبوبیە دەدەن ئەوەش بوەتە ڕەخنەیەك لەسەریان چونكە تەوحیدی ڕبوبیە ئەو دور و درێژیەی ناوێ سەلماندنی بون و وجودی الله تعالى بۆ بڕواداران كێشەیەكی ئەوتۆی لەسەر نیە تەنانەت لەگەڵ كافر و بێ بڕواكانیش (والله أعلم بالصواب).

ئینجا (توحيد الألوهية) بە مانای ئەوە دێ (إفراد الله سبحانه وتعالى بالعبادة) كە تەوحیدی عیبادەشی پێ دەگوترێ واتە: واتە الله بەیەكگرتن لە خوایەتیدا لە پەرستش و عیبادەتدا، بە مەعنای ئەوە دێ الله بە تاك و تەنها بزانی لە دڵتدا ئەوە جێگیری بكەی بە زمان بیڵێی بە كردەوە بیسەلمێنی كە الله تعالى لە عیبادەت و پەرستشدا هەر تەنها ئەوە شایستەی پەرستن نابێ شیرك و هاوبەشی بۆ ئەنجام بدرێ و بكرێ، عیبادەتیش دیارە دوو پێناسەی هەیە بە مەعنایە خاس و تایبەتیەكەی بەو ئەمر و فەرمانانە دەگوترێ كە الله تعالى بە بەندەكانی كردوە الله تعالى بپەرستن، سنور و بازنەیەكی دیاریكراوی بۆ داناوە وەكو (نوێژ كردن، ڕۆژوگرتن، زەكاتدان، حەجكردن، جەنگ و جیهادكردن. فەرمانكردن بە چاكە ڕێگری لە خراپە) ئەوانە پێیان دەڵێن عیبادەت و پەرستشی الله تعالى ئەگەر ئەنجامتدا تۆ بویتە عەبدی الله تعالى بەبێ شیرك و هاوبەشی بەندایەتی اللەت كردوە و عیبادەتی تایبەتت ئەنجام داوە بەڵام عیبادەت بە مانایە گشتیەكەی ئەو پێناسەی بۆ هەیە كە لە ڕابردوش ئاماژەمان پێدا و ڕونمان كردەوە (اسم جامع لكل ما يحبه الله ويرضاه من الأقوال والأفعال الظاهرة والباطنة[1]) كە ابن تيمية ئەو پێناسەی كردوە الله پاداشتی بداتەوە لە پەرتوكە نایابەكەی كە بەناوی (العبودية)یە دەفەرموێ واتە عیبادەت ناوێكی كۆكەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی كە الله تعالى خۆشی دەوێ وە الله تعالى پێی ڕازییە لە قسە و گوتنەكان لە عەمەل و كردارەكان ئەوانەی ڕواڵەتن وە ئەوانەی نادیار و پەنهانیشن.

[1] العبودية لشيخ الإسلام ابن تيمية ص ٨.

ئینجا دوو ڕوکنی هەیە عیبادەتی الله تعالی:

ڕوکنی یەکەمیان ئەوپەڕی خۆ بە زەلیل دانان و خۆ بە کەمگرتن ڕوکنی یەکەمی عیبادەتە، عەگەر کەسێک بڵێ من عیبادەت دەکەم خۆی پێ کەم نەبێ بەرامبەر بە الله تعالی و خۆی زەلیل ناکا لەگەڵ عیبادەتەکەی لێی قبوڵ نیە عیبادەت بە خۆ زل زانینەوە بەرامبەر بە الله تعالی و بە منەت کردنەوە قبوڵ نابێ لەلای الله تعالی.

ڕوکنی دوەمی عیبادەت خۆشەویستیەوە ئەگەر کەسێک خۆی لەوپەڕی زەلیلیش دابنێ لە عیبادەت و پەرستشەکان بەڵام بە نادڵی بیکا و خۆشی نەوێت و حەز و ئارەزوی خۆی وەگەڵ نەخا ئەوکاتە قبوڵ نیە لەلای الله تعالی.

لەبەر ئەوەیە ابن القیم دەفەرموێ ڕوکنی عیبادەت بریتیە لەوپەڕی خۆزەلیلکردن و لەوپەڕی خۆشەویستی دەربڕین بۆ الله تعالی و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی.

جا تەوحیدی ئەسماء و سیفاتیش بریتیە لەوەی دان پێداهێنانی هەموو ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی ئەوەی لە قورئانی پیرۆز هاتوە ئەوەی لە سونەتی سەحیحی پێغەمبەری دڵسۆز هاتوە (ﷺ) وە هەموو سیفەتە بەرزەکانی الله تعالی ش ئەوەی لە قورئان و سونە هاتوە بڕوامان پێی هەبێ ئەوە لە دڵمان جێگیری بکەین دانی پێدابێنین بە زمان بە کردەوە بیسەلمێنین، کە ئەو ناو و سیفەتانەی الله تعالی نە لێیان زیاد بکەین نە لێیان کەم بکەین نە گۆڕانکارییان بەسەردا بێنین واتا ڕاستیەکانی بۆ بڕیار بدەین بەبێ ئەوەی گۆڕانکاری بەسەر وشەکاندا بێنین بەسەر مانایەکانیاندا بێنین بەبێ ئەوەی دایبڕێنین و پەکی بخەین تەعطلی بکەین بەبێ ئەوەی هاو وێنە و هاو نمونە بۆ الله تعالی بڕیار بدەین لە ناو و سیفەتەکانی وە بەبێ ئەوەی چۆنیەتی بڵێین و بڕیار بدەین بڵێین (یلیق بجلاله) لەخۆی دەوەشێتەوە الله تعالی ئەوەشیان پێناسەی تەوحیدی ئەسماء و سیفاتە.

**مەزهەبی ئەهلی سونە و جەماعە لە ئەسماء و سیفاتدا بە ئیجمالی:**

وَمِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ: الإِيمَانُ بِمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ فِي كِتَابِهِ الْعَزِيزِ، وَبِمَا وَصَفَهُ بِهِ رَسُولُهُ مُحَمَّدٌ (ﷺ) مِنْ غَيْرِ تَحْرِيفٍ وَلاَ تَعْطِيلٍ، وَمِنْ غَيْرِ تَكْيِيفٍ وَلاَ تَمْثِيلٍ. بَلْ يُؤْمِنُونَ بِأَنَّ اللهَ ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١].

---

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- بەشێک لە ئیمان بون بە الله بە درێژی باس دەكا كە تەوحیدی ئەسماء و سیفاتە بۆمان ڕوندەكاتەوە الله پاداشتی بداتەوە دەفەرموێ (وَمِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ: الإِيمَانُ بِمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ فِي كِتَابِهِ الْعَزِيزِ، وَبِمَا وَصَفَهُ بِهِ رَسُولُهُ مُحَمَّدٌ (ﷺ) مِنْ غَيْرِ تَحْرِيفٍ وَلاَ تَعْطِيلٍ، وَمِنْ غَيْرِ تَكْيِيفٍ وَلاَ تَمْثِيلٍ. بَلْ يُؤْمِنُونَ بِأَنَّ اللهَ ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١]) دەفەرموێ بەشێک لە ئیمان بون بە الله تعالى بریتیە لە ئیمان بون بەو وەسفانەی الله تعالى وەسفی خۆی پێكردوە لە پەرتوكەكەی خۆی كە قورئانی پیرۆزە وە بەو وەسفانەی كە پێغەمبەری پێشەوا محمد المصطفى (ﷺ) وەسفی اللهی پێكردوە لە فەرمودە شیرینە سەحیح و ڕاست و دروستەكانی، بەبێ ئەوەی تەحریفی لەگەڵدابێ تەحریف یەعنی چی؟ تەحریف یەعنی گۆڕان لادان دوو جۆریشی هەیە:

هەندێک جار لادان و گۆڕانكاری هێنانە بەسەر وشەكە لە پیت و زاهیری و لەفز و دەربڕینەكان.

هەندێک جاریش گۆڕان و لادانە لە مانا و واتاكەی.

هەردوكیان نابێ بهێنیتەجێ لەناو و سیفەتەكانی الله تعالى (وَلاَ تَعْطِيلٍ) بەبێ تعطيل تعطيل یەعنی بەتاڵكردنەوە و پەكخستن، نابێ ناوەكانی الله تعالى و سیفەتەكانی الله تعالى ئەوەی لە قورئان و سونە هاتوە پەكیان بخەین دەبێ واتاكانیان بۆ دابنێین و بڕیار بدەین (وَمِنْ غَيْرِ تَكْيِيفٍ) بەبێ چۆنیەتی بۆ دانانی ناڵێن چۆنیەتی نیە ئەهلی سونە و جەماعە بەڵام دەڵێن ئێمە عیلمان نیە بە چۆنیەتیەكان الله تعالى دەزانێ -جل شئنه- چۆنە (وَلاَ تَمْثِيلٍ) بەبێ هاو وێنەهێنانەوە بۆیان و بڕیاردان بەوەی كە بیچوێنین نمونەی بۆ

بهێنینەوە و هاو وێنەی بۆ بڕیار بدەین بە هی دروستكراوەكان (پەنا بە خوای رب العالمین)، بەڵكو ئەهلی سونە و جەماعە كە واناكەن و وا ناڵێن ئەی چی دەكەن و چۆن ئیمانیان هەیە؟ بیروبڕوایان هەیە بەوەی بەڕاستی و بێگومان الله تعالی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] دەفەرموێ هیچ كەس و شتێک بە الله تعالی ناچێ لە ناو و سیفەتەكانی هاو وێنەی نیە وە الله تعالی یش لە زات و ناو و سیفەتەكانی بە هیچ شتێک ناچێ وە لاگاڵ ئەوەدا الله تعالی ش سەمیعە بیسەرە بۆ هەموو شتەكان وە بەصیرە بینەرە بۆ هەموو شتەكان.

لێرەدا ابن تیمیة الله پاداشتی بداتەوە لەو بڕگە مەتنەدا ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە جێگیری كردوە، وەڵامێكیشە بۆ جەهمی و موعتەزیلەكان و باقی تاقمەكانی تر كە هەریەكەیان بە شێوازێک تێكەوتون لە ئەسماء و سیفاتی الله تعالی، بۆ نمونە جەهمیەكان تێكەوتون لە بواری ئەوەی سیفەتەكانی الله تعالی زۆربەی پەک دەخەن و بڕیاری نادەن بۆ الله تعالی، بڕیار نادەن كە الله تعالی سەمیعە و بیسەرە بۆ هەموو شتەكان یان الله تعالی بەصیرە یان عەلیمە یان موتەكەلیمە الله تعالی خاوەنی سیفەتی كەلامە، بەڵكو دەڵێن سەمیعە بەبێ سەمع عەلیمە بەبێ عیلم بەصیرە بەبێ بەصەر (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەو قسانەی ئەوان كە پەكی ناو و سیفاتەكانی الله دەخەن تعطیلی دەكەن كوفر و شیركیشی پێوە دیارە چونكە الله تعالی ئەگەر تۆ بڵێی عەلیمە بەبێ عیلم بە مانای ئەوە دێ كاتێک هەبوە الله تعالی عیلمی نەبوە ئەگەر گوتت الله تعالی كاتێک هەبوە عیلمی نەبوە بەرامبەری عیلم چیە؟ جەهل و نەفامیە، (نعوذ بالله) كەواتە بە ناڕاستەوخۆ سەلماندت و گوتت الله تعالی كاتێک هەبوە (پەنا بە خوای رب العالمین) (ولله المثل الأعلى) جەهلی هەبوە و نەفام بوە (پەنا بە خوای رب العالمین)، لەبەر ئەوە جەهمیەكان بیروبۆچونەكەیان ڕەتكراوەیە ابن تیمیة -رحمه الله- كە ئەو بڕگانەی هێنا و ئاوا عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بۆ ئێمە لە قاڵبدا لەو وشە پڕ نرخانەی لە ڕابردودا باسمان لێوەكرد ە

دیاریان کرد ئەوە وەڵامێکە بۆ جەهمیەکان و باقی تاقم و فیرقەکانی تر کە مونحەریف بونە و لایانداوە لاڕێڕەو و ڕێبازی ئەهلی سونە و جەماعە سەبارەت بە ئەسماء و سیفاتی اللە تعالی.

سیفەتەکانی اللە تعالی وە ناوە زۆر جوانەکانیشی سەرچاوە بۆ ئێمە ابن تیمیة لێرە دیاریکرد و وە ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە بیروبڕوایانە قورئانی پیرۆز و سونەتی سەحیحی پێغەمبەری دڵسۆزە (ﷺ)، سێیەمیان نیە نابێ عەقڵی تێدا بەکار بێنی نابێ سەرچاوەیەکی تر بێنیتەوە چونکە کەس نیە وەکو اللە خۆی بناسێ -جل شئنە- اللە تعالی خۆی خۆی دەناسێ و هەر ئەوە دەتوانێ خۆیمان پێ بناسێنێ وە کەسیش نیە وەکو پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) اللەی ناسیبێ، لە ڕێگای وەحیەوە اللە تعالی هەموو شتە پێویستەکانی بۆ مرۆڤەکان ڕون کردوەتەوە یەکەمین جار و بۆ یەکەمین کەس محەمەدە (ﷺ) لە اللەوە بیستویەتی و وەریگرتوە ئەویش ڕاستگۆیە لەوپەڕی ڕاستگۆیی بە ئێمەی ڕاگەیاندوە.

کەواتە ئێمە دەبێ هەر ناوێکی اللە تعالی هەر سیفەتێکی اللە تعالی کە لە قورئان تۆمار بوبێ لە فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتبێ و بۆمان گێڕدراوەبێ دەبێ بیروبڕوایەکی سەدا سەدی تەواومان پێی هەبێ جێگیری بکەین وو لە پاشان بڕوای پێ بێنین، بۆ نمونە اللە تعالی کە دەفەرموێ عەلیمم دەبێ ئێمە بیروبڕوامان وابێ کە اللە تعالی خاوەنی عیلم و زانستی بوە لە ئەوەل و ئەزەلەوە بەبێ سەرەتا کاتێک نەبوە اللە تعالی عیلم و زانست و زانیاری نەبوبێ وە عیلمەکەشی دەوری هەموو شتێکی داوە هیچ شتێک بەدەر نیە لە عیلم و زانستی اللە تعالی دەبێ ئاوا بۆی بڕیار بدەین و بیروبڕوامان وابێ.

کەواتە سێ خاڵ و شت پێویستە لە ئەسماء و سیفاتی اللە تعالی کە ئێمە وەریدەگرین:

بۆ نمونە کە اللە تعالی بڵێین عەلیمە ئەوە ناوە بۆ اللە تعالی بڕیارماندا، دەبێ بیشی سەلمێنین سیفەتی عیلمی لێ وەردەگیرێ کە اللە تعالی خاوەن عیلمێکی دەوردەری هەموو شتەکانە هیچ شتێک نیە لە عیلمی اللە بەدەر بوبێ لە ئەوەل و ئەزەلەوە بەبێ سەرەتا وە

كۆتاشی نیە عیلم و زانستی الله تعالی، لە پاشان دەبێ ئاسەوار و شوێنەواری ئەو ناو و سیفەتەی الله تعالی لە خۆشمان بێنینەجێ، بەوەی كە زانیمان عەلیمە الله تعالی هەموو شتێكیش دەزانێ دەبێ بترسێین گوناح و تاوان و سەرپێچی فەرمانەكانی نەكەین چونكە عیلمی پێی هەیە و دەزانێ وە تواناشی هەیە تۆڵەشت لێ بستێنێتەوە وە الله تعالی غەزەبیش دەگرێ لەو كەسەی كە سەرپێچی فەرمانەكانی دەكا. ئاوا دەبێ لە خۆمان بێنینەجێ و لێی بترسێین كەواتە دەبێ لێی نزیک بینەوە و لێی بترسێین و سەرپێچی فەرمانەكانی نەكەین وە هەروا با پێیدا بڕۆین باقی ناو و سیفەتەكانی الله تعالی یش.

جا ابن تيمية -رحمه الله- كە فەرمووشی (مِنْ غَيْرِ تَحْرِيفٍ وَلاَ تَعْطِيلٍ) گوتمان تەحریف یەعنی چی؟ تەحریف بە مەعنای ئەوە دێ پێناسەكەی (تغيير اللفظ عن ظاهره ومدلوله) گۆڕانكاری و گۆڕینی لەفز وشە و دەربڕینەكانە لە ڕواڵەتی خۆیدا وە لە بەڵگەبونی لەسەر واتاكانی، كەواتە دوو بەشە تەحریف:

یان تەحریفی لەفزییە لە زاهیری و ڕواڵەتیەكەی هەروەكو الله تعالی دەفەرموێ: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ [طه: ٥] واتە: الله تعالی فەرمویەتی الله تعالی ی ڕەحمان لەسەر عەرش (اسْتَوَى)ی كردوە فەرموی (اسْتَوَى)، (اسْتَوَى) هەندێک لە تاقم و كۆمەڵەكان دەڵێن (إستولى) وا دەڵێن كەواتە (اسْتَوَى)یان گۆڕی بە (إستولى) حەرف و پیتێكیان لێ زیاد كرد گۆڕییان و تەحریفیان كرد، ئەوان دەڵێن ئێمە تەئویلمان كردوە بە مانایەكی لێوەشاوە بۆ الله تعالی بەڵام تەئویل ئەگەر بەڵگەی نەبێ لە قورئان و لە سونە یان لە ئەثەری سەحیحی سەلەفی ساڵح وەكو ئیجماعێک لەسەر، ئەو تەئویلە قبوڵ نیە و تەحریفە گۆڕینی وشەكەیە لە شوێنی خۆی كە الله تعالی نەهی لێكردوە دەربارەی جولەكەكان دەفەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِه﴾ وشەكان دەگۆڕن لە شوێنی خۆیان و لایدەدەن شتێكی تری لە شوێندا جێگیر دەكەن.

ئینجا یان دەڵێن: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ [الفجر: ٢٢] دەڵێن: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ﴾ شتێکی بۆ زیاد دەکەن دەڵێن (وَجَاءَ أَمْرُ رَبِكَ) (پەنا بە الله) یەعنی تەنها ئەمر و فەرمانی الله دێ، فەرمانی الله لە هەموو کات و شوێنێکدا دێ لەوێ الله نەیفەرموە فەرمانم دێ الله تعالی دێ چۆن دێ؟ ئێمە نازانین (یلیق بجلاله سبحانه وتعالی) دێت مەحکەمەی خەڵکەکە بکا لە مەیدانی حەشر و حیسابدا ئەوەیە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە.

جۆری دوەمی تەحریف ئەویش ئەوەیە واتاکەی بگۆڕی وەکو ئەوەی کە دەڵێن کاتێ الله تعالی دەفەرموێ من خاوەن ڕەحمەتم دەڵێن ڕەحمی الله (إرادة الإنعام)ە الله تعالی ویست دەکات کە بەخشش بکات لەگەڵ مرۆڤ و بەدی هێنراوەکانی، بەس ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن نەخێر ڕەحم و بەزەیی الله تعالی بە مەعنایە حەقیقیەکەی خۆی ئێمە بڕیاری دەدەین بەس (یلیق بجلاله سبحانه وتعالی) وەکو هی مرۆڤەکان نیە کە ڕەحم و بەزەیی دڵی پێویستە و سۆزە و لە مرۆڤدا ئەو شتانەیە هی الله تعالی وەکو هی مرۆڤەکان نیە بە دڵنیاییەوە وە بەهی مرۆڤەکانی ناچوێنین لەخۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- بەڵام ڕەحم و بەزەییە نەک بڵێین (إرادة الإنعام)ە و ماناکەی بگۆڕین و تەحریفی بکەین، یان الله تعالی کە دەفەرموێ پێغەمبەریش (ﷺ) کە باسی یەد و دەست دەکرێ بۆ الله تعالی ئێمە دەڵێین (یلیق بجلاله) ئەهلی سونە و جامەعە واتە هەندێک تاقم و کۆمەڵ هەیە دەڵێن مەبەست پێی نیعمەت و قودرەتە نەک دەستبێ بۆ الله تعالی.

(تَعْطِيلٍ) بە مەعنای ئەوە دێ لە زمانی عەرەبیدا بە مەعنای (الإخلاء) دێ یانی بەتاڵ کردنەوە یان پەک خستن موعەطیلەکان پێیان دەگوترێ ئەوانەی خاوەنی تعطیلن لەناو و سیفەتی الله تعالی پێیان دەگوترێ موعەطیلە، لەبەرچی پێیان دەگوترێ موعەطیلە؟ کە ئەنەهو لەو ناو و سیفەتانە الله تعالی یان دارناندوە واتایان بۆ نەگوتوە و پەنچەریان کردوە لەوێوە وایان کردوە کە الله تعالی -جل شئنە- بەبێ سیفەتەکان بێتە بەرچاوان ئیمانی پێ

بێنن ئەوەیان دروست نیە بەبێ ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی واتای بۆ لێک نادەنەوە هەروا بە ڕواڵەتی و بە سەر زار دەیهێنن و دەیڵێن.
کەواتە ئەوەش پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە چونکە ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوایان وایە کە ناو و سیفەتەکانی الله تعالی واتای حەقیقی خۆی هەیە وە بۆی دەهێننەوە بەبێ ئەوەی گۆرانکاری بەسەر بێنن تەحریفی بکەن بەبێ ئەوەی پەکی بخەن واتاکانی بۆ وەردەگرن لە چوارچێوەی ئایەتەکان و فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وە بە فەهم و تێگەیشتنی سەلەفی ساڵح و پێشینانی چاک، کەواتە هەموو ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی ئەهلی سونە و جەماعە جێگیری دەکا وە لەگەڵ سیفاتە بەرزەکانی وە مانا و واتاکانیشی بۆ دەڵێت بە واتایە حەقیقیەکانی وە مانا و زانیاری و زانستی بون بە چۆنیەتیەکەشی ڕەت دەکەنەوە ئیلا الله تعالی بۆخۆی دەزانێ -جل شئنە- ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.
وە لە پاشان فەرموی (وَمِنْ غَيْرِ تَكْيِيفٍ وَلاَ تَمْثِيلٍ) وە ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوایان وایە بە سیفەت و ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی ئەوەی لە قورئان و لە سونە هاتوە بەبێ تەکیف یانی چۆنیەتی بۆ دانان و زانست و زانیاری بڕیاردان دەربارەی چۆنیەتی ناو و سیفەتەکانی الله تعالی وە بەبێ تەمثیلیش چواندن هاو وێنە و نمونە هێنانەوە بۆ ناو و سیفەتەکانی الله تعالی.
(تَكْيِيفٍ) چیە؟ چۆنیەتیە ئەهلی سونە و جەماعە کەیفیەت وشەی کە کاتێک تەماشای دەکەی هەیئەتە شێوە و شکڵە بۆ شتەکە ئەوەیان ڕەت کردوەتەوە دەڵێن ئێمە سیفاتی الله تعالی ناڵێن کەیفیەتی نیە ئەوە ڕەتناکەنەوە بەڵام ئەوە ڕەتدەکەنەوە دەڵێن ئێمە عیلم و زانست و زانیاریهان بە کەیفیەتەکەی نیە الله تعالی خۆی دەزانێ -جل شئنە- کەیفیەتی هەیە و چۆنە ئێمە هیچی لێ نازانین عیلمەکەی ڕەتدەکەینەوە بۆلای الله تعالی بەس دەڵێین

(یلیق بجلاله) الله تعالی ئەوە لە گەورەیی خۆی دەوەشێتەوە لە خۆی دەوەشێتەوە نازانین چۆنە.

ئەهلی سونە و جەماعە نمونەیان زۆرە لەوانە ئیمامی مالیک -رحمه الله- و هەندێکی تر لە سەلەفی ساڵح دەربارەی ئیستیوا کە لێیان پرسیوە فەرمویەتی ئەو پرسیارە بیدعەیە وە نابێ بکرێ بەڵام کە دەشیکەی فەرموی (الاستواء معلوم) ئیستیوا واتە لە زمانی عەرەبیدا و مانایە حەقیقیەکەی شتێکی ڕون و ئاشکرا و زانراوە ئەوە ڕەتناکەینەوە، بەڵام (والکیف مجهول) فەرمویەتی چۆنیەتیەکەی لە ئێمە نادیارە، چۆنیەتیەکەی نادیارە مانای ئەوە نیە کەیفیەتی نیە ئێمە نازانین کەیفیەتەکەی چۆنە عیلمان بە کەیفیەتەکەی نیە عیلم و زانست و زانیاری بە کەیفیەتی و چۆنیەتیەکەی لە ئێمە نادیارە و مەجهئلە ئەوەی ڕەتکردۆتەوە.

تەمثیلیش موستەڵەحێکی قورئانیە، لە قورئانی پیرۆز وو لە حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ) باسی میثل و تمثیل کراوە بۆ ناو و سیفەتەکانی الله باسی تەشبیهی تێدا نیە، تەشبیە کە بە شێکە لە هاو نمونە هێنانەوە ئەهلی سونە و جەماعە کە لە پەرتوکەکانی عەقیدە باسیان کردوە وەکو وەڵامدانەوەیەک بۆ موشەبیهەکان بوە کاتێک ئەوانیش تاقمێک بونە و پەیدابونە و لاڕێ بونە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وەکو وەڵامدانەوەیەک بۆ ئەوان ئەو وشە بەکارهاتوە، بەڵام تەمثیل موستەڵەحێکی قورئانیە فراوانترە لە تەشبیە، یانی کت و مت دوو شتان پێک بچوێنی ئەوە زیاتر تمثیل و هاو نمونایەتیە یان لە زۆربەی شتەکان پێکیان بچوێنی بەڵام تەشبیە پێک چواندنە هەندێک جار ئەگەر لە یەک خاڵ و لە یەک سیفەتیش بێ لە هەر هەمووشی نەبێ و لە زۆربەی نەبێ شتەکان پێک بچوێنی، هەردوکیان ڕەتکراوەن دەربارەی ناو و سیفەتەکانی الله تعالی نابێ ئێمە پێمان وابێ الله تعالی لە زاتی لە سیفەتەکانی وە لە ناوە زۆر جوانەکانی بەهیچ کەس و شتێک ناچێ الله تعالی هیچ وێچونێکی نیە ناو و

سیفەتەکانی الله لەگەڵ ناو و سیفەتەکانی هیچ کەس و شتێک وە هیچ کەسێکیش نیە لە زاتی لە سیفاتی لە ناوەکانیان بە هی الله بچن -جل شئنه-، لەبەر ئەوە ئەو ئایەتە زۆربەی پەرتوکەکانی عەقیدە و ئەهلی سونە و جەماعە ئایەتێک کە زۆر بەکاری بێنن لە ئەسماء و سیفات ئەو ئایەتەیە هەردەم لەسەر زمانیانە هەردەم لە نوسراوەکانیان بەدی دەکرێ و دەبینرێ الله تعالی دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] بوەتە قاعیدە و بنەمایەکی یەکجار گەورە ئەهلی سونە و جەماعە دەستیان پێوە گرتوە کە الله تعالی نەفی دەکا نەفی تەمثیلیەت و هاو وێنە و نمونایەتی دەکا بۆ ناو و سیفەت و زاتی خۆی کە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ هیچ کەس و شتێک لە ناو و زات و سیفاتدا بە الله ناچێ وە الله تعالی یش لەناو زات و سیفاتیدا بە هیچ کەسێک ناچێ لەگەڵ ئەوەدا ئەوە وەڵامە بۆ کێ؟ بۆ ئەوانەی کە تەشبیە و (تەمثیلیان دەکرد یەعنی ئێستا ئەوەی ڕەتکردەوە الله تعالی واتە ئێوە ڕاست نین تەواو نیە عەقیدەتان ئەی موشەبیهەکان ئەی مومەثیلەکان ئەوانەی کە هاو وێنە بۆ الله تعالی دادەنێن و ناو و سیفەتی الله بە هی بەدیهێنراوەکان دەچوێنن یان هی یەکێک لە بەدیهێنراوەکان بە هی الله دەچوێنن (پەنا بە خوای رب العالمین)، لەگەڵ ئەوەدا الله تعالی ئەوە نەبێ ناو و سیفاتیشی نەبێ ئەوە نەبێ زاتیشی نەبێ بەڵکو جێگیریشی دەکات ڕەدی موعەطیلەکانی پێ دەداتەوە ئەوانەی کە موعەطیلەن و پەکی دەخەن ناو و سیفاتی الله تعالی یان موحەریفەن و تەحریفی دەکەن ڕەد و وەڵامی ئەوانیش لەو بڕگەی ئایەتەکەی کۆتایدا هەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ الله تعالی لەگەڵ ئەوەدا بیسەرە وە بینەریشە بۆ هەر هەموو شتەکان واتە سیفاتەکەش جێگیر دەکا بۆ خۆی الله تعالی، هەم ناوی سەمیعە سیفەتی سەمعیشی لێ وەردەگیرێ بە مەعنای دەبیستێ الله تعالی بە بیستنێکی بەدەر لە هەموو بیستنەکان بیستنێک کە لەخۆی دەوەشێتەوە -جل شئنه- کە وردترین و بچوکترین دەنگ و هەست و خوستی شتەکان الله تعالی دەیبیستێ و بەدەر میە لە بیستنی الله تعالی

تا گەورەترینیان لە یەک کات و ساتدا بەبێ ئەوەی الله تعالی -جل شئنه- ئەوەی توش ببێ (ولله المثل الأعلی) لێ تێکچونێک یان تێنەگەیشتنێکی توش ببێ (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەوانە بەدەرە و دورە لە الله تعالی، وەکو مرۆڤەکان کاتێک ئەگەر دوو سێ کەس قسەیەکی بۆ بکا ڕەنگە لێی تێک دەچێ بەڵام الله تعالی -جل شئنه- لە یەک کاتدا ئەگەر هەموو بەدیهێنراوەکان بدوێن و قسە بکەن چ بە پستە پست بێ چ تەنانەت ئەوەی لەناو دڵیشیان دایان ناوە وەکو وەسوەسە و خەیاڵ وە هەتاوەکو گەورەترین دەنگ و قسە هەموی الله تعالی دەبیستێ وە ئاگاداری هەر هەموی دەبێ بەبێ لێ تێک چون (والله أعلم).

کەواتە ابن تیمیة ئەوەی فێرکردین و دایە ئێمە دەفەرموێ ئەهلی سونە و جەماعە خاوەنی ئەو بیروبڕوایەن سەبارەت بە ئەسماء و سیفاتی الله تعالی جێگیری دەکەن هەموو ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی کە لە قورئان هاتوە کە لە حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر هاتوە (ﷺ)، وە هەموو سیفاتە بەرزەکانی الله تعالی کە لە قورئان هاتوە کە لە حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە بەبێ ئەوەی تەحریفی بکەن یانی بیگۆڕن چ لە لەفز و ڕواڵەتی حەرف و پیتێکی لێ بگۆڕن چ لە واتادا ماناکەی وەکو حەقیقی خۆی نەهێنن و لێک نەدەنەوە، وە بەبێ تەعطیل پەکیشی ناخەن واتای بۆ دادەنێن واتایەکی حەقیقی لێوەشاوە بۆ الله تعالی، وە بەبێ تەکیف چۆنیەتیەکەشی ناڵێن عیلمیان نیە بە چۆنیەتیەکەی عیلم بە چۆنیەتیەکەی ڕەتدەکەنەوە، وە بەبێ تەمثیل هاو وێنە و هاو نمونە هێنانەوە بۆ ناو و سیفاتەکانی الله تعالی ئەوە ڕەتدەکەنەوە و الله تعالی لە زات و ناو و سیفاتی بە هیچ کەس و شتێک ناچێ وە هیچ کەس و شتێکیش بە الله تعالی ناچێ -جل شئنه- ، ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە سەبارەت بە ئەسماء و سیفات.

**خولاسەی مەزهەبی ئەهلی سونە و جەماعە لە ئەسماء و سیفاتی الله تعالى:**

فَلاَ يَنْفُونَ عَنْهُ مَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ، وَلاَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ، وَلاَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَاءِ اللهِ وَآيَاتِهِ، وَلاَ يُكَيِّفُونَ وَلاَ يُمَثِّلُونَ صِفَاتِهِ بِصِفَاتِ خَلْقِهِ.

---

لە پاشان درێژە پێدەدا و زیاترمان بۆ ڕوندەکاتەوە ابن تيمية و دەفەرموێ (فَلاَ يَنْفُونَ عَنْهُ مَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ) ئەهلی سونە و جەماعە ڕەتناكەنەوە و نەفی ناكەن و ئەو وەسفانەی الله تعالى وەسفی خۆی پێكردوە (وَلاَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ) ئەوانە هەموی تەئكید كردنەوەیە بۆ بڕگەكانی تر كە لەپێشتردا فەرموی، وە ئەهلی سونە و جەماعە تەحریفی وشەكان ناكەن لە شوێنی خۆیدا لایبەن و چ مانایان بگۆڕن چ وشەكان بگۆڕن و گۆڕانكاری بەسەردا بێنن لە زاهیر و لەفزدا (وَلاَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَاءِ اللهِ وَآيَاتِهِ) وە ئیلحادیش ناكەن، ئێستا دێین مانای ئیلحاد لێک دەدەینەوە، ئەویش بە مانای گۆڕینیش دێ یان بە مانای نەفی و ڕەتكردنەوەش دێ، وە نایگۆڕن و ڕەتی ناكەنەوە ئەسماء و ناوە زۆر جوانەكانی الله تعالى وە ئایەت و بەڵگەكانی خوایی (وَلاَ يُكَيِّفُونَ وَلاَ يُمَثِّلُونَ) وە چۆنیەتیەكەشی بڕیار نادەن وە هاو وێنایەتیش بۆ الله تعالى بڕیار نادەن (صِفَاتِهِ بِصِفَاتِ خَلْقِهِ) وە سیفاتەكانی الله تعالى بە سیفاتەكانی بەدیهێنراوەكانی ناچوێنن و هاو وێنەی بۆ ناهێننەوە.

جا گۆڕین (يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ) لە تەحریف پێشتر گوتمان بە مانای ئەوە دێ هەندێک جار لەفزەكەی دەگۆڕن وەكو: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ [طه: ٥] كە پیتێكی لێ زیاد دەكەن دەڵێن (إستولى) وە هەندێک جاریش ماناكەی دەگۆڕن كاتێ كە دەڵێن ڕەحمەتی الله تعالى بە مانای (إرادة الإنعام) دێت كە الله ویستی بەخشش دەكات نەک ڕەحم بە مەعنایە حەقیقیەكەی بۆ الله تعالى ئەوانە دەگۆڕن یان الله تعالى كاتێک دەفەرموێ: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ [النساء: ١٦٤] دەیگۆڕن و تەئویلی دەكەن دەڵێن لێرەدا موسا فاعیلە الله تعالى مەفعولە، بەو مانایەی (وَكَلَّمَ اللَّهَ مُوسَى تَكْلِيمًا) وای دەگۆڕن

قیرائەت وخوێندنەوەکەی و ماناکەی یەعنی موسا قسەی کردوە و الله بیستویەتی -جل شئنه- نەک الله تعالى قسەی کردوە و موسا بیستویەتی، سیفەتی کەلام ڕەتدەکەنەوە پەکی دەخەن و تەعطیلی دەکەن لە الله تعالى بەڵام وانیە و ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ [النساء: ١٦٤] یەعنی الله تعالى قسەی کردوە وە قسە و کەلامی الله تعالى حەقیقیە و ڕاستە بۆخۆی دەیکا -جل شئنه- سەوت و حەرفێکی هەیە و وە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- کەلامیش سیفەتێکی زاتیە بۆ الله تعالى لە ئەوەل و ئەزەل هەیبوە وە لە هەمان کاتدا سیفەتێکی فعلیە هەر کاتێ ویستبێتی الله تعالى و بیەوێ قسەی کردوە -جل شئنه- وە بەرامبەرەکەی بیستویەتی قسە و کەلا ی الله تعالى بۆ نمونە وەکو موسا پێغەمبەر (ﷺ)، یان هەندێک جار ئەو ئایەتە بەوە دەگۆڕن دەڵێن الله تعالى فەرمانی کردوە دارەکە قسە بکا لەجیاتی الله تعالى و موسا گوێی لێبێ یان فلان فریشتە (پەنا بە خوای رب العالمين) ئەوانە سیفەتی نەقسە پاڵ دەدرێتە لای الله تعالى، الله تعالى بۆخۆی توانایە لەسەر هەموو شتەکان وە سیفەتی کەلامی هەیە بە کەلامی حەقیقی سیفەتێکی زاتیە بۆ الله تعالى وە هەم کردارییە هەرکاتێک بیەوێ قسە دەکا بە کەلامێکی حەقیقی ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

یاخود ئەو ئایەتە وا تەفسیر دەکەن: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ [المائدة: ٦٤] دەڵێن (يعنى قوتە ونعمتە) یانی دەسەڵات و هێزی الله وە نیعمەت و بەخششی الله ناڵێن دەست بۆ الله تعالى، ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن یەد یەعنی دەست بەڵام دەستێک کە لەخۆی دەوەشێتەوە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] وە بە هی هیچێک لە مەخلوقاتەکان ناچێ هی مەخلوقەکانیش هیچیان بە هی الله ناچێ -جل شئنه- وە کەیفیەت و چۆنیەتیەکەی نازانین بۆخۆی دەزانێ الله تعالى -جل شئنه-.

جا ئایەتەکان یەکجار زۆرن ئەگەر بیهێنینەوە بە بەڵگە بەڵام لەبەر ئەوەی لێرە ئێمە هەموی باس ناکەین و نایهێنینەوە چونکە لە درێژەی پەرتوکی (الواسطية) هەمویان باسیان

لێوەكراوە و ئايەت و بەڵگەی یەكجار زۆر هاتوە لە شوێنەكانی خۆی چاكتر و زیاتر ڕونی دەكەینەوە بە پشتیوانی الله تعالى.

كەواتە ئەهلی سونە و جەماعە ئایەتەكان وا تەفسیر دەكەن بە حەقیقەتی خۆی بە ڕێک و پێكی بە تەواوەتی كە دەڵێن: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ [الفجر: ٢٢] تەحریفی ناكەن دەڵێن یەعنی الله تعالى دێتە مەیدانی حەشر و حیساب ئینجا چۆنیەتیەكەی هاتنی چۆنە؟ ئێمە نازانین (یلیق بجلاله سبحانه وتعالى): ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ [النساء: ١٦٤] الله تعالى دواوە و قسەی كردوە لەگەڵ موسا موساش گوێبیستی گوتەكانی الله تعالى بوە چۆنە كەلامی الله تعالى؟ چۆنیەتیەكەی نازانین بەس كەلامێكی حەقیقیە سەوت و حەرفی هەیە (یلیق بجلاله سبحانه وتعالى): ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ [المائدة: ٦٤] دەستانی الله تعالى كراوەن ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون دەستە (یلیق بجلاله): ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] نایگۆڕن مانایەكەی و بەڵام لە الله دەوەشێتەوە و چۆنیەتیەكەشی بڕیار نادەن.

لە پاشان دەفەرموێ (وَلاَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَاءِ اللهِ وآيَاتِهِ) ئەهلی سونە و جەماعە ئیلحادیش ناكەن لە ناوە زۆر جوانەكانی الله و بەڵگە و ئایەتەكانی الله، ابن القيم الجوزية زۆر بە جوانی باسی ئیلحادمان بۆ دەكا لەناوە زۆر جوانەكانی الله تعالى دەفەرموێ: (هو العدول بها وبحقائقها ومعانيها عن الحق الثابت لها[١]) یەعنی لادانە لە مانایە تەواو و ڕاست و دروستەكانی لە حەق و ڕاستیەتی ناوە زۆر جوانەكانی الله تعالى ئەوانەی جێگیرە بۆ الله تعالى.

لە پاشان دەفەرموێ ئیلحاد دەربارەی ناوە زۆر جوانەكانی الله تعالى دەفەرموێ چەند جۆرێكی هەیە، كورتەی پوختەكەی ئاوا دەفەرموێ:

[١] بدائع الفوائد ص ١٦٩.

دەفەرویَ هەندێک جار بت و سەنەمەکا ناویان لیَ دەنریَ وەکو الله وەکو پەرستراو (پەنا بە خوای رب العالمین)، ئا ئەوانە تەحریفە و ئیلحادە لەناوی الله تعالی کە گۆڕدراوە ناوێکی الله تعالی بۆ بتێک بەکار هاتوە و گۆڕانکاریەکیان بەسەر هێناوە، بۆ نمونە وەکو (اللات) گوتراوە لە (الإله) وەرگیراوە تێیەکیان بۆ زیادکردوە و کردویانەتە لات کە دەڵێن ئەوە لە ئیلاهەوە هاتوە و بە مانا ئیلاە دێت وئەو ناوەیان ئیلحاد تێدا کرد یەعنی گۆڕانکاریان بوسەر هێنا لە حەقیقەتی خۆیانیان گۆڕی، وە (العزی) دەڵێن لە (العزیز)ەوە وەریانگرت، ئەو دوو ناوە دوو بت و سەنەم بون بون کە قورەیشیەکان دەیانپەرستن و بڕوایان پیَ هەبون (پەنا بە خوای رب العالمین).

دەفەرمویَ جۆرێکی تر لە ئیلحاد بریتیە لەوەی الله تعالی -جل شئنە- ناوێک کە لێی ناوەشێتەوە هەر لەخۆڕا بڕیاری بۆ بدەی ناوی الله تعالی بەو ناوە بێنی وەکو نەسڕانیەکان الله تعالی (نعوذ بالله) بە (أب) ناو دەبەن بە باوک مەبەستیان پێی باوکی عیسایە (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەوە شیرک و هاوبەشیە، عەوەش جۆرێکی ترە لە ئیلحاد لە گۆڕین لە نەفیکردن و ڕەتکردنەوەی ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی .

وە جۆرێکی تریشی ئەوەیە سیفەتی نەقس بڕیار دەدەن بۆ الله تعالی وەکو جولەکەکان گوتیان الله تعالی هەژارە (پەنا بە خوای رب العالمین) الله تعالی خاوەن کەمالیەتە و غەنیە و دەوڵەمەندە هیچ هەژار نیە ڕەدی دانەوە الله تعالی.

وە جۆرێکی تر ابن القیم دەفەرمویَ ئیلحاد لەناوەکانی الله تعالی بریتیە لەوەی مانایە حەقیقی و تەواوەکانی ناوەکانی الله تعالی بگۆڕی حەقیقەتەکان بڕوات پێی نەبیَ و ڕەتیان بکەیتەوە وەکو جەهمیەکان دەڵێن الله سەمیعە بەڵام سەمعی نیە عەلیمە بەڵام عیلمی نیە بەصیرە بەڵام بەصەری نیە ئەوەش، تەعطیلکردن و پەکخستنی ناو و سیفەتی الله تعالی یە جۆرێکی ترە لە جۆرەکانی ئیلحاد لە ناوەکانی الله تعالی.

وە یان دەفەرموێ ابن القیم جۆرێكی تر لە ئیلحاد لە ناوە زۆر جوانەكانی اللە تعالی پێچواندنی سیفاتەكانی اللە تعالی یە بە مەخلوقەكان كە دەڵێن ئەگەر كەسێك هەیە و هەندێك هەنە لە موشەبیهەكان دەڵێن (یَدُ اللَّهِ كأیدینا) (پەنا بە خوای رب العالمین) دەستی اللە تعالی وەكو دەستی مەخلوقەكانە وەكو هی ئێمەیە ئەوە رەتكراوەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە جۆرێكە لە ئیلحاد لە ناوەكانی اللە تعالی (وسمعە كسمعنا) بیستنی اللە تعالی وەكو هی ئێمەیە، ئەوانە هەر هەمویان ئیلحادە وە ئەهلی سونە و جەماعە رەتی دەكەنەوە بڕوایان پێی نیە[1].

بەڵام ئیلحاد لە ئایەتەكانی اللە تعالی وەكو ابن تیمیة فەرموی ئەهلی سونە و جەماعە پێی رازی نین و رەتیدەكەنەوە ئەویش ئەوەیە واتا حەقیقی و تەواوەكانی ئایەتەكان دەگۆڕدرێن ئەوەی اللە تعالی مەبەستێتی -جل شئنە- لا دەدرێ مەبەستەكەی اللە تعالی واتایەكی تری بۆ دادەنرێ ئەهلی سونە و جەماعە پێی رازی نین: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ﴾ جولەكەكان كە وایان كردوە و اللە تعالی ش باسی كردونە.

ئینجا كە فەرموی (وَلاَ يُكَيِّفُونَ وَلاَ يُمَثِّلُونَ صِفَاتِهِ بِصِفَاتِ خَلْقِهِ): ئەوەش پێشتر باسمانكرد بە دور و درێژی.

كەواتە ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ و مەبەستی ئەوەیە و تەئكید دەكاتەوە دڵنیامان دەكا كە ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوایان وایە تەحریف رەتدەكەنەوە تەمثیل رەتدەكەنەوە لە ناو و سیفەتەكانی اللە تعالی وە تەعطیل رەت دەكەنەوە واتای حەقیقی بۆ ناوە زۆر جوانەكانی اللە تعالی دادەنێن، وە تەكیف و چۆنیەتی عیلم بون زانستی بون بە تەكیف و چۆنیەتی ناو و سیفەتەكانی اللە تعالی رەت دەكەنەوە ئەوە بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعەیە، قەتاوقەت ئەهلی سونە و جەماعە ناگۆڕن ناوە زۆر جوانەكانی اللە تعالی سیفاتە زۆر بەرزەكانی اللە تعالی ئەوەی لە قورئان و لە سونە هاتوە چ لەفز و

[1] كتاب فائدة جليلة في قواعد الأسماء الحسنى، ص: ٤٦.

وشەكان بگۆڕن بە حەرف و پیتی تر بێننە شوێنی چ مانای بگۆڕن یان پەكی ناخەن و مانای حەقیقی تەواوی لێوەشاوە دادەنێن بۆ الله تعالی، وە لە پاشانەكە هاو وێنە و هاو نمونە بۆ الله تعالی دانانێن لە ناو و سیفات و زاتی، وە لە پاشانەكە چۆنیەتیەكەشی عیلم و زانستی خۆیان ڕەت دەكەنەوە دەڵێن ئێمە نازانین چۆنیەتیەكەی چۆنە الله تعالی دەزانێ -جل شئنە- دائیمەن ئەو وشە بەسەر زمانیاندا دێ، ئەگەر دەڵێن الله تعالی سەمیعە یان بەصیرە یان دەستی هەیە دەڵێن (یلیق بجلالە سبحانە وتعالی) لە گەورەیی و لە خۆی دەوەشێتەوە الله تعالی -جل شئنە-.

**پێداهەڵدانی الله تعالی:**

**أَنَّهُ سُبْحَانَهُ: لاَ سَمِيَّ لَهُ، وَلاَ كُفْءَ لَهُ، وَلاَ نِدَّ لَهُ. ولاَ يُقَاسُ بِخَلْقِهِ سُبْحَانَهُ وَتعَالى. فَإِنَّهُ سبحانه أَعْلَمُ بِنَفْسِهِ وَبِغَيْرِهِ، وَأَصْدَقُ قِيلاً، وَأَحْسَنُ حديثًا مِنْ خَلْقِهِ.**

---

دوایی ابن تیمیة لە درێژەی وتەكانیدا دەفەرموێ (أَنَّهُ سُبْحَانَهُ: لاَ سَمِيَّ لَهُ، وَلاَ كُفْءَ لَهُ، وَلاَ نِدَّ لَهُ. ولاَ يُقَاسُ بِخَلْقِهِ سُبْحَانَهُ وَتعَالى. فَإِنَّهُ سبحانه أَعْلَمُ بِنَفْسِهِ وَبِغَيْرِهِ، وَأَصْدَقُ قِيلاً، وَأَحْسَنُ حديثًا مِنْ خَلْقِهِ) دەفەرموێ لەبەر ئەوەی الله تعالی پاک و بێگەردە لەوەی هاو وێنەی هەبێ، الله تعالی هاوكوفی هەبێ، الله تعالی نمونەی هەبێ، وە دەفەرموێ الله تعالی قیاس ناكرێ ئەندازە ناكری بەسەر بەدیهێنراوەكانی پاک و بێگەردی وبەرزی بۆ ئەو اللهیە چونكە اللهی پاک و بێگەرد خۆی شارەزاترە لەهەموو شارەزایان بە خۆی بە زاتی خۆی وە بە غەیری خۆشی شارەزایە، وە الله تعالی ڕاستگۆترە لە هەموو ڕاستگۆیان لە قسە و گوتن و فەرمودەكان، وە لە هەموو كەسێک چاكتر قسە دەكات لە مەخلوق و بەدی هێنراوەكانی، لەبەر ئەوە ئێمە دەبێ هەموی وەرگرین لە الله تعالی و بە هیچ شێوازێک قسەكان نەگۆڕین و تەحریفیان نەكەین تەعطیلی نەكەین تەمثیلی نەكەین وە عیلمی خۆمان ڕەت كەینەوە بە چۆنیەتیەكانی.

ئينجا كە دەفەرموێ (لَا سَمِيَّ لَهُ) بە بەڵگەی ئەو ئايەتە كە الله تعالى فەرموی: ﴿هَلْ تَعلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا﴾ [مريم: ٦٥]، وە كە دەڵێ (وَلَا كُفْءَ لَهُ) بە بەڵگەی ئەو ئايەتەيە كە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَلَم يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحد﴾ [الإخلاص: ٤] الله تعالى هاو وێنە و هاو كوفی نيە -جل شئنه-، بە بەڵگەی ئەو ئايەتەش ابن تيمية دەفەرموێ كە دەفەرموێ (وَلاَ نِدَّ لهُ) يەعنى: ﴿فَلَا تَجعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُم تَعلَمُونَ﴾ [البقرة: ٢٢] (أَندَاد) جەمع و كۆی نيدە نيد يانی هاو وێنە و هاو نمونە چ لە ڕوی خۆشەويستی بۆ الله چ لەهەر بوارێكی تر.

ئينجا ئەوانە هەموشيان لێك نزيكن بەس ئەو وشە لێك نزيكانە ابن تيمية هێناويەتيەوە و هەموی ڕەتكردوەتەوە (بە بەڵگەی قورئانی) هەيە جێگيری كردوە لە عەقيدەكەی خۆی، چونكە سەمی و كوفء و نيد زۆر لێك نزيكن ماناكانياب پێكيش دەچن، يەعنی وەكو الله نيە هاو وێنەی نيە هاو كوفی نيە هەموی ئەو مانايانە دەگرێتەوە.

وە لە پاشان كە فەرموی (ولاَ يُقَاسُ بِخَلْقِهِ سُبْحَانَهَ وَتَعَالَى) يەعنى نابێ ئێمە بە هيچ شێوازێك هيچ كەس و شتێك بهێنينە ئاستی الله لە زاتی لە سيفاتی لە ناوەكانی بەڵكو الله تعالى وەكو هيچ كەس و شتێك نيە و قياس ناكرێ نە لە زاتی نە لە ناوە زۆر جوانەكانی نە لە سيفاتە بەرزەكانی لەسەر هيچ كەس و شتێك، لەبەر ئەوەيە هەندێك لە موعتەزيلەكان و ئەهلی عەقڵ و تاقم و كۆمەڵەكانی تری جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە توشی لاڕێيی بونە كاتێك كە تۆ دەڵێی الله تعالى ئەوە سيفەتێتی ئەو دێ بە عەقڵی خۆی دەڵێ مادەم بە هی مەخلوق دەچێ بە هی فلان دەچێ من هی فلانم بينيوە قياسی دەكات لەسەر مەخلوق و فلانيەكان ئينجا هەندێكيان ڕەتی دەكەنەوە و دەڵێن چۆن دەبێ ئێمە ئەوە بڵێين؟ ئەوە توشی تەشبيە دەبين توشی تەمثيل دەبين، نا كاكە الله تعالى ئەهلی سونە و جەماعە ئەوها بيروبڕوايان هەيە قياس ناكرێ لەگەڵ هيچ كەس و شتێك تاك و تەنهايە لە زاتی و لە ناوە زۆر جوانەكانی لە سيفاتە بەرزەكانی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْء وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] الله تعالى بڕانديەتيەوە هيچ كەس و شتێك لە زات و لە ناو

و له سیفاتی به الله ناچێ وه الله تعالی یش به هیچ کەس و شتێک ناچێ قیاس ناکرێن لەگەڵ الله تعالی الله تعالی لەگەڵ هیچ شتێک قیاس ناکرێ وه الله تعالی سەمیع و بیسەرە وە بەصیر و بینەرە.

(فَإِنَّهُ سبحانه أَعْلَمُ بِنَفْسِهِ وَبِغَيْرِهِ) بەڵێ الله تعالی عیلم و زانستی دەوری هەموو شتێکی داوه هیچ شتێک نیه له عیلمی بەدەربێ الله تعالی بۆخۆی خۆی چاکتر دەناسێ وه عیلم و زانستی تەواوی هەیه بەخۆی وه به غەیری خۆشی له مەخلوق و بەدی هێنراوەکان ئێمه ئەو عیلم و زانست و زانیاریەمان نیه به الله تعالی وەکو خۆی خۆی دەناسێ هەر دەبێ له خۆشیەوه وەربگرین ناسینی الله تعالی وه ناوه زۆر جوانەکان و سیفاته بەرزەکانی که الله تعالی دەفەرموێ: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ [الملك: ١٤] یان دەفەرموێ: ﴿عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ [المائدة: ١٠٩] واته زۆر زانا به شته پەنهانەکان: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾ [طه: ١١٠] کەس ناتوانێ عیلمی هەبێ و زانیاریەکی هەبێ دەوری الله بدا بەڵام الله تعالی عیلم و زانست و زانیاریەکەی دەوری هەموو شت و کەسەکانی داوه، وه هەر الله تعالی مەبەستی هەیه له ئایەت و وشه و گوتەکانی بۆخۆی له مەبەستی خۆی شارەزایه و دەبێ ئێمه ئەوه بڕیار بدەین کەواته الله تعالی ش (وَأَصْدَقُ قِيلاً) ابن تيمية فەرموی له هەموو کەس و شتێک ڕاستگۆتره له قسه و گوتنەکانیدا: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾ [النساء: ١٢٢] ئەو ئایەته بەڵگەیه الله تعالی فەرموی کێ هەیه له الله ڕاستگۆتربێ له قسه و گوتنەکان؟ کەس نیه ئێمەش ئەو شاهێدیه دەدەین، له پاشان فەرموی (وَأَحْسَنُ حديثًا مِنْ خَلْقِهِ) که الله تعالی له هەموو قسه و گوتنەکان وه له هەموو گێڕانەوەکان الله تعالی له هەموو مەخلوق و بەدیهێنراوەکانی قسەکانی چاکتره و لەجێتره و ڕاستگۆتره -جل شئنه- کەواته: ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ * وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ﴾ [البلد: ٨-٩] ئەوەی به بەڵگه هێناوەتەوه هەر لەوەوه وەریگرتوه ابن تيمية -رحمه الله-.

(فَإِنَّهُ سبحانه أَعْلَمُ بِنَفْسِهِ وَبِغَيْرِهِ) وشەی (أَعْلَمُ) کە ابن تيمية فەرموی الله تعالی پاک و بێگەردی بۆ ئەو زۆر زاناترە بەخۆی وە بە غەیری خۆشی لە مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان لە هەموو کەس و شتێک، جا (أَعْلَمْ) دیارە سیغەیەکە لە زمانی عەرەبی پێی دەگوترێ (اسم تفضيل) واتە پلەدارییەکە پێی ئەدرێ لەو نزمتریش ئەگەر نەگاتە ئاستی ئەویش لە عیلم و زانستیەوە کەواتە عالمیش هەیە و وە ئەگەر ئەویش (أَعْلَمَ)، جا هەندێک لە موفەسیرین و زانایانی ئیسلام لە تەفسیری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە (أَعْلَمْ) دێ دیارە ئاوای تەفسیر دەکەن و لێکی دەدەنەوە کە دەڵێن (أَعْلَمْ) بە مەعنای عالمە بۆ الله تعالی واتە (اسم الفاعل) الله تعالی زانایە بە شتەکە بەڵام هەندێک لە زانایانی تری ئەهلی سونە و جەماعە لە سەردەمیەکان ابن عثيمين -رحمه الله- دەفەرموێ نەخێر مانایە ڕاستیەکەی خۆی (أَعْلَمْ) کە (اسم تفضيل)ە ئەوە بۆ الله بڕیار دەدرێ -جل شئنه- چونکە (أَعْلَمْ) لە زمانی عەرەبیەوە کە بە مانای ئەوە دێ کە زاناترە بۆ الله تعالی جێگیرە -جل شئنه- وە چاکترە ئەوە جێگیر بکەین وەکو الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلاً﴾ [النِّسَاء: ١٢٢] واتە بۆ الله دەگونجێ (اسم تفضيل) بەکاربێ بە مانایە حەقیقی و ڕاستیەکەی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا، کە الله تعالی بەو مانایەی تەواو تەواو زاناترە مەرج نیە شەریک و هاوبەشی هەبێ یان لە ئەو نزمتر لە ئاستی شتەکانی غەیبی و پەنهان یان لە شتەکانی کە ناشێ و ناگونجێ مەخلوق و بەدیهێنراو شارەزاییان لێی هەبێ هەبن بەڵام بۆ زیاتر موبالەغە کردنەکە (اسم تفضيل)ەکە کە بەکاردێ بۆ جێگیر کردنی حەقیقیەت و ڕاستیەتی و تەواویەتی تری ئەو وەسف و سیفەتەی الله تعالی یە -جل شئنه-.

**الله تعالی پێغەمبەرەکانی هەڵبژارد بەسەر هەموو خەڵکدا:**

ثُمَّ رُسُلُه صَادِقُونَ مُصَدَّقُونَ؛ بِخِلَافِ الَّذِينَ يَقُولُونَ عَلَيْهِ مَا لاَ يَعْلَمُونَ.

---

لە پاشان الله تعالی کە فەرموی لە ڕابردودا گوتمان زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون (وَأَحْسَنُ حَدِيثًا مِنْ خَلْقِهِ) کە ابن تیمیةش تۆماری کردوە لە مەتنی (الواسطية)

واتە اللە لە دواندن و قسەکانی -جل شئنە- قسەکانی لەوپەڕی چاکیە و وە جوانیە و ڕێک و پێکی و تەواوییە لە هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان اللە تعالى چاکتر و زیاتر و جوانتر قسەکانی جێگیرە و لەجێیە -جل شئنە-، جا گوتمان اللە تعالى کە بۆخۆی -جل شئنە- ئەو نوتق و قسە و گوتنانەی داوەتە بەدیهێنراوەکانی لەبەر ئەوە لە ڕابردودا گوتمان ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون: ﴿أَلَم نَجعَل لَّهُۥ عَينَينِ * وَلِسَانا وَشَفَتَينِ﴾ [البلد: ٨-٩] اللە تعالى دەفەرموێ ئایە ئێمە دوو چاومان پێیان؟ نەداوە زمانمان نەداوە؟ دوو لێوەکانمان نەداوە؟ واتە اللە بەخشیویەتی بە مەخلوق و بەدیهێنراوەکانی، بەڵێ اللە تعالى -جل شئنە- ئەو توانایەی هەیە ئەو فەزڵ و بەخشانەی کەوا کردوە بۆخۆشی لەوپەڕی تەواوییە -جل شئنە- لە وەسف و سیفەتەکانیدا لە زانیاری و عیلمدا وە لە ڕاستگۆیی و قسە لەجێی و تەواوەتی گوتەکان و کەلامەکەی -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى).

لە پاشان ابن تیمیة هاتە سەر ئەوە و فەرموی (ثُمَّ رُسُلُهُ صَادِقُونَ مَصدُوقُونَ) فەرموی لە پاشان ڕەوانە کراوەکانی (رُسُل) تەبعەن جەمع و کۆیە لە زمانی عەرەبیدا کە تاکەکەی (رَسُولْ)ە، ڕەسولیش ئەو زات و کەسانەن کە وەحی و نیگایان لە اللە تعالى وە بۆ دابەزیوە بە پەیام و پەرتوکێکی تایبەتەوە فەرمانیشیان پێکراوە کە ڕای بگەیەنن بە قەوم و گەلەکانیان بەوانەی کە پێچەوانەی ئەوانیش بونە، ئینجا دەفەرموێ ابن تیمیة لە پاشان اللە تعالى ڕەوانە کراوەکانی خۆی ڕەوانە کرد پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) (صَادِقُونَ مُصَدَّقُون) یان هەندێک جاریش خوێندراوەیە بە (صادقون مصدوقون) هەردوکیان مانا دەکەین کە لە هەریەک لە نوسخەکانی (الواسطية) هەردوکیان تۆمار بوە و هاتوە.

جا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون واتە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ابن تیمیة مەبەستی لێی ئەوەیە کە ڕاستگۆنە، (صَادِق) بە مەعنای ئەوە دێ کە قسەکەی هەواڵەکەی خەبەرەکەی کە دەیدا تێیدا ڕاستگۆیە چونکە (صَادِقُونَ) جەمعی (صَادِق)ە

(صَادِق)یش (اسم لمن قام به الصدق) ناوێکە بۆ کەس و زاتێک کە ڕاستگۆیی پیشەی بێ و پێی هەڵبستێ لە قسەکانیدا ڕاستگۆبێ، صیدقیش دیارە لە زمانی عەرەبیدا (مطابقة الخبر للواقع يعني الصدق أن يطابق الواقع ما تقوله) واتە ڕاستگۆیی ئەوەیە قسەکە لەگەڵ واقیع و شتە بەرچاویەکە یەک بگرێتەوە لەو شتەی کە لە بوندایە بەوە دەگوترێت ڕاستگۆیەتی، واتە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ڕاستگۆ بونە لەو هەواڵ و قسەی کە گوتویانە لەگەڵ واقیع تێکی کردوەتەوە.

جا لە پاشان (مُصَدَّقُون) بە مەعنای ئەوە دێ دیارە ئەگەر بڵێین (مُصَدَّقُون) یەعنی واجبە لەسەر ئومەتەکانیان پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بە ڕاستگۆیان دابنێن لە هەواڵ و خەبەرەکان کە هێناویانە لە لای الله تعالى، واتە بەڕاست دانراون لەلایەن ئومەتەکانیان ئەوانەی شوێنیان کەوتونە ئەوە واتای (مُصَدَّقُون)ە، بەڵام (مَصْدُقُون) بە واتای ئەوە دێ دیارە کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) خۆیان ڕاستگۆنە لە قسەکانیان (عليهم الصلاة والسلام) چونکە (مَصْدُقُون) وەکو ئیبنو مەسعود ڕیوایەتی کردوە لە یەکێک لە حەدیسەکان ئاوا ناوی پێغەمبەریش دەبا (ﷺ) دەفەرموێ: «أَخْبَرَني الصّادقُ المصْدوقُ» واتە هەواڵی بە من داوە ئەو کەسە ڕاستگۆیە کە پێغەمبەرە (ﷺ)، (المَصدُوقُ) کە تەصدیقی قسەکانیشی هەیە هەم لەلای خۆیەوە و هەم الله تعالى یش تەصدیقی کردوە، واتە ئەوانە الله تعالى بەڕاستی داناوە قسەکەیان تەصدیقیان دەکا بە ڕاستیان دادەنێ مۆری ڕاستگۆیی لەسەر قسەکانیان دراوە ئەوە واتای (مَصْدُقُون)ە.

لە پا شان دەفەرموێ (بِخِلَافِ الذِينَ يَقُولُونَ عَلَيهِ مَا لا يَعْلَمُونَ) پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بە پێچەوانەی ئەوانە بونە کە قسەیان کردوە دەربارەی الله تعالى و لە سەر الله تعالى و وەسفیان کردوە بەبێ عیلم و زانستی چونکە قسەکردن بەبێ عیلم و زانستی نەفامیەتە بەڕاستی الله تعالى قبوڵی ناکا وە الله تعالى لێیان وەرناگرێ کە دەفەرموێ:

﴿وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ [الأعراف: ٣٣]

واتە ئێوە شـــیرک بۆ اللە ئەنجام دەدەن بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکتان بۆ دابەزیبێ لەلای اللە تعالى و بەڵگەیەکتان لە دەســـت بێ لەو شـــیرک و هاوبەشـــیە وە ئێوە قســـە دەکەن لەســـەر اللە بەبێ ئەوەی عیلمتـــان هەبێ و بیزانن و بە عیلمەوە قســـە بکەن، جا موعتەزیلەکان و جەهمیەکان بەڵێ لەوپەڕی نەفامیەوە وە باقی تاقم و کۆمەڵەکانی تری دژ بە ئەهلی سونە و جەماعە قسەیان کردوە دەربارەی اللە تعالى -جل شئنە- چونکە اللە تعالى -جل شـــئنە- پاک و بێگەردە لەو قســـانەی کە موشریک و کافرەکان دەربارەیان کردوە و هەڵیان بەستوە.

ئایە کێن ئەوانەی کە پێچەوانەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) قسە بەبێ عیلم و زانســـتی دەربـــارەی اللە دەکەن؟ اللە تعـــالى لە ئـــایەتەکە مەبەســـتی پێی موشریکە عەرەبەکانە قورەیشـــیەکان ئەوانەی وەسـفی اللەیان کردوە بەبێ عیلم وە ئەوانەی شـوێن پێی ئەوانیشـــیان هەڵگرتوە وە لە ئومەتەکانی پێغەمبەرانی پێشـــتریش (علیهم الصـــلاة والســـلام) کە دەر بارەی اللە قســـە یان کردوە ئەوانە کافر بونە و بێ بڕوا بونە کە اللە دەفەرموێ: ﴿وَهُم يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰـــــنِ﴾ [الرعد: ٣٠] لە بێ علمیەوە ئەوانە چی دەکەن؟ کافریش دەبن بە اللە تعالى بەو قسانەی بەبێ عیلمەوە دەربارەی اللە تعالى قسە دەکەن.

**اللە ستایشی خۆی کرد بەوەی کە موخالەفەی پێغەمبەران بون وەسفیان پێی دەکرد:**

وَلِهَذَا قَالَ: ﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ * وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ * وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ [الصافات: ١٨٠-١٨٢]. فَسَبَّحَ نَفْسَهُ عَمَّا وَصَفَهُ بِهِ الْمُخَالِفُونَ لِلرُّسُلِ، وَسَلَّمَ عَلَى الْمُرْسَلِينَ؛ لِسَلامَةِ مَا قَالُوهُ مِنَ النَّقْصِ وَالْعَيْبِ.

---

جا لە پا شان ابن تیمیة -رحمە اللە- دەفەرموێ (وَلِهَذَا قَالَ) هەر لەبەر ئەوە شە اللە تعالى فەرمویەتی: ﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ * وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ * وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ [الصافات: ١٨٠: ١٨٢] اللە تعالى ئەو ئایەتانەی فەرموو ئەو ئایەتانە کە

ابن تيميةش به بەڵگەی هێناوە واتە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاكی و بێگەردی بۆ پەروەردگارەكەت لە شيرك و هاوبە شی و ئەو وە سف و هاوڵناوانەی پاڵیدەدەنە لای الله تعالى كە الله تعالى خاوەن عیزەتە لەو وەسفانەی دەیكەن پاك و بێگەردی بۆ ئەو، وە سەلامی خوایی لە سەر ڕەوانەكراو و پێغەمبەران بێ (عليهم الصلاة والسلام)، وە هەموو سوپاس و ستایشەكان شایستەی خوای پەروەردگاری جیهانیانە و بۆ ئەوبێ.

جا (سُبْحَانَ) لە زمانی عەرەبیدا دیارە مەفعولی موتڵەقە ئەو مەفعولی موتڵەقە بۆ تەئكید كردنەوەی فعلێكی پێش خۆیەتی كە تەقدیر دەكرێ واتە (أسبح سبحانه) یەعنی من پاك و بێگەردی بڕ یار دەدەم بۆ ئەو خوایەی كە شایستەی ئەوەیە پاك و بێگەردبێ و تەئكیدی دەكەمەوە، جا (سُبْحَانَ)ش لە زمانی عەرەبیەوە لە قاموس و فەرهەنگەكان بە مانای (إبعاد) دێ یانی دورخستنەوە وەكو دەڵێن (سبحان فلان من كذا) یانی بەدوربێ فلانەكەس لەو شتە یان ئەو شتە لەو بەدوربێ هەروەكو لەلای عەرەبەكان وا بەكارهاتوە، جا (سُبْحَانَ) بۆ الله تعالى دیارە پاك و بێگەردایەتی ئەوە دەگەیەنێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە یانی الله بە پاك و بێگەرد دەگرم لە هەموو شیرك و هاوبەشیەكان لە ڕبوبیەت و پەروەردگاریەت كە مولحید و بێ بڕواكان پاڵیان داوەتە لای الله تعالى، وە (سبحان الله) مانای ئەوەش دەگەیەنێ یانی الله بە پاك و بێگەرد دەگرم لە هەموو شیرك و هاوبەشیەكانی هاوبەش پەیداكاران و موشریكەكانی لە ئولوهیەت و پەرستن و خوایەتی اللهدا شیرك و هاوبەشیان بۆ ئەنجام داوە، وە الله بە پاك و بێگەرد دەگرم لە ناوە زۆر جوانەكانی و سیفاتە بەرزەكانی كە ماناكانی بە حەقیقی خۆیان دەڵێین وەكو خۆی دەڵێین وە چۆنیەتیەكەی نازانین بەوەی لە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنە- بەبێ ئەوەی نەفی بكەین و ڕەتی بكەینەوە و بە هی هیچ كەس و شتێكی بچوێنین، وە لە پاشان پاك و بێگەردی بۆ الله تعالى لە هەموو فەرمانە كەونیەكانی وە لە هەموو تە قدیر و

ئەندازە و ویستە کەونیە کانی الله تعالی کە هەموی لەوپەڕی حیکمەت و تەواوییە ئەگەر ویست و ئیرادەی کەونی لەگەڵ هەر شتێکدا نەبێ نابێ وە هیچ شتێکی لە خۆڕا نەکردوە الله تعالی بەبێ بەڵگە و بەبێ حیکمەت و بەبێ کارلەجێی -جل شئنه-، وە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ( سبحان الله) بە مانای ئەوەش دێ پاک و بێگەردی بۆ الله تعالی لە شەرع و فەرمان و یا ساکانی کە دایناوە و کەم و کورتی تێدا نیە لەوپەڕی تەواوییە ئەوە مانای (سُبْحَانَ رَبِّكَ) دەگەیەنێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە، واتە پاک و بێگەردی لە هەموو قسە و هەڵبەستراو و دیعایە و گوتنە کانی کە لە الله ناوەشێتەوە کەم و کورتیە کان کە پێچەوانانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە هەر سەردەم و کاتێکدا کە دەریان بڕیوە و گوتویانە.

جا لە پا شان پێویستە هەڵوە ستە لە سەر ئەوەش بکەین (رَبِّ الْعِزَّة) ئایە بۆ الله دە شێ و دەگونجێ؟ بەڵێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ڕەب بە مەعنای صاحیب دێ واتە الله تعالی خاوەنی عیزەتە، عیزەت بۆ الله تعالی دیارە بە سێ مانا دێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا کە ئەو سێ مانایە لە نونیە بە شەرحی ئەبو عیسا هاتوە کە دانەری بەڕێز دەفەرموێ:

(وهو العزيز فلن يرام جنابه أني يرام جناب ذي السلطان

وهو العزيز بقوة هي وصفه فالعز حينئذ ثلاث معان

وهي التي كملت له سبحانه من كل وجه عادم النقصان[1])

جا مانای یەکەم کەواتە بە مانای ئەوە دێ عیزەت بە مانای قەدەغەکردن و دەوڵەمەند بون بێ ڕاز و نیاز و ئیحتیاج بون لە هەموو کەسێکدا وە دەوڵەمەندە لەوپەڕی دەوڵەمەندی، بەڵێ الله تعالی ئەوەتا دەڵێ (وهو العزيز فلن يرام جنابه) یەعنی الله تعالی عەزیزە بەو مانایەی کە ئیمتیناعی هەیە بەو مانایەی الله تعالی دەوڵەمەندێکی تەواو دەوڵەمەندە بێ

[1] الكافية الشافية ٢/ ٢١٨.

ڕاز و نیازە لە هەموو کەس و شتێک کەس ناتوانێ هیچ زەرەر و زیان بەو بگەیەنێ و بە هیچ کەسێک بگەیەنێ بەبێ ویستی ئەویش، هەروەکو لە فەرمودەی قودسی هاتوە کە الله تعالى دەفەرموێ: «إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي» ئێوە ئەی بەندەکانم ناتوانن و لە تواناتاندا نیە و لە ئاستی ئەوەدا نین بتوانن زەرەر و زیانم پێ بگەیەنن «وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي[1]» لە ئاستی ئەوەشدا نین سود و قازانج و کەڵک بە من بگەیەنن.

وە لە پاشان بە مانای ئەوەش دێ کە الله تعالى دەفەرموێت (وهو العزيز بقوة هي وصفه فالعز حينئذ ثلاث معان) عەزیزیشە بەو مانایەی کە قاهیرە و زاڵە بەسەر هەر هەموو شتەکان دەسەڵاتی هەیە، لە پاشان دەفەرموێ (وهو العزيز بقوة هي وصفه) ئەوەش سیفەتی اللهیە عەزیز بە مەعنای قوەت و دەسەڵاتیش دێت، کەواتە بۆ الله تعالى عەزیز بەو مانایانە دێ یان ئیمتیناع و دەوڵەمەندی بێ ڕاز و نیازی لە هەر هەموو شتەکانەوە یان بە مانای زاڵبون و قاهیرایەتی بەسەر هەر هەموو شتەکانەوە یان بە مانای قوەت و هێز و توانایەکی زۆر دێ هەموی لە الله تعالى دەوەشێتەوە و الله تعالى سیفەتی عیزەتی هەیە بەو سێ مانایانە.

ئینجا لە پاشان کە دەفەرموێ: ﴿وَسَلَمٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ﴾ سەلامی الله لە سەر پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، جا سەلامەتی خوایی واتە لەڕوی تێگەشتنەوە فەهم و تێگەشتنی پێغەمبەرانی سەلامەت کرد وە لە ڕوی عبودیەتەوە وە لە ڕوی عەقیدە لە ڕوی تبليغ لە هەموو لایە کان: ﴿وَسَلَمٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ﴾ واتە سەرامی خوایی لەسەر پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، چونکە سەلامەت مادەم پیتی (عَلَی)ی لە دواوە هاتوە و بۆسەر پێغەمبەران گوتراوە کەواتە دەوری داون واتە لەسەریانەوە هەتا ژێریانەوە و لە دەوریانەوە بە سەریان سەلامەتی خوایی داڕژاوە و دەوری هەموی داوە و لە هەموو شتێک ئەوان سەلامەتن لەلای الله تعالى وە و وە بێ کێشە و گیر و گرفتن.

[1] صحيح مسلم (٢٥٧٧)، سنن الترمذي (٢٤٩٥)، سنن ابن ماجه (٤٢٥٧).

جا لە پاشـان دەفەرموێ ﴿وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الحمد) ئەلف و لامی ئیسـتیغڕاقی لەسـەرە واتە هەموو حەمد و سـوپاس و سـتایشـەکان لە هەر حامیدێکبێ بۆ هەر مەحمودێکبێ بۆ هەر مەحمودوبیهی یەک بێ بە هەر سـیغە و دەربڕینێک بێ هەموی شـایسـتەی الله تعالى یە ئەوەی حەمد و سـوپاس و سـتایشـە هەموشـی بۆ ئەوە ئەویش شایستەی ئەو حەمد و سوپاس و ستایشانەیە کە الله پەروەردگاری جیهانیانە، جا ئەگەر (الله) مەعنای ڕەبیش لەخۆوە دەگرێ وە ئەگەر ڕەبیش هات بە تەنها مەعنای (الله)ش لە خۆوە دەگرێ، کە لەوانە زا نای بەڕێز موحەممەدی کوڕی عە بدولوە هاب لە یەکێک لە پەرتوکەکانی دەربارەی عەقیدە دەفەرموێ (رب) و (الله) دوو وشـە و ناوی الله تعالى ن (إذا اجتمعت افترقت) ئەگەر بە یەکەوە هاتن الله مانای تایبەتی خۆی هەیە واتە مەعبود و پەر ستراوی ڕا ستەقینە کە شایستەی پەر ستنە وە ڕەبیش بە مەعنای پەروەردگاریەت دێ کە لە نەبونەوە شـت بێنێتە بون خاوەنێتی ڕاسـتەقینە هەر هی ئەوە ئەو بەڕێیانەوە دەبا، وە ئەگەر هاتوو بە جیاش هاتن (الله) هات لە ڕ ستەیەک مەعنای ڕەبیش دەگەیەنێ ئەگەر ڕەبیش هات بە تەنها مەعنای (الله) دەگەیەنێ، یان لەفزەکە خودی خۆی ئەوە دەگەیەنێ یان بە لە خۆوە گرتن یان ئەوەی لازم و پێویست دەکات.

ئینجا لە پاشـان دەفەرموێ: ﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ یەعنی چی؟ (العالم كل ما سِوَى الله عَالَم) جگە لە الله تعالى هەموو بەدیهێنراوەکان پێیان دەگوترێ جیهانی و پێیان دەگوترێ عـالەم چونکە ئەوان نیشـانەن و بەڵگەن لە عەلامەتەوە هـاتوە لەسـەر پەروەردگاریەتی الله تعالى لەسـەر بون و وجودی لەسـەر ئەوەی کە الله ئەوانی بەدی هێناوە لە نەبونەوە بە عیلمەوە لەبەر ئەوە أبو العتاهية لە شیعرێکیدا دەڵێ:

(وَفي كُلِّ شَيءٍ لَهُ آيَة

تَدُلُّ عَلى أَنَّهُ واحِدُ الديوان[1])

[1] ألا إننا كلنا بائد عدد الابيات: ٥.

لە هەموو بەدیهێنراوەکاندا ئەوەی بەدیهێنراوبێ کە شتە بەڵگەیەک هەیە لەسەر ئەوەی کە الله تعالی تاک و تەنهایە شەریک و هاوبەشی نیە.

**سیفەتەکان لە نێوان نەفی کردن و ئیثبات کردن:**

وَهُوَ سُبْحَانَهُ قَدْ جَمعَ فيما وَصَفَ وَسَمَّى به نَفْسَهُ بينَ النَّفْيِ وَالإِثْبَات، فَلاَ عُدُولَ لأَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ عَمَّا جَاءَ بِهِ الْمُرْسَلُونَ؛ فَإِنَّهُ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ، صِرَاطُ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ والصَّالِحِينَ.

---

جا لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- دەڵێ (وَهُوَ سُبحَانَهُ قَد جَمعَ فِيمَا وَصَفَ وَسَمَّى بِهِ نَفْسَهُ بَينَ النَّفِي والإثبات) ئەوەشـــیان خاڵێکی گرنگ و بنەمایەکی گرنگی ئەهلی ســـونە و جەماعەیە کە لە قاعیدەکانی ئەســـماء و ســـیفاتی الله تعالی یە نەفی و ئیثباتی تێدایە کە ئەهلی ســـونە و جەماعە نەفی و ئیثبات بە یەکجار کۆ دەکەنەوە ســـیفەتە ســـەلبیەکان ئەوانەی ناوە شێتەوە لە الله تعالی ڕەتی دەکەنەوە وە سیفەتی کەمالیەت و تەواویەتیش بۆ الله تعالی جێگیر دەکەن، هەروەکو الله تعالی لە دەیەها ئایەت وای جێگیر کردوە و وایفەرموە وە پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرمودەی ســـەحیحدا وای ڕاگەیاندوە، کە ابن تيمية دەفەرموێ: (وَهُوَ سُـبحَانَهُ قَد جَمعَ فِيمَا وَصَـفَ وَسَـمَّى بِهِ نَفْسَـهُ بَينَ النَّفِي والإثبات) الله تعالی پاک و بێگەردی بۆ ئەو کە کۆی کردوەتەوە وەسفەکانی خۆی و ناوەکانی خۆی لە نێوان نەفی ڕەتکردنەی سیفەتە سەلبیەکان و ناوە سەلبیەکان وە ئیثبات و جێگیر کردنی ســـیفەت و ناوە زۆرجوان و تەواو و کەمالیەکان بۆخۆی -جل شـــئنە- کە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ هیچ کەس و شتێک وەکو الله تعالی نیە لە زات لە ناوە زۆر جوانەکان لە سیفاتەکانی الله تعالی بەڵکو الله تعالی ش وەکو هیچ کەس و شتێک نیە -جل شئنە-، ئەوە نەفی بوو وە لەگەڵ ئەوەدا ئیثبات و جێگیریش دەکات بۆ خۆی الله تعالی سیفەتە تەواوەکان وە ناوە زۆر جوانەکان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ الله لەگەڵ ئەوەدا بیسەری بینەرە.

جا لە پاشـــان اللە تعالی کە نەفی و ئیثباتی کردوە لە دەیەها ئایەت بۆخۆی ســـیفەتە ســـەلبیەکان چ ســـودێکی هەیە کە باســـی لێوە کراوە؟ ئەویش ئەوەیە کە اللە تعالی -جل شئنە- کە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ لێرەدا سیفەتی تەواویەتی بۆخۆی ڕاگەیاند اللە -جل شـــئنە-: ﴿الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ە وە خوایەتی اللە تعالی یە -جل شـــئنە- لە پاشـــانیش دەفەرموێ هەر لە نەفســـی ئایەتەکە ﴿لاَ تَأْخُذُهُ سِـــنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ﴾اللە تعالی نە بۆرژان و خەوە نوچکەی بەسەردا دێ و هەیەتی -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) نە نوستن نەوم بە مەعنای نو ستنێکی دور و درێژ ئەوە شی ڕەتکردوەتەوە سیفەتە سەلبیەکانیەتی.

جا قازانج بۆ سیفەتە سەلبیەکان کە اللە تعالی باسی دەکا لە چەند خاڵێکدایە، ئەو سیفەتە ســـەلبیانە کە اللە تعالی -جل شـــئنە- لە قورئانی پیرۆخ بۆخۆی باســـیان لێوە دەکا و ڕەتی دەکاتەوە و نەفیان دەکا قازانجی هەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا:

یەک لە فائیدەکانی کە اللە تعالی بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿لاَ تَأْخُذُهُ سِـــنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ﴾ [البقرة: ٢٥٥] ئەوەیە کە جێگیری ژیان و زیندوایەتی تەواو و کەمالیەت بۆخۆی پێدەکا -جل شـــئنە-، وە هەندێک جار هەیە ئەگەر ســـیفەتێکی ســـەلبی اللە تعالی باس دەکا جێگیری سیفەتێکی کەمالیەت و تەواوی لە بەرامبەریدا پێ جێگیر دەبێ کە ئەو سیفەتە سەلبیەی اللە تعالی ڕەت کردوەتەوە -جل شـــئنە- لە خۆیەوە وە هەندێک جاریش دوو ســـیفەتی کەمالیەت و تەواویەتی پێ جێگیر دەبێ، بۆ نمونە: ﴿لاَ تَأْخُذُهُ سِـــنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُۥ﴾ [البقرة: ٢٥٥] ســـیفەتی حەیات و زیندوایەتی اللە تعالی -جل شـــئنە-ی لەوپەڕی کەمالیەت و تەواوی پێ جێگیر دەبێ، بەڵام لە ئایەتێکی تر کە اللە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعجِزَهُۥ مِن شَيء فِي ٱلسَّمَـٰـــوٰتِ وَلَا فِي ٱلأَرضِ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾ [فاطر: ٤٤] ئەوە بەڵكو دوو ســـیفەت جێگیر دەکا یانی هیچ شـــتێک نیە لە ئاســـمانەکان و وە لە زەوی اللە تعالی دەستەوسان بکا -جل شئنە- کە سیفەتی عەجزی اللە تعالی لە خۆی ڕەتکردەوە سیفەتێکی سـەلبیە بۆ جێگیر کردنی ئەوە کە لە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾

واتە دوو سیفەتی کەمالیەتی بۆخۆی -جل شئنە- الله تعالى بڕیاردا و جێگیری کرد، چونکە هەموو هۆشمەندێک ئەگەر وردبێتەوە لەوە ناتوانێ شتێک ئەنجام بدا و بیکا کە عیلم و زانستی پێ نەبێ وە لە پاشان دەسەڵاتیشی بەسەردا نەشکێت و توانای نەبێ بەڵام الله تعالى کە دانەری ئاسمانە کەواتە عیلم و زانستیشی پێی هەیە وە لە پاشانەکە الله تعالى -جل شئنە- توانای دروست کردنەکەشی هەیە کە لە کۆتایی ئایەتەکە الله تعالى وای فەرموو.

بەڵام تاقم و کۆمەڵەکانی تری پێچەوانەی ئەهلی سونە و جەماعە دائیمەن نەفیەکان هەندێک جار و سیفەتە سەلبیەکان کە ڕەتدەکەنەوە بە دورو درێژی بە جوزئیاتەوە باسی دەکەن زۆر بە درێژی بەڵام سیفەتی کەمال بۆ الله تعالى زۆر بە کورتی جێگیر دەکەن، جا هەر بۆ نمونە هەندێک جار هەر ئەوەندە دەڵێن (وله صفات كمال) زۆر بە موجمەلی و کورتی باسیدەکەن بەڵام بۆ جوزئیاتەکان وەکو ئیمامی باقلانی لە کیتابی (التمهيد) بە نمونە هاتوەتەوە و دەڵێن بە دور و درێژی باسی نەفیەکان دەکات تەنانەت باسی ئەو شتانەش دەکەن ئەو تاقم و کۆمەڵانە دەڵێن هەندێک جار دەڵێن (ليس بذي دم وليس بذي جوارح وليس بذي روح ولا بذي أبعاض...) پیایدا دەچن نە خوێنی هەیە نە ئەندامی هەیە نە گیانی هەیە وە نە بەعض و هەندی هەیە واتە بە ئەندام... نەفیەکان زۆر دور و درێژ دەکەنەوە، بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە لە الله تعالى یان وەرگرتوە -جل شئنە- بە کورتی هەموو سیفەتە سەلبیەکان نەفی دەکەن وە جێگیر کردنی سیفەتەکانی تەواویەتیش کە لە قورئان و سونەی سەحیح هاتبێ جێگیری دەکەن بە دور و درێژتر و بە ڕێک و پێکتر.

ئینجا لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- فەرموی (فَلَا عُدُولَ لِأَهْلِ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَةِ عَمَّا جَاءَ بِهِ المُرْسَلُونَ) ئەهلی سونە و جەماعە لانادەن لاڕێ نابن لەو ڕا ستە ڕێگایەی کە پێغەمبەران هێناویانە (عليهم الصلاة والسلام) واتە ڕاست و ڕێک ڕێگای پێغەمبەران دەگرنەبەر (عليهم الصلاة والسلام)، ڕێی پێغەمبەران چ ڕێگایەکە؟ (فَإِنَّهُ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ) ڕێی

پێغەمبەران ڕاستە ڕێگای الله تعالى يە -جل شئنە- ئەو ڕێگايەيە کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ * وَقِفُوهُمۡ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ﴾ [الصافات: ٢٣-٢٤] پێچەوانەی ئەو ڕێگايەيە کە لە قيامەتدا ئەوانە ببەن بۆ ڕێگای ناو ئاگری دۆزەخ وە ڕايان بگرن ئا ئەوانە بەرپرسن، جا پێچەوانەی ڕێگای ئەوان چيە؟ ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ﴾ [الأنعام ١٥٣] خوای رب العالمين دەفەرموێ ئا ئەوەيە ڕێباز و ڕێگای ڕاستی من شوێنی بکەون کە ڕێبازی تەوحيد و الله بەيەکگرتنە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى).

جا لە پاشان الله تعالى -جل شئنە- کە ئەو ڕێگايەی بە ئێمە نيشاندا و ڕێگای پێغەمبەرانە (عليهم الصلاة والسلام) (صِرَاطُ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِم) ابن تيمية دەفەرموێ ڕێگای پێغەمبەران ئەو ڕێگايەيە کە الله تعالى ناز و نيعمەتی لەگەڵ پێغەمبەران کردوە لەسەر ئەو ڕێگايە (مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ والصَالِحِينَ) لەگەڵ پێغەمبەران و ئەوانەی پێغەمبەرانيان بەڕاست داناون لەوانە ئيمامی ئەبو بەکر و صديقن وە شەهيدەکان و وە پياوچاکان.

جا بە کورتی پێناسەی ئەوانە دەکەين:

يەکەميان ئايە بزنين پێغەمبەران کێن؟ پێغەمبەران ئەوانەن کە الله تعالى ڕەوانەی کردون يان نەبيين يان ڕەسولن.

وە لە پاشانەکە صديقين کێن؟ صديقن ئەو کەسانەن کە الله تعالى -جل شئنە- ناوی بردون لەو ئايەتە: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا﴾ [النساء: ٦٩] واتە ئەوانەی گوێڕايەڵی فەرمانی الله و پێغەمبەر بکەن (ﷺ) ئا ئەوانە لەگەڵ ئەوانەن کە الله ناز و نيعمەت و بەخششی بەسەردا کردون کە لە پێغەمبەران و ڕاستگۆيان و ئەوانەی تە صديقی پێغەمبەرانيان کردوە (عليهم الصلاة والسلام) وە شەهيدەکان و ساڵيحەکان باشترين هاوەڵ و هاوڕێن ئەوانە، صديقەکان ئەوانەن تەصديقی پێغەمبەرانيان کردوە

(عليهم الصلاة والسلام)، صديق لەسەر وەزنی فەعيلە سيغەی موبالەغەيە واتە زۆر تەصديقكەرە و زۆر بەڕاستدانەری پێغەمبەرانە (عليهم الصلاة والسلام).

لە پا شان الله تعالى دەفەرموێ شەهيدەكان ئەوانەی بۆ بەرزكردنەوەی و شەی (لا اله الا الله) دەجەنگن و گيان لەسەر دەستن و گيان دادەنێن و شەهيد دەبن و دەكوژرێن ئا ئەوانە شەهيدەكانن.

ساڵیحونیش ئەوانەی ئەهلی سەلاحن لە ڕواڵەتدا لە ئیش و كارەكانیان لە هەڵسوكەوتەكانیان لە ڕیش و ئیشیان پێیانەوە دیارە وە لە باطن و دڵیشیانەوە پاكن چاكن، وە هەندێكیش لە زانایان دەفەرمون بەڵكو لەو ئایەتە ساڵیحون هەمویان دەگرێتەوە واتە عامێكە لە پێ شتریش خا صەكانی هێنا پێغەمبەران هەر ساڵحن واتە صديقەكانيش هەر ساڵحن و شەهيدەكانيش هەر ساڵحن ئەوە ڕا ستە ڕێگای ئەهلی سونە و جەماعەيە كە ڕێگای پێغەمبەرانە (عليهم الصلاة والسلام) وە ڕێگای ڕاستی الله تعالى يە وە ئەو ڕێگايەيە كە الله تعالى ناز و نیعمەتی لەگەڵ پێغەمبەران و ڕا ستگۆیان و شەهيدەكان و وە ساڵیحەكان كردوە الله تعالى لەوانمان بكا.

**جەمع لە نێوان نەفی و ئیثبات لە قورئانی پیرۆزدا:**

وَقَدْ دَخَلَ فِي هذه الْجُمْلَة مَا وَصَفَ اللهُ بِهِ نَفْسَهُ فِي سُورَةِ الإِخْلاَصِ الَّتِي تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، حَيثُ يَقُولُ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحد * اللَّهُ الصَّمَد * لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَد * وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحد﴾ [الإخلاص: ١-٤].

---

دانەر ابن تيميە -رحمە الله- دەفەرموێ (وَقَدْ دَخَلَ فِي هذه الْجُمْلَة مَا وَصَفَ اللهُ بِهِ نَفْسَهُ فِي سُورَةِ الإِخْلاَصِ الَّتِي تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، حَيثُ يَقُولُ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحد * اللَّهُ الصَّمَد * لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَد * وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحد﴾ [الإخلاص: ١-٤]) ئەوەمان بۆ شيدەكاتەوە و نمونەمان بۆ دەهێنێتەوە لە قورئانی پیرۆز كە الله تعالى هەندێكجار لە هەندێك لە ئايەتەكان لە هەندێك لە سورەتەكان پێكەوە نەفی و ئیثباتی كۆ كردوەتەوە. نەفی

هەندێک وەسف و سیفەتی کردوە لە خۆی وە هەندێک وەسف و سیفەتیشی بۆخۆی جێگیر کردوە هەر لە ئایەتێک و هەندێک جار لە سورەتێک، هەروەکو دەفەرموێ (وَقَدْ دَخَلَ فِي هذِهِ الْجُمْلَةِ مَا وَصَفَ اللهُ بِهِ نَفْسَهُ) واتە دەچێتە ژێر ئەو ڕستەیەی کە الله تعالی گوتمان هەندێک جار نەفی و ئیثبات دەکا بۆخۆی نەفی و و ئیثباتەکە کە خۆی وەسف کردوە لە سورەتی ئیخلاص بە مەعنای ئەوەی هەر لە سورەتی ئیخلاص ابن تیمیة دەفەرموێ وەکو نمونەیەک نەفیشی تێدایە ئیثباتیشی تێدایە واتە ڕەتکردنەوە لە سیفەتە نەقسەکان و وە جێگیرکردنی سیفەتە تەواوەکان، کە سورەتی ئیخلاص ئەوەندەی سێیەکی قورئانە ئەوەش جیاوازی لەسەرە لەنێوان زانایان ئەوەندەی سێیەکی قورئانە مانای چیە؟ بە کورتی دەیلێین إن شاء الله و دەگەینە سەری بەس با بە کورتیەکەی ئەوەندە بلێین، کە دەفەرموێ الله فەرمویەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحد﴾ ئەی موحەمەد (ﷺ) لە وەڵامی موشریک و بێ بڕوا و هاوبەش پەیداکاران بڵێ الله تاکە: ﴿اللهُ الصَمدُ﴾ الله تعالی صەمەدە صەمەدیش بە چەندین مانا هاتوە لەلای توێژەروانی قورئانی پیرۆز یەک لە ماناکان واتە سەید و گەورەیەک کە کەس نایگاتێ لە سەیدایەتی و گەورایەتی بێ ڕاز و نیازە لە هەموو کەس و شتێک وە هەموو کەس و شتەکان ڕاز و نیازیان بەوە موحتاجن بەو: ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ وە الله تعالی نە منداڵی هەیە وە نە لە کەسیش بوە –جل شئنه-: ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحد﴾ هیچ کەس و شتێکیش هاو وێنەی الله تعالی نیە وە ناگاتە ئاستی الله تعالی.

جا لێرە ئەگەر سەرنج بدەین و تەماشا بکەین لە سورەتی (الإخلاص) دەبینین سەرەتا الله تعالی ئیثبات کردنی خودایەتی بۆخۆی کردوە وە تاکایەتی بۆخۆی کردوە کە دەفەرموێت: ﴿هُوَ اللَّهُ أَحد﴾ الله تاکە، الله جێگیربونی سیفەتی خوایەتیە بۆخۆی الله بە مەعنای چی دێ؟ (المعبدوا المستحق للعبادة) واتە خوایەکی شایستە بۆ پەرستن هیچ کەس نیە اللەبێ هیچ کەس شایستەی پەرستن نیە ئیلا الله نەبێ، الله بە مەعنای کەواتە مەعبودێکی شایستە بۆ پەرستن دێ ئەوە بۆخۆی جێگیری کرد، وە لە پاشان: ﴿أَحد﴾ی بۆخۆی جێگیر

کرد، واتە ئەو اللهیە تاکیشە تاکە بەو مانایەی هیچ شەریک و هاوبەشی نیە وە هیچ کەس لەئاستی الله نیە -جل شئنە-، ئینجا الله تعالی صەمەدێتی بۆخۆی جێگیر کرد فەرموی: ﴿اللهُ الصَمدُ﴾ صەمەدیش گوتمان لە تەفسیرەکان هاتوە هەندێک دەفەرمون بە مانای سەیدێک و گەورەیەک کە کەسی ناگاتێ لە پلەی سەیدایەتی و گەورایەتی لە هەموو گەوران گەورەترە لە هەموو سەیدان سەیدترە وە هەندێکیش دەفەرمون واتە بێ ڕاز و نیازە دەوڵەمەندە لە هەموو کەس و شتەکان هەموو کەس و شتەکان موحتاجن ڕاز و نیازیان بە الله تعالی یە.

هەتا ئێرە ئیثباتکردن بوو لە پاشان دەست پێدەکا الله تعالی نەفی دەکا هەندێک لە سیفەتە سلبیەکان لەخۆی، دەفەرموێ: ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ الله تعالی منداڵ لەخۆی نەفی دەکا و ڕەتدەکاتەوە کەواتە الله تعالی نە منداڵی هەیە وە نە نەوەی هەیە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلی) وە نە باوکیشی هەیە و نە لە کەسیش بوە، ئەوانەی ڕەتکردەوە لەخۆی الله تعالی، ئەوە هەر سوڕەتی ئیخلاصە الله تعالی سەرەتا جێگیری سیفەتە کەماڵ و تەواویەکانی بۆخۆی کرد لە دواتریش هەر لە نەفسی سوڕەتدا الله تعالی نەفی سیفەتە نەقس و سەلبیەکانی لە خۆی کرد.

کەواتە الله تعالی لە سەرەتاکەیدا جێگیری خوایەتی دەکا بۆخۆی، کە هەر ئەوە شایستەی پەرستن کەواتە ملکەچی بن دڵکەچی بن وە بیپەرستن کڕنۆشی بۆ بەرن ئەوە وەردەگیرێ لە خوایەتی الله تعالی کە بۆخۆی جێگیری کردوە، لە پاشان سیفەتی تاکایەتی الله تعالی بۆخۆی بڕیاردا واتە ئەو خوایە شەریک و هاوبەشی نیە تاک و تەنهایە هەم لە زاتیدا هەم لە ناوەکانیدا هەم لە سیفەتەکانیدا کە دەڵێین تاک و تەنهایە لە ناوەکانی بە مانای ئەوە نا کە بڵێین کەس نابێ ناوێکی وەکو ناوی اللهی هەبێ هەندێک لە ناوەکان هاوبەشن لەنێوان الله تعالی و مرۆڤ و بەدیهێنراوەکان بەڵام لە ناوەڕۆکدا لێک جودان لە مانا و واتا لێک جودان، دەکرێ و دەشێ کەسێک ناوی قادیربێ وەکو الله تعالی ناوی قادیرە لە لەفز و

دەربڕین و پیتەکان وەکو یەکن بەڵام ناشێ و ناگونجێ قادیری الله تعالی مانایەکی تایبەتی هەیە کە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- کە: ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ە الله تعالی لەسەر هەموو شتێک توانایە هیچ شتێک نیە لە توانای الله بەدەربێ -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى)، قادیری بەندەکان و مرۆڤەکانیش کە ناوی لێدەنرێ قادیر کەم و کورتە لە خۆی دەوەشێتەوە سنوردارە هەموو شتەکانی لە تواناد نیە مرۆڤ کەمێکی کەم لە شتەکانی لە توانادا هەیە واتە ئەوە ناگرێتەوە کە دەڵێین الله تعالی لە ناوەکانی تاک و تەنهایە ئەوە هیچ نەقسی تێدا نیە بۆ الله تعالی ئەگەر هەندێک لە ناوەکانی الله تعالی ناوبێ بۆخۆی بەڵام ماناکەی کەمال و تەواویەتە بۆ الله و لەخۆی دەوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر مرۆڤەکان خودی ئەو ناوەشیان لێبێ بەڵام لە ناوەڕۆکدا هی مرۆڤەکان لە واتادا کەم و کورتە وە دورە و جیاوازی هەیە لە ناوەکەی الله تعالی و لە ماناکەی ناوەکەی الله تعالی.

جا خوای رب العالمین دەش فەرموێ: ﴿وَإِلَـٰهُكُمۡ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ [البقرة: ١٦٣] الله و پەروەردگاری ئێوە ئەی موحەمەد (ﷺ) پێیان بڵێ خوایەکی تاک و تەنهایە، یان: ﴿وَمَا مِنۡ إِلَـٰهٍ إِلَّآ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ [المائدة: ٧٣] هیچ خوایەک نیە ئەوانەی کە بە درۆ ناویان لێنراوە خوا بت و سەنەمەکان و ئەوانەی جگە لە الله دەپەرسترێن ڕاست نین هەڵەن بە درۆ ناویان لێنراوە وە خوا نین ئەوان خەڵکێک ناوی لێناون خوا حەق نیە ئەو ناوەیان بێ ببڕێ و لێبنرێ ئیلا زاتێک خوایە -جل شئنه- کە اللەیە هەر ئەوە شایستەی پەرستن.

لە پاشان گوتمان مانای صەمەدیەت دیارە صەمەد بە مانای ئەوە دێ هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون ئەسڵی صەمەد لەوەوە هاتوە کە دڵ بۆلای دەچێ یان لە سەیدێک هاتوە کە هەموو گەورایەتی و شتەکان بۆلای ئەو دەچێتەوە، کەواتە صەمەدیش یەکێکە لە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی وە واتای ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە دڵەکان هەموو برۆن بۆلای الله تعالی هەرکەسێک ڕاز و نیازێکی هەبێ لە اللەی داوا بکا -جل شئنه- وە الله

تعالی لە هەموو سەید و گەورەكان گەورەترە و وە گەورەی گەورەكانە -جل شئنە- ئەوەش جێگیر كردن بوو.

لە نەفیش اللە تعالی گوتمان ڕەتیدەكانەوە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) كە منداڵی هەبێ و وە ڕەتیدەكاتەوە كە لە كەس بوبێ، ئایەتەكانی قورئان زۆر نەفیكردن و ڕەتكردنەوەی منداڵ بۆ اللە تعالی تێیدا دەبینرێ ئەوەش لەبەر چیە؟ لەبەر ئەوەیە چونكە موشریك و كافر و بێ بڕواكان زۆر جاران لە زۆر هەڵوێستیان لە زۆر دەربڕینیان ئەو سیفەتەیان دەدایە پاڵ اللە تعالی (پەنا بە خوای رب العالمین) كە اللە تعالی منداڵی هەیە جارێک فریشتەكانیان دەكردە منداڵی اللە تعالی جارێک پێغەمبەرانیان كردوەتە (پەنا بە خوای رب العالمین) منداڵی اللە تعالی، لەبەر ئەوەیە اللە تعالی ڕەتی دەكاتەوە و زۆر لە ئایەتەكان ئەوەی تۆمار كردوە كە اللە تعالی پاک و بێگەردە لەوە مەزن و گەورەترە كە منداڵی هەبێ كە دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُ ٱلْبَنَـٰتُ وَلَكُمُ ٱلْبَنُونَ﴾ [الطور ٣٩] ئینجا چیان دەگوت؟ دەیانگوت فریشتەكان كچی اللەن ((پەنا بە خوای رب العالمین) خوای رب العالمین وا وەڵامیان دەداتەوە دەشێ و دەگونجێ ئێوە كوڕتان هەبێ و كوڕتان پێ باشترە اللە تعالی كچی هەبێ؟ نەخێر اللە تعالی هیچ منداڵێكی نیە نە كچ نە كوڕ ئەوە سیفەتی نەقسە بۆ اللە تعالی ڕەتیكردوەتەوە خوای رب العالمین: ﴿وَقَالُوا ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَلَدًا * لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا﴾ [مریم ٨٨-٩٠] خوای رب العالمین دەیانگوت موشریك و كافرەكان اللەی ڕەحمان منداڵی هەیە (پەنا بە خوای رب العالمین) نا ئەوە قسەیەكی بێسەر و بەرە قسەیەكی بێ مانایە هەڵبەستانە و درۆیە خوای رب العالمین منداڵی نیە، وە لە پاشان جولەكەكان دەیانگوت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾ (پەنا بە خوای رب العالمین) جولەكەكان دەیانگوت عوزەیر كوڕی اللەیە (پەنا بە الله) ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٣٠] وە نەسڕانیەكان دەیانگوت عیسا كوڕی اللەیە (پەنا بە خوای رب العالمین)، جا خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿مَا ٱتَّخَذَ صَـٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ [الجن: ٣] اللە تعالی هاوسەریشی نیە وە

منداڵیشی نیە ئەوانە سیفەتی نەقسن پێویستی پێ نیە -جل شئنه- خوای رب العالمین غەنیە ئەوە درۆ و دەلەسەیە موشریک و کافرەکان هەڵیان بەستوە: ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ﴾ [الأنعام: ١٠١] چۆن دەشێ و دەگونجێ الله تعالى ڕەتی کردبێتەوە هاوسەری هەبێ منداڵی هەبێ؟ کەواتە نە هاوسەری هەیە و نە منداڵی هەیە ئەوانە سیفەتی نەقسن و: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] واتە: الله تعالى بڕاندییەوە هیچ کەس و شتێک وەکو الله نیە وە الله تعالى یش لە زات و لە ناوەکانی و لە سیفەتەکانی وەکو هیچ کەس و شتێک نیە، یان دەش فەرموێ ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ * وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ [الإخلاص: ٢: ٤].

کەواتە ئێمە دەبێ خوایەتی الله جێگیر بکەین وەکو لە سوڕەتی ئیخلاص هاتوە وە هەموو ڕاز و نیازەکانمان ببەینە خزمەت الله تعالى و لەو داوا بکەین، هەر ئەو ڕاز و نیازەکانی ئێمەی پێ جێبەجێ دەبێ چونکە الله تعالى لە هەموو گەوران گەورەترە، ئینجا ئەوەش ڕەتکەینەوە کە سیفەتی نەقسە بڵێین الله تعالى منداڵی هەیە حاشاکی الله تعالى الله تعالى دورە لەوەی منداڵی هەبێ هاوسەری هەبێ یان لە کەس بوبێ -جل شئنه- ئەوانە ڕابگەیەنین.

لەبەر ئەوەشە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی سێیەکی قورئانە سوڕەتی ئیخلاص هەندێک لە زانایان دەفەرمون ماناکەی ئەوەیە لە پلە و پایە و فەزڵدا چونکە هەموو عەقیدەی لەخۆوە گرتوە چونکە تەوحید و یەکتایی الله تعالى ڕادەگەیەنێ سوڕەتی ئیخلاص، وە قورئانیش دابەشە بۆ سێ بەش هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون یان ئەحکامی شەرعیە یان چیرۆک و سەرگوزشتەیە قورئان یان عەقیدەیە، جا سوڕەتی ئیخلاص بەشی عەقیدەی لەخۆوە گرتوە دوو بەشەکەی تری تێدا نیە لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) سێیەکی قورئانە ئەوە بۆچونێکی زانایان.

وە لە پاشان هەندێکی تر دەڵێن نەخێر لەبەر ئەوەی قورئان زۆر زۆر گەورەیە بەڵام سورەتی ئیخلاص عەقیدەی وای تێدایە پێغەمبەر (ﷺ) لە پلە و پایە دەڵێ ئەگەر قورئان هەر هەموی بەرز و مەزنە بەڵام سورەتی ئیخلاص ئەوەندەی سێیەکی قورئانی مەزنە لەبەر ئەوەی چونکە دەربارەی الله تعالی یە وە وەسفی الله تعالی دەکا.

## آیة الكرسي هەمەلایەنترینی وشەکانی نەفی و ئیثبات:

وَمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ فِي أَعْظَمِ آيَةٍ فِي كِتَابِهِ؛ حَيْثُ يَقُولُ ﴿ٱللَّهُ لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا -أي لا يَكْرِثه ولا يُثْقِلُه- وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ﴾ [البقرة: ٢٥٥] أي: لا يكرثه ولا يثقله؛ ولهذا كان من قرأ هذه الآية في ليلة لم يزل عليه من الله حافظ ولا يقربه شيطان حتى يصبح.

---

لە پاشان ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ (وَمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ فِي أَعْظَمِ آيَةٍ فِي كِتَابِهِ؛ حَيْثُ يَقُولُ) واتە ئەوەش وەکو سورەتی ئیخلاص الله تعالی نەفی و ئیثباتی جێگیر کردوە لە یەکێکی تر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز نەفی هەندێک لە وەسف و سیفەتە نەقسەکانی کردوە لە خۆی وە جێگیری هەندێک لە سیفەت و ئاوەڵناوە کەمالەکانی کردوە بۆخۆی، ئەویش چ ئایەتێکە؟ لە مەزنترین ئایەتی پەرتوکی خوایی کە (آیة الكرسي) پێ دەڵێن، کە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ [البقرة: ٢٥٥] ئینجا دەفەرموێ (أي: لا يكرثه ولا يثقله؛ ولهذا كان من قرأ هذه الآية في ليلة لم يزل عليه من الله حافظ ولا يقربه شيطان حتى يصبح) ابن تیمیة دەفەرموێ الله تعالی نەفی و ئیثباتی بە یەکجار هێناوە لە یەکێکی تر لە ئایەتەکانی

پەرتوكە مەزنەكەی خۆی كە قورئانی پیرۆزە و (آية الكرسي)ە عەویش دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ الله هیچ پەرستراوێكی حەق نیە جگە لەو ئەو خوایەش: ﴿ٱلحَیُّ﴾ هەمیشە زیندوە الله تعالی وە هەمیشە الله تعالی بەبێ دابڕان لە زیندوێتی بەردەوامە وە زیندوێتی الله تعالی بێ سەرەتایە وە بێ كۆتاشە: ﴿ٱلقَیُّومُ﴾ وە زیندویەكی بەخۆوە وەستاویشە بێ ڕاز و نیاز و ئیحتیاجە بۆ وەستانی الله تعالی وە بۆ ژیانی بۆ بەردەوامی ڕاز و نیازی بە هیچ كەس و شتێک نیە -جل شئنە- بەڵكو ئەوە ڕاگری شتەكانی تر هی مەخلوق و بەدیهێنراو و دروستكراوەكانی: ﴿لَا تَأخُذُهُۥ سِنَة وَلَا نَوم﴾ الله تعالی نە بۆرژانی هەیە نە نوستنیشی هەیە بە دور و درێژی ئەوانەی ڕەتكردوەتەوە لە خۆی.

كەواتە سەرەتا الله تعالی وەكو سورەتی ئیخلاص لەو ئایەتەشدا ئەو سیفەتانەی خوایەتی كە هەر ئەوە شایستەی پەرستن بۆخۆی جێگیری كرد ڕەتی خوایەتی و پەرستشی هەموو پەرستراوە ناحەق و باتڵ و پوچەڵەكانی ڕەت كردەوە بەو بڕگەی كە دەڵێ: ﴿لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ ئینجا لە پاشان جێگیری حەیایەتی و قەیومایەتی بۆخۆی كرد الله تعالی وە لە پاشان لێرەشەوە دوبارە هات نەفی و ڕەتكردنەوەی خەو و بۆرژانی لە خۆی كرد.

وە لە پاشان دەفەرموێ: ﴿لَّهُۥ مَا فِی ٱلسَّمَـٰوَٰتِ﴾ جێگیری موڵكایەتی و خاوەنێتی خۆی كرد بۆ هەموو ئاسمانەكان و ئەوەی لە ئاسمانەكانە وە بۆ هەموو زەوی و ئەوەی لە زەوییە الله تعالی خاوەنی هەر هەموویانە: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِی یَشفَعُ عِندَهُۥۤ إِلَّا بِإِذنِهِۦ﴾ جا كێ هەیە و لە توانایدا هەیە شەفاعەت و تكاكاربێ لەلای الله تعالی مەگەر بە مۆڵەتی خوایی مەگەر ئەوەی الله مۆڵەتی دەدا هەر ئەو دەتوانێ: ﴿یَعلَمُ مَا بَینَ أَیدِیهِم وَمَا خَلفَهُم﴾ الله تعالی زانایە عیلم بۆخۆی جێگیر دەكا لێرە زانایە و شارەزایە بەوەی لە پێشیانە و لە پاشیانە واتە لە ڕابردو و لە داهاتوو هی هەركەس و شتێک دەبێ: ﴿وَلَا یُحِیطُونَ بِشَیء مِّن عِلمِهِۦۤ﴾ مەردوم و بەندەكان عیلمیان نیە دەوری دابێ بە هیچ شتێک لە شتەكانی الله تعالی: ﴿إِلَّا بِمَا شَاۤءَ﴾ ئیلا ئەو شتانەی الله تعالی مۆڵەت بدا كە عیلمی لێ بەدەست بێنن: ﴿وَسِعَ كُرسِیُّهُ

﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ كورسی الله تعالی فراوانە بە قەدەر ئاسمانەكان و زەوی: ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَا﴾ ڕاگرتنیشیان لەلای الله تعالی وە هیچ ماندوبون و بار قورسیەكی نیە: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾ وە الله تعالی بەرزێكی مەزنە.

جا ابن تيمية دەفەرموێ (أي لا يَكْرِثه ولا يُثْقِلُه) بە مەعنای ئەوەی بارقورسی و بارگرانی و ماندوبون دروست ناكا بۆ الله تعالی ڕاگرتنی ئاسمانەكان و زەوی (ولهذا كان من قرأ هذه الآية) لەبەر ئەو گەورایەتیەیە و ئەو نەفی و ئیثباتیەیە كە تێیدایە كە وەسفەكانی الله تعالی ی تێدا باسكراوە ابن تيمية دەفەرموێ هەریەك ئەو ئایەتە بخوێنێ لە شەوێكدا بەردەوام لەلای الله تعالی پارێزراو دەبێ (ولا يقربه شيطان حتى يصبح) شەیتانیش ناتوانێ توخنی كەوێ و نزیكی بكەوێتەوە تا بەیانی دەكاتەوە ئەو كەسە.

جا (آية الكرسي) موفەسیرین دەفەرمون لەبەر ئەوە گەورەترین ئایەتی قورئانی پیرۆزە كە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەوەیداوە كاتێک لە ئوبەی كوڕی كەعب لێی دەپرسن كامە ئایەت لە هەموو ئایەتەكان گەورەترە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ (آية الكرسي)، ئەویش لەبەر ئەوەیە چونكە كۆكەرەوەی ناو و سیفەتەكانی الله تعالی یە هەم نەفی تێدایە ڕەتكردنەوەی سیفەتە سەلبیەكان و كەم و كورتەكان وە هەم ئیثبات و جێگیری سیفەتە كەمال و تەواویەكانیشی تێدایە بۆ الله تعالی، وە پێغەمبەریش فەرموی: «مَن قَرَأَ هَذِه الآيَةَ فِي لَيْلَةٍ لَم يَزَل عَلَيهِ مِنَ اللَّهِ حَافِظ» ابن تيمية لەو فەرمودەی وەرگرتوە بڕگەكەی كۆتایی قسەكانی خۆی كە دەفەرموێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) هەریەكێک (آية الكرسي ) بخوێنێ لەشەوێكدا بەردەوام الله تعالی لەو شەوە دەیپارێزێ «وَلَا يَقْرَبُهُ شَيْطَان حَتَّى يُصبِحَ[1]» شەیتان ناتوانێ توخنی كەوێ و نزیكی ببێتەوە هەتا ئەو كەسە بەیانی دەكاتەوە.

جا كە دەڵێین: ﴿ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾ ئێمەی مرۆڤیش ژیانمان هەیە بەڵام ژیانی ئێمەی مرۆڤ ئەو كاتە تەواوە كە مردنی بەدوادا دێ یانی مردن ژیانمان تەواو دەكا، لەبەر ئەوەی مرۆڤ

[1] الراوي: ---، المحدث: ابن باز، المصدر: مجموع فتاوى ابن باز، الصفحة أو الرقم: (٣/٤٥٤).

ئەگەر هەر بژی هەر زۆر زۆر بژی تەواو نیە، لەبەرچی؟ چونکە پیر دەبێ پەکی دەکەوێ کەم و کورتی توش دەبێ پێویستی بە مردنە، بەڵام الله تعالی کە دەڵێین: ﴿ٱلحَىُّ﴾ە ژیانێکی هەمیشەییە قەت کەم و کورتی توش نابێ لە ئەوەل ئەو ژیانەی هەبوە تا کۆتاش ئەو ژیانەی هەر دەبێ -جل شئنە- هەر زیندوە الله تعالی، کەواتە لەوپەڕی تەواویەتە هی الله تعالی هی ئێمە کەم و کورتی هەیە، جا ژیانی ئێمە کۆمەڵێک شتی کەم و کورتی تریشی بەسەردا دێ هەندێکجار بێ ئاگا دەبین پێویستمان بە نوستن دەبێ لە ژیانی خۆماندا هەندێک جار دەچینە غەیبوبە و لە هۆش خۆمان دەچین، ئەوانە لە الله تعالی بەدەرە و دورە لە الله تعالی قەت لێی ناوەشێتەوە، ئەوانە سیفەتی نەقسن بۆ ئێمەی ئینسان دەگونجێ بەڵام بۆ الله تعالی ناگونجێ -جل شئنە-.

وە کە دەڵێین الله تعالی ﴿ٱلقَيُّومُ﴾ە بە مەعنای (القائم بنفسه المقیم لغیره من خلقه) یانی خۆی الله تعالی موحتاجی کەس نیە بۆ وەستانی و بۆ ژیانی و بۆ زیندوایەتی خۆی -جل شئنە- وە هەموو کەس و شتەکان موحتاجی ئەون ئەو ڕاگری هەموو شتەکانە الله تعالی لە ڕاگرایەتی خۆی و ژیان و زیندوایەتی خۆی موحتاجی کەس نیە بێ ڕاز و نیازە لە هەموو کەس و شتێک بەڵام شتەکان و بەدیهێنراوەکان هەمویان موحتاجن بە الله تعالی بۆ ڕاگرایەتیان جا هەر هەموی ڕاگرتوە بەوەی ڕزق و ڕۆزیان دەدا الله تعالی هی بەندەکانی دەیانژێنێ وە چاودێرە بەسەریانەوە -جل شئنە-، هەموو دەمێک الله تعالی هەستان و دانیشتنەکانیان بۆ دەکات دەسەڵات و توانای ئەوەیان پێ دەبەخشێ کە بگەڕێن و بسوڕێن و بژین ئەوە هەموی الله تعالی یە -جل شئنە- پێیان دەبەخشێ.

وە لە فەرمودەی سەحیحیش هاتوە سەبارەت بە بۆرژان و نوستنی الله تعالی دوبارە پێغەمبەریش (ﷺ) ڕەتیکردوەتەوە دەفەرموێ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَنَامُ، وَلَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ[1]» الله تعالی بە دڵنیاییەوە و سەدا سەد نانوێ وە نابێ الله تعالی ش بنوێ واتە لێی ناوەشێتەوە

[1] صحیح مسلم (٢٩٣) (١٧٩)، سنن ابن ماجه ١٩٥ (١٩٦)، مسند أحمد (١٩٥٣٠) (١٩٥٨٧) (١٩٦٣٢).

بنوێ لەبەر ئەوەی نوستن بێ ئاگاییە سیفەتی کەم و کورتیە، لەبەر ئەوەی الله تعالی لە شەو و ڕۆژ لە هەموو چرکە و لەحزەکان هەموو مەردوم و بەدیهێنراوەکان موحتاجن بەوەی الله تعالی ڕایان بگرێ ئاگای لێیان بێ مادەم موحتاجن بەوە الله تعالی کەواتە -جل شئنە- نابێ هیچ چرکە و لەحزەیەکیش هەبێ بێ ئاگابێ جا نوستنیش بێ ئاگاییە لەبەر ئەوە الله تعالی قەتاوقەت نانوێ و وە بۆرژانیشی توش نابێ.

لە پاشان فەرموی: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ یەعنی ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەوی هەیە الله خاوەنیانە -جل شئنە- خاوەنی ڕاستەقینە.

ڕەنگە هەبێ بپرسێ بڵێ باشە ئەی بۆخۆشمان ئێمە خاوەنی شتەکانی خۆمان نین؟ بۆ نمونە من خانویەکم هەیە ئایە خاوەنی ئەو خانوەی خۆم نیم؟ لە تاپۆکەی بەناوی من نیە؟ من ناتوانم خاوەنێتی یەعنی تەسەڕوف تێکردن تەسەڕوفی تێدا بکەم بیکڕم بیفرۆشم؟ ئێمە دەڵێین ئێمەش خاوەنین بەس خاوەنێکی کەم و کورتین ئەو خاوەنیەتیەش الله تعالی بە ئێمەی بەخشیوە، بۆ نمونە ئەگەر تۆ خاوەنی ئۆتۆمبێلێکی بەناوی خۆتە و بە پارەی خۆت کڕیوتە خاوەنیەتیەکەت کەم و کورتە تا سەر نیە کاتێک دێ دەبڕێ و خاوەنیەتیەکەت لێ دەستێنێتەوە الله خاوەنی ڕاستەقینەی تۆ و ئۆتۆمبێلەکەی تۆشە کە بە تۆی بەخشیوە چونکە ئەو دەتوانێ بت مرێنێ بت ژێنێ تەسەڕوفت تێدا بکا هەرچی بیەوێ لەگەڵت بکا -جل شئنە-، کە تۆ مردی خاوەنیەتیەکەت نەما دەبێتە میرات لەپاشت بەجێ دەمێنێ کەسێکی تر دەبێتە خاوەنی شتەکەی تۆ خاوەنیەتیەکەی تۆ کەم و کورتە.

یان دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ﴾ باسی شەفاعەت و تکا دەکا شەفاعەت و تکا خوای رب العالمین بە هەندێک کەسی بەخشیوە و مۆڵەتی داون شەفاعەت و تکا بکەن، لەوانە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، لوانە زاناکان، لەوانە پیاو چاک و وەلیەکانی لە الله نزیک) ئەوانە خوای رب العالمین مۆڵەتیان پێدەدا لە قیامەتیش تکا کاربن بۆ هەندێک خەڵک و کەسەکانی گوناحکار و تاوانبار.

جا الله تعالى كە فەرموشی هەموو عیلم و زانستی و زانیاریەكان ئەوەی مرۆڤ و مەردوم بیزانێ الله تعالى پێی بەخشیوە -جل شئنە-، هیچ كەس لەخۆیەوە شت نازانێ ئەو عیلمەی ئێمە هەمانە كە ئێجگار ئێجگار كەمە هەموی لە اللەوەیە -جل شئنە- جا عیلمی ئێمەش دەوری الله نادا -جل شئنە- بەڵام عیلمی الله تعالى دەوری هەموو مەردومی داوە -جل شئنە- دەفەرموێ: ﴿عَـٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ الله تعالى زانایە بە پەنهانەكان بە شتە نادریارەكان وە غەیب و پەنهان و نادیارەكان كەس هیچی لێ نازانێ و بۆی ئاشكرا نابێ: ﴿إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ﴾ ئیلا ئەگەر كەسێک الله تعالى لە پێغەمبەرەكانیەوە رازیبێ بەوەی غەیب و پەنهانێكی بۆ ئاشكرا ببێ ﴿فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدًا﴾ [الجن: ٢٦-٢٧].

وە لە پاشان الله تعالى فەرموی: ﴿ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ كورسی الله تعالى -جل شئنە- جێگیرە بۆ الله وە یەكێكە لە بەدیهێنراوەكانی الله تعالى، كە عەرشی الله تعالى ئەویشیان یەكێكە لە بەدیهێنراوەكانی الله تعالى جێگیرە بۆ الله تعالى، جا پێناسەی كورسی الله تعالى هاتوە دەفەرمون: «ما السَّماوات السّبع في الكُرسيِّ إلّا كحلقةٍ ملقاة بأرضٍ فلاة[١]» فەرموی هەر حەوت ئاسمانەكان سەبارەت بە كورسی الله تعالى وەكو ئەڵقەیەكە هەڵیدەیتە زەویەكی پان و پۆری چۆڵەوانی و سەحرا، یانی ئەوەندە بچوكە سەبارەت بە كورسی الله تعالى ئەوەنە گەورەیە -جل شئنە- وە عەرش و كورسیەكەشی، لە شوێنێ خۆیدا بە درێژی باسی عەرش و كورسی ئەو بابەتە شتانە دەكەین لەبەر ئەوە لێرە هەر ئەوەندامان گوت بە كورتی.

الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾ الله تعالى بەرز و مەزنە بەرزایەتیەكە سیفەتی علوە كە ئەهلی سونە و جەماعە جێگیری دەكەن بە حەقیقەتی خۆی بۆ الله تعالى

[١] الراوي: [أبو ذر الغفاري]، الألباني، التعليق على الطحاوية (٣٦)، هذا القدر فقط صح مرفوعا، أخرجه ابن أبي شيبة في ((العرش)) (٥٨) واللفظ له، وابن حبان (٣٦١)، وأبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (١٦٧/١).

بەبێ ئەوەی چۆنیەتیەكەی بزانن بەوە تەفسیری دەكەن كە علوی زاتی هەیە الله تعالی هەم زاتەكەشی بەرزە: ﴿ٱلرَّحۡمَـٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ [طه: ٥] ئاوای تەفسیر دەكەن وە هەم سیفەت و ناوەكانیشی بەرزە و لەوپەڕی بەرزییە و كەسی ناگاتێ و سیفەت و ناوی كەس نایگاتێ: ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦ﴾ [الأنعام: ١٨] الله تعالی دەسەڵاتێكی بەرزی مەزنە بەسەر هەموو بەندەكانیەوە: ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ﴾ [المائدة: ١٢٠] لەسەر هەموو شتێك توانایە الله تعالی بەرزیەكەی لەوەدایە -جل شئنه-.

جا ابن تیمیة كە فەرموشی ئەو ئایەتە بخوێندرێ لە شەوێكدا لەو فەرمودەی كە پێشتر خوێندمانەوە وەریگرتوە بەڵێ (آیة الكرسي) زۆر گرنگ و موهیمە كە ئێمە بایەخی پێبدەین بیخوێنین پارێزەرە بۆمان الله تعالی -جل شئنه- ئەو بەخشیشەمان لەگەڵ دەكا، ئەگەر ئێمە بە دڵ و گیانەوە لێی تێبگەین و بیخوێنین، جا گەورەترین ئایەتی قورئانیشە لەبەر ئەوەی ئەوەتا لە ئوبەی پرسرا كە كامە ئایەت لە هەموو ئایەتەكان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی مەزنترە لە پەرتوكی الله و قورئانی پیرۆز؟ ئەویش گوتی: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ...الآية﴾ پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی لەسەر شانی دانا و فەرموی ئەو عیلم و زانستیەت لێ پیرۆز ئەی باوكی مونذیر[١]، واتە قسەكەت ڕاستە و پێكاوتە ئەی ئوبەی كوڕی كەعب كە دەڵێی مەزنترین ئایەت لە قورئانی پیرۆز (آیة الكرسي)ە.

## جەمع لەنێوان (علوه وقربه وأزلیته وأبدیته):

وَقَوْلُهُ سُبْحَانَهُ: ﴿هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيم﴾ [الحدید: ٣]، وَقَوْلُهُ سُبْحَانَهُ: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لا يَمُوتُ﴾ [الفرقان: ٥٨].

---

ابن تیمیة -رحمه الله- لە مەتنەكە دەفەرموێ (قَوْلُهُ سُبْحَانَهُ: ﴿هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيم﴾ [الحدید: ٣]، وَقَوْلُهُ سُبْحَانَهُ: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لا يَمُوتُ﴾ [الفرقان: ٥٨]) لێرەدا ئەو دانەرە بەڕێزە دێ هەندێك لە ناو و سیفەتەكانی الله

[١] صحیح مسلم (٨١٠) (٢٥٨)، سنن أبي داود (١٤٦٠)، مسند أحمد (٢٠٥٨٨) (٢١٢٧٨).

تعالی جێگیر دەکا کە لەو ئایەتانە الله تعالی هەندێک لە ناوە زۆر جوانەکانی بۆخۆی داناوە کە سیفەتە زۆر بەرزەکانیشی لێ وەردەگیرێ لەوانە سیفەتی علو و بەرزیایەتی لێ وەردەگیرێ هی قورب و نزیکایەتی وە هی ئەوەلیەت و بێ سەرەتایی وە هی ئەبەدیەت و بێ کۆتایی لێ وەردەگیرێ، با بێین یەک بە یەک ئایەتەکان شیبکەینەوە و تەفسیری بکەین بە شێوازێک کە ئەهلی سونە و جەماعە کردویانە چاکتر لێی حاڵی دەبین و تێ دەگەین.

خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّهِرُ وَالْبَاطِنُ﴾ یانی زاتی الله تعالی ئەوەلە، ئەوەل بە مانای چی دێ؟ هەر پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئێمەی تەفسیر کردوە چونکە هەندێک جار ئایەتەکانی قورئان جۆرێک لە جۆرەکانی تەفسیر ئەوەیە بە ئایەت تەفسیر دەکرێ پێی دەڵێن تەفسیری مەئثور یان بە حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ) تەفسیر دەکرێ بەو بابەت و جۆرە تەفسیرە دەڵێن تەفسیری مەئثور واتە تەفسیرێکە ئایەت بە ئایەت تەفسیر دەکرێ ئایەت بە حەدیس تەفسیر دەکرێ لەگەڵ ئەوەدا جۆرێکی ترمان هەیە لە تەفسیر (التفسير بالرأي) پێ دەڵێن بە بۆچونی زانایان بە گوێرەی ورد بونەوە لە لایەنە زمانەوانیەکەی و وە بە هەندێک بەڵگە و چەندین بنەما لەو چوار چێوەدا تەفسیری ئایەتەکانی قورئان دەکەن، جا لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) لەو دۆعا و نزا و پاڕانەوەی لەبەر الله تعالی کە دەیکات کە شەوانە خوێندویەتی لە کاتی ئیستیفتاحی نوێژەکانیدا کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ» ئەی الله تعالی تۆ یەکەمی لە پێش تۆ هیچ کەس و شتێک نەبوە، ئەوەل هەر بۆخۆشمان ئەگەر سەرنجی بدەین یەکەم بە مانای چی دێ؟ بە مانای ئەوە دێ لە پێشی هیچ نیە چونکە لەپێش ژمارە یەک چی هەیە؟ هیچ ژمارەیەک هەیە؟ نەخێر، سفڕ هەیە سفڕیش حیسابی بۆ ناکرێ سفڕ یانی هیچ، کە دەڵێین لەپێش یەک هیچ نیە بە مەعنای سفڕ هەیە سفڕیش یانی هیچ، کەواتە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «اللَّهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ» واتە تەفسیری ئایەتەکە ﴿هُوَ الْأَوَّلُ﴾ خوای رب

العالمين کە فەرمووی بە مانای ئەوە دێت واتە تۆ یەکەمی ئەی الله تعالى هیچ کەس و شتێک لەپێش تۆ نیە، لە پاشان دەفەرمویٚ «وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ» وە تۆش ئەی الله تعالى ئاخیر و کۆتای لەدوای تۆوە هیچ کەس و شتێک نیە، جا ئاخیریش هەر بەو مانایە دێ، ئەگەر شتێک بڵێین ئەوە ئاخیرە بە مەعنای ئەوەیە کۆتایە تەواوە هیچ کەس و شتێک لەپاش ئەو نیە، وە دەش فەرمویٚ «وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ» تۆ دیاری و بەرزی ئەی الله تعالى هیچ کەس و شتێک لە سەروی تۆ نیە، وە لە پاشان دەفەرمویٚ «وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ» تۆ باطینی ئەی الله تعالى هیچ کەس و شتێک لەو دیوی تۆ نیە، ئینجا پاشان دەفەرمویٚ «اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ» لەبەر الله دەپارێتەوە دەفەرمویٚ قەرزەکانمان لەسەر ئەدا بکەی و بدەیتەوە وە دەوڵەمەندمان بکەی لە فەقیر و هەژاری.

کەواتە ابن تيمية -رحمه الله- ئەو بەڵگانەی هێنایەوە بە ئایەتی قورئانی بۆ ئەوەیە کە بۆمان بسەلمێنێت و پێمان نیشان بدا و زانیاری ئەوەمان فێربکا کە هەریەک لەو ناوانەی الله تعالى کە لە قورئان تۆمار بوە سێ دیلالەتی هەیە لە عەقیدە و بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعە (دیلالەت یان دەلالەت بە یەک مانا دێ) جا دیلالەت و دەلالەت مانای چیە؟ یانی بەڵگەیە لەسەر سێ شت و وە سێ ڕێگاوە بەڵگەدارە لەسەر شتەکان:

یەکەمیان (دلالة على ذات الرب بالمطابقة) هەریەک لەو ناوانە بەڵگەیە لەسەر زاتی الله تعالى بە موطابەقە، موطابەقە یانی چی؟ موطابەقە وشەیەکە بەکاردێ بۆ دوو شت کە ڕێکبن لێک جیاواز نەبن و زیادەیی و کەمییان لەسەر یەک نەبێ، ئێستا کە ئەو دوو دەستانەی خۆم لەسەر یەکیان دادەنێم پەنجەکان بە تەواوەتی لەسەر یەک دابندرێ بەبێ ئەوەی لێک درێژتر و کەمتر و زیاتر و ئەوانەبن بەوە دەگوترێ ئێستا من ئەو دەستەم طەبق کرد لەسەر ئەو دەستە، موطابەقە دروست بوو یانی ڕێک و پێک وەکو یەک بەبێ زیادە و کەمی، جا کە دەڵێین ناوەکانی الله تعالى لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە

هەندێک جار دیلالەتی موطابەقەیی هەیە لەسەر زاتی الله تعالی، بۆ نمونە الخالق زۆر جاران زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەیهێننەوە دەفەرمون هەر سێ دیلالەتەکەی تێدایە، الخالق بە موطابەقە ناوە بۆ الله تعالی واتە بەدیهێنەر یانی ڕێک و پێک ناوێکە لە الله دەوەشێتەوە بەبێ زیاد و کەم وە بەڵگەیە لەسەر زاتی الله تعالی بە موطابەقە.

وە دیلالەت و دەلالەتی دوەم (دلالة على الصفة المشتقة بالتضمن) هەندێک جار بەڵگەیە لەسەر ئەو سیفەتەی کە وەردەگیرێت لەو ناوە بە لەخۆوە گرتنەوە، تەضەمون یانی لە خۆیەوە دەگرێ نەک بە موطابەقە، واتە هەر ناوێک لە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە سیفەتێکی لەخۆوە گرتوە و لێی وەردەگیرێ ناوێکی ڕوت نیە وەکو ناوی مرۆڤەکان وەکو ناوی بەدیهێنراوەکان، بۆ نمونە بەدیهێنراوەکان بۆ نمونە ئەگەر مرۆڤێک بە نمونە بهێنینەوە هەندێک جار دوو ناو سێ ناوی هەیە مەرج نیە ئەو ناوەی ئەو کەسە سیفەتی لێ وەربگیرێ، هەندێک جار سیفەتەکەی پێچەوانەیە ڕێک و پێک نیە و لەخۆوە ناگرێ ئەو ناوە سیفەتەکە کە بەڵگەبێ لەسەری، بۆ نمونە هەندێک جار کەسێک هەیە ناوی ڕەحیمە بەڵام هیچ ڕەحم و بەزەیی نیە و بە خەڵکی ناگەیەنێ زۆر زاڵمە زۆر ستەمکارە زۆر دڵ ڕەقە یانی پێچەوانەیە، کەسێک هەیە ناوی عەبدوڵایە بەڵام لەگەڵ ئەوەدا عەبدی تاغوتانە و هی زاڵمانە و هی بت و سەنەمەکانە وە خوای رب العالمین ناپەرستێ، کەواتە ناوەکەی سیفەتەکەی لێ وەرناگیرێ، ئیسم و موسەما موطابیق نیە لەوێدا، بەڵام هی الله تعالی -جل شئنە- لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە یەک لە بەڵگەکانی ناوەکانی ئەوەیە بەڵگە دەبێ لەسەر سیفەتێکی لێوەشاویە لەو ناوە وەردەگیرێ کە لە خۆوەیەوەی گرتوە، بۆ نمونە کە دەڵێین الله (الخالق)ە یان (الأول)ە ی‌ان (ال‌آخ‌ی‌ر)ە یامن هەر یەکێکی تر لە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی سیفەتێکی لەخۆوە گرتوە و ئەو کاتە مانای سیفەتێک دەدا دەبێ بێتە مێشکت بیروبڕوات وابێ کە دەڵێی الله خالقە واتای سیفەتی خەلقی لە خۆوە گرتوە کە دەڵێین الله عەلیمە سیفەتی عیلمی لە خۆوە گرتوە

یەعنی کە دەڵێی الله خالقە بە مەعنای ئەوە نیە سیفەتەکە نەیەتەجێ دەم و دەست ئۆتۆماتیکیەن لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەبێ بێتە مێشکت بیروبڕوات وابێ کە دەڵێی الله خالقە مەعنای سیفەتی خەلقی هەیە و بەدی دەهێنێ کە دەڵێی الله عەلیمە یانی سیفەتی عیلمی هەیە و دەزانێ و زانستی هەیە.

ئینجا لە پاشان دیلالەتی سێیەم لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بۆ ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی ئەویش (دلالة علی بقية الصفات بالالتزام) هەریەک لە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی هەندێک جار بە لازم بون و پێویست بون پەیوەستە بە ناوەکانی تری الله تعالی، کاتێک دەڵێین الله (الخالق)ە، (الخالق) بە دیلالەی موطابەقە و ڕێک و پێکی بەڵگەیە لەسەر زاتی الله تعالی بە دیلالەی تەضەمون و لە خۆوە گرتنەوە سیفەتی خەلقی لێ وەردەگیرێ بە دیلالەی ئیلتیزام بەڵگەیە لەسەر ناوەکانی تر ناوی تر دەبێ بۆ الله بڕیار بدەی و نوە زۆر جوانەکانی تر وە سیفەتی تر لەخۆوە دەگرێ، بۆ نمونە (الخالق) خەلق و بەدیهێنان بەبێ سیفەتی قودرەت و عیلم نابێ هیچ کەس و شتێک نیە بە گوێرەی عەقڵ و ژیریش هیچ شتێکی پێ بەدی بێ مەگەر دەبێ عیلمی بەو شتە هەبێ چوبێتە بنج و بنەوانی شتەکە ئەوە بۆ مەخلوق و بەدیهێنراوەکانیش وایە وە دەبێ قودرەت و دەسەڵاتیشی لەسەر بەدیهێنانی هەبێ، جا کە دەڵێین الله تعالی خالقە بەڵێ ناوە بۆ الله تعالی بە موطابەقە بەڵگەیە لەسەری وە سیفەتی خەلقی لێ وەردەگیرێ بە تەضەمون و لەخۆوە گرتن وە بە ئیلتیزامیش لە ناوی (الخالق) چی وەردەگیرێ؟ دەبێ سیفەتی قودرەت بڕیار بدەی کە الله تعالی دەسەڵاتە توانایە لەسەر هەموو شتێک کە بەدی دەهێنێ، وە سیفەتی عیلم زانست و زانیاری بە شتەکە.

جا کەواتە کە دەڵێین ئەوەل بەڵگەیە لەسەر چی؟ چی لێ وەردەگیرێ بۆ الله تعالی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بەڵگەیە لەسەر ئەزەلیەتی الله تعالی وەکو زاتی وەکو سیفاتەکانی وەکو ناوە زۆر جوانەکانی، ئەزەلیەت بە مانای

ئەوە دێ وشەیەکە لە قورئان نەهاتوە لە حەدیسی سەحیحی پێغەمبەریش نەهاتوە (ﷺ) بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە لە وەڵامی تاقم و کۆمەڵەکانی تر هەندێک جار بەکاری دەهێنن بە مانای ئەوەل دێ ئەگەرنا لە شوێنی ئەزەل ئەوەل بەکارهاتوە لە قورئانی پیرۆز وە لە حەدیسی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ)، ئەزەل و ئەوەل بە مەعنای بێ سەرەتا یانی هیچی لەپێش نەهاتوە الله تعالى -جل شئنە- بێ سەرەتایە، وە ئاخیر سیفەت و ناوی ئاخیر بۆ الله تعالى بەڵگەیە لەسەر چی؟ لەسەر ئەبەدیەت و بێ کۆتایی الله تعالى کۆتایی نیە -جل شئنە- وەکو ناوە زۆر جوانەکانی سیفاتە بەرزەکانی وەکو زاتیشی -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى)، زاهیر بەڵگەیە لەسەر بەرزیەتی الله تعالى یەعنی ئەوە دەگەیەنێ سیفەتی بەرزی لێ وەردەگیرێ، وە باطین بەڵگەیە لەسەر نزیکی و لەگەڵبونی الله تعالى لەگەڵ هەموو شتەکان و مەخلوقەکانی بە عیلم و قودرەتی لەگەڵیانە، جا لەگەڵ بونی بڕواداران بە سەرخستن یشیان وە لەگەڵبونی شتەکانی تر تەنها بە ڕاگرتن و تاقیکردنەوەیان و وە عیلم و قودرەتەوە لەگەڵیانە، کەواتە هەریەک لە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالى لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئیلا دەبێ سیفەتێکی لێ وەربگری نابێ بڵێی ناوێکی ڕوتە بۆ الله تعالى -جل شئنە-.

لە پاشان الله تعالى دەفەرموێ کە ابن تيمية هێناویەتیەوە لە مەتنەکەی: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ [الفرقان: ٥٨] دەفەرموێ پشت ببەستە بە زیندویەک کە نامرێ قەت قەت نامرێ، ئەو زیندوەی قەت قەت نامرێ کێیە؟ الله ی ە -جل شئنە-، کەواتە لێرەدا ناوی (الحي) بۆ خۆی بڕیاردا الله تعالى، وە لە شوێنی تر و چەندین ئایەتی تریش ئەوەی بۆخۆی بڕیارداوە، (الحي) یانی چی بۆ الله تعالى؟ (الحي) بە مەعنای زیندویەکی لەوپەڕی تەواوی زیندو ژیان و زیندوایەتی الله تعالى کەم و کورتی نیە، بۆخۆشی تەئکیدی کردوەتەوە الله تعالى لەو ئایەتە، واتە لەو ئایەتەدا هەم ئیثباتی تێدایە وەکو لە ڕابردو باسمانکرد گوتمان یەک لە قاعیدەکانی ئەهلی سونە و جەماعە هەندێک جار ناو و

سیفەتەکانی الله تعالی هەم نەفی تێدایە بۆ سیفەتە سەلبی و نەقس و کەم و کورتەکان وە ئیثباتیشی تێدایە بۆ سیفەتە تەواوەکان، لێرە (الحي) ناوی الله تعالی یە لە ناوە زۆر جوانەکانی تەواوی کە سیفەتی زیندویەتیەکی تەواوی سەدا سەدی لێ وەردەگیرێ بۆ الله تعالی، وە بە هەمان شێوە نەفی مردنیشی تێدایە کە سیفەتێکی سەلبیە کە کەم و کورتیە الله تعالی نیەتی -جل شئنه-.

جا الله تعالی ئایەتەکان زۆر زۆرن هەندێک جار دوو ناو پێکەوە دەهێنێ بۆخۆی لە کۆتایی ئایەتەکان ئەو دوو ناوەش کە پێکەوە دێن لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە زیاتر و چاکتر و جوانتری دەکا تەواوتری دەکا ئەوە نەبێ بێ حیکمەت بێ الله تعالی هەر ئاوا (پەنا بە الله) بە هەڕەمەکی شتەکە هاتبێتەوە دوو ناوی الله تعالی لە پاڵ یەک دانرابن، لە هەر ئایەت و شوێنێک کاتێ الله تعالی دوو ناوی خۆی پێکەوە دەهێنێ حیکمەتێکی تێدایە وە لێزانین و کارلەجێیەکی تێدایە وە ناوەکان بەهێزتر و جوانتر دەکا وە کەمالیەتی زیاتری پێ دەبەخشێ ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

بۆ نمونە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ [آل عمران: ٦] هیچ پەرستراوێکی حەق و ڕەوا نیە جگە لە الله ئەو اللهیەی کە (ٱلْعَزِيزُ)ە زاڵ و دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا وە (ٱلْحَكِيمُ)ە کار لەجێشە، ئەوە بزانن ماناکەی چی دەکا، هەندێک جار ئەگەر بڵێی کەس و شتێک زاڵە دەسەڵاتدارە (پەنا بە خوای رب العالمین) بۆ الله لێی ناوەشێتەوە بەڵام بۆ مەخلوق و بەدیهێنراوەکان هەندێک جار تۆ یەکسەر بیری ئەوەت بۆ دێ بە دەسەڵاتەکەی زوڵم و ستەم بکا بەڵام کار لەجێیی نەکا وەکو لە کوردەواری دەڵێ هەندێک خەنی بکا و هەندێک گەنی بکا بەڵام الله تعالی -جل شئنه- کە دەڵێ (ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ) خوای رب العالمین زاڵێکی دەسەڵاتدارە کارەکانیشی هەموی لەجێیە و عەدالەتە، بزانە ناوەکەی تەواوتر کرد بەهێزتری کرد واتاکە، لێرە (ٱلْعَزِيزُ) لەگەڵ (ٱلْحَكِيمُ) بە تەواوەتی تر تێیان دەگەیەنێ هەروا دانەنراوە ناوەکان لەگەڵ یەک و پێکەوە، یان لە

هەندێک شوێن الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ [يونس: ١٠٧] خوای رب العالمین لێبوردەی بەزەییە، لێبوردەی بەزەییە كەواتە دەبورێ لەپاش ئەوەی لێشت دەبورێ ڕەحم و بەزەیشت پێدەكا یانی ڕەنگە پلەشت بداتێ ڕەنگە پاداشتیشت بداتەوە هەر لێبوردن نەبێ تەنها.

كەواتە ئەو ناوە زۆر جوانانەی الله تعالی كە لە كۆتایی ئایەتەكان هەندێک جار لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بە یەكەوە دێن یانی لەپاڵ یەک دێن ئاوا دانەنراوە حیكمەت و كارلەجێی و لێزانی لێیە، جا هەریەک لە ناوەكانی اللەش گوتمان سیفەتێكی لێ وەردەگیرێ.

جا با بزانین (الْحَيِّ) سیفەتی چی لێ وەردەگیرێ كە الله تعالی لەو ئایەتە هێنای؟ سیفەتی حەیاتی لێ وەردەگیرێ (الْحَيِّ) ناوە بۆ الله تعالی سیفەتی زیندویەتی و ژیانی لێ وەردەگیرێ زیندوایەتی الله تعالی -جل شئنە- لەوپەڕی تەواوییە كەم و كورتی نیە ئێمەش زیندوین بەڵام زیندوایەتی ئێمە كەم و كورتە هەموو دەمێک ئەگەری ئەوەی هەیە لەناو بچێ زیندوایەتیەكەمان گیانمان بكێشرێ مردنمان بەسەردابێ وە لە ژیان و زیندوایەتی هەندێک جار پێویستمان بە خەوە ئەگەر نەخەوین ئیرهاق دەبین ناتوانین هۆشمان لەسەرخۆ نامێنێ جا زیندوایەتیەكەی الله تعالی ئەو نەقس و كەم و كورتیانەی نیە، وە تەئكیدیش دەكاتەوە زیندوایەتیەكەی الله تعالی لە ئەوەل و لە ئەزەلە بێ سەرەتا وە تا ئەبەدیشە بەبێ كۆتا وە تەئكیدیش دەكاتەوە مردن و سیفەتی نەقسی وەكو مردنی بەسەردا نایە (والله أعلم).

## جێگیر كردنی سیفەتی (العلم) لە قورئاندا:

وَقَوْلُهُ: ﴿وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ [التحريم: ٢]، ﴿وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ﴾[سبأ: ١]، ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ [سبأ: ٢]، ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ

حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ [الأنعام: ٥٩]، وَقَوْلُهُ: ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَى وَلا تَضَعُ إِلاَّ بِعِلْمِهِ﴾ [فصلت: ٤٧]، وَقَوْلُهُ: ﴿لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ [الطلاق: ١٢].

---

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- چەندین ئایەتی تر دەهێنێتەوە لەسەر جێگیر کردنی سیفەتی عیلم بۆ الله تعالی وە ناوە زۆر جوانەکەی الله تعالی کە عالمایەتی و زانابیە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ [النور: ٥٩] الله عەلیمە زانایە عەلیم نەک هەر زانا زۆر زانایە لەبەر ئەوەی سیغەی موبالەغەیە لەسەر وەزنی فەعیلە وە عیلمەکەی دەتوانێ بگەیەنێ و وە حەکیمە الله تعالی کار لەجێیە یانی عیلم و زانست و زانیاریەکانی لە شوێنی خۆی بەکار دەهێنێ کار لەجێیی پێ دەکا، وە لە پاشان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ﴾ [سبأ: ١] وە الله تعالی دەفەرموێ الله -جل شئنه- (الْحَكِيمُ) یەعنی کارلەجێیە (الْخَبِيرُ) یەعنی عیلم و زانستیەکەی وردکاری تێدایە لە بنج و بنەوانی زاهیر و باطینی هەموو شتەکان دەزانێ -جل شئنه-، وە لە پاشان ابن تيمية هێناویەتیەوە الله تعالی فەرمویەتی: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ [سبأ: ٢] الله تعالی دەزانێ ئەوەی لەناو زەویدا هەیە و لەناخی زەویدا هەیە لە مردووەکان لە مەعدەن و کانزاکان لە هەر شتێک کە هەبێ الله عیلم و زانستی پێی هەیە وە ئەوەی لە زەویش دەردەچێ لە ڕووەک و گیا و گوڵ و مەعدەن و کانزا و هەر شتەکان هەیە الله عیلم و زانستی پێی هەیە وە دەش فەرموێ ئەوەی لە ئاسمانیش دادەبەزێ الله تعالی عیلم و زانستی پێی هەیە ئەوەی بەرەو ئاسمانیش هەڵدەکشێ لە زەویەوە عیلم و زانستی پێی هەیە.

کەواتە ئەوانە هەموی ناوی علمایەتی و زانایەتی و زۆر زانایی الله تعالی ی پێ جێگیر دەبێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وە سیفەتی عیلم بۆ الله تعالی وە سیفاتی حیکمەت وە سیفەتی خیبرە و وردزانی و وردکاری لێ وەردەگیرێ بۆ خوای رب العالمین.

وە ئايەتێكی تر بە بەڵگە دەهێنێتەوە ابن تيمية دەفەرموێ الله تعالى فەرموی: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ [الأنعام: ٥٩] الله تعالى دەفەرموێ الله خاوەنی كلیلەكانی غەیبیە بە مانای ئەوەی ئەو شتە پەنهان و نادیارەكان عيلم و زانستی لەلای الله يە -جل شئنه- وە هيچ كەس نيە ئەو غەيب و پەنهانانە بزانێ ئيلا خۆی نەبێ -جل شئنه- تەنانەت لە عەقيدەی ئەهلی سونە و جەماعە فريشتەكان و پێغەمبەرانيش (عليهم الصلاة والسلام) هيچ لە غەيب و پەنهانەكان نازانن مەگەر غەيب و پەنهانێك الله ويستبێتی -جل شئنه- پێيان بڵێ و پێيان ڕابگەيەنێ و بۆيان ئاشكرا بكا، وە دەش فەرموێ: ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ الله تعالى شارەزايە و زانايە بەوەی لە وشكانی هەيە و لە دەريا هەيە: ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا﴾ هيچ گەڵايەک نيە لە داريش بوەرێ ئيلا الله تعالى عيلم و زانستی پێی هەيە: ﴿وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ﴾ وە هيچ دانەوێڵەيەكيش نيە لە تاريكايی ناو ناخی زەوی كە حەشاريش درابێ و شاردرابێتەوە ئيلا الله عيلم و زانستی پێی هەيە: ﴿وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ هيچ شتێكی تەڕ و وشكيش نيە ئيلا الله تعالى عيلمی پێی هەيە و نوسيويەتيەوە لە پەرتوكی ڕون و ئاشكرا كە (اللوح المحفوظ)ە، وە لە ئايەتێكی تر دوبارە ابن تيمية بە بەڵگە دەيهێنێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَى وَلا تَضَعُ إِلاَّ بِعِلْمِهِ﴾ [فصلت: ٤٧] جا هيچ بارێك هەڵناگيرێ لەلايەن ئافرەتانەوە و مێينانەوە لە منداڵ و لە هەڵگرتنی هەر شتێك وە داشی نانێن ئيلا بە عيلمی الله تعالى يە لە سەرەتاوە تا كۆتا الله تعالى عيلم و زانستی بە كۆرپەلە و منداڵ و هەموو شتەكان هەيە، وە لە سورەتێكی تر دوبارە ابن تيمية بە بەڵگەی دەهێنێتەوە بۆ جێگير كردنی زانين و زانياری و زانايی و زۆر زانايی الله تعالى -جل شئنه- وەكو ناوە زۆر جوانەكانی و سيفەتی عيلمی كە لێ وەردەگيرێ دەفەرموێ: ﴿لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ [الطلاق: ١٢] با بزانن الله تعالى

لەسەر هەموو شتێک توانایە وە بەڕاستی و بێگومان الله تعالی عیلم و زانستیەکەی دەوری هەموو شتێکی داوە.

جا بابێین بە دور و درێژتر باسی ناوە زۆر جوانەکەی الله تعالی بکەین کە عالمیەتە و زانایە و زۆر زانایە وە لە پاشان سیفەتی عیلمی کە چۆن لێ وەردەگیرێ و چەند ناو و سیفەتێکی تریش کە لە ئایەتەکان هەیە وە سیفەتەکانی کە لێیان وەردەگیرێ.

ئەو ئایەتانە ابن تيمية -رحمه الله- بە بەڵگەی هێناوەتەوە خۆشی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لەوەدایە کە هیچ قسەیەک بێ بەڵگە ناکەن یان ئایەت یان حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەتی لە عەقیدەدا سەرچاوەی تەواوی سەرەکی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەن، ئەو ئایەتانەی لەدوای یەک کە ڕیز کردوە ابن تيمية -رحمه الله- ئەو ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی الله تعالی یەکێک لە ناوەکانی عەلیمە، یەکێک لە ناوەکانی حەکیمە، یەکێک لە ناوەکانی الله تعالی (عَلَّامُ الْغُيُوبِ)ە یانی هەر زۆر زۆر شارەزایە و زانایە بە شتە پەنهان و نادیارەکان، ئینجا سیفەتی عیلمی لێ وەردەگیرێ بۆ الله تعالی، (الْحَكِيمُ) سیفەتی حیکمەتی لێ وەردەگیرێ، (ٱلْقَدِيرُ) سیفەتی قودرەتی لێ وەردەگیرێ.

ئینجا خوای رب العالمين کە دەفەرموێ: ﴿يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەوە دەیەوێ عیلمەکەی خۆی تەواو پێمان بناسێنێ کە بە ورد و درشتی شتەکان عیلم و زانستی هەیە تەنها چچەند نمونەیەکە بۆ ئێمەی هێناوەتەوە، ئینجا خوای رب العالمين کە دەفەرموێ: ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ﴾ یانی ئەو شتانەی لە پێشتر و وە ئەو شتانەی لە دواتریش هی مرۆڤەکان و مەخلوق و بەدیهێنراوەکان هەیە هەموی الله تعالی -جل شئنە- عیلم و زانستی پێی هەیە، وە لە پاشان کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾ هیچ شتێک لە عیلمی الله تعالی مرۆڤەکان نایزانن و دەوریان نەداوە ئیلا ئەوەی الله بیەوێ -جل شئنە- پێیان ڕابگەیەنێ.

کەواتە لە ئایەتەکەی یەکەم کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ [التحريم: ٢] ئەوە جێگیر کردنی دوو ناوی زۆر جوانی الله تعالى ی تێدایە ابن تيمية هێناویەتیەوە، (الْعَلِيمُ) ناوی یەکەمە سیغەی موبالەغەیە واتە زۆر زانایە الله تعالى (الْحَكِيمُ) ئەویش ناوی الله یە -جل شئنە- واتە کارلەجێ، وە ئەوانە دوو ناون مەدح و پێدا هەڵگوتن و ثەنائی اللهی پێدەکرێ -جل شئنە- لە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالى ن، گوتمان هەریەک لەو ناوانە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەبێ سیفەتیشی لێ وەربگیرێ، جا عەلیم سیفەتی عیلمی لێ وەردەگیرێ وە حەکیمیش سیفەتی حیکمەتی لێ وەردەگیرێ، جا حیکمەتیش بەو مانایە دێ عیلم و زانستی مەعنای دەرک و پەیبردن بە شتەکان بەڵام حیکمەتیش بەو مانایە دێ دانانی هەر شتێک لە شوێنی خۆی لە پێناو بەرژەوەندیەکی تەواو بەوە دەگوترێ حیکمەت الله تعالى -جل شئنە- هەموو شتەکانی لەوپەڕی کارلەجێیە لەپێناو بەرژەوەندیەکی تەواوی لێوەشاوەیە هیچ شتێکی لە خۆڕا نیە بێ واتا نیە (ولله المثل الأعلى).

وە ئایەتەکەی دوەم کە ابن تيمية هێنایەوە: ﴿وَهُوَ الحَكِيمُ الخَبِيرُ﴾ [الأنعام: ١٨] الله تعالى (الحَكِيمُ)ە (الخَبِيرُ)یشە ئەوەش دوو ناوی بۆ الله تعالى جێگیر کردوە، ئەویش یەکەمیان (الحَكِيمُ) دوبارە یەعنی ئیش و کارەکانی لەوپەڕی تەواوییە الله تعالى کارلەجێیە وە لە پاشان (الخَبِيرُ)یش یەعنیە الله تعالى خاوەن خیبرەیە، خیبرە چیە؟ (العلم التام الكامل بالأشياء) زانست و زانیاری تەواوی سەدا سەدی بە شتەکان بەوە دەگوترێ خیبرە (ظاهرها وباطنها) لە ڕواڵەت و لە کاکڵە و ناوەڕۆکیدا لە هەموی ئەگەر عیلم و زانستیت بە شتێک هەبوو (مع الإحاطة بذلك) دەوریدا عیلم و زانستیەکەت هی شتەکە تۆ خەبیری لەو شتە، جا الله تعالى خیبرەکەی وەکو هی مرۆڤەکان نیە وەکو هی بەدیهێنراوەکان نیە (ولله المثل الأعلى) سەدا سەدە وردکارە وردبینە الله تعالى -جل شئنە- وە خیبرەی هەیە واتە عیلم و

زانستی و زانیاری تەواوی سەدا سەدی بە ڕواڵەتی و بە ناواخن و بە باطینایەتی هەموو شتێک هەیە و وە عیلم و زانستیەکەی دەوری شتەکانی داوە.

ئایەتەکەی سێیەم ئەوەیە کە خوای رب العالمین: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ [سبأ: ٢] لەو ئایەتە الله تعالى سیفەت و ناوە زۆر جوانەکەی خۆی کە عیلم و زانستیە و زۆر زاناییە دەیسەلمێنێ الله تعالى وە جێگیری دەکا وە سیفەتی کامیل و زۆر تەواوی لێ وەردەگیرێ لە هەموو ڕووەکانیەوە، الله تعالى هەواڵ دەدا لەو ئایەتە کە لەوپەڕی عیلم و زانستی عیلم و زانستی هەیە وە سیفەتی عیلمەکەی الله تعالى کەمالیەت و تەواویی هەیە وە کەم و کورتی نیە بە ورد ترین شت تا درش ترین شت هەموو شتەکانی نادیار و ڕواڵەتی و ئاشکراکان الله تعالى عیلم و زانستی پێی هەیە کە فەرموی: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ﴾ الله تعالى دەزانێ و زۆر زانایە بەوەی کە لە ناواخنی زەویدا هەیە ناواخنی زەوی و لە ژێر زەوی هەر مەعدەنێک هەر کانزایەک هەر مرۆڤێک و مردویەک وە هەر شتێکی لێبێ لە دانەوێڵەیە مەعدەنە کانزایە مرۆڤە مردوەکانن هەموی الله تعالى عیلم و زانستی و شارازەیی پێی هەیە، وە ئەوەی دەریش دەچێ لە زەوی وەکو ڕووەک و ئەوانە شین دەبێ هەموی عیلم و زانستی و شارەزایی پێی هەیە، ئەوەی لە ئاسمانیش دادەبەزێ لە باران و تەزرە و بەفر و هەر شتێک الله تعالى عیلم و زانستی پێی هەیە، وە ئەوەی هەڵدەکشێ بەرەو ئاسمانیش لە زەویەوە لە هەڵم و لە غوبار و لە تۆز و لە هەر شتێک الله تعالى -جل شئنه- عیلم و زانستی بە هەر هەموی هەیە، کەواتە دەیەوێ بۆمان بسەلمێنێ الله -جل شئنه- پێمان نیشان بدا کە عیلم و زانستیەکانی الله تعالى سیفەتی عیلمی الله تعالى لەوپەڕی تەواوی و کەمالیەتە کەم و کورتی نیە.

وە لە ئایەتەکەی چوارەم ابن تیمیة کە بە بەڵگەی هێنایەوە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ﴾ الله تعالى کلیلی پەنهانی و نادیارەکانی لەلایە و زانایە بە شتە نادیار و غەیبی و پەنهانەکان ئیلا بە خۆشی دەزانێ ئەو نادیار و پەنهانانە چین عیلم

و زانستی پێی هەیە، وە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ وە دەش زانێ لە وشکانی و دەریا چی هەیە چونکە دەریا جیهانێکی سەربەخۆیە لەنێو دەریادا سەدان وە هەزاران هەندێک جار ڕەنگە دەگاتە ملیۆنەها شتی تێدایە لە گیاندار و بێ گیان ئەوە الله تعالی عیلم و زانستی دەوری داوە بە هەموو شتەکان ئەوەی لەناو دەریایە لە وشکانیش دەیەها و سەدەها و هەزارەها شت هەیە کە ئێمە نەمان بینیوە هەندێک جار لەلامان سەیرە الله تعالی ورد و درشتەکانی وشکانیش دەزانێ عیلم و زانست و زانیاری پێی هەیە، ئینجا دەفەرموێ تەنانەت کەشتێکی زۆر سادەیە بەڵام لەلایەکیشدا شتێکی وردە کە ئێمە هەندێک جار عیلم و زانستیمان پێی نابێ کەوتنە خوارەوەی گەڵایەک و هەڵوەرینی گەڵایەک یانی گەڵای دار پەلکی دار، کە هەندێک جار ئەگەر تۆ لە پاڵ دارێک وەستابی هەست پێ ناکەی کە گەڵاکە دەوەرێ عیلم و زانستیت پێی نابێ الله تعالی عیلم و زانستیەکەی ئەوەندە وردە ئەوەندە تەواوە -جل شئنه- ئەو گەڵایە کە لە شوێنی خۆیدا کە دەکەوێتە خوار و دەوەرێ تۆ لەپاڵی و هەستی پێ ناکەی الله تعالی عیلم و زانستی پێ هەیە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى)، وە لە پاشان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ﴾ وە دانەوێڵە کە لە تاریکایی ناواخنی زەویدایە دنکە گەنمێک دنکە جۆیەک هەریەک لەو شتانە عیلم و زانستی پێی هەیە الله تعالی: ﴿وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ﴾ [الأنعام: ٥٩] هەر شتێک کە تەڕبێ یان وشک بێ الله تعالی عیلم و زانستی و زانیاری پێ هەیە وە نوسراوەشە لە (اللوح المحفوظ) و لە پەرتوکی ڕون و ئاشکرا.

کەواتە لەو ئایەتە الله تعالی سەلماندی -جل شئنه- عیلمی الله تعالی لەوپەڕی تەواوییە بە ورد و درشتی شتەکانە وە چەندین نمونەی بۆمنان هێنایەوە.

جا پێغەمبەر (ﷺ) بۆمان ڕوندەکاتەوە لە فەرمودەیەکی سەحیحدا دەفەرموێ: «مفاتيح الغيب خمس» کلیلی پەنهانە غەیب و نادیارەکان پێنجن «لا يعلمهن إلا الله[1]» هیچ کەس

[1] **صحيح البخاري** (٤٧٧٨) (١٠٣٩) (٤٦٢٧)، **مسند أحمد** (٤٧٦٦) (٥١٣٣) (٥٢٢٦).

ئەو عیلم و زانستیەی بە کلیلی پێنج پەنهانەکە نیە ئیلا الله نەبێ -جل شئنە-، ئینجا لە پاشان هات پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتەی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ﴾ [لقمان: ٣٤] خوێندەوە.

وە ئایەتی پێنجەم کە ابن تيمية -رحمه الله- هێناویەتیەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَى وَلا تَضَعُ إِلاَّ بِعِلْمِه﴾ [فصلت: ٤٧] ئەو ئایەتەش سیفەتی عیلمی لێ وەردەگیرێ بۆ الله تعالى کە الله تعالى هەواڵی داوە هیچێک نیە بکەوێت لە حەمل و بارەکان کە هەڵدەگیرێ تەنانەت کۆرپەلە لەناو سکی دایکیشی چ هی ئینسان و مرۆڤەکان بێ چ هی ئاژەڵ و حەیوانەکان بێ ئیلا الله تعالى عیلم و زانستی پێی هەیە کە دەکەوێ لەبار دەچێ هەرچیەکی بەسەر دێ، وە مردن و ژیانیش ئیلا بە عیلم و زانستی الله تعالى یە، کەواتە الله تعالى اللهی تاک و تەنها اللهی پاک و بێگەرد -جل شئنە- عالم و زانایە و زۆریش زانایە بە هەموو شتەکان هیچ شتێک نیە ون و بزربێ لە الله تعالى ئەوەی لە زەویدا هەیە و لەسەر زەویشە ئەوەی لە ئاسمانەکان یشدا هەیە.

لە ئایەتی شەشەم ابن تيمية -رحمه الله- بە بەڵگە هێناویەتیەوە بۆ جێگیرکردنی دوو سیفەتی الله تعالى قودرەت و دەسەڵات و توانا وە عیلم و زانستیش دەفەرموێ: ﴿لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير﴾ با بزانن بەڕاستی الله تعالى بەسەر هەموو شتێک توانایە هیچ شتێک نیە لە توانای الله تعالى بەدەربێ: ﴿وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ [الطلاق: ١٢] وە الله تعالى بەڕاستی و بێگومان عیلم و زانستیەکەی دەوری هەموو شتێکی داوە.

کەواتە سیفەتی قودرەت و عیلم بۆ الله تعالى لەو ئایەتە جێگیر بوو کە الله تعالى هیچ شتێک نیە لە ڕابردو و لە ئێستا و لە داهاتوو دەسەڵاتی بەسەردا نەبێ وە هیچ شتێک نیە لە ڕابردو و ئێستا و داهاتوو عیلم و زانست و زانیاری پێ نەبوبێ جا شتەکە پەنهان و نادیاربێ وردبێ درشتبێ وە ئاشکرابێ، عیلم و زانستی بە هەموی هەبوە وە دەسەڵات و

توانای لەسەر هەموو شتەکان هەیە الله تعالی -جل شئنە-، کەواتە عیلم و زانستی الله تعالی لەوپەڕی تەواوییە بە هەموو شتەکان بە ورد و درشتیەوە ئاشکرا و نادیاریەوە لە ئاسمانەکان و لە زەوی لە هەر شوێن و جێگایەک هەبێ وە دەسەڵات و تواناشی بەسەر هەر هەمویان هەیە.

ئەو تەئیکد کردنەوە و پێداگرتنەی ابن تیمیة -رحمه الله- و ئەو هەموو ئایەتانەی بەدوای یەکدا هێناوە زیاتر بۆ جێگیر کردنی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە وە لە پاشانیش وەکو وەڵامێکە بۆ ئەو تیرە و تاقمانەی کە جگە لە ئەهلی سونە و جەماعەن و ڕەتی ئەو بابەتە سیفەتانە دەکەنەوە لە الله تعالی و تەعطیلی دەکەن و پەکی دەخەن و بڕیاری نادەن، وەکو جەهمیەکان و موعتەزیلەکان هەندێک جار بڕوایان وابوە کە الله تعالی دەڵێن عالمە بەبێ عیلم سیفەتی عیلمی لێ وەرناگرن تەنها ناوێکی ڕوت ئەوە لە الله ناوەشێتەوە -جل شئنە-، الله قادیرە بەڵام سیفەتی قودرەتی بۆ وەرناگرن، وە هەندێک جار تەنانەت ئەشعەریەکانیش لە هەندێک و خاڵ و سیفەتی الله تعالی هەندێک ناوی بۆ بڕیار دەدەن و سیفەتی لێ وەردەگرن هەندێکیش لە سیفەتەکان پەکی مەعناو و واتاکەی دەخەن و بڕیار نادەن و وە ڕەتی دەکەنەوە (پەنا بە خوای رب العالمین).

جا الله تعالی -جل شئنە- کە گوتمان لە کۆتایی ئەو ئایەتانە ئەوە دەسەلمێنین و دەهێنین کاتێ کە ناوێک لە ناوەکانی ناوێکی تری دەخاتە پاڵ لە کۆتایی ئایەتەکە دەیهێنێ لەوپەڕی کارلەجێی و لێزانیە ئەوە نەبێ هەر وا دانرابێ واتایەکی پڕ واتا و ڕێک و پێک و زیاتر و تەواوتر دەبەخشێ، بۆ نمونە چەند نمونەیەک بهێنینەوە.

الله تعالی دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [البقرة: ٢٢٦] دەڵێ ئەوانەی سوێند دەخۆن لە خێزان و هاوسەرەکانیان، سوێند خواردن بە تەڵاق سوێند نیە زۆر کەس هەیە لەناو کوردەواری وا باوە دەڵێ سوێندی گەورەی خواردوە بە مەعنای تەڵاقی خواردوە، کاکە تەڵاق هەر سوێند نیە تەڵاق

مەخلوقێکە بەدیهێنراوێکە نابێ ئەو وشەی بۆ بەکاربێ ئەوەی سوێند بە تەڵاق دەخوا و دەڵێ بە تەڵاقم ئیختیلافی لەسەرە لە بەینی زانایانی فیقهی ئایە تەڵاقەکەی پێ دەکەوێ یان ناکەوێ؟ وە ئایە بە سوێند دادەنرێ یان نا؟ هەندێک لە زانایان دەفەرمون سوێند نیە و لەغوە و چونکە تەڵاق مەخلوقە بەڵام کەسەکە تاوانی گەورەی ئەنجام داوە بە مەخلوقێک سوێندی خواردوە پێویستی بە تەوبە و گەڕانەوەیە بۆلای الله تعالى چونکە سوێند خواردن بە جگە لە الله تعالى شیرکە یان کوفرە جائیز نیە و دروست نیە، ئینجا یان شیرک و کوفری بچوکە لە ئیسلام نایباتە دەرەوە یان ئەگەر حوجەت لەسەر کرد و ڕونکردنەوەیدا و پێی وابوو شتەکەی سوێندی پێ خواردوە هێناویەتیە ئاستی الله تعالى لە ڕوی گەورایەتی لەبەر ئەوە سوێندی پێ خواردوە ئەوە دەبێتە شیرک و کوفری گەورەش و لە ئیسلامیشی دەیباتە دەرەوە (پەنا بە خوای رب العالمين)، جا خوای رب العالمين لەو ئایەتە دەفەرموێ ئەوانەی سوێند دەخۆن لە خێزان و هاوسەرانیان سوێندخواردن بە الله دەخۆن بە وەڵاە یان ناو و سیفەتەکانی الله تعالى کە لەگەڵیان کۆ نەبنەوە لەگەڵ خێزانیان، ئەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی نێوان ژن و مێرد کە ڕوودەدا حوکمێکی شەرعی تایبەتی هەیە الله تعالى لەو ئایەتە تۆماری کردوە کە باسی تەڵاق نیە ئینجا دەفەرموێ الله تعالى با ئەوانە بمێننەوە چوار مانگ ئەگەر سوێندەکەیان هێنایەجێ ئەوە ئەو کاتە حیسابێکە و ئەگەر نەشهاتەجێ حیسابێکی تری بۆ دەکرێ ئەگەر نەگەیشتە مودە و کاتی دیاریکراوی خۆی، بەڵام ئێمە مەبەستمان ئەوەیە لە کۆتایی ئایەتەکە خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُور رَّحِيم﴾ بەڕاستی و بێگومان الله تعالى لێبوردەیەکی بەزەییە، ئەوە چی دەگەیەنێ؟ ئەوە ئەوە دەگەیەنێ کەواتە ئەگەر ئەو کەسانە گەڕانەوە (تەوبەیان کرد) بۆلای الله تعالى گەڕانەوە و تەوبەیان بە نسیب بوو بەڕاستی الله تعالى لێبوردەیە بەزەیشە یەعنی لێیان دەبورێ ڕەحمیشیان پێ دەکا، لێرەدا لەو ئایەتە ئەوەی لێ دەوەشێتەوە.

بەڵام لە مەسەلەی تەڵاق اللە تعالی غەفور و ڕەحیمی لە ئاخیری ئایەتەکە نەهێناوە بەڵکو دوو ناوی زۆر جوانی خۆی تۆمار کردوە کە لەوێ بوەشێتەوە کە واتای تەواو لەوێ ببەخشێ کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنۡ عَزَمُوا ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ [البقرة: ٢٢٧] ئەگەر پێداگریان کرد و عەزمیان جەزم کرد لەسەر جیابونەوە لەگەڵ خێزان و هاوسەریان و تەلاقەکە بهێننەجێ بەڕاستی اللە تعالی سەمیعە دەبیسێ وە عەلیمە یانی تەلاقەکەی ئەوان دەبیستێ چۆن تەلاقیان خواردوە فێڵ لە اللە ناکرێ، لێرە ئەوەی لێ دەوەشێتەوە لێبوردەیی اللەی لێ ناوەشێتەوە کە اللە تعالی باسی لێبوردەیی بکا لەبەر ئەوە ناوی سەمیعی بۆخۆی بەکارهێنا لە ئاخیری ئەو ئایەتە وە عەلیمیشە اللە تعالی عیلم و زانستیشی پێ هەیە باسی ئەوە ناکا لێیان دەبورێ یان ڕەحمیان پێ دەکا یەعنی ئاگایان لە خۆی بێ ئەوەی عەزمی جەزم کرد لەسەر تەڵاق قسەکانی نەگۆڕێ اللە تعالی سەمیعە قسەکەی دەبیستێ وە عەلیمیشە زانایە بە قسە و شتەکان و حوکمەکانیەوە لەبەر ئەوە دەبێ قسەکان وەکو خۆی بڵێ و حوکمەکە وەکو خۆی بدا.

لە پاشان اللە تعالی -جل شئنە- لە هەندێک ئایەت دەفەرموێ: ﴿عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [البقرة: ٢٠٩] لە کۆتایەکەی چونکە لەوێ ئەو لێک وەشاوەیە و مانای تەواو دەدا، گوتمان عەزیز یانی دەسەڵاتداری زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا بە عام ئەگەر دەسەڵاتداری زاڵ بێتە بەر گوێچکەت هەندێک جار تۆ بیر لەوە دەکەیتەوە زوڵم و ستەمی لێ بوەشێتەوە ئەو دەسەڵاتدار و زاڵیە بەسەر هەموو شتێک (پەنا بە اللە) لەبەر ئەوە اللە تعالی دەفەرموێ ئەو دەسەڵاتە لە شوێنی خۆی بەکار دەهێنێ، لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان گوتمان هەندێک جار ئەگەر دەسەڵاتی زاڵبن لە سنوری مرۆڤایەتی خۆیان هەندێک جار حیکمەتیان نیە لە شوێنی خۆی بەکاری ناهێنن ئەوە نەبێ لە دژی دوژمن بەکاری بێنن بۆ پاراستنی جەماوەر و ژێر دەستەیان بەکاری بێنن هەندێک جار هەر لەگەڵ جەماوەری خۆیان ئەو دەسەڵات و زاڵیە بەکار دەهێنن زوڵم و ستەمی پێ دەکەن کار لەجێ نابن.

وە الله تعالى لە ئایەتی تر دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ﴾ [النحل: ١٩] شتە نهێنیەكانی خوت خوتە و خەیاڵاتی ناو دڵ و دەرونیشت الله تعالى پێی شارەزایە ئاگادارە چەند شتەكە نهێنی بێ وە ئەوانەی ئاشكراشی دەكەی، كەواتە هیچ شتێک لە الله تعالى بزر نیە -جل شئنە-.

لە كۆتایی ئەو ئایەتانە دەتوانین بڵێین ابن تيمية -رحمه الله- كە فەرموی و هێنایەوە بە بەڵگە بۆ جێگیر كردنی هەندێک لە ناوە زۆر جوانەكانی الله تعالى كە سیفەتە زۆر بەرزەكانیشی لێ وەرگیرا بەڵگەی ئەوەی هەیە و ئەوە جێگیر دەبێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە كە الله تعالى خاوەنی عیلم و زانستی و زانیارییەكی تەواوی سەدا سەدە بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی ئەوە دەسەلمێنرێ بۆ الله تعالى، ئەوانەی كە ئینكاری ئەو بابەتە سیفەتەیان كردوە وەكو جەهمیەكان وەكو موعتەزیلەكان وە هەندێكی تر لە تیرەكانی تر بەڕاستی هەڵەیان كردوە نەیان پێكاوە سیفەتی نەقس (پەنا بە خوای رب العالمين) پەڵیان داوە بۆلای الله تعالى كە ئەوانە مونحەریف بونە لا ڕێ بونە.

هەندێكیش هەندێكجار تەئویلی ئەوەش دەكەن كە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ كورسی الله تعالى فراوانە بە قەد ئاسمانەكان و زەوی یانی ئاسمانەكان و زەوی گرتوەتەوە ئەوەندە فراوانە، جا هەندێک لە موعتەزیلەكان ئینكاری عیلم دەكەن بەڵام دەڵێن كورسی لەو ئایەتەدا مەبەست پێی عیلمە یەعنی عیلمی الله فراوانە بە قەد ئاسمانەكان و زەوی، نا الله تعالى لە زۆرێک لە شوێنەكانی تر عیلمی فراوانی خۆی كە دەوری هەموو شتێكی داوە بۆخۆی بڕیار داوە لێرە كورسی هەر بە مانای كورسی دێ نابێ تەئویل بكرێ وەكو ئەوان تەئویلیان كردوە، وەكو ئەشعەری و ماتۆریدیەكانیش هەندێک لە سیفەتەكانی الله تعالى جێگیر دەكەن هەندێک جار هەندێكیشی ڕەت دەكەنەوە بە تایبەت سیفەتە فیعلیەكانی الله تعالى، هەندێک جار ئەشعەری و ماتۆریدیەكان توشی شتی دژ بە یەكیش دەبن هەندێک لە سیفەتی الله تعالى بڕیار دەدەن وە هەندێكی تر لە

سیفاتە فیعلیەکانی ڕەت دەکەنەوە و دانی پێدا ناهێنن وەکو سیفەتی (ٱستوى) چونکە سیفەتی (ٱستوى) سیفەتێکی فیعلی الله تعالی یە -جل شئنە-، جا ڕەتی دەکەنەوە و دەیگۆڕن یان بە مەعنای (إستولى) تەئویلی دەکەن و لە شوێنی خۆی لای دەدەن، ئەوانە هیچیان ئەهلی سونە و جەماعە پێی ڕازی نین، یان قەدەریەکان هەندێک جار سیفەتی عیلم و زانستی الله تعالی دەربارەی شتەکان و ڕودانی شتەکان ڕەت دەکەنەوە دەڵێن هەر کەسێک بۆخۆی دەسەڵاتە لەسەر ئیش و کارەکان کە دەیکا نەک الله تعالی بۆی بێنێتە بون کەسەکان بۆخۆیان خاوەن و بکەری کار و کردەوەکانن بە حیسابی خۆیان لەبەر ئەوەی پاکایەتی الله تعالی ڕابگرن تەنزیهی الله لەوە بکەن بڵێن الله شەڕ دروست ناکا، بەڵام عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وا نیە بەڵکو لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە الله تعالی هەموو شتێک دەزانێ وە عیلم و زانستی پێی هەیە هەموو شتێکیش هەر ئەو بەدی دەهێنێ و دروستی دەکا تەنانەت خراپەکانیش وەکو مۆڵەت کە کەسەکە بۆخۆی هەڵی دەبژێرێ بۆ ئەوەی تاقیکردنەوە دروست ببێ ئەوەیە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە (والله أعلم بالصواب).

## جێگیر کردنی سیفەتی (الرزق والقوة والمتانة) لە قورئاندا:

وَقَوْلُهُ: ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ [الذاريات: ٥٨].

---

دوایی دێین ابن تیمیة لە درێژەی وتەکانی لە مەتنی (الواسطية) دەفەرموێ (وَقَوْلُهُ) واتە وتە و فەرمودەی الله تعالی ش کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ [الذاريات: ٥٨] الله تعالی بێگومان و بەڕاستی ڕۆزیدەرێکی خاوەن هێزێکی بەتینە، کەواتە لەو ئایەتەیەوە چیمان بۆ دەسەلمێندرێ؟ ناوە زۆر جوانەکەی الله تعالی کە ڕازقیەتە کە ڕۆزیدەرە الله تعالی لەوپەڕی تەواوی ڕزق و ڕۆزی هەموو بەندە و مرۆڤەکان و بەدیهێنراوەکانی خۆی دەدا وە الله تعالی خاوەنی قوەت و هێزێکی بەتینی سەدا سەدە -جل شئنە- ئەوەمان بۆ دەسەلمێندرێ.

کەواتە ئەو ئایەتە دەتوانین بڵێین سێ سیفەتی الله تعالی ی لە خۆوە گرتوە:

یەکەمیان ڕزق و ڕۆزیدانی بەردەوامی بەدوای یەکەوە بۆ مرۆڤ و بەندە و بەدیهێنراوەکانی.

دووەمیان سیفەتی قوەت و هێز بۆ الله تعالی.

سێیەمیان سیفەتی مەتانەت و بەتینی نەبڕاوەیی لەوپەڕی تەواوی هێزەکان بۆ الله تعالی.

کەواتە ئێمە لە سەرمانە بیروبڕوامان وابێ بە گوێرەی ئەو ئایەتە الله تعالی ڕۆزیدەرە ناوی ڕەزاقە وە سیفەتی ڕزقدانی لێ وەردەگیرێ ڕۆزیدەرە بۆ هەموو بەندە و مرۆڤەکان و ئەوانەی پێویستیان بە ڕزق و ڕۆزییە بەدوای یەکەوە وە هیچ شەریک و هاوبەشی نیە لەو ڕزق و ڕۆزییەی کە دەیدا وەکو بەخشیشێک دەیبەخشێ، داوای هیچ شتێک ناکا لە بەرامبەریدا بەڵکو تەنها داوای ئەوەیە ئێمەی لە پێناو ئەوە دروست کردوە عیبادەت و پەرستشی بکەین، ئەوەی عیبادەت و پەرستشیشی ناکا هەر ڕزق و ڕۆزی پێ دەدا ئەوە جۆرێکە لە ڕەحم و بەزەیی الله تعالی وە لە عەدالەت و دادوەریشی وە لە بەخشیشی خوایی -جل شئنە- کە دەیبەخشێ، وە لە پاشان بڕوامان هەبێ کە الله تعالی لەوپەڕی تەواوی بەهێزە هێز و توانایەکی لەبن نەهاتوی سەدا سەدی هەیە وە هیچ هێز و توانایەک ناتوانێ بەربەرەکانێی ئەو هێز و توانایەی الله تعالی بکا -جل شئنە-، وە مەتانەش زیاتر و کە دەڵێ مەتینە یەعنی دەسەڵات و هێزەکانی الله تعالی پتەوە و زۆر بەهێزە ئەوەش دەبێ جێگیر بکەین بەوەی کە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنە-.

**جێگیر کردنی سیفەتی (السمع والبصر) لە قورئاندا:**

وَقَوْلُهُ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١]، وَقَوْلُهُ: ﴿إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ [النساء: ٥٨].

---

دوایە لە درێژکردنەوەی قسەکانی ابن تیمیة دەفەرموێ و ئایەتێکی تر دەهێنێتەوە -رحمە الله- دەفەرموێ: (وَقَوْلُهُ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١]) وە

فەرمودەی خوییش کە دەفەرموێ ئەوە قاعیدە و بنەمایەکی سەرەکیە و ئەهلی سونە و جەماعە هەردەم لەسەر زمانیانە کاتێک دەربارەی ئەسماء و سیفاتی الله تعالی دەدوێن یان دەنوسن و توٚمار دەکەن ئەو ئایەتە دەڵێنەوە و چەندەها جار دەبێتەوە کە دەفەرموێ الله تعالی کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] الله تعالی هیچ شتێک لە زاتی لە سیفەتی لە ناوی وەکو الله نیە وە اللەش -جل شئنە- لە زاتی لە ناوە زوٚر جوانەکانی لە سیفاتە بەرزەکانی وەکو هیچ مەخلوق و بەدیهێنراو و کەس و شتێک نیە لەگەڵ ئەوەدا الله تعالی سەمیعیشە بیسەرە و بەصیریشە بینەرە.

کەواتە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ وەڵامە بوٚ ئەوانەی مومەثیلەنە و موشەبیهەنە کاتێ کە ناو و سیفەتە زوٚر بەرزەکانی الله تعالی دەچوێنن بە بەدیهێنراوەکان الله تعالی وەڵامی دانەوە کە الله تعالی لە زاتی لە ناوە زوٚر جوانەکانی لە سیفاتە بەرزەکانی بە هیچ کەس و شتێک ناچێ: ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ وەڵامە بوٚ موعەطیلەکان کە پەکی ناو و سیفەتە زوٚر بەرزەکانی الله تعالی دەخەن کەوا جێگیری کرد الله تعالی سەمیعە سیفەتی سەمعی لێ وەردەگیرێ ناوی سەمیعە و سیفەتی سەمعی لێ وەردەگیرێ بەصیرە و سیفەتی بەصەری لێ وەردەگیرێ.

لە پاشان هەر ابن تیمیة دەفەرموێ (وَقَوْلُهُ) الله تعالی فەرمویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ [النساء: ٥٨] ئەوەش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەبێ بڕوامان پێی هەبێ کە الله تعالی فەرمویەتی الله تعالی چاکترین ئاموٚژگاریکارە بوٚ ئێوە کە ئاموٚژگاریتان بکا لەگەڵ ئەوەدا بێگومان و بەڕاستی الله تعالی سەمیعە واتە بیسەرە سیفەتی سەمعی لێ وەردەگیرێ وە بەصیرە بینەرە الله تعالی -جل شئنە- سیفەتی بەصەری لێ وەردەگیرێ.

کەواتە ئەهلی سونە و جەماعە عەقیدەی وایە بیسەرایەتی الله تعالی دەبێ ئێمە جێگیری بکەین بوٚ الله تعالی، ئەو بەڵگانەش بوٚ ئەوەیە کە الله تعالی -جل شئنە- ناوە زوٚر

جوانەکەی سەمیعە سیفەتی سەمعی لێ وەردەگیرێ، ئەوەندە فراوانیشە بیسەری الله تعالی وەکو هی مەخلوق و بەدیهێنراوەکان نیە لەوپەڕی تەواوی و کەمالیەتە وردترین شت بە پستە پست بیکەی تەنانەت خوت خوتە و خەیاڵاتیش بێ ئەوەی لەناو دڵیشت بێ بە زمانیش دەرت نەبڕی بە دەنگێکی زۆر نزمیش بیکەی بە دەنگێکی زۆر گەورە بیکەی بە هەر لەهجە و لوغەت و زمانێک بێ لە هەر شوێن و جێگایەک بێ هی هەر مەخلوق و بەدیهێنراوێک بێ لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر هەموو بەدیهێنراوەکان لە یەک کاتدا بدوێن ئیلا الله تعالی دەیبیستێ بەبێ ئەوەی لێی تێک بچێ -جل شئنە- یان قسەیەک ببیستێ و ئەویتر نەبیستێ ئەوانە نیە بۆ الله تعالی هەموی لە یەک کاتدا لەوپەڕی تەواوی دەبیستێ وە سەدا سەد هی هەر هەموشیان بەبێ کەم و کورتی ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

کە دەڵێین بەصیریشە الله تعالی بە ورد ترین شت وە ناسکترین شت لە شوێنی تاریک بێ ڕوناک بێ لە هەر شوێنێک هەبێ الله تعالی بینەرە بە شتە نادیار و دیارەکان بە شتە ورد و درشتەکان لە هەر شوێن و جێگایەک هەبێ ئەو شتانە الله تعالی دەیان بینێ، وە هەندێک جاریش الله تعالی هەر شتی وردیشی باس کردوە یان پاڵپشتی خۆی نیشانداوە -جل شئنە- سەرخستنی خۆی بۆ هەندێک لە پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام) کە دەڵێ چونکە بیستن و بینین دوشتن هێزە توانایە بۆ الله تعالی سیفەتی کەمالیەت و تەواویەتە، وەکو دەفەرموێتە موسا پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هارونی برای (ﷺ) کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه: ٤٦] بڕۆنە لای فیرعەون لێشی مەترسێن من لەگەڵتان دام یەعنی پاڵپشتیتان دەکەم سەرتان دەخەم وە ڕاگرتان دەکەم هیدایەت و ڕێنوێنیتان دەکەم وە لە پاشان: ﴿أَسْمَعُ﴾ دەبیستم کە چی دەگوترێ و چی ناگوترێ بە وردییەوە هەموو شتەکان هیچ شتێک نیە بەدەربێ لە بیستنی من، ئینجا الله تعالی دەفەرموێ وە دەشبینم لەوێدا چی

دەگوزەرێ فیرعەون چی دەکا و چی لەگەڵ ئێوە دەکا وە ئێوە چی دەکەن و ئەنجام دەدەن لەوێ.

ئەوە ئەوەشی بۆ ئێمە لێ وەردەگیرێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ناوە زۆر جوانەکانی الله سیفەتە زۆر بەرزەکانی الله تعالی دەبێ ئاسەواریشی دیاربێ لەسەر ئێمە، ئاسەواری ئەوە دیاربێ کە الله دەفەرموێ سەمیعم ئێمە لێی بترسین هیچ قسەیەک نەکەین هەڵەبێ و کەم و کورت بێ تاوان بێ گوناح بێ چونکە الله تعالی دەیبیستێ بڵێین وەڵا کەس دیار نیە کەس ئاگای لێ نیە الله تعالی لە هەر شوێنێک بێ دەتبیستێ، هیچ شتێک نەکەین و ئەنجام نەدەین بڵێین کەس نامان بینێ و لە پەنهان و نادیارین خۆمان شاردبێتەوە چونکە الله تعالی هەموو شتێک دەبینێ ترسمان لێ بنیشێ.

ئینجا ئەگەر دۆستایەتی الله بەدەست بێنی و پشتی پێ ببەستی بەرامبەر هەر هێز و قوەتێکی دونیا ترست نەبێ بوەستەوە ڕاوەستە هەڵوێستت هەبێ بڕیارت هەبێ پشت بە الله ببەستە چونکە الله تعالی دەتبینێ و دەسەڵاتدارەکەش دەبینێ هێزەکەش دەبینێ، ئینجا ئەگەر لەگەڵتدابێ و پشتگیریت لێبکا الله تعالی توانایە بەهێزە بەسەر هەموو شتێک، وە لە پاشان الله تعالی عیلم و زانستی پێی هەیە دەبیستێ کەسەکە چی دەکا و چی دەڵێ زانیاری هەیە و زانستی هەیە بەناو دڵی کەسەکەش ئەوەی بۆ تۆ نایڵێ لەناو دڵ و مێشکی خۆی چ پیلانێکی هەیە زاڵم و ستەمکارەکە کەواتە دەشبینێ.

خۆشی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لەوەدایە کە بەناو و سیفەتەکان الله بناسین جورئەتمان زیاد دەکا وە تەقوامان زیاد دەکا لێی دەترسێین وە لێی نزیک دەبینەوە هەوڵدەدەین پاڵپشتی ئەو بەدەست بێنین، کەواتە کەسێکی بەعیزەتی ڕێک و پێکی بە دینی موتەقی دور بوەوە لە گوناح و تاوان و وە ئەنجام دەری خێر و چاکەکانمان لێ دەردەچێ.

## جێگیر کردنی سیفەتی (المشیئة والإرادة) لە قورئاندا:

وَقَوْلُهُ : ﴿وَلَوْلا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاء اللَّهُ لا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ﴾ [الكهف: ٣٩]، وَقَوْلُهُ: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلُواْ وَلَـكِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ [البقرة: ٢٥٣]، وَقَوْلُهُ: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ [المائدة: ١]، وَقَوْلُهُ: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء﴾ [الأنعام: ١٢٥].

---

ئەمجارە لە مەتنی (الواسطية)دا ابن تيمية -رحمه الله- باسی جێگیرکردنی سیفەتی مەشیئەت و ئیرادە ویستی الله تعالى دەکا ئەو ئایەتانەی بە بەڵگە بۆ دەهێنێتەوە و دەفەرموێ الله تعالى فەرمویەتی (وَقَوْلُهُ : ﴿وَلَوْلا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاء اللَّهُ لا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ﴾ [الكهف: ٣٩])، وە دەفەرموێ الله دوبارە فەرمویەتی (وَقَوْلُهُ: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلُواْ وَلَـكِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ [البقرة: ٢٥٣])، وە دوبارە الله فەرمویەتی: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ [المائدة: ١]، وە دوبارە الله فەرمویەتی (وَقَوْلُهُ: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء﴾ [الأنعام: ١٢٥]).

ئەو ئایەتانەی بە بەڵگە هێناوەتەوە دەربارەی مەشیئەت و ویست و ئیرادەی الله تعالى کە الله تعالى خاوەنی مەشیئەت و ئیرادە و ویستە لە هەر ئیش و کارێک کە بیەوێ بیکا (إذا شاء الله کان وإذا لم يشأ لم يكن) الله تعالى هەر شتێک بیەوێ بیکات دەبێ ئەوەی نەشیەوێ و ویستی لەگەڵدا نەبێ ئەو ئیشە نابێ، جا ئیرادەی الله تعالى -جل شئنە- لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دوو جۆری هەیە یان ئیرادەی کەونیە یان ئیرادەی شەرعیە دێین یەک بە یەک باسی لێوە دەکەین بەڵام با ئایەتەکان تەفسیر بکەین بە کورتی و پوختی.

یەکەمین جار الله تعالى لە سورەتی الكهف دەفەرموێ کاتێک ئەو دوو کەسە دەکەونە بەرامبەر یەک کەسێکیان بڕواداری هەژارە وە کەسەکەی تریشیان دەوڵەمەندی بێ بڕوایە، کە دەوڵەمەندە بێ بڕوایەکە دوو باخچەی گەورەی هەیە و پارە و پول و شتی زۆری هەیە و ماڵ و منداڵ و عەشیرەتی هەیە پێیوە مەغرور بوە، کەسە بڕوادارەکە لە ڕوبەڕویدا پێی دەڵێ: ﴿وَلَوْلا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ﴾ خۆزگا ئەگەر تۆ هاتبایە ناو باخچەکەت: ﴿قُلْتَ مَا شَاء اللَّهُ لا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ﴾ [الكهف: ٣٩] بتوگتیا ئەوەیە الله تعالى بە منی بەخشیوە و مەشیئەتی لەگەڵ بوە کە پێیداوم وە هیچ هێز و پشت و پەنایەک نیە جگە لە پشت و پەنای الله تعالى پشت بەو بەسترابا واتە هەموو هێز و هەموو ناز و هەموو نیعمەتێک و ئەو باخچەکەی تۆش هەر لە اللەوەیە -جل شئنە- ویستی ئەوی لەگەڵدا بوە ئەگەر ویستی ئەو نەبا نەدەبوو.

جا لە پاشان لە ئایەتەکەی دوەم دەڵێ لله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلُواْ﴾ ئەگەر الله بیویستبا یەکتریان نەدەکوشت و شەڕی یەکتریان نەدەکرد: ﴿وَلَـكِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ [البقرة: ٢٥٣] بەڵام الله تعالى ئەوەی بیەوێ ئەو دەبێ ئەوەی اللەش بیەوێ ڕوودەدات بە دڵنیایی و سەدا سەد.

وە لە پاشان لە ئایەتەکەی سێیەم الله تعالى فەرمویەتی: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُم إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ [المائدة: ١] الله تعالى دەفەرموێ ئەی گەلی بڕواداران بۆ ئێوەم حەڵاڵ کردوە واتە حەرام نیە و بۆتان حەڵاڵە ئەو ئاژەڵ و حەیوانانەی وەکو مەڕ و بزن و مانگا بۆ ئەوەی بیخۆن و سەری ببڕن و سود و کەڵکی لێ وەربگرن و بۆتان حەڵاڵە ئیلا ئەوەی بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوە بۆ ئەو کەسانەش کە لە ئیحرامدان ڕاویان بۆ حەڵاڵ نیە وە لە پاشان دەفەرموێ بەڕاستی و بێگومان الله تعالى ئەوە دەبێتە حوکمی و حوکم دەدا کە دەیەوێ و ئیرادەی لەگەڵە.

وە لە ئایەتی پێنجەم دەفەرموێ الله تعالى فەرمویەتی: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ﴾ هەریەک الله تعالى ویستی لەگەڵدابێ و بیەوێ هیدایەت و ڕێنوێنی بکا سینە و دڵ و دەرونی فراوان دەکا بۆ وەرگرتنی ئیسلام و تەسلیم بون بە الله تعالى واتە ڕێنوێنی دەکات: ﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾ [الأنعام: ١٢٥] هەر کەسێکیش الله تعالى هیدایەت و ڕێنوێنی نەکات بیەوێت گومڕای بکات ئەوە دڵی بۆ یەک دەهێنێتەوە و تەنگی دەکا هەروەکو کەسێک کە بەرزبێتەوە بەرەو ئاسمانەکان کاتێک توشی دڵ تەنگی دەبێ و پاڵەپەستۆی دەکەوێتە سەر.

ئەو ئایەتانە هەر هەموی ابن تیمیة -رحمه الله- بۆ ئەوەی هێناوەتەوە بیسەلمێنێ و جێگیری بکا لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی الله تعالى خاوەنی مەشیئەت و ئیرادەیە، هەر شتێک مەشیئەت و ئیرادەی الله تعالى ی لەگەڵدابێ ئەو کار و ئیشە دەبێ هەر شتێک مەشیئەت و ئیرادەی الله تعالى ی لەگەڵدا نەبێ مەحاڵە ئەو ئیشە ڕوبدا و ببێ، ئەو ئیشە ئەگەر خراپ بێ یان باش بێ ئەو ئیشە چاک بێ یان خراپ بێ ئیلا دەبێ مەشیئە و ئیرادەی الله تعالى ی لەگەڵدابێ، چونکە لە باسی قەدەریش دێینە سەری قەدەر چوار خاڵی تێدایە:

یەکەمیان عیلمی الله تعالى دەوری هەموو شتێکی داوە لە ئەزەل و ئەوەلەوە.

دوەم الله تعالى ئەو عیلم و زانست و زانیاریەی نوسیوەتەوە لە (اللوح المحفوظ).

سێیەم ئیرادە و مەشیئەی الله تعالى لەگەڵ هەر شتێکدابێ دەبێ لەگەڵ هەر شتێکدا نەبێ ئەو ئیشە ڕوو نادا و نابێ.

ئینجا چوارەمیان ئیجاد و هێنانە کایەوەی شت و مەخلوق و بەدیهێنراوەکانە ئەگەر الله تعالى دروستی نەکا و نەیهێنێتە کایەوە کار و ئیشەکە خراپ بێ یان باش بێ ئیلا ئەو ئیشە بون و وجودی نابێ.

جا ئیرادە و مەشیئەی الله تعالی چەند تێبینی و خاڵێک هەیە دەبێ لەسەری بڕۆین و بدوێین و ڕونی بکەینەوە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕونبێ، ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئیرادەی الله تعالی دابەشە بۆ دوو جۆر: (یەکەمیان ئیرادەی کەونی و قەدەری، دوەمیان ئیرادەی شەرعی).

ئیرادەی کەونی و قەدەری فراوانە هەموو شتێک لە خۆوە دەگرێ لە باش و لە خراپەوە، واتە هێنانە کایەوەی شتەکان ئەگەر ویستی الله تعالی ی لەگەڵدا نەبێ ئەو ئیشانە نابێ ئەوە ئیرادەی کەونییە، تەنانەت کوفری کافرانیش ئەگەر ئیرادەی الله تعالی ی لەگەڵدا نەبێ ئیرادەی قەدری و کەونیەکەی نابێ، لەبەر چی ئیرادەی کەونی و قەدەری اللەشی لەگەڵدا دەبێ؟ تا ئیشەکە ڕوبدا و تاقیکردنەوەکە دروست ببێ ئەگەرنا ئیشەکە ڕونادا و نابێ بەبێ ئیرادە و مەشیئە و ویستی الله تعالی.

کەواتە ئیرادەی کەونی قەدەری زۆر فراوانترە لە ئیرادەی شەرعی وە عام و گشتی ترە کاتێک ئیمانی ئیمان دارنیش دەگرێتەوە وە کوفری کافرانیش دەگرێتەوە، وە ویستی الله تعالی لەوەشدایە کە کافران ئیمان بێنن ئەوەی دەوێت الله تعالی لێیانی داوایە بەڵام ئەوان بە دەستی خۆیان کە ئیمان هەڵنابژێرن و کوفر هەڵدەبژێرن الله تعالی مەشیئەت و ویستی لەگەڵ ئەوەدا دەبێ بۆیان بێنێتە کایەوە و کوفرەکەیان بۆ ڕوبدا تاوەکو تاقی بکرێنەوە.

ئیرادەی شەرعیش بریتیە لەوەی کارە خەیر و چاکەکان کارە شەرعیەکان کە الله پێی ڕازییە -جل شئنە- ئەو بەرتەسکترە لە ئیرادەی کەونی و قەدەری، هەموو ئیشێکی خەیر و چاکە الله تعالی ئیرادەی کەونیشی لەگەڵدایە کە دروستی دەکا و دەیهێنێتە کایەوە وە ئیرادەی شەرعیشی لەگەڵدایە بە مەعنای ئەوەی پێی ڕازییە الله تعالی -جل شئنە- وە پاداشتی ئەو کەسانەش دەداتەوە کە لێیان دێتەجێ و یان دەیهێننەجێ.

جا الله تعالی -جل شئنە- لە قورئانی پیرۆز بەڵگەی بۆ هەردوکیان هێناوەتەوە ئەهلی سونە و جەماعە لە خۆڕا نیە کاتێک دەڵێن ئەو دوو ئیرادانە بونی هەیە.

بۆ هی یەكەمیان ئیرادەی كەونی الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ [التكویر: ٢٩] هیچ شتێک نیە ئێوە ویستی بكەن و مەبەستان بێ ئیلا ئەوە دەبێ كە الله تعالی ویستی لەگەڵدایە و ئیرادە و مەشیئەی كەونی لەگەڵدایە چونكە الله پەروەردگاری جیهانیانە -جل شئنە-.

وە ئیرادەی شەرعیش خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ﴾ [النساء ٢٧] الله تعالی دەیهەوێ ویستی لەگەڵ ئەوەدایە كە لێتان خۆش ببێ و وە تەوبەتان وەربگرێ و قبوڵ بكا چونكە ئەوە ئیرادە شەرعیەكەیە كە الله تعالی تەوبەی خۆشدەوێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ [البقرة ٢٢٢].

جا خاڵێكی تر لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە سەبارەت بە ئیرادە و مەشیئەی الله تعالی ئەوەیە ئێمەی بەندە عیلم و زانستیمان نیە الله تعالی چ ویست و مەشیئە و ئیرادەیەكی كردوە و هەیە لە (اللوح المحفوظ) چی نوسراوەتەوە عیلم و زانستی پێ هەبوە، تەنانەت بۆ خۆشمان كە ئیش و كارەكان دێتە پێشمان هەتا ڕوو نەدا ئێمە نازانین ئەو ئیش و كارە چیە و چۆن دەبێ؟ لەبەر ئەوە نابێ ئێمە وەكو قەدەریەكان ئەوە بكەینە بیانوو بڵێین شتەكە لەسەرمان نوسراوە الله تعالی عیلمی پێ هەبوە لە (اللوح المحفوظ) تۆمار كراوە وە ئیرادە و مەشیئەی لەگەڵ هەر شتێكدا هەبێ ئەو دەبێ.

كەواتە نابێ خۆمان بەردەینەوە و بڵێین ئێمە ئەو ئیشە كە بوە و نوسراوە و لە (اللوح المحفوظ) هەر بەسەرمان دێ چونكە تۆ ئیرادەی اللەت لێ دیار نیە -جل شئنە- هەتاوەكو نەهێتە كایەوە و نەیبینی بەچاو، ئێمە نەمان دەزانی دوێنێ كە ئەمرۆ لەو كاتژمێرە لێرەدا كۆ دەبینەوە وە لە پاشان ئەو دەرس و وانە دەخوێنین و بۆمان دەكرێ، ئەگەر گومانمان دەبرد ئەگەر ڕێ و شوێنمان بۆ گرتبوەبەر بەڵام نەمان دەزانی دێتە جێ ڕێک دەكەوێ سەدا سەد یانە نا بەڵام خوای رب العالمین دەیزانی -جل شئنە- لە (اللوح المحفوظ)یش نوسیبوی ئیرادە و مەشیئە و ویستیشی لەگەڵدا بوو كە ئیشەكە هاتەجێ ئینجا بۆ ئێمە دەردەكەوێ

کە ئەوە ئیرادەی الله تعالی لەگەڵ ئەوەدا بوە، لەبەر ئەوە نابێ بیکەینە بیانوو خۆمانی لێ بەردەینەوە بڵێین ئەو ئیشە ناکەین یان دەیکەین چونکە ئیرادەی الله تعالی نازانین چۆنە هەتا نەیەتەجێ و هەتا نەکەوێتە بەر چاوانمان و نەبێتە واقیع و ڕوو نەدا، لەبەر ئەوەیە دەبێ هەردەم خۆمان هانبدەین ڕێگا باشەکان بگرینەبەر نیەتمان باش بکەین گومانی باش بە الله تعالی ببەین -جل شئنە- بەرەو خەیر بچین ئینجا ئەو کاتە هەر شتێک بێتە پێش ئەوە ئیرادە و مەشیئەی اللەی لەگەڵدا بوە.

لە پاشان نابێ ئێمە پێمان وابێ الله تعالی کاتێک ئیرادەی کوفری کردوە لە کافرێک یان ئیرادەی گومڕایی کردوە لە کەسێک کە هیدایەت و ڕێنوێنی نەبوە یان گوناح و تاوانێک کە بەندەیەکی الله تعالی ئەنجامی دەدا ئیرادە و مەشیئەی الله تعالی شی لەگەڵە بەو مانایەی کە مۆڵەتی دەدا بەو مانایەی کە بۆی دەهێنێتە کایەوە ئیرادە و مەشیئەی لەگەڵدا دەبێ، ئەوانە تەنها لەپێناو تاقیکردنەوەیە زوڵم و ستەم نیە الله تعالی چ لە کافرەکەی کردبێ چ لە گومڕاکەی کردبێ چ لە گوناح کارەکەی کردبێ یان بە زۆر بەسەریدا سەپاندبێ بەڵکو بێدینان و بێ بڕوایان ئەوانەی لە گوماندان لە بیروبڕوادا ئەو بابەتە شتانە دەوروژێنن ئەگەرنا الله تعالی -جل شئنە- وەکو گوتمان لە مەڕاتیبەکانی قەدەری الله تعالی کە دەگەینە سەری بە درێژتریش باسی دەکەین الله تعالی عیلم و زانستی و زانیاری هەیە بە هەموو شتێک و عیلم و زانستی و زانیاریەکەی دەوری شتەکانی داوە، وە لە پاشان لە (اللوح المحفوظ) نوسیویەتی ئینجا بە مەعنای ئەوە دێ کافرێک کە کافر دەبێ الله تعالی عیلمی پێ هەیە لە ئەوەل و ئەزەل ئەبو جەهل کافرە بێ بڕوایە چەند پێغەمبەر (ﷺ) دەعوەشی لەگەڵ بکا ڕێنوێنیشی بکا حوجە و بەڵگەشی بۆ بێنێتەوە لەسەریشی بکا ئیلا نابێتە موسڵمان الله ئەو عیلمەی هەبوە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) لە (اللوح المحفوظ)یش نوسیویەتیەوە لەبەر ئەوە الله تعالی ئیرادە و مەشیئەشی لەگەڵ ئەوەدا بوە کە ئەبو جەهل کافربێ و کوفری لێ بێتەجێ و بەردەوام بێ لەسەر کوفرەکەی ئەوە نەبێ

الله بە زۆر لەسەر ئەبو جەهل ئەوەی دانابێ بەڵام عیلمی پێ هەبوە الله تعالى لە ئەوەل و ئەزەلەوە كە ئەبو جەهل بۆخۆی عینادە كوفری عیناد دەیگرێ وە بۆخۆی موتەكەبیرە و خۆی بە زل دەزانێ كوفری تەكەبور دەیگرێ پشت دەبەستێت بە بت و سەنەمەكان و هەوا و نەفسی خۆی دەپەرستێ و واز دەهێنێت لە ڕێگای الله تعالى و دژایەتی پێغەمبەر دەكا و (ﷺ) نابێتە بڕوادار، ئینجا لەبەر ئەوە الله تعالى ئیرادە و مەشیئەی لەگەڵ كوفرەكەی ئەودا دەبێ ئیرادەی كەونی و قەدەری وە بۆی دەهێنێتە كایەوە، كاتێک خۆی ئەبو جەهل دەیەوێ كافر ببێ و بەردەوام بێ لەسەر كوفرەكەی لەبەر ئەوە ڕێنوێنی ناكا الله تعالى ڕێنوینیە تەوفیقیەكە چونكە شایستە نیە ئەبو جەهل وە موسیرە و وە عینادە لەسەر كوفرەكەی و خۆی بە زل دەزانێ و ئینجا تا مردنیشی هەر لەسەر ئەو كوفرە دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێ.

### جێگیر كردنی سیفەتی (المحبة والمودة) لە قورئاندا:

وَقوْلـهُ: ﴿وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ [البقرة: ١٩٥]، ﴿وَأَقْسِطُوا إِنّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ [الحجرات: ٩]، ﴿فَمَا اسْتَقَامُواْ لَكُمْ فَاسْتَقِيمُواْ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ [التوبة: ٧]، ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ [البقرة: ٢٢٢]، وَقوْلُهُ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ [آل عمران: ٣١]، وَقوْلُهُ: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ [المائدة: ٥٤]، وَقوْلُهُ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾ [الصف: ٤]، وَقوْلُهُ: ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ﴾ [البروج: ١٤].

---

جا دێینە سەر سیفەتێكی تر لەو سیفەتانەی الله تعالى كە ابن تيمية -رحمه الله- لە مەتنی (الواسطية) چەند ئایەتێكی بۆ تۆمار كردوە دەفەرموێ الله تعالى فەرمویەتی (وَقوْلـهُ : ﴿وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ [البقرة: ١٩٥]) لێرەدا سیفەتی حوب وە مەحەبە بۆ الله تعالى بەو ئایەتە و چەند ئایەتێكی تر ابن تيمية جێگیری دەكا، وە لە

سوڕەتێکی تر الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسِطُوا إِنّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ [الحجرات: ٩]، وە لە پاشان لە سوڕەتێکی تر الله تعالی دەفەرموێ: ﴿فَمَا اسْتَقَامُواْ لَكُمْ فَاسْتَقِيمُواْ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ [التوبة: ٧]. وە لە سوڕەتێکی تر دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ [البقرة: ٢٢٢]، وە لە سوڕەتێکی تر الله تعالی فەرمویەتی: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ [آل عمران: ٣١]، وە لە سوڕەتێکی تر الله تعالی فەرمویەتی﴾: فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ [المائدة: ٥٤]، وە لە سوڕەتێکی تر الله تعالی فەرمویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾ [الصف: ٤]، وە لە سوڕەتێکی تر الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ﴾ [البروج: ١٤].

ئەو ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی الله تعالی خاوەنی سیفەتی حوب و مەحەبەیە، ئەو حوب و مەحەبەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بە حەقیقی و واتای دروستی خۆی هاتوە و وەردەگیرێ نەک وەکو تاقم و کۆمەڵەکانی تر نەفی بکرێ لە الله تعالی وەکو جەهمیەکان و موعتەزیلەکان، یان ئەوەیە تەئویل بکرێ بە مەعنای تەئویلێکی تەحریفی و ماناکەی بگۆڕدرێ کە باسی لێوە دەکەین، با سەرەتا ئایەتەکان تەفسیر بکەین بە کورتی و پوختی.

الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ [البقرة: ١٩٥] چاکەکاربن و چاکە ئەنجام بدەن چونکە بەڕاستی و بێگومان الله تعالی چاکەکارانی خۆش دەوێ.

وە لە پاشان دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسِطُوا إِنّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ [الحجرات: ٩] دادوەربن و عەدالەت بکەن چونکە الله تعالی دادوەر و عەدالەتانی خۆش دەوێ ئەوانەی دادوەریەکی تەواوی سەدا سەد دەکەن.

وە لە پاشان الله تعالی فەرمویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ [البقرة: ٢٢٢] بەڕاستی و بێگومان الله تعالی تەوبەکارانی خۆش دەوێ وە ئەوانەی خۆیان پاک

دەکەنەوە لە گوناح و تاوان دڵ و دەرونیان وە لاشە و جەستەشیان دەستنوێژی دەگرن بە هەمان شێوە الله تعالى هەردوو جۆرەکەی خەڵکەکە کە خۆیان پاک دەکەنەوە بە هەردوو جۆرەکەی خۆ پاککردنەوە خۆشی دەوێن.

وە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ [آل عمران: ٣١] پێیان بڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەگەر ئەوان الله تعالى یان خۆش دەوێ با شوێنت بکەون ئەوە نیشانەی خۆشویستنی الله تعالى یە الله تعالى یش ئەوانی خۆش دەوێ.

وە دەفەرموێ: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ [المائدة: ٥٤] ئەگەر ئەوان دین و ئاین بگۆڕن و لە ڕێبازی الله لابدەن الله تعالى خەڵکانێکی تر دەهێنێت کە اللەیان خۆشبوێ و اللەش ئەوانی خۆشبوێ -جل شئنە- دەیانگۆڕێ.

لە ئایەتەکەی تر الله تعالى فەرموی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾ [الصف: ٤] بەڕاستی و بێگومان الله تعالى ئەوانەی خۆش دەوێ کە دەجەنگن و کوشتار دەکەن لەپێناو الله تعالى وەکو یەک ڕیز ڕادەوەستن کە پتەون کەلێنیان نیە پشتی یەک دەگرن هەروەکو چۆن بینایەکی دامەزراو کەلێنی نەبێ و داڕژابێ وەکو قاڵبێک ئاوان قاڵبێک کە بڵێین لە مادەی ڕەساس داڕژابێ بە مەعنای کەلێنی نەبێ و کونی نەبێ و مەنفەزی نەبێ و تەواو یەک پارچە حیساب بێ.

وە لە پاشان الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ﴾ [البروج: ١٤] الله تعالى غەفورە لێبوردەیە وە وەدودە ودیش لە زمانی عەرەبیدا خۆشەویستیەکی ساغ و سافە جۆرێکە لە خۆشەویستی یانی الله تعالى خاوەنی ود و خۆشەویستیشە.

کەواتە لەو ئایەتانە دەرکەوت الله تعالى هەم مەحەبەی هەیە خاوەنی سیفەتی حوبە وە هەم مەوەدەی هەیە خاوەنی سیفەتی ودە.

جا ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە دەسەلمێنن بۆ الله تعالى -جل شئنە- کە دەڵێین سەدا سەد الله تعالى کە دەڵێ حوبم هەیە مەعنای حوبێکی حەقیقیە و تەواوە نەک وەکو خەڵکانێک

کە دەڵێن چۆن دەشێ و دەگونجێ لە تیرە و تاقمەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە الله تعالی حوبی هەبێ یان بوغزی هەبێ چونکە دەڵێن ئەوە شتێکی عاطفیە ئینسان لە دڵەوە دەست پێدەکا و غەریزەیەکە و چۆن دەبێ الله تعالی خاوەنی ئەو شتانەبێ؟ بەڵام وەکو گوتمان ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون الله تعالی خاوەنی مەحەبەت و حوبێکە یان ودێکە کە لەخۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- جیاوازە لەگەڵ حوب و بوغز و ودی مرۆڤ و بەدیهێنراوەکان وە لەبەر ئەوە تاقم و کۆمەڵەکانی تر تێکەوتون لێرەش چونکە قیاسی دەکەن بەسەر هی بەندەکان بەسەر هی بەدیهێنراوەکان، دەڵێن چۆن دەشێ و دەگونجێ الله تعالی خاوەنی ئەو بابەتە حوبەبێ؟

جا الله تعالی -جل شئنە- کە فەرمویەتی و دەفەرموێ لەو ئایەتانە لە هەندێکیش بەڵکو ئەوە ڕەتدەکاتەوە هەندێک شتی خۆشبوێ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ [القصص ٧٧] یانی لەپاڵ ئەوەی کە الله تعالی سیفەتی حوب بۆخۆی جێگیر دەکا ئەوەش جێگیر دەکا هەندێک جار پێچەوانەی حوب هەندێک شت هەیە خۆشی ناوێ کە خۆشی ناوێ واتە ڕقی لێ دەبێتەوە الله تعالی، یان الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ﴾ [البقرة ٢٠٥] الله تعالی شتی خراپ و پوچی خۆش ناوێ، یان: ﴿وَلَـٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ﴾ [التوبة ٤٦-٤٧] الله تعالی هەندێک جار سیفەتی کەرِه یانی دەکەرِهێنێ شتەکە و ڕەتی دەکاتەوە و پێی چاک نیە.

جا کەواتە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون الله تعالی سیفەتی حوب و ودی هەیە وە هی بوغزی هەیە -جل شئنە- وە بە واتا حەقیقی و ڕاستیەکەی کە لەخۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە-، جا زۆر جاران لەوە تێ دەکەون تیرە و تاقمەکانی تر وەکو گوتمان ڕەتی دەکەنەوە جێگیری ناکەن بۆ الله تعالی بۆ نمونە موعتەزیلەکان سیفەتی حوب یان ود یان بوغز بۆ الله تعالی هەر ڕەت دەکەنەوە و یەکی دەخەن جەهمیەکانیش بە هەمان شێوە موعتەزیلەکان و جەهمیەکان دەڵێن ئەو سیفەتە لە الله ناوەشێتەوە وەکو زۆربەی

سیفەتەکانی تریش واتاکەی نەک حەقیقی هیچ واتایەکی لێک نادەنەوە و بۆ الله تعالی بڕیاری نادەن، وە ئەشعەریەکان دەڵێن ناشێ و ناگونجێ الله تعالی خاوەنی حوببێ بە مانایە حەقیقی و دروستیەکەی ئیلا مانایەکی تری بۆ دەڵێن، دەڵێن چونکە مانا حەقیقیەکەی حوب بەو مانایە دێ: (ميل النفس إلى المحبوب بسبب رقة تحصل فيه) دەڵێن ئەوەیە کە مەیلی دەرونی بەندەکان و مرۆڤەکان و کەسەکانە بۆلای ئەو کەس و شتەی کە خۆشی دەوێ دەچێ بەهۆی ئەوەی دڵی بۆ دێتەوە و دڵی ناسک دەبێ بۆی کە نەوعێک لە ڕقە و سۆز و عەطف دروست دەبێ لە دڵیەوە، دەڵێن ئەوەش سیفەتی نەقسە چۆن دەگونجێ بۆ الله تعالی ی بڕیار بدەین؟ دەبێ الله تعالی پاک و بێگەردبێ لەوە و لەبەر ئەوە جێگیری ناکەین، ئەی چی جێگیر دەکەن؟ ئەشعەریەکان دەڵێن حوبی الله و مەحەبەتی الله تعالی (إرادة الإنعام) دەڵێن ویستی اللهیە بۆ ئەوەی کە چەند بەخشیشێک بکات و نیعمەت بکات لەگەڵ ئەو کەسەی کە خۆشی دەوێ نەک بڵێین حوبی بۆی هەیە بە حوبێکی حەقیقی، وە غەزەب و بوغزیش دەڵێن (إرادة الإنتقام) دەڵێن ئەویش مەبەست لێی ئەوەیە کە الله تعالی دەیەوێ تۆڵە بستێنێتەوە لە بەرامبەرەکەی نابێ بڵێین الله تعالی بوغزی حەقیقی هەیە یان غەزەبی حەقیقی هەیە.

جا لێرەدا پرسیار دەکەن ئەهلی سونە و جەماعە لە ئەشعەریەکان دەڵێن باشە ئێوە ئیرادە و مەشیئە بۆ الله تعالی جێگیر دەکەن ئەویش دوو سیفەتی الله تعالی یە -جل شئنە- لە قورئاندا هاتوە لە فەرمودەی پێغەمبەر هاتوە (ﷺ) ەبەر ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن ئەشعەریەکان لە هەندێک شوێن و جێگادا هەر قسەکانی خۆیان تێک گیر دەبێ بەوە دەیان گرن ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن بۆچی لە ئیرادە ئیرادەیش هەر پێناسەکەی ئەوەیە (ميل النفس لجلب محبوب أو دفع مكروه) ئەویش بە مانای ئەوە دێ مەیلی دەرون و نەفسە بۆ بەندە و مرۆڤەکان بۆ ئەوەی کە شتێکی باش بێننە کایەوە بۆ خۆشەویستەکەیان وە شتێکی خراپ و پێناخۆش ڕەت بکەنەوە لەسەریان، بۆ ئیرادە جێگیر دەکەن و ئەو

مانایەشی هەیە؟ بۆچی حوب جێگیر ناکەن وەکو ئیرادە بڵێن بەو نەوعەی کە لە الله دەوەشێتەوە؟ وەکو ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن لە الله دەوەشێتەوە و (كما يليق بجلاله وذاته سبحانه وتعالى)، ئینجا ئەشعەریەکان دیارە وەڵامیان نابێ، لەبەر ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن ئێوە قسەکانتان تێک گیرە لەلایەک ئیرادە جێگیر دەکەن بۆ الله و هەر ئەو مانایەشی هەیە مەیلی نەفسە بۆ بەندەکان بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن ئێمە ئیرادە ناڵێین مەیلی نەفسە بۆ الله تعالى یش وە ناشڵێین ئەویش نیە دەڵێین بە مەعنایە حەقیقیەکەی خۆیەتی و لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- ئیرادەی الله، هی مرۆڤ و بەندەکانیش لە خۆیان دەوەشێتەوە کەم و کورتی تێدایە هی الله تعالى لەوپەڕی تەواوی و کەمالیەتە، جا حوبیش هەر وایە ودیش هەر وایە لە سیفەتەکانی الله تعالى ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون وا جێگیری دەکەین بوغز و غەزەبیش هەر وایە، جا ئەشعەریەکان لێرەدا قسەیان پێ نامێنێ بەرامبەر بە ئەهلی سونە و جەماعە.

**جێگیر کردنی سیفەتی (الرحمة) لە قورئاندا:**

وَقَوْلُهُ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ [الفاتحة: ١]، ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾ [غافر: ٧]، ﴿وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ [الأحزاب: ٤٣]، ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ [الأعراف: ١٥٦]، ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ [الأنعام: ٥٤]، ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ [يونس: ١٠٧]، ﴿فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ [يوسف: ٦٤].

---

ئەمجارە ابن تيمية لە مەتنەکەیدا بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی ڕەحمەت بۆ الله تعالى -جل شئنه- بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە الله تعالى خاوەنی ڕەحم و بەزەییە ڕەحمەتی هەیە جا ڕەحم و بەزەیی الله تعالى یش حەقیقەتی هەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بە شێوازێک کە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

لە سەرەتای سورەتی (الفاتحة) الله تعالی دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ [الفاتحة: ١] چونکە زانایان بە یەکدەنگی بۆچونیان وایە: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ ئایەتێکە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئینجا یان ئایەتێکە لە سورەتی (الفاتحة) یان ئایەتێکی سەربەخۆیە پەیوەندی بە سورەتی (الفاتحة)وە نیە لە سەرەتای قورئان و سەرەتای سورەتەکانی تر هاتوە: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ یانی بەناوی اللەی ڕەحمان و ڕەحیم، ڕەحمان کەواتە ناوێکە لە ناوەکانی الله وە دەشتوانین بڵێین سیفەتێکیشە لە سیفەتەکانی الله چونکە هەموو ناوێکی الله تعالی دەبێ لایەنی کەم سیفەتێکی لێ وەربگیرێ، لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ناو عەلەم نیە بۆ الله تعالی بە ڕوتی وەکو مرۆڤەکان هەندێک جار ناویان هەیە بەبێ ئەوەی سیفەتەکەیان لێ بێتەجێ و مانای سیفەتەکەی لێ وەربگیرێ بەڵام هی الله تعالی هەر ناوێک لە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی لایەنی کەم دەبێ سیفەتێک لەخۆوە بگرێ کە ئەو ناوە لەسەری بەڵگەبێ (الرحمن) سیفەتی ڕەحمەت دەگەیەنێ بۆ الله تعالی، کەواتە بە ناوی ئەو اللەیەی کە ڕەحمانە خاوەن سیفەتێکی ڕەحمەتێکی فراوانە، لەبەر ئەوەی (الرحمن) لەسەر وەزنی فەعلانە، فەعلان لە زمانی عەرەبی سیغەیەکە زیادەیی تێدایە بەسەر سیغەکانی تر چونکە حەرف و پیتی تێدا زیاد کراوە فەعلان بە مەعنای تەوسیعە و فراوانی دێ، جا کەواتە کە دەڵێین (الرحمن) لەسەر وەزنی فەعلانە بە مەعنای (واسع الرحمة) دێ الله تعالی خاوەنی ڕەحمێکی یەکجار فراوانە ڕەحمەکەی هەموو شتێک دەگرێتەوە، وە هەندێک لە زانایان دەفەرمون خاوەنی ڕەحمێکی فراوانە هەموو شتێک دەگرێتەوە لە دونیادا تایبەتە بە دونیا، وە (الرحیم)یش لەسەر وەزنی فەعیلە سیفەتی ڕەحمەتی لێ وەردەگیرێ بۆ الله تعالی بە مەعنای فاعیلە، کەواتە الله تعالی ڕەحمی خۆی دەتوانێ بگەیەنێ، وە هەندێکیش لە زانایان دەفەرمون (الرحمن) تایبەتە بە دونیا (الرحیم)یش دەڵێن تایبەتە بە بڕواداران وە بە ڕۆژی دوایی، زاناکانی تری ئەهلی سونە و جەماعەش دەفەرمون (الرحمن الرحیم) ئەو

تایبەتیایەتیان نیە هەم بە دونیا و هەم بە قیامەت هەردوکیان بۆ دونیا و قیامەتە، (الرحمن) لەسەر وەزنی فەعلان بە مەعنای (واسع الرحمة)یە فراوانە ڕەحمەکەی، وە (الرحیم)ی‌ش لەسەر وەزنی فەعیلە بە مەعنای فاعیلە کە ڕەحمەکەی دەتوانێ بگەیەنێ بۆ هەر کەسێک و لە هەر شوێن و جێگایەک بێ.

وە لە پاشان اللە تعالی لە ئایەتەکەی دووەم فەرمویەتی: ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾ [غافر: ٧] پەروەردگارمان ڕەحم و عیلم و زانستیەکەی تۆ فراوانە هەموو شتێکی گرتوەتەوە، ئەوەش سیفەتی ڕەحم و عیلمی بۆ اللە تعالی جێگیر کردوە لەو ئایەتە.

وە لە [الأحزاب: ٤٣] فەرمویەتی: ﴿وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ اللە تعالی ڕەحم و بەزەیی بوە بە بڕواداران.

وە لە [الأعراف: ١٥٦] اللە فەرمویەتی: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ ڕەحم و بەزەییەکەی من فراوانە و هەموو شتێکی گرتوەتەوە.

وە لە [الأنعام: ٥٤] فەرمویەتی: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ اللە تعالی لەسەر خۆی ڕەحم و بەزەیی تۆمار کردوە و داناوە بە واتای خاوەنی ڕەحم و بەزەییە.

وە لە [یونس: ١٠٧] دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ اللە تعالی خاوەنی سیفەتی لێبوردنە لێبوردەیە وە ڕەحیمیشە بەزەییە و بەزەیی هەیە.

یان کە یەعقوب پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە یوسفی کوڕی (ﷺ) کە لێی ون بوو هەواڵیان بۆ هێنایەوە فەرموی: ﴿فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ [یوسف: ٦٤] اللە تعالی لە هەموو پارێزەران پارێزەرترە وە هەر اللە تعالی لە هەموو بەزەیی بەخشان بەزەیی ترە بە مەعنای خاوەنی سیفەتی ڕەحم و بەزەییە اللە تعالی لەوپەڕی ڕەحم و بەزەیی.

جا ئەهلی سونە و جەماعە بەو ئایەتانە دەیسەلمێنن وەکو ابن تیمیة هێناویەتیەوە -رحمە اللە- کە اللە تعالی خاوەنی سیفەتی ڕەحمەتە ڕەحمەتێکی بە مەعنای حەقیقی و ڕاست و دروستی کە لەخۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- بڕیاری بۆ دەدەن دەفەرمون تەنانەت

پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرمودەی سەحیحدا فەرمویەتی: «ارْحَمُوا مَنْ فِي الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ[١]» ئێوە بەزەیی بنوێنن و بکەن بەرامبەر بەوانەی لەسەر زەوی هەن الله تعالى ی ئاسمانیشەوە ڕەحم و بەزەیتان پێدەکا، واتە هەم سیفەتی علو لەو حەدیسە بۆ الله تعالى جێگیر کراوە کە الله تعالى لەسەر عەرشە -جل شئنه- (کما یلیق بجلاله) وە هەم سیفەتی ڕەحمەت و بەزەیش بۆ الله تعالى لەو فەرمودە جێگیر کراوە.

یان پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «مَن لا يَرْحَمُ لا يُرْحَمُ[٢]» هەریەکێک سۆز و بەزەیی نەبێ الله تعالى یش بەزەیی و ڕەحمی پێ ناکا، دیارە الله تعالى خاوەنی سیفەتی ڕەحمەتە لەبەر ئەوە پێغەمبەر وای فەرموە (ﷺ).

فەرمودەکان زۆرن وە بەڵگە ئایەتیەکانیش زۆرن بەڵام الله تعالى -جل شئنه- خاوەن ڕەحمە ڕەحم و بەزەیی الله تعالى یش بەوەوە دیارە کە ڕزق و ڕۆزی بەندەکانی دەدا تەنانەت لە دونیا ڕزق و ڕۆزی دوژمنانی خۆشی دەدا هی کافر و بێ بڕوایانیش دەدا دەیانژێنێ دەیانمرێنێ شەویان بەسەردا دەهێنێ ڕۆژیان لێ هەڵدەکا ئەوانە هەر هەموی ڕەحم و بەزەیی الله تعالى یە -جل شئنه- دەیکا وە فەزڵ و بەخششی خوای رب العالمین ە -جل شئنه-، بەڵام ئێمە لەو وەسف و سیفەتانەی الله تعالى دەبێ ئاثەوار و شوێنەوارەکەی لەخۆمان بێنینەجێ، بەڵام ئاثەوار و شوێنەوارێک هەیە کە زۆرجار هەیە بەندەکان شەیتان فێڵیان لێ دەکا دەڵێن پەکی خۆیان دەخەن یان تەمبەڵی لێ دەکەن دەڵێن الله بە ڕەحمە زۆر تەماشای فراوانی ڕەحمی الله دەکەن زۆرجار توشی تاوان و گوناح دەبن و کەمتەر خەم دەبن لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی الله و پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیان هەڵەیە، دەبێ لە بەرامبەر ئەوەی کە الله تعالى ڕەحم و بەزەییەکەی فراوانە وا تێدەگەی و حاڵی دەبی بیشزانی الله تعالى (ذُو ٱنتِقَام)ە تۆڵە سێنیشە وە الله تعالى -جل شئنه- غەزەبیشی هەیە

[١] سنن الترمذي (١٩٢٤)، سنن أبي داود (٤٩٤١)، مسند أحمد (٦٤٩٤) (٦٥٢٤) (٦٨١٧).
[٢] صحيح البخاري (٥٩٩٧)، صحيح مسلم (٢٣١٨)، سنن أبي داود (٥٢١٨).

وە الله تعالى -جل شئنه- تۆڵە دەسێنێتەوە لەو کەسانەی کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن، جا لەبەر ئەوە نابێ ئێمە بەوە دڵی خۆمان خۆشبکەین و شەیتان فێڵمان لێبکات بەڵکو دەبێ هەردەم ئاگاداری خۆمان بین لە بەرامبەر ڕەحمی الله تعالى کە ئومێدمان پێی هەبێ داوا لە الله بکەین پێمان بگەیەنێ وە بش ترسێین لە عەزاب و لە توڕەیی الله تعالى -جل شئنه- لە غەزەبی خوای رب العالمين لە ئینتیقام و تۆڵە سەندنەوەی الله تعالى.

هەر لە یەک ئایەتدا هەندێک جار الله تعالى جێگیری کردوە دەفەرموێ: ﴿غَافِرِ ٱلذَّنبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوبِ شَدِيدِ ٱلعِقَابِ﴾ [غافر: ٣] دەفەرموێ الله تعالى لێبوردەی گوناحەکانە وە وەرگری تەوبە و گەڕانەوەیە یانی قبوڵکاری تەوبە و گەڕانەوەیە وە لەگەڵ ئەوەیشدا الله تعالى توند و تیژە لە تۆڵە سەندنەوە و لە عیقابدانی کەسانێک کە سەرپێچی فەرمانەکانی الله تعالى دەکەن، کەواتە لە یەک ئایەتدا الله تعالى هەم باسی لێبوردن و بەزەیی خۆی ڕاگەیاندوە و تەوبە قبوڵکردن وە هەم باسی تۆڵەسەندنەوەشی کردوە کە الله تعالى پەنامان بدا لەبەری بپارێینەوە کە تۆڵەمان لێ نەستێنێتەوە چونکە بەرگەی تۆڵەی الله تعالى ناگرین ئێمە -جل شئنه-.

**جێگیر کردنی سیفەتی (الرضى والغضب والسخط والأسف والكره والمقت) لە قورئاندا:**

قَوْلُهُ: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ [المائدة: ١١٩]، ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ﴾ [النساء: ٩٣]، وَقَوْلُهُ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ﴾ [محمد: ٢٨]، ﴿فَلَمَّا آسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ [الزخرف: ٥٥]، وَقَوْلُهُ: ﴿وَلَـكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ﴾ [التوبة: ٤٦]، وَقَوْلُهُ: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لا تَفْعَلُونَ﴾ [الصف: ٣].

---

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- لە (الواسطية) دێتە سەر ئەوەی کە ئەمجارە بە چەندین ئایەت سیفەتەکانی ڕەزامەندی و (الرضى) وە لەگەڵ ئەوە (الغضب) و توڕەیی و (السخط) و ئەسەف و (الكره) و (المقت) دەسەلمێنێ بۆ الله تعالى.

لەو ئایەتانە ابن تيمية -رحمه الله- بە بەڵگەی هێناوەتەوە كە الله تعالى یەكەم خاوەنی ڕەزامەندییە و ڕیضایە، ڕەزامەندی و ڕیضاش بە مەعنایە حەقیقی و تەواویەكەی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە كە الله تعالى لە شتێک ڕازییە بەو شێوازەی كە لێی دەوەشێتەوە، كە الله تعالى فەرموی: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ [المائدة: ١١٩] دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی الله لێیان ڕازییە وە پلەی ئەوەشی بەوان داوە كە ئەوانیش لە الله ڕازین بە مەعنای خاوەن ئیمان و بڕوایەكی پتەو و تەواون قەناعەتێكی بێگومانیان هەیە بە الله تعالى و بە فەرمانەكانی و جێبەجێی دەكەن.

وە لە ئایەتەكەی تر دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ﴾ [النساء: ٩٣] هەریەک (مَن) سیغەی عومومە، هەریەک بڕوادارێک بە عەمدەن و ئەنقەست بكوژێ الله تعالى دەفەرموێ تۆڵەكەی جەهەننەمە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە وە الله تعالى: ﴿وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ﴾ الله غەزەبی لێ دەگرێ: ﴿وَلَعَنَهُ﴾ وەبەر لەعنەتی خۆی دەخا.

جا بە هەمیشەیی مانەوەی كەسێک قاتیلی عەمد لە ئاگری دۆزەخ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە مانای ئەوە نیە دەرناچێ ئەگەر كەسەكە بڕواداربێ، وە ئایە بكوژێكی ئەنقەست كە بڕوادارێک دەكوژێ تەوبەی لێ قبوڵ دەبێ؟ بۆچونی زۆربەی هەرە زۆری ئەهلی سونە و جەماعە ئەوەش ڕاجیح و پەسەندە تەوبەی لێ قبوڵ دەبێ تەنها ابن عباس لە یەک لە ڕیوایەتەكان دەفەرموێ و لێی دەگێڕنەوە لێی قبوڵ نابێ، وە ئایە هەمیشەییەكەی بۆناو ئاگری دۆزەخ كاتێک نیە لە ئاگری دۆزەخ دەربچێ؟ بەڵێ كاتێک دادێ لە ئاگری دۆزەخ دەردەچێ بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون لەپێناو ئەوە الله تعالى وای فەرموە بە مەعنای عەزابەكەی زۆر زۆر گەورەیە و زۆر عەزاب دەدرێ و دەمێنێتەوە ئەگەر تەوبە نەكا و نەگەڕێتەوە لای الله تعالى و خۆی نەكاتە بەر

جێبەجێکردنی فەرمانی الله و حەدی لەسەر جێبەجێ نەکرێت ئەو کاتە زۆر زۆر دەمێنێتەوە وەکو ئەوە وایە کە بە هەمیشەیی لە ناویی مابێتەوە.

وە لە پاشان لە سورەتێکی تر دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ﴾ [محمد: ٢٨] ئەوەش لەبەر ئەوەی چونکە ئەوان شوێنی ئەوە کەوتن کە الله تعالی پێی سوغطیان لێ دەگرێ بە مەعنای الله تعالی تورە دەبێ لێیان وە حەزیان بە رەزامەندی الله تعالی نەبوو رەزامەندی الله تعالی یان رەت دەکردەوە و پێیان خۆش نەبوو.

جا لە پاشان لە سورەتێکی تر الله تعالی دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا آسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ [الزخرف: ٥٥] لەدوای ئەوەی ئەوان وایانکرد الله تعالی ئەسەف لێیان بگرێت دەڵێ تۆڵەمان لێیان سەندەوە وە ئەوانمان نقوم کرد هەر هەمویان.

وە لە پاشان لە سورەتێکی تر دەفەرموێ: ﴿وَلَـكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ﴾ [التوبة: ٤٦] الله تعالی حەزی پێ نەبوو ئەوان بێنە مەیدان و هەبن، چی لێکردن؟ تەمبەڵی کردن یەکی خستن نەهاتنە مەیدان بۆ جەنگ و جیهاد چونکە نیەتیان پاک نەبوو مونافق بون دورو بون دەغەڵ بون.

وە الله تعالی لە سورەتێکی تر دەفەرموێ: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ [الصف: ٣] لەلای الله تعالی زۆر جێگای تۆڵە سەندنەوە و تورەبونە کە قسەیەک دەکەن نایهێننەجێ بە کردار هەر بە قسە دەیهێننەوە.

جا لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە سیفەتەکانی الله تعالی هەندێک جار دابەشکراوە بۆ چەند جۆرێک بە چەند رەچاوکردنێک، دەفەرمون هەندێک جار سیفەتەکانی الله تعالی یەکێک لە جۆرەکانی ئەوەیە سیفاتی زاتی هەیە وە سیفاتی فیعلیشی هەیە الله تعالی، سیفاتی زاتی ئەوانەن کە زاتی الله تعالی -جل شئنە- بەردەوام لە ئەزەل و ئەوەلەوە سیفەتەکەی لەگەڵدا بوە کاتێک نەبوە نەیبوبێ الله تعالی -جل شئنە- وەکو سیفەتی عیلم کەلام وە لە پاشانەکە قودرەت هەتا کۆتایی، جا سیفەتی فعلیشی هەیە الله تعالی سیفەتە

فعليەكان هەر دەمێک الله ویستی هەبوبێ هاتوەتەجێ هەر دەمێک نەیویستبێ نەیهێناوەتەجێ، جا هەندێک جار سیفەتێک دەشێ و دەگونجێ پێی بگوترێ زاتی بە ئیعتیبار و ڕەچاوكردنێک لە هەمان كاتدا پێی بگوترێ فعلیش وەكو سیفەتی كەلام، كەلام هەندێک جار سیفەتی زاتیە بۆ خوای رب العالمین هەر لە ئەوەل و ئەزەلەوە الله تعالی سیفەتی كەلامی هەبوە لەگەڵیدا بوە قەت لێی دانەبڕاوە و كاتێک نەبوە نەیبوبێ وە هەر كاتێكیش الله تعالی قسەی كردبێ -جل شئنە- بەوەی لێی دەوەشێتەوە ئەوە سیفەتی فعلی بوە كەلامەكەی.

كەلامیش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەگەینە سەریشی كەلامێكی حەقیقیە سەدا سەدییە بە مانایە ڕاست و دروستیەكەیەتی كە سەوت و حەرفیشی هەبێ بەس لە الله دەوەشێتەوە هی الله -جل شئنە- چۆنیەتیەكەی ئێمە نایزانین عیلمان پێی نیە وە بەڵام ناڵێین كەلامی نەفسیە ئەهلی سونە و جەماعە وەكو ئەشعەریەكان وا دەڵێن و خەڵكێكی تر لە تیرە و تاقمەكان وا دەڵێن یان موعەطیلەكان و جەهمیەكان پەكی ئەو سیفەتەی الله تعالی دەخەن.

جا ڕەزامەندی الله تعالی تاقم و كۆمەڵەكانی تر هەندێكیان ڕەتی دەكەنەوە بە مەعنایە حەقیقیەكەی یان تەئویلی دەكەن، بۆ؟ چونكە دەڵێن ڕەزامەندی سەبارەت بە مرۆڤ و بەندەكان بریتییە لە (الانبساط القلب إلى المرضية عنه) یەعنی دەڵێن دڵ بۆ یەک هاتنەوە و كرانەوەی دڵە بەرامبەر ئەو شت و كەسەی تۆ پێی ڕازی، دەڵێن چۆن دەبێ و دەشێ بۆ الله تعالی وابێ؟ كەواتە ئاثەوار و شوێنەكەشی دەڵێن شادییە و خۆشییە و گەشە و زەردەخەنەی سەر لێوان دەموچاو و ڕویە كەسێک كە لە كەسێک ڕازییە ئاوای پێوە دیار دەبێ بەڵام دەربارەی الله تعالی بریتیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن ئێمە دەڵێین ڕازامەندی الله ڕەزامەندیەكی حەقیقی و ڕاست و دروستیە بەڵام چۆنیەتیەكەی نازانین و دڵنیاشین وەكو هی مەخلوق و بەدیهێنراوەكان نیە چونكە الله تعالی لە زاتی وە

لە ناوە زۆر جوانەکانی لە سیفاتە بەرزەکانی: ﴿لَيسَ كَمِثلِهِ شَيء﴾ وەکو هیچ کەس و شتێک نیە هیچ کەس و شتێکیش وەکو الله نیە: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلبَصِيرُ﴾ [الشورى ١١].

الله تعالى لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز وەکو یەک لەو ئایەتانە کە ابن تیمیة -رحمه الله- هێنایەوە باسی ڕەزامەندی خۆی کردوە دەربارەی سەحابەکان زۆرجار دەفەرموێ: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ [المائدة: ١١٩] کە دەڵێ: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ﴾ ڕیضا لێرەدا مەعنایە حەقیقیەکەی دەبێ بڕیار بدەین لە زمانی عەرەبی چۆن دێ بەس بەو شێوازەی لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- بەبێ ئەوەی ئێمە زانستیمان هەبێ بە چۆنیەتیەکەی.

لە پاشان فەرمودەی سەحیحیش هەیە کە هاتوە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «إِنَّ اللَّهَ تعالى يَقُولُ لِأَهْلِ الْجَنَّةِ» الله تعالى دەفەرموێتە بەهەشتیان «هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لَا نَرْضَى؟» دەڵێ ئایە ئێوە ڕازی بون بەوەی کە پێتان بەخشراوە و دراوە لە بەشتان لە بەهەشتدا؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی چۆن ڕازی نەبین ئەی الله تعالى ئایە بۆمان هەیە ڕازی نەبین؟ یەعنی شتێکی وات بە ئێمە داوە دەبێ هەر ڕازی بین «وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أحدا من العالمين» شتێکی وات داوەتە ئێمە بەڕاستی تۆ نەت بەخشیوە و نەتداوە پێمان وایە بە هیچ کەسێک لە جیهانیان دەڵێ «أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنا؟» ئایە دەموچاوی ئێمەت نورانی و سپیلکە هەڵنەگەڕاندوە؟ «ألم تثقِّلْ موازيننَا؟» ئایە تەرازوی خێری ئێمەت قورس نەکردوە؟ لە پاشان دەفەرموێ «ألم تدخلنا الجنة وتنجنا من النار؟[١]» ئایە ئێمەت نەبردوەتە بەهەشت و لە ئاگری دۆزەخ قوتارت نەکردوین؟ چۆن ڕازی نابین؟ جا ئەو بابەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەندێک جار ڕەزامەندی مەخلوق و بەدیهێنراو و دروستکراوەکان دەخوازێ، ئایە ڕەزامەندی مەخلوق و دروستکراوەکان چیە؟ قەناعەت بونە بەو شتەی کە دەیان درێتێ لەبەر ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ [المائدة: ١١٩] ﴿وَرَضُوا عَنْهُ﴾ [المائدة: ١١٩] سەحابەکان بەوە لێکی دەدەنەوە ئایە ڕەزامەندی

[١]

سەحابەکان لە اللە تعالی لە چیەوەیە؟ دەفەرمون تەفسیرەکەی ئەوەیە قەناعەت و دڵنیان لەوە و قەناعەتیان هاتوە بەوەی اللە تعالی پێی بەخشیون و پێی داون، دەڵێن بەڵگەشمان ئەو حەدیسەیە کە تازە خوێندمانەوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) دەڵێتە بەهەشتیەکان ئایە ئێوە ڕازین بەوەی پێم داون؟ ئەوانیش دەڵێن چۆن بۆمان هەیە ڕازی نەبین؟ ئەو هەموو بەخشش و ناز و نیعمەتانەت لەگەڵ کردوین، ئینجا اللە تعالی دەفەرموێ «أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلَا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا[1]» دەفەرموێ من بۆ ئێوە حەلاڵ دەکەم ڕەزامەندی خۆم لێتان ڕازی دەبم تازە لە مەودا جارێکی تر تورە نابم لێتان کاتێ کە دەچنە بەهەشت و کاتی تاقیکردنەوە کۆتایی پێ دێ و هەر دەکەونە ناو ڕەزامەندی اللە تعالی، جا ڕەزامەندی اللە تعالی یش لە هەموو شتێک گەورەتر و مەزنترە: ﴿وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ﴾ [التوبة ٧٢] هیچ شتێک نیە لە ڕەزامەندی اللە گەورەتر، کە لێت ڕازی بێ اللە تعالی هەموو ناز و نیعمەتەکانت لەگەڵ دەکا تەنانەت ڕەزامەندی اللە تعالی کار و شتێکی مەعنەوی دڵنیاکاری زۆر خۆشە بۆ بەهەشتیەکان کە پێیان دەبەخشێ ئیلام ئەوە ناگاتە ئەوەی کە بە چاوی سەر بە خزمەت اللە دەکەون و اللە تعالی دەبینن.

لە پاشان سوخوط سیفەتێکە بۆ اللە تعالی جێگیرە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وەکو لە [محمد: ٢٨] تەفسیرمان کرد، سوخطیش بریتیە لە غەزەب جۆرێکە لە غەزەب توورەیی اللە تعالی ئەویش پێچەوانەی ڕەزامەندی اللە تعالی یە اللە تعالی غەزەب و سوخطی بۆخۆی بڕیار داوە و جێگیری کردوە ئەهلی سونە و جەماعەش دەفەرمون بە مەعنایە حەقیقیەکەی بەوەی لە اللە دەوەشێتەوە -جل شئنە- جێگیری دەکەین بەبێ ئەوەی چۆنیەتیەکەی بزانین، وە لە فەرمودەش هاتوە کە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا باوکە ئادەم و نوح پێغەمبەر و ئیبراهیم پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام) کە خەڵکەکە دەچنە خزمەتیان دەڵێن داوا بکە و تکا بکەن بۆمان کە اللە تعالی حەشر و حیسابمان دەست پێبکا

---

[1] **صحيح البخاري** (٦٥٤٩) (٧٥١٨)، **صحيح مسلم** (١٨٣) (٢٨٢٩)، **سنن الترمذي** (٢٥٥٥).

لەو مەیدانە ڕزگارمان بێ، ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: «إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ» دەڵێن ئەمڕۆ الله تعالى غەزەبێكی گرتوە تووڕەییەكی گرتوە لە پێشتردا ئەو غەزەبەی نەگرتوە هاو نمونەی ئەو غەزەبەی نەبوە «وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ[1]» وە لە مەودواش هەتا هەتایی بەم جۆرە غەزەب ناگرێ الله تعالى، كەواتە سیفەتی غەزەب بۆ الله تعالى وە سوخوط هەم لە ئایەت جێگیر بوە وە هەم لەو حەدیسەش غەزەب جێگیرە بۆ الله تعالى بە مەعنایە حەقیقی و ڕاستی و دروستیەكەی دەبێ بڕیار بدەین بۆ الله تعالى بەڵام چۆنیەتیەكەی نازانین و (كما يليق بجلاله) وە لە پاشان الله تعالى كە دەفەرموێ: ﴿وَكَرِهُوا رِضۡوَٰنَهُۥ﴾ [محمد: ٢٨] كەواتە كەڕهاندن و موقابیل و پێچەوانەی ڕەزامەندییە كە بۆ خۆشی الله تعالى بڕیاری داوە -جل شئنه- خاوەن ئەو سیفەتەیە.

ئایەتی سێیەم كە الله تعالى ئەویش باسی تووڕەیی وە غەزەبی زۆر و توندی خۆی دەكا -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى): ﴿فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ [الزخرف: ٥٥] الله تعالى دەفەرموێ: ﴿ءَاسَفُونَا﴾ ئەسەف بۆ الله تعالى -جل شئنه- بە مەعنای ئەغضەبونا یەعنی لەو كاتەی كە تووڕەیان كردین الله تعالى دەفەرموێ، ئەسەفیش بە مەعنای تووڕەبونێكی توند و تیژ و زۆر دێت نەك تووڕەبونێكی عادەتی و یان تەنها تووڕەبون بەڵكو لە زمانی عەرەبیەوە یانی (غضبان غضبا شديدا) وە بۆ الله تعالى یش یەعنی الله تعالى دەفەرموێ لەو كاتە ئێمەیان زۆر تووڕە كرد بە تووڕەییەكی توند ئینجا الله تعالى دەفەرموێ تۆڵەمان لێ ستاندنەوە و ئەوانمان غەرق كرد هەر هەموویان، تووڕەبونێكی ئەسەف بۆ الله تعالى -جل شئنه- بە تووڕەبونێكی توند و زۆر دادەنرێ ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە بەو تووڕەبونەی كە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- تووڕەبونێكی حەقیقی و ڕاست.

[1] **صحيح البخاري** (٤٧١٢) (٢٢١٧) (٣٣٤٠)، **صحيح مسلم** (١٩٤) (١٩٥) (٢٣٧١)، **سنن أبي داود** (٢٢١٢).

ئایەتی چوارەمەكەی دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ [النساء: ٩٣] جا: ﴿غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ﴾ بۆ الله تعالى لەو ئایەتە كە دەفەرموێ ئەو كاتە هەر كەسێک ئیماندار و بڕواداریێک بە ئەنقەست بكوژێ ئەوە تۆڵەكەی جەهەنەمێكی هەمیشەییە تێیدا و تورەبونی الله تعالى دەیگرێتەوە و دەكەوێتە سەری وە الله تعالى وەبەر لەعنەتی خۆی دەخات وە عەزابێكی مەزنی بۆ ئامادە كردوە.

﴿غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ﴾ لێرەدا لەو ئایەتەش الله تعالى غەزەبی بۆخۆی جێگیر كردوە بە شێواز و جۆرێک كە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- وە لەعنەتیش لەعنەتدان لە كافرەكان و وە لە بێدینەكان و لێرەش لە قاتیل و بكوژی موسڵمانی عەمدەن الله تعالى -جل شئنە- بۆخۆی جێگیری كردوە، جا (لَعَن) لە زمانی عەرەبی بە مەعنای بەدورخستنەوە لە ڕەحمی خۆی دێ الله تعالى وە غەزەبیش سیفەتێكی فعلی و كرداری الله تعالى یە -جل شئنە- الله تعالى خۆی پێ وەسف كردوە ئەهلی سونە و جەماعەش جێگیری دەكەن بۆ الله تعالى -جل شئنە- بە شێوازێک كە لە خۆی دەوەشێتەوە و لە مەزنی خۆی دەوەشێتەوە، نەک بڵێن غەزەب مەبەست لێی ئەوەیە دەیهەوێ ئینتیقام بكا الله تعالى وەكو ئەشعەریەكان یان هەندێک لە تاقمەكانی تر و ماتۆریدیەكان وا دەڵێن كە تەئویلێكی لادانە لە وشە و كەلیمەكە بڕیاریان داوە، بەڵكو تەواویەتی ئەوەیە غەزەب بە مەعنای حەقیقەت و ڕاستیەكەی كە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنە- دەبێ جێگیر بكرێ بۆ الله تعالى، لە ئایەتی سورەتی (النور)یش الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَٱلْخَـٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ [النور: ٩] لە لیعان الله تعالى دەفەرموێ ئافرەتەكە كاتێ كە ئەگەر پیاوەكە بڵێ لە دیار قازی موسڵمانان كە ئەوە هاوسەرەكەم توشی زینا بوە یان زینای كردوە ئەوكاتە لیعانیان لە بەیندا دەكرێ كە مەسەلەیەكی فیقهیە شەرعیە باسكراوە لە هەموو بابەت و پەرتوكە فیقهیەكان كە پێنجەم جارەكە دەبێ ئافرەتەكە بڵێ غەزەبی الله تعالى لەسەر ئەو

ئافرەتەیە ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بڵێ و ڕاست بکا، غەزەب لەو ئایەتەش دیارە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە الله تعالی یەکێک لە سیفەتەکانی غەزەبە غەزەبێک کە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە.

وە ئایەتی پێنجەم کە الله تعالی دەربارەی مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان دەفەرموێ: ﴿وَلَـٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنبِعَاثَهُم فَثَبَّطَهُم﴾ [التوبة: ٤٦] سیفەتی کەڕهی بۆخۆی جێگیر کردوە بە مەعنای الله تعالی لە کوردی کەڕە بە مەعنای کەڕهاندن و پێناخۆشی و ڕەتکردنەوەش دێ بەو مەعنایەی کە الله تعالی پێی ناخۆشبوو دەریان بچوێنێ مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان لە ڕیزی موجاهید و جەنگاوەرەکانی الله تعالی لەبەر ئەوە الله تعالی ئەوانی هێشتەوە تەمبەڵی کردن لە دەرچونەکە وەکو بڵێی حەبسی کردن، جا لێرەدا سیفەتی کورە بۆ الله تعالی جێگیرە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بەو شێوازەی کە لێی دەوەشێتەوە -جل شئنە-.

وە لە ئایەتی شەشەم الله تعالی فەرموی: ﴿كَبُرَ مَقتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفعَلُونَ﴾ [الصف: ٣] یان لە ئایەتی [غافر: ١٠] دەفەرموێ: ﴿لَمَقتُ ٱللَّهِ أَكبَرُ مِن مَّقتِكُم أَنفُسَكُم﴾ کەواتە الله تعالی سیفەتی مەقتی بۆخۆی بڕیاردا و جێگیری کرد بەو شێوازەی کە لێی دەوەشێتەوە، مەقتیش لە زمانی عەرەبی (البغض شديد)ی پێ دەگوترێ یەعنی توڕەبونێکی زۆر توڕەبونی توند و تیژ زیاتر لە توڕەبونێکی عادەتی ئەوەشی بۆ خۆی جێگیر کرد الله تعالی کە توڕەبونیش هەمومان دەزانین پێچەوانەی خۆشەویستیە، الله تعالی -جل شئنە- خاوەنی مەقتیشە هەندێک جار کە توڕەبونێکی زۆر و توند و تیژ کە لە خۆی دەوەشێتەوە بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە (ولله المثل الأعلى)، لە فەرمودەی سەحیحیش هاتوە کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) الله تعالی ئەگەر بەندەیەکی خۆشویست بانگ دەکاتە جوبڕائیل کە دەفەرموێ: «إن الله إذا أبغض عبدا نادى جبريل» ئینجا لە تەواوی فەرمودەکە کە تەواوی دەکا دەڵێ ئەگەر ڕقیشی لە بەندەیەکی بویەوە دیسان بانگی جوبڕائیل دەکا

الله تعالى «فقال: إني أبغض فلانا فأبغضه[1]» دەفەرمویٚ الله تعالى من ڕقم لە فڵانە غەزەبم لە فڵانە ئەی جوبڕائیل تۆش ڕقت لێی بێ وە غەزەبت لێی بێ، كەواتە لەو فەرمودەش سیفەتی غەزەب بۆ الله تعالى پێغەمبەر (ﷺ) جێگیری كردوە بەو شێوازەی كە لە الله دەوەشێتەوە (ولله المثل الأعلى).

كەواتە ابن تيمية -رحمه الله- لەبەر ئەوە ئەو ئایەتانەی هێناویەتەوە بەڵگەن لەسەر چەندین سیفاتی خەبەری و هەواڵدان كە ئیختیاریشن، الله تعالى -جل شئنه- بۆخۆی بڕیاری داوە دەبێ ئێمە وەكو ئەهلی سونە و جەماعەش بڕیاری بدەین و حەقیقەت و ڕاستیەكانی بلێین، بلێین بەو پێودانەی كە لە الله تعالى دەوەشێتەوە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

## جێگیر كردنی سیفەتی (الإتيان والمجيء) لە قورئاندا:

قَولُهُ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلآئِكَةُ وَقُضِيَ الأَمْرُ﴾ [البقرة: ٢١٠]، ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن تَأْتِيهُمُ الْمَلآئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ﴾ [الأنعام: ١٥٨]، ﴿كَلاَّ إِذَا دُكَّتِ الأَرْضُ دَكًّا دَكًّا * وَجَاء رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ [الفجر: ٢١-٢٢]، ﴿وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاء بِالْغَمَامِ وَنُزِّلَ الْمَلائِكَةُ تَنزِيلاً﴾ [الفرقان: ٢٥].

---

لە پاشان دەگاتە سەر ئەوە ابن تيمية لە مەتنەكەی (الواسطية) دێ جێگیر كردنی ئیتیان و مەجیء و هاتنی الله تعالى -جل شئنه- چ لە مەیدانی حەشر و حیسابدا چ ئەو سیفەتە بە گشتی بۆ الله تعالى جێگیر دەكا لەو ئایەتانە كە ئەو ئایەتانە هەمویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە الله تعالى خاوەنی سیفەتی ئیتیان و مەجیئە یەعنی هاتن، وە هاتنی الله تعالى یش -جل شئنه- لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە مەبەست لێی هاتنە وەكو زاتی -جل شئنه- نەك وەكو ئەوانەی تەئویلی دەكەن و تاقم و كۆمەڵەكانی تر دەڵێن ئەمر و فەرمانی الله دێ قودرەت و دەسەڵاتی الله دێ عیلم و زانستی الله دێ، نەخێر قودرەتی

[1] صحيح مسلم (٢٦٣٧)، صحيح البخاري (٣٢٠٩) (٦٠٤٠) (٧٤٨٥)، سنن الترمذي (٣١٦١).

الله تعالی و عیلم و زانستی و ئەمر و فەرمانی الله تعالی بەڵكو لە هەموو كات و لە هەموو شوێنێكی تر دێ لە هەندێک شوێنەكان ڕاشكاوانە الله تعالی -جل شئنە- باسی قودرەت و دەسەڵات و وە عیلمی خۆی كردوە و فەرمانی خۆی كردوە كە دێ جا لێرەدا باسی ئەمر و فەرمان و عیلم و زانست و قودرەتی تێدا نیە مەبەست لێی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون زاتی الله تعالی یە دێ -جل شئنە- بەو شێوازەی لێی دەوەشێتەوە (كما یلیق بجلالە وعظمتە).

جا ئایەتی یەكەم كە الله تعالی فەرموی: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلآئِكَةُ وَقُضِيَ الأَمْرُ﴾ [البقرة: ٢١٠] دیارە پێشینانی چاک هەندێكیان وا تەفسیری دەكەن دەفەرمون فریشتەكانن كە دێن وەكو پارچە پارچەی (ظُلَل) یەعنی سێبەر چەند پارچە هەورێک ئەگەر تەواو هەور ئاسمان دانەگرێ بەوە دەگوترێ وە الله تعالی یش هەر دەمێک بیەوێ ئەوكاتە دێ، جا زانایانی سەلەفی ساڵح كەواتە جیاوازییان خستوەتە نێوان هاتنی الله تعالی وو لە پاشان هاتنی فریشتەكان، دەڵێن ئەو ئایەتەش ئاوا بەڵگەیە لەسەری یەعنی وەكو بڵێی وەكو پارچە هەورێک فریشتەكان دێن و ئاسمانیان تەواو دانەگرتبێ پارچەیەک لەوێ و پارچەیەک لەوێ و بە موتەفەریقە و لەیەک جیایی ئەوە هاتنی فریشتەكانە و وا دێن، ئینجا الله تعالی یش دێ -جل شئنە-، هەندێكیش دەڵێن نا (ظُلَل) هەر مەبەست پێی فریشتەكانە یەعنی الله تعالی دێ بە جودا و ئەو (ظُلَل)ەكە هەر مەبەستی پێی خودی فریشتەكانە نەک پارچە هەور و ئەو بابەتە شتانە.

كەواتە مەبەست لێرە ئەوەیە هاتنی فریشتەكان كە نێوان ئاسمان و زەوی زۆرجار دادەگرن و بە پارچە پارچە و زۆری دێن و ژمارەیان زۆرە مەبەستمان زیاتر ئەوە نیە ابن تیمیةش -رحمە اللە-، مەبەست ئەوەیە كە الله تعالی یش دێ -جل شئنە- بۆ مەیدانی حەشر و حیساب ئەو كاتە حوكمی خەڵكەكە بدا و حاكمی ڕەهای موتڵەقی مەیدانی حەشر و حیسابیشە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلی).

وە لە ئایەتەکەی تریش الله تعالى فەرمویەتی: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن تَأْتِيهُمُ الْمَلآئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ﴾ [الأنعام: ١٥٨] ئەی ئەوانەی بێ بڕوان کافرن وە بڕواتان بە زیندوبونەوەی ڕۆژی قیامەت و ئەو بابەتە شتانە نیە ئایە ئێوە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن لەو مەیدانەدا کە فریشتەکان دادەبەزن لە دونیادا فریشتەی عەزاب لە دونیادا و وە لە قیامەتیش دەیان بیننەوە دێن بۆ لاتان و فریشتەکان دەبینن بە چاوی خۆتان یان چاوەڕوانی ئەوە دەکەن لە مەیدانی حەشر و حیساب الله بێ حوکمتان لە نێوان بدا و یەکلاکەرەوەبێ حوکم و فەرمانەکانی لە نێوانتان و حیساب لەگەڵ بەندەکانی خۆی بکا یان هەندێک لە عەلامەت و ئایەت و نیشانەکانی الله تعالى تان بۆ سەربێ.

ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون مادەم الله تعالى لەو ئایەتە جیاوازی خستە نێوان هاتنی فریشتەکان و وە هاتنی هەندێک لە عەلامەت و نیشانەکانی الله تعالى ئینجا هاتنی خۆشی باسکرد دیارە مەبەست لە هاتنی الله تعالى هاتنی زاتێتی هاتنێکی حەقیقیە نەک ئەمر و فەرمانەکانی یان هەندێک لە دروستکراوەکانی وەکو فریشتە یان هەندێک لە ئایەت و بەڵگەکانی کە دەینێرێ بەڵکو زاتی دێ -جل شئنە- بەو شێوازەی کە لە خۆی دەوەشێتەوە (ولله المثل الأعلى) ئێمە کەیفیەت و چۆنیەتیەکەشی نازانین.

لە پاشان الله تعالى لە سورەتی [الفجر: ٢١-٢٢] الله تعالى فەرموی: ﴿كَلاَّ إِذَا دُكَّتِ الأَرْضُ دَكًّا دَكًّا * وَجَاء رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ ئەو کاتەی باسی قیامەت دەکا الله تعالى -جل شئنە- کە زەوی بە تەواوەتی لێک دەکشێ و وە نامێنێ وە لە پاشان الله تعالى دەفەرموێ -جل شئنە- وە الله دێت خوای پەروەردگارت ئەی موحەمەد (ﷺ) لەو کاتەی فریشتەکان پۆل پۆل وەستاون لە مەیدانی حەشر و حیساب بۆ ئەوەی مەحکەمەی بەندەکان دەست پێبکا، ئەو هاتنەی الله تعالى ش لەو ئایەتە جێگیرە مەجیئی الله تعالى هاتنی الله تعالى وەکو حەقیقەتێک لە عەقیدە و بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعە هەروەکو لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى).

وە لە ئایەتەکەی چوارەم الله فەرمویەتی: ﴿وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاءِ بِالْغَمَامِ وَنُزِّلَ الْمَلائِكَةُ تَنزِيلاً﴾ [الفرقان: ٢٥] ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژی قیامەتە ئاسمانەکان لەت دەبێ و پارچە پارچە دەبێ وە هەروەکو پارچە هەور دیار دەکەوێ چۆن هەور هەندێک جار پارچە پارچە لە ئاسمان بە موتەفەریقە هەموو ئاسمانی دانەگرتوە ئاسمانیش وەکو ئەو هەورە کە پارچە پارچە دێتە بەرچاوان و دەبێ ئاوا پارچە پارچە دەبێ و لێک جیا دەبێتەوە پارچەکان و لەناو دەچێ کە هاتنی ڕۆژی قیامەتە ئەو کاتە جا الله تعالی دەفەرموێ فریشتەکانیش ئەو کاتە دێن بە دابەزینێکی تەواو جا الله تعالی یش -جل شئنە- بە جیاواز دێ جگە لە فریشتەکان، لێرەدا بۆ ئەوەیە ئەهلی سونە و جەماعە ئەو ئایەتە بە بەڵگە دەهێننەوە واتە دابەزین و هاتنی فریشتەکان جیایە لەگەڵ هاتنی الله تعالی، وە لە ئایەتەکان الله تعالی کە هاتنی فریشتەکانی بە جیاواز هێناوە هاتنی خۆشی بە جیاواز هێناوە دیارە هاتنی الله تعالی جیاوازە وە هاتنێکی حەقیقی و ڕاست و دروستە بەوەی لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى).

جا لێرەدا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەهلی بیدەع وە تاقم و کۆمەڵەکانی تر جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە لە ئەشعەریەکان و موعتەزیلەکان وە لە شیعە و باقی کۆمەڵەکانی تر بگرە هەمویان هاتنی الله تعالی یان ڕەت کردوەتەوە وەکو زاتی -جل شئنە- بۆ مەیدانی حەشر و حیساب بەوەی کە لە خۆی دەوەشێتەوە هەریەک تەئویلێک دەڵێ بەڵام زیاتر ئەو تەئویلە دەڵێن دەڵێن ئەمر و فەرمانی الله دێ لەو ڕۆژەدا یانی ناڵێن زاتی الله تعالی -جل شئنە-، دەڵێن کە الله فەرمویەتی: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ﴾ [الفجر ٢٢] یەعنی (جَاءَ أمر رَبِكَ) یەعنی فەرمانی اللەی پەروەردگارت دێت لەو ڕۆژەدا، دەبێ حەرفێکی تێدابێ حەرفەکەش ئەمرە وەگەڵی دەخەن و دەڵێن ئاوا واتاکەی تەواو دێ، بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە ڕەتدەکەنەوە وە پێشی ڕازی نین دەڵێن نەخێر الله تعالی لە هەندێک شوێن فەرمویەتی: ﴿أَو يَأتِيَ أَمرُ رَبِّكَ﴾ [النحل ٣٣] لەوێدا بە ڕاشکاوی دەفەرموێ الله تعالی

ئەو کاتەی فەرمانی اللهی پەروەردگارت دێ، کەواتە لەوێ مادەم باسی فەرمان و ئەمری کردوە لە شوێنێکی تریش باسی نەکردوە لەو شوێنەی کە باسی نەکردوە و دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ﴾ مەبەست لێی هاتنی زاتی الله تعالى يە -جل شئنه- بەو شێوازەی لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى) کەیفیەت و چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین ئەوە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

**جێگیر کردنی سیفەتی (الوجه) لە قورئاندا:**

وَقَوْلُهُ: ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُوالْجَلالِ وَالإِكْرَامِ﴾ [الرحمن: ٢٧]، ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ﴾ [القصص: ٨٨].

---

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- لە (العقيدة الواسطية) گەیشتە سەر جێگیر کردنی وجه بۆ الله تعالى -جل شئنه- بە ئايەتی قورئانی پیرۆز کە لە ئایەتی یەکەم دەفەرموێ الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُوالْجَلالِ وَالإِكْرَامِ﴾ [الرحمن: ٢٧] ئەوەی لەسەر ڕوی زەوییە هەر هەمویان لە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی و قیامەت دەچنەوە فەنا و لەناو دەبرێن تەنها وەجهی الله تعالى دەمێنێ کە خاوەن جەلال و گەورەیی و مەزنییە خاوەن ئیکراِم و ڕێز و بەڕێزییە.

جا لە ئایەتی دوەم دەفەرموێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ﴾ [القصص: ٨٨] هەموو شتێک لەناو دەچێ هیچ شت نیە بمێنێ هەتا سەر و هەتا هەتایی بێ تەنها وەجهی الله تعالى نەبێ. جا ئەهلی سونە و جەماعە بەو ئایەتانە جێگیر دەکەن بۆ الله تعالى دەفەرمون الله تعالى وەجهی هەیە، وجه لە کوردی پێی دەگوترێ ڕوو یان بۆ مرۆڤەکان پێی دەگوترێ دەموچاو جا بۆ الله تعالى ئەگەر لێکیشیان دایەوە وجه هەندێک جار بە مەعنای زاتیش دێ لە هەندێک شوێنەکان ئەهلی سونە و جەماعە دەیسەلمێنن، وە هەندێک جاریش بە مەعنای ڕووش دێ ئەو ڕووە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى) وجه بە مەعنایە حەقیقیەکەی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بەس دەڵێن ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین،

هەندێک جاریش بە مەعنای لەپێناو الله دێ وجه وەکو الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ﴾ [الكهف ٢٨] ئەی پێغەمبەر (ﷺ) تۆ ئارامبە لەگەڵ ئەوانەی کە بانگ و هاواری الله تعالى دەکەن لە بەیانیان و لە ئێواران مەبەستیان تەنها پێ ڕەزامەندی اللهیە، کەواتە لەوێ: ﴿وَجۡهَهُۥ﴾ موفەسیرین وای تەفسیر دەکەن دەڵێن مەبەست پێی لەپێناو اللهیە -جل شئنه- ڕەزامەندی اللهیە لەوێ مەبەست پێی وەجهی حەقیقیەکەی نیە بە مەعنای ئەوەی ڕوی الله تعالی (ولله المثل الأعلى)، یان لەو ئایەتە دەڵێ: ﴿إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ﴾ [الإنسان ٩] ئێمە خواردنتان پێ دەدەین تەنها لەپێناو الله لە پێناو ڕەزامەندی الله.

وە لە پاشان وەجهی الله تعالی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون نور و ڕوناکیەکی زۆری هەیە بەس ئێمە نازانین چۆنیەتیەکەی چۆنە وەکو لە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە، کاتێک پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) کە لە تەفسیری ئەو ئایەتە ئیمامی بوخاری هێناویەتیەوە: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ﴾ [القيامة: ٢٢] وە ئیمامی موسلیمیش هێناویەتیەوە لە سەحیحەکەی لە باب و باس و خواسی (إِثْبَاتُ رُؤْيَةِ الْمُؤْمِنِينَ فِي الْآخِرَةِ رَبَّهُمْ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) لە جێگیر کردنی بینینی بڕواداران بۆ الله -جل شئنه- لە ڕۆژی دوایی، جا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ» لە نێوان بڕواداران لە ڕۆژی دوایدا (الله تعالى لەوانمان بکا و بە نسیبمان بکا) دەفەرموێ وە لە نێوان تەماشاکردن و بینینی پەروەردگاریان «إِلَّا رِدَاءُ الْكِبْرِيَاءِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ[١]» تەنها پەردەی کیبرییا هەیە لە نێوان بەندە مرۆڤە بڕوادارەکان و الله تعالی لەسەر وجه و ڕوی الله تعالی تەنها ئەو پەردە هەیە ئەویش لە (جَنَّةِ عَدْنٍ)، (وكقوله -(ﷺ)- عن ربه) یان لە فەرمودەیەکی تریشدا پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئەو پەردەی لە نێوان بڕواداران و وەجهی الله تعالی هەیە دەفەرموێ «حِجَابُهُ النُّورُ» پەردەیەکی نورین هەیە (ڕوناکی) «لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَ سُبُحَاتُ

[١] صحيح مسلم (١٨٠)، صحيح البخاري (٤٨٧٨) (٤٨٧٩) (٧٤٤٤)، سنن الترمذي (٢٥٢٨).

وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ[١]» ئەگەر بێو پەردەکە لابدرێ هەر هەموو شتەکان ڕەنگە لە دور بە دوری و ڕوناکیەوە ڕوناکی وجه و ڕوی الله تعالی (ولله المثل الأعلى) چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین هەموو شتەکان هەتا چاوی بەندە و مەخلوقەکان حوکم دەکا و دەیبینێ دەیسوتێنێ، لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکی تر دەفەرموێ: «أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ[٢]» خۆمان بە اللەی مەزن پەنا دەدەین بە ڕوی بەرز و بەڕێزی الله تعالی -جل شئنه-.

کەواتە ئەوانە هەموی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە الله تعالی دەشێ و دەگونجێ ئەهلی سونە و جەماعە جێگیریان کردوە بگوترێ وەجهی هەیە وەجهێک بە مەعنایە حەقیقیەکەی کە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنه- وە چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین، جا کە دەش گوترێ: ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾ [الرحمن: ٢٧] بە دڵنیاییەوە ئەوە ئەوەش دەگەیەنێ کە زاتی الله تعالی دەمێنێ -جل شئنه- دەمێنێتەوە و لەناوچونی بۆ نیە موفەسیرین واش دەفەرمون، ئەهلی سونە و جاماعە دەڵێ ناشێ و ناگونجێ ئێمە ئەگەر گوتمان زاتی الله تعالی دەمێنێ و واشی تەفسیرکەین وەجهی الله تعالی یش جێگیر نەکەین چونکە بە دەیەها بەڵگە لەسەر ئەوەیە لەو فەرمودانەی خوێندمانەوە و وە لە ئایەتەکانی قورئانیش و هەندێک ئایەتی تریش کە ابن تیمیة -رحمه الله- نەیهێناوەتەوە لەسەر ئەوەی الله تعالی خاوەن وەجهێکی حەقیقیە بە مانایە ڕاست و دروستیەکەی بەبێ ئەوەی ئێمە ماناکەی تەئویل کەین و تەحریف کەین و تەعطیل کەین و هاو وێنەشی بۆ ناهێنینەوە وە لە پاشانەکە چۆنیەتیەکەشی نازانین و بڕیاری بۆ دەدەین ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

[١] صحيح مسلم (١٧٩)، سنن ابن ماجه (١٩٥) (١٩٦)، مسند أحمد (١٩٥٣٠) (١٩٥٨٧) (١٩٦٣٢).
[٢] سنن أبي داود (٤٦٦).

## جێگیر کردنی سیفەتی (اليدين) لە قورئاندا:

وَقَوْلُهُ: ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ [ص: ٧٥]، ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ [المائدة: ٦٤].

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- لە (العقيدة الواسطية) گەیشتە سەر ئەمجارە جێگیر کردنی دەستەکان بۆ الله تعالى (اليدين)، ئەو ئایەتانەی بۆ ئەوە هێناوەتەوە ابن تيمية -رحمه الله- کە جێگیری بکا الله تعالى خاوەنی دەستەکانە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کە بڕیار دەدرێ دوو دەست کە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین (ولله المثل الأعلى).

لە ئایەتەکەی یەکەم الله تعالى فەرموی: ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ [ص: ٧٥] ئەوە دەربارەی ئەوەیە الله تعالى شەیتان و ئیبلیسی دواندوە و خیطابی لەگەڵ کردوە فەرمویەتی چی تۆی قەدەغە کرد ئەی ئیبلیس ئەوەی بە هەردوو دەستەکانی خۆم دروستم کردوە و بەدیم هێناوە کە باوکە ئادەمە (ﷺ) بەو دەستانەی کە لە الله دەوەشێتەوە و چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کە تۆ کڕنوشی بۆ بەری و سوجدەی بۆ بەری.

جا سوجدە بردنی ئیبلیس و داوای الله تعالى بۆ ئەوەی بۆ ئادەمی ببا چ سوجدە و کڕنۆشێک بوە؟ ئایە سوجدە و کڕنۆشی ڕێز و ئیحتیڕام بوە یان سوجدە و کڕنوشی عیبادەت و پەرستش بوو؟ لێرەدا ئەهلی سونە و جەماعە دیارە جیاوازییان هەیە هەندێکیان دەفەرمون سوجدە و کڕنۆشی ڕیز بوە هەندێکیشیان دەفەرمون ئێمە نابێ هیچ بەڵگەیەکمان لە دەست نیە ئەو تەئویلە بکەین، لەوانە عثيمين -رحمه الله- دەڵێ بەڵکو دەبێ ئێمە بڵێین سوجدەیەکی حەقیقی و تەواو بوە ئەگەر هی عیبادەتیش بوە جا تەنها بۆ الله هەیە -جل شئنه- ئەو ئەمر و فەرمانە بکا ئەو هەر ئەمر و فەرمانێک بکا لێی وەرگیراوە کە لە ئیبلیس ئەو داوایەی کردوە بۆ باوکە ئادەم (ﷺ)، ئەوە دەشێ و دەگونجێ الله هەر داوایەک بکا ئەوە لە الله

دەوەشێتەوە و بۆ ئەو دەشێ و دەگونجێ بۆ هیچ بەدیهێنراو و مەخلوق و کەسێکی تر ناشێ و ناگونجێ، کەواتە دەفەرموێ دەبێ ئێمە بڵێین سوجدە و کڕنۆشێکی حەقیقی بوە نەک ئیلا هی ئیحتیڕام و ڕێز بەڵام ئیبلیس نەیبردوە وە ئەوەش مانای شیرک و هاوبەشی ناگەیەنێ لەبەر ئەوەی چونکە الله تعالی بۆخۆی ڕێیداوە و فەرمانی کردوە کە ئیبلیس ئەو سوجدە و کڕنۆشە بەرێ بۆ باوکە ئادەم بەڵام کە نەیبرد سەرپێچی فەرمانەکەی کرد وەبەر لەعنەتی الله تعالی کەوت.

جا جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە سیفەتی دەست بۆ الله تعالی ڕەت دەکەنەوە تەحریفی دەکەن جەهمیەکان پەکی دەخەن لێکی نادەنەوە موعتەزیلەکان نەفی دەکەن وە ئەشعەریەکان وە هەندێکی تر لە تیرەکانی تر تەئویلی دەکەن تەحریفی دەکەن مانای دەگۆڕن بەوە لێکی دەدەنەوە یەعنی بە قودرەتی خۆم لێرەدا کە ئەنەهو الله تعالی فەرمویەتی: ﴿خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ یەعنی (خَلَقْتُ بِقدرتيَ) ئێ الله تعالی پێویست ناکا بڵێ (بِقدرتيَ) هەردوو قودرەتەکانم ئەگەر وابا دەیگوت (بِقدرتي) بە یەک قودرەتم بە یەک دەسەڵاتم بە دەسەڵاتەکەم دروستم کردوە، جا لێرەدا کە وای فەرموە هەندێک دەڵێن ئاخر قەیناکە مەبەستی پێی ئەوە بوە (بِقدرتي وبِنِعْمَةِ) هەم نیعمەتم لەگەڵی بوە هەم قودرەتم لەگەڵی بوە، ئا ئەوانە تەئویلە و بەڵگە و شتێکی ئەوتۆی لەسەر نیە هەتا جێگیر ببێ.

ئەهلی سونە و جەماعە وەڵامیان دەدەنەوە پێیان دەڵێن، باشە ئیبلیس یەکێک نیە لە مەخلوقات و بەدیهێنراوی الله تعالی؟ بە دڵنیاییەوە هەمومان دەبێ بڵێین بەڵێ، باشە ئەی ئیبلیس بۆی نیە ئەگەر الله تعالی مەبەستی پێی ئەوەبێ بڵێ بە قودرەتی خۆم دروستم کردوە بڵێ باشە الله تعالی منیشت بە قودرەتی خۆت دروست کردوە چ جیاوازییەکم لەوە هەیە لەگەڵ ئادەم؟ چونکە لێرە ئەو ئایەتە سیاقەکەی ئەوەی لێ دەوەشێتەوە کە الله تعالی پلە و پایەیەک بە ئادەم دەبەخشێ ئەو پلە و پایەیە ئیبلیس نیەتی ئەو پلە و پایە مەخلوق و بەدیهێنراوەکانی تر نیانە لەبەر ئەوەیە ئەی ئیبلیس کڕنۆشی بۆ بەرە چونکە ئادەم خاوەن

پلە و پایەی ئەوەیە بە دەستەکانی خۆم بەدیم هێناوە و دروستم کردوە بەو دەستانەی لە اللە دەوەشێتەوە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین، ئەگەر مەبەست پێی قودرەتبا ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون قسەکەشیان زۆر مەنتیقیە زۆر واقیعیە زۆر لەجێیە دەیتوانی ئیبلیس بڵێ باشە اللە تعالى تۆ منیشت بە قودرەتی خۆت دروست کردوە ئەوە چ پلە و پایەیەکە هەتا من کڕنۆشی بۆ بەرم؟ بەڵام ئیبلیس نەیتوانتی ئاوا بڵێ ئەوە پلە و پایەیەکە اللە تعالى بەخشیویەتی بە ئادەم چونکە مەبەست لەوێ: ﴿بِيَدَيَّ﴾ قودرەت و نیعمەت نیە وەکو ئەوان دەڵێن وەکو ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون بەڵکو دەستی حەقیقیە بەو واتایەی لە اللە دەوەشێتەوە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) و ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین.

وە وەڵامی دوەمی ئەهلی سونە و جەماعە بۆ ئەو تاقم و کۆمەڵانەی تەئویل دەکەن و تەحریف دەکەن واتای: ﴿بِيَدَيَّ﴾ دەڵێن باشە اللە تعالى لەوێ بە تەثنیەی هێنا بە دوی هێنا بە یەکی نەهێنا کە دەفەرموێ: ﴿لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ فەرموی بە دیم هێناوە بە دوو دەستەکان نەی فەرموە بە یەک دەست یان (بِيَدِينا) کە مەعنای ئەوە بگەیەنێت بڵێ بە قودرەتمان یان بە قودرەتەکان نەی فەرموو اللە تعالى (بقدرتَينا) چونکە قودرەتی اللە تعالى شامیلە گشتگیرە هەموو شتێک دەگرێتەوە: ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ە نابێ قەتاوقەت حەسر بکرێ لە ژمارەیەکی دیاریکراودا ئەو وشانەی کە شامیل و عام و گشتین، عام مەعنای چیە؟ هەتا لە (أصول الفقه)یش کە دەخوێندرێ، دەبێ لەفزێکی شامیل بێ هەموو فەردەکان و تاکەکان لەخۆیەوە بگرێ جا وشەی قودرەت عام و گشتی و شامیلە هەموی لەخۆوە دەگرێ نابێ حەصر بکرێ چونکە پێناسەی عام وا دەکرێ تەنانەت لە أصول الفقه)یشدا (غير منحصر على فرد) وشەیەکی شامیل بێ نابێ حەصریش بکرێ و کورت هەڵبهێندرێ لەسەر تاک و فەردێک یان چەند تاک و فەردێک ئەو کاتە لە عام و گشتیایەتی دەردەچێ، کەواتە یان دەبێ بە گوێرەی قسەی ئێوە ئەهلی سونە و جەماعە پێیان دەڵێن قودرەتی اللە

تعالى بلّيى عام و گشت نيە گشتگير نيە و هەموى ناگرێتەوە ئێ ئەوەش پێچەوانەی: ﴿وَعَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٖ قَدِيرٞ﴾ە يان نابێ حەصری بكەی لە دوو ژمارەدا كە وەكو الله تعالى دەستەكەی حەصر كردوە لەدوان وەكو تەثنيە هێناوێتی بەس قودرەتەكە ئەگەر بلّيى عامە نابێ بلّيى حەصر دەبێ و كورت هەلّدێ لە دوان، بۆ گوتويەتی دوو قودرەتم؟ چونكە وشەی عام نابێ كورت هەلّبهێندرێ لە ژمارەيەكی دياريكراو لە چەند فەردێكی دياريكراو.

جا بەو وەلّامەوە ئەهلی سونە و جەماعە بە تەواوەتی بردیانەوە لە تاقم و كۆمەلّەكانی تر كە دەفەرمون دوو دەستی حەقيقيە بۆ الله تعالى -جل شئنه- ئێمە چۆنيەتيەكەی نازانين جێگيری دەكەين بەو پێودانەی وە بەو واتايەی كە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

لە پاشان الله تعالى لە ئايەتی دوەم فەرموی: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌ﴾ جولەكەكان گوتيان الله (پەنا بە الله) دەستگرە لە بەخشين بە واتای ئەوەی (پەنا بە خوای رب العالمين) بۆ مرۆڤەكان مەغلولە و دەستگر بە ڕەزيلی و قرچۆكی دەگوترێ كە زۆر بەخشەر نيە و دەستكراوە نيە يانی نابەخشێ، لە زمانی عەرەبيدا ئەوە وا بەكار دەهێندرێ ئەگەر كەس و مرۆڤێك ڕەزيل بێ قرچۆك بێ دەستگربێ بەخشەر نەبێ يان بەغيل بێ بۆی بەكاردێ، يەعنی جولەكەكانيش زانيويانە الله تعالى خاوەنی دەستە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى) يەديان بۆ بەكار هێناوە بە مەعنای حەقيقی و ڕاستيشی كە دێ پێويست بە تەئويل ناكات ئينجا الله تعالى دەفەرموێ: ﴿غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾ دەستی ئەوان بقوچێ و نەكرێتەوە و دۆعايە لێيان دەكا الله تعالى -جل شئنه- فەرمانە بەسەرياندا دەدا: ﴿وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ﴾ بەهۆی ئەو قسە و بێڕێزيانەيان بەرامبەر بە الله تعالى خۆيان وەبەر لەعنەتی الله گرت و لەعنەتيان لێكرا، الله تعالى لە وەلّامياندا دەفەرموێ: ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ﴾ بەلّكو دەستەكانی الله تعالى كراوەن -جل شئنه-: ﴿يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُ﴾ [المائدة: ٦٤] الله تعالى چۆنی بوێ ئاوا دەيبەخشێ و دەيدا بە قسەی هيچ كەس و شتێكی ناكا -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

کەواتە: ﴿يَدَاهُ﴾ لێرەدا جێگیری کرد الله تعالی بۆخۆی کە خاوەنی دوو دەستە کە لەخۆی دەوەشێتەوە (ولله المثل الأعلى) بە مەعنایە حەقیقی و ڕاست و دروستیەکەی بەس ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین.

وە پێغەمبەر (ﷺ) لە چەندین فەرمودە جێگیری کردوە کە الله تعالی خاوەنی دەستە بە مەعنایە حەقیقیەکەی کە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە-، لە یەک لە فەرمودەکان پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «المقسطون يوم القيامة على منابر من نور على يمين الرحمن» دادوەرەکان لە ڕۆژی دوایی واتە ئەوانەی قیست دەکەن دادوەری دەکەن عەدالەتێکی حەقیقی و تەواو دەکەن ئەوانە لەسەر میمبەر و شوێنی بەرزی نورین و ڕوناکین لە ڕاستی اللەی ڕەحمان -جل شئنە- «وكلتا يديه يمين مباركة» پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) هەردوو دەستەکانی الله ڕاستەن موبارەکن پیرۆزن «الذين يعدلون في أنفسهم وأهليهم وما ولوا[1]» موقسیطین کێن؟ ئینجا تەفسیری کرد پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوانەی دادوەرن داربارەی خۆیان عەدالوت لەگەڵ خۆشیان دەکەن لەگەڵ ئەهل و دەوروبەریشیان دەیکەن وە لەگەڵ ئەوانەش کە ئەوان بەسەریان فەرمان ڕەوان.

جا لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) جێگیری کرد لەو فەرمودە سەحیحەدا کە فەرموی دوو دەستی الله نەیفەرموو دەستێکیش وە فەرموشی دەستەکانی الله تعالی «وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِين» وە هەردوو دەستی الله تعالی ڕاستەیە واتە خێر و بەرەکەتیش لە ڕاستەدا هەیە بەوەی کە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) کەواتە جێگیربوو لەو فەرمودەش کە الله تعالی دوو دەستی هەیە بەوەی لەخۆی دەوەشێتەوە چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین.

لە فەرمودەیەکی تر لە ئەبو هوڕەیرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «يمين الله ملأى، لا تغيضها نفقة، سحاء الليل والنهار، أرأيتم ما أنفقه منذ خلق السماوات والأرض، فإنه لم

[1] أخرجه مسلم برقم (١٨٢٧) في الإمارة، باب: فضيلة الإمام العادل وعقوبة الجائر، عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما.

يغض ما في يمينه، وبيده الأخرى القسط يخفض ويرفع[١]» دەفەرموێ ڕاستەی الله تعالى پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) پڕە وەکو لە کوردی دەگوترێ پڕ و تەژی بە لەهجەی بادینی بە مەعنای تەواو پڕ، پڕە هیچ نەفەقە و بەخشینێک لێی کەم ناکاتەوە ئەوەندە زۆری لەلایە الله تعالى، بە شەو و ڕۆژ کە ببەخشێ، ئایە دەبینن لەوەتەی ئاسمانەکانی بەدی هێناوە و زەوی بەدی هێناوە، ڕاستەی الله تعالى هیچی لێ کەم نەبوەتەوە ئەوەندەشی بەخشیوە و داویشیەتی -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى)، وە بە دەستەکەی تریش دادوەرییە لێی بەرز و نزم نابێ.

کەواتە لێرەشدا پێغەمبەر (ﷺ) دوبارە دوو دەستی بۆ الله تعالى جێگیر کرد بەوەی کە لە الله دەوەشێتەوە (ولله المثل الأعلى) وە چۆنیەتیەکەی نازانین.

وە لە تەفسیری ئەو ئایەتەش کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ﴾ [الزمر: ٦٧] ابن كثير لە تەفسیری ئەو ئایەتە دەفەرموێ ئەوە نمونەی وەکو ئەو فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرموێ: «يطوي الله السماوات بيمينه ويقبض الأرض بيمينه[٢]» الله تعالى ئاسمانەکان لول دەدا و دەپێچێتەوە بە ڕاستەی وە زەویش دەگرێ بە ڕاستەی.

کەواتە دوبارە لێرەش ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دوو ڕاستەی بۆ الله تعالى جێگیر کرد ئەوەش حەقیقەت و ڕاستیەتی هەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بەڵام چۆنیەتیەکەی نازانین و بۆی جێگیر دەکەین بۆ خوای رب العالمين بەوەی لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنه-.

---

[١] صحيح البخاري (٧٤١٩) (٤٦٨٤) (٧٤١١)، صحيح مسلم (٩٩٣)، سنن الترمذي (٣٠٤٥).

[٢] أخرجه البخاري برقم (٧٣٨٢) في التوحيد، باب: قول الله تعالى: (ملك الناس) ، ومسلم برقم (٢٧٨٧) في صفات المنافقين، باب: كتاب صفة القيامة والجنة والنار، عن أبي هريرة رضي الله عنه.

وە لەو فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) كە دەفەرموێ: «قلوب العباد بين أصبعين من أصابع الرحمن يقلبها كيف يشاء[١]» دڵی بەندەكانی الله لە نێوان دوو پەنجەی اللەن لە پەنجەكانی الله تعالی ی ڕەحمان وەریان دەگێڕێ الله تعالی هەر چۆنێكی بوێ یانی هەڵگێڕ و وەرگێڕی دڵەكان دەكا قەلبیان دەكا لە باشە بۆ خراپە لە خراپە بۆ باشە بەڵام خراپەكان بە دەستی خۆی بەندەكە هەڵی دەبژێرێ و الله عیلمی پێی هەیە لەبەر ئەوە الله تعالی -جل شئنە- ڕێگای پێدەدا كە خراپەكە ببێ (والله أعلم بالصواب).

لە پاشان لە فەرمودەیەكی تر هاتوە دەفەرموێ: «يَطْوِي اللَّهُ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى» ئاسمانەكان لە ڕۆژی دوایی الله دەیپێچێتەوە لولیان دەدا لە پاشان بە ڕاستە دەیانگرێ «ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ» لە پاشان دەڵێ من پاشام «أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟» كوان ئەوانەی كە خۆیان بە زل و گەورە دەزانی لەسەر ڕوی زەوی لاف و گەزافی زلی و گەورەیی و مەزنی یان لێ دەدا؟ «أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟» كوان ئەوانەی كە لوتبەرز بون؟ «ثم يَطْوِي الْأَرَضِينَ السبع، ثم يأخذهن بشماله» لە پاشان حەوت تەبەقە زەویەكە ئەویش دەپێچێتەوە و لولیان دەدا الله تعالی، جا لە پاشان بە شیمال و چەپەی دەیگرێ «ثم يقول: أنا الملك، أين الجبارون؟ أين المتكبرون؟[٢]» جا لە پاشان دوبارە دەفەرموێ من پاشام وە خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو بەدیهێنراوەكانم كوان ئەوانەی خۆیان پێ مەزن و بەرز و گەورە بوو؟ كوان ئەوانەی فیزی ئەوەیان لێدەدا خۆیان پێ لوتبەرز بوو؟ جا ابن عباس دەفەرموێ: (ما السماوات السبع والأرضون السبع في كف الرحمن إلا كخردلة في يد أحدكم[٣]) دەفەرموێ ئەو ئاسمانانە و حەوت ئاسمانەكە و حەوت زەویەكە تەبەقەی زەوی دەفەرموێ لە چنگی الله تعالی و لە كەفی اللەی ڕەحمان وەكو خەردەلەیەكی زۆر بچوكە لە دەستی ئێوەی

[١] سنن الترمذي (٢١٤٠)، سنن ابن ماجه (٣٨٣٤)، مسند أحمد (١٢١٠٧) (١٣٦٩٦).
[٢] صحيح مسلم (٢٧٨٨) (٢٧٨٨)، صحيح البخاري (٧٤١٢)، سنن أبي داود (٤٧٣٢).
[٣] القول المفيد على كتاب التوحيد [ابن عثيمين] ج: ٢ ص: ٥٣٥.

مرۆڤدا، ئاوای تەشبیە دەکا ئاوای دەهێنێتەوە ابن عباس -رضي الله عنهما- (ولله المثل الأعلى) گەورەیی الله تعالى بەدیار دەخا.

کەواتە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوەیە کە جێگیری دەکەن دەفەرمون الله تعالى خاوەنی دوو دەستە هەردەمێ بیەوێ دەیانکاتەوە دەیانقوچێنێ وە بەرز و نزمیان دەکا وە پەنجەی هەیە کە لە فەرمودەکەی ڕابردوو سەلماندمان بەڵام چۆنە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین حەقیقەتیشی هەیە و جێگیریشی دەکەین (ولله المثل الأعلى).

باشە ئێمە لە کۆتاییەکەی ئەوە بڵێین بۆچی ئەو سیفەتانەی الله تعالى بخوێنین و الله تعالى بۆ ئێمەی بڕیار داوە و لە قورئانی پیرۆز هاتوە و لە حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) مەبەست لە شارەزابوون لەو سیفەتانەی الله تعالى چیە؟

یەکەم خاڵ ئەوەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوانە سیفەتی کەمال و تەواویەتن ئەگەر ئەو سیفەتانە نەبێ ئەو کاتە تۆ الله تعالى -جل شئنە- بە تەواوی و سەد لە سەدی ناناسی لەبەر ئەوە پێویست بوە الله تعالى -جل شئنە- بۆ بەندەکانی کە ڕەوانەی کردوە و شی کردوەتەوە بۆ پێغەمبەریش (ﷺ).

لە پاشان خاڵی دوەم و قازانجی دوەم ئەوەیە واجب و پێویستە لەسەر هەموو موسڵمان و بڕوادارێک شوێنی دەقەکانی قورئان و حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەر بکەوێ (ﷺ) ئەوەی کە اللەی تێدا وەسف کراوە لە هەموو ئەوانی تر لەپێشترە بەبێ تەحریف و تەعطیل و تەمثیل و تشبیە (باسی تەعطیل و تەحریف و تەمثیل و تشبیە و تەکیفمان کرد لە پێشتر پێناسەکەمان کرد ئێستا ناچینەوە سەری).

وە خاڵێکی تر ئەوەیە کە ئەگەر وەسفەکان بەدیار بکەون گەورایەتی مەوسوف بەدیار دەخا، تۆ چەندێک کەسێک وەسفی زیاتر شارەزابی ئەوەندە لەلات خۆشەویستر دەبێ ئەوەندە لەلات بەرز و مەزنتر دەبێ کە سیفەتەکانی لەوپەڕی تەواوی و ڕێک و پێکی بێ، جا الله تعالى یش سیفەتەکانی لەوپەڕی تەواوییە چەند ئێمە بە سیفەتەکانەوە

بیناسین ئەوەندە چاکتر لێی نزیک دەبینەوە ئەوەندە چاکتر لێی دەترسین ئەوەندە چاکتر خۆشمان دەوێ، هەر لەو پێناوانەیە کە ئەهلی سونە و جەماعە بەڵگەکانی ئایەتی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) جێگیر دەکەن و دەیهێننەوە هەتاوەکو ئێمە چاکتر و زیاتر لە الله بترسین و لێی نزیک بینەوە.

## جێگیرکردنی سیفەتی (العين) لە قورئاندا:

وَقَولُهُ: ﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ [الطور: ٤٨]، ﴿وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ * تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾ [القمر: ١٣- ١٤]، ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾ [طه: ٣٩].

---

ئەو ئایەتانە ابن تيمية بە بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ جێگیر کردنی چاو بۆ الله تعالى چاوێک کە لە خۆی دەوەشێتەوە (ولله المثل الأعلى) بەبێ تەحریف و تەعطیل و تەمثیل و تەکیف و چۆنیەتیەکەی وە چۆنیەتیەکەی ئێمە نازانین ئەهلی سونە و جەماعە وا دەفەرمون.

ئایەتی یەکەم مانای ئەوەیە: ﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ [الطور: ٤٨] واتە ئارامگربە بۆ فەرمانی الله تۆ بە چاوی ئێمەی بەو مانایەی دەتبینین بە چاو لە ئێمە دیاری وە بزر نی کە دەشت بینین بە مانای دەتپارێزین ئاگاشمان لێتە هەروەکو الله تعالى لە ئایەتێکی تر دەفەرموێتە هارون و موسا پێغەمبەر (ﷺ): ﴿إِنَّنِى مَعَكُمَا أَسمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه: ٤٦] بڕۆنە لای فیرعەون و مەشترسن چونکە من لەگەڵتاندام، ئەو مەعییەی الله تعالى بۆ بڕواداران و پێغەمبەران مەعییەیەکی خاصە، یانی نەک ئیلا بە قودرەت و عیلم لەگەڵتاندام بە مەعنای ئەوەی سەریشتان دەخەم پشتگیریشتان دەکەم بۆ بڕواداران مەعیەی خاصە وە بۆ تێکڕای مەخلوق و بەدیهێنراوەکانی تر مەعییەی عامە، وە لە پاشان دەفەرموێ: ﴿أَسمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه: ٤٦] دەبیستم و دەبینم ئەوەی لەوێ دەکرێ، کەواتە الله تعالى -جل شئنه- خاوەن ئەو سیفەتانەیە ئەهلی سونە و جەماعە بۆی جێگیر دەکەن.

لە ئایەتی تر الله تعالی فەرمویەتی: ﴿ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ﴾ [الشعراء: ٢١٨] لەو کاتەی تۆ هەڵدەستیتەوە و لە پێیاندای الله تعالی دەتبینێ، یان الله تعالی لەو ئایەتەی ڕابردوو دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ [الطور: ٤٨] بە مەعنای (نراك) دەتبینێ.

ئەوانە هەموی بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن ئەو مانایەی لێ وەردەگیرێ کە الله تعالی سیفەتی عەینی بۆخۆی جێگیر کردوە -جل شئنە- عەینێک کە لەخۆی دەوەشێتەوە بە مەعنایە حەقیقیەکەی (ولله المثل الأعلى) چۆنیەتیەکەشی نازانین.

ئەگەر پرسیاری ئەوە بکرێ باشە بۆ الله تعالی فەرمویەتی: ﴿بِأَعْيُنِنَا﴾ (نَا)ی ضەمەیری جەمعی بۆ بەکارهێناوە بۆ بە تاک نەیهێناوە بە تەثنییە نەیهێناوە؟ زۆرجار (نَا) و ضەمیری جەمع لە زمانی عەرەبیدا بۆ عەزەمەت و تەعزیم و گەورەییە یەعنی بەکاردەهێندرێ، جا الله تعالی لەبەر گەورەیی ئەو سیفەتەی خۆی بەکاری هێناوە وا دەفەرمون زانایان، (نَا)ی بەکارهێناوە کە زاتی الله تعالی هەم مەزن و گەورەیە وە هەم جێگیر کردنی ئەو سیفەتەش بۆ الله تعالی گەورایەتی تێدایە الله تعالی (نَا)ی ضەمەیری بەکارەێناوە کە ضەمیری جەمعە و کۆیە.

وە لە فەرمودەی پێغەمبەریش هاتوە (ﷺ) کە بەڵگەبێ لەسەر ئەوەی الله تعالی چاوی هەیە چاوێک کە لە خۆی دەوەشێتەوە عەینێک کە لە خۆی دەوەشێتەوە کە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ): «إِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ[١]» دەربارەی دەجال کە پێغەمبەر (ﷺ) دەدوێ و قسان دەکا دەفەرموێ دەجال ئەعوەڕە یەعنی خێلە چاوەکانی ڕاست و ڕەوان و تەواو نیە و لە ناوەڕاست نیە خێلە دەجال، یان لە ڕیوایەتەکانی تر دەفەرموێ چاوێکی قەپاتە وە چاوێکی کراوەیە، قەپاتە وەکو پارچەیەک لە گۆشت و ئەوانەی بەسەردا هاتبێ هەر هیچی پێوە دیار نیە کە چاویشە وەکو باس و خواسی دەجال وا دەکا پێغەمبەر (ﷺ)، جا دەجال کە دەڵێ من خوام و لەگەڵ ئەوەدا یەک چاوی هەیە و چاوێکی قەپاتە یان خێلە بەلاّم اللهی

[١] **صحيح البخاري** (٤٤٠٢) (١٧٤٢) (٣٠٥٥)، **صحيح مسلم** (٦٥) (٦٦) (١٦٩)، **سنن أبي داود** (٤٦٨٦) (٤٧٥٧).

پەروەردگارتان ئەعوەڕ نیە، کە دەڵێ ئەعوەڕ نیە مەعنای چی دەگەیەنێ؟ کە گوترا فڵان کەس ئەعوەڕ نیە یەعنی خێل نیە خێلیش لە زمانی عەرەبی عادەتەن یەک چاو خێل نیە کەواتە بە دوو چاوی ڕاست و ڕەوان دەگوترێ کە دەڵێی فڵان کەس خێل نیە، ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون کەواتە ئەو فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر جێگیری کرد (ﷺ) هەردوو چاوەکانی اللە تعالی سەلامەتن خێل نین وە نابینا نیە اللە تعالی بەس هەموو ئەو مانایانە و جێگیر کردنی چاو بۆ اللە تعالی بە مانایە حەقیقیەکەشی چۆنیەتیەکەی نازانین (کما یلیق بجلالە سبحانە وتعالی).

وە ئایەتی دووەم کە ابن تیمیة هێناویەتیەوە اللە تعالی فەرمویەتی: ﴿وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ * تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾ [القمر: ١٣- ١٤] ئەوەش دەربارەی نوح پێغەمبەرە (ﷺ) کە لەو کاتەی سواری کەشتیەکە دەبێ نوح پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵی سوار دەبن بڕواداەکان کە ئەو کەشتیە دروستکراوی دەستی نوح پێغەمبەر بوو (ﷺ) لە دار و لە بزماری ئەو کات و هەر شتێک لەوانەی کە کەشتی پێ دروست دەکرا دروستی کردبوو نوح پێغەمبەر (ﷺ) چونکە اللە تعالی فەرمانی پێدابوو کە سوارین و بەو کەشتیەوە اللە تعالی قوتاریان دەکا لەو عەزابەی کە ڕەوانەی دەکات کە وەکو غەزەبێک لە قەومی نوح اللە تعالی دەیگرێ، جا اللە تعالی کە دەفەرموێ نوحمان بارکرد لەسەر تەختە دارەکان کە لێک بەسترابونەوە چ بە بزمار و بە هەر شتێکی ئەو کات کە داری لێک دەبەستێتەوە، جا سواری ئەو کەشتی بونەی نوح و ئەوانەی بڕواداربون لەگەڵی اللە تعالی کە سواری کردن و یارمەتیدان دەفەرموێ: ﴿تَجْرِي﴾ ئەوە دەڕوا ئەو کەشتیە ﴿بِأَعْيُنِنَا﴾ بە چاودێری ئێمەوە بە بینینی ئێمەوە واتە دەیانپارێزین چاودێریيان دەکەین کە لەناو نەچن.

جا ئەوەش دوبارە اللە تعالی فەرموی: ﴿بِأَعْيُنِنَا﴾ وەکو لە ئایەتەکەی سورەتی (الطور)ی‌ش ھەر فەرموی ئەوەش جێگیر کردنی ئەوەی تێدایە کە اللە تعالی خاوەنی

چاوە سیفەتی چاو و عەینی هەیە (ولله المثل الأعلى) جا ئێمە بۆی جێگیر دەکەین وەکو ئەهلی سونە و جەماعە بەڵام چۆنیەتیەکەی نازانین.

لە ئایەتەکەی سێیەم کە ابن تیمیة بە بەڵگەی سێیەمی هێناوەتەوە بۆ جێگیر کردنی چاو و عەین بۆ الله تعالى ئەویش الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي﴾ [طه: ٣٩] الله تعالى هەواڵ دەدا کە بەندەکەی خۆی موسای خۆش دەوێ وە لێی نزیکە کە الله تعالى جۆرێک لە جۆرەکانی مەحەبەت و خۆشەویستی تایبەتی بۆ موسا هەیە (ﷺ) لەبەر ئەوە دەفەرموێ وەکو بڵێ پەروەردەت دەکەین ئەی موسا لە ژێر چاودێری ئێمەوە و بە بینینی ئێمەوە و بە پاراستنی ئێمەوە تۆ پەروەردە دەبی و پێدەگەی ئێمە دەتپارێزین لە هەموو ناخۆشیەک.

ئینجا الله تعالى فەرموی: ﴿عَلَىٰ عَيْنِي﴾ ئەوەش بەڵگەیە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون لەسەر یەک چاو بۆ الله تعالى -جل شئنه-، جا ئەگەر بگوترێ باشە لێرەدا باسی تاک کراوە دەڵێین تاک هەندێک جار وشەکە جنسە جنس لە زمانی عەرەبی زیاتر لە یەکیش دەگرێتەوە، مەبەست لێی لەو ئایەتە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون عەددەت و ژمارە دیاریکردن نیە مەبەست جنسەکەیە جنسیش فەردی هەیە لە زمانی عەرەبیدا ئەوەی شارەزابێ دەزانێ، بە بەڵگەی ئەوەش ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئێمە حەدیس و فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ) جێگیریان کردوە بۆ الله تعالى کە الله تعالى خاوەنی دوو چاوە بە حەقیقی و ڕاستی کە لە خۆی دەوەشێتەوە چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین.

لە پاشان ابن تیمیة لە سەرەتا و تا ئێستا و هەندێکی تری ماوە ئایەت دەهێنێتەوە بە ئایەتی قورئانی پیرۆز سیفەتەکانی الله جێگیر دەکا لە پاش ئایەتەکان ئینجا دەست بە فەرمودەکان دەکا فەرمودە و حەدیسی پێغەمبەریش دەهێنێتەوە (ﷺ) لە مەتنی (الواسطیة).

## جێگیر كردنی سیفەتی (السمع والبصر والرؤية) لە قورئاندا:

وَقَوْلُهُ: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ [المجادلة: ١]، وَقَوْلُهُ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ﴾ [آل عمران: ١٨١]، وَقَوْلُهُ: ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم بَلَى وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ [الزخرف: ٨٠]، ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ [طه: ٤٦]، ﴿أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى﴾ [العلق: ١٤]، ﴿الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ * وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ * إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ [الشعراء: ٢١٧-٢١٩]، ﴿وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ [التوبة: ١٠٥].

---

ئەو ئایەتانەی هەموو كردە بەڵگە ابن تيمية -رحمه الله- تۆماری كرد لە (العقيدة الواسطية) بۆ جێگیر كردنی سەمع و بەصەر و ڕوئیە بۆ الله تعالى.

جا ئایەتی یەكەم كە الله تعالى فەرموی: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ﴾ [المجادلة: ١] ئەو ئایەتە بەڵگەیە ڕاشكاوانە لەسەر ئەوەی كە الله تعالى جێگیر كردنی سەمع بۆ خۆی بڕیار دەدا كە الله تعالى بیسەر بوە بۆ ئەو قسە و گوتنەی ئەو ئافرەتە كە خەولە بوو شكایەت و سكاڵای هەبوو لە پیاو و هاوسەرەكەی خۆی بردییە لای پێغەمبەر (ﷺ) الله تعالى دەفەرموێ بێگومان الله بیستی قسە و وتەی ئەو گفتوگۆیەی نێوان تۆ و خەولە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) سكاڵا بوو دەربارەی هاوسەرەكەی شكایەت و سكاڵاكەی هێناوە بۆ لای الله الله تعالى دەبیستێ ئەو گفتوگۆیەی نێوان ئێوە چونكە بەڕاستی الله تعالى بیسەر و بینەرە، جا لە پاشان زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەوە بەڵگەیە الله تعالى جارێک بە سیغە و دەربڕینی ماضی لەو ئایەتەدا بۆخۆی جێگیری كرد كە بیسەر بوە وە جارێک بە سیغە و دەربڕینی موضاریع.

جاری یەكەم كە لە ئایەتی یەكەم دەفەرموێ: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا﴾ لەو ئایەتەی دوەمیش دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ

أَغْنِيَاء﴾ [آل عمران: ١٨١] ئەوانە هەردوكيان بە سیغەی ماضین جێگیری كردوە الله تعالی، جا بە سیغەی ماضی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕوداوەكە و حەدەثەكە و فعلەكە و شتەكە هاتوەتەجێ ڕابردوو بوە وە جێگیر كردنەكەشی بەهێزترە، كەواتە الله تعالی لە پێشتر كە ئەوان وایان گوتوە و الله تعالی ئەوانی بیستوە لەو كاتەی كە وایان گوتوە و لە ڕابردوەكەی.

وە جاری دوەم بە سیغەی موضاریع دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا﴾ الله تعالی دەبیستێ بە مەعنای لە داهاتوش كە ئەگەر قسە دەكەن و گفتوگۆ دەكەن هێشتا نەش گەشتونەتە سەری یان دەستان پێكردوە و هێشتا كۆتایی پێ نەهاتوە ئەویش هەر دەبیستێ، چونكە موضاریع بەڵگەیە لەسەر حاڵ و ئێستا وە لەسەر ئیستیقبال و داهاتوو.

كەواتە الله تعالی ئێستاش دەتان بیستێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو گفتوگۆیەی لە نێوان تۆ لەگەڵ خەولە ئەو ئافرەتە سەحابیە هەیە وە لە داهاتوش دەتان بیستێ، ئەوانە هەمویان بەڵگەی ڕاشكاوانەن لەسەر ئەوەی كە الله تعالی سەمعی هەیە و دەبیستێ (ولله المثل الأعلی) بەوەی كە لێی دەوەشێتەوە بە حەقیقی و ڕاستی ئێمە چۆنیەتیەكەی نازانین.

وە لەو ئایەتەی تریش كە فەرموی: ﴿إِنَّنِى مَعَكُمَا أَسمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه ٤٦] الله تعالی دەفەرموێتە موسا پێغەمبەر (ﷺ) وە دەفەرموێتە هاڕون پێغەمبەر (ﷺ) كە من لەگەڵتاندام و دەتان بیستم و دەتان بینم، ئەوەش لەوێ بە سیغەی موضاریع جێگیری كردوە واتە ئێوە بڕۆن لە داهاتودا كە دەگەنە لای فیرعەون من دەتان بیستم و دەشتان بینم، كەواتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی الله تعالی -جل شئنە- سیفەتی سەمعی هەیە وە دەشبیستێ وە حەقیقیشە بەڵام (ولله المثل الأعلی) چۆنیەتیەكەی ئێمە نایزانین ئەوە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

جا سەمع و بیستنی الله تعالی -جل شئنە- هەندێک جار بە مانای تەهید و پشتگیری كردنە بۆ كەسەكە، هەندێک جار بە مانای تەهدیدە و تۆڵە لێسەندنەوەیە و ترساندنیەتی، وە

هەندێک جاریش بە مانای ورد و درشتی جێگیر کردنی سەمعیەتە بۆ اللە تعالی کە اللە تعالی بیسەری هەموو شتەکان دەبێ بە ورد و درشتیەوە، جا بیستنی اللە تعالی یش -جل شئنە- بیستنێکی فراوانە هیچ شتێک نیە اللە تعالی نەیبیستێ -جل شئنە- دەوری هەموو شتێکی داوە بە بیستنەوە تەنانەت دایکە عائیشە -رضي الله عنها- کاتێ کە دەفەرموێ لەو ئایەتە کە اللە تعالی وەکو بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دایبەزاند فەرموی: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا﴾ خەولەی کچی ثەعلەبە لەگەڵ پیاوەکەی کاتێ کە ظیهاری لەگەڵ کردبوو هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، دایکە عائیشە دەفەرموێ من لێیان نزیک بوم هەر لەو دیوی حوجرەکە بوم بەڵام لە هەموو قسەکان نەدەگەیشتم ئەوها بە سەبری و هێواشی خەولە لە خزمەت پێغەمبەر دەیکرد (ﷺ) بەڵام اللە تعالی لە سەروی حەوت ئاسمانانەوە بە ورد و درشتی لە هەموو قسەکان بیستی و وە ئایەتی بەسەر دابەزاندن، کەواتە دایکە عائیشە دەفەرموێ پاکی و بێگەردی و گەورەیی بۆ ئەو اللەیەی کە بیستنەکەی زۆر فراوانە و وە زۆر دەقیق و وردە.

ئینجا ئەهلی سونە و جەماعە جێگیری دەکەن کە بەڵێ اللە تعالی خاوەنی سیفەتی سەمعە وە بەصەرە وە ڕوئیەیە بە حەقیقەت و ڕاستی بەڵام ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین بەڵام جێگیری دەکەین وەکو واتا تەواوەکەی وە چۆنیەتیەکەش و زانستی بە چۆنیەتیەکەی ڕەت دەکەینەوە و هیچی لێ نازانین.

ئەوە بەڵگەکەیە کە دایکە عائیشە دەفەرموێ: «الحمد لله الذي وسع سمعه الأصوات، لقد جاءت المجادلة تشكو إلى رسول الله وأنا في ناحية من البيت، ما أسمع ما تقول، فأنزل الله -عز وجل- ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ﴾ فدل ذلك أن الله يدرك بسمعه الأصوات على اختلافها[1]» دەفەرموێ سوپاس و ستایش بۆ خوایەکی پەروەردگار کە بیستنەکەی زۆر فراوانە هەموی دەبیستێ بە ورد و درشتیەوە دەڵێ ئەوەی هات کە گفتوگۆی کرد لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)

[1] **سنن النسائي** (٣٤٦٠)، **سنن ابن ماجه** (١٨٨) (٢٠٦٣)، **مسند أحمد** (٢٤١٩٥).

کە خەولەی کچی ثەعلەبە بوو کە سکاڵای هێنایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لە پیاو و هاوسەرەکەی، جا دەڵێ لەلایەکی ژورەکە بوو من زۆر لێیان نزیک بوم، بەڵام من هەموو قسەکانی ئەوانم نەبیست و گوێم لێ نەبوو بەڵام الله تعالی ئەو ئایەتەی دابەزاند و کە بیسەر بوو بۆ هەموو قسەکان بە ورد و درشتیەوە، ئینجا دەفەرموێ ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە الله تعالی بە بیستنی خۆی و بە سەمعی خۆی هەموو دەنگەکان بە جیاوازییەوە دەبیستێ.

جا زۆرجار ئەهلی سونە و جەماعە نمونە بەوە دەهێننەوە دەڵێن سەمع و بیستنی الله تعالی ئەوەندە فراوانە لە یەک لەحزە و چرکەدا ئەگەر هەموو مەخلوق و بەدیهێنراوەکان بدوێن و قسە بکەن بە جیاوازی لە نێوانیان لە زمان و لەهجەکانیانەوە بە هەر دەنگێک بیکەن بە نزمی بیکەن یان بە دەنگی بڵند و زۆر بەرز بیکەن یان بە مام ناوەندی بیکەن هەر داوایەکیان هەبێ لە یەک چرکەشدا الله تعالی هەموی دەبیستێ بەبێ ئەوەی لێی تێک بچێ -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى)، وە دەشتوانێ هەر هەمویان پاداشت ئەگەر داوا دەکەن بیانداتەوە ئەگەر داوای تۆڵەیە تۆڵەیان بۆ بستێنێتەوە ئەگەر بڕوادارن یان هەر ڕاز و نیازێک هەبێ بۆیان جێبەجێ بکا، ئەوە گەورەیی الله تعالی یە -جل شئنە-، بەڵام ئێمەی مەخلوق و بەدیهێنراو تەنانەت مرۆڤەکان ئەگەر نمونەمان پێ بێتەوە سەبارەت بە سەمع و بە بینینیان کەم و کورتیهان یەکجار زۆرە، تۆ ئەگەر بیسەربی دوو کەس بدوێن و قسەت لەگەڵ بکەن چەند لێشت نزیکبن بە یەک زمانیش بێ زۆریش فەصیح و ڕاشکاوانە قسە بکەن ڕەوان بێژبن لە قسەکانیان ئیلا لێت تێک دەچێ ئەگەر دوو کەس لە یەک کاتدا بدوێنن و قسەت لەگەڵ بکەن، دەڵێیە یەکێک بوەستە جارێ با گوێ لەوە بگرم لێم تێک دەچێ نازانم چی دەڵێ ئینجا لە دوایی گوێ لە تۆ دەگرم واتە قسەکانی تۆ دەبیستم و هەستت لێ ڕادەگرم، ئینجا ئەگەر دەنگێکی دور بە دوریش بێت و مەژغوڵ و سەرقاڵت بکات دەنگەکەی ئەو نزم و کەم بکاتەوە دوبارە لێت تێک دەچێ، کەواتە مرۆڤ کەم و

کورتە لە بیستنەکانی بەڵام الله تعالی لەوپەڕی تەواوییە لە بیستنەکانی، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ وەکو گوتمان بنەمایەک لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە هەندێک جار ناوەکان یەک دەگرنەوە دەگوترێ مرۆڤیش خاوەنی سەمعە و بیسەرە الله تعالی یش خاوەنی سەمعە و بیسەرە بەڵام لە مانا و لە ناوەڕۆکدا لە واتایە حەقیقی و ڕاستیەکەیدا هی الله تعالی سەمع و بیستنەکەی زۆر فراوانە کەمالیەت و تەواویەتی پێوەیە بەڵام هی مرۆڤەکان زۆر کەم و کورتە و لە خۆیان دەوەشێتەوە، هی الله لە گەورەیی خۆی دەوەشێتەوە هی مرۆڤەکانیش لە کەم و کورتی خۆیان دەوەشێتەوە ئەگەر لە ناویشدا هاوبەش بن لە ناوەڕۆکدا زۆر لێک دورن هەموو ناو و سیفەتەکانی الله تعالی هەر وایە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى).

وە لە ئایەتەکەی دوەمیش کە الله تعالی فەرموی: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ فَقِير وَنَحْنُ أَغْنِيَاء﴾ [آل عمران: ١٨١] ئەوە هەندێک لە موفەسیرین هێناویێتیانەوە دەڵێن وەکو سەبەب نزول و دابەزینی ئەو ئایەتە هۆکارەکەی ئەوەبوو فینحاس کە یەکێک بوو لە گەورە جولەکەکان، ئەو کاتە ئەو گەورە جولەکە دیارە کەسێک بوو بازرگانی دەکرد وە لە پاشان دەوڵەمەند بوو وە لە قسە و گوتنەکانی فەصیح و ڕەوانبێژ بوو وە پلە و پایەیەکی هەبوو لەنێو جولەکەکاندا، جارێکیان ئیمامی ئەبو بەکر دەچێتە بازاڕی جولەکەکان بۆ کڕین و فرۆشتن بە تاک و تەنها ئەو فینحاسە دەبینێ و بانگی لێدەکات و بانگەوازی لەگەڵ ئەنجام دەدا کە دەڵێ وەرە سەر ڕێگای ڕاست و تاوەکو کەی فینحاس تۆ نابیتە موسڵمان؟ کە فینحاس ئەو کاتە دیارە قسەی کردوە و خەڵکی جولەکە دەورەی لێ داون و لەنێو بازاڕەکە ئیمامی ئەبو بەکر وای بینیوە -رضي الله عنه- دیارە فینحاسیش ئەو قسەی دەکا دەڵێتە ئیمامی ئەبو بەکر دەڵێت چۆن بێم بڕوا بێنم بە موحەمەدێک کە موحەمەدەکەی ئێوە من بیستومە دەڵێت خواکەی ئێوە موحتاجە و دەیهەوێت کە خەڵکی قەرزی پێبدات دیارە فەقیر و هەژارە خوایەکەی ئێوە من خوایەکی دەوڵەمەندم دەوێ ئەو قسانە دەکا و

ئەو ئایەتە هی ئەوەیە، ئینجا ئیمامی ئەبو بەکر لێی دەچێتە پێش و مستێک لە دەمی دەدا و ددانی دەشکێنێت، ئینجا جولەکەکان دەیانەوێ تۆڵەی لێ بستێننەوە فینحاس لێ ناگەڕێ و لەگەڵ ئیمامی ئەبو بەکر دێتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، دەڵێ ئەبو بەکر وای لێکردوم، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ لەبەرچی ئەی ئەبو بەکر؟ ئەویش دەفەرموێ بەرگریم کرد لە الله تعالی و لە تۆ ئەی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، ئەویش دەفەرموێ تۆڵەی کەسێک قسە و بێ ڕێزی بکا بەرامبەر بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە ئەی فینحاس.

ئینجا زانایان ئەوە دەکەنە بەڵگە ئەوانەی بە سەحیح و ڕاست و دروستی دادەنێن دەڵێن لە هەر جێگا و شوێنێک ئەگەر کوفری و بێ بڕواییەک دەربڕدرا ئەو کاتە تۆ بۆت هەیە عەزمت جەزمکەی وەکو عەزیمەتەوە لێی بچیتە پێش و لە کەسەکە بدەی حیسابی هیچ شتێک نەکەی ئایە چیت دێتە پێش و چیت بەسەر دێ و بە تاک و تەنهایی و ئەوانە هەموو کافرن و ئەگەری ئەوەی هەیە بکوژرێی هەرچیت بەسەربێ ئەوە عەزیمەتە، ئەگەر کردت خەیرت پێدەگا وە ئەگەری زۆریش هەیە الله تعالی ڕزگاریشت بکا وەکو ئیمامی ئەبو بەکر هیچیشت بەسەر نەیە وە زۆرجاریش وابوە ئەگەر لەپێناو الله تعالی بێ، ئەگەر لەگەڵ ئەوەشدا وەکو ڕوخسەتێک بۆشت هەبێ خۆت بێدەنگ کەی و بڕۆی ئەوێ بەجێ بێڵی لە ترسی ئەوەی چونکە تۆ بە تاک و تەنهای و ڕەنگە ئەگەری ئەوەت بێتە سەر بکوژرێی و ئازار و ئەشکەنجەی زۆر بدرێی بەڵام عەزیمەتەکە ئەولاترە و چاکترە بیکەی (والله أعلم بالصواب).

ئینجا لێرەوە الله تعالی دەفەرموێ ئەوەیان ئەمجارە تەهدیدە ئەوەی یەکەمیان ئەو بابەتە بیستنە بوو کە الله تعالی ورد و درشتی شتەکان دەبیستێ وە ئەوەی دوەمیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بیستنێکە و تەهدیدیشی پێوەیە الله تعالی ئەو ئایەتەی دابەزاند بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر فینحاس و ئەوان لەسەر ئەو بۆچونەی موفەسیرین فەرموی: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ فَقِير وَنَحْنُ أَغْنِيَاء﴾ [آل عمران: ١٨١] یەعنی بێگومان

الله تعالی بیستی ئەوانەی کە گوتیان الله تعالی فەقیر و هەژارە (پەنا بە خوای رب العالمین) تعالی وە ئێمە دەوڵەمەندین، الله تعالی کە دەڵێ بیستی وەکو کە ئەنەهو لە زمانی عەرەبی ئەو بابەتە وشە و دەربڕینانە بۆ ئەوەندە دێ یەعنی ئاگادارم بیستومە لەسەریان ناچێ بە مەعنای حیسابیان بۆ دەکەم، ئینجا لە کۆتایی ئایەتەکەش الله تعالی هەر وا دەفەرموێ کە لەسەریان دەنوسرێ ئەوانە کە (قتلة الأنبياء)ن پێغەمبەرانیشیان کوشتوە (علیهم الصلاة والسلام) بەبێ حەق و بە ناڕەوایی ئینجا تۆلەیان لێ دەستێنرێتەوە.

لە ئایەتەکەی سێیەم کە ابن تیمیة بە بەڵگەی هێنابوەوە بۆ جێگیر کردنی بیستنی الله تعالی، الله تعالی دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم بَلَى وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ [الزخرف: ٨٠] ئەوە دەربارەی موشریکەکانی قورەیشی هات دابەزی ئەو ئایەتە دەفەرموێ موشریکە قورەیشیەکان وا دادەنێن ئێمە نهێنیەکانیان نابیستین ئەوەی بە پستە پست لەنێوان خۆیاندا دەیلێن و بە دەنگی نزم کە دوانیان سیانیان پێکەوە کۆ دەبنەوە و دەیلێن ئێمە نایان بیستین بەڵێ دەشیان بیستین ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە وە ئێمە ڕەوانەکراوی فریشتەکانیشمان ڕەوانە کردوە لەسەریشیان بنوسن و تۆمار بکرێت ئەوانیش لەسەریان دەنوسن.

لە پاشان لە ئایەتی چوارەم دەربارەی موسا پێغەمبەر (ﷺ) وە هاڕونی براشی (ﷺ) کە الله تعالی ڕەوانەی لای فیرعەونیان دەکا، ئەمجارە بیستنەکە لێرە بیستنی تەهیدە سەرخستنە پشتگیری کردنە کە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ [طه: ٤٦] ئێوە بڕۆن وە مەش ترسێن: ﴿لَا تَخَافَا﴾ مەترسێن: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ چونکە من لەگەڵتاندام ئەوە مەعییەتی تایبەتی پێ دەڵێن ئەهلی سونە و جەماعە، دەگەینە سەری مەعییەت و لەگەڵدابونی الله دوو جۆری هەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە:

١. مەعییەت و لەگەڵدابونی گشتی و عام هەیە کە لەگەڵ هەموو کەسێکدا هەیە الله تعالی -جل شئنه- لە خراپ و باشە بە مەعنای بیستن و بە بینین و بە عیلم و زانستی و بە دەسەڵاتەوە لەگەڵ هەموو شتێکدا هەیە.

٢. وە مەعییەتی خاص و تایبەتیش هەیە کە لەگەڵ بڕوادارانە وەکو لەو ئایەتە بە موسا و هارون دەفەرموێ (عليهما الصلاة والسلام) هی پشتگیری کردنە و سەرخستنە وە لەگەڵدابونی هێز و توانا پێ بەخشینیانە وە پاراستنیانە.

الله تعالی کە دەفەرموێ بڕۆن مەترسن بڕۆنە لای فیرعەون چونکە من لەگەڵتاندام وە دەش بیستم هەر قسەیەکی ورد و درشت دەکرێ لەوێ تەنانەت ئەوەی بە دڵی فیرعەونیشدا دێ من ئاگادارم: ﴿وَأَرَى﴾ دەشبینم، جا بینین بە مەعنای ئەوەیە کە بە چاو شتەکان دەبیندرێ جا (ولله المثل الأعلى) الله تعالى -جل شئنه- کە ڕونمان کردەوە لە ڕابردودا لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە هەموو شتەکان دەبینێ بە بینینێکی حەقیقی و ڕاستی هیچ شتێک ون نیە لە الله تعالی و بزربێ و الله تعالی نەیبینێ.

جا لە پاشان لە ئایەتی پێنجەم ابن تیمیة -رحمه الله- کە بە بەڵگەی هێنایەوە الله تعالی فەرموی: ﴿أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى﴾ [العلق: ١٤] ئەوە دەربارەی ئەبو جەهلە کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوە و کەعبە نوێژی دەخوێند و دەیکرد ئەبو جەهل هات گوتی تا کەی ئەی قوڕەیشیەکان قەدەغەی ئەو موحەممەدە ناکەن؟ ئەوە جوێن فڕۆشتنە بە بت و سەنەمەکانی ئێمە کە کڕنۆش دەبا بۆ خوا تاک و تەنهاکەی ئینجا هات لەوێ پێغەمبەر قەدەغە بکا (ﷺ) لە نوێژ کردنەکەی ئینجا الله تعالی دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى﴾ [العلق: ١٤] ئایە نازانێ ئەبو جەهل کە الله تعالی دەیبینێ ئەو هەڵسوکەوتەی کە لەگەڵ پێغەمبەری (ﷺ) دەکا و قەدەغەی دەکا؟ ئینجا الله تعالی پێغەمبەری (ﷺ) هەڵهێنا لەسەر ئەوەی ڕوە و ئەبو جەهل بوەستێتەوە، کەواتە هەموو جارێک نابێ کەسی موسڵمان بڵێ دەسەڵاتم نیە و زەعیف و لاوازم لە هەموو ئیش و کارێکدا لە بەرامبەر طاغوت و زاڵمان ئەو کاتە ئەگەر

خەڵکیشت لەگەڵدا نەبێ دەسەڵاتیشت زەعیف و لاوازبێ بڵێی وەڵا تەنازول دەکەم هەموو شتێک تەنازولی لێ نیە، هەموو شتێک نابێ تۆ کەمتەر خەمی ئەوەی لێ بکەی دەبێ هەندێک جار مەوقیفت هەبێ هەڵوێستت هەبێ بوەستیتەوە لە بەرامبەری، وەکو قەدەغەکردن لە نوێژ قبوڵ نیە تەنازول بکەی بۆ هیچ کەسێک ئیلا دەبێ نوێژەکەت ئەنجام بدەی و بیکەی و حیساب بۆ بەرامبەرەکەت نەکەی چونکە ئەوە عیبادەتی الله تعالی یە و لەسەرتە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوە و ئەبو جەهل وەستایەوە گوتی هەموو جارێ دێم لێرە کڕنۆش دەبەم بۆ خوای پەروەردگارم و وە حیسابت بۆ ناکەم، ئینجا ئەو پێغەمبەر کە تەهدید دەکا (ﷺ) هەڕەشەی لێدەکا الله تعالی یش دەفەرموێ ئەگەر وازی نەهێنابا: ﴿سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ﴾ [العلق: ١٨] ئێمە بانگی فریشتەی دەرگاوانی جەهەننەم و سەرپەرشتیاری جەهەننەم مان دەکرد لەسەر دەم و نێو چاوان ئەبو جەهلیان هەر لە دونیادا ڕاکێشابا بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، ئینجا الله تعالی ئەمریش دەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ بە قسەی ئەبو جەهل مەکە: ﴿وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب﴾ [العلق: ١٩] هەردەم کڕنۆش و سوجدە بۆ من ببە و لێم نزیک بەرەوە و قسەکانی ئەبو جەهل جێبەجێ مەکە.

جا لەو ئایەتەدا سەلمێندرا کە الله تعالی دەبینێ هەموو شتێک دەبینێ کە فەرموی: ﴿أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى﴾ [العلق: ١٤] واتە ئیستیفهامێکە پرسیارێکە دەیکا الله تعالی بۆ جێگیر کردنی سیفەتی بینینە بۆ خۆی، کە دەفەرموێ ئایە نازانێ ئەبو جەهل کە ئێمە دەیبینین ئەو هەڵسوکەوتە دەکا؟ بەڵێ دەبێ هەموو کەس بزانێ کە الله تعالی هەموو شتێک دەبینێ.

لە ئایەتەکەی شەشەم کە بە بەڵگەی هێناوەتەوە ابن تيمية -رحمه الله- بۆ جێگیر کردنی سیفەتی سەمیعایەتی الله تعالی -جل شئنه- وە بینینی الله تعالی دەفەرموێ: ﴿الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ * وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ * إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ [الشعراء: ٢١٧ - ٢١٩] الله تعالی پێغەمبەر دەدوێنێ (ﷺ) لەو ئایەتە دەفەرموێ ئەو خودایەی ئەی موحەمەد (ﷺ) کە تۆ دەبینێ و تۆی لێ دیارە ئەو کاتەی تۆ هەڵدەستیتەوە لە شەوان بۆ شەو و نوێژی و

عیبادەتەكان بۆ پەرستشی الله تعالى: ﴿وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ﴾ وە كە دەچیتە ناو هاوەڵەكانیش ئەوان كاتێک نوێژی بە جەماعەتیان لەگەڵ دەكەی و لە ڕیزی ئەوانەوە دەیانبینی و پەیدا دەبی تۆ لە ناویان و دەچیتە ناویان كە هەموتان دەچنە كڕنۆش بۆ الله تعالى بە یەكەوە و بە جەماعەت ئەو كاتیش هەر دەتبینێ الله تعالى هاوەڵەكانیش دەبینێ چونكە: ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ الله تعالى بیسەرە و وە زانایە.

لە پاشان لە ئایەتەكەی حەوتەم كە ابن تيمية بە بەڵگەی هێنایەوە بۆ جێگیر كردنی ئەو سیفەتانەی الله تعالى سەبارەت بە بینینی الله تعالى بۆ شتەكان الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ [التوبة: ١٠٥] الله تعالى لەو ئایەتە بەندەكان هاندەدا دەفەرموێ ئێوە كار و كردار بكەن ئیشی خۆتان بكەن مەڵێن وەڵا ئەوە چۆن دەبێ ئێمە ئەگەر بمانەوێ حوكمی ئیسلام بگەڕێنینەوە زاڵم و طاغوتەكان ئەوەندە دەسەڵاتدارن ئێمە چیمان پێ دەكرێ؟ و موستەزعەفین ژێر دەستەین، نا دەست بكەن بە ئیش و كارەكانی خۆتان عیلم و زانستیەكە پەیدا بكەن وە دەعوە و بانگەوازی لەگەڵ خەڵكی بكەن ئینجا مەڵێ من وەڵا چۆن دەتوانم بخوێنم تەمەنێكم بەسەر بردوە عیلم و زانستی پەیدا بكەم تازە چی فێر دەبم؟ هەریەک لە ئیشە چاكەكان الله تعالى بەندەكانی هاندەدا لەسەر ئەوە دەفەرموێ ئێوە كار بكەن: ﴿فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ﴾ جا لەپاش كار كردنەكەی ئێوە الله تعالى كارەكانی ئێوە دەبینێ كە ئێوە دەیكەن و ئەنجامی دەدەن وە پێغەمبەریش (ﷺ) وە بڕوادارانیش چونكە كە تۆ كارەكەت كرد هەم الله دەیبینێ -جل شئنە- هەم لە پێغەمبەریش بەدیار دەكەوێ (ﷺ) كار و كردەوەكەت كە دەبێتە واقیع و تەماشای دەكەن وە بڕوادارانیش بە چاو دەیبینن تۆ چ كارێک دەكەی، ئینجا الله تعالى لەسەر چاكیەكان پاداشتت دەداتەوە پشتگیریت لێ دەكات سەرت دەخا.

بەڵگەش لەو ئایەتە: ﴿فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ﴾ یەعنی الله تعالى دەیبینێ كردەوەكانتان لەپاش ئەوەی ئەنجامی دەدەن، كەواتە بینین بۆ الله تعالى سیفەتێكە جێگیرە بەگوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەو ئایەتەشیان بەڵگەیەكە لە بەڵگەكان.

كەواتە ئەهلی سونە و جەماعە دەیسەلمێنن كە الله تعالى سەمیعە خاوەنی سەمعە و دەبیستێ بە ورد و درشتی شتەكانەوە، هەندێک جار سەمیعایەتیەكەی و بیستنەكەی الله تعالى بە ورد و درشتی وەكو دەڵێت الله تعالى: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا﴾ [المجادلة: ١] وە هەندێک جاریش بۆ ئەوەندەی جێگیر دەكا بۆ سەرخستنە و پشتگیری كاریكردن و پاراستنە بۆ بڕوادارەكان وەكو دەفەرموێتە موسا و هارۆن (عليهما الصلاة والسلام): ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ [طه: ٤٦] وە هەندێک جاریش بۆ تەهدید كردنە وە سەرزەنشت كردن و هەڕەشە كردنە وەكو الله تعالى دەربارەی فینحاس و ئەوان دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ﴾ [آل عمران: ١٨١] (پەنا بە خوای رب العالمين) ئەوەش هەڕەشەی خواییە بە مەعنای لەسەریان ناچێ الله تعالى ئەوەی بیستوە و وە لەسەریان دەنوسێ و تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە.

جا بینینی الله تعالى یش لە كۆتایی ئەو بڕگانەدا ئەوەی دەڵێین كە هەندێک جار بەندەكان ئەگەر بگەنە ئەو ئاستە كە هەستی ئەوە بكەن الله تعالى دەبینن -جل شئنه- ئەوە زۆر گرنگە و پلەیەكی زۆر پلەدارییە لە عیبادەت و پەرستشدا، كاتێ كە پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیحسان ناوی دەبا كە دەفەرموێت: «الْإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ» ئیحسان و چاكەكاری و پلەی بەرزی بڕواداری لە عیبادەت و پەرستشدا ئەوەیە تۆ الله تعالى بپەرستی هەر وا دابنێی اللهت لێ دیارە و دەیبینی بڕوادارە ڕاستەقینەكان ئەوەندە دڵنیا دەبن لە عەقیدە ئەوەندە الله دەناسن -جل شئنه- ئەوەندە لێی نزیک دەبنەوە هەردەم وا هەست دەكەن وا الله تعالى لەبەر چاویانە و الله تعالى دەبینن، عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وایە زۆر كورتە پوختە بە ڕێک و پێكی كە ئەنەهو تۆ الله تعالى دەبینی -جل شئنه-، پلەی هەرە بەرزی

ئیحسان وا بکەی تۆ الله دەبینی پلەی نزمتر لەو هەر لە ئیحسانەوە ئەویش ئەوەیە: «فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ[١]» بزانی ئەو بەردەوام دەتبینێ و چاودێرە بەسەرتەوە، جا ئەوە گرنگە و موهیمە لە خۆمان بیهێنینەجێ و ئەوەش بەوە دەبێ کە زیاتر الله بناسین بە ناو و سیفەتەکانیەوە.

**جێگیر کردنی سیفەتی (المكر والكيد) لە قورئاندا:**

وَقَوْلُهُ: ﴿وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ [آل عمران: ٥٤]، وَقَوْلُهُ: ﴿وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ [النمل: ٥٠]، وَقَوْلُهُ: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا * وَأَكِيدُ كَيْدًا﴾ [الطارق: ١٥-١٦].

---

جا ئەو ئایەتانە بۆ ئەوە هێناویەتیەوە ابن تیمیة -رحمه الله- کە ئەهلی سونە و جەماعە بەو ئایەتانە ئەوە جێگیر دەکەن و دەیسەلمێنن کە الله تعالی سیفەتی مەکرِ و کەیدی هەیە بەڵام ڕونکردنەوەی دەوێ نابێ بە موتڵەقی و ڕەهایی بڵێین الله تعالی کەید و مەکری هەیە وە یان ناو بۆ الله تعالی دابتاشین لەو سیفەتانە، ئەگەر بڵێین الله مەکری هەیە بتوانین بڵێین الله ماکیرە (پەنا بە الله تعالی) -جل شئنه- ئەوانە ڕەتکراوەن لە الله تعالی تەنها وەکو سیفەتەکەی بەو قەید و تایبەتماندیانەوە کە الله تعالی هێناوێتی بۆخۆی دەبێ بگوترێتەوە نابێ زێدە ڕەوی تێدا بکرێ.

الله تعالی لە ئایەتەکەی یەکەم کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ﴾ [الرعد: ١٣] بۆخۆی بڕیار دەدا الله تعالی دەفەرموێ الله شەدید بە مەعنای توند و تیژی دێ یان بە مەعنای زۆری دێ لە زمانی عەرەبیەوە وە میحالیش بە مەعنای عقوبە دێ بە مەعنای تۆڵە سەندنەوە دێ، یەعنی الله تعالی توند و تیژە لە تۆڵە سەندنەوەکانیدا، کەسێک ئەگەر کافربێ و پێداگری لەسەر کوفرەکەی بکا بێدین بێ و عینادبێ لەسەر کوفرەکەی وەکو ئەبو جەهل وەکو فیرعەون ئەوانە الله تعالی لەگەڵیان: ﴿شَدِيدُ الْمِحَالِ﴾ە بە مەعنای

[١] **صحيح البخاري** (٤٧٧٧) (٥٠) (١٣٩٧) (٧١٢١)، **صحيح مسلم** (٩) (١٠) (١٤)، **سنن النسائي** (٤٩٩١).

ئەوەی توند و تیژە لە تۆڵە سەندنەوە لێیان چونکە ئەوان توند و تیژن پێداگرن لەسەر کوفر و بێ بڕواییەکانیان و وە لەسەر دژایەتی الله تعالى -جل شئنه-.

وە لە پاشان ابن تيمية ئەو ئایەتەی بە بەڵگە هێناوە: ﴿وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ [آل عمران: ٥٤] ئەوە مەبەست پێی جولەکەکانە جولەکەکان پیلانی شەهید کردن و کوشتنی عیسا پێغەمبەر (ﷺ) دایان ڕشت و دایاننا ویستیان کە عیسا بکوژن (ﷺ)، جا الله تعالى ئەو ئایەتەی بەوە دابەزاند کە دەفەرموێ ئەوان لە پیلاندا بون مەکریان گێڕا، جا مەکر زانایانی ئەهلی لوغە دەفەرمون چیە؟ مەکر بە واتای چی دێ؟ مەکر بەو واتایە دێ کە ئەگەر لە ژێر بە ژێرییەوە شتێک بکەی بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەت تەواو نەزانێ لە کۆتایدا تۆ زاڵبی بەسەریدا و پیلانێکی لێ بگێڕی و لە پاشانەکە زەرەر و زیانی پێ بگەیەنی ئەوە زیاتر بە مەکر دەگوترێ لە زمانی عەرەبیدا، ئینجا الله تعالى -جل شئنه- دەفەرموێ لە پیلاندا بون جولەکەکان لە عیسا پێغەمبەر (ﷺ) بە حیسابی خۆیان فێڵیان دەکرد لە الله تعالى یش بەو پیلانە بەڵام: ﴿وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ [آل عمران: ٥٤] الله تعالى چاکترین هەڵوەشێنەرەوەی پیلانەکانە و تۆڵەسێنەرەوەیە لە پیلانەکان لە بەرامبەریان چۆن ئەوان ئەنجامیان داوە ئەویش ئاوا تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە.

جا الله تعالى ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون نەیگوتوە وشەیەکی تر بەکار بێنێ دائیمەن خەیری بەکار هێناوە چونکە هی الله تعالى پیلان نیە بە مەعنای کەم و کورتی یان بە مەعنای تۆڵەسەندنەوەیەکی بێ مەعنای پیلان دارێژ وەکو مرۆڤەکان کە دەیکەن یان لەسەر ناحەق و ناڕەوایی لەبەر ئەوە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ چونکە مەکرەکەی الله تعالى چیە؟ چاکەیە تەواویەتە کەمالیەتە تۆڵەسەندنەوەیە لەبەرامبەر ئەو مەکر و خیدعانەی کە کافر و بێ بڕواکان دەیکەن لەبەر ئەوە خەیریەتی پێوەیە هی الله تعالى -جل شئنه- ئەوەی نیە الله تعالى بفەرموێت یانی الله تعالى زۆر مەکر دەکات یان

تەئکید کردنەوە بۆ مەکرەکەی تێدابێ نا مەکرەکانی الله تعالی خەیرە هەموو جارێک ئەهلی سونە و جەماعە ئەوەی لێ وەردەگرن.

کەواتە جولەکەکان چیان کرد؟ کۆبونەوە لە نێوان یەکتردا پیلانێکیان دارِشت گوتیان عیسا دەکوژین لە کۆڵی دەکەینەوە، جا هەڵوەشاندنەوەی پیلانی ئەوان بە چی بوو لەلای الله تعالی یش مەکرەکەی الله تعالی؟ ئەوەبوو نەیهێشت ئەوان پیلانەکەیان سەربگرێ کەسێکی تری هاو وێنەی عیسای پێ نیشاندان و داینە بەردەستی کە هەندێک لە موفەسیرین دەڵێن لە خۆیان بوو ئینجا ئەویان گرت و لەجیاتی عیسا صەڵبیان کرد و لە خاچیاندا و کوشتییان نەیانتوانی کارەکەیان بەرامبەر بە عیسا (ﷺ) جێبەجێ بکەن، جا الله تعالی کە دەفەرموێ: ﴿وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡ﴾ [النساء ١٥٧] ئەوەبوو مەکرەکەی الله تعالی کە دەفەرموێ جولەکەکان دەڵێن ئێمە مەسیح عیسای کوڕی مەریەممان کە ڕەوانەکراوی اللهیە کوشتمان بەڵام ئەوان نەیان کوشت ئەوان لە جاچیان نەدا ئەوەی کە کوشتیان و لە خاچیاندا کەسێک بوو کە الله تعالی بە عیسای چواند و ئەوان ئەویان برد و پیلانەکەیان هەڵوەشایەوە ئەوە مەکری الله تعالی بوو بەرامبەریان بەس: ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ الله تعالی دەفەرموێ هەستیشی پێ ناکەن: ﴿وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ [النمل: ٥٠] هەستیشیان پێ نەکرد بە مەکری الله تعالی.

کەواتە مەکرەکانی الله تعالی کە هەڵوەشاندنەوەی مەکر و خیدعە و کەیدی دوژمنی ئیسلام و کافر و جولەکە یان قەومی ساڵحە ئەوان زۆرجار هەستیشی پێ ناکەن کە هەڵیدەوەشێنێتەوە کە قەومی ساڵحیش چیان کرد؟ هەستان: ﴿وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا﴾ پیلانێکیان دارِشت مەکرێکیان دارِشت لەنێوان یەکتردا مەشوەرەتیان بە یەکتر کرد پیلانەکەیان لە چیبوو؟ لەوەدا بوو کە گوتیان با ئێمە ساڵح بکوژین لە ناوی ببەین، جا الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا﴾ ئێمەش لە بەرامبەر مەکرەکانی ئەوان مەکرێکمان کرد بە

مەعنای ئەوەی لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنە- بەڵام ئەوان هەستیان پێ نەکرد ئەویش چیبوو؟ الله تعالی سالّح پێغەمبەری (ﷺ) قوتار کرد لە دەستیان و نەیانتوانی پیلانەکە جێبەجێ بکەن.

وە لە پاشان هەندێک جار مەکری الله تعالی ئیستدراج کردنی کافر و بێ بڕواکانە یەعنی زیاتر دەیانهێنێتە ناو کوفر و بێدینیەکەیان کە ئەوان بە دەستی خۆیان ئەو کوفر و بێدینیەیان هەڵبژاردوە کە پیلان دادەڕێژن وەکو الله تعالی دەفەرموێ: ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [الأعراف: ١٨٢] کافر و بێ بڕواکان هەندێک جار ئێمە هێواش هێواشبدەیان هێنین نغرۆیان دەکەین لەناو بێدینی و کوفری و گومڕاییەکەیان کە بەدەستی خۆیان ئەو ڕێگایەیان هەڵبژاردوە بەبێ ئەوەی ئەوان هەستی پێبکەن و بیزانن.

پێغەمبەریش دەفەرموێ (ﷺ): «إذا رأيت الله يعطي العبد وهو مقيم على المعاصي» ئەگەر بینیت الله تعالی ببەخشێ بە کەسێکی تاوانکار ئەویش بەردەوامبێ لەسەر تاوانەکەشی پێت وابێ الله تعالی شتی پێ بەخشیوە، وەکو زۆرجار (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەو کوفری و بێ بڕواییانە یان وشەی نەشیاو لەنێوان میلەتی کوردیش کاتی خۆی دەگوترا سەبارەت بە سەدام حوسێن کە دەگوترا ئەوەندە زاڵمە ئەوەندە ستەمکارە ئەوەندە بێدینە، هەبوو ئیمان لاوازبوو یان بێ بڕوا بوو دەهات لەناو کوردەکان چی دەگوت هەبوو لە کوردەکانیش دەیگوت، بزانە الله ئەو هەموو شتەی پێداوە ئەو هەموو شتەشی داتێ لەسەر کەواتە تاوان بکەی ئینجا باشتر پێت دەبەخشێ (پەنا بە خوای رب العالمین)، پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ئەگەر تۆ بینیت الله تعالی بە بەندەیەکی دەبەخشێ ئەو بەندەیەش بەردەوامە لەسەر گوناح و تاوانەکانی یەعنی فەزڵێکی لەگەڵ دەکا بەخششێکی پێ دەبەخشێ «فاعلم أنه استدراج[1]» بزانە ئەوە ئیستیدراجە لەلای الله تعالی ئەوە نەبێ

[1] أخرجه أحمد في المسد (٤/ ١٤٥) بسند ضعيف؛ فيه رشدين بن سعد. هەرچەندە هەندێک لە زانایان و موحەدیسین دەفەرمون زەعیفە بەڵام ماناکەی ڕاستە.

پشتگیری كاری بێ بۆ ئەو بەندەیەی ئەوە نەبێ سەرخستنی بەندەكەیێ ئەوە نەبێ الله تعالی لەگەڵ زوڵم و ستەمەكەیدابێ بەڵام جڵەو درێژ كردنە بۆی هەتا هێواش هێواش زیاتربێ ئایە دەگەڕێتەوە تەوبە دەكا؟ یان لەسەر كوفرەكەی بەردەوام دەبێ؟ كەواتە ئیستیدراج زیاتر زانایان دەفەرمون بە مەعنای ئیمهال دێ یەعنی وازلێهێنان و ماوەیەک مۆڵەتدان ئایە چی دەكا لەناو كوفر و بێدینیەكەی؟ و تۆزێک الله تعالی یان ماوەیەک عەزابەكەی خۆی لەسەری و گرتنەوە لێی دوای دەخا، وەكو ئەو فەرمودەش كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: «إِنَّ اللَّهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ[1]» الله تعالی هەندێک جار جڵەو بۆ زاڵم و ستەمكاران درێژ دەكا لەناو زوڵم و ستەمەكەیان ئایە بگەڕێنەوە ئەگەرنا حوجەبێ لەسەریان ئەگەر ماوەیەک دەتوانن زوڵم و ستەم بكەن ئەوە مۆڵەتە الله تعالی دەیانداتێ بەڵام ئەگەر بیانگرێ لە دەستی الله ڕزگار بونیان نیە -جل شئنه- بە گرتنێک دەیانگرێ ناتوانن ڕابكەن و تۆڵەی تەواویان لێ دەستێنێتەوە.

جا ئاخیر ئایەت كە ابن تیمیة -رحمه الله- بە بەڵگە هێناویەتیەوە بەوەی الله تعالی خاوەنی سیفەتی كەیدیشە بەوەی لێی دەوەشێتەوە بە مەعنایە حەقیقیەكەی كە هەڵوەشێنەرەوەی كەیدی كافر و بێ بڕواكانە لە بەرامبەریان بەو قەیدانەی كە الله تعالی بۆخۆی بڕیاری داوە ئاوا دەبێ واتای بكەین وە بڵێین بەوەی لە الله دەوەشێتەوە: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا * وَأَكِيدُ كَيْدًا﴾ [الطارق: ١٥- ١٦] الله تعالی فەرموی كافر و بێ بڕواكان لە كەید و پیلان گێڕیدان وە ئێمەش لە بەرامبەریان لە كەیدداین و هەڵوەشێنەرەوی كەیدەكانی ئەوان دەبین.

جا ئەوە بۆ الله تعالی -جل شئنه- دەبێ جێگیری بكەین و ئەهلی سونە و جەماعە جێگیریان كردوە بەڵام نابێ بەهیچ جۆر و شێوازێک ئەهلی سونە و جەماعە یەكدەنگن لەسەر ئەوە ئێمە لە كەید بڵێین الله تعالی كائیدە (پەنا بە خوای رب العالمین) وە ناوی بۆ هەڵبژێرین لە

[1] صحيح البخاري (٤٦٨٦)، صحيح مسلم ( ٢٥٨٣ )، سنن الترمذي ( ٣١١٠ ).

مەکر بڵێین الله ماکیرە لە خیدعەی الله کە بۆخۆی وەکو فیعلێک ئەگەر بڕیاری بدا ئێمە بڵێین الله تعالی خادیعە (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەوانە دروست نیە لە ئیستیهزا کە بە کافرەکانی دەکاتەوە الله تعالی یان بە مونافیقەکان بڵێین الله تعالی موستەهزیئە (پەنا بە خوای رب العالمین) نابێ ئەو ناوانە بگوترێ بە هیچ شێوازێک تەنها دەبێ وەکو قەید الله تعالی وەکو فیعل چۆنی بۆخۆی بەکار هێناوە ئێمەش هەر ئەوەندە بڵێین و زیاتری لەسەر نەڕۆین و بڵێین بە مەعنایە حەقیقیەکانی کە لە الله دەوەشێتەوە بڕیاری بدەین و چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین وە ناویش بۆ الله تعالی لەو فیعل و سیفەتانەی الله تعالی داناڕێژین و نایهێنینەوە.

جا ئەهلی سونە و جەماعە دەش فەرمون ناکرێ و ناشێ ئێمە بڵێین الله تعالی -جل شئنە- بەو مانایەیە کە مەخلوق و بەدیهێنراوەکان لە مەکر و لە کەید هەیانە چونکە الله تعالی -جل شئنە- زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا -جل شئنە- توانایە، وە الله تعالی بێ باکە بێمنەتە لە هەموو کەس و شتێک موداڕات و موجامەلە و پێویست نیە لە ژێر بە ژێری شتێک بکا و لە سەرەوەش شتێکی تر چونکە مەکر و کەید زیاتر ئەوەیە هەتا وەکو زەڕبە و تۆڵە سەندنەوەیەک یان پیلانگێڕییەک لە بەرامبەرەکان لەلایەن کەسان و مەخلوق و مرۆڤەکان، جا الله تعالی -جل شئنە- لە بەرامبەر ئەوان دەیکا و ئەنجامی دەدا بە ڕاشکاوانە بە عەلەنی بەبێ ئەوەی موجامەلە و موداڕاتی تێدابێ بێباکە لێیان کە ئەوان فرت و فێڵ دەکەن کەید دەکەن پیلان گێڕی دەکەن الله تعالی یش مەکر و کەید دەکا لە بەرامبەر کەید و مەکرەکانی ئەوان هەڵیان دەوەشێنێتەوە زۆر بە ئاشکرایی وە هەندێک جار پیلانەکە بەسەر خۆیان دەگێڕێتەوە وە الله تعالی -جل شئنە- ئاشکرایانە بەبێ ترس و بەبێ باکی ئەنجامی دەدا (والله أعلم).

**جێگیر کردنی سیفەتی (العفو والمغفرة والرحمة) له قورئاندا:**

وَقَوْلُهُ: ﴿إِن تُبْدُواْ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُواْ عَن سُوَءٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ [النساء: ١٤٩]، ﴿وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [النور: ٢٢].

---

جا لێرەدا لەو ئایەتانە جێگیرە بۆ الله تعالی کە الله تعالی لە کۆتایی فەرموی: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ [النساء: ١٤٩] الله تعالی عەفوە بە مەعنای زۆر عەفو دەکا و دەبورێ الله تعالی -جل شئنه- وە قەدیرە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتەکان، وە لە ئایەتەکەی تریش فەرموی: ﴿وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا﴾ [النور: ٢٢] جا با ئیمامی ئەبو بەکر لێبوردەبێ و عەفو بکا پەڕێکی نوێ وەکو بڵێی هەڵداتەوە و دڵی پاککاتەوە ئایە حەزیان لێ نیە و پێیان خۆش نیە الله تعالی لێیان ببورێ و وە الله تعالی لێبوردەی بەزەییە.

جا لەو ئایەتەی یەکەم الله تعالی -جل شئنه- سیفەتی عەفوی بۆخۆی جێگیر کردوە کە الله تعالی فەرموی: ﴿إِن تُبْدُواْ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُواْ عَن سُوَءٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ [النساء: ١٤٩] جا یەکێک لە ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالی یش عەفوە الله تعالی سیفەتی عەفوی لێ وەردەگیرێ بە مەعنای لێبوردەیە و دەبورێ الله تعالی عەفو دەکا بەرامبەرەکانیان هەندێک جار ئەگەر هەڵەی لەگەڵ بکەن.

پێغەمبەریش ئەوەی جێگیر کرد بۆ الله تعالی (ﷺ) کە دەفەرموێ: «اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ؛ فَاعْفُ عَنِّي[١]» ئەی خوای پەروەردگارم تۆ عەفوی واتە یەکێک لە ناوە زۆر جوانەکانت عەفوە وە سیفەتی عەفوی لێ وەردەگیرێ و دەبوری و عەفو دەکەی وە عەفوشت خۆش دەوێ لەبەر ئەوە لێم خۆشبە و عەفوم بکە.

جا عەفو پێناسەکەی ئەوەیە بە مەعنای لە هەڵەکانی بەرامبەرت ببوری چاوپۆشی لێبکەی ئەوە لەناو مرۆڤەکاندا کاتێک یەکێک هەڵەت لەگەڵ دەکا چاوپۆشی لێبکەی لێی ببوری لەسەری حیساب نەکەی هەڵە و کەم و کورتیەکان ئەو کاتە دڵی لەگەڵ پاکەیتەوە، بۆ

[١] **سنن الترمذي** (٣٥١٣)، **سنن ابن ماجه** (٣٨٥٠)، **مسند أحمد** (٢٥٣٨٤) (٢٥٤٩٥) (٢٥٤٩٧).

الله تعالى یش بە مانای ئەوە دێ الله تعالى کە ببورێ لە هەڵە و کەم و کورتیەکان وە لەسەریان حیساب نەکات و کەسێک کە هەڵە دەکات ئەوە عەفوایەتی الله تعالى یە -جل شئنە- بەرامبەر بە بەندەکان.

وە لە ئایەتەکەی دوەم الله تعالى-جل شئنە- فەرمان دەکا بە ئیمامی ئەبو بەکر ئەوەش لەو ڕوداوە بوو کە بوختانەکە بە عائیشە کرا -رضي الله عنها- کاتێ کە گوتیان (پەنا بە خوای رب العالمين) کە دەستی بێ بڕوایان و مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکانی تێدابوو هەندێک موسڵمانیش پێیوە هەڵخەڵەتان کە دایکە عائیشە گوایە هەڵەی کردوە و کارێکی ناشیاوی بەدڕەوشتی کردوە (پەنا بە خوای رب العالمين) لەبەر ئەوە ئیمامی ئەبو بەکر یەکێک لەو کەسانەی کە لێی نزیک بوو کە نەفەقەی پێ دەبەخشی و بەخێوی دەکردن ناوی مسطح کوڕی أثاثة بوو ئەو پیاوە لەلای ئیمامی ئەبو بەکر بوو چونکە قسەکەی ئەویش گوترا بۆ ئیمامی ئەبو بەکر کە بڕوای کردوە ئەو بوختانەی کە بە دایکە عائیشە کراوە ئەویش بڕوای کردوە و ڕەنگە بڵاوی کردبێتەوە تا ڕادەیەک ئیمامی ئەبو بەکر لە دڵی خۆی داینا بە قسەش گوتی تازە جارێکی تر من ئەو چاکەی لەگەڵ ناکەم ئەو پارە و پولەی پێی دەبەخشم ئەو بەخێوکردنەی بۆی دەکەم لەسەری دەبڕم جا الله تعالى ئەو ئایەتەی دابەزاند و فەرموی: ﴿وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُوا۟ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓا۟ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ﴾ نەکەن بیبڕن لە کۆتایەکەیش فەرموی: ﴿وَلۡيَعۡفُوا۟ وَلۡيَصۡفَحُوٓا۟﴾ الله تعالى فەرموی با لێبوردە بن عەفو بکەن وە لە پاشان دڵیان لەگەڵی پاک کەنەوە چونکە ئایە حەزیان لێ نیە و پێیان خۆش نیە: ﴿أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾ ئایە ئەبو بەکر و سەحابەکان ئێوە پێتان خۆش نیە الله تعالى لێتان ببورێ و لێتان خۆشبێ ئێوەش هەڵە و کەم و کورتیتان هەیە: ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ [النور: ٢٢] وە الله تعالى لێبوردەی بەزەییە، جا ئیمامی ئەبو بەکر کە ئەو ئایەتەی پێگەیشت دەم و دەست دڵی خۆی پاککردەوە وە لە مسطحی بوری وە نەفەقە و پێبەخشینەکەی لەسەر بەردەوام کرد.

ئەو ئایەتانە بەڵگە بون لەسەر ئەوەی ابن تیمیة -رحمه الله- هێنایەوە كە الله تعالی خاوەنی سیفەتی عەفوە وە لێبوردەیە ئەو دەبورێ لە گوناح و تاوانەكان وە خاوەنی سیفەتی ڕەحمە بەزەییە، جا ئەو سیفەتانەش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بە مەعنایە حەقیقی و ڕاستیەكەی خۆیان دێن نەك واتایان بگۆڕین و تەئویلیان بكەین یان وەكو جەهمیەكان پەكی بخەین و بڕیاری نەدەین بۆ الله تعالی، بەس ئێمە چۆنیەتیەكەی نازانین چۆنیەتیەكە كە لە الله -جل شئنە- دەوەشێتەوە ئێمە عیلم و زانستیمان پێی نیە.

**جێگیر كردنی سیفەتی (العزة) لە قورئاندا:**

قَوْلُهُ: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ [المنافقون: ٨]، وَقَوْلُهُ عَنْ إِبْلِيسَ: ﴿فَبِعِزَّتِكَ لأغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ [ص: ٨٢].

---

جا ئەو ئایەتانە هەردوكیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە الله تعالی خاوەنی سیفەتی عیزەتە، سیفەتێك لە سیفەتەكانی عیزەتە، عیزەت دەبێ بۆ الله تعالی جێگیر بكەین.

عیزەت بە مانای چی دێ؟ بە مانای (الغلبة والقوة والمنعة) دێ بە مەعنای هێز و زاڵبون و قەدەغە كردن هەر شتێك كە نەیهەوێ سەربگرێ دەتوانێ قەدەغەی بكا چ زەرەر و زیانبێ بۆخۆی چ بۆ بەرامبەرەكانی خەڵكەكە والێبكا نەتوانن شتەكە ئەنجام بدەن، كەواتە بۆ الله تعالی بە مەعنای زاڵبونی تەواو بە مەعنای دەسەڵات و توانای تەواو دێ وە بە مەعنای هێزی تەواو دێ.

وە الله تعالی -جل شئنە- كە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلمُؤمِنِينَ﴾ [المنافقون ٨] ئەو ئایەتەش ئەو كاتە دابەزی كە سەرۆكی موناففەكان عەبدوڵای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلول ئەو كاتە لە یەك لە جەنگەكان كە ویستیان بگەڕێنەوە گوتی من دەچمەوە شاری خۆمان كە مەدینەیە ئێمەی ئەعەز (پەنا بە خوای رب العالمین) واتە ئێمەی زۆر خاوەن عیزەت و خاوەن دەسەڵات و توانا ئەوانەی ئەذەلن (پەنا بە خوای رب العالمین) مەبەستی پێی پێغەمبەر و (ﷺ) هاوەڵە بەڕێزەكانی بوو، واتە ئەوانەی زۆر زەلیلن بێ دەسەڵاتن

ئەوان دەردەکەین و دەردەخەین، جا الله تعالی ئەو ئایەتەی دابەزاند کە لە پاشان پێغەمبەریش (ﷺ) عەبدولاّی کوڕی عەبدولاّی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول کە ئەو بەڕاستی موسڵمان بوو هەڵوێست و مەوقیفی ئەوەی نواند ئیمانیانە کە بۆخۆی دەرگای مەدینەی لە باوکی گرت و گوتی تۆ واتگوتوە و ئایەت دابەزیوە و من لێت قبوڵ ناکەم هەتا نەڵێی ئێمە زەلیلەکانین و وە موحەمەد (ﷺ) ئەعەزەکەیە زۆر خاوەن عیزەتەکەیە دیارە ئەویش وایگوت، و مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان هەر وان لەسەرەوە هەندێک جار ئەگەر مەکر و خیدعە و پیلانەکانیان سەربگرێ قسەکان دەکەن و پێی لەسەر دادەگرن ئەگەر سەری نەگرت تەنازول دەکەن و سەریان شۆڕ دەکەن بێغیرەت و بێ جورئەتن، جا الله تعالی فەرموی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ﴾ عیزەت تەنها بۆ اللەیە و الله شایەنی عیزەتە کە هەیبێ: ﴿وَلِرَسُولِهِ﴾ وە پێغەمبەرەکەی الله تعالی ش الله تعالی عیزەتی پێ بەخشیوە و شایستەی ئەوەیە خاوەن عیزەت بێ: ﴿وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ وە بڕوادارەکانی ڕاستەقینەش هاوەڵانی پێغەمبەریش (ﷺ) تا ئەوانەش خاوەنی عیزەتن الله تعالی پێی بەخشیون واتە زاڵن بەهێزن وە خاوەن توانان.

وە لە پاشان لە ئایەتەکەی دواتر الله تعالی دەفەرموێ ئیبلیس گوتی: ﴿فَبِعِزَّتِكَ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ [ص: ٨٢] بە عیزەتی تۆ سوێند ئەی خوای پەروەردگار ئەوانە گومڕا دەکەم نغرۆ دەکەم لا ڕێیان دەکەم نغرۆیان دەکەم لەناو لاڕێبون و گومڕایی هەر هەمویان ئیلا ئەو بەندانەی یەکلا بونەتەوە بۆ تۆ موخلەصن ئەوانە ناتوانم و دەسەڵاتم بەسەریاندا نیە الله تعالی جیای کردنەوە.

جا لێرەدا کەواتە شەیتان عیلم و زانستی هەبوە لە الله نزیک بوە چاک چاک دەزانێ الله تعالی خاوەنی عیزەتە لەبەر ئەوە سوێند بە عیزەتی الله دەخوا، هەتا الله تعالی ڕێگای پێبدا مۆڵەتی پێبدا وەکو تاقیکردنەوە بتوانێ وەسوەسە و خوت خوتە و خەیاڵاتی خۆی ئەنجام بدا لەگەڵ بەندەکانی الله تعالی.

جا ئەهلی سونە و جەماعە لێرەدا لەطیفەیەکی خۆش دەڵێن وە حەقیشیانە جێگیری دەکەن دەڵێن شەیتان بە شەیتانی خۆی ئیبلیس هەندێک جار اللەی چاکتر ناسیوە وە دەشناسێ سیفەتەکان بۆ اللە بڕیار دەدا وە جێگیر دەکا چاکتر لە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان و فیرقەکانی تر کە ئەو بابەتە ناو و سیفەتانە بۆ اللە تعالی جێگیر ناکەن بە مەعنایە حەقیقی و تەواویەکەی خۆی، ئەوەتا ئایەتی قورئانی پیرۆزە کە شەیتان وایگوتوە.

جا عیزەت سیفەتێکیشە بۆ اللە تعالی زیاتر ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون لە (العزیز) وەرگیراوە کە ناوی اللە تعالی یە -جل شئنە-، کە اللە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ [العنكبوت ٢٦] اللە تعالی عەزیزە عەزیز بە مەعنای زاڵ دێ زاڵە بەسەر هەموو شتەکان توانایە، ئینجا ئەل حەکیمیشە کار لەجێشە.

لەبەرچی زۆرجار لە هەندێک شوێن لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز عەزیز و حەکیم پێکەوە دێن؟ چونکە عەزایزایەتی و زاڵبون بەسەر شتەکان توانای ڕەهای ئاوا کە اللە هەیەتی -جل شئنە- ئەوەی لێ بیر دەکرێتەوە زوڵمی لێ بە بەرهەم بێ چونکە بەندەکان مرۆڤەکان کاتێک زاڵن بەسەر شتەکان و توانایان زۆرە چیش دەکەن؟ زوڵم و ستەم دەکەن بەهۆی ئەو توانایە و زاڵبونەیان، جا اللە تعالی دەیەوێ سەدا سەد ناوە زۆر جوانەکانی خۆی کە پێکەوە دەیانهێنێ کەمالیەتی تەواویەتی پێ ببەخشێت و نیشان بدا بە ئێمە اللە تعالی زاڵێکی خاوەن حیکمەتە ئەل حەکیمە کارلەجێیە، یانی زاڵایەتیەکەی و دەسەڵاتەکەی لە شوێنی خۆی بەکار دەهێنێ نەک لە زوڵم و ستەمدا (پەنا بە خوای رب العالمین) بۆ ئەوەیە لەگەڵ یەکتر دێ، وە عەزیز کردن و عیزەت بەخشینیش هەر لە دەست اللە تعالی یە لەبەر ئەوە دەبێ ئێمە لەبەر اللە بپارێیتەوە خوایە بەعیزەتمانکەی خوایە عیزەتمان پێ ببەخشی خوایە زاڵمانکەی بە دەسەڵاتمان بکەی بەرامبەر بە کافر و بێ بڕواکان چونکە اللە تعالی دەفەرموێ: ﴿وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ﴾ [آل عمران: ٢٦] اللە تعالی یە کە عیزەت

دەبەخشێ بە هەرکەسێک کە بیەوێ پێی ببەخشێ وە هەندێک جار زەلیلی دەکا واتە سەرشۆڕی دەکا ڕسوای دەکا هەرکەسێک کە بیەوێ وای لەگەڵ بکا.

وە زۆر جار هەیە خەڵکانێک وا سوێند دەخۆن دەڵێن بە ڕەبول عیزەت یانی لە عەرەبیشدا (ورب العزة) ئایە ئەو سوێندە دروستە یانە نا؟ ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون دروستە چونکە الله تعالى خۆی بۆخۆی بڕیاری داوە دەفەرموێ: ﴿سُبۡحَـٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا یَصِفُونَ﴾ [الصافات ١٨٠] کەواتە وەکو ناو و سیفەتێک بۆ الله تعالى ئەگەر بڵێی ڕەبول عیزە یانی الله تعالى ی خاوەن عیزەت بە مەعنای ئەوە دێ الله تعالى -جل شئنه- (ورب العزة) یانی خاوەنی قوەت و هێزە خاوەنی دەسەڵات و توانایە هەموو شتێکی لە تواناداهەیە بیکا زاڵە بەسەر شتەکان لەبەر ئەوە جائیزە و دروستە بۆ الله تعالى بگوترێ.

**جێگیر کردنی ناو بۆ الله تعالى و ڕەتکردنەوەی هاو وێنە و نمونە بۆ الله تعالى:**

وَقَوْلُهُ: ﴿تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ ذِي الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ﴾ [الرحمن: ٧٨]، وَقَوْلُهُ: ﴿فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا﴾ [مريم: ٦٥]، ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحد﴾ [الإخلاص: ٤]، وَقَوْلُهُ: ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ [البقرة: ٢٢]، ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ﴾ [البقرة: ١٦٥].

---

جا لەو ئایەتانە الله تعالى بۆخۆی جێگیری کرد کە الله تعالى خاوەنی ناوی زۆر جوانی بەرز و بەڕێزە وەکو الله بۆخۆی هاو وێنەشی نیە الله تعالى -جل شئنه- هەم لە ناوەکانی هەم لە سیفاتە بەرزەکانی هەم لە زاتیدا.

جا ئایەتەکەی یەکەم کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ﴾ تەبارەکە بۆ الله تعالى دەشێ و دەگونجێ بەکار بهێندرێ بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ناشێ بۆ مرۆڤەکان بەکار بهێندرێ مانایەکی زیاد دەبەخشێ بۆ مرۆڤەکان کە بڵێی فلان مرۆڤ تەبارەکە (تبارك هذا الرجل) ئەوە جائیز و دروست نیە بۆ ئەو دەبێ بڵێی (هذا الرجل مبارك) ئاوا جائیزە چونکە تەبارەکایەتی الله تعالى دەیبەخشێ بە مرۆڤەکە مرۆڤەکەی موبارەک

کردوە پیت و بەرەکەتی تێخستوە هەندێک جار ئەوە نەبێ بەخۆی بە دەستی هێنابێ، جا تەبارەکە بۆ الله تعالی بە مەعنای بەرز و مەزن بوو الله تعالی پاک و بێگەرد بوو لە هەموو سیفەتەکانی نەقس و کەم و کورتی بەڵام مرۆڤەکان قەتاوقەت ئاوا بەرز و مەزن نابن لە خۆیانەوە پاک و بێگەردیش نابن بە پیت و بەرەکەتیش نابن مەگەر الله تعالی پێیان ببەخشێ -جل شئنه-.

ئینجا الله تعالی دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ﴾ بەرز و مەزن بووەوە پاک و بێگەردی ناوی خوای پەروەردگارتانە ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، جا لێرەدا ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون دەتوانین بە دوو واتا تەفسیری ئەوە بکەین ئایە بە مانای ئەوەی بڵێین پیت و بەرەکەت لەگەڵ ناوی خوای پەروەردگارتە ئەی موحەممەد (ﷺ) واتە ناوی الله لەگەڵ هەرشتێکدابێ و بسم الله لەگەڵ هەر شتێک بگوترێ پیت و بەرەکەتی دەخاتە ناو یان بە مەعنای ئەوە دێ لێرەدا بە مەعنای هاو وێنەی نیە الله تعالی لە ناوەکەی کە اللەیە ناوی هەرە تایبەتی الله تعالی یە وە لە زاتیشیدا هاو وێنەی نیە -جل شئنه- بە مەعنای سەمی هاو وێنایەتی بەکار دەهێنرێ ئەو دوو واتایەی لێ دەگرن.

جا لە پاشان لە ئایەتەکەی تر الله تعالی فەرموی: ﴿فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا﴾ [مريم: ٦٥] الله تعالی دەفەرموێت مەبەستی پێ پێغەمبەرە (ﷺ) دەفەرموێ پەرستشی خوا و پەروەردگارت بکە ئەی موحەممەد (ﷺ): ﴿وَاصْطَبِرْ﴾ لە زمانی عەرەبی ئەگەر ئەوەی صەرفی خوێندبێ و شارەزابێ: ﴿وَاصْطَبِرْ﴾ کە حەرفی (ت) بوەتە (ط) لێرەدا بەو واتایە دێ ئەو گۆڕانکارییە یەعنی نەوعەن ما موبالەغەیەک دەداتە فیعل و کارەکە یانی فیعل و ئارامێکی زۆر بگرە لەسەر عیبادەت و پەرستشەکەش کە دەیکەی و ئەنجامی دەدەی ئەی موحەممەد (ﷺ)، ئەگەر بیگوتبا (وَاصْبِرْ) طائەکەی لەگەڵ نەبا سەبر و ئارامیەکە کەمتر بوو بەڵام: ﴿وَاصْطَبِرْ﴾ یانی سەبر و ئارامییەکی زۆر بگرە لەسەر عیبادەت و پەرستشەکە بەو حەرفی (ط) زیاتر ماناکەی بەخشی کە داوای صەبری زیاتری

لێدەکا، لە پاشان الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ﴾ سەبر و ئارامیەکی زۆرت هەبێ لە عیبادەتکردن و پەرستشی خوای پەروەردگارت: ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا﴾ [مریم: ٦٥] جا ئێمە دەبێ لە وەڵامدا هەمومان بڵێین و پێغەمبەریش وایفەرموە (ﷺ) بڵێین (لا) نەخێر نابینین هیچ هاو وێنەیەکی هەبێ الله تعالی، الله تعالی پرسیارە لێمان دەکا بەڵێ پێغەمبەریش (ﷺ) بە قسە و گوتنیش وە بە کرداریش سەلماندی لە ژیانی خۆی الله تعالی هاو وێنەی نیە شەریک و هاوبەشی نیە.

جا ئەهلی سونە و جەماعە لێرەش: ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا﴾ [مریم: ٦٥] دەڵێن دوبارە دەتوانین هەردوو مانای لێ بگرین و لێی بەدەست دێ الله تعالی لە ناوی تایبەتی خۆی کە اللهیە کەس ناتوانێ ئەو ناوە بەکار بێنێ تایبەتە بە الله تعالی بۆ کەسیش نیە وە کەسیش نەیتوانیوە بەکاری بێنێ چونکە الله بە مەعنای مەعبود و پەرستراوی ڕاستەقینەی شایستەی پەرستن دێ کەسیش ناتوانێ ئەو ناوەی لێبێ و ئەو سیفەتەی هەبێ لەبەر ئەوەی ناوێکی هەرە تایبەتی الله تعالی یە -جل شئنه-، هەندێک لە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون (اسم الله الأعظم)یشە لەوانە ئیمامی تەحاوی وە ابن القیم الجوزیة وە لە پاشان لە سەردەمیەکانیش شێخ عبد الله بن جبرین -رحمه الله- وە دکتۆر عمر بن سلیمان الأشقر یش پێیان وایە الله (اسم الله الأعظم)ە، وە بە مانای ئەوەش دێ یانی الله تعالی هاو وێنەشی نیە لە زاتی لە ناوە زۆر جوانەکانی لە سیفاتە بەرزەکانی: ﴿سَمِيًّا﴾ بەو مانایەش دێ.

وە لە ئایەتەکەی تر الله تعالی فەرموی: ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ [الإخلاص: ٤] واتە الله تعالی هیچ کەس و شتێک لە ئاستی ئەودا نیە هاو کوفی الله تعالی نیە ناتوانێ بگاتە ئاستی الله لە زاتی لە سیفاتی لە ناوەکانی بەڵکو الله تعالی تاک و تەنهایە.

وە لە پاشان لە ئایەتەکەی تر الله تعالی فەرموی: ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً﴾ [البقرة: ٢٢] بۆ الله تعالی ئەنداد بڕیار مەدەن ئەنداد جەمعی نیدە نید بە مەعنای هاو وێنە دێ جا چ لەڕوی

بە مەعنای شەبیە و مەثیل و شەریک دێ یانی شەریک و هاوبەش و هاو وێنە بۆ الله تعالی بڕیار مەدەن چ لە ئاستی خۆشویستندا نابێ کەست لە ئاستی الله خۆشبوێ چ لە هەموو شتەکانی تر چونکە الله تعالی دەفەرموێ و تەئکید دەکاتەوە: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ﴾ [البقرة: ١٦٥] هەیە لە خەڵکان بێجگە لە الله تعالی یان گەیاندوەتە ئاستی الله لەڕوی خۆشەویستیەوە وەکو الله خۆشیان دەوێن (پەنا بە خوای رب العالمين) کە موفەسیرین دەفەرمون وەکو الله خۆشیان دەوێن دوو مانای لێ وەردەگیرێ یان ئەوەیە کە لە ئاستی الله خۆشیان دەوێن ئەو کەسانە و ئەو شتانەشیان سەدا پەنجا خۆش دەوێ اللهشیان سەدا پەنجا خۆش دەوێ ئینجا سەدا سەدی خۆشەویستیەکەیان بۆ ڕێک دەکەوێ کردیاننە شەریک لەگەڵ الله تعالى لە خۆشەویستی یان ئەوەیە ئەوانیان بە قەد الله خۆشدەوێ بەو مانایەی چۆن بڕوادارەکان اللهیان سەدا سەد خۆشدەوێ ئەوانیش ئاوا سەدا سەد ئەو کەس و شتانەیان خۆش دەوێ (پەنا بە خوای رب العالمين) کە ئەوەشیان شیرکە و هاوبەشییە وە دروست نیە بەڵکو بڕواداران: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا أَشَدُّ حُبّا لِّلَّهِ﴾ ئەوانەی بڕواداری ڕاستەقینەن لەو موشریک و هاوبەشانە زیاتر خوای پەروەردگاری خۆیانیان خۆش دەوێ ئەوان چۆن بت و سەنەمەکانیان خۆشدەوێ لە چ ئاستێک بڕوادارەکان زۆر زیاتر اللهیان خۆشدەوێ -جل شئنه-.

## ڕەتکردنەوەی شیرك و هاوبەشی لە الله تعالى:

وَقَوْلُهُ: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ للّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَم يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلَّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾ [الإسراء: ١١١]، ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [التغابن: ١]، قَوْلُهُ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا * الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ [الفرقان: ١-٢]، وَقَوْلُهُ: ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ

مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ * عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ [المؤمنون: ٩١-٩٢]، ﴿فَلاَ تَضْرِبُواْ لِلّهِ الأَمْثَالَ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ [النحل: ٧٤]، ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ [الأنعام: ٣٣].

---

سەرەتا وەکو پێشەکی کورتەیەک باسی شیرک و هاوبەشی و جۆرەکانیتان بۆ بکەم:

شیرک و هاوبەشی یانی چی؟ شیرک و هاوبەشی یانی هاو وێنایەتی بڕیاردان بۆ الله تعالی کەسێک یان هەر شتێک بکەیتە شەریک و هاوبەش لەگەڵ الله تعالی بیکەیتە هاو وێنەی الله تعالی چ لە زاتدا چ لە سیفاتدا چ لە ناوە زۆر جوانەکانیدا، ئەوانە شەریکە و هاوبەشیە و ڕەتکراوەیە و دروست نیە.

تەوحید و الله بەیەکگرتن -جل شئنه- دەبێتە سێ جۆر و سێ بەش کە بە وەرگرتن و وردبونەوەی ئەهلی سونە و جەماعە لە قورئانی پیرۆز و وە لە فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ) هەڵیان هێنجاوە ئیستیقرائیان کردوە و دەڵێن سێ جۆر لە تەوحید و الله بەیەکگرتن هەیە کە (توحيد الربوبية، وتوحيد الألوهية وتوحيد الأسماء والصفات)، بە هەمان شێوە دەش فەرمون زانایانی بیروبڕوا زانایانی الله بەیەکگرتن و تەوحید دەفەرمون لە ئەهلی سونە و جەماعە شیرک و هاوبەشیش ئەو سێ جۆرەی هەیە واتە (الشرك الربوبية والشرك الألوهية والشرك في الأسماء والصفات).

شەریک و هاوبەشایەتی لە ڕبوبیەت چیە؟ هەرکەس و شتێک پێت وابێ بەدیهێنەرە وەکو الله تعالی یانی خالیقە شتەکان لە نەبونەوە لە توانایدا هەیە بیهێنێتە بون یان شەریک و هاوبەشی الله تعالی یە لە بەدیهێنراوەکانیدا، ئەو کاتە شیرکت کردوە لە ڕبوبیەت و لە پەروەردگاریەتی الله تعالی، یان هەرکەسێک بێنیتە ئاستی الله تعالی (پەنا بە خوای رب العالمين) لە ڕزق و ڕۆزیداندا پێت وابێ کە ئەو کەسە ئەو شتە دەتوانێ وەکو الله تعالی

ڕزق و ڕۆزی بەدیهێنراوەکان بدا یان شەریک و هاوبەشە لەگەڵ الله تعالى لە دانی ڕزق و ڕۆزیەکان ئەوە شیرک و هاوبەشیت ئەنجام داوە و کردوتە لە ڕبوبیەت و لە پەروەردگاریەتی الله تعالى.

بۆ نمونە زۆر جاران لە نێو کوردەواری خۆشماندا ئەو شیرک و هاوبەشیە هەبوە، لە سەرەتاکانی ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) ئەگەر بێتەوە یاد و بیرتان کەسێک لەو کاتە ژیابێ و تەمەنێکی هەبوبێ زۆرێک لە خەڵکەکە کاتێک کە بار و زروفی ئیقتیسادی و ناتەواو بوو لە وڵاتەکەمان (لە کوردستاندا) کە ئومەمی موتەحیدە (UN) یارمەتیەکی خەڵکەکەی دەدا، خەڵک دەیانگوت ئەگەر (UN) نەبێ ئێمە لە برسان دەمرین (پەنا بە خوای رب العالمین)، ئەوە شیرک و هاوبەشی ڕبوبیەت بوە خەڵکەکە کە دەیگوت ئەگەر حوجەت لەسەر کردبان هەر بەردەوام بان لەسەر قسەکانیان پێ دەبونە موشریک و لە ئیسلامیش دەردەچون، لەبەر ئەوەی چونکە کەس لە برسان نامرێ ئەگەر هەرکەسێک یارمەتیشت نەدا مادەم الله تعالى ڕۆزیدەرە -جل شئنە- ئەو دەتوانێ ڕزق و ڕۆزیەکەت دابین بکا واتە ڕزق و ڕۆزی تەنها لە دەست الله تعالى یە.

ئینجا نمونەکان زۆرن دەتوانین زۆر زیاتریش نمونە بێنینەوە واتە شیرک و هاوبەشی لە ڕبوبیەتدا بە مانای ئەوە دێ لە هەریەک لە فعل و کار و کردەوەکانی الله تعالى کە الله تعالى تێیدا تاک و تەنهایە پێت وابێ کەسێک شەریک و هاوبەشە لەگەڵ الله تعالى لە ئەنجامدانیدا یان کەسێک وەکو اللەی پێ دەکرێ (پەنا بە خوای رب العالمین) لە ئەنجامدانی هەر کار و کردەوەیەکی تایبەت بە الله تعالى ئەوە ئەو کاتە شیرک و هاوبەشیت کردوە لە ڕبوبیەتدا.

ئینجا جۆری دوەم لە شیرک و هاوبەشی شیرک و هاوبەشیە لە ئولوهیەتدا، ئەگەر پێت وابێ هەر کەس و شتێک لە ئاستی الله تعالى یە یان شەریک و هاوبەشی الله تعالى یە

لە کڕنۆش بۆ بردن و سوجدە بۆ بردن و پەرستنیدا ئەوە شیرک و هاوبەشیت ئەنجام داوە لە عیبادەت و لە ئولوهیەت و لە خوایەتی الله تعالی -جل شئنە-.

نمونەکان زۆرن هەر کەسێکت لە ئاستی الله تعالی خۆشبوێ چونکە یەک لە کردەوەکانی دڵ مەحەبەت و خۆشەویستیە ئەوە ئەو کاتە شیرک و هاوبەشیت لە ئولوهیەتدا (پەنا بە الله) بۆ الله تعالی بڕیار داوە، یان بە قەد الله تعالی لە هەر کەس و شتێک بترسێی پێت وابێ ترسەکە وابێ کە دەتوانی زەرەر و زیانت پێ بگەیەنێ یان دەتوانێ سود و قازانج و کەڵکێک هەیە پێت بگا و ئەو ڕەتیکاتەوە و نەهێڵێ پێت بگا هەریەک لەو ترسانەت هەبێ شیرک و هاوبەشیت (پەنا بە خوای رب العالمين) بۆ الله تعالی ئەنجام داوە لە ئولوهیەت و لە خوایەتی الله تعالی، ئینجا یان گوێڕایەڵی سەمع و تاعەیەکی موتڵەقی ڕەهات هەبێ بۆ هەر بەرنامەیەک بۆ هەر کەسێک بۆ هەر یەدیهێنراوێک ئەو کاتە شیرک و هاوبەشیت بۆ الله تعالی ئەنجام داوە هەم ئولوهیەت و هەم لە ڕبوبیەتدا چونکە هەموو بەرنامەی ژیانت شتە تایبەتەکان فەرمان و قەدەغە کردنەکان لە دەست الله تعالی یە دیاریکردنی حەڵاڵ و حەرام لە دەست الله تعالی یە -جل شئنە- تایبەتە بەو ئەگەر تۆ لە کەس و شتێکی ترت وەرگرت (پەنا بە خوای رب العالمين) شیرک و هاوبەشیت ئەنجام داوە بۆ خوای رب العالمين.

ئینجا مەرج نیە ئەو شتە و ئەو کەسە کە دەپەرسترێ جگە لە خوای رب العالمين دەکرێتە شەریک و هاوبەش لەگەڵ الله تعالی ئەو کەسە مرۆڤبێ جنۆکەبێ یان گیان لەبەرێکی تربێ هەندێک جار شتە بێ گیانەکانیش وەکو سەید قوطب ڕونکردنەوەی لەسەر دەدا و دەفەرموێ و پێکاوێتی و ڕاستیشی فەرموە بیروبۆچون و ئایدۆلۆجیەکانیش هەندێک جار هەیە فکرەیەک دیموکراتیەتێک عالمانیەتێک وە سۆشیال دیموکراتیەتیەک یان چەپ ڕەوایەتیەک کارل مارکسیەتێک یان لینی نزمیەتێک هەریەک لەو بەرنامە و فکرە و بیردۆزە مرۆڤ کردانەی کە زادەی مێشک و بیروبۆچونی مرۆڤانە پێچەوانەی شەریعەت

و یاسای الله تعالی یە -جل شئنە- ئەو ڕێگایە و ئەو بەرنامە بگرێتەبەر گوێڕایەڵی بکا جێبەجێی بکا لە ژیانی بڕوای پێ هەبێ ئەو کاتە شیرک و هاوبەشی ئەنجام داوە (پەنا بە خوای رب العالمین) لە ئولوهیەتدا و وە لە ڕبوبیەتدا بۆ الله تعالی وە دەبێ ئەو کەسە زۆر ئاگاداری خۆی بێ.

ئینجا هاوارکردنی هەر کەسێک وە هەر شتێک کە شتەکەی لە تواناذا نیە تەنها ئەو شتە لە توانای الله تعالی یە بڵێی لە هانام وەرە زەرەر و زیانێکم لەسەر لابدە یان سود و کەڵک و قازانجێکم پێ بگەیەنە وەکو هاوار کردنی مردوەکان کە زۆرجار دەکرێ ئەگەر مردوەکە پیاوێکی چاکیش بێ ئافرەتێکی زۆر صاڵیحەش بێ ئەوە ئەو کاتە بەریئە لێ هەتا تەنانەت پێغەمبەریش بێ (علیهم الصلاة والسلام)، عیسا پێغەمبەر (ﷺ) کە دەپەرسترێ لەلایەن نەسڕانیەکان لەگەڵ الله تعالی (پەنا بە الله) کە بڕیاری بۆ دەدرێ کە کوڕی الله تعالی یە (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەوە شیرک و هاوبەشیە، عیسا پێغەمبەر (ﷺ) لێی بەرییە بەڵام ئەو کەسانەی کە وا دەکەن و وا دەڵێن پێوە دەبنە موشریک و هاوبەش پەیداکار الله تعالی لێیان هەڵناگرێ و قبوڵ ناکا و تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە.

جا پێناسەی طاغوتیش پێویستە هەڵوەستەیەکی کورتی لەسەر بکەین کە طاغوت چیە؟ طاغوت (کل ما عبد من دون الله وهو راض) هەر کەس و شتێک بپەرسترێ جگە لە الله تعالی جا ئەو کەس و شتەش ڕازیبێ بەو پەرستنەی کە بۆی ئەنجام دەدرێ تاوەکو عیسا پێغەمبەر و (ﷺ) وە پێغەمبەران بە تێکڕا و وە پیاوچاکان و ئافرەتانی صاڵیحە بێنینە دەرەوە، بۆ؟ چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وە پیاوچاکان و ئافرەتانی صاڵیحە ئەگەر دەش پەرسترێن ڕازی نین بەوەی کە ئەو پەرستنەیان بۆ ئەنجام دەدرێ بەرینە لێی وە پێشی ڕازی نین کەواتە ئەوان طاغوت نین عیسا پێغەمبەر (ﷺ) طاغوت نیە کە دەپەرسترێ بێجگە لە خوای رب العالمین ، گوتمان هەر کەس و شتێک بپەرسترێ بێجگە لە الله طاغوتە بەڵام بەو مەرجەی بۆخۆی ڕازیبێ بەو پەرستنەی کە بۆی ئەنجام دەدرێ

و پێی باش و خۆشبێ (پەنا بە خوای رب العالمین) ئینجا دەبێتە طاغوت، کەواتە بت و صەنەمەکان وە یان هەر کەسێک وەکو فیرعەون دەپەرسترێن و دەپەرستران ڕازی بون بەوەی ئەو پەرستنەیان بۆ ئەنجام دەدرێ ئەوانە طاغوتن، بەڵام پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کە بەریئن وە ڕازی نین بەو پەرستنەی بۆیان ئەنجام دەدرێ وە پیاو چاکەکانیش بە هەمان شێوە ئافرەتە صاڵیحەکانیش ئەوانە بەریئن و طاغوت حیساب نین و تاوان و گوناح لە ئەستۆ و لە ملی ئەوان نیە.

لە پاشان شیرک و هاوبەشی هەندێک جار لە ئەسماء و سیفاتە تۆ پێت وایە (پەنا بە خوای رب العالمین) یەکێک لە سیفەتەکانی خوای رب العالمین پێت وایە کەسێکیش ئەو سیفەتەی تێدایە، بۆ نمونە الله تعالى (الرحمن)ە ڕەحم و بەزەییەکەی فراوانە هەموو شتێک دەگرێتەوە، پێت وابێ مرۆڤێکیش و یان کەسێکی تریش هەیە ڕەحم و بەزەییەکی فراوانی هەیە لە ئاستی الله تعالى (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەوە شیرک و هاوبەشیت لە ئەسماء و سیفات بۆ الله تعالى بڕیاردا، یان پێت وابێ کە الله تعالى اللەیە -جل شئنه- الله مانای ئەوەیە (المعبود الحق) یەعنی پەرستراوێکی شایستەی پەرستن و حەق و ڕەوا پێت وابێ کەس و شتێکی تریش هەیە شایستەی پەرستنە کەواتە لێرەدا شیرکت کردوە هەم لە عیبادەت و ئولوهیەتدا بۆ الله تعالى وە هەم لە ئەسماء و سیفاتیشدا، ئەو سیفەتە تایبەتیەی خوای رب العالمین کە مەعبودی حەقە وە پەرستراوی حەق و ڕەوایە پاڵت داوە لای یەکێکی تر و کەسێک تر.

ئینجا ئەوە پێشەکیەک بوو بۆ بۆ ئەو بڕگانەی کە ابن تيمية -رحمه الله- هێناویێتیەوە لە (العقيدة الواسطية) کە ئەو ئایەتانەیە شیرک و هاوبەشی پێ ڕەت دەکاتەوە ئینجا دێینە سەر ئایەتەکان و تەفسیریان دەکەین.

ئایەتی یەکەم کە هێناویەتیەوە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَم يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾ [الإسراء: ١١١] پێیان

بڵێ و سوپاس و ستایشەکان هەموو بۆ الله تعالی: ﴿الْحَمْدُ لِلّهِ﴾ (الْ) زۆربەی زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە لەسەر ئەو بۆچونەن کە ئەلف و لامی ئیستغراقیە، ئەلف و لامی ئیستغراقی لە زمانی عەرەبیدا بەو مانایە دێ کە کول لە شوێنیدا جێی ببێتەوە یەعنی وشەی کول دابنێی ئەگەر ئەلف و لامەکەت لادا مانای تەواوی بێ، یەعنی کە دەڵێین (الْحَمْدُ لِلّهِ) (الْ) ڕەش دەکەینەوە کوللی لە شوێن دادەنێین یەعنی (کل حَمْدُ لِلّهِ) هەموو حەمد و سوپاس و ستایشەکان بۆ الله تعالی، ئەو حەمد و سوپاس و ستایشانەی بۆ هەر کەس و شتێک دەکرێ و ئەنجام دەدرێ وە ئەوەی نەشکراوە هەر هەموی شایستەی الله تعالی یە وە بۆ الله تعالی یە، وە (لِلّهِ) لامەکە بۆ ئیستیحقاقە یەعنی ئەو حەمد و ستایشانەی الله تعالی کە دەکرێ و بۆی ئەنجام دەدرێ الله تعالی شایستەیە کە بۆی دەکرێ چونکە خەڵکانێک هەن هەندێک جار هەیە سوپاسیان دەکرێ و شایستەی سوپاس کردن نین مەدحیان دەکرێ و پێیان هەڵدەگوترێ شایستەی ئەو نین بەڵام الله تعالی شایستەی ئەو حەمد و سوپاس و ستایشانەیە کە دەیکرێ، (الله)یش گوتمان بە مەعنای مەعبودێکی حەق و ڕەوا دێ وە: ﴿الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾ الله تعالی شی دەکاتەوە و ڕونی دەکاتەوە دەفەرموێ پێیان بڵێ حەمد و سوپاس و ستایشەکان بۆ ئەو خوایەی کە منداڵی نیە و وە نایبێ و ڕەتکراوەیە بۆ الله تعالی کە خاوەنی منداڵ بێ (پەنا بە خوای رب العالمین) وەکو موشریک و کافرەکان دەیانگوت، لەبەر ئەوەی منداڵ سیفەتی نەقسە بۆ خوای رب العالمین هەموو جارێک بەڵام زۆرجار منداڵ هی مەخلوق و بەدیهێنراوەکانیش دەبێ بە باوکی بچێ، (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەگەر تۆ گوتت الله تعالی منداڵی هەیە هەم سیفەتی نەقسە کەواتە لە ئینسانەکاندا ئینسان بۆ منداڵ دەبێ؟ لەبەر ئەوەی هەتا منداڵ تەواوکەری بێ هەتا سۆز و خۆشەویستیەکانی جێبەجێ ببێ غەریزەیەکی هەیە ئینسان وە نیعمەتی الله تعالی یە کە لەگەڵی دەکا سەرەڕای ئەوەش هەندێک جار بە باوکەکەش دەچێ، جا الله تعالی نە موحتاجە و بێ نیازە لە هەر کەس و شتێک الله تعالی وە موحتاج

نیە غەنییە پێویستی بە منداڵ نیە وە ئەگەر (پەنا بە الله) گوتت فڵانە کەس و فڵانە شت وەکو نەسڕانیەکان دەڵێن عیسا کوڕی اللەیە و جولەکەکان دەڵێن عوزەیر کوڕی اللەیە (پەنا بە خوای رب العالمین) نوسەیریەکان عەلیلاهیەکان و عەلەویەکانیش لە شیعە وەکو بنەماڵەی (حافیظ ئەسەد) لە سوریا ئەوانیش دەڵێن ئیمامی عەلی (پەنا بە خوای رب العالمین) بەشی خوایەتی تێدایە و وەکو نەسڕانیەکان پێیان وایە ئیمامی عیسا کوڕی اللەیە (نعوذ بالله) ئەوە ئەو کاتە دەبێ کوڕەکە بە باوکی بچێ نابێ خوای رب العالمین هاو وێنەیەکی هەبێ -جل شئنە-، کەواتە ئەو شیرک و هاوبەشیە بڵێی الله تعالی منداڵی هەیە ڕەتکراوەیە سەدا سەد هەم بە بەڵگەی ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز وە بە فەرمودەی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ) بە عەقڵی و بە مەنتیقی و واقیعیش لە الله -جل شئنە- ناوەشێتەوە: ﴿وَلَم يَكُن لَّهُ شَرِيك فِي الْمُلْكِ﴾ وە الله تعالی شەریک و هاوبەشی نیە لە خاوەنیەتی و دەسەڵاتدا، کە الله تعالی خاوەنی ئاسمانەکانە هی زەوییە هی مرۆڤ و بەدیهێنراوەکانە شەریک و هاوبەشی نیە لەو بوارانەدا -جل شئنە- تاک و تەنهایە هیچ کەس شەریک و هاوبەشی الله تعالی نیە: ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيّ مِّنَ الذُّلَّ﴾ الله تعالی پێویستی بە هیچ یارمەتیدەرێک نیە کەسێک هەبوبێ یان شتێک هەبێ یارمەتیدەری الله تعالی بێ چونکە الله تعالی توانای نەبوە الله تعالی -جل شئنە- نەیتوانیوە شتەکان بە ڕێک و پێکی بکا چونکە یارمەتیدان و یاریدەدەر بۆ مرۆڤ و مەخلوق و بەدیهێنراوەکان لە پێناو ئەوەیە کەسەکە سەدا سەد شتەکەی لە تواناادا نیە دەبێ کەس و شتێک یارمەتی بدا جا الله تعالی -جل شئنە- پێویستی بە هیچ وەلیەک و یاریدەدەرێک نەبوە و نابێ -جل شئنە- خۆی تاک و تەنهایە کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندا هەیە و ئەوەی لە ناویاندا هەیە و هی هەموو بەدیهێنراوەکانە بەبێ ئەوەی پێویستی بە یارمەتیدان و یاریدەدەر هەبوبێ -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) جا کە وابێ: ﴿وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾ [الإسراء: ١١١] الله تعالی بە گەورە و مەزن بگرن بە بەردەوامی چونکە گەورە و مەزنە -جل شئنە-

وە خاوەنی هەموو شتەکانە بەدیهێنەرە بۆ هەموو شتەکان وە منداڵی نیە شەریک و هاوبەشی نیە هەموو شیرک و هاوبەشیەکان ڕەتکەنەوە الله بە مەزن و گەورە بگرن بە بەردەوام -جل شئنه-.

ئەو ئایەتەی ڕابردوو سورەتی (الإسراء) هەندێک لە زانایان پێی دەڵێن ئایەتی (عیز) واتە ئایەتی عیزەت مەندایەتی الله تعالی یە کە الله تعالی پێویستی بە هیچ کەس و شتێک نیە زاڵە بەسەر هەموو شتەکان.

لە ئایەتەکەی تر الله تعالی فەرمویەتی: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير﴾ [التغابن: ١] ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە پاک و بێگەردی بۆ خوای رب العالمین ڕەدەگەیەنن تەسبیحی الله تعالی دەکەن نەقس و کەم و کورتیەکان شیرک و هاوبەشیەکان ڕەت دەکەنەوە لە الله تعالی داندەنێن بەوەی الله تعالی پاک و بێگەردە لە شیرک و هاوبەشی لە کەم و کورتیەکان وە: ﴿لَهُ الْمُلْكُ﴾ الله تعالی دەسەڵات و خاوەنیەتی هەیە بۆ هەموو شتەکان: ﴿وَلَهُ الْحَمْدُ﴾ وە حەمد و سوپاس و ستایشی بۆ دەکرێ و شایستەیە ئەو حەمد و سوپاس و ستایشانەی بکرێ لەسەر هەموو ناز و نیعمەتەکان وە بە بێ ناز و نیعمەتیش هەر شایستەیە چونکە خۆی خاوەن سیفەتی کەمال و تەواویەتە لێوەشاوەیە حەمد و سوپاسی بکرێ: ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير﴾ [التغابن: ١] الله تعالی لەسەر هەموو شتێک توانایە.

وە ئەم جارە لە سورەتێکی تر ابن تیمیة بە بەڵگە هێناویەتیەوە بۆ ڕەتکردنەوەی شیرک و هاوبەشی لە الله تعالی کە الله تعالی فەرمویەتی: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا * الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيك فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ [الفرقان: ١-٢] ﴿تَبَارَكَ الَّذِي﴾ تەبارەکە لە زمانی عەرەبیدا بە مەعنای مەزنایەتی و پیت و بەرەکەت و بەرێزی دێت بۆ الله تعالی یش یەعنی بەرز و مەزنایەتی بۆ الله تعالی کە ئەو خودایەی فورقان کە قورئانە دایبەزاندوە لەلای

خۆیەوە بەسەر بەندەكەی خۆی: ﴿عَلَى عَبْدِهِ﴾ كە موحەممەدە (ﷺ)، جا لە ڕابردوش گوتمان تەبارەكە بۆ مرۆڤەكان ناشێ و ناگونجێ بڕیار بدرێ نابێ بڵێی تەبارەكە فڵانە شەخس لەبەر ئەوەی تەبارەكە بەرزی و مەزنی تەواوی ئیلا بۆ اللهیە -جل شئنە- بەڵام دەگونجێ بڵێی فڵانە كەس (رجل مبارك) موبارەكە بە مەعنای پیت و بەرەكەت یان بەرز و مەزنیەكی تێدایە، بەس كێ پێی بەخشیوە وای لێكردوە؟ الله تعالى -جل شئنە- لە خۆڕا كەس تەبارەكە نیە خاوەن بەرزی و مەزنایەتی نیە ئیلا الله تعالى نەبێ -جل شئنە-: ﴿لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا﴾ ئەو فورقانە كە جیاكەرەوەیە لە نێوان باتڵ و حەق و ڕەوایەتی لە نێوان شیرک و هاوبەشی و یەكتایی و الله بەیەككرتن -جل شئنە- تەوحید لەبەرچی الله تعالى بەسەری دابەزاندوە بەسەر بەندەكەی خۆی؟ تا بیكاتە ترسێنەر بۆ جیهانیان بیانترسێنێ لە شیرک و هاوبەشی لە تۆڵەی خوایی لە ئاگری دۆزەخ لە غەزەبی الله كە پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ): ﴿نَذِيرًا﴾ واتە ترسێنەرە بۆ جیهانیان لە عەزابی الله تعالى دەیانترسێنێ وە لە شیرک و هاوبەشی دەیانترسێنێ وە لە دەرئەنجامی گوناح و تاوانەكانیان دەیانترسێنێ: ﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەو اللهیەی ئەو فورقانەی دابەزاندوە و پێغەمبەرەكەی موحەممەد (ﷺ) كردویەتیە نەذیر بۆ جیهانیان ئەو خاوەنی ئاسمانەكان و زەوییە یەعنی ڕاگریانە بەدیهێنەریانە وە بەڕێوەبەریانە لەوپەڕی بەڕێوەبردن هی ئاسمانەكان و زەوی: ﴿وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾ وە منداڵی بۆخۆی دانەناوە و وە دورە منداڵ لە الله تعالى -جل شئنە-: ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ﴾ وە شەریک و هاوبەشیشی نیە الله تعالى: ﴿فِي الْمُلْكِ﴾ لە هیچ شتێكی وە لە خاوەنیەتی و دەسەڵاتیشی: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ وە هەموو شتەكانی بەدیهێناوە: ﴿فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ [الفرقان: ١-٢] هەروا بەدی نەهێناوە و وازیشی لێ هێنابن هەموی بە ئەندازەیەكی زۆر ڕێک و پێكی جوان لە ئەوەڵەوە وە تا كۆتاش بە ڕێیانەوە دەبا و بەدیهێناون وە ئەندازەی بۆ داناوە بۆ هەموو شتێک.

وە لە پاشان لە ئایەتێکی تر الله تعالی فەرمویەتی: ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ من وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ﴾ جا الله تعالی منداڵی بۆخۆی دانەناوە وە الله تعالی -جل شئنه- منداڵی نیە وەکو کافر و موشریکەکان دەڵێن: ﴿وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ﴾ وە الله تعالی لە ئەوەل و ئەزەلەوە وە ئێستاش و تا داهاتوش و تا ئەبەد الله تعالی هیچ خوایەکی تر لەگەڵی شەریک و هاوبەش نیە چونکە ئەگەر خوایەکی تر لەگەڵی شەریک و هاوبەشبا الله تعالی ڕونی دەکاتەوە و دەفەرموێ: ﴿إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ﴾ هەر خوایەکیان لەو خوایانە (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەگەر لەگەڵ الله هەبان الله تعالی دەفەرموێ هەریەکەیان دەڕۆیشت و شتێکی بۆخۆی بەدی دەهێنا و دروستی دەکرد بە ئەویتر ڕازی نەدەبوو: ﴿وَلَعَلا بَعْضُهُم عَلَى بَعْضٍ﴾ وە هەندێکیان زاڵ و بەرزتر دەبونەوە بەسەر خوایەکەی تر واتە موناڧەسە لە نێوانیاندا دروست دەبوو وە ڕازی نەدەبون بە ئیشی یەکتر، لە پاشان دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاک و بێگەردی بۆ الله تعالی لەو وەسف و کەم و کورتی و شیرک و هاوبەشیانەی پاڵی دەدەنە لای خوای رب العالمین موشریک و کافرەکان کە دەڵێن خوایەکی تر شەریکە لەگەڵی (پەنا بە خوای رب العالمین) لە خاوەنێتی لە موڵک و دەسەڵات لە خوایەتی و پەرستشدا (پەنا بە خوای رب العالمین) یان دەڵێن منداڵی هەیە (پەنا بە الله) ئەوانە سیفەتی نەقس و کەم و کورتین هەموی ڕەتکراوەیە لە الله تعالی: ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ الله تعالی زانایە بە پەنهان و نادیارەکان وە بە شتە ڕواڵەتی و ئاشکراکان ﴿فَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ [المؤمنون: ٩٢] بەرز و مەزنە الله تعالی لەو شیرک و هاوبەشیانەی بۆی ئەنجام دەدەن و بۆی دەڵێن الله تعالی نیەتی -جل شئنه-.

وە لە پاشان لە سورەتێکی تر الله تعالی دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَضْرِبُواْ لِلّهِ الأَمْثَالَ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ [النحل: ٧٤] هاو وێنە و نمونە بۆ الله تعالی مەهێننەوە و بڕیار مەدەن بڵێن ئەوە وەکو اللهیە (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەوە لە ئاستی اللهیە (پەنا بە خوای رب

العالمین) چ لە بەدیهێناندا چ لە خوایەتیدا چ لە ناو و سیفەتەکانیدا وە بەڕاستی و بێگومان الله تعالی دەزانێ وە ئێوە نازانن و شارەزا نین.

وە لە ئایەتی کۆتایی کە ابن تیمیة -رحمه الله- هێناویەتیەوە بۆ ڕەتکردنەوەی شیرک و هاوبەشی الله تعالی فەرمویەتی: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ [الأنعام: ٣٣] پێیان بڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) بێگومان و سەدا سەد پەروەردگارەکەم فەواحیشی حەرام کردوە، فەواحیش جەمعی فاحیشە یان فاحیشەیە فاحیشە بە مانای سنور بەزێنی دێ لە زمانەوانیدا چ سنور بەزێنی زمان بێ چ هی دامێن بێ واتە هەر تەجاوز و سنور بەزێنییەک پێی دەگوترێ فاحیشە، زیاتر فاحیشە بۆ ئەوەش بەکار دەهێندرێ گوناح و تاوانەکانی لایەنی ناموسی و دامەن کە دەیگرێتەوە، جا ئەوکات ئەگەر وات بەکارهێنا بە تایبەتی و خاسیەتیەکەی بەکارت هێناوە ئەگەرنا بە مانا فراوانیەکەی هەموو تاوان و گوناحەکانی زمان کە تەجاوز دەکات و سنور بەزێنی دەکات یان هی دامەن یان هی دەست و هەر شتێکی تر هەر پێی دەگوترێ فاحیشە، کەواتە پێیان بڵێ پەروەردگارم فەواحیش فاحیشەکان و سنور بەزێنی و تاوان و گوناحەکانی حەرام کردوە: ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ ئەوەی بە ئاشکرا و ڕواڵەتی دەکرێ ئەوەی بە پەنهانی و نادیاری دەکرێ هەموی ئاگادارە الله و حەرامی کردوە: ﴿وَالإِثْمَ﴾ یەعنی تاوان و گوناح زیاتر کە بە دەست و بە ئەندامەکان ئەنجام دەدرێ بەوە دەگوترێ: ﴿وَالْبَغْيَ﴾ وە سنور بەزێنیەکان: ﴿بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ چونکە دیارە هەندێک جار ئەگەر تۆ بەسەر کەسێکدا بەغی دەکەی و ڕێک و ڕاست و لەگەڵ بۆچونەکانیدانی و بەسەریدا زاڵ دەبی هەموو جارێ ناحەق نیە هەندێک جار حەق و ڕەوایە کەسەکە زاڵمە ستەمکارە دەبێ تۆ وای لەگەڵ بکەی بەڵام خوای رب العالمین فەرموی ئەو بەغیانەی بە ناحەق کە دەکرێ خوای رب العالمین هەموو ئەوانەی حەرام کردوە: ﴿وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللَّهِ﴾ وە شیرک و هاوبەشی بۆ الله

ئەنجام بدەی الله تعالى پێی ڕازی نیە حەرامی كردوە كردویەتیە تاوان و گوناحی مەزن و گەورە: ﴿مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا﴾ كە قەت بەڵگەیەكیان پێ نایەتەوە لەسەر شیرك و هاوبەشیەكان وە نە لە ڕابردو هەیان بوە و نە لە ئێستا و نە هەتا هەتایی: ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ یان قسەیەك بكەن بڵێن لەسەر الله تعالى بەبێ ئەوەی عیلم و زانستیتان پێی هەبێ و هەر لەخۆڕا قسەكان بڕیار بدەن لەسەر الله تعالى.

## جێگیر كردنی سیفەتی (الاستواء) لە قورئاندا:

وَقَوْلُهُ: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ [طه: ٥]، فِي سَبْعَةِ مواضع ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ [الأعراف: ٥٤]، وَقَالَ فِي سُورَةِ يُونُسَ -عَلَيْهِ السَّلاَمَ-: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ [يونس: ٣]، وَقَالَ فِي سُورَةِ الرَّعْدِ: ﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ [الرعد: ٢]، وَقَالَ فِي سُورَةِ طَهَ: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ [طه: ٥]، وَقَالَ فِي سُورَةِ الْفُرْقَانِ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ الرَّحْمَنُ﴾ [الفرقان: ٥٩]، وَقَالَ فِي سُورَةِ آلم السَّجْدَةِ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ [السجدة: ٤]، وَقَالَ فِي سُورَةِ الْحدِيدِ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ [الحديد: ٤].

---

لەو حەوت ئایەتانە الله تعالى لە قورئانی پیرۆز سیفەتی ئیستیوای بۆخۆی بڕیار داوە، كەواتە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بە یەك دەنگی بەبێ ئیختیلاف و جیاوازی سیفەتی علو و بەرزیایەتی بۆ الله تعالى بڕیار دەدەن بەو ئایەتانە و چەندین ئایەتی تر و وە چەندەها فەرمودەی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) وە سیفەتی ئیستیوایش كە سیفەتێكی فعلیە بۆ الله تعالى بە مانایە ڕاست و دروستیەكەی بڕیار دەدەن ئەهلی سونە و جەماعە بەبێ تەئویل كردن و بەبێ تەحریف كردن و گۆڕینی و بەبێ تەفویض كردن بڵێن ئەوە ئێمە هیچی لێ نازانین و ماناكەی دیار نیە و هەر ئیستیوا دەڵێین و بەس الله لێی دەزانی -جل

شئنه-، ئەوانە هەموی بەبێ هاو وێنە هێنانەوە بۆ الله تعالى لە ئیستیوا وە بەبێ تەشبیهکردن وە بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان ئەهلی سونە و جەماعە جێگیری دەکەن سیفەتی ئیستیوا بۆ الله تعالى.

جا علو و بەرزایەتی الله تعالى سێ جۆرە:

١. یان علوی زاتە یانی زاتی الله تعالى بەرز و مەزنە.

٢. وە یان علوی قەدرە یانی پلە و پایەی الله تعالى بەرز و مەزنە.

٣. یان علوی قەهرە بە مەعنای زاڵبون و دەسەڵاتبون الله تعالى دەسەڵات و زاڵبونی بەرز و مەزنە بەسەر هەموو شتەکان.

جا خوای رب العالمین دەربارەی علوی قەهر دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّا فَوقَهُم قَـٰهِرُونَ﴾ [الأعراف: ١٢٧] ئێمە لەسەریانەوە دەسەڵاتین توانایین زاڵین بەسەریاندا، وە لە پاشان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلقَاهِرُ فَوقَ عِبَادِهِ﴾ [الأنعام: ١٨] الله تعالى قاهیر و زاڵ و دەسەڵاتە بەرزە بەسەر بەندەکانیەوە.

کەواتە دەگوترێ لە زمانی عەرەبیشدا ئەگەر کەسێک پاشایەک دەسەڵاتدارێک دەسەڵاتداری خەڵکانێک بێ لە وڵات و شوێنێک پێی دەڵێن چی؟ (الملك عال على أهل البلد) ئەو پاشایە بەرزە بەسەر خەڵکانی ئەو وڵات و شوێنەدا، هەم بەرزە لە ڕوی ڕێزی زیاتر لێ دەگیرێ هەم بەرزە لە ڕوی دەسەڵات زاڵە بەسەریاندا.

وە لە پاشان جێگیریان کردوە ئەهلی سونە و جەماعە کە الله تعالى لە ڕوی پلە و پایەوە وە لە ڕوی قەدرەوە بەرزە بەسەر بەندەکان و بەسەر بەدیهێنراوەکان وە دەیەها ئایەت و فەرمودەی بۆ دەهێننەوە کە الله تعالى -جل شئنە- بۆخۆی سەلماندویەتی بەرز و مەزنە بەسەر هەموو شتەکانەوە لە ڕوی قەدر و پلە و پایەدا پلەدارترە لە هەموو کەسێک وە لە هەموو شتێک.

وە لە پاشان الله تعالى دەفەرمویٚ: ﴿وَهُوَ ٱلعَلِيُّ ٱلعَظِيمُ﴾ [البقرة: ٢٥٥] الله تعالى یەكێک لە ناوەكانی عەلیە كە سیفەتی علوی لیٚ وەردەگیریٚ واتە الله تعالى بەرزە وە مەزنیشە، وە یان دەفەرمویٚ لە ئایەتێكی تر: ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوقِهِم﴾ [النحل: ٥٠] سیفەتی فەوقیەت بۆخۆی بڕیار دەدا الله تعالى یەعنی دەترسێن لە پەروەردگاریان كە الله تعالى لەسەروی ئەوانەوەیە بەرزە بەسەریانەوە و فەوقی ئەوانە.

یان هەندێک جار بەڵگەكە بەوە دێتەوە ئەهلی سونە و جەماعە كە دەڵێن هەر شت بۆ الله بەرز دەبێتەوە دیارە الله تعالى بەرزە -جل شئنه-، ئەگینا شت چۆن دەڵێن بۆی بەرز بۆوە؟ كەواتە ئەهلی سونە و جەماعە دەیەها بەڵگە دەهێننەوە لەسەر جێگیر كردنی سیفەتی بەرزایەتی الله تعالى هەم لە زاتی زاتی بەرزە بەسەر شتەكانەوە، هەم لە سیفەتەكانی الله تعالى بە مەعنای قەدر و پلە و پایەی وە بە مەعنای قاهیرایەتی و زاڵبونی بەسەر شتەكاندا، ئینجا دەڵێن یەک لە جۆرەكانی بەڵگە ئەوەیە الله تعالى ڕاشكاوانە بەرزایەتی خۆی ڕاگەیاندوە دەفەرمویٚ: ﴿وَهُوَ ٱلعَلِيُّ ٱلعَظِيمُ﴾ [البقرة: ٢٥٥] وە یەک لە بەڵگەكان ئەوەیە الله تعالى ڕاشكاوانە باسی فەوقیەتی خۆی دەكا: ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوقِهِم﴾ [النحل: ٥٠] وە یەک لە بەڵگەكان ئەوەیە شتەكان لە نزمی دەڵیٚ بەرز دەبێتەوە بۆلای الله: ﴿تَعرُجُ ٱلمَلَـٰئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيهِ﴾ [المعارج: ٤] فریشتەكان وە ڕۆحیش لەگەڵیاندایە هەندێک دەفەرمون مەبەست پێی جوبرائیلە وە ڕۆح و گیان كێشانی مرۆڤەكانیش لە فەرمودەی سەحیح هاتوە ئەویش بەرز دەبێتەوە بەرەو ئاسمانەكان، كەواتە هەموو الله تعالى دەفەرمویٚ ئەوانە بەرز دەبنەوە بەرەو لای الله مەعنای دیارە الله تعالى بەرزە -جل شئنه-، وە هەندێک جاریش الله تعالى فەرمویەتی: ﴿إِلَيهِ يَصعَدُ ٱلكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ﴾ [فاطر: ١٠] وشەكان هەڵدەگیرێن یان دەبردرێن و بەرز دەكرێنەوە بۆلای الله تعالى، یان هەندێک جاریش الله تعالى بەوە دەیسەلمێنیٚ كە بەرزە كە شت لەوەوە دادەبەزیٚ كەواتە كە دەڵێی دابەزین لە بەرزی شت دادەبەزیٚ بۆ نزمی دیارە الله تعالى بەرزە -جل شئنه- كە دەفەرمویٚ:

﴿مُنَزَّل مِّن رَّبِّكَ﴾ [الأنعام: ١١٤] قورئانی پیرۆز یان هەریەک لەو پەرتوک و پەیامە ئاسمانیانە دابەزیوە لەلای خوای پەروەردگارت ئەی موحەمەد (ﷺ)، كە دەڵێ دابەزیوە بە مەعنای الله بەرزە -جل شئنە- دای دەبەزێنێ بۆ نزمایەتی، هەندێک جاریش الله تعالی بە ڕاشكاوانە باسی ئاسمان دەكا كە الله تعالی لە سەروی ئاسمانەكانە: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَاءِ﴾ [الملك: ١٦] (فِي) لێرە لە زمانی عەرەبیدا بە چەندین مانا دێ بەس لێرە بە مەعنای (على) دێ بە ئیتیفاقی ئەهلی سونە و جەماعە یەعنی (ءَأَمِنتُم مَّن على ٱلسَّمَاءِ) ئایە ئێوە ئەمینن یانی نەک الله تعالی (پەنا بە الله) (فِي) بە مەعنای ظەرفیەت نیە چونكە (فِي) بە مەعنای ظەرفیەت شیرک و هاوبەشیە بۆ الله تعالی لێرە بڕیاری بدەی پێت وابێ الله لەناو ئاسمانە و ئاسمان دەوری الله تعالی ی داوە الله تعالی -جل شئنە- لەوە غەنیە، نا لێرە بە مەعنای (على) دێ، یانی ئایە ئێوە ئەمینن كە تاوان و گوناح و سەرپێچی الله تعالی دەكەن لەو خوایەی كە لە سەروی ئاسمانەكانە -جل شئنە- بەرزە لەوێ، وە هەندێک جاریش الله تعالی بە وشەی (رفع) بەرز بونەوە بۆلای خۆی بە وشەی (رفع) ناوی دەبا ئەوەش بەڵگەیە لەسەر فەوقیەت و وە لەسەر بەرزیایەتی الله تعالی كە دەفەرموێ: ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيهِ﴾ [النساء: ١٥٨] بەڵكو الله تعالی بەرزی كردەوە بۆلای خۆی بۆ نمونە عیسا پێغەمبەر (ﷺ)، یان هەندێک جاریش الله تعالی ڕاشكاوانە بەرزایەتی خۆی بەسەر بەدیهێنراوەكاندا ڕادەگەیەنێ باسی ئەوە دەكات الله تعالی كاتێ كە فیرعەون داوا دەكا لە هامان دەڵێ وەرە شتێكم بۆ دروست بكە من بەسەری بكەوم و بەرز ببمەوە بەڵكو (پەنا بە خوای رب العالمین) شەڕو بەر بەرەكانێی خوای موسا بكەم دەڵێ: ﴿لَّعَلِّي أَبْلُغُ الأَسْبَابَ﴾ بەڵكو بگەمە ئەسباب و هۆكارەكانەوە: ﴿أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ﴾ ئەو هۆكارانەی بەرزم دەكاتەوە بەرەو ئاسمانەكان: ﴿فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى﴾ لەوێوە ببینم زاڵبم بەسەر خوای موسا (پەنا بە خوای رب العالمین)، جا فیرعەون ئایە نەیدەزانی ئەو ئەوەی پێ ناكرێ؟ موفەسیرین دەفەرمون بە دڵنیاییەوە فیرعەون دەیزانی بەس بۆ ئەوەی دائیمەن سەركردەكان زۆر شت

هەیە دەزانن واش نیە بەس بۆ گەمژە كردن و فێڵكردن لە جەماوەر و خەڵكە نەزان و ڕەش و ڕوتەكە هەندێک جار شتێک دەهێننە بەرچاوان و دروستی دەكەن بە ئیعلام بە ڕاگەیاندن فێڵە لێیان دەكەن، فیرعەون دەیزانی ناگاتە ئەوێ بەڵام لە دوایە گوتی ئەوە چومە و تیرێكم هاوێشتوە و سەریشی بەخوێن بوە ئەها ببینن خوای موسام كوشت (نعوذ بالله)، دەیزانی ئەوە گەمژایەتیە و واشی نەكردوە بەس بۆ سەر لێشێواندنی خەڵكەكە دەیزانی خەڵكەكە گومانێكیان لە فیرعەون دروست بوە كە فیرعەون نابێ خوابێ نابێ وابێ، گوتی ئەوەتا ئەها كاكە ئەوەی موسا دەیڵێ ڕاستە دیارە ئەویش خوای هەیە ئاوایە بەڵام من زاڵبوم بەسەر خوایەكەی موسا (پەنا بە خوای رب العالمين)، كەواتە دەڵێ بڕۆم بەرەو ئاسمانەكان هەتا لەوێوە خوای موسا ببینم (پەنا بە الله)، ئینجا زانایان هەندێک دەفەرمون فیرعەونیش چاكتر لە هەندێک خەڵكی ئەهلی تەئویل خوای ناسیوە لەبەر ئەوەی گوتویەتی من دەچم لە ئاسمان واتە لە سەرووی ئاسمانەوە خوا دەبینم یانی سیفەتی علوایەتی بۆ الله تعالی بڕیارداوە -جل شئنه-.

ئینجا لە پاشان بەڵگەی یەک دەنگی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لەسەر بەرزایەتی الله تعالی، هەتا هی فیطرەت و سروشتیش هی مرۆڤەكان و هی حەیوان و ئاژەڵەكانیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی الله تعالی بەرزە، ئەی بۆ كە دۆعا دەكەی تۆ چاو دەبڕیتە ئاسمان و دەست بۆ ئاسمان بەرز دەكەیتەوە ئەگەر پێت وانەبێ الله لە سەروی ئاسمانەكانە و بەرزە؟ ئەی بۆ مێرولەیەک لە سەردەمی سولەیمان پێغەمبەر (ﷺ) كە ئیمامی سیوطی ڕیوایەتی دەكا لە یەكێک لە پەرتوكەكانی و دەفەرموێ سەنەدیشی سەحیحە كە هەندێک جار لە شەرحی (الواسطية) و پەرتوكەكانی تر زۆرجار ابن عثيمين یش -رحمه الله- بە بەڵگە دەیهێنێتەوە لەسەر فیطرەتی حەیوان و ئاژەڵەكان كاتێک دەڵێ سولەیمان پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتوە بەرەو ئەوەی كە بچن نوێژی بارانە بكەن لەبەر ئەوەی باران نەباریوە لەمێژە، لە ڕێگادا دەگەنە مێروستانێک لەسەر پشت مێروستانەكە خۆی

ڕاکشاندوە و ئەو قاچۆکانەی کە هەیەتی بەرزی کردوەتەوە بەرەو ئاسمان، سولەیمان ڕادەوەستێ (ﷺ) دەفەرموێ نزیک دەبێتەوە لە مێرولەکە بزانێ چی دەڵێ، گوێبیستی دەبێ سولەیمان پێغەمبەر (ﷺ) زمانی تەیر و تاری زانیوە و لێی تێگەیشتوە و حاڵیبوە موعجیزەیەک بوە بۆ ئەو، سولەیمان پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) گوێبیست بوم ئەو مێرولەیە وا دەڵێ ئەی خوای پەروەردگارم تۆ ئێمە مەحڕوم مەکە لە ئاودان و لە ئاو دابەزینی ئاسمان بە گوناحی جگە لە ئێمە هی مرۆڤەکان، جا دەفەرمون زانایان مێرولەش دەزانێ الله لە ئاسمانە -جل شئنە- لە سەروی ئاسمانەکانە چونکە قاچەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردوەتەوە، کەواتە فیطڕەتی ئینسان و مرۆڤەکانیش لە کاتی دۆعا کە وا دەکەن مێرولەیەکیش کە وا دەکا، کە دەڕوانیتە ئاسمان و دەست بۆ ئاسمان بەرز دەکەیەوە مەعنای الله -جل شئنە- بەرزە.

ابن القیم الجوزیة لە پەرتوکە زۆر نایابەکەی کە نونیەی پێ دەگوترێ کە شەش هەزار و شەست سەد و ئەوەندە بەیتەیە هێناویەتیەوە ئاخیری هەموو بەیتەکان بە نون تەواو بوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەی تێدا کۆ کردوەتەوە ئەو پیاوە بەڕێزە بەناوی (الکافیة الشافیة) وە بە قەسیدەی نونیە مەشهورە و بەناو بانگە کە بە ئیختیلاف و جیاوازیەکانی عەقیدە و بیروبڕواشەوە هەموی لەوێ کۆ کردوەتەوە لەوێ بیست و یەک جۆر لە بەڵگەکان دەهێنێتەوە نەک فەردی بەڵگەکان چونکە هەندێک جار یەک جۆر لە بەڵگەکان دەیەها وە سەدەها حەدیسی لەسەرە و ئایەتی لەسەرە بەڵام هەموو جۆرەکانی کۆ کردوەتەوە لە بیست و یەک جۆر دەڵێ بەو بیست و یەک جۆرە کە هەریەک لەو جۆرانە هەندێک جار دەیەها یان سەدەها ئایەتە و حەدیسە بەڵگەن لەسەر بەرزایەتی الله تعالی -جل شئنە- کە دەفەرموێ:

(منها استواء الرب فوق العرش في

سبع أتت في محكم القرآن

***

وكذلك اطردت بلا لام ولو
كانت بمعنى اللام في الأذهان

***

لأتت بها في موضع كي يحمل الـ
باقي عليها بالبيان الثاني[1])

وەڵامی ئەشعەریەكان و ماتۆریدیەكان و ئەهلی تەئویل دەداتەوە لێرە، دەڵێ یەک لە جۆرەكانی بەڵگە لەسەر ئەوەی كە الله تعالى بەرزە و ئیستیوای كردوە لەسەر عەرش بە مەعنایە حەقیقی و ڕاستیەكەی خۆی كە چۆنیەتیەكەی ئێمە نایزانین بەوەی لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- دەڵێ لە حەوت ئایەت الله تعالى وەكو ئەو ئایەتانەی كە لە ڕابردوو باسمان كرد و ابن تیمیةش -رحمه الله- هێنابویەوە دەڵێ لە (محكم القرآن) یانی ئایەتە موحكەمەكانە نەک موتەشابیهەكانە الله تعالى جێگیری كردوە كە ئیستیوای كردوە لەسەر عەرش، دەڵێ ئەگەر بێو ئیستیوا بە مەعنای (استولى) هاتبا دەڵێ ئەو كاتە دەبا سەدا سەد الله تعالى لە یەک لە شوێنەكان لامێكی بەگەڵ ئیستیوا خستبا لەو حەوت شوێنانە لە هیچێک لە ئایەتەكانی قورئان لام لەگەڵ ئیستیوا نەهاتوە كە لامی لەگەڵ نەهاتوە نابێ تۆ بە لامیشی لێكدەیەوە دەڵێ ئەگەر لە یەک ئایەتیش ئیستیوا بە (استولى) هاتبا لە یەک لەو حەوت ئایەتانە دەمانگوت قەیناكە ئایەتەكانی تریش حەمل دەكەینە سەر ئەو ئایەتە كەواتە ئیستیوا بە واتای (استولى)ش دێ مادەم لە هیچ ئایەتێک الله تعالى ئیستیوای بە مەعنای (استولى) نەهێناوە یەعنی وەكو (استولى) نەیهێناوە و لامێكی لەگەڵ بێ كەواتە مانای نابێ (استولى)شی لێ وەربگیرێ بەڵگەكەی زۆر لەجێیە.

[1] نونية ابن القيم الكافية الشافية - ط مكتبة ابن تيمية [ابن القيم] ص ٧٢.

جا ئایە ئیستیوا بە چەند مانا دێ مانایە حەقیقی و ڕاست و دروستەکانی ئایە بە مەعنای (استولی) دێ؟ نەخێر ئیستیوا مەعنایە دروست و ڕاشکاوەکانی لە زمانی عەرەبیەوە ابن القیم تۆماری کردوە لە نونیەکەی دەڵێ بە چوار واتا دێ هیچ مەعنای (استولی)ی لەگەڵدا نیە، ئەو چوار واتایە بۆ الله تعالی -جل شئنه- دەشێ و دەگونجێ ئەهلی سونە و جەماعە بڕیاری دەدەن دەڵێن مەعنایە حەقیقیەکەی ئیستیوایە بۆ الله تعالی بەس ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین (ولله المثل الأعلی)، کە لە نونیە فەرمویەتی:

(فلهم عبارات علیها أربع

قد حصلت للفارس الطعان

***

وهي استقر وقد علا وكذلك ار

تفع الذي ما فيه من نكران

***

وكذاك قد صعد الذي هو أربع

وأبو عبيدة صاحب الشيباني

***

يختار هذا القول في تفسيره

درى من الجهمي بالقرآن

***

والأشعري يقول تفسير استوى

بحقيقة استولى من البهتان[١])

---

[١] ابن القيم الكافية الشافية - ط مكتبة ابن تيمية [ابن القيم] ص: ٨٧.

دەفەرموێ ئیستیوا بە چوار واتا دێ لە زمانی عەرەبیەوە زانایانی زۆر شارەزا لە عەرەبی هەر وایان فەرموە دەڵێ ئەوەتا چوار ماناکەی کەسێک ئەگەر سوارچاکی ئەو مەیدانەبێ کە طەعنیش لێی بدا بەدوا گەڕانی بۆ بکا تەحقیقی بکا هەر ئەو چوار مانایە دێتە بەردەستی، یەکەمیان بە مەعنای (استقر) دێ ئیستیوا وە دوەمیان بە مەعنای (عەلا) دێ واتە بەرز بوەوە وە سێیەمیان بە مەعنای (ارتفع) دێ، وە چوارەمیان بە مەعنای (صەعیدە) دێ دەڵێ ئەو زانا بەڕێزەی کە موجتەهیدی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدیشە بەناوی ئەبو عوبەیدە کە پیاوێکە زۆر زانا بوە لە لوغە و لە عەرەبیدا دەڵێ ئەو بۆچونەی ڕاجیح و پەسەند کردوە لە تەفسیرەکەی بۆ ناوی ئیستیوا سیفەتی ئیستیوای الله تعالی -جل شئنه- ئەویش شارەزاترە و چاکتر زانیویەتی لە جەهمی دەربارەی قورئانی پیرۆز کە جەهمیەکان ڕەت دەکەنەوە الله تعالی خاوەنی سیفەتەکان بێ پەکی دەخەن و تەعطیلی دەکەن، دەڵێ ئەو شارەزاتریشە لە ئەشعەریەت کە تەفسیری وە لێکدانەوەی ئیستیوایان کردوە بە مەعنای (استولی) ئەوە بوختانە (پەنا بە خوای رب العالمین) بەو وشە کراوە و بە ئایەتەکانی قورئان.

جا هەندێک جار لە قورئان بەڵگەی تریش هەیە ئینجا بەڵگەشی بۆ دەهێننەوە ئەهلی سونە و جەماعە کە لە هەندێک شوێن ڕاشکاوانە لێی وەردەگیرێ ئیستیوا بە مەعنای (استقر) دێ ئەو وشە وەکو الله تعالی فەرموی: ﴿وَقِيلَ يَـٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَـٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ﴾ [هود: ٤٤] الله تعالی دەربارەی نوح پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ بە زەوی گوترا ئاوەکەت قوت دەوە کاتێک نوح پێغەمبەر (ﷺ) ماوەیەک ڕۆیشت لەناو ئاوەکە لەگەڵ کەشتیەکە و ئەوانەی لەگەڵیدا بون بە کەشتیەکە دەڵێ گوتمانە ئاسمانیش ئاوەکەت هەڵکێشەوە وە ئاو نەما وە لە پاشان الله تعالی دەفەرموێ فەرمانەکەی الله جێبەجێ بوو ئینجا کەشتیەکەی نوح پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ﴾ لەسەر جودی (استقرار)ی، ئیستیوا لێرە موفەسیرین یەک

دەنگن کە دەڵێن بە مەعنای (استقرار) دێ یانی جێگیر بوو لەسەر جودی لەوێوە وەستا، ئەوە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئیستیوا لە موستەڵەحی قورئانی هەندێک جار بە مەعنای (استقر) دێ.

وە بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێک جار بە مەعنای (ارتفع) دێ الله تعالی دەفەرموێ: ﴿كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ﴾ [الفتح: ٢٩] وەکو زەڕاعەتێک وایە کاتێ کە دەردەچێ لە زەوی ئەو زەڕاعەتە تەواو توند دەبێ وای لێدێ لەسەر پێیەکان و لقەکانی خۆی خۆی دەگرێ بەرز دەبێتەوە کەواتە ئیستیوا لێرە: ﴿فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ﴾ یانی (ارتفع عَلَىٰ سُوقِهِ) ئەگەر گەنمە ئەگەر هەر شتێکە لە زەڕاعەتەکە سوقەکە بڵێین قاچکەیەتی کە لە زەویەوە بەرز دەبێتەوە ئەو بەروبومە دەچێتە سەری قاچکەکە و لەسەر قاچکەکە دەبێ کەواتە بەرز بووەوە لەوێ و ئیستیوا لێرە موفەسیرین دەفەرمون بە مەعنای (ارتفع) دێ.

وە هەندێک جاریش بە هەموو ماناکان لێک دەدرێتەوە: ﴿فَإِذَا ٱسۡتَوَيۡتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلۡفُلۡكِ﴾ [المؤمنون: ٢٨] یانی ئەو کاتەی بەرز بویتەوە و جێگیر بوی تۆ و ئەوانەی لەگەڵتن لەسەر فولک بە مەعنای کەشتی دێ، ئەوە لێرەشدا کەواتە بە مەعنای جێگیر بون و بەرزبونەوە هات.

بەڵگاکان زۆرن بەڵام با بێین ڕونی کەینەوە ئایە چەند بیروبۆچون هەیە دەربارەی ئیستیوا هی تاقم و کۆمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە؟ چونکە ئیستیوا سیفەتێکی خواییە فیطرەت فعلیە کە ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونێکی تەواو و تایبەت و سەدا سەدییان بۆی هەیە کە ئەوە ڕاستە و دروست و صەوابە هەموو تاقم و کۆمەڵەکانی تر پێچەوانەن لەگەڵ ئەهلی سونە و جەماعە لە ڕاڤە و تەفسیر و لێکدانەوەی ئەو سیفەتە، هەرچی جەهمیەکانن ئینکاری دەکەن هی باقی سیفەتەکانی تریش دەڵێن ئەو سیفەتە واتاکەی وەکو سیفەت بۆ الله تعالی نیە و پەکی دەخەن، وە لە پاشان موعتەزیلەکانیش بە هەمان شێوە، وە

ئەشعەریەکانیش زۆرجار ئینکارییان ئەگەر نەشکردبێ ڕاشکاوانە تەئویلی دەکەن تەحریفی دەکەن ئەویشە هەر جۆرێکە لە ئینکار (پەنا بە خوای رب العالمین).
جا زۆرجار تەئویلەکانیش لەچی تەئویلی دەکەن؟ هەندێک جار مەعنای ئیستیوا تەئویل دەکەن بە مەعنای (استولی)، تەئویل یەعنی دەیگۆڕن وە هەندێک جار مەعنای عەرشیش تەئویل دەکەن هەر نەک ئیلا ئیستیواکە عەرشیش تەئویل دەکەن بە مەعنای موڵک بە مەعنای دەسەڵات بە مەعنای شتێ کە الله خاوەنیەتی -جل شئنە- نەک بە مەعنای عەرش و بارەگایەکی تایبەت بۆ الله تعالی، جا وەڵام بۆ ئەوانە زانایانی لوغەیش دەتوانن وەڵامیان بدەنەوە ئەهلی سونە و جەماعەش وا وەڵامیان دەدەنەوە دەڵێن باشە ئەگەر دەڵێن ئیستیوا بە مەعنای (استولی) دێ بڕۆن لە زانایانی لوغە بپرسن هی زمانی عەرەبی کە شارەزان، ئایە لە عەرەبیدا لە هیچ شوێنێک هەیە بەڵگە هەبێ ئیستیوا بە مەعنای (استولی) بێ مەعنایە حەقیقی و تەواوی و سەدا سەدیەکەی؟ جا ئەگەر ئەوە نیە و عەرەب وایان بەکار نەهێناوە تۆ بۆ لە خۆتەوە دێی ئەو مانایەی لێ وەردەگری؟ ئەوانیش دەڵێن ئەی ئەوە نیە دێڕە شیعرێکمان هەیە کە أخطل دیان بوە و نەسڕانی بوە گوایە گوتویەتی:

(قد استوى بشر على العراق
من غير سيف أو دم مهراق)

ئەوەتا بشر زاڵ بوە بەسەر عێڕاق ئیستیوا لەوێدا دەڵێن أخطل گوتویەتی بشر کاتێک عێڕاقی گرتوو بوە دەسەڵاتدار لە عێراق گوتویەتی ئەوەتە ئیستیوای کردوە بشر لەسەر عێڕاق بە مەعنای (استولی) و زاڵ بوە بەسەر عێڕاق و موسەیتیر بوە بەبێ ئەوەی شمشێر بوە شێنێ بەبێ ئەوەی خوێن بڕژێنێ، دەڵێن ئەوە نیە ئەشعەریەکان و ئەوانەی تەئویلی ئەوە دەکەن ئیستیوا لێرە لە قەولی أخطل لە زمانەوانیدا بە مەعنای (استولی) هاتوە؟ لە وەڵامیان ئەهلی سونە و جەماعە یەکەمجار دەڵێن ئەو بەیتە درۆیە لێکۆڵینەوەمان دەڵێن بۆی کردوە لە هیچێک لە پەرتوکەکان و نوسراوەکانی موسڵمانان نەنوسراوەتەوە کەواتە

دەتوانین بڵێین هیچ کەسێک بەڵگەی لە دەست نیە کە ئەو بەیتە شیعرە لە نوسراوی موسڵمانان نوسرابێتەوە و بەڵگەیەکی جێگیربێ، کەواتە کێ دەڵێ أخطل وایگوتوە؟ لە پاشان ئەگەر أخطل واشی گوتبێ مادەم پێچەوانەی ئایەت و حەدیسی سەحیحە و أخطل خۆشی نەسڕانی بوە قسەی ئەو ڕەتکراوەیە بە ئایەت و حەدیس، جواب و وەڵامی دوەمیش دەڵێن ئیستیوا لە وشە و دەربڕین و بەیتەکە ئەگەر بڵێین هی أخطلیشە شەرت نیە بە مەعنای (استولی) بێ بۆ نایەی یەکسەر بە مەعنای ئیستیوای لە قەڵەم بدەی؟ کە بڵێین کاکە بە مەعنای (استقر) هاتوە یان بە مەعنای (علی) هاتوە بەرز بوەتەوە بەسەر عێڕاقدا بۆ ئەوە ناڵێی؟ بۆ یەکسەر دەڵێی (استولی)؟ وە لە پاشان وەڵامێکی تریش ئەوەیە أخطل بەخۆی کەسێکی نەسڕانی بوە قسە لە نەسڕانیەک وەرناگیرێ دەربارەی عەقیدە و بیرو بڕوا کێ دەڵێ ئەگەر واشی گوتبێ واش بوبێ تەنها بۆ ئەوە وای نەگوتوە هەتاوەکو عەقیدە و بیروبڕوای موسڵمانان تێک بچێ و قسەکەی ئەو بە بەڵگە بێتەوە؟ کەواتە ئەوانە هیچیان بەڵگە نین لەسەر ئەوەی کە بڵێین أخطل وایگوتوە و قسەکەی وەربگیرێ، جا ابن القیم -رحمە اللە- لە نونیەکەی دەفەرموێ:

(ودليلهم في ذاك بيت قاله

فما يقال الأخطل النصراني[١])

دەڵێ لەجیاتی بچن بە ئایەت بەڵگە بێننەوە لە جیاتی بە حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر بێننەوە (ﷺ) بەڵگەی ئەوانەی تەئویلی ئیستیوا دەکەن بە (استولی) شعرێکە گوایە أخطلی نەسڕانی گوتویەتی، ئایەت لە کوێ؟ حەدیس لە کوێ؟ باشە قسە ڕاشکاوەکانی ئەهلی لوغە لە کوێ کە هێناوێتیان هی عەرەبی؟ بۆ دەچی یەخەی بەیتێک دەگری؟ کە گومان هەیە أخطل وایگوتبێ ئەگەر واشی گوتبێ کەسێکی نەسڕانیە دەکرێ بۆ دژایەتی ئیسلام و قورئان و حەدیس وایگوتبێ وە ئینجا بۆشت هەیە لەو شیعرەشدا ئیستیوا بە

[١] ابن القيم الكافية الشافية - ط مكتبة ابن تيمية [ابن القيم] ص: ٣٩.

ئیستیوا لێک بدەیەوە بە مەعنای (علی وارتفع) یانی بەرز بوەتەوە و زاڵبوە بەسەر عێڕاقدا بۆ دەڵێی بە مەعنای (استولی)؟

کەواتە ئەوانە هیچیان بەڵگە نین و وە ڕەتکراوەن و ناشێ و ناگونجێ بۆ الله تعالی یش -جل شئنە- ئەهلی سونە و جەماعە قسەیەکی لەجێ دەهێننەوە دەڵێن دەشێ و دەگونجێ بڵێین الله (استواء علی الأرض)؟ ئەشعەریەکان و هەموو بە یەکدەنگی تاقم و کۆمەڵەکانی تر دەڵێن نەخێر، ئێ ئەگەر نەخێر ئەگەر بە مەعنای (استولی) بێ دەبێ بشێ، چونکە الله تعالی ئایە زاڵ نیە بەسەر زەوی؟ (نعوذ بالله) ئەگەر بڵێی زاڵ نیە کوفرە و شیرکە ئێ ئەگەر بە مەعنای (استولی) بێ دەبێ بشێ و بگونجێ جائیزبێ ئێمە بڵێین (استولی علی الأرض) الله تعالی چۆن (استواء علی العرش) بە مەعنای (استولی) بێ لەسەر قسەی ئەوان، ئەگەر ئیستیوا بە مەعنای (استولی) بێ بە مەعنای ئەوەی دەشێ و دەبێ بشگونجێ بڵێین (استولی علی الأرض) ((استولی علی عبادە) دەشێ و دەگونجێ؟ دەڵێن ناشێ ناگونجێ بۆ الله وابگوترێ، ئێ ئەگەر دەڵێن ئیستیوا بە مەعنای (استولی)یە دەبێ بگونجێ چونکە (استولی) یانی بە واتای زاڵبون و دەسەڵاتدارە بەسەر جا الله تعالی -جل شئنە- کەس گومانی لەوە نیە زاڵە و دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو مەخلوقەکانی نەک ئیلا بەسەر عەڕش، ئەی بۆ دەڵێن بەس لەسەر عەڕش؟ ئینجا ئەوکات ئەوان خۆیان مەجبور کردوە دەڵێن بابە عەڕش خۆ بارەگایەکی تایبەت نیە بۆ الله تعالی عەڕش موڵکە موڵکی الله یانی (استولی علی الملك) ئەوە ماناکەی وا لێک دەدەنەوە و ئەوانەش هەر هەموو بێ بەڵگەن کەوا دەڵێن.

ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وایە بیروبڕویان وایە کە: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ [طه: ٥] بە مەعنای ئەوەیە اللەی ڕەحمان -جل شئنە- (ولله المثل الأعلی) بە مانایە حەقیقیەکەی ئیستیوای کردوە لەسەر عەڕش کە بە مەعنای (علا وارتفع) دێ یان بە مەعنای (صعد واستقر) دێ بەبێ ئەوەی چۆنیەتیەکەی بزانین وەکو باقی سیفەتەکانی تری

الله تعالی ئێمە نازانین و چۆنیەتی و کەیفیەتیەکەی چۆنە ئایە (علا وارتفع) یان (صعد واستقر) ئیستیوای الله تعالی وەکو ئێمە ئیستیوا دەکەین لەسەر کورسی یان لەسەر مێزێک یان لەسەر زەوی؟ نەخێر دڵنیاین وەکو ئەوە نیە چونکە الله تعالی هاو وێنەی نیە الله تعالی -جل شئنە- بە هیچ کەس و شتێک ناچێ هیچ کەس و شتێکیش بە الله ناچێ لە ذات لە سیفات لە ناوە زۆر جوانەکانیدا، چۆنیەتیەکەی نازانین هی الله تعالی تاک و تەنهایە لە ئیستیواکەی بەڵام بە مەعنایە حەقیقیەکەی دێ ئەوە کورتی و پوختی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە دەربارەی ئیستیوا.

کەواتە لە ئایەتەکان کە ابن تیمیة -رحمه الله- هێنایەوە سەلماندی کە الله تعالی لەسەر عەرشە کە دەڵێین ئیستیوا ئیستیوا بە مەعنای (علا وارتفع وصعد واستقر) دێ لە زمانی عەرەبیەوە وەکو ابن القیم لە نونیەکەی هێناوێتی و وە (استولی) مانایەکی دورە کە بۆی لێک دەدەنەوە هیچ بەڵگەیەکیان نیە ئەو زانایانە، ئەسڵەن (استولی) ئەگەر بڵێی الله تعالی (استولی)ی کردوە بە مەعنای ئەوەی ئیلا دیارە لەسەر عەرش دەسەڵاتی هەیە نا الله تعالی -جل شئنە- لە هەموو شوێن و جێگایەکان دەسەڵاتی هەیە ئەگەر بە مەعنای (استولی)یە ئەی بۆ ناشێ و ناگونجێ بڵێین (استواء علی الأرض)؟ یانی جائیز نیە و دروست نیە لەبەر ئەوەی ئەگەر بە مەعنای (استولی) بێ دەبێ بشێ و بگونجێ الله تعالی کە زاڵە بەسەر زەویشدا بەسەر هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکانیدا، ئینجا لە پاشان گوتمان لە لایەک تەئویلی ئیستیوا دەکەن بە (استولی) وە تەئویلی عەرشیش دەکەن هەندێکیان بە موڵک و دەسەڵاتی الله تعالی، جا ئەگەر بڵێین عەرش موڵکی الله تعالی یە یانی (استولی علی ملکە) الله تعالی زاڵ بوە بەسەر موڵک و ئەوانەی کە موڵکی الله تعالی یە لە هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان ئەوەشیان هەڵەیە چونکە عەرش مانای تایبەتی خۆی هەیە الله تعالی -جل شئنە- بەو مانایە هێناوێتی، ناگونجێ و ناشێ ئێمە بڵێین عەرش موڵکی

الله تعالى یە -جل شئنە- بۆ ئیلا باسی عەرشی کردوە و بە موڵک ناوی بردوە؟ بەڵگە و دەلیلی دەوێ.

کەواتە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ [طه: ٥] یەعنی الله تعالی لەسەر عەرش ئیستیوای کردوە بە مانایە حەقیقی و ڕاستەکەی ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین (کما یلیق بجلاله سبحانه وتعالی).

## جێگیر کردنی سیفەتی (العلو) لە قورئاندا:

﴿يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ [آل عمران: ٥٥]، ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ﴾ [النساء: ١٥٨]، ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ [فاطر: ١٠]، ﴿يَا هَامَانُ ابن لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الأَسْبَابَ * أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لأَظُنُّهُ كَاذِبًا﴾ [غافر: ٣٦-٣٧]، وَقَوْلُهُ: ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ * أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾ [الملك: ١٦-١٧].

---

جا لەو ئایەتانە هەموو جێگیر بوە سیفەتی علو و بەرزایەتی بۆ الله تعالی -جل شئنە- بە چەندین ئسلوب و شێواز الله تعالی -جل شئنە- بۆخۆی جێگیری کردوە کە الله تعالی بەرزە -جل شئنە- بەسەر هەموو مەخلوق و بەدیهێنراوەکانی هەم لە ڕوی زاتی بەرزە هەم لە سیفاتەکانی هەم لە ناوە زۆر جوانەکانی -جل شئنە- (ولله المثل الأعلی).

جا یەکێک لەو ئایەتانە کە بە بەڵگە هێناویەتیەوە ابن تیمیة -رحمه الله- باسی ڕەفعی تێدایە یانی بەرز بونەوە جا ڕەفع هەر ئەوە بەخۆیەوە هەڵدەگرێ لە نزمی کە شتێک بەرز دەبێتەوە دیارە شتەکە بۆلای دەچێت بەرزە لەبەر ئەوە الله تعالی یش بەرز کردنەوەی عیسا پێغەمبەر (ﷺ) کە لە زەوی بوە کاتێک جولەکەکان پیلانی ئەوەیان بۆ دانا بیکوژن الله تعالی یش ئەوەبوو یەهوذا کە یەکێک بوو لە خیانەت کارەکان لەگەڵ عیسا پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگا و شوێنی عیسای بە جولەکەکان پیشاندا، ئەوکاتە الله تعالی یەهوذا چوە ژورەوە و عیسا لەوێدا نەبوو لەبەرچاوی یەهوذا نەمابوو الله تعالی هەڵی کێشابوو بەرەو

ئاسمان، یەهوذا هەرکە هاتە دەرەوە بە عیسا چوو بە بەرچاوی جولەکەکان هەر یەهوذایان گرت و کوشتیان و وە لە پاشانەکە لە خاچیاندا ئەوەش تۆڵەبوو الله تعالى لە یەهوذای ستاندەوە ئینجا ئەوکاتە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ [آل عمران: ٥٥] بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە: ﴿مُتَوَفِّيكَ﴾ مەبەستی پێ مردن نیە ئەلێرە بەڵکو مەبەستی پێ نوستنە یەعنی دەدنوێنم بە نوستوێتیەوە هەڵت دەکێشم بەرەو ئاسمان کە هۆشت تەواو لەخۆت نەبێ چونکە زۆر زەحمەت و قورسە مرۆڤەکان بە زیندوێتی و بە ئاگایەوە بڕۆن بەرەو ئاسمانەکان لەبەر ئەوە الله تعالى وای فەرموو یانی مردنێکی وەکو نوستن بێ یان نوستنێکی وەکو مردن کە لە کوردەواری و لە عەرەبیشدا دەگوترێ دەڵێن نوستن برای مردنە یان (النوم أخ الموت)، ئینجا کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ ئەی عیسا من تۆ هەڵدەکێشم و بەرزت دەکەمەوە بۆلای خۆم، جا ئەوە ئەوە دەگەیەنێ کە الله تعالى بەرزە -جل شئنە- لە سەرووی ئاسمانەکانە لەبەر ئەوە ئەو وشەی بەکارهێنا و ئاوای دەربڕی.

جا مەسەلەی ڕەفع بەرزیایەتی الله تعالى و دەربڕینی بە وشەی ڕەفع ئەوە هیچ تەئویلێک بەخۆیەوە هەڵناگرێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاقم و کۆمەڵاکانی تر جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە تەئویلیشی دەکەن، ئەوەتا ابن القيم وەکو لە نونیە پێیان گوتن دەربارەی مانا کردنی ئیستیوا کە لە ئاخیری بەیتەکە دەڵێ:

(ولهم عبارات عليها أربع
قد حررت للعالم الرباني
***
وهي استقر وقد علا وكذلك ار
تفع الذي ما فيه من نكران)[١]

[١] ابن القيم الكافية الشافية - ط مكتبة ابن تيمية [ابن القيم] ص: ٨٧.

دەڵێ ئەو عیبارەت و دەربڕینانە لەو زانایەی کە خواییە کە جێگیری کردوە و مانای لێکی داوەتەوە (استقر)ی.ه ەەندێک جار ئیستیوا بە مەعنای (علا)ی.ه وە بە م.ەعن.ای (ارتفع)یە دەڵێ بەس (ارتفع) کەس ناتوانێ ئینکاری بکا ئەگەر ئەوانی تریش بتوانن مانایەکی تری لێ وەرگرن بەڵام وشەی (ارتفع) یانی بەرز بونەوە کە اللە تعالی دەفەرموێ: ﴿وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ هیچ تەئویلێک بە خۆیەوە هەڵناگرێ مەگەر بڵێین بەرز بونەوە کە دەڵێ بۆلای من دیارە اللە تعالی -جل شئنە- بەرزە (وللە المثل الأعلی) وە لە سەروی هەموو مەخلوقات و بەدیهێنەرەوەکانێتی وە لە سەروی ئاسمانەکانە -جل شئنە-.

لە پاشان لە ئایەتەکەی تر اللە تعالی فەرموی ابن تیمیة بە بەڵگەی هێنایەوە بۆ بەرزی اللە تعالی دەڵێ کاتێک جولەکەکان دەڵێن ئێمە عیسامان کوشت اللە تعالی دەفەرموێ: ﴿وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡ﴾ [النساء: ١٥٧] اللە تعالی دەڵێ جولەکەکان قسەیان هەیە و دەڵێن ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان ڕەوانەکراوی اللە کوشتمان بەڵام نەیان کوشت لە خاچیشیان نەدا بەڵکو ئەوەی وە عیسامان چواند و هاتە سەر وێنەی ئەو لەبەر چاوی ئەوان کە یەهوذا بوە ئەویان کوشت، ئینجا لە کۆتاییەکەی اللە تعالی دەفەرموێ: ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْه﴾ بەڵکو ئەی عیسا چی لێهات لەو ناوە؟ بۆ بزر بوو؟ اللە تعالی دەفەرموێ بەڵکو اللە تعالی عیسای ڕەفع کرد و بەرز کردەوە بۆلای خۆی، ئینجا ئەوان تەئویلاتەکان لەوێوە دەست پێدەکات: ﴿وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْه﴾ دەڵێن: ﴿إِلَيَّ﴾ مەبەستی پێی خۆی نیە یانی بۆ موڵکی من بۆ دەسەڵاتی تایبەتی من یان بۆ ئاسمانەکەی من بەرز بوەتەوە تەئویلێکی دورە، یان دەڵێن: ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْه﴾ دەڵێن (إلی سمائە) (إلی أمرە) (إلی مکان خاص) لە دەسەڵات و موڵکی اللە تعالی ئەوانە هەموی تەئویل و گۆڕانکارییە بەسەر مانایەکەی دەهێنن و هیچ دەلیل و بەڵگەیەکیان نیە.

بەڵگەیەکی تر کە ابن تیمیة هێناویەتیەوە بۆ جێگیر کردنی سیفەتی بەرزی و علو بۆ الله تعالى الله تعالى فەرموی: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ [فاطر: ١٠] واتە کردەوە چاکەکان لە تەسبیحات و زیکرەکان و یادی الله (سبحان الله) و (الحمدلله) ئەوانە کەلیم و طەیبن موفەسیرین دەفەرمون ئەو زیکر و قسە چاک و دۆعا و پاڕانەوانە بەرز دەبێتەوە بۆلای الله تعالى، کە (صَعِدَ) بە مەعنای بەرز بونەوە دێ لە نزمی و زەوی شتێک بەرز بێتەوە بەرەو ئاسمان و بەرزی ئەوە وشەی صەعیدەی بۆ بەکاردێ جا الله تعالى کە فەرموی: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ﴾ یانی بەرز دەبێتەوە، تەنانەت ئەمڕۆ ئالەتێک هەیە پێی دەڵێن مەصعەد، مەصعەد چیە؟ مەصعەد یانی شتێکە تۆ سواری دەبی لە نزمی بەرزت دەکاتەوە، کەواتە الله تعالى کە وشەی یەصعەدوی بەکار هێنا کە فعلێکە وە دەڵێ کردەوەکان و تەسبیحاتەکان و کەلیماتی طەیب و کە (سبحان الله) و (الحمدلله) زیکر و یادەکانی الله تعالى یە بەرز دەبێتەوە بۆلای الله، دیارە الله تعالى بەخۆی بەرزە -جل شئنە- وە لە سەروی ئاسمانەکانە لەبەر ئەوە بۆلای ئەو بەرز دەبێتەوە: ﴿وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ کردەوە چاکەکان ئەویش هەر بەرز دەبێتەوە بۆلای الله تعالى، جا لەو ئایەتەدا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون الله تعالى لەنێوان وشەی صوعود و ڕەفع جەمع و کۆی کردونەتەوە هەردوکیان بە مەعنای بەرز بونەوە دێن کەواتە دیارە الله تعالى -جل شئنە- بەرزە و لە سەروی ئاسمانەکانە.

لە پاشان تەئویلی دەکەن ئەوانە بە تەئویلی نەزانانە بەڵام الله تعالى وەری ناگرێ و قبوڵی ناکا هەندێک جار بە عرٶج وەکو الله تعالى دەفەرموێ: ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ﴾ [المعارج: ٤] ئەوەش بە مەعنای ئەوە دێ کە لە نزمی دیسان بۆ بەرزی وەکو میعراجی پێغەمبەریش (ﷺ)، میعراج یانی چی؟ یانی لە زەویدا بڕۆی و بفڕی بەرەو ئاسمانەکان بەرزبیتەوە بەرەو ئاسمانەکان، جا کەواتە الله تعالى کە دەفەرموێ: ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ﴾ واتە بەرز دەبنەوە فریشتەکان ڕۆح و گیانی کێشراوی بەندەکەشیان پێیە و

لەگەڵیانە بەرەو لای الله تعالی، کەواتە ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ الله تعالی -جل شئنە- سیفەتی بەرزی هەیە وە لە سەروی حەوت ئاسمانەکانە.

وە لە ئایەتەکەی تر لە سەرگوزشتەی فیرعەون الله تعالی -جل شئنە- بۆمان دەگێرێتەوە دەفەرموێ فیرعەون گوتی: ﴿يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الأَسْبَابَ﴾ هامان وەزیری دەستە ڕاستی فیرعەون بوو بانگی لێکرد و گوتی ئەی هامان وەرە بینایەک و شتێکی بەرزم بۆ دروست بکە بەڵکو من بگەمە هۆکارەکانی بەرز بونەوەم بەرەو ئاسمان: ﴿أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى﴾ بەڵکو بگەمە شوێنە بەرزیەکانی ئاسمان هەتا لەوێ تەماشا بکەم و بڕوانم بەسەر خوای موساوە، ئینجا لە کۆتایەکەیدا دەڵێ: ﴿وَإِنِّي لأَظُنُّهُ كَاذِبًا﴾ چونکە من وا گومان دەبەم کە موسا درۆزن بێ (پەنا بە خوای رب العالمین) خوای نەبێ و لەوێ نەبێ الله تعالی.

جا هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون جا فیرعەون گوتویەتی من خوام بەڵام موسا (ﷺ) فەرمویەتی تۆ خوا نی خوای حەق و ڕاستەقینە اللەیە، دیارە فیرعەونیش لێی پرسیوە الله لە کوێیە؟ کوا خواکەی تۆ دەنا؟ مادەم دەڵێی خوام هەیە لە موناقەشە و گفتوگۆ ئەوە ئەوەی لێ دەوەشێتەوە ئەو واتایە هەر واش دێتە بەر شاشەی عەقڵ و مەنتیقیشە قسەکە، ئینجا لە پاشان موسا دیارە پێیگوتوە خوای من بەرزە لە سەروی ئاسمانەکانە لەبەر ئەوە فیرعەون دەڵێ من دەچم لە ئاسمان، ئەگەر قسەیەکی وای پێ نەگوترابا باشە فیرعەون چۆن دەزانێ الله تعالی لە ئاسمانە؟ جا کەواتە موسا بۆ ئەوی سەلماندوە الله تعالی لە ئاسمانە و واتە لە سەروی ئاسمانەکانە وە فیرعەونیش بۆ خەڵکەکە هەر وا دەڵێ، دەڵێ دەچم لە ئاسمان بزانم خوای موسا ببینم و هەرچەندە من وا گومان دەبەم (نعوذ بالله) موسا درۆزنە، کەواتە ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ الله تعالی خاوەنی سیفەتی بەرزییە وە لە سەروی ئاسمانەکانە.

لە پاشان موعتەزیلە و ئەشعەریەکان وە جگە لەوانیش لە فیرقەکانی تر دەڵێن ئەوە گومانێکی فیرعەونی بوە ئەوە نابێتە بەڵگە دەڵێن ئەوەش کە بڵێ و بیرو بڕوای وابێ بڵێ اللە لە ئاسمانە ئا ئەوە خۆیان چواندوە بە فیرعەون یەعنی قسەکەیان عەکس کردوەتەوە، جا فیرعەون ئەوە دانی پێدا هێناوە دەڵێ من دەچم لەوێ ببینمەوە ئینجا لە بەرامبەر موسا وا دەڵێ ئینجا ئەو قسە نابێ هی فیرعەون بێ چونکە فیرعەون پێی وابوە اللە هەر نیە (نعوذ باللە) ئاوای بەرامبەر خەڵکەکە دەربڕیوە هەر گوتویەتی من خوامە، ئیلا دەبێ موسا پێی گوتبێ و پێی ڕاگەیاندبێ کە اللە تعالی لە سەروی ئاسمانەکانە لەبەر ئەوە فیرعەونیش دەڵێ دەچم لەوێ دەیدۆزمەوە و بیبینمەوە و تەماشای بکەم یانی یان ئەگەر هەبێ بیکوژم (نعوذ باللە) وە ئەگەر نەشبێ کە ئەمن گومانم وایە دەڵێم موسا (نعوذ باللە) درۆزنە نیە پێتان ڕابگەیەنم، چونکە فیرعەون دەڵێ: ﴿فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ ٱلأَعلَىٰ﴾ [النازعات: ٢٤] من پەروەردگار و خوای مەزنی ئێوەم (پەنا بە اللە)، یان دەڵێ: ﴿مَا عَلِمتُ لَكُم مِّن إِلَـٰهٍ غَيرِى﴾ [القصص: ٣٨] من نەمزانیوە و عیلم و زانستیم نیە کە هیچ خوایەکی تر هەبێ جگە لە من، ئێ ئەگەر ئەو قسانە وایە کەواتە ئیلا دەبێ موسا پێی گوتبێ بە فیرعەون کە اللە تعالی لە سەروی ئاسمانەکانە ئەگەرنا فیرعەونیش وای نەدەگوت.

وە ئایەتەکەی تر کە ابن تیمیة -رحمه اللە- بە بەڵگە هێناویەتیەوە بۆ سەلماندن و جێگیر کردنی سیفەتی علو بۆ اللە تعالی ئەویش اللە تعالی فەرموی: ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ ئایا ئێوە ئەمینن لەوەی لە ئاسمانە ئەو زاتەی لە ئاسمانە کە اللەیە -جل شئنه- گوتمان کە دەڵێ لە ئاسمانە ئەو (فِي)ە بە مەعنای (علی)یە یەعنی لە سەروی ئاسمانەکانە ئەگەرنا ئاسمان و هیچ شتێک لە مەخلوق و بەدیهێنراوەکان ناتوانێ دەوری اللە بدا -جل شئنه- اللە زۆر لەوە مەزنتر و گەورەترە ئەو بۆخۆی دەوری هەموو شتەکانی داوە وە عیلم و زانستیەکەی ئەوە دەوری هەموو شتەکانی داوە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى) کەواتە اللە لە سەروی ئاسمانەکانە، ئینجا: ﴿أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ

تَمُورُ﴾ ئەوە عەزابێکتان بەسەر بێنێ و نغرۆتان کا و ژێر زەویتان بکات و بتان باتە خوارەوە لە زەوی، یان: ﴿أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا﴾ یان ئەمینن ئێوە لە خوایەک کە لە ئاسمانەوە دەرد و بەڵاو بایەکتان بۆ بنێرێت، کەواتە ئەوانە هەردوو ئایەتەکان بەڵگە بون لەسەر ئەوەی الله تعالى دەیسەلمێنێ و ڕاشکاوانە دەفەرموێ لەو زاتەی لەو خوایەی کە لە ئاسمانە بە مەعنای لە سەروی ئاسمانەکانە کەواتە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی الله تعالى خاوەنی سیفەتی علوە.

جا هەندێک وا تەئویلی دەکەن (پەنا بە الله) موعتەزیلەکان ئەشعەریەکان هەندێک لە تاقم و کۆمەڵەکانی تر دەڵێن: ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ﴾ یانی (أمره) ئەمینن ئێوە لەوەی کە ئەمرەکەی لە ئاسمانە، ئێ ئەمری الله بۆ بەس لە ئاسمانە یەعنی؟ دەبێ لەلای خۆیبێ -جل شئنە- ئەوە تەئویلێکی زۆر دورە یان دەڵێن (أو من في السماء ملكه) یەعنی ئەوەی کە دەسەڵاتی موڵکی لە ئاسمانە، ئەوانە هەموی تەئویلی دورن وە مەعنایە ڕاستەقینەکەی تەواوی خۆی بە گوێرەی ئەوەی شارەزابێ لە زمانی عەرەبی نایگەیەنێ لەبەر ئەوە باشتر و ئەولاتر وایە ئەو تەئویلانە وەلا بنرێ بگوترێ مەبەست پێی زاتی الله تعالى یە -جل شئنە- هەر ئەوەی لێ دەوەشێتەوە بەڵام لە سەروی ئاسمانەکانە (ولله المثل الأعلى) سیفەتەکەی علوی الله تعالى ئاوا دەبێ جێگیری بکەین.

جا ئەو تاقم و کۆمەڵانە کاتێ کە ئەو ئایەتانە تەئویل دەکەن وە قسەی بۆ دەهێننەوە کە مانایە سەرەکی و ظاهیریەکە نایگرێتەوە لە هەر هەمویان نزیکتر لە ئەهلی سونە و جەماعە ئەشعەریەکانن چونکە ئەوان دان دەنێن بە هەندێک لە سیفەتەکانی الله تعالى بەڵام یەک لە کێشەکانی هەیانە لەگەڵ ئەهلی سونە و جەماعە مەسەلەی سیفەتی علوە بۆ الله تعالى وە ئیستیوائە بۆ الله تعالى لەوانە کێشەیان هەیە لەگەڵ ئەهلی سونە و جەماعە، لە هەندێک بۆچونەکان بەگەڵ ئەهلی سونە و جەماعە دەکەون لە هەندێک بۆچونەکان بەگەڵ موعتەزیلەکان دەکەون چونکە ئەشعەریەت خۆی لە خۆیدا لەو ناوە پەیدابوو، سەرەتا

جەهمیەکان و ئینجا موعتەزیلەکان هەبون کە تەئویلی ئەسماء و سیفاتیان دەکرد یان ڕەتیان دەکردەوە پەکیان دەخست تەعطیلیان دەکرد بەڵام أبو الحسن الأشعري -رحمه الله- کە یەکێک بوو لە قوتابیە مەزنەکانی قوتابخانەی موعتەزیلایەتی کە زڕ باوکەکەی کە دایکی شوی کردبۆوە بە عبد الجبار الجباهي کە ئەو یەکێک بوو لە زانا زۆر گەورەکانی موعتەزیلە دیارە دەرسی لەلا دەخوێند، جارێکیان دەرسەکە نەگەیشتە عەقڵ و مێشکی بیری زۆر لێکردەوە چەند پرسیارێکی لە مامۆستاکەی خۆی کرد کە زڕ باوکیشی بوو وە لە پاشان لێی جودا بوەوە ئەوەبوو موتەوەکیلیش ئەو کاتە بوو کە هاتبوە سەر حوکم خەڵکەکە دەوێرا بە ئاشکرا بڵێ من موعتەزیلە نیم چونکە موتەوەکیل کە هاتە سەر حوکم لە پاش خەلیفە موعتەزیلەکان ئەوەبوو دونیا ئارامتر بویەوە کەسێک بوو پشتگیری سونەتی پێغەمبەری کرد (ﷺ) ئەهلی سونە لەوێ ژیانەوە بوژانەوە لە ژێر دەستەیی ڕزگاریان بوو، ئەو خەلیفە کە هاتە سەر حوکم لەوێوە أبو الحسن الأشعري ئەو بۆچونانەی بۆ دروست بوو کەوتە نێوان موعتەزیلەکان دەرسی لەلای ئەوان خوێندبوو زۆر مەعلومات و بیروبۆچونەکانی و ئەوانی لەلا مابوەوە وە هاتەوە سەر ئەهلی سونە و جەماعە لە هەندێک شتەکان، کەواتە (كان متذبذباً بينهما بين هؤلاء وهؤلاء) یانی لەنێوان هەردوکیان دەهات و دەچوو لە کۆتایەکەشی بۆچونی ڕاجیح و پەسەند أبو الحسن الأشعري لە ئەشعەریایەتیش ئەوەی لە نێوان موعتەزیلایەتی و ئەهلی سونە و جەماعە بوە گەڕاوەتەوە بە تەواوەتی بۆ سەر ڕێبازی پێشینانی چاک و سەحابەکان، وە کیتابی الإبانة بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن هی ئەوە وە وتە و قسەکانیشی تۆمارە لە پەرتوکی تریش کە بە تەواوەتی بوەتەوە ئەهلی سونە و جەماعە و هاتوەتەوە سەر ڕێبازی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و پێشینانی چاک.

جا ئەو زانایانەش هەندێک هەن کە بە ئەهلی سونە و جەماعە حیسابن بەڵام هەندێک جار لە خاڵێکی لە بڕگەیەک لە سیفەتێک تەئویلیان کردوە و لایانداوە بەوەندە نابنە فیرقەی

ضاله لەلای ئەهلی سونە و جەماعە یانی لە تاقمە گومڕایەکان حیساب بکرێن یان لابدرێن لە ئەهلی سونە و جەماعە، لەوانە ئیمامی نەوەوی ابن حجر العسقلاني لە هەندێک شوێن ئەگەر تەئویلیشیان هەبێ بەڵام لە زۆر جێیەکانی تر موافقن لەگەڵ ئەهلی سونە و جەماعە هەر لە بازنەی ئەهلی سونە و جەماعە دادەنرێن بەڵام دەگوترێ ئا لەو خاڵە لەو شتە تێبینی و فلانیان لەسەرە و وە لێکدانەوەیان بۆ کراوە و عوزریشیان بۆ دەهێنرێتەوە چونکە ئینسانی باش و پاک بونە وا دەفەرمون زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوانەی لەدوای ئەوان هاتون.

## جێگیر کردنی سیفەتی (المعية) لە قورئاندا:

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ [الحديد: ٤]، وَقَوْلُهُ: ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَى ثَلاثَةٍ إِلاَّ هُوَ رَابِعُهُمْ وَلا خَمْسَةٍ إِلاَّ هُوَ سَادِسُهُمْ وَلا أَدْنَى مِن ذَلِكَ وَلا أَكْثَرَ إِلاَّ هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَمَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ [المجادلة: ٧]، ﴿لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ [التوبة: ٤٠]، وَقَوْلُهُ: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ [طه: ٤٦]، ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾ [النحل: ١٢٨]، ﴿وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ [الأنفال: ٤٦]، ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ [البقرة: ٢٤٩].

---

جا لەو ئایەتانە دەردەکەوێ کە الله تعالى سیفەتی مەعیەتی هەیە و لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدایە، جا ئەو مەعیەتە لە عەقیدە و بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعە دەبێتە دوو جۆر: (جۆری یەکەمیان پێی دەگوترێ لەگەڵدابونی عام و گشتی، جۆری دوەمیان پێی دەگوترێ مەعیەت و لەگەڵدابونی تایبەت).

گشتیەکە لەگەڵ هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکاندایە -جل شئنه- لەگەڵ کافر لەگەڵ موسڵمان لەگەڵ هەر هەمویان بە گشتی، وە خاصەکە تەنها لەگەڵ بڕواداران و ئەهلی

تەوحید و موسڵماناندایە وە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە سەروی هەمویان وە لە پاشان هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پێشینانی چاک وە پیاوچاکان لە هەموو سەردەمێکدا وە ئافرەتانی صاڵیحە الله تعالی لەگەڵیان دایە بە لەگەڵدابونێکی سەرخستنیان و پشتگیری کردنیان و ڕەحم پێکردنیان و وە ئیش و کار ئاسان کردن بۆیان.

جا لەگەڵدابونی گشتی الله تعالی ئەوە بەڵگەیە لەسەری موفەسیرین دەفەرمون: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ [الحديد: ٤] کە یەکەمجار ابن تيمية ئەو ئایەتەی بە بەڵگە هێنایەوە یەعنی الله لەگەڵتانە ئێوە لە هەر شوێن و جێگایەک بن یەعنی لەگەڵ مەخلوق و دروستکراو و بەدیهێنراوەکانە الله تعالی لە هەر شوێنێک هەبن، ئینجا یان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ [النساء: ١٠٨] ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی الله تعالی مەعیەتی گشتی لەگەڵدابونی گشتی و عام لەگەڵ هەموو بەدیهێنراوەکانە چونکە ئەگەر لەگەڵیاندا نەبێ ڕاناوەستن ئیشیان مەیسەر نابێ وە بەدی نەدەهاتن و کەم و کورتیان تێ دەکەوێ الله تعالی لەگەڵیانە ڕایگرتون ئیش و کاریان مەیسەر دەکا لەبەر ئەوەی هەتا تاقیکردنەوە و ئینتیحانیش دروست ببێ، جا مەعیەتی خاص و تایبەتیش ئەوەیە کە الله تعالی لەگەڵ پێغەمبەرانە (عليهم الصلاة والسلام) وە لەگەڵ پیاوچاکانە لەگەڵ ئافرەتانی صاڵیحەیە کاتێ کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ [التوبة: ٤٠] پێغەمبەر (ﷺ) لە ئەشکەوتەکە لەکاتی هیجرەت و کۆچکردنی دەفەرموێتە ئیمامی ئەبو بەکر غەمگین مەبە چونکە بەڕاستی اللهمان لەگەڵە لەگەڵدابونی الله لەوێ یەعنی اللهمان لەگەڵە بۆ ئەوەی پشتگیریمان بکا اللهمان لەگەڵە بۆ ئەوەی سەرمان بخا، یان الله تعالی دەفەرموێتە موسا و هارون (عليهما الصلاة والسلام) بڕۆنە لای فیرعەون مەترسن: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه: ٤٦] من لەگەڵتاندام بە مەعنای لەگەڵدابونی تایبەتە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون لەو ئایەتە یەعنی سەرتان دەخەم پشتتان دەگرم مەترسن، وە لە پاشان الله تعالی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَّالَّذِينَ

هُم مُّحْسِنُونَ﴾ [النحل: ١٢٨] الله تعالى لەگەڵ ئەوانەیە كە تەقوای الله دەكەن و لە الله دەترسێن وە ئەوانەی چاكە كارن بە لەگەڵدابونێكی تایبەت و خاص واتە پشتیان دەگرێ سەریان دەخا، یان الله تعالى دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ [الأنفال: ٤٦] الله تعالى بەڕاستی لەگەڵ ئارام گرانە یەعنی پشتیان دەگرێ پاداشتیان دەداتەوە سەریان دەخا.

جا مەعیەتی گشتی و عام زیاتر بەو مانایە دێ و ئەوەی لە قەزا دەخوازێ كە عیلم و زانستی وە قوڕب و نزیک بونەوە وە چاودێری بون بەسەر شتەكان یەعنی الله تعالى كە دەڵێین لەگەڵ مەخلوقات و بەدیهێنراوەكانە بە گشتی وەكو مەعیەتی عام وەكو ئەهلی سونە و جەماعە فەرمویان كە بەشی یەكەم و جۆری یەكەمی مەعیەت و لەگەڵدابونی اللەیە بە مەعنای الله عیلمی پێیان هەیە عیلمی لەگەڵیاندایە الله لێیان نزیكە الله تعالى چاودێرە بەسەریان بەو مەعنایەی موراقیبە و هەموو ئیش و كارەكانیان دەبینێ هەرچی بكەن لە الله بزر نیە -جل شئنە- بەو مانایە دێ، مەعیەتی خاص و تایبەتیش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە كە جۆری دوەمە ئەویش ئەوە لە قەزا دەخوازێ و پێویست دەكا سەرخستن وە پشتگیری كردن وە پاراستنی شتەكان وە فەزڵ و بەخشیش لەگەڵ كردنیان ئەو مانایانەی لێ دەوەشێتەوە وەكو لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە هاتوە.

لە ئایەتی یەكەم الله تعالى فەرمویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ ئەو خوایە ئەو خوایە -جل شئنە- كە ئاسمانەكان و زەوی بەدیهێناوە لە شەش ڕۆژدا: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ لە پاشان ئیستیوای كرد و بەرز بوەوە بەسەر عەرش: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ﴾ عیلم و زانستی بەوەی هەیە كە دەچێتە ناو ناخی زەوی و دەچێتە زەوی: ﴿وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ ئەوەی دەردەچێ لە زەوی هەر عیلم و زانستی پێ هەیە: ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ ئەوەی دادەبەزێ لە ئاسمان و وە ئەوەی بەرزیش دەبێتەوە بەرەو ئاسمان هەر عیلم و زانستی پێ هەیە: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ ئەو خوایە لەگەڵتاندایە ئێوە لە هەر شوێن و جێگایەكبن بە مەعنای لێتان نزیكە عیلم و زانستی لەگەڵتاندایە

چاودێرە بەسەرتان موراقیبە: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِير﴾ الله تعالی بەو شتانەی ئێوە دەیکەن بینەرە وە دەبینێ.

کەواتە ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر مەعیەتی گشتیایەتی الله تعالی کە لەگەڵ هەموو مەخلوق و بەدیهێنراوەکاندایە لە هەر شوێنێک هەن جا: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾ بە مەعنای ئەوەی یەعنی لەگەڵتانە بە عیلم و دەسەڵاتیەوە، ئێمە بۆ ناڵێین الله وەکو زاتی لەگەڵتە؟ وەکو زاتیشی لەگەڵتە بەو مانایەی کە الله -جل شئنە- ئاگای لێتە چونکە ئەگەر بڵێی وەکو زاتی الله تعالی لەگەڵتە وەکو گوتمان یان دەبێ الله تەجزیئە بکرێ (پەنا بە خوای رب العالمین) بەشێکی لەگەڵ تۆیە و بەشێکی لەگەڵ ئەوە، دوایە ئەوەش دەوەشێتەوە و ئەوەش دێتە خەیاڵ و بەر شاشەی مێشکت تۆ هەندێ کات لە مورافیقی لە قەزای حاجەی، ئایە الله تعالی دەشێ و دەگونجێ لەگەڵتدابێ لە قەزای حاجە؟ ئەوانە شوێنی ناشیاون، ئایە دەشێ و دەگونجێ کەسێک هەیە گوناحکارە دەچێتە شوێنە گوناحەکان دەچێتە بارِ و مەیخانەکان دەچێتە شوێنی زینا خانە، ئایە دەشێ و دەگونجێ بڵێین الله لەگەڵیدایە وەکو زاتی بە مەعنای الله تعالی ش لەگەڵ ئەو چوەتە ئەو شوێنە پیس و خراپ و ناشیاوە؟ بە دڵنیاییەوە ناشێ و ناگونجێ بۆ ئینسان و مرۆڤە ڕەوشت بەرزەکان سەرەڕای ئەوەی چۆن دەبێ بیگونجێنی بۆ الله تعالی -جل شئنە- (ولله المثل الأعلی)؟ الله تعالی لەوە مەزنتر و گەورەترە، کەواتە ئەهلی سونە و جەماعە کە وای تەئویل دەکەن بە تەئویلێکی تەفسیریی دەڵێن قەرینەمان لە دەستە وە سەلەفی ساڵحیش ئاوا ئەو ئایەتەیان تەفسیر کردوە جا عەقیدە و بیروبڕواش بە فەهمی ئەوان و لەوانەوە وەردەگیرێ نەک لە خۆڕا چونکە ئەوان نزیک بونە لە پێغەمبەر (ﷺ) عەقیدە پاک بونە ئەوان چاکتر تێگەشتون (والله أعلم بالصواب).

لە پاشان ئایەتەکەی دوەم کە الله تعالی -جل شئنە- فەرموی ابن تیمیة بە بەڵگەی هێنایەوە لەسەر ئەوەی کە الله تعالی سیفەتی مەعیەتی هەیە و لەگەڵدابونی مەخلوق و

بەدیهێنراوەکان ئەویش دەڵێ: ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَى ثَلاثَةٍ إِلاَّ هُوَ رَابِعُهُمْ وَلا خَمْسَةٍ إِلاَّ هُوَ سَادِسُهُمْ وَلا أَدْنَى مِن ذَلِكَ وَلا أَكْثَرَ إِلاَّ هُوَ مَعَهُمْ﴾ الله تعالى دەفەرموێ ئەگەر سێ کەس هەبن بە پستە پست لەنێوان خۆیان و بە نەجوا قسە بکەن الله چوارەمیانە بەو مانایەی ئاگای لێیانە و دەزانێ چی دەڵێن وانەزانن هەر ئەو سیانەن اللەش ئاگای لێیانە -جل شئنه- وە ئەگەر ئەوان چواربن الله پێنجەمیانە بەو مانایەی ئاگای لێیانە و لێیان نزیکە و دەزانێ چی دەڵێن ئەگەر پێنجبن الله شەشەمیانە -جل شئنه- ئەگەر لەوە کەمتریش بن الله -جل شئنه- هەر ئاگای لێیانە و دەزانێ چی دەڵێن ئەگەر لەوە زیاتریش بن الله تعالى هەر ئاگای لێیانە و دەزانێ چی دەڵێن، ئینجا کەوابێ: ﴿هُوَ مَعَهُمْ﴾ الله لەگەڵیانە بەو مانایەی الله تعالى عیلمی پێیان هەیە چی دەڵێن وە موطەڵیعە بەسەریانەوە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى) وە موراقیب و چاودێرە بەسەریانەوە و لێیان نزیکە.

جا ابن عباس دەفەرموێ ئایەتەکانی پێشتری ئەو ئایەتە بخوێننەوە چاکتر بەدیار دەکەوێ کە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلۡأَرۡضِ﴾ الله تعالى لە ئایەتی پێشتر فەرمویەتی ئایە نابینن الله تعالى دەزانێ و شارەزایە و عیلمی هەیە بە ئەوەی لە ئاسمانەکانە و ئەوەی لە زەوییە، ئینجا لە پاشان بە عیلم دەستی پێکردوە فەرمویەتی: ﴿يَعۡلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلۡأَرۡضِ﴾ کەواتە ئەوەی لە ئاسمانەکانە و ئەوەی لە زەوییە الله عیلمی پێ هەیە، ئینجا هاتوەتە سەر ئەوەی فەرمویەتی: ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَى ثَلاثَةٍ إِلاَّ هُوَ رَابِعُهُمْ وَلا خَمْسَةٍ إِلاَّ هُوَ سَادِسُهُمْ وَلا أَدْنَى مِن ذَلِكَ وَلا أَكْثَرَ إِلاَّ هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَمَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيم﴾.

کەواتە الله تعالى بە مەعنای ئەوەی عیلمی لەگەڵیانە: ﴿هُوَ مَعَهُمْ﴾ لەسەرەتا باسی عیلمی کردوە الله تعالى قودرەتی لەگەڵیانە لێیان نزیکە و موراقیبە بەسەریانەوە ئەوە ئەوەی دەگەیەنێ نەک الله تعالى -جل شئنه- تەجزیئەیێ (پەنا بە خوای رب العالمین) یان وەکو زاتی لەگەڵیانە لە شوێنی باش و خراپ بن هەر لەگەڵیاندا دەبێ نا مەبەست لێی ئەوە نیە

لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە الله تعالى عیلمی و زانستیەکەی دەوری هەموو شتەکانی داوە.

جا ئەو دوو ئایەتانە هەردوکیان ابن تيمية هێناویەتیەوە -رحمه الله- بە بەڵگە بۆ مەعیەتی الله تعالى لە جۆری یەکەم کە مەعیەتی عام و گشتیە لەگەڵ هەموو بونەوەرەکاندایە الله -جل شئنه- بە عیلم و زانستیەوە بە موراقەبە کردنەوە و بە لێ نزیکیەوە.

وە ئایەتی سێیەم بەڵگەیە بۆ مەعیەتی خاص و تایبەت کە تەنها لەگەڵ ئیماندارانە لەگەڵ پیاوچاکانە لەگەڵ پێغەمبەرانە (عليهم الصلاة والسلام) لەگەڵ ئافرەتە صاڵیحەکانە کە ابن تيمية بە بەڵگەی هێنایەوە بۆ مەعیەتی الله تعالى فەرموی: ﴿لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ [التوبة: ٤٠] پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە کۆچ و هیجرەتی کرد لەگەڵ ئیمامی ئەبو بەکردا بوو چون لەو ئەشکەوتە مانەوە ئەشکەوتی (ثور) وە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە بینی ئەبو بەکری لەگەڵدایە دڵی ئیمامی ئەبو بەکری دایەوە و ورەی بەرز کردەوە و ئیمانی جێگیرتر کرد گوتی مەترسە ئەی ئەبو بەکر: ﴿لاَ تَحْزَنْ﴾ غەمگین مەبە مەترسە: ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ [التوبة: ٤٠] چونکە بەڕاستی ئێمە اللهمان لەگەڵە.

لەگەڵدابونی الله لەوێ بەو مانایە دێ یانی لەگەڵمانە بە تایبەتی مەعیەتی خاصە سەرمان دەخا پشتگیریمان لێدەکا ناهێڵێ ئێمە بکەوینە دەستی موشریک و کافرەکان وە الله تعالى -جل شئنه- غەم و پەژارەمان لادەدا دڵنیامان دەکا جا ئەوە مەعیەتی خاصی الله تعالى یە لەگەڵ بڕوادار و پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، کە ئەو فەرمودەیە مەشهور و بەناو بانگە کاتێ کە ئیمامی ئەبو بەکر فەرمویەتی ئا ئەوەتان موشریکەکان خۆ تەماشای بەرپێیان بکەن ئێمە دەبینن ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) پێغەمبەر دەفەرموێ: «ما ظنك باثنين، الله ثالثهما[١]» ئەی ئیمامی ئەبو بەکر تۆ یەقین و بیروبڕوا و یان گومانت چیە بە

[١] صحيح البخاري (٣٦٥٣) (٣٩٢٢) (٤٦٦٣)، صحيح مسلم (٢٣٨١)، سنن الترمذي (٣٠٩٦).

دوو کەس کە الله سێیەمیانە -جل شئنه-؟ لەگەڵیاندایە بەو مەعنایەی یەعنی دەیانپارێزێ سەریان دەخا پشتگیرییان لێ دەکا ترست نەبێ غەمگین مەبە.

ئینجا لە پاشان ئایەتی چوارەم کە ابن تیمیة بە بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ مەعیەتی خاصە ئەویش کە لەگەڵبونی تایبەتی الله تعالی لەگەڵ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) یان لەگەڵ بڕواداران ئەویش کە الله تعالی فەرموی کە موسا و هارون (علیهما الصلاة والسلام) دەیانەوێ بەرەو لای فیرعەون بچن لەسەر فەرمان و ئەمری خوایی الله تعالی پێیان دەفەرموێ: ﴿لَا تَخَافَا﴾ مەترسێن هەردوکتان ئەی موسا و هارون (علیهما الصلاة والسلام) لەبەر ئەوەی: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ [طه: ٤٦] من لەگەڵتاندام بە مەعنای لەگەڵدابونێکی تایبەت سەرتان دەخەم پشتتان دەگرم دەتان پارێزم ترستان نەبێ وە من دەبیستم و دەبینم، لەبەر ئەوەی هارون و موسا چیان گوت لەپێشتر؟ ڕویان کردە الله تعالی گوتیان: ﴿إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَىٰ﴾ [طه: ٤٥] ئێمە دەترسێین سنور بەزێنی بکا طوغیان بیگرێ فیرعەون لە بەرامبەرماندا یان زێدەڕەوی بکا شتێکی وا بێجێمان لەگەڵ بکا یان لەناومان ببا ئەی خوای رب العالمین، الله تعالی دڵنیای کردن مەعیەتی خاصی خۆی بۆ ڕاگەیاندن کە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە مەعیەتی خاص لەگەڵدابونی تایبەت لەگەڵ پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) دەبێ لەگەڵ بڕواداراندا دەبێ ئەویش بەو مانایەی سەریان دەخا دەیان پارێزێ پشتگیرییان لێدەکا -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى)، جا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە لێرە: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا﴾ تەفسیریان کردوە بە مەعیەت و لەگەڵدابونی تایبەتی الله تعالی بە مەعنای سەرخستن و پشتگیریکردن و پاراستنی الله بۆ موسا و بۆ هارون (علیهما الصلاة والسلام).

وە لە پاشان الله تعالی -جل شئنه- لە ئایەتێکی تریش دەسەلمێنێ کە الله تعالی لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە تەقوای الله تعالی یان هەیە کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾ [النحل: ١٢٨] الله تعالی لەگەڵ ئەوانەیە کە تەقوای

اللەیان هەیە و لە اللە دەترسێن و پارێزگارن لە تاوان و گوناحەکان چاکەکان ئەنجام دەدەن وە ئەوانەش کە چاکەکارن و موحسینن اللە لەگەڵیانە بە لەگەڵدابونی تایبەت و خاص بە مەعنای سەریان دەخا دەیان پارێزێ پشتگیرییان لێ دەکا -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

وە بەڵگەیەکی تر کە ابن تیمیة هێناویەتیەوە بۆ مەعیەتی خاص و تایبەت کە اللە تعالی لەگەڵ بڕواداران و پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) بە تایبەتی بە مەعنای سەریان دەخا دەیان پارێزێ پاداشتیان دەداتەوە کە اللە تعالی فەرمویەتی: ﴿وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ [الأنفال: ٤٦] جا اللە تعالی دەفەرموێ سەبر و ئارامتان هەبێ چونکە بەڕاستی اللە تعالی لەگەڵ ئارام گرانە: ﴿مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ ئەو مەعیەتە تایبەتە بە مەعنای کەسێک ئارامگربێ اللە تعالی پشتی دەگرێ سەری دەخا دەیپارێزێ پاداشتی زۆری دەداتەوە، یان هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون سەبر لەو ئایەتە: ﴿ٱسْتَعِينُوا بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ [البقرة ١٥٣] مەبەست پێی ڕۆژوە یانی (ٱسْتَعِينُوا بِٱلصِّيامِ وَٱلصَّلَوٰةِ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ) ئێوە پشت ببەستن و دەست بگرن بە ڕۆژو و بە نوێژ چونکە اللە لەگەڵ ئارامگراندایە یانی لەگەڵ ڕۆژو واناندایە ئەگەر لەوێدا سەبر بە مەعنای ڕۆژو لێکی بدەینەوە، وە هەندێک لە موفەسیرینیش دەفەرمون هەر بە مەعنای سەبرە یەعنی ئێوە ئارام بگرن دەست بگرن بە ئارامگرتن و سەبرەوە وە بە نوێژەوە بە دڵنیایی و سەدا سەد اللە لەگەڵ ئارام گرانە بە مەعنای لەگەڵ ئارام گرانە یەعنی مەعیەتی خاصە یەعنی سەریان دەخا پشتیان دەگرێ دەیان پارێزێ.

وە لە ئایەتەکەی تر کە ابن تیمیة -رحمه الله- بەو ئایەتەش جێگیری مەعیەتی تایبەتی اللە تعالی ی کرد بۆ بڕواداران کە اللە فەرمویەتی: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ [البقرة: ٢٤٩] چەند ژمارە کەم هەن تاقم و کۆمەڵی ژمارە کەم هەن کە اللە تعالی زاڵی کردون و زاڵیان دەکا بەسەر ژمارەی زۆری بێ بڕواکان ئەوەش بە مۆڵەت و پشتگیری اللەیە چونکە اللە لەگەڵ ئارام گرانە، ئەوەش لە جەنگی بەدر دابەزی

یەعنی تەفسیرە بۆ ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جەنگی بەدر وە لە ئەسڵی خۆشیدا طالوت و جالوت کاتێ کە پێگەیشتن الله تعالی لە کۆتاییەکەی کە ژمارە و کۆمەڵ و تاقمی طالوت زۆریش کەم بون الله تعالی بەسەریخستن بەسەر جالوت کە زۆریش بون لەبەر ئەوەی بڕوادار بون ئیماندار بون ئارامگر بون الله تعالی لەگەڵ ئەوان بوو، لە جەنگی بەدریش چونکە موسڵمانەکان لە چەک و تفاق و تەقەمەنی ئەوکات وە لە هەموو بوارەکاندا لە ژمارەی جەنگاوەرەکانیشدا زۆر زۆر کەم و کورتیان هەبوو بەرامبەر بە موشریک و کافرەکان کافرەکان لەوپەڕی توانای چەک و تەقەمەنی ئەوکات و وە تفاق و پارە و پول و ژمارەی مرۆڤ و جەنگاوەرەکانیان زۆر زۆر زیاتر بوو لە موسڵمانان نۆ سەد و هەندێک بون موسڵمانان سێ سەد و هەندێک بون ئینجا لەگەڵ ئەوە الله تعالی سەریخستن، لەبەر ئەوە أبو الحسن الندوي دەفەرموێ زۆرجار سەرکەوتنەکانی الله تعالی لەگەڵ ژمارەی کەمی بڕوادارانە بۆ ئەوەی خوایەتی خۆی بسەلمێنێ -جل شئنە- یەعنی الله -جل شئنە- لەوێدا چاکتر دەسەڵاتی الله بەدیار کەوت ئەگەر موسڵمانان ژمارەیان زۆربا چەک و تفاقیان زۆربا جەنگاوەری زۆریان هەبا ئەو کاتە خەڵکێک نەیدەگوت الله سەریخستون ئیمان لاوازەکان یان بێ ئیمانەکان دەیانگوت بابە ئەوە ژمارەیان زۆربوو لەبەر ئەوە بە ئەبو جەهل و ئەوان وێران، چەک و تفاقیان زۆربوو لەبەر ئەوە پێیان وێران، ئەوەندەی ئەوان بون لەبەر ئەوە پێیان وێران، بەڵام ئەو ژمارە کەمە بە چەک و تفاقێکی کەم ئینجا توانیان سەرکەوتن بەدەست بێنن بە مۆڵەتی الله تعالی، ئەوە سەلمێندرا شتێکی عەجاییە ئەو ژمارە کەمە ئەو هەموو لەشکرە زۆرەی خاوەن عەداد و عودەی لەناو برد کەواتە دەسەڵاتی الله تعالی چاکتر بەدیار کەوت -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى).

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە لە ئەهلی سونە و جەماعەش دەکرێ ئایە لەگەڵبونی الله و مەعیەتی الله لەگەڵ سیفەتی علوی الله تعالی بەرزی الله تعالی تێک گیر نابن؟ چونکە ئێمە لە نزمین ئێستا مەخلوقی الله تعالی ین ئەگەر دەڵێی الله لەگەڵتدایە ئایە الله نزم

دەبێتەوە (پەنا بە خوای رب العالمين)؟ کە لەگەڵتدایە تۆ لە نزمیدا دەژی الله تعالی یش بەرزە -جل شئنە-؟ ئەو کاتە ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن نەخێر الله تعالی بەرزێکی نزیکە لێت، دەبێ وابگوترێ بۆ الله تعالی قەت نابێ بڵێی نزمە ئەگەر ئێمە نزمیشین و الله تعالی لێشمان نزیکە بەڵام بەرزێکی نزیکە لێمان، بەرزیەکەی هەر دەبێ بۆ بڕیار بدەی، الله تعالی لە بەرزی خۆیەوە لێمان نزیکە ئێمەی هەر لێ دیارە بە عیلم و زانستیەوە لەگەڵماندایە بە قودرەت و دەسەلاتەوە لەگەڵماندایە بە سەمع و بیستنەوە لەگەڵماندایە بە بینینەوە لەگەڵماندایە -جل شئنە-: ﴿لَيسَ كَمثلِهِۦ شَيء وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] جا هیچ شتێک وەکو الله نیە ئەگەر تۆ دەڵێی چۆن دێتە مێشک و بیری لێبکەمەوە؟ ئەی چۆن دەبێ ئەگەر من لە شوێنێکی بەرز بم کەسێک زۆر نزم بێ دەبێ بۆی نزم بم ئینجا لەگەڵیدا دەبم؟ کاکە ئاخر عەقڵی خۆت بەکارمەهێنە دەربارەی الله تعالی قیاسی مەکە لەگەڵ مەخلوقێک لەگەڵ بەدیهێنراوێک لەبەر ئەوەی: ﴿لَيسَ كَمثلِهِۦ شَيء﴾ هیچ کەس و شتێک لە زات و لە سیفات و لە ناو وەکو الله نیە اللەش -جل شئنە- لە زات و لە ناو و لە سیفات وەکو هیچ کەس و شتێک نیە: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] لەگەڵ ئەوە الله تعالی بیسەری بینەرە، کەواتە لەگەڵدابونی الله وەکو لەگەڵدابونی مەخلوقەکان نیە تۆ ئەگەر لەگەڵ شتێکدا بی ئەو جۆرە لەگەڵدابونەی تۆ نیە الله تعالی کە لەگەڵ مەخلوق و شتەکاندایە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى)، کەواتە الله تعالی -جل شئنە- لەوپەڕی بەرزییە لە سەروی ئاسمانەکانە ئیستیوای کردوە لەسەر عەرشەکەی خۆی -جل شئنە- لەگەڵ ئەوەدا لەگەڵ هەموو مەخلوق و بەدیهێنراوەکانیشە وە لەگەڵ بڕواداران و پێغەمبەرانیشە (عليهم الصلاة والسلام) بە مەعیەتی خاص و تایبەت (والله أعلم بالصواب).

## جێگیر كردنی سیفەتی (الكلام) له قورئاندا:

وَقَوْلُهُ: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا﴾ [النساء: ٨٧]، ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلاً﴾ [النساء: ١٢٢]، ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ﴾ [المائدة: ١١٦]، ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً﴾ [الأنعام: ١١٥]، ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ [النساء: ١٦٤]، ﴿ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّهُ﴾ [البقرة: ٢٥٣]، ﴿وَلَمَّا جَاء مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ﴾ [الأعراف: ١٤٣]، ﴿وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا﴾ [مريم: ٥٢]، وَقَوْلُهُ: ﴿وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ [الشعراء: ١٠]، ﴿وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ﴾ [الأعراف: ٢٢]، وَقَوْلُهُ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾ [القصص: ٦٥].

---

ئەو ئایەتانە هەموی ابن تیمیة بۆ هێنایەوە؟ دەیەوێ بیسەلمێنێ لە عەقیدە و بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعە الله تعالی خاوەنی سیفەتی كەلامە، سیفەتی كەلامیش هەم زاتیە بۆ الله تعالی لە ئەوەل و ئەزەلەوە هەیبوە هەم فیعلیشە هەردەما و كاتێک لە هەر زەمەن و شوێنێک ویستبێ الله تعالی قسە بكا قسەی كردوە و كەلامی هەبوە.

ئینجا كە دەڵێ: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا﴾ [النساء: ٨٧] كێ هەیە لە الله تعالی ڕاستگۆتربێ لە قسە و گوتنەكان؟ بە دڵنیاییەوە ئێمە لە وەڵامدا هەموومان بە یەک دەنگی دەڵێین كەس نیە الله لە هەموو كەس و شتێک ڕاستگۆترە لە قسە و گوتنەكان -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

ئەوە ئەوەی لێ وەردەگیرێ الله تعالی قسەی حەقیقی و تایبەتی هەیە -جل شئنه- وە لەخۆی دەوەشێتەوە بە مەعنای حەدیث چونكە بە قسە دەگوترێ وە قسەكان و كەلامی الله تعالی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا حەقیقیەتی هەیە ڕاستی هەیە كەلامی نەفسی نیە وە الله تعالی -جل شئنه- (پەنا بە الله) ئەوە نیە لەسەر بەدیهێنراوێک كەلام و قسەكەی خۆی دەربڕێ لە ڕێگای جوبڕائیلەوەبێ یان هەر بەدیهێنراوێكی تربێ كە ئەوە بیروبۆچونی هەندێک لە تاقم و كۆمەڵەكانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعەیە، بەڵكو الله تعالی بۆخۆی

-جل شئنه- دەدوێ قسە دەکا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) گوێبیستی بونە فریشتەکان گوێبیستی دەبن، و الله تعالی ئەو کەلامەی کە هەیەتی سەوت و حەرفی حەقیقیشی هەیە بەس بەوەی کە لەخۆی دەوەشێتەوە، چۆنە؟ ئێمە نازانین چۆنیەتیەکەی بەڵام سەدا سەدین لەوەی ئەهلی سونە و جەماعە لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە کەلامێکی حەقیقیە سەوت و حەرفی هەیە لەخۆی دەوەشێتەوە -جل شئنه- چۆنیەتیەکەی نازانین.

جا ابن تیمیة لێرە کە ئەوەی بەکارهێنا یەکەم ئایەت: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا﴾ [النساء: ٨٧] حەدیث هیچ تەئویلێک بە خۆیەوە هەڵناگرێ ئیلا کەلامە و قسەیە قسەی حەقیقیە، کەواتە کێ هەیە لە الله تعالی قسەکانی ڕاستگۆتربێ؟ بە دڵنیاییەوە کەس نیە ئەوە کەواتە ئەوەی پێ دەسەلمێنرێ الله تعالی خاوەنی سیفەتی کەلام و قسەیە.

وە بەڵگەی دوەم مەسەلەی قەول و قیلی هێنایە گۆڕ لەو ئایەتەی بە بەڵگە هێنایەوە ابن تیمیة قەول و قیلیش هەر بە قسە دەگوترێ جا قسەی حەقیقی و تەواو کە الله تعالی فەرمویەتی لە دەیەها ئایەت بەڵگە هاتوەتەوە بەڵام ابن تیمیة لێرە تەنها ئەوەی بە بەڵگە هێنایەوە: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلاً﴾ [النساء: ١٢٢] کێ هەیە ڕاستگۆتربێ لە قیل واتە لە قسەکردن کەواتە قیل بە مەعنای قسەکردن دێ کێ هەیە ڕاستگۆتربێ لە قسە کردن لە الله تعالی؟ بە دڵنیاییەوە کەس نیە وە لە پاشان الله تعالی فەرموی: ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ﴾ [المائدة: ١١٦] (قَالَ) بۆ قسەکردنە کەواتە الله تعالی فەرموی واتە قسەی کرد کەواتە لەوێ دەبێ جێگیری بکەین گوتی ئەی عیسای کوڕی مەریەم، کەواتە ئەوەش ئەوەی لێ دەوەشێتەوە کە جێگیر دەبێ الله تعالی کە قسەی کرد و: ﴿قَالَ اللَّهُ﴾ بە مەعنای کەلامی هەیە کەلامێکی حەقیقی، وە لە پاشان: ﴿قِيلاً﴾ لەو ئایەتەی پێشتر موفەسیرین دەفەرمون بە مەعنای قەولەن دێ کە مەصدەرە یەعنی کێ هەیە کە قسەکانی ئەوەندەی قسەی الله تعالی ڕاستگۆبێ و تەواوبێ؟ کەس نیە.

وە لە پاشان لە ئایەتەکەی تر الله تعالی فەرموی: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً﴾ [الأنعام: ١١٥] یانی الله تعالی فەرموی قسەکانی خوای پەروەردگارت وشەی خوای پەروەردگارت ڕاستە و دادوەریشە لە وشەکانی و قسەکانی کەواتە کەلام لێرەش جێگیر بوو بۆ الله تعالی.

هەروەکو پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ: «أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ[١]» ڕاستگۆترین قسە کە شاعیرێک کردبێتی قسەکەی لەبیدە، کەواتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە قسە کەلام هەندێک جار قەولی پێدەگوترێ و کە دەڵێی (قال) بە مەعنای کەلام دێ چونکە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «أَصْدَقُ كَلِمَةٍ» خۆ ئەو قسانەی کە لەبید کردی یەک وشە نەبوو چەند وشەیەک بوو کردی و ڕستەیەک بوو کردی، کەواتە کەلیمە بە مەعنای کەلام دێ وە لەو فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ)، وە کە گوتی (قال) بە واتای قسەیە، کەواتە الله تعالی کە کەلیمەی بۆخۆی بەکارهێنا یەعنی قسەیە ئەوە نەبێ یەک وشەبێ، وە لە پاشان کە قالەی بۆخۆی بەکارهێنا یەعنی خاوەنی سیفەتی کەلامە بەوەی لێی دەوەشێتەوە -جل شئنه-.

جا لەو ئایەتە کە دەڵێ: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِهِۦ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ [الأنعام: ١١٥] ﴿تَمَّتْ﴾ موفەسیرین دەفەرمون بە مەعنای یەعنی (وحقت وثبتت) جێگیر بوو وە حەق بوو (ولا تبدل ولا تغير له) یەعنی نابێ بگۆڕدرێ نابێ گۆڕانکاری بەسەردا بهێنێرێ نابێ بەدیلی بۆ بدۆزرێتەوە، کەواتە (فلا مغير لأمر الله وقضائه وقدره) یەعنی قەزا و قەدەری الله وشە و ئەمر و فەرمانی الله کەلام و قسەی الله گۆڕینی نابێ بەسەردابێ جێگیرە تەواوە وە خوای پەروەردگارت ئەی موحەمەد (ﷺ) قسەکانیشی وشە و کەلیمەکانیشی صیدقە ڕاستگۆییە عەدلە دادوەرییە وە گۆڕانکاریشی بەسەردا نایە ئەمر و فەرمانەکان و قسە و گوتنەکانی الله تعالی -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

---

[١] **صحيح البخاري** (٣٨٤١) (٦١٤٧) (٦٤٨٩)، **صحيح مسلم** (٢٢٥٦)، **سنن الترمذي** (٢٨٤٩).

کەواتە کەلیمە ناوە لە ناوەکانی کەلام هەندێک جار هەتا دەگوترێ (کلمة التوحید)، (کلمة التوحید) چیە؟ (لا إله إلا الله)، (لا إله إلا الله) یەک وشەیە؟ نا ڕستەیەکە کەلامە کەواتە بەس کەلیمە هەندێک جار ناوە بۆ کەلام لێرەش هەر وا گوتراوە بۆ الله تعالى -جل شئنە-.

لە پاشان ابن تیمیة -رحمه الله- ئایەتێکی تری بە بەڵگە هێناوە الله تعالى کە فەرموی: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ [النساء: ١٦٤] الله تعالى موسای دواند و قسەی لەگەڵ کرد بە تەئیکد و تەکلیمەن تەئکید کردنەوەیە یەعنی وەکو مەصدەرێک وەکو مەفعولێکی موطڵەق بۆ کەلەمە پێی تەئکید کراوەیە یەعنی الله تعالى قسەی لەگەڵ موسا کرد بە تەئکید و سەدا سەد قسەی لەگەڵ کرد، کەواتە ئەلێرە هەندێک لە موفەسیرینی تاقم و کۆمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە ئەو ئایەتەیان هەر گۆڕیوە دەڵێن (وَكَلَّمَ اللَّهَ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا) ئەوکات (نعوذ بالله) الله تعالى دەکەنە (مفعول بە) وە موسا دەکەنە(فاعیل) دەڵێن موسا قسەی لەگەڵ الله کرد بەڵام لە ڕیواتی جێگیری موتەواتیر وا دەخوێنرێتەوە ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ یەعنی الله تعالى فاعیلە بۆ قسەکە یەعنی الله قسەی کرد لەگەڵ موسا نەک موسا قسەی کرد لەگەڵ الله.

ئەوەتا ئەوانەی وا دەڵێن هەندێک لە موعتەزیلەکانن هاتنە لای ئەبو عەمری قاری گوتیان ئێمە حەز دەکەین ئەو ئایەتەی قورئای وا بخوێنرێتەوە و وا لەجێ ترە بڵێین: (وَكَلَّمَ اللَّهَ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا) (پەنا بە خوای رب العالمين) مەبەستیان پێ ئەوەبوو هەتا سیفەتی کەلام لە الله تعالى ڕەت بکەنەوە، جا ئەبو عەمر لە وەڵامیاندا چی گوت ئەو زانا بەڕێزە؟ گوتی باشە گریمان ئەوە ئەوەم وا خوێندەوە بەڵام ئەی چی لەو ئایەتە دەکەن خۆ ئەو تەیویلە بە خۆیەوە هەڵناگرێ وە ئەو مەعنایە بە خۆیەوە هەڵناگرێ بە هیچ جۆرێک چۆنیشی بخوێنیتەوە هەر مانای ئەوەی لێ دەوەشێتەوە و لێی وەردەگیرێ کە الله قسەکەی کردوە -جل شئنە- الله خاوەن سیفەتی کەلامە کە فەرمویەتی: ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَىٰ لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ﴾ [الأعراف: ١٤٣] لەوێدا چی لێ دەکەی؟: ﴿وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ﴾ بەهیچ جۆرێک لەبەر زەمیرەکەی کە:

﴿وَكَلَّمَهُ﴾ هێ یەكەی سەر كەلەمەهوە لەگەڵ: ﴿رَبُّهُ﴾ بە هیچ نەوعێك مانای ناتوانی وای لێ وەربگری كە بڵێی الله مەفعولە (پەنا بە الله) موسا فاعیلە، لەوێدا هیچ قسە نامێنێ ئەوانەی گومڕان ئەوانەی تەئویل دەكەن دەبێ بێ قسەبن بێدەنگبن قسەیان پێ نامێنێ، جا موعتەزیلەكان قسەیان پێ نەما لەوێ چونكە زەمیرەكەی: ﴿كَلَّمَهُ﴾ بە دڵنیاییەوە لە پێشتر باسی موسا كراوە لە زمانی عەرەبیش زەمیر دەگەڕێتەوە بۆ ئیسم و ناوێكی نزیكترینی خۆی و لەپێش خۆی هاتبێ جا ئەوە زەمیری: ﴿كَلَّمَهُ﴾ بە یەكدەنگی زانایانی لوغەش دەبێ بۆ موسا بگەڕێتەوە، یەعنی قسەی لەگەڵ كرد، لەگەڵ كێی كرد؟ هێیەكە بۆ موسا دەگەڕێتەوە لەگەڵ موسای كرد، كێ لەگەڵێكرد قسە؟: ﴿رَبُّهُ﴾ پەروەردگاری موسا لەگەڵی كرد، كەواتە بە هیچ نەوعێك لەو ئایەتە مەجال نەماوە بۆ ئەو تاقم و كۆمەڵانە بۆ موعتەزیلەكان كە بڵێن (پەنا بە خوای رب العالمین) خوای رب العالمین كەلامی نیە بەڵكو موسا كەلامی كردوە.

الله تعالی ئەمجارە باسی ئەوە دەكا: ﴿وَنَـٰدَیْنَـٰهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الأَیْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِیًّا﴾ [مريم: ٥٢] نیدائیش بانگ لێكردنە بە قسە و گوتنە كەواتە الله تعالی كە دەڵێ ئێمە موسامان بانگ كرد و نیدائمان لێدا بۆ موسا كەواتە بە قسە و گوتن ئەو ئەمر و فەرمان و بانگەمان كرد كە لە خۆمان نزیك خستەوە و ڕزگارمان كرد.

وە یان دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ [الشعراء: ١٠] ئەو كاتەی كە خوای پەروەردگارت ئەی موحەمەد (ﷺ) بانگی لە موسا كرد یەعنی بانگ كردنیش دیارە بە قسە و گوتنە.

ئینجا: ﴿وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ﴾ [الأعراف: ٢٢] الله تعالی بانگی كردن هی باوكە ئادەم و دایكە حەوا (عليهما السلام) ئایە من ئێوەم قەدەغە نەكردبوو لەو دارە هەردوكتان بۆ لە بەروبومەكەتان خوارد كە بوە هۆی ئەوەی لە بەهەشت وە دەرێی نان؟

کەواتە بانگ کردن بە قسە و گوتنە ئەوەش جێگیر کردنی سیفەتی کەلام بۆ الله تعالی -جل شئنه- جێگیر دەکا.

یان دەڵێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ﴾ ئەو ڕۆژەی کە بانگیان دەکرێ لەلای الله تعالی وە: ﴿فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾ [القصص: ٦٥] ئێوە ئایە چ وەڵامێکی پێغەمبەرانتان دایەوە؟ وەڵامتان دانەوە یان نا؟

ئەوانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە الله تعالی -جل شئنه- قسەی هەیە وە کەلامی هەیە بە کەلامێکی حەقیقی سەدا سەدی نەک کەلامی نەفسی وەکو ئەشعەریەکان دەڵێن یان نەک کەلامێک سەوت و حەرفی نەبێ یان نەک وەکو جەهمیەکان و موعتەزیلەکان کە هەر ڕەتی دەکەنەوە الله تعالی کەلامی هەبێ جا بۆ مرۆڤ و ئینسانەکان کەلام نەبون و قسە نەبون نەقس و کەم و کورتیە بۆ الله تعالی -جل شئنه- خاوەن سیفەتی تەواویەت و کەمالیەت هەر دەبێ کەلامی هەبێ و ناکرێ و ناشێ بڵێین الله تعالی (پەنا بە الله) کەلامی نیە.

کەواتە سیفەتی کەلام لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە هەم سیفەتێکی زاتیە بۆ الله تعالی لە ئەوەل و ئەزەلەوە هەیبوە وە لەگەڵیدا بوە و لازم بوە وە هەر دەشمێنێتەوە هەتا هەتایی بێ کۆتا لەگەڵ زاتی الله تعالی، وە هەم سیفەتێکی فعلیشە هەر کاتێک الله تعالی -جل شئنه- ویستبێ یان بیەوێ لە ئێستا و لە داهاتوو قسەی کردوە -جل شئنه- کەلامی هەبوە، ئینجا کەلامەکەش حەقیقی و ڕاستە ئەوە نەبێ نەفسی بێ ئەوە نەبێ الله تعالی -جل شئنه- هەر بە سەر زارەکی بڵێین کەلامی هەیە، بەڵکو حەقیقیە بەڕاستی هەیەتی سەوت و حەرفیشی هەیە لەسەر بۆچونی زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە ابن تیمیةش کە پێداگری لەوە دەکا و ابن القيم الجوزية و باقی زانایانی تری ئەهلی سونە و جەماعە، ئەو سەوت و حەرفانە بەس لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین بە مانایە ڕاست و دروستیەکەی وەری دەگرین، وە دەیەها جۆر لە بەڵگەی هێنایەوە یەک

لەوان باسی نیدائی کرد نیداء بە کەلام دەکرێ کە الله تعالی کە دەفەرموێ: ﴿وَيَومَ يُنَادِيهِم فَيَقُولُ أَينَ شُرَكَاءِيَ﴾ [القصص: ٦٢] یان دەربارەی موسا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ﴿وَنَـٰدَيْنَـٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَـٰهُ نَجِيًّا﴾ [مريم: ٥٢] ئینجا باسی موناجاتی کرد موناجاتیش بە هەمان شێوە ئەویش جۆرێکە لە بانگ کردن و قسە و گفتوگۆکردنە بەڵام هەرچی نیدائە بۆ دور بە دوری لە زمانی عەرەبی بەکاردێ لە دورەوە یەکێک بانگ بکەی نیدائی بکەیتێ، موناجات زیاتر لە نزیکیەوەیە کە زۆر لێک نزیکبن قسە و گفتوگۆ بکرێ لەنێوان دوو کەس یان دوو لایەن کە زۆر لە یەک نزیکبن خەڵکانێک ئەگەر لێیان دورتربن هەست بە قسەکان نەکەن و نەیبیستن.

## قورئانی پیرۆز کەلامی اللهیە:

﴿وَإِنْ أَحد مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللَّهِ﴾ [التوبة: ٦]، ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيق مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلاَمَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ من بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [البقرة: ٧٥]، ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلامَ اللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَلِكُمْ قَالَ اللَّهُ من قَبْلُ﴾ [الفتح: ١٥]، ﴿وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ من كِتَابِ رَبِّكَ لا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِه﴾ [الكهف: ٢٧].

---

ئەو ئایەتانەی بۆ ئەوە هێناوەتەوە ابن تيمية -رحمه الله- کە جێگیری دەکا کە قورئانی پیرۆز کەلامی اللهیە قورئانی پیرۆز فەرمودەی الله تعالی یە -جل شئنه-.

یەکەمین ئایەت کە تەفسیرەکەی ئاوایە الله تعالی بە پێغەمبەری فەرموە (ﷺ): ﴿وَإِنْ أَحد مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ﴾ ئەگەر یەکێک لە موشریک و هاوبەش پەیداکاران هانا و پەنای بۆتۆ هێنا کە پەنای بدەی لە کوشتن و لە برین و لە زەرەر و زیان پێگەیشتنی و هاتە ناو بازنەی وڵاتی ئیسلام ئەوکاتە تۆ پەنای بدە ئەی موحەمەد (ﷺ): ﴿فَأَجِرْهُ﴾ پەنای بدە مەهێڵە بکوژرێ مەهێڵە ببردرێ مەهێڵە بگیرێ مەهێڵە زەرەر و زیانی پێ بگات، لەبەر چی؟: ﴿حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللَّهِ﴾ [التوبة: ٦] هەتا بەڵکو گوێ بگرێ و گوێبیستی کەلامی الله بێ فەرمودەی الله بێ واتە قورئانی بەسەردا بخوێنەوە کەلامی الله گوێبیستبێ بەڵکو

دڵی نەرمبێ و هیدایەت و ڕێنوێنی ببێ جا لێرە: ﴿يَسْمَعَ﴾ بە مەعنای بیستن دێ: ﴿كَلاَمَ﴾یش ئیزافەی كردوە بۆلای الله تعالی یەعنی قسە و فەرمودەی الله گوێبیست بێ موفەسیرین دەفەرمون لێرە مەبەستیش پێی قورئانە، كەواتە قورئان (كلام الله)یە وە لە پاشان اللهش كەلامی هەیە ئەو كەلامە دەبیسترێ كاتێک دەخوێنرێتەوە بەسەر خەڵكان چ الله تعالی بۆخۆی بفەرموێ دەبیسترێ وەكو موسای دواندوە وەكو پێغەمبەری (ﷺ) دواندوە چ هەر یەكێكی تر بیڵێتەوە كەواتە ئەوە سەلێمنرا الله تعالی خاوەن سیفەتی كەلامە وە قورئانی پیرۆزیش كەلامی الله تعالی یە.

وە لە پاشان لە ئایەتی دوەم كە بە بەڵگەی هێناوەتەوە الله دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلاَمَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [البقرة: ٧٥] ئەو ئایەتەش بە بەڵگە هێنایەوە كە دەڵێ ئەو پەرتوک و فەرمودانەی الله تعالی لەپێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) لە تەوراتو ئینجیل و باقی پەرتوكە ئاسمانیەكانی تر كە ئەوانیش (كلام الله) بونە فەرمودەی الله تعالی بونە الله تعالی دەفەرموێ كۆمەڵ و تاقمێكیان فەریق یەعنی هەندێكیان كۆمەڵێكیان تاقمێكیان لەوانەی كە گوێبیستی كەلامی الله دەبون واتە لە بەنو ئیسرائیل و لە جولەكەكان یان لە دیانەكان یان لە ئومەتانی پێشتر: ﴿يَسْمَعُونَ كَلاَمَ اللَّهِ﴾ فەرمودەی الله گوێبیست دەبون دەیان بیست فەرمودەی الله و كەلامی الله كە تەوراتو ئینجیل و سوحوف و زەبورِ بوە: ﴿ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ئینجا لە پاشان دەهاتن دەیانگۆڕی تەحریفیان دەكرد چ پیتەكانیان دەگۆڕی یان واتایان دەگۆڕی لەپاش ئەوەی تێی دەگەیشتن و فەهمیان دەكرد و وەریان دەگرت و ئینجا دەشیان زانی ئەو گۆڕینە هەڵەیە هەر دەشیان كرد.

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە الله تعالی كەلامی هەیە -جل شئنە- وە هەموو پەرتوكە ئاسمانیەكان لە سوحوفی ئیبراهیم و موسا ئەگەر سوحوفی موسا جیابێ لەگەڵ تەورات كە دوو بۆچون هەیە گوتمان، هەندێک لە زانایان دەفەرمون موسا هەم سوحوفی بەجیا بەسەر

دابەزیوە لە پاشان تەوراتی بەسەر دابەزیوە، هەندێکیش دەڵێن نەخێر تەورات دەتوانین بڵێین دوو ناوی هەبوە هەم سوحوفی پێگوتراوە هەم تەوراتی پێگوتراوە، هەردوو بۆچونەکان بۆچونی زانایانی ئەهلی سونە و جەماعەن، ئینجا لە پاشان سوحوفی ئیبراهیم و سوحوفی موسا و ئینجا زەبوری داود و تەوراتی موسا و وە ئینجیلی عیسا و ئەوانە هەر هەمویان ئەوانیش وەکو قورئانی پیرۆز (كلام الله) بونە بەو ئایەتە الله تعالی سەلماندی و جێگیری کرد -جل شئنه-، کەواتە (كلام الله) الله تعالی خاوەن سیفەتی کەلامە وە پەرتوکە ئاسمانیەکان بە قورئانیشەوە کەلامی اللەن.

وە لە ئایەتەکەی سێیەم کە ابن تيمية هێناویەتیەوە ئەویش باسی سەرگوزشتەی مونافقەکانە لە ئەعراب و دەشتەکیەکان کاتێ کە الله تعالی فەرمویەتی: ﴿سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَـٰمَ ٱللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ [الفتح: ١٥] ئەو ئایەتەش الله تعالی کە قەدەغەی ئەوانە دەکا کە دابڕان لە شوێنکەوتەبونی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە دەڵێن: ﴿فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا مَعِىَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا مَعَ ٱلْخَـٰلِفِينَ﴾ [التوبة: ٨٣] الله تعالی دەڵێ قبوڵیان مەکەوە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوان بەدوا کەوتن نەهاتن لەگەڵت بۆ جەنگ و جیهادەکە لە پاشان بیانوو عوزر دەهێننەوە و دەڵێن جارێکی تر لەگەڵت دێین بڵێ جارێکی تر لەگەڵم مەیەن چونکە ئێوە ڕازی بون بە دانیشتن و نەیەن لەگەڵم و جەنگ و جیهاد نەکەن، یان هەندێک جار هەبوە مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان لە نیوەی ڕێدا گەڕانەوە وەکو جەنگی ئوحود، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بەخۆی و بە سێ سەد کەس هەڵی خەڵەتاندن لە مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکانیش بون ئەوانی گەڕاندەوە لە ڕێگادا نەگەیشتنە مەیدانی جەنگ و جیهادەکە ئەوە ئیش و پیشەی ئەوانە بوە کە مونافق و دوڕو دەغەڵ بونە.

ئینجا الله تعالی دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ﴾ ئەوە مەعنای چیە؟ ئەوە هەر وا الله تعالی فەرمویەتی؟ یەعنی الله کەلامی هەیە -جل شئنە-، کەلامەکەی الله تعالی یش چیبوو؟ قورئانی پیرۆزە کە دایبەزاندوە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ)، یان ئەو بڕگەی تری ئایەتەکە کە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ ئەوان دەیانەوێ فەرمودە و فەرمانی الله بگۆڕن -جل شئنە- کە پێشیان ناگۆڕدرێ سەبارەت بەوەی الله تعالی دەفەرموێ بڕۆن و دەربچن لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) جەنگ و جیهاد بکەن ئەوان دوا دەکەون و دەیگۆڕن و بیانوی نالەجێ دەهێننەوە بۆ دەرنەچونەکەیان، جا کەواتە ئەوە سەلمێنرا کە الله تعالی خاوەن سیفەتی کەلامە وە قورئانی پیرۆزیش (کلام الله)یە.

وە لە سورەتی الكهف الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ لا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾ [الكهف: ٢٧] لەو ئایەتە الله تعالی فەرمانی کردوە بە خوێندنەوەی ئەوەی دابەزیوە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لە وەحی و نیگاوە کە قورئانی پیرۆزە بەسەری دابەزیوە ئینجا لە پاشان الله تعالی تەئکید دەکاتەوە دەڵێ لە پەرتوکی خوای پەروەردگارت ئەی موحەمەد (ﷺ) پەرتوکی الله تعالی یش یەکێکە لە ناوەکانی قورئانی پیرۆز واتە قورئان دابەزیوە بەسەرت بیخوێننەوە کە قورئان کەلامە، کەلامی کێشە؟ (کلام الله)یە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى)، ئینجا بە تەدەبور وەکو عیبادەتێک و بە تێفکرینەوە ئایەتەکان الله تعالی دەفەرموێ بیخوێننەوە، لە پاشان دەفەرموێ: ﴿لا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾ گۆڕانکاری نیە لە کەلامی الله تعالی ئەگەر ئەمرێکی فەرموو وە کەس ناتوانێ بیگۆڕێ واتاکەی دیارە فەرمودەی اللەیە وە الله تعالی ئەگەر ئەمر و فەرمانێکی دا گۆڕانکاری بەسەردا نایە دەبێ فەرمان و ئەمرەکەی وەکو خۆی جێبەجێ بکرێ.

لە سورەتی الأنعام هەر تەئکیدی وەکو ئەو ئایەتە دەکاتەوە کە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ [الأنعام: ١١٥] الله تعالی دەفەرموێ تەواو و سەدا سەد گوتە و وشەکانی الله تعالی کە (کلام الله)یە

لەوپەڕی ڕاستی و دادوەریدایە وە گۆڕانکاری نیە بۆ وشە و گوتەکانی الله تعالی وە الله -جل شئنە- سەمیعە بیسەرە و عەلیمە زانایە.

وە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەو قورئانی لەبەر دەستی ئێمەیە دەبێ وا پێناسەی بکرێ بڵێین قورئانێکە دابەزیوە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) کەواتە ئەوە سیفەتی علوایەتیشی بۆ الله تعالی جێگیر کردوە -جل شئنە- چونکە دابەزینی شت لە بەرزییە بۆ نزمی کەواتە کە دەڵێین قورئان لە اللەوە دابەزیوە دیارە الله تعالی -جل شئنە- بەرزە وە لە سەروی ئاسمانەکانەوەیە، وە لە پاشان دەگوترێ قورئانی پیرۆز موعجیزەیە یەعنی دەستە وەسانکاری بەرامبەرەکانە ئەوانەی دژایەتی دەکەن و دوژمنین یان بڕوایان پێ نیە الله دەسەوسانی کردون لەوەی بتوانن وەکو قورئان بێننەوە وە چەندجار تەحەداشی کردون وە پێشیان نەهاتوەتەوە و هەوڵیشیان بۆ داوە، ئینجا لە پاشان قورئان خوێندنەوەکەی عیبادەتە پەرستشە وەکو باقی پەرتوکەکانی تر نیە، ئینجا لە پاشان قورئان بریتیە لە حەرف و مانا یەعنی هەم حەرفە هەم واتای هەیە بەو حەرف و مانایانەشەوە قورئانی پیرۆز (کلام الله)یە، ئینجا لە پاشان قورئان کە کراوەتە موسحەف و نوسراوەیە ئەو مەسحەف و نوسراوانە مەخلوقن بەدیهێنراون بەڵام وەکو کەلامی قورئان حەرف و پیت و ماناکانی قورئانی پیرۆز (کلام الله)یە و مەخلوق نیە و بەدیهێنراو نیە، (کلام الله) سیفەتێکە لە سیفەتەکانی الله تعالی هەم سیفەتی زاتیە لە ئەوەل و ئەزەلەوە هەیبوە وە هەم سیفەتێکی فعلیشە هەر دەمای ویستبی قسەی پێکردوە و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)ی پێ دواندوە.

ئینجا لە پاشان قورئان کە دەڵێین مەخلوق نیە سیفەتی الله تعالی یە بەو مانایەی کە (کلام الله)یە چەند خاڵێکی دێتە سەر وردکاری لەسەر دەکەین:

یەکەم کێشە دروستبوو لە بەینی موعتەزیلەکان و ئەهلی سونە و جەماعە بەوەی موعتەزیلەکان پێیان وایە (پەنا بە الله) (کلام الله) مەخلوقە پێیان وایە قورئان مەخلوقە، ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە یان ئەو وشە و دەربڕینە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە

کوفرییە بە هیچ جۆرێک جائیز نیە، ئەوەی بیڵێ و حوجەی لەسەر بکرێ وە نەگەڕێتەوە لێی پێی کافریش دەبێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە، چونکە قورئان (کلام الله)ی‌ە (کلام الله) سیفەتێکی زاتی و ئەزەلی الله تعالی یە -جل شئنە- ئینجا لە پاشان فعلیشە، هەریەک بڵێ سیفەتی الله تعالی بەدیهێنراوە سیفەتە زاتیەکانی کە سەدا سەد لەگەڵی بوە و تا کۆتاش هەر لەگەڵی دەبێ کە بڵێی بەدیهێنراوە دەبێ زاتەکەش بەدیهێنراوبێ (پەنا بە خوای رب العالمین) جا لەبەر ئەوە ئەوە کوفرە جائیز نیە بگوترێ، جا لە سەردەمی چەندێک لە خەلیفەکان لەوانە مەئمون کە هاتە سەر بۆچونی موعتەزیلەکان لەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە (پەنا بە الله) وە قەناعەتیان بە مەئمون هێنا گەورە زاناکانی موعتەزیلەکان لەو سەردەمە کە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە تاقی بکاتەوە ئەوەی نەڵێ قورئان مەخلوقە دارکاری بکا بە زەبر و زەنگ پێی بسەلمێنێ کە قورئان مەخلوقە (پەنا بە خوای رب العالمین)، جا دەیەها زانایانی ئیسلامیان دەربەدەر بون کەوتنە موعانات و ناخۆشی وە هەندێکیشیان لێیان درا و عەزیەت دران و وە زیندانی کران، لەوانە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل الله تعالی لێی قبوڵ کردبێ ئەو تەحەمول و سەبر و ئارامیە لەسەر میحنەت و ناخۆشیەکان، جا هەر گوتراوە و مەشهورە لەنێوان ئەهلی سونە و جەماعە کە دەڵێن ئیمامی ئەبو بەکر دینی ئیسلامی ڕزگار کرد لە پاش پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی ڕیدە وە ئیمامی ئەحمەدیش جارێکی تر نوێی کردەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە و دینی ئیسلامی ڕزگار کرد لە چنگی موعتەزیلەکان لە ڕۆژی میحنە کە ئەو بەڵا و موسیبەتانەی بەسەرهات ئاخیری هەر بەو دەردی ئەو ئەشکەنجەدان و ئازاردان و تەعزیبانەی لەناو سجن دەیاندا بەو دەردەوە ئیمامی ئەحمەد گەڕایەوە لای الله و وەفاتی کرد و بە شەهیدی تەعزیب لە پێناو قورئان ناوی دەرکردوە ئیمامی ئەحمەد، کە (پەنا بە الله) لێی دەگێڕنەوە الله تعالی لێی خۆشبوبێ لە دەمی خوێن دەهاتە خوارەوە و وە لە پاشەریشی ئەو پیاوە بەڕێزە خوێنی دادەنا هەتا پێیوە بەو دەردە مرد لەبەر تەعزیب و ناخۆشیەکان کە ڕۆژانە

لێی دەدرا بە دەستی جەلادەكانی دار دەستەكانی دەسەڵاتی ئەوكات (پەنا بە خوای رب العالمين).

ئایە قورئانی پیرۆز جیاوازی هەیە كە دەڵێین كەلامی اللەیە لەگەڵ كەلامی ئینسان و مرۆڤەكان؟ گومان لەوە نیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە قورئان كە (كلام الله)یە حەرف و سەوتی هەیە حەقیقەتی هەیە بەڵام بەوەی كە لە الله دەوەشێتەوە وەكو هی مرۆڤەكان نیە وەكو هی بەدیهێنراوەكان نیە هی بەدیهێنراوەكان جیاوازە لەگەڵ هی الله تعالى.

ئایە دەشێ و دەگونجێ بڵێین سوێند بە قورئان دەخورێ؟ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونی جیاوازی لەسەرە، هەندێک لە زانایان پێیان وایە نابێ سوێند بە قورئان بخورێ چونكە موسحەفەكان مەخلوقن بەوەی كە حیبر و نوسینەكان و چ لە مەطبەعەی دەكرێ چ بە دەست دەكرێ نابێ سوێندی پێ بخورێ ئەو گومانەی دێتە ناوەوە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە (والله أعلم بالصواب) بۆچونیان وایە سوێند بە قورئان دەخورێ بەو مانایەی كە كەسەكە دەبێ بڕوای وابێ كە (كلام الله)یە سوێند بە (كلام الله) دەخوا (كلام الله)ش سیفەتێكە لە سیفەتەكانی الله تعالى، جا بە ئیتیفاقی ئەهلی سونە و جەماعە ڕاستە و دروستە و جائیزە سوێند خواردن بە زاتی الله بە ناوە زۆر جوانەكانی بە سیفاتە بەرزەكانی وە بە غەیری خوای رب العالمين سوێند خواردن جائیز نیە دروست نیە هەندێک جار دەبێتە شیركی گەورە ئەگەر كەس و شتەكە سوێندی پێ دەخۆی پێت وابێ لە ئاستی اللەیە (پەنا بە الله) لە گەورەیی و لە مەزنی و لە بەڕێزی لەلات یان هەندێک جاریش دەبێتە شیرک و كوفری بچوک ئەگەر پێت وا نەبێ پێت مەخلوقێک بێ تەنها هەر بەسەر زمانتدابێ سوێند خواردن بە غەیری الله جائیز نیە و دروست نیە.

جا ئایە قورئان گەورەترە یان پێغەمبەر (ﷺ)؟ ئەو پرسیارە پرسیارێکی بیدعەییە بەڵام زۆرجار لەناو ئێمەدا دەکرێ لەبەر ئەوە حەزمان لێیە لێرەدە بۆتان ڕونی بکەینەوە، لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەو پرسیارە ئەگەر کرا بە کەسەکە بڵێ پرسیارێکە سودت پێ ناگەیەنێ نەکردنی باشترە داهێنراوە بەڵام چونکە دەیکەی بۆ ئەوەی هەموو گومانەکانت هەڵبوەشێنرێتەوە و ڕەت بکرێتەوە و پێی بڵێ لە وەڵامدا قورئان کە (کلام الله)یە (کلام الله) گەورەترە لە پێغەمبەر (ﷺ) چونکە قورئان مەخلوق نیە سیفەتێکە لە سیفەتەکانی الله تعالى کە (کلام الله)یە بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) مەخلوقە، لەنێوان مەخلوقەکاندا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە لە هەموو بەدیهێنراو و مەخلوقەکان گەورەترە، ئەگەر گوتیان ئەی عەرش گەورەترە یان پێغەمبەر (ﷺ) لە عەرشی الله؟ لەوێدا دەڵێین پێغەمبەر گەورەترە (ﷺ) لە بۆچونی ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە چونکە عەرشیش مەخلوقە پێغەمبەریش مەخلوقە (ﷺ)، بەڵام لە قورئاندا کە قورئان (کلام الله)یە و مەخلوق نیە و سیفەتی اللهیە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کامەیان گەورەترن؟ بە دڵنیاییەوە قورئان گەورەترە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە (والله أعلم بالصواب).

## قورئان دابەزیوە لە لای الله تعالى بۆ زەوی:

وَقَوْلُهُ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ [النمل: ٧٦]، ﴿وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ﴾ [الأنعام: ٩٢]، ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ [الحشر: ٢١]، ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُواْ إِنَّمَا أَنتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ * قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُواْ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾ [النحل: ١٠٢]، ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَـذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾ [النحل: ١٠٣].

ابن تیمیة -رحمه الله- بەو ئایەتانە جێگیری ئەوە دەکا کە قورئان دابەزیوە لە ئاسمانەوە وە لەلای الله تعالی وە بۆ سەر زەوی بۆ سەر مرۆڤەکان ئا ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە الله تعالی سیفەتی علوی هەیە و بەرزە وە لە پاشان ئەوەش دەگەیەنێ کە قورئان پاڵدراوەتە لای الله تعالی (کلام الله)یە یەکێکە لە سیفەتەکانی الله تعالی ئەوانە هەمویان دەلیلن وە ئەوەش دەگەیەنێ کە قورئان بەرز و پیرۆزە دابەزیوە لە ئاسمانەوە شتێکی سەر زەوی نیە کە سیفەتی خوای رب العالمین ە وە درۆ و دەلەسە کە پێی هەڵدەبەستری یان دەگوترێ قورئان (پەنا بە الله) هی موحەمەدە (ﷺ) بەو مانایەی کە ئەو دایناوە و قسەی خۆیەتی ئەوانە ڕەت دەبێتەوە بەو ئایەتانە مادەم دەڵێین دابەزیوە لەلای الله تعالی ئەوە نەبێ هەر لەسەر زەوی بوبێ قورئانی پیرۆز.

جا ئەرکەکانی قورئانی پیرۆزیش لەسەر ئێمە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە چیە؟ دەبێ ئێمە بڕوامان وابێ قورئان (کلام الله)یە وە بڕوامان وابێ الله تعالی کەلامی هەیە بە مەعنایە حەقیقی و ڕاست و دروستیەکەی سەوت و حەرفیشی هەیە بەوەی کە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین، وە لە پاشان بڕوامان وابێ (کلام الله) سیفەتێکی زاتیە لە ئەوەل و ئەزەلەوە هەیبوە و بەردوام دەیبێ بەبێ کۆتا وە لە پاشان سیفەتێکی فعلیشە هەر دەمای ویستبی و بیەوێ الله تعالی دەدوێ و قسە دەکا، وە لە پاشان بڕوامان وابێ کە قورئانی پیرۆز لەلای اللەوە دابەزیوە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ)، وە بڕوامان وابێ قورئانی پیرۆز جوبڕائیل (علیه السلام) بۆ پێغەمبەری هێناوە (ﷺ)، وە دەبێ بڕوامان وابێ بە قورئانی پیرۆز کە موعجیزەیە دەستە وەسانکاری بەرامبەرەکانێتی کەس ناتوانێ وەکو قورئان بێنێتەوە، وە دەبێ بڕوامان وابێ کە قورئانی پیرۆز ئەوەی تێیدایە و تێیدا جێگیر بوە هەموی ڕاست و دروستە و سەدا سەدە هیچ هەڵە و کەم و کورتی و گومانی تێدا نیە، وە دەبێ قورئانی پیرۆز بکەینە مەنهەج و بەرنامەی ژیانیشمان لەو دەستورە و لەو یاسایە زیاترمان نیە وەکو موسڵمان شتێکی تر هەبێ کاری پێبکەین بۆ

ژیانی ڕۆژانەمان، وە بڕواشمان وایێ قورئان دەگونجێ و دەشێ لەوەتەی هاتوە و دابەزیوە هەتا کۆتا ژیانیش و هەتا قیامەتیش جێبەجێ بکرێ لە هەموو بار و زروفەکاندا هیچ بار و زروفێک نیە بڵێین یان گومان بکەین کە ناشێ قورئانی تێدا جێبەجێ بکرێ وەکو عەلمانیەکان و بێدینەکان گوتویانە و دەیڵێن، وە بڕواشمان وایێ ئەوەی قورئان ڕەتکاتەوە بڵێ ناشێ ناگونجێ جێبەجێ بکرێ لە مەیدانی ژیاندا یان کار و شتێکی تر یان یاسا و بەرنامەیەکی تر چاکترە لە قورئان جێبەجێ بکرێ یان بۆمان حەلاڵە لە قورئان لابدەین یاسایەکی تر لە شوێنی جێگیر کەین و ئیشی پێبکەین ئەو کەسە کافر دەبێ بە بێ بڕوا حیسابە لە ئیسلام دەردەچێ، دەبێ ئەو هەموو بڕوایەمان هەبێ وە هەڵسوکەوتیشمان تایبەت بێ لە ئادابەکان لەگەڵ قورئانی پیرۆز، کە بە بەرزی تەماشای بکەین وە لە باوەشی بگرین وە ئەگەر ویستمان بیخوێنین بە دەست نوێژەوە بە پاکیەوە ڕوە و قیبلە و ڕوگە ئەوانە ئادابن ئەولاترە بە دانیشتنەوە زۆر لەلامان گەورە و مەزن بێ لەگەڵ الله تعالی تۆ دەدوێی کە قورئان دەخوێنی وە ئەولایە و باشترە کە بڕوادار ڕۆژانە بەشێکی هەبێ لە قورئان خوێندنەوە مەنهەجی ژیانێتی و لەگەڵی تێکەڵ بێ یان دەرخی بکا هەموی لەبەر بکا یان بە ئیتقان و ڕێک و پێکیەوە قورئان بخوێنێتەوە ڕۆژانە بەشێکی لە قورئان خوێندن هەبێ.

ئینجا الله تعالی کە فەرموی لە سوڕەتی النمل ابن تیمیة بە بەڵگەی هێنایەوە کە قورئان لە لای اللهوە دابەزیوە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ)، الله تعالی فەرموی بەنو ئیسرائیلیەکان ئیختیلاف و جیاوازییان هەبوو لەناو خۆیاندا کە ئەوە تەوڕات وایە و وا نیە و الله وای فەرموە و وای نەفەرموە و هەر لەناو خۆیاندا جا الله تعالی لە وەڵامی ئەوان بۆ ڕونکردنەوە بۆ بەنو ئیسرائیل دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ [النمل: ٧٦] جا قورئان کە دابەزی ئەو قورئانە الله تعالی دەفەرموێ دەدوێ و قسان دەکا دەگێڕێتەوە بەسەر بەنی ئیسرائیلدا ئەوەی زۆربەی ئەوان کە جیاوازیان تێیدا هەیە، یەعنی بۆیان یەکلا دەکاتەوە ڕونی دەکاتەوە کە ئەو جیاوازیانە وا نیە و بۆچونی

ڕاست و دروست لەگەڵ ئەوەدایە نەک لەگەڵ فلان و فیساری، جا کەواتە قورئانی پیرۆز کە ئەوان دەدوێنێ الله تعالی سەلماندی -جل شئنه- دابەزیوە (عَلَى)ی بەکار هێناوە: ﴿يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ﴿يَقُصُّ عَلَى﴾ بۆ چیە؟ لە بەرزی شتێک دابەزێ بەسەر نزمی (عَلَى)ی بۆ بەکار دەهێنرێ.

وە لە پاشان ئایەتی دوەم کە الله تعالی فەرمویەتی دەبێتە بەڵگە بۆ جێگیر کردنی ئەو بۆچونانە کە ابن تیمیەش هێناوێتی کە الله تعالی فەرموی: ﴿كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ إِلَيْكَ مُبَـٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَـٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ [ص: ٢٩] ئەو ئایەتەش هەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئانی پیرۆز دابەزیوە لەلای الله تعالی بە پیت و بەرەکەتە بەڕێز و سەنگین و مەزنە قورئانی پیرۆز بۆ ئەوەشە تا ئێوە وردبنەوە و بیر بکەنەوە لە ئایەتەکانی قورئان وە ئەوانەی خاوەن عەقڵ و هۆشیشن بە بیریان بێتەوە و هەردەم لەسەر قورئان بڕۆن و کاری پێ بکەن، وە لە پاشان الله تعالی کە فەرموی: ﴿وَهَـٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ﴾ [الأنعام: ٩٢] کە ابن تیمية ئەوەی وەکو ئایەتی دوەم بە بەڵگە هێناوەتەوە، ئا ئەو کیتابە کە قورئانی پیرۆزە دامان بەزاندوە بە پیت و بەرەکەت و بەرز و مەزنە قورئانی پیرۆز بە مەعنای دامان بەزاندوە یەعنی لەلای اللهوە دابەزیوە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ).

وە لە پاشان الله تعالی لە سورەتی الحشر ابن تیمية بە بەڵگەی هێنایەوە کە قورئان دابەزیوە کە الله فەرمویەتی: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ [الحشر: ٢١] ئەگەر ئێمە ئەو قورئانەمان دابەزاندبا بەسەر شاخ و کێوێک دەتبینی دەترسان وە ڕادەچڵەکین وە لەبار یەک دەچون یان دەتاوانەوە موفەسیرین دەفەرمون شاخ و چیا خۆی لەبەر ڕانەدەگرت لەبەر گەورەیی و مەزنی الله تعالی و وە سام و هەیبەتی قورئانی پیرۆز، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە الله فەرموی: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا﴾ یەعنی ئەگەر دامان بەزاندبا دیارە قورئان دابەزیوە، وە لە پاشان الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ﴾ ئەگەر ئێمە ئایەتێکمان لە شوێنی ئایەتێکی تر دابنابا ئەوە

الله تعالی زاناترە بەوەی دابەزیوە یان دادەبەزێ بە مانای قورئانی پیرۆز دابەزیوە، وە لە پاشان الله تعالی لەو ئایەتانە کە وای فەرموو دەفەرموێ: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ * قُلْ نَزَّلَهُ﴾ ئایەتێکی تر کە بەڵگەیە لە سورەتی النحل بەڵکو دایبەزاندوە، کێ دایبەزاندوە؟ الله تعالی قورئانی پیرۆزی دابەزاندوە لەلای خۆی، کێ هێناوێتی قورئانەکە؟: ﴿رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ﴾ روح القدس کە جوبرائیلە لە الله تعالی وە دایبەزاندوە و هێناوێتی بۆسەر پێغەمبەر موحەمەد (ﷺ).

کەواتە ئەو ئایەتانە هەمویان بەڵگەن لەسەر پلە و پایە و مەزنی قورئانی پیرۆز کە قورئانی پیرۆز دابەزیوە لە الله تعالی وە دەبێ ئێمە لێی ورد بینەوە تێی بگەین وە لە پاشان لەسەری برۆین وەکو مەنهەجێکی ژیانی خۆمانی دابنێین دەست بەوەوە بگرین هەموو یاسا و رێساکانی تر رەتکەینەوە جگە لە قورئانی پیرۆز نەیانکەینە مەنهەجی ژیانمان، وە هەموو جیاوازی و راجیاییەک واز لێبێنین لەبەر ئایەتەکانی قورئان، قورئان بکەینە مەسدەر و سەرچاوە بۆ یەکلا کردنەوەی ئیش و کارەکانمان بۆ دوبەرەکیەکانمان، وە ئەوانەش هەموو بەڵگەشن لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز دابەزیوە لەلای الله کە (کلام الله)یە وە قورئانی پیرۆز مەخلوق نیە و بەدیهێنراو نیە بەڵکو یەکێکە لە سیفاتەکانی الله تعالی کە (کلام الله)یە.

ئایە گەمە و گاڵتە کردن و سوعبەت کردن بە قورئانی پیرۆز کە یەک لە برایەکانی پرسی دروستە یان دروست نیە؟ نەخێر ئەوە دروست نیە بە هیچ جۆرێک ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون نابێ قورئان بکرێتە هی گەمە و گاڵتە و گەپ کردن، نابێ قورئان بکرێتە ئەوەی ئایەتێک الله تعالی (کلام الله)یە دایبەزاندوە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) تۆ بەکاری بێنیتەوە بۆ شتێکی خواردن و خوارنەوەیەک وەکو هەندێک دەڵێن: ﴿وَٱلْتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ﴾ [القیامة: ٢٩] دەبێتە پێکەنین لە کۆڕ و مەجلیسەکان کاتێ کە مریشکێک لەسەر خواردن دانراوە یان سور کراوەتەوە یان بە ساغی، ئەوانە هەر هەمویان بێ رێزییە لەگەڵ قورئانی

پیرۆز ڕاست و دروست نیە قورئان لەوە گەورەترە دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ نابێ بکرێتە مایەی سوعبەت و گەمە و گاڵتە و گەپ، هەندێک جار سوعبەت و گەمە و گاڵتە و گەپەکە کوفرییە، ئەو ئایەتە: ﴿إِنَّكُم إِذا مِّثلُهُم﴾ [النساء: ١٤٠] ئەو کەسانە دەگرێتەوە ئەگەر بە هەڵبژاردنی خۆیان ناچار نەکرابن و ئیکراهیان لەسەر نەبێ لە شوێنێکدا ئامادەبن و دانیشتبن وە کافر و موشریکەکان دەست بکەن بە کوفر و شیرکیانەوە گەمە و گاڵتە و گەپ بکەن بە الله تعالی (پەنا بە الله) بە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) وە بە ئاینی ئیسلام و ئایەتەکانی قورئان، ئەوکاتە تۆ لاسەرتە بە دەست یەکەمجار بە وەڵام بێی و دارکارییان بکەی و قەدەغەیان بکەی بەرهەڵستی بکەی لێنەگەڕێی کوفریەکەیان سەربگرێ و بیلێن، وە ئەگەر بە دەست پێت نەکرا دەبێ بە زمان ڕوە و ڕویان بوەستیتەوە و لێیان قبوڵ نەکەی و ڕازی نەبی، وە ئەگەر ئەوەشت پێ نەکرا دەبێ هەڵبستی ئەوێ جێ بێڵی و لەگەڵیان ئامادە نەبی دابنیشی لەکاتی کوفر و شیرکەکەی دەیکەن و بەردەوامن لەسەری، جا ئەگەر دانیشتی ئەوە نیشانەی ئەوەیە بە دڵ تۆ ڕازی بوی بە کوفرەکەیان و کافر دەبی وەکو ئەوان، وەکو الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَقَد نَزَّلَ عَلَيكُم فِي ٱلكِتَٰبِ أَن إِذَا سَمِعتُم ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكفَرُ بِهَا وَيُستَهزَأُ بِهَا فَلَا تَقعُدُوا مَعَهُم حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيرِهِۦٓ إِنَّكُم إِذا مِّثلُهُم إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلمُنَٰفِقِينَ وَٱلكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ [النساء: ١٤٠] الله تعالی دەفەرموێ بێگومان و بەڕاستی بەسەرتانەوە دابەزیوە لە پەرتوکە خواییەکەی کە قورئانی پیرۆزە ئەگەر ئێوە بیستتان ئایەتەکانی الله تعالی و قورئان پێیوە کافر دەبون کافرەکان و کوفرییان پێ دەکرد یان گاڵتە و گەمەیان پێ دەکرد ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن هەتا قسەکانیان نەگۆڕن و نەچنەوە سەر قسەیەکی تر و واز نەهێنن لە کوفر و شیرکەکەیان جا ئەگەر ئێوە لەکاتی کوفریەکەیان کە دەیانکرد و لەگەڵیان مانەوە و دانیشتن بەبێ ئەوەی بەرهەڵستییان بکەن بە دەست یان بە زمان لێیان هەڵبستنەوە یان بەجێیان بێڵن دانیشتن و لەگەڵیان مانەوە الله دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُم إِذا مِّثلُهُم﴾ کەواتە ئێوە وەک ئەوانن واتە لە

کوفری کردنەکەی وەک ئەوانن و وەکو ئەوان کافر دەبن چونکە اللە دڵنیای کردینەوە و تەئکیدی کردەوە فەرموی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ چونکە اللە مونافق و دەغەڵ و دوڕووەکان پێیوە دەبیە مونافقێکی ئیعتیقادی و مونافقێکی گەورە لەگەڵیان کە مایەوە لە مەجلیس و کۆڕەکە اللە دەفەرموێ مونافق و دەغەڵ و دوڕوکان لەگەڵ کافرەکان هەمویان پێکەوە کۆ دەکەمەوە لە ئاگری دۆزەخ و جەهەننەم وە عەزابیان دەدەم.

**جێگیر کردنی بینینی اللە تعالی لەلایەن بڕواداران لە قیامەتدا لە قورئاندا:**

﴿وُجُوه يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةَ * إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَة﴾ [القيامة: ٢٢-٢٣]، ﴿عَلَى الأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾ [المطففين: ٢٣]، ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَة﴾ [يونس: ٢٦]، وَقَوْلُهُ: ﴿لَهُم مَّا يَشَاؤُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيد﴾ [ق: ٣٥]. وَهَذَا الْبَابُ فِي كِتَابِ اللهِ كَثِير، مَنْ تَدَبَّرَ الْقُرْآنَ طَالِبًا لِلْهُدَى مِنْهُ؛ تَبَيَّنَ لَهُ طَرِيقُ الْحَقِّ.

---

ابن تيمية دەفەرموێ (وَهَذَا الْبَابُ فِي كِتَابِ اللهِ كَثِير) جا ئەو باس و خواسە کە اللە تعالی دەبینرێ بە چاوی سەر لەلایەن بڕوادارانەوە لە ڕۆژی دوایی لە قورئانی پیرۆز زۆرە ئایەت و بەڵگەکان (مَنْ تَدَبَّرَ الْقُرْآنَ طَالِبًا لِلْهُدَى مِنْهُ) بەڵام بە مەرجێک کەسێک لە قورئان بڕوانێ و لێی وردبێتەوە و تەدەبور بکا و تێبگات وە مەبەست و خوازیاری ئەوەش بێ مەبەستی ئەوەشی هەبێ کە وەکو ڕێنوێنی بە دوای قورئاندا بڕوات و ڕێنوێنی لێ وەربگرێ (تَبَيَّنَ لَهُ طَرِيقُ الْحَقِّ) ئەوکات بۆی ڕون دەبێتەوە ڕێگای ڕاست و ڕەوا.

جا هەندێک لە ئایەتەکان ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ڕاشکاوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ڕاستەوخۆ بڕواداران بە چاوی سەر لە ڕۆژی دوایی اللە تعالی دەبینن، ئەوە یەکێکە لە ناز و نیعمەتە زۆر گەورە و مەزنەکان اللە بە نسیبمان بکا یا ڕەبی، ئینجا هەندێک جاریش هەیە لێی هەڵدەهێنجرێ و بە وردبونەوە ئایەتەکە بە ناڕاستەوخۆ بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

ئەوانەی بە ڕاشکاوانە و ڕاستەوخۆ بەڵگەن یەک لەوان ئەو ئایەتەیە کە ئەهلی سونە و جەماعە بە بەڵگەی دەهێننەوە کە الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وُجُوه يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ * إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ [القيامة: ٢٢-٢٣] الله تعالی فەرمویەتی ڕوو و دەموچاوانێک هەن ئەو ڕۆژە دەدرەوشێنەوە دەگەشێنەوە، بە یەک حەرف و پیت مانایان لێک جیاوازە: ﴿نَّاضِرَةٌ﴾ کە حەرفەکەی دوای ئەلفەکە (ضادە) (اخت الصاد) بە مانای ئەوە دێ بۆ درەوشانەوەیە بۆ ڕوناکبونە بۆ جوانیە بەڵام: ﴿نَاظِرَةٌ﴾ کە حەرفەکەی پاش ئەلفەکە (ظێیە) (اخت الطاء) ئەو کاتە بە مانای بینین دێ زیاتریش ئەگەر تەحەدای کرد لە ڕستە و جوملەیەکدا بوو بە ئیلا مەبەستی پێ بینینی چاوی سەرە، ئینجا ئەو دەموچاوانەی دەدرەوشێنەوە و دەگەشێنەوە مەبەستی پێ ئەوان دەڕواننە خوای پەروەردگاریان: ﴿نَاظِرَةٌ﴾ یانی دەڕواننە خوای پەروەردگاریان دەیبینن بە چاوی سەر.

واتە الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وُجُوه يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾ دەموچاوانێک واتە مرۆڤانێک هەن لە بڕوادارەکان بەهۆی تەقوا و خێر و چاکە و بڕواداریيانەوە دەموچاو گەشاوەن بریسکاوەن لە ڕۆژی دوایدا ئینجا ئەو دەموچاو بریسکاوانە ئەو بڕوادارانە ئەو لە الله ترسانە: ﴿إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ ئەوانەن بەو دەموچاوەیان بەو چاوەی لەسەر هەیانە دەڕواننە خوای پەروەردگاریان یەعنی دەیبینن.

جا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەگەر هاتوو (نەظەر) بە حەرف و پیتەکەی کە (ظێ بێ) نەک (ضادبێ) بە مانای ئەگەر بە ئیلای حەرفی جەڕ تەحەدای کرد و پەڕییەوە بە مانای بینینی ڕاستەوخۆ دێ بە چاو، بەوە لێک دەدرێتەوە هەم لە زمانەوانیشدا هەم لە مانا و واتایەکانیدا.

جا هەندێک لەوانەی کە لارێ بونە بە تایبەت موعتەزیلەکان ئەوە چۆن تەفسیر دەکەن؟ دەڵێن: ﴿إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ بە مانای (إِلَى ثواب رَبِّهَا) تەئویلی دەکەن و دەڵێن حەرفێکی تێدایە یەعنی دەڕواننە پاداشتەکانی خوای پەروەردگاریان، ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن

وانیە ئەو ئایەتە پێویستی بەوە نیە شتێکی بۆ تەقدیر و ئەندازە بکرێ و بڵێی حەرفی تێدایە مانایەکەی بە ڕاست و دروستی دێ، وە حەدیسیشمان لە دەستە هی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگە لەسەر ئەوەی کە الله تعالى ڕاستەوخۆ دەبینرێ، جا ابن تیمیة هەر لە (الواسطیة) هێناویەتیەوە لەبەر ئەوە ئێمە فەرمودەکە ناهێنینەوە لەدوای ئەو ئایەتانە کە کردویەتیە بەڵگە بۆ جێگیر کردنی سیفەتەکانی الله تعالى چەند حەدیسێکیش دەهێنێتەوە ابن تیمیة -رحمه الله-، ئەویش جێگیر کردنی هەندێک لە سیفاتەکانی الله تعالى پێدەکا جا لەوێوە بە درێژتر باسی لێوە دەکەین فەرمودە سەحیحەکانیشی هێناوەتەوە کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی الله بە چاوی سەر دەبینرێ.

ئینجا ئایەتەکەی سوڕەتی (المطففین)یشی بە بەڵگە هێناوەتەوە ابن تیمیة -رحمه الله- کە دەڵێ الله تعالى فەرمویەتی: ﴿عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾ [المطففین: ٢٣] بڕوادارەکان لەسەر شوێنێک دادەنرێن لە بەهەشت: ﴿أَرَائِكِ﴾ تەبعەن جەمع و کۆی ئەریکەیە ئەریکە لە زمانی عەرەبیدا بە مەعنای (ما يُتَّكَأُ عليه) دێ هەر شتێک بتوانی لەسەری پاڵ بدەیەوە ئەنیشک بدەیەوە ئەوە پێی دەگوترێ ئەریکە، جا دەڵێ ئەوانە ئەنیشکیان داوەتەوە و پاڵیان داوەتەوە لە پاڵدانەوەوە دەبینن و دەڕوانن، چی دەبینن و دەڕوانن؟ هەندێک لە زانایان بەوەیان لێک داوەتەوە یەعنی (النظر إلى الله) لەسەر ئەریکەکە و بە پاڵدانەوە و ئەنیشک دانەوەوە دەڕواننە الله تعالى و بە چاوی سەر الله تعالى دەبینن -جل شئنه-، هەندێکیش دەڵێن نا ناز و نیعمەتەکان دەبینن هی بەهەشت جا هەندێک بەو ئایەتەی پێشتر وای نەفسیر دەکەن کە: ﴿نَاظِرَةٌ﴾ لەوێ ڕاشکاوانە الله تعالى فەرمویەتی الله دەبینن -جل شئنه- جا لێرەوەش دەڵێن هەر ئەوە دەگەیەنێ، وە هەندێکیش دەڵێن نەخێر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ناز و نیعمەتەکان دەبینرێن، جا ئەگەر بڵێین ناز و نیعمەتەکانیش گەورەترین ناز و نیعمەت ئەوەیە کە ئینسان بە چاوی سەر الله ببینێ -جل شئنه-.

جا ئایەتەکەی سێیەم کە ابن تیمیة بە بەڵگەی هێنایەوە -رحمه الله- لەسەر ئەوەی کە الله بە چاوی سەر دەبینرێ لەلایەن بڕوادارەکانەوە لە ڕۆژی دوایی دەڵێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ [یونس: ٢٦] ﴿وَزِيَادَةٌ﴾ لێرە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون تەفسیری دەکەن بەوەی کە لە پێغەمبەر پرساوە (ﷺ) وە سەحابەکان لێیان پرساوە وایان تەفسیر کردوە بە دڵنیاییەوە ئەو تەفسیرە لە پێغەمبەرەوە بوە (ﷺ) چونکە سەحابە هیچ شتێکی عەقیدە و غەیبیات لە خۆیانەوە قسەیان لێ نەکردوە مەگەر لە پێغەمبەریان بیستبێ (ﷺ)، لەوانە ئیمامی ئەبو بەکر وە جگە لەو لە سەحابە بەڕێزەکان -رضي الله عنهم- کە لێیان پرسیوە: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى﴾ مەبەستی چیە؟ کە ئەوانەی چاکەکارن و چاکە دەکەن حوسنایان بۆ هەیە، حوسنا کوێیە؟ گوتویەتی بەهەشتە «الجنة» چونە بەهەشتە، گوتیان ئەی باشە: ﴿وَزِيَادَةٌ﴾ مەعنای چیە کە الله تعالی فەرموی؟ فەرمویەتی «النظر الى وجه الله سبحانه وتعالى[١]» واتە تێڕوانینی بینینی الله تعالی یە بە چاوی سەر لەلایەن بەهەشتێکانەوە کە الله دەبینن بە چاوی خۆیانەوە بەبێ پەردە ئەوە ئەوە دەگەیەنێ.

ئینجا الله تعالی لە تەواوکردنی ئایەتەکە فەرمویەتی: ﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ﴾ ئەوە خۆشیەکەی لەوەدایە یەعنی بەرهەمی ئەوەی کە دەڕواننە الله تعالی ئەوانەی کە بڕوادارن و بەهەشتین چییان لێ دێ؟ کە زەلیلیان توش نابێ چیتر سەرشۆڕییان توش نابێ ناخۆشییان توش نابێ غەم و پەژارە و گۆڕانکارییان بەسەردا نایە یان ڕەنگیان هەر لە گەشاوەیدا دەمێنێتەوە چونکە شتێکی یەکجار خۆش دەبینن و تام و چێژی تایبەتی خۆی هەیە و لێی دەکەن.

ئینجا لە پاشان ئایەتی دواتر کە ابن تیمیة کردیە بەڵگە الله پاداشتی بداتەوە بۆ بینینی الله تعالی دەڵێ: ﴿لَهُم مَّا يَشَاؤُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ [ق: ٣٥] الله تعالی فەرمویەتی زۆر زیاتریشیان بۆ هەیە لەناو بەهەشتدا لە ناز و نیعمەتەکان ئەوەی کە بیانەوێ وە لە پاشان

[١] **صحيح مسلم** (١٨١)، **سنن الترمذي** (٢٥٥٢) (٣١٠٥)، **سنن ابن ماجه** (١٨٧).

زیادەشیان هەیە بەسەر ئەوەوە، ئەو زیادە بەسەر ئەوەوە وا تەفسیر کراوە لەلایەن هەندێک لە موفەسیرین یەعنی (بالنظر إلى وجه الله سبحانه وتعالى) بە تەماشاکردن و بینینی الله تعالى -جل شئنه- کۆمەڵێک لە سەلەفی ساڵح وایان فەرموە (أي: نزيدهم بشيء لم يخطر على بالهم وهو النظر إلى وجه الله تعالى) لە تەفسیرەکەی وا دەڵێن ژمارەیەک لە سەلەفی ساڵح لە موفەسیرین دەفەرمون: ﴿وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ یەعنی ئێمە زیاد دەکەین بۆیان لەسەر ناز ونیعمەتەکەیان شتێکیان بۆ دەکەین کە ئەوان ڕەنگە بە دڵ و خەیاڵیشیاندا نەهاتبێ ئەویش بینینی الله تعالى یە بە چاوی سەر لە بەهەشت الله بە نسیبمان بکا و لەوانمان بکا.

وە هەندێک لە زانایان دەش فەرمون ئەو ئایەتەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوە دەسەلمێنێ لە سورەتی المطففين کە بە پێچەوانەوە الله تعالى دەفەرموێ کافر و بێ بڕواکان پەردە دروست دەبێ لە نێوان الله تعالى و ئەوان ئەوان بە چاوی سەر نایبینن یەکێکە لە عەزابەکان بۆیان کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾ [المطففين: ١٥] نەخێر کافر و بێ بڕواکان لە خوای پەروەردگاریانەوە لەو ڕۆژە پەردە هەیە لە نێوانیان و نایبینن بە چاوی سەر، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان: ﴿لَّمَحْجُوبُونَ﴾ نایبینن و پەردە هەیە، کەواتە بڕوادارەکان بەو ئایەتەی پێشتریش کە باسمان کرد لە سورەتی المطففين کەواتە ئەوان دەیبینن بە چاوی سەر بە پێچەوانەی کافر و بێ بڕواکان.

موعتەزیلەکان بە بەڵگەی ئەوە دەڵێن الله نابینرێت بە چاوی سەر -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى) چونکە دەڵێن ئەی ئەوە نیە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ﴾ [الأنعام: ١٠٣] بینین و چاوەکان پەی نابەن بە الله تعالى هەر الله تعالى پەی دەبا بە هەموو بینینەکان و بە چاوەکان، ئینجا ئەهلی سونە و جەماعە وەڵامیان دەدەنەوە دەڵێن کاکە ئیدراک لێرە پەی بردنە کە مەبەست پێ ئیحاطەیە یەعنی هیچ بینینێک ناتوانێ ئیحاطەی الله تعالى بکا -جل شئنه- هیچ عیلم و زانستیەک ناتوانێ ئیحاطەی الله تعالى

بکا هیچ دەسەڵاتێک ئیحاطەی تعالی بکا دەوری الله تعالی بدا -جل شئنە-، بەو مانایەیە ئەگەرنا ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی بڵێین نابینرێ الله تعالی -جل شئنە-، دەبینرێ وە بەڵام ئیحاطەت پێ ناکرێ تۆ الله تعالی لەوە گەورەترە -جل شئنە- ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی بڵێی بەهەشتیەکان نایبینن بەڵام ئیحاطەی پێ ناکەن و ئیدراک لێرەدا بەو مانایە لێکیان داوەتەوە.

وە لە پاشان موعتەزیلەکان وە تاقم و کۆمەڵەکانی تریش کە بە دوای ئەواندا چونە بەڵگەیەکی تریش دەهێننەوە دەڵێن ئەی ئەوە نیە موسا پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتیە الله تعالی: ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِى أَنظُرۡ إِلَيۡكَ﴾ [الأعراف: ١٤٣] ئەی الله تعالی پیشانم بدە بتبینم، جا لێرە موفەسیرین و ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە بۆچونیانە دەڵێن خۆ موسا پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی لە دونیادا الله نابینرێ چونکە پێغەمبەری الله بوو وە بڕواشی وابوو بەڵام بەنو ئیسرائیل ئەوەندەیان سوئالی بێ مانا لێدەکرد بۆ ئەوەی ببێتە حوجە و بەڵگە لەسەریان لەسەر قسەکەی ئەوانەوە فەرموی ئەی الله تعالی با بتبینین یان با بتبینم بە چاوی سەر هەتا بۆ ئەوان بسەلمێنرێ کە الله تعالی لە دونیادا نابینرێ، ئینجا موعتەزیلەکان دەڵێن ئەی ئەوە نیە الله تعالی لە وەڵامی موسا فەرمویەتی: ﴿لَن تَرَىٰنِى﴾ لەنیش دەڵێن نەفیە نەفی ئەبەدی و هەتا هەتاییە بە مەعنای نابینرێم ناتوانی بمبینی هەتا هەتایی، جا هەتا هەتایی لێرە وەکو زانایانی لوغەش دەفەرمون لەن هەموو جار نەفیەکی تەئبیدی سەدا سەدی نیە بەڵکو نەفیەکەی لەنی بە دڵنیاییەوە بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەوە لە لوغەش هەر ئەو مانایە ڕاست و دروسترە ئەگەر هەشبێ هەتا قیامەتییە چونکە هەتا قیامەت هەموو شتێک نیزامی تێک دەچێ قیامەت نیزام و سیستەمێکی نوێیە واتە هەتا قیامەت لەن نەفی دەکا ئەگەر قیامەت هات زمانی عەرەبیش تێک دەچێتەوە قەواعید و بنەماکانی عەرەبیش نامێنێ مرۆڤەکان هەڵدەوەشێنەوە و جارێکی تر سەر لەنوێ زیندو دەکرێنەوە و ئاسمانەکان تێک دەچێ و زەوی تێک دەچێ و ڕەنگە زەویەکی تر دەهێنرێ

یان ئەو زەویە ئەو دیمەن و شتانەی بەسەریەوەیە نامێنێ دەبێتە زەویەکی تر و هەموی تێک دەچێ بنەمایەکانی عەرەبیش تێک دەچێ، وەکو ئیمامی مالیک لە ئەلفیەکەی کە مەسدەر و سەرچاوەیەکی گرنگی نەحو صەرفە فەرمویەتی:

(ومن رأى النفي بلن مؤبدا

فقوله اردد وسواه فاعضدا[1])

دەفەرموێ هەریەک گوتی لەن تەفیەکی موئەبەدی سەدا سەدە یەعنی هەتا هەتاییە قیامەتیش ئەگەر هات جا ئەو قەول و قسە ڕەتکەوە وە قسەی پێچەوانەی ئەوان پشتگیری لێبکە و تەئیدی لێبکە و بڵێ ڕاستر و دروستر و بەهێزترە.

ئینجا ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن ئەی موعتەزیلەکان ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئێوە چونکە: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾ یەعنی ئەی موسا من نابینرێم و ناتوانی بمبینی هەتا قیامەت دادێ نەفیەکە هەتا ئەوکاتەیە، یەعنی لە دونیا نابینرێم، بەڵێ ئەهلی سونە و جەماعەش دەڵێن لە دونیا الله تعالى نابینرێ، جا ئەوەتا الله تعالى سەبارەت بە نوح پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ [هود: ٤٦] جا الله تعالى وەکو بە نوح پێغەمبەریشی گوت (ﷺ) ئەوەی بە موساشی گوت هەروایە لە واتاکەی ئێستا شی دەکەینەوە، الله تعالى نەیفەرموە ئەی موعتەزیلەکان ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون بڵێ (إني لا أرى) من نابینرێم ئەگەر بیگوتبا (إني لا أرى) نابینرێم مەعنای لە هیچ کاتێک نابینرێ الله تعالى بەس فەرموی: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾ تۆ نامبینی ئێوەی مرۆڤەکان نامبینن هەتا کەی نامبینن؟ هەتا قیامەت دادێ ئینجا لە قیامەت دوبارە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کافر و بێ بڕوا نامبینن بەڵام بڕوادار ئەو کاتە بەڵگەی ترمان هەیە دەمبینن ئەوە بەڵگەی ئەهلی سونە و جەماعەیە، کەواتە دروست نیە و ناتوانن و لە تواناتاندا نیە لە دونیادا من ببینن چونکە الله تعالى

[1] الكافية الشافية: لابن مالك ج٣ ص١٥١٥.

لەوە گەورەترە -جل شئنه- کە ببینرێ لە دونیادا، و لە توانای ئێمەدا نیە لە قیامەت ئێمە دیزاینێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە یەعنی سەر لەنوێ دادەڕژێینەوە بە هێز و توانایەکی تر الله تعالى زیندومان دەکاتەوە ئەو توانا و هێز و دیزاینەی لە قیامەت بۆ مرۆڤەکان هەیە جیاوازە لەگەڵ هی دونیا لە توانا بەخشینی الله تعالى بۆ مرۆڤەکان لەوێوە هەندێک شت هەیە تەحەمولی دەکەی و دەیبینی و لە تواناتدا هەیە لە دونیادا ئەوەت لە تواناتدا نیە، جا ئەهلی سونە و جەماعە الله پاداشتیان بداتەوە دەفەرمون ئەوەتا کە الله تعالى فەرموی: ﴿وَلَـٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ﴾ [الأعراف: ١٤٣] ئا لەوێشدا الله تعالى ڕونکردنەوەیدا فەرموی بڕوانە شاخ و چیایەکە ئەی موسا ئەگەر ئەو جێگیر بوو توانی لە بەرامبەر تەجەلای من و خۆ نیشاندانی من بە شاخ و چیایەکە بمێنێتەوە ئینجا لەپاش ئەوکات تۆش دەتوانی، یەعنی ئەگەر شاخێک بەو هەموو هێز و توانایەوە الله تعالى پێی بەخشیوە کە دینگە و ڕاگری زەوییە الله تعالى وایکردوە ئەو خۆی نەگرێ تۆ مرۆڤێکی لە دونیادا دەڕی هێزت وەکو شاخ نیە وەکو شاخ پتەو نی هەر خۆت ناگری، بەو مانایەی الله تعالى نیشانی ئەوەی داوە کە من دەبینرێم دەتوانم خۆم نیشان بدەم -جل شئنه- بەڵام لە دونیادا لەبەر ئێوەمە تەحەمول ناکەن ناتوانن هێزی ئەوەتان نیە خۆ ڕابگرن لە بینینی من لە قیامەت ئەوە دەتوانرێ جا ئەوەش بەڵگەیەکی ترە هی ئەهلی سونە و جەماعە.

لە کۆتایدا سەبارەت بە بینینی الله تعالى لەلایەن بڕوادارانەوە ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاشکاوانە فەرمویەتی لە شوێنی خۆی بە درێژتر باسی دەکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ[١]» ئێوە بە دڵنیاییەوە لە قیامەت و لەدوای هاتنی قیامەت پەروەردگاری خۆتان دەبینن ترون یەعنی بە چاو دەیبینن هەروەکو ئێستا مانگ ئەگەر لە چواردەبێ دەیبینن، ئەگەر مانگ لە چواردەبێ ئاسان دەبینرێ جا

[١] **صحيح البخاري** (٥٥٤) (٥٧٣) (٤٨٥١)، **صحيح مسلم** (٦٣٣)، **سنن أبي داود** (٤٧٢٩).

چۆن مانگ لە چواردە دەبینرێ بە ئاسانی ئا ئاوا بە ئاسانی ئێوە ئەی بڕواداران پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) پەروەردگاری خۆتان دەبینن لە قیامەتدا.

کەواتە ئەوانە هەمویان بەڵگە بون لە کۆتایدا بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعە لەگەڵ ئەوەدایە بەو بەڵگانەوە ڕەدی موعتەزیلەکان دەدەنەوە کە الله تعالى لەلایەن بڕوادارەکانەوە بە چاوی سەر دەبینرێ لە قیامەت یەکێکە لە ناز و نیعمەتە گەورە و مەزنەکان.

## ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالى وە سیفاتە بەرزەکانی لە سونەتی پێغەمبەرەوە

ثُمَّ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَالسُّنَّةُ تُفَسِّرُ الْقُرآنَ وتُبَيِّنُهُ، وتَدُلُّ عَلَيْهِ، وتُعَبِّرُ عَنْهُ، وَمَا وَصَفَ الرَّسُولُ بِهِ رَبَّهُ ـ عَزَّ وَجَلَّ ـ مِنَ الأَحَادِيثِ الصِّحَاحِ الَّتِي تَلَقَّاهَا أَهْلُ الْمَعْرِفَةِ بِالْقَبُولِ؛ وَجَبَ الإيمَانُ بِهَا كَذَلِكَ.

---

جا لە پاشان ابن تيمية -رحمە اللە- دێتە سەر ئەوە بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر جێگیر کردنی ناوە زۆر جوانەکانی الله تعالى وە سیفاتە بەرزەکانی لە سونەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) یەعنی بەڵگەی ئەمجارە فەرمودەییان بۆ دەهێنێتەوە کە سونەتی پێغەمبەریش (ﷺ) یەکێکە لە سەرچاوەکانی زانین و شارەزابونمان دەربارەی ناو و سیفەتەکانی الله تعالى، هەتا ئێرە بەڵگەکانی قورئانی هێناوە سەلماندی بۆ ئێمە بە ڕێک و پێکی کە الله تعالى خاوەنی ناوە زۆر جوانەکان و سیفاتە زۆر بەرزەکانە وە ئەمجارە فەرمودەکان دەهێنێتەوە و دەڵێ سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێک جار بەڵگەیە لەسەر هەندێک لە ناو و سیفەتەکانی الله تعالى، باسی ئەوە دەکا دەربارەی (فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)) باس و خواسەکە ئەمجارە دەربارەی سونەت و فەرمودە سەحیح و دروستەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) دەربارەی جێگیر کردنی ناو و سیفەتەکانی الله تعالى، ابن تيمية -رحمە اللە- دەفەرموێ لە (الواسطية) (فَالسُّنَّةُ تُفَسِّرُ الْقُرآنَ) سونەت و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕاڤە و تەفسیری قورئانە

یەعنی قورئانی پێ تەفسیر دەكرێ ئایەتەكان (وتُبَيِّنُهُ) وە هەندێک جار قورئان موجمەلە یەعنی كورت هاتوە ئایەتەكە، سونەت چی دەكا؟ موبەینە بۆ قورئانەكە یەعنی ڕونكەرەوەیە بە درێژتر پێت ڕادەگەیەنێ، بۆ نمونە الله تعالى هەڵسوكەوتەكانی كە لە نوێژدا دەكرێ لە قورئاندا الله فەرمویەتی؟ الله دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَوٰةَ﴾ [العنكبوت ٤٥] نوێژ بەرپا بكەن، ئێ چۆن ئێمە ئەو نوێژە بكەین؟ ئەوە موجمەلە كورتە نازانین چۆنیەتی نوێژ بەڵام پێغەمبەر هات (ﷺ) لە فەرمودەكانی خۆی بە فعل و كرداری خۆی بۆ ئێمەی ڕون كردوە دەفەرموێ: «صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي[1]» نوێژ بكەن هەروەكو من ببینن چۆن نوێژ دەكەم، كەواتە سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمودەی پێغەمبەر ڕاڤە و تەفسیرە بۆ قورئانی پیرۆز وە هەندێک جاریش ڕونكەرەوەیە بە دور و درێژی بۆ موجمەل و شتە كورتە پوختەكانی لە قورئاندا هاتوە (وتَدُلُّ عَلَيْهِ) وە هەندێک جار بەڵگەیە لەسەری (وتُعَبِّرُ عَنْهُ) وە هەندێک جار فەرمودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) تەعبیر دەكا لە ئایەتەكانی قورئان (وَمَا وَصَفَ الرَّسُولُ بِهِ رَبَّهُ ـ عَزَّ وَجَلَّ ـ مِنَ الأَحَادِيثِ الصِّحَاحِ الَّتِي تَلَقَّاهَا أَهْلُ الْمَعْرِفَةِ بِالْقَبُولِ؛ وَجَبَ الإيمَانُ بِهَا كَذَلِك) جا ئەو فەرمودانەی كە هاتوە لە فەرمودە سەحیح و ڕاست و دروستەكان كە ئەهلی شارەزایانی فەرمودە فەرمودە ناسەكانی كە قبوڵیان كردوە و بە سەحیحیان داناوە لەو فەرمودانەی كە ئاوایە و پێغەمبەر (ﷺ) الله تعالى ی وەسف كردوە دەبێ ئێمە چیبكەین؟ واجب دەبێ لەسەرمان پێویست دەبێ كە بڕوامان پێیان بە هەر هەموو فەرمودە سەحیح و دروستەكان كە باسی سیفەتەكانی الله تعالى ی كردوە. ئینجا بەڵگە لەسەر ئەوەی كە بەڵێ سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) تەفسیری قورئانە ڕونكەرەویەتی وە بە دور و درێژی موجمەلەكانمان تێ دەگەیەنێ و حاڵی دەكا بەڵگەیە لەسەری، ئایەتەكان زۆرن بە كورتی یەک دوو بەڵگەیەک دێنین كە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [النحل: ٤٤] الله تعالى

[1] **صحيح البخاري** (٦٣١) (٦٢٨) (٦٣٠)، **صحيح مسلم** (٦٧٤)، **سنن أبي داود** (٥٨٩).

دەفەرموێ بەسەر تۆوە ئەی موحەمەد (ﷺ) زیکرمان دابەزاندوە زیکر یەکێکە لە ناوەکانی قورئانی پیرۆز: ﴿إِنَّا نَحنُ نَزَّلنَا ٱلذِّكرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ [الحجر: ٩] ئێمە بەسەر تۆوە زیکر کە قورئانە دامان بەزاندوە وە ئێمەش دەیپارێزین پارێزەری قورئانین، ئینجا لەو ئایەتەش الله تعالی دەفەرموێ ئێمە قورئانمان بەسەر تۆ دابەزاند ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئیش و کاری تۆ چیە؟ ئیش و کاری تۆ ئەوەیە ڕون بکەیەوە ئەو ئایەتانەی قورئان بۆ خەڵکەکە کەواتە: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ کە موجمەل و کورتە خەڵک لێی حاڵی نابێ و تێ ناگا نازانێ نوێژ چۆن ئەنجام بدا کە فەرمانیان پێدەکەم نوێژ بکەن و بەرپای بکەن تۆ بۆیان ڕونکەوە بۆ نمونە ئەوە نمونەیەکیانە، بە فیعل و کرداری خۆت بە گوتن و قسەکانی خۆت کە نوێژ چۆن ئەنجام دەدرێ ڕوکنەکانی چیە وە فەرزەکانی چیە سونەتەکانی چیە.

ئینجا سەبارەت بە حەج ئەو کار و کردەوانەی حەجیش کورتە پوختێکە لە ئایەتەکانی قورئان هاتوە کە الله تعالی فەرمویەتی لەسەر مەردوم و خەڵکەکانە لەسەر مرۆڤ و بڕوادارەکانە حەجی ماڵی الله بکەن ئەگەر لە توانایاندا هەبێ، جا پێغەمبەر هات (ﷺ) کە کردار و فیعل و فەرمانەکانی الله تعالی لە حەجێی بۆ ئێمە ڕون کردەوە کە فەرموی: «خذوا عنّي مناسِكَكم[١]» لە منەوە وەربگرن ئەو عیبادەت و پەرستشانەی هی حەجێ کە حەجی ماڵی اللهی پێ ئەنجام دەدەن.

کەواتە ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕونکەرەوەی قورئانی پیرۆزن و ئایەتەکانن وە تەفسیرن بۆیان، وە بە دور و درێژتر ئەو ئایەتانەی موجمەل و کورتە پوختن پێغەمبەر (ﷺ) ڕونی دەکاتەوە بە درێژی بۆمانی باس کردوە و حاڵیمان دەکا و تێمان دەگەیەنێ، جا ئاهلی سونە و جەماعە دەفەرمون کە سونەت وایە کە حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەر وایە (ﷺ)، کەواتە لە هەر حەدیسێکی سەحیح هاتبێ ناوێکی زۆر جوانی الله یان سیفەتێکی بەرزی الله ئێمە واجب دەبێ

[١] صحيح الجامع (٧٨٨٢).

لەسەرمان قبوڵی بکەین وە وەریبگرین وە ڕەتی نەکەینەوە، هەندێک لە تاقم و کۆمەڵەکان بۆچونیان وایە کە حەدیسەکان مادەم دابەش دەکرێ و چەند بەشێکی هەیە موتەواتیری هەیە و ئاحادی هەیە ئاحاد (ظني الدلالة)یە لە عەقیدە وەرناگیرێ.

ئایە حەدیس و فەرمودەی ئاحاد لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وەردەگیرێ بۆ جێگیر کردنی بیروبڕوا و ئیمان و ناوە زۆر جوانەکانی الله و سیفاتە بەرزەکانی الله تعالى یانە نا؟ تەبعەن فەرمودەکانی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) زانایان دەفەرمون لە ڕوی وەرگرتن و ڕەتکردنەوەیان وە گێڕانەوەیان بۆ ئێمە دابەشە بۆ چەند بەشێک، هەندێک لە فەرمودەناسان و موحەدیسین -رحمهم الله- دابەشیان کردوە دەڵێن فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) یان موتەواتیرە یان ئاحادە یان مەشهورە وە هەندێکیش دەفەرمون (والله أعلم) بەس ئاحاد و موتەواتیر، موتەواتیر چیە بە کورتی؟ موتەواتیر دوو جۆری هەیە یان موتەواتیری لەفزییە یان موتەواتیری مەعنەوییە، موتەواتیر بەو فەرمودە دەگوترێ کە لە هەر چین و تەبەقەیەکدا کۆمەڵێک لە مرۆڤەکان ئەو فەرمودەیان گێڕابێتەوە کە عەقڵی مرۆڤ بڵێ ئەو کۆمەڵە مرۆڤە پێکەوە کۆ نابێتەوە لەسەر قسەیەکی درۆین یان ناڕاست لەبەر ئەوەیە بڕیار دەدرێ فەرمودەکە وەرگیراوە و قبوڵکراوە، وە هەریەک لەوانەش کە لە چینەکان لە مرۆڤەکان کە ڕیوایەتیان کردوە سیفەت و ئاوەڵناوی تایبەتمەندیان هەیە (بە ڕاستگۆ ناسرابن، بەڕێزبن، درۆیان لێ نەبینرابێ، وە ژمارەیەکی وابن کە عەقڵی مرۆڤ بڵێ ئەوانە پێکەوە لەسەر درۆ و شتی ناڕاست کۆنابنەوە) لە هەر چین و تەبەقەیەکدا واتە لە سەحابە ئینجا لە تابیعی ئینجا لە تابیعی تابیعی هەتا گەیشتوەتە دەستی فەرمودەناسێکی وەکو ئیمامی بوخاری یان زانایەکانی تر و فەرمودەناس بۆ ئێمە گێڕدراوەیە بەو حەدیسە دەگوترێ موتەواتیر، موتەواتیر (قطعي الثبوت)ە یەعنی سەدا سەد جێگیرە وە ئەوەی بڕوای بە فەرمودەی موتەواتیر نەبێ زانایان دەفەرمون کافرە، لەبەر ئەوەی موتەواتیر ئەوە بەخۆیوە هەڵناگرێ سەحیحە زەعیفە ئەو بەش و دابەشانە لەگەڵ موتەواتیر نیە، وە ژمارەی فەرمودە

موتەواتیرەکان زۆر نیە لەبەر ئەوە هەندێک جار لەلای هەندێک لە زانایان لە هەندێک لە پەرتوکی تایبەتیش کۆکراوەتەوە ژمارەی فەرمودەکانی تر زیاترە، جا ئایە ژمارەی ئەو کەسانەی لە هەر چین و تەبەقەیەک ڕیوایەتیان کردبێ فەرمودەی موتەواتیر چەندبێ وەکو مەرج دایان نابێ؟ هەندێک لە زانایان دەفەرمون نابێ ژمارەیان لە دە کەس کەمتربێ هەندێک بە حەوتی دادەنێن هەندێک بە زیاتری دادەنێن هەندێکیش دەفەرمون بە ژمارە نیە بەڵکو گرنگ ئەوەیە ژمارەیان لە سێ و ئەوانە زیاتربێ، ئینجا کەسەکانیش ئەو تایبەتمەندی و ئاوەڵناو و خەسڵەت و سیفەتانەیان تێدابێ کە گوتمان ڕاستگۆیی و پاکایەتی و درۆیان لێ نەبینرابێ، وەکو پێغەمبەر دەفەرمویێ (ﷺ): «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ[1]» پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێ هەریەک درۆم پێ هەڵبەستێ با شوێنی خۆی لە ئاگری دۆزەخ ئامادە بکات و دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ فەرمودەیەکی موتەواتیرە، موتەواتیری لەفزی ئەوەیە لە لەفز و دەربڕینەکان لە وشەکان وەکو یەکبن فەرمودەکە یەعنی بلێین فلانە زانا و فلانە فەرمودە ناس کە ڕیوایەتی کردوە وە لە شوێنێکی تریش کە ڕیوایەت کراوە دەربڕینەکان لەفزەکان پیتەکان حەرفەکان کت و مت وەکو یەکبێ، فەرمودەی موتەواتیری مەعنەوی ئەوەیە لە مانادا یەکبن بەڵام لە لەفز و دەربڕیندا ئەگەر یەکیش نەبن ئاساییە، ئەوە فەرمودەی موتەواتیری مەعنەوییە کە دەفەرمون پاڕانەوە و دەست بەرز کردنەوە بۆ دۆعا یەکێکە لەو فەرمودانەی کە لەفزەکان هەندێک جار وەکو یەک نینە بەڵام لە مانادا یەک دەگرنەوە فەرمودە ناسان بە بەڵگە دەیهێننەوە، ئەوەیان بۆ مەعلومات و پێشەکیەک و بەرچاو ڕونی بەڵام ئەوەی ئێمە ئیشمان پێیە فەرمودەی ئاحادە، فەرمودەی ئاحاد فەرمودە ناسان دەفەرمون ئەو فەرمودەیە لە تەبەقە و چینەکان با دوو تەبەقە یان یەک تەبەقە یەک کەس ڕیوایەتی کردبێ فەرمودەکە یان ئەوپەڕی دوو کەس ڕیوایەتی کردبێ نەگەیشتبێتە سێ و ژمارەی تەواتور یان مەشهور

[1] **صحيح البخاري** (١٢٩١)، **صحيح مسلم** (٤)، **مسند أحمد** (١٨١٤٠) (١٨٢٠٢).

بەوەی دەگوترێ فەرمودەیەکی ئاحاد، یەعنی تاکە کەسێک ڕیوایەتی کردبێ وەکو فەرمودەی «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ[١]» «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ» تەنها ئیمامی عومەر ڕیوایەتی کردوە وە لە سەردەمی تابیعیش تەنها یەک کەس ڕیوایەتی کردوە بەو فەرمودە دەگوترێ فەرمودەیەکی ئاحاد، ئینجا فەرمودەی ئاحادە لە ڕوی وەرگرتن و قبوڵکردن و دانپێداهێنانی فەرمودە ناسان چەند بەشێک و جۆرێکیان بۆ داناوە (هەندێک جار سەحیحە، هەندێک جاریش حەسەنە، هەندێک جاریش زەعیفە، وە هەندێک جاریش مەوزوعە) جا سەحیحیش دەکەنە دوو بەش (الصحيح لذاته والصحيح لغيره، حسن لذاته وحسن لغيره) ئینجا زەعیف و مەوزوعیش، فەرمودەی سەحیح ئەو فەرمودەیە کە ئەوانەی فەرمودەکەیان ڕیوایەت کردوە (زەبتیان بەهێز بوبێ یەعنی وەهمیان نەبوبێ حیفزیان بەهێز بوبێ، وە ڕاستگۆ بوبن لە قسەکانیان ئەمانەت پارێز بوبن) دەبێ ئەو دوو مەرجە سەرەکیەی لێ بێتەجێ کەسەکەی ئەو فەرمودەی ڕیوایەت کردوە، وە مەتنەکەشی پێچەوانە نەبێ لەگەڵ دەقی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز یان فەرمودەکانی موتەواتیر و لە خۆی سەحیحتر پێچەوانە نەبێ، ئەوە ئەو کاتە ئەو فەرمودە سەحیحە قبوڵە وەرگیراوە ئەگەر ئاحادیشە، ئینجا ئەو فەرمودەی کە ئاحادە بە درێژی ئێمە ناچینە سەری چونکە بابەتەکەی ئێمە بابەتێکی فەرمودە ناسی یان علوم الحديث نیە مصطلح الحديث نیە بەڵام مەبەستمان ئەوەیە ئایە بزانین لە عەقیدە و بیروبڕوادا ئەو فەرمودانەی ئاحادن کاریان پێ دەکرێ یان نا؟ فەرمودە ئاحادەکان ئەگەر سەحیح بون ئەگەر حەسەن بون بەڵام بەس زەعیف و مەوزوع نەبێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئیش و کاری پێ دەکرێ وەرگیراوە قبوڵە دەبێتە بەڵگە، بەڵام جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە ئەشعەریەکان وە تاقم و کۆمەڵەکانی تریش زۆرجار ڕەتی دەکەنەوە ئیش و کاری پێ ناکەن دەڵێن فەرمودەی ئاحاد لەبەر ئەوەی زەنییە قەتعی نیە ئێمە ئیشی پێ ناکەین و

[١] صحيح البخاري (١) (٥٤) (٢٥٢٩)، صحيح مسلم (١٩٠٧)، سنن أبي داود (٢٢٠١).

عەقیدە گرنگە و موهیمە و نابێ ئیشی پێ بکرێ، بەڵام لە ڕوی جێگیر بونەوە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئاحاد زەنی نیە بەڵکو یەقینیە هەندێک جار یەک کەس فەرمودەیەکی ڕیوایەت کردوە بە قەد پەنجا کەس فەرمودەیەکی موتەواتیر ڕێزی هەیە پلە و پایەی هەیە ڕاستگۆیە ئامانەت پارێزە بۆ نمونە عومەری کوڕی خەتاب کە فەرمودەیەک ڕیوایەت دەکا عومەر خۆ بەقەد پیاوێک نیە ئەگەر تەماشای دەکەی لە ڕوی ڕاستگۆیی لە ڕوی ئامانەت پارێزی لە ڕوی لێوەرگرتن لە ڕوی بەرێزی و سەنگینی لە ئیسلامدا لە تەرازوی ئیسلامدا عومەر زۆر گەورە و مەزنە زۆر بە ئاسان شتی لێ وەردەگیرێ مادەم جێگیر بوبێ عومەر فەرمویەتی عومەر بەسە کە دەفەرموێ، کەواتە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون فەرمودەکانی ئاحاد وەرگیراون مادەم جێگیربێ و سەحیح بێ بۆ عەقیدەش چونکە یەقینیە و زەنی نیە جێگیر بونەکەی ئا ئەوەیە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە، لەبەر ئەوەیە تاقم و کۆمەڵەکانی تر دەیەها سیفەتی الله تعالى هەیە بابەتی عەقیدە هەیە چونکە حەدیسی ئاحاد بەڵگەیە بۆی ڕەتی دەکەنەوە تەئویلی دەکەن قسەی لێ دەکەن بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە بەو فەرمودە ئاحادانە جێگیری دەکەن پشتی پێ دەبەستن بەڵگەی بۆ دەهێننەوە.

**جێگیر کردنی سیفەتی (النزول) لە فەرمودەکاندا:**

فَمِنْ ذَلِكَ: مِثْلُ قَوْلِهِ (ﷺ): «يَنْزِلُ رَبُّنَا إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرِ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ[1]». مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

---

ئینجا دێینە سەر یەکێک لە سیفەتەکانی الله تعالى کە سیفەتی فیعلیە بۆ الله تعالى ابن تيمية جێگیری کردوە بە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش دابەزینی الله تعالى و نزولی الله تعالى یە بۆ ئاسمانی دونیا ابن تيمية دەفەرموێ (فَمِنْ ذَلِكَ) یەعنی بەڵگە لە

[1] **صحيح البخاري** (١١٤٥) (٦٣٢١) (٧٤٩٤)، **صحيح مسلم** (٧٥٨)، **سنن أبي داود** (١٣١٥) (٤٧٣٣).

فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جێگیر کردنی یەک لە سیفەتەکانی الله تعالی کە سیفەتێکی کرداری و فعلیە و دابەزینێتی بۆ ئاسمانی دونیا دەفەرموێ ئەوەیە (مِثْلُ قَوْلِهِ (ﷺ) ) نمونەی فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە فەرموی: «يَنْزِلُ رَبُّنَا إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرِ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ» کەواتە بە کورتی و پوختیەکەی سەرەتا با بیکەینەوە کوردی ئینجا دوایە دەچین هەڵوێستی ئەهلی سونە و جەماعە بۆ ئەو فەرمودە دەردەخەین پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «يَنْزِلُ رَبُّنَا إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا» دادەبەزێ خوای پەروەردگارمان بۆ ئاسمانی دونیا «كُلَّ لَيْلَةٍ» هەموو شەوێک «حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرِ» لەو کاتەی بەشی سێیەمی سێیەکی شەو کۆتاییەکەی دەمێنێ «فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ» کێ داوا و هاوارم لێبکا من وەڵامی دەدەمەوە «مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ» هەریەکێک پرسیارم لێبکا و داوای هەبێ لێم پێی دەبەخشم «مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ» کێ داوای لێبوردنم لێبکا لێی دەبورم.

جا فەرمودەیەکە بەڕاستی دەبێ چاکی لێ وردبینەوە دەستی پێوە بگرین هەموو ڕاز و نیازەکانمان ئیش و کارەکانمان داخوازیەکانمان ئەگەر بکرێ و موسڵمانین بخەینە ئەو کاتە لە الله داوا بکەین بە دڵنیاییەوە وەڵامت دەدرێتەوە پشتت دەگیرێ الله تعالی لێت خۆش دەبێ لەقیس خۆمانی نەدەین.

جا ئەهلی سونە و جەماعە ئەو فەرمودە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی جێگیری دەکەن دەڵێن الله تعالی یەک لە سیفەتەکانی دابەزین و نزولە بۆ ئاسمانی دونیا، ئەو دابەزین و نزولە بە مەعنای حەقیقی و ڕاستیە بەڵام چۆنیەتیەکەی ئێمە نایزانین الله تعالی -جل شئنە- لە خۆی دەوەشێتەوە و بۆخۆی دەزانێ (ولله المثل الأعلى) ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە، وەکو ئەو ئایەتە: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ [الفجر: ٢٢] کە الله تعالی فەرموی ئەو کاتەی الله تعالی دێ و فریشتەکان پۆل پۆلن ڕاوەستاون ڕیز ڕیز، بەو مانایەی کە جاء و مجيء بۆ الله تعالی مانایە حەقیقیەکەی دێ کە ڕونمان کردەوە لە شوێنی خۆیدا نەک

بڵێین ئەمری الله تعالی دێ، جا وەكو ئەو ئایەتەیان تەئویل دەكرد تاقم و كۆمەڵەكانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە ئەو فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) «يَنْزِلُ رَبُّنَا» تەئویلی دەكەن دەیگۆڕن تەحریفی دەكەن جەهمیەكان هەر ڕەتی دەكەنەوە و پەكی دەخەن وە موعتەزیلەكان و فیرقەكانی تر تەنانەت ئەشعەریەكانیش دەڵێن دابەزینی ڕەحمی اللەیە بۆ ئاسمانی دونیا بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە وەڵامیان بەدەستە بۆیان وەڵامێكی ئاسان، دەڵێن باشە ڕەحمی الله تعالی ئەوە نەبێ هەر سێیەكی شەو دابەزێتە ئاسمانی دونیا لە هەموو كاتێك دابەزیوە لەسەر زەوی وە دابەزیوەتە ئاسمانی یەكەم دادەبەزێ بۆ هەموو شوێنەكان، باشە ئەو تایبەتمەندیە چیە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ؟ ئینجا هەندێك دەڵێن جوبڕائیلە دادەبەزێ یان فریشتەیە هەندێك دەڵێن ئەمری خوای رب العالمين ە، ئا ئەوانە هەموو قەید خستنە ناو ئەو فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ)، وە جێگیر نەكردنی ئەو سیفەتەی الله تعالی یە ئەو سیفەتە فعلی و كردارە وە ڕەتكردنەوەیەتی وە تەئویلێكی تەحریفیە گۆڕینێتی لە مەعنایە حەقیقی و تەواوەتیەكەی وە هەڵهاتنە لەبەری، بەڕاستی ڕاست و دروست نیە لەبەر ئەوەی ئەگەر دەڵێن فریشتەیە یان جوبڕائیلە ئێ چۆن دەشێ و دەگونجێ؟ خۆ جوبڕائیل ناڵێ «مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ» هەر بەو بڕگەی ئاخیری فەرمودەكە كێ داوای لێبوردنم لێبكا لێی دەبورم، جوبڕائیل ئەوەی لە دەستدا نیە وە ئەوەش ناگەیەنێ، وە لە پاشان ئەگەر دەڵێی فەرمان و ئەمری الله تعالی یە فەرمان و ئەمری الله تعالی هەموو دەمێ دادەبەزێ و هەموو دەمێ لە توانایدا هەیە لەسەر زەوییە و لە هەموو شوێنەكانە، وە لە پاشان ئەگەر الله تعالی فەرمویەتی وەكو پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) كێ لەبەرم بپاڕێتەوە وەڵامی دەدەمەوە ناشێ و ناگونجێ ئەوە كەسێكی تربێ، وە بەڵگەكانیان زۆر لاوازە قسەكانیان زۆر بێ جێیە ئەوانەی كە دەڵێن دابەزینی الله تعالی نیە هی ڕەحمیەتی یان هی شتێكی ترە ڕەتكراوەیە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون دابەزینێكی ڕاست و دروستی حەقیقیە بڕیار دەدەین بۆ الله تعالی بەبێ ئەوەی چۆنیەتیەكەی بزانین.

جا لێرەوە ئەهلی بیدەع و وە موعتەزیلەکان و ئەوانەی شوێنی ئەوانیش کەوتون و بۆچونیان وەکو ئەوان بوە پرسیاری نابەجێ و داهێنراوی دەهێننەجێ یان دەیکەن دەیوروژێنن، یەک لەوان دەڵێن باشە ئەگەر الله دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ئایە عەرشی بەتاڵ دەکا و بەجێ دێڵێ چونکە ئیستیوای لەسەر عەرشە؟ ئەوە پرسیارێکی عەقڵی بیدەعییە ڕەتکراوەیە نەکردنی ئەولاترە بەڵام ئەگەر هەر دەشکرێ ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئێمە نازانین چونکە چۆنیەتیەکەی دابەزینی الله تعالى بە دڵنیاییەوە و سەدا سەد وەکو هی مەخلوق و بەدیهێنراوەکان نیە، پرسیاری دوەمیشیان ئەوەیە دەڵێن ئایە ئەگەر دابەزییە ئاسمانی یەکەم واتە ئاسمانی دوەم و ئاسمانەکانی تر دەوری الله دەدەن و دەبنە سەقف بۆ الله تعالى (پەنا بە الله)؟ ئێمە دەڵێین هیچ شتێک ئیحاطەی خوای رب العالمین ناکا بەڵگەمان هەیە لەسەر ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە بە ئایەت و بە فەرمودە وە ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە، وە ناشزانین چۆنە چۆنیەتیەکەی تەنها الله دەزانێ -جل شئنە- ئێمە هەر دان بەوەدا دەهێنین دابەزینەکەی دابەزینێکی حەقیقیە سەدا سەدییە، هەروەکو لە زمانی عەرەبیدا نزول چ واتایەکی هەیە یەنزیلوە جا ئەو یەنزیلوە الله تعالى عەرش بەجێ دێڵێ عەرش بەتاڵ دەبێ ئاسمان دەبێتە سەقفی، ئەوانە هەموو سوئالی بێجێ و بیدەعینە و ئێمە هیچی لێ نازانین تەنها دەڵێین الله تعالى دادەبەزێ بۆ ئاسمانی دونیا بە دابەزینێک کە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) دابەزینەکە حەقیقیە و ڕاستیە و مانایەکەی لوغەوی و زمانەوانی لێ دەگیرێ و وەردەگیرێ ئینجا چۆنیەتیەکەشی ڕەت دەکەینەوە ئێمە عیلم و زانستیمان بە چۆنیەتیەکەی نیە عیلم و زانستی بە چۆنیەتیەکەی بڕیار نادەین.

**جێگیر كردنی سیفەتی (الفرح) لە فەرمودەكاندا:**

وَقَوْلُهُ (ﷺ): «لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ التَّائِبِ مِنْ أَحدكُمْ بِرَاحِلَتِه[١]». مُتَّفَق عَلَيْه.

[١] صحيح مسلم (٢٧٤٤)، صحيح البخاري (٦٣٠٨)، سنن الترمذي (٢٤٩٨).

لە پاشان هەر لە قسەکانی خۆی لە (الواسطية) ابن تيمية دەگاتە سەر جێگیر کردنی ئەمجارە سیفەتی فەرەح بۆ الله تعالی، فەرەح بۆ بەندەکان و مەخلوق و بەدیهێنراوەکان لە زمانەوانی و فەرهەنگەکان ئەگەر تەماشای بکەی بە کوردیەکەی یەعنی شادومانی یەعنی کامەرانی یەعنی ئاسودەیی یەعنی بەختەوەریی یەعنی دڵخۆشی ئەو مانایانە هەموی دەگەیەنێ، بەڵام بۆ الله تعالی ئێمە هەر فەرەح دەڵێین وە بە مەعنایە حەقیقی و ڕاستیەکەی بۆ الله تعالی زیاتر شادومانی دەوەشێتەوە شادی ئێمە بڵێین الله شاد دەبێ بەو شتە چونکە دڵخۆشی ئەگەر بێین بیکەینەوە کوردیوە لێوەشاوە نیە بۆ الله تعالی چونکە الله تعالی لە هیچ ئایەتێک لە هیچ حەدیسێک لە هیچ شوێنێک جێگیر نەبوە بۆی کە بڵێی خاوەن دڵە الله تعالی (پەنا بە خوای رب العالمين)، ئەویش وشەی دڵی کە وەگەڵ بخەین ناشیاو دەبێ جا زیاتر شادی بەکار بێنین (والله أعلم) ئەوەی من لێی حاڵیمە و تێ دەگەم لە کوردیەکەی باشتر و ئەولاتر دەبێ یان فەرەحە عەرەبیەکە بڵێین بە مەعنایە حەقیقی و ڕاستیەکەی، کە دەفەرموێ ابن تيمية دەڵێ پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) (وَقَوْلُهُ (ﷺ)): «لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهُ الْمُؤْمِنِ التَّائِبِ مِنْ أَحدكُمْ بِرَاحِلَتِهِ» جا دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) الله تعالی زیاتر شادە و فەرەحە بە تەوبە و گەڕانەوەی بەندەکەی بڕواداری تەوبەکاری لە یەکێکی کە شادومانە دڵخۆشە بە ڕاحیلەکە و گەڕانەوەی ئەسپ و وڵاخەکەی بارەکەی لەسەرە، ئەوەش فەرمودەیەکی دور و درێژە هەموو فەرمودەکە بێنینەوە چاکتر لێی حاڵی دەبین ئەویش ئەو فەرمودەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ أَحدكُمْ» الله تعالی شادترە و وە فەرەحترە بە تەوبە و گەڕانەوەی بەندەکەی لە یەک لە ئێوە «كَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِأَرْضِ فَلَاةٍ» لەسەر پشتی وڵاخەکەی بارێک هەبوبێ لە زەوییەک و بیابان و چۆڵایەتیەک «فَانْفَلَتَتْ مِنْهُ» ئەو وڵاخە لە دەستی دەربچێ و بڕوا «وَعَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ» وە لەسەر پشتی وڵاخەکەی خواردن و خوارنەوە و بارەکەی لەسەربێ هی ئەو کەسە «فَطَلَبَهَا حَتَّى إذا أَئِسَ مِنْهَا» جا بخوازێ و

بەدوایدا بگەڕێ و وڵاخەکەی بۆ نەدۆزرێتەوە هەتا دەست بەرداربێ و بێ ئومێدبێ لێی «نام تحت شَجَرَةً» لەوێ بخەوێ و پاڵ بکەوێ لە ژێر دارێک «فلمَّا رفع رأسَه» یەعنی بخەوێ و پاڵ بکەوێ مەبەستی بۆ چیە؟ لە هەندێک لە ڕیوایەت دەڵێ لینگی لێ ڕادەکێشێ بۆ مردن مەئیوس دەبێ و دەست بەردار دەبێ خواردن و خواردنەوەی نەماوە ناگاتەوە ئاوەدانیەکانیش وا دادەنێ چەند چرکەیەکی تر ماوەیەکی تر بمرێ و ملك الموت لێی میوان بێ و گیانی بکێشێ ئینجا لەو کاتە «فلما رفع رئسه» لەدوای ئەوەی سەری خۆی هەڵبڕی و بڵند کرد چاوی هەڵهێنا بینی «فإذا ناقته عند رأسه» تەماشای کرد وا حوشترەکەی یان وڵاخەکەی لەسەر سەری وەستاوە «فقال من شدة الفرح» ئەوەندە شاد دەبێ ئەوەندە فەرەحنایی بۆ دێ ئەوەندە دڵخۆش دەبێ، چی دەڵێ؟ ئاگای لە خۆی نامێنێ و دەڵێ «اللَّهُمَّ أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّكَ» (پەنا بە الله) ئەی الله تعالی تۆ بەندەی منی و من پەروەردگاری تۆم لە نەزانینە ئاوای بەسەر زماندا دێ بیروبڕوای وا نیە «أَخْطَأَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) هەڵەی کرد لەبەر زۆر شادومان بونی لەبەر زۆر دڵخۆش بونی لەبەر زۆر فەرەح بونی، ئینجا کەواتە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ئەوە چەند شادومانە چەند فەرەحی توش بوە الله تعالی -جل شئنە- لەو کەسە زۆر شادومانترە الله تعالی لەو کەسە زۆر فەرەحترە بە تەوبە و گەڕانەوەی بەندەکانی.

لەو فەرمودەیە ئەوە وەردەگیرێ لەلایەن ئەهلی سونە و جەماعەوە کە ئێمە سیفەتی فەرەح شادی بۆ الله تعالی بڕیار بدەین بە مانایە حەقیقی و ڕاستیەکەی بەبێ تەئویل کردن و تەحریف کردنی بەڵام چۆنیەتیەکەی ئێمە نازانین عیلم و زانستیمان بە چۆنیەتیەکەی نیە وەکو باقی سیفەتەکانی تر هەم دابەزینی الله تعالی بۆ ئاسمانی دونیا وە هەم هاتنی بۆ ڕۆژی مەیدانی حەشر و حیساب و مەجیئی وە باقی سیفەتەکانی تری خەبەری الله تعالی -جل شئنە- (ولله المثل الأعلى) ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

جا كەواتە لەو فەرمودە دوو خاڵی زۆر گرنكی تێدایە پێویستە ئەو فەرمودە جێگای بایەخە زۆر بایەخی پێبدرێ:

یەكەمیان ئەوەیە سیفەتی فەرەح بۆ الله تعالى جێگیر دەكرێ.

دوەمیان پلە و پایەی تەوبە و گەڕانەوە بەندەكان لە تاوان و گوناحەكان لەلای الله تعالى یەكجار گەورەیە پێویستە ئێمە بەندەی گوناحكارین وە شەیتان و هەوا و هەوەس و نەفس وە دونیا هەندێک جار وازمان لێ ناهێنێ گوناحمان پێ دەكا بە زوترین كات گرنگ ئەوەیە بگەڕێینەوە بۆلای الله تعالى هەردەم لە تەوبەكردن و گەڕانەوەدا بین وە بایەخی پێ بدەین.

## جێگیر كردنی سیفەتی (الضحك) لە فەرمودەكاندا:

وَقَوْلُه: (ﷺ): «يَضْحَكُ اللهُ إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحدهُمَا الآخَرَ؛ كِلاهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ[1]». مُتَّفَق عَلَيْه.

---

لە پاشان یەكێكی تر لە سیفەتەكان ابن تيمية كە بەڵگەی بۆ دەهێنێتەوە لە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) سیفەتی ضەحكە واتە پێكەنین، پێكەنین وە ضەحک بۆ الله تعالى ابن تيمية لە ڕێی ئەو فەرمودانەوە جێگیر دەكا بۆ الله تعالى وە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە جێگیرە بە مانایە حەقیقی و ڕاستیەكەی، بەبێ تەئویل و تەحریف كردن بەڵام چۆنیەتیەكەی ئێمە نازانین وە دڵنیاشین لەوەی ئەو سیفەتانەی الله تعالى وەكو هی مەخلوق و بەدیهێنراوەكان نیە چۆنیەتیەكەشی نازانین بەڵام مانایە حەقیقی و ڕاستیەكەی لێ وەردەگرین و جێگیر دەكەین بۆ الله تعالى، كە ابن تيمية دەفەرموێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «يَضْحَكُ اللهُ إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحدهُمَا الآخَرَ؛ كِلاهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ» الله تعالى ضەحكی هەیە و واتە پێ دەكەنێ -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى) بە دوو كەسان بە دوو مرۆڤ و پیاوان كە یەكیان یەكێكی دەكوژێ وە دوایە هەردوكیان دەچنە بەهەشت، ئەوەش دیمەنەكەی وایە وەكو ڕاقەكارانی فەرمودەكە دەفەرمون كەسی موسڵمان و كەسێكی

[1] صحيح البخاري (٢٨٢٦)، صحيح مسلم (١٨٩٠)، سنن النسائي (٣١٦٥) (٣١٦٦).

کافرە، کافرەکە موسڵمانەکە دەکوژێ موسڵمانەکە شەهید حیساب دەبێ و دەچێتە بەهەشت، لەدوایی کافرەکەش موسڵمان دەبێ دوبارە لە مەیدانی جەنگ و جیهاد دەکوژرێ بە موسڵمانیەتیەوە ئینجا ئەویش دەچێتە بەهەشت ئەگەر نەش کوژرێ بە موسڵمانێتی دەمرێ و وەفات دەکا، کەواتە هەردوکیان بەهەشتی دەردەچن.

جا لەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی جێگیر کرد کە الله تعالى خاوەن سیفەتی ضەحکە، ضەحک وەکو گوتمان بۆ مرۆڤەکان بەو مانایە دێ ئەگەر بە شتێک سەریان سوڕ بمێنێ و سەرسام ببن پێکەنین دەیگرێ کەسەکە بەڵام بۆ خوای رب العالمین دڵنیاین وەکو هی مرۆڤەکان نیە، وە هەندێک جاریش هەیە خەڵکانێک بەبێ سەبەب و هۆکار پێدەکەنن ئەو نمونەش هەیە بۆ خەڵک و مرۆڤەکان کاتێک بەبێ سەبەب و هۆکار پێ دەکەنن چی دەڵێن؟ دەڵێن (الضحك بلا سبب من قلة الادب) یەعنی ئینسان هەر لە خۆڕا پێبکەنێ هیچی نەبینیبێ و جێی سەرسامی نەبوبێ ئەوکاتە لە بێ ئەدەبیە و لە کەم ئەدەبیە و لە نەزانینەوەیە یەعنی بە ڕەوشتێکی جوان و بەرز دانانرێ، جا مرۆڤەکان ئەگەر شتێک ببینن هەندێک جار پێکەنین دەیانگرێ وە ضەحک دەیانگرێ بەڵام بۆ الله تعالى ئێمە دەڵێین پێکەنین و ضەحکەکە وەکو هی مرۆڤەکان نیە چۆنیەتیەکەشی ئێمە نازانین عیلمان پێ نیە بەڵام جێگیریشی دەکەین بە مانایە حەقیقی و ڕاستیەکەی بۆ الله تعالى وەکو لەو فەرمودە سەحیحە هاتوە ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

جا بۆ مرۆڤەکان قەدەغەش کراوە زۆر پێکەنین چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ وەکو پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): «إياكم وكثرة الضحك فإن كثرة الضحك تميت القلب[١]» دەفەرموێ ئاگاداربن هۆشیارین لە زۆر پێکەنین چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ، ئینجا خوای رب العالمین یش هانمان دەدا بۆ زۆر گریان نەک زۆر پێکەنین لە ژیانماندا

[١] **مسند أحمد (٨٠٧٦)، سنن ابن ماجه (٤٢١٧)، هەندێک لە فەرمودە ناسان لەوانە شێخ عبد الله بن جبرینیش دەفەرموێ حەسەنە و وەرگیراوە.**

دەفەرموێ: ﴿وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ﴾ [النجم: ٦٠]، وە لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ بە جوبرائیل وەکو مەدحێک بۆی دانراوە دەڵێ جوبرائیل: «ما ضحِك منذ خلق الله النار[١]» جوبرائیل پێ نەکەنیوە لەوەتەی الله تعالی ئاگری بەدی هێناوە، دەبێ مرۆڤەکان ئاوا کەم پێبکەنن وە پێشینان هەبوە هەندێک جار گوتویانە هەتا قودس ڕزگار نەکرێ ئێمە پێناکەنین یان هەتا موسڵمانان سەرنەکەون پێ ناکەنین چونکە پێکەنین لە خۆشی و شادییە موسڵمان ئەگەر وڵات و شوێنێکی داگیر کراوبێ شادومان نابێ وە دڵخۆش نابێ لەبەر ئەوە کەمتر پێ دەکەنێ.

## جێگیر کردنی سیفەتی (العجب) لە فەرمودەکاندا:

وَقَوْلُهُ: «عَجِبَ رَبُّنَا مِنْ قُنُوطِ عِبَادِهِ وَقُرْبِ خَيْرِهِ، يَنْظُرُ إِلَيْكُمْ أَزِلِينَ قَنِطِينَ، فَيَظَلُّ يَضْحَكُ يَعْلَمُ أَنَّ فَرَجَكُمْ قَرِيبٌ[٢]». حديث حَسَن.

---

ئەمجارە ابن تیمیة یەک لە فەرمودەکانی پێغەمبەری (ﷺ) هێناوەتەوە کە فەرمودەیەکی سەحیح و جێگیرە لەلایەن ابن تیمیة و لەلایەن هەندێک زانایانی تری فەرمودەناس، کە سیفەتی عەجەب بۆ الله تعالی بڕیار دەدا کە لە کوردی بۆ مرۆڤەکان عەجەب بە واتای سەرسامی دێ یان واق وڕمان دێ بەڵام بۆ الله تعالی هەر عەجەب بگوترێ باشترە وە ئەولاترە چونکە سەرسامی وشەی سەری تێدایە سەریش بۆ مرۆڤەکان و بۆ مەخلوق و ئەوانەیە، جا الله تعالی سیفەتی عەجەبی هەیە بەوەی کە لەخۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- وە مانایە حەقیقیەکەی ئێمە جێگیر دەکەین وەکو ئەهلی سونە و جەماعە ابن تیمیةش وای هێناوەتەوە بەڵام چۆنیەتیەکەی نازانین (ولله المثل الأعلی)، دەفەرموێ کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (وَقَوْلُهُ: «عَجِبَ رَبُّنَا مِنْ قُنُوطِ عِبَادِهِ وَقُرْبِ خَيْرِهِ، يَنْظُرُ إِلَيْكُمْ أَزِلِينَ قَنِطِينَ،

[١] صفة النار لابن أبي الدنيا، ص: ١٣٦.

[٢] أورده بهذا اللفظ ابن كثير في تفسيره عند تفسير قوله تعالى: أمحسبتم أن تدخلوا الجنة [البقرة: ٢١٤] وأورده بنحوه الإمام عبد الله بن أحمد في السنة برقم (١١٢٠) وضمن حديث طويل عن أبي رزين العقيلي رضي الله عنه. وقد سبق تخريج الجملة الأولى من الحديث وهي قوله: عجب ربنا من قنوط عباده وقرب غيره. ولكن ذكره جميعهم بلفظ: ضحك ربنا.

فَيَظَلُّ يَضْحَكُ يَعْلَمُ أَنَّ فَرَجَكُمْ قَرِيبٌ») لەو فەرمودەدا ابن تیمیة ئەوەی جێگیر كردوە كە فەرمودەی تریش هەن بۆ جێگیر كردنی عەجەبی الله تعالى -جل شئنه- كە ابن تیمیة سیفەتی عەجەبی بە مانایە حەقیقیەكەی بۆ الله تعالى جێگیر كردوە (ﷺ) بەڵام عیلم و زانستی بە چۆنیەتیەكەی ڕەت دەكەینەوە ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن نازانین چۆنیەتیەكەی چۆنە (ولله المثل الأعلى) الله تعالى بۆخۆی دەزانێ، جا سیفەتی عەجەب وەكو ضەحک و وەكو نزول و دابەزین وەكو فەرەح یەكێكە لە سیفەتە فعلیەكان و كرداریەكانی الله تعالى -جل شئنه-، وە فەرمودەیەكی تریش هەیە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی كە الله تعالى عەجەبی هەیە لەو گەنجانەی كە «لَيْسَتْ لَهُ صَبْوَةٌ»[١] ئەو گەنجەی كە شەهوەت و ئارەزوو بازایەتی گەنجایەتی نیە یەعنی بایەخی پێنادا ئەوەشیان هەر ئەوەی پێ جێگیر دەبێ، یان الله تعالى لە قورئانی پیرۆز كە فەرمویەتی: ﴿وَإِن تَعجَب فَعَجَب قَولُهُم﴾ [الرعد: ٥] یان دەفەرموێ: ﴿بَل عَجِبتَ وَيَسخَرُونَ﴾ [الصافات: ١٢] لە هەندێک لە قیرائەتەكان هاتوە: ﴿بَل عَجِبتُ وَيَسخَرُونَ﴾ دەڵێن بەو ئایەتەش جێگیرە بۆ خوای رب العالمین مادەم ئەو قیرائەتەش هەیە و قیرائەتێكی جێگیرە وە ئەهلی سونە و جەماعە بڕوایان بەو قیرائەتەش هەیە كە ئەوە دەگەیەنێ الله تعالى فەرمویەتی: ﴿بَل عَجِبتُ وَيَسخَرُونَ﴾ جا من عەجەب گرتوو دەبم لەوەی كە ئەوان ئیستیهزا و گەمە و گاڵتە و گەپ دەكەن بە ئایەتەكانی خوای رب العالمین بڕوایان پێ نیە كافر و موشریكەكان یانی جێگای ئەوەیە كە بڕوای پێ بێنن.

جا ئەو فەرمودە كەواتە ئەوەی پێ جێگیر دەبێ كە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) الله تعالى عەجیب دەیگرێ بە مەعنای عەجەبی هەیە -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى) لە دەست بەرداربون و لە قنوط، قنوط بە مانای چی دێ؟ یەئس و دەستبەرداربون و بێ ئومێدییە، لە یەئس و دەست بەرداربونی بەندەكانی كاتێک بێ ئومێد دەبن لە ڕەحم و بەزەیی خوای رب

[١] مسند أحمد (١٧٣٧١).

العالمين وە لە نزیک بونەوەی غیرەکانیان «ينظرُ إليكم أَزِلِينَ قَنِطِينَ» الله تعالى تێتان دەڕوانێ و تەماشاتان دەکا ئێوە خۆتان نزم دەکەنەوە دەست بەردار دەبن بێ تاقەت دەبن «فَيَظَلُّ يضحكُ يعلمُ أن فرجَكم قريب» یەعنی لەو کاتەی مەبەستی پێ ئەوەیە کە یەک بەڵا و موسیبەتێکی بەسەردێ شتێکی بەسەردێ تەنگانەیەکی بەسەردێ دەست لەخۆی بەردەداتەوە بێ ئومێد دەبێ ئینجا خوای رب العالمین واتان دەبینێ و تەماشاتان دەکا عەجەبی دەبێ لەوەی ئینجا الله تعالى پێ دەکەنێ چونکە دەزانێ فەرەج و دەرگە بونەوە لێتان زۆر نزیکە نابێ ئەوها دەست بەرداری خۆتانبن، جا لەو فەرمودە کەواتە دوو سیفەتی الله تعالى ی فیعلی جێگیرە یەکیان عەجەب یەکیشیان ضەحک و پێکەنین بەوەی لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه-.

## جێگیر کردنی سیفەتی (الرجل) لە فەرمودەکاندا:

وَقَوْلُهُ (ﷺ): «لا تَزَالُ جَهَنَّمُ يُلْقَى فِيهَا وَهِيَ تَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا رِجْلَهُ [وَفِي رِوَايَةٍ: عَلَيْهَا قَدَمَهُ] فَيَنْزَوِي بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، فَتَقُولُ: قَطْ قَطْ[١]». مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

وە لە پاشان لە فەرمودەیەکی تر ابن تیمیة هێناویەتیەوە بە بەڵگە بۆ جێگیر کردنی سیفەتی ڕیجل و قەدەم بۆ الله تعالى -جل شئنه- کە ڕیجل و قەدەم بۆ مرۆڤەکان بە مانای پێ و قاچ دێ، جا بۆ خوای رب العالمین یش کە ابن تیمیة بەوەی لە الله دەوەشێتەوە بەو فەرمودە کە ئێستا دەیخوێنینەوە تۆماری کردوە لە (الواسطية) و جێگیری کردوە ئەوەش عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە کە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «لا تَزَالُ جَهَنَّمُ يُلْقَى فِيهَا وَهِيَ تَقُولُ» بەردەوام ئاگری دۆزەخ خەڵکی هەڵدەدرێتە ناو ئەویش دەڵێ «هَلْ مِنْ مَزِيدٍ» نیە زیاتر بێتە ناوم (پەنا بە خوای رب العالمین) «حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا رِجْلَهُ» هەتا الله تعالى ی خاوەن عیزەت ڕیجلی خۆی واتە ئەگەر بیکەینەوە کوردی قاچی خۆی خوای رب العالمین بەوەی کە لە الله دەوەشێتەوە و چۆنیەتیەکەی ئێمە نازانین یان لە ڕیوایەتێکی تر گوتویەتی

[١] صحيح البخاري (٦٦٦١) (٤٨٤٨) (٧٣٨٤)، صحيح مسلم (٢٨٤٨)، سنن الترمذي (٣٢٧٢).

«عَلَيْهَا قَدَمَهُ» هەتا الله تعالى قەدەم بە مانای پێی دێ ئینجا (ولله المثل الأعلى) بەوەی لە الله دەوەشێتەوە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین هەتا ئەوەی دەخاتە ناو دۆزەخ و جەهەننەم «فَيَنْزَوِي بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ» بۆ یەک دێتەوە ئاگری دۆزەخ هەندێکی بۆ هەندێکی و دێتەوە باریەک «فَتَقُولُ: قَطْ قَطْ» بەس بەس الله تعالى بە مەعنای ئەوەی ئاوا الله تعالى ئاگری دۆزەخ بێدەنگ دەکا لەوەی کە بڵێ زیاترم بۆ بێ پڕ دەبێتەوە.

ئەوەش ئەو فەرمودە ئەوەی پێ جێگیر دەبێ کە ابن تيمية بۆ ئەوە بە بەڵگە هێناویەتیەوە کە الله تعالى خاوەنی سیفەتی ڕیجل و قەدەمە وەکو لەو فەرمودە سەحیحەی پێغەمبەر هاتوە (ﷺ) بەوەی لە الله دەوەشێتەوە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین بەڵام جێگیری دەکەین بە مانا و واتایە حەقیقیەکەی تەئویل و تەحریفی ناکەین وە دەڵێین الله تعالى خاوەنی ئەو سیفەتەیە بەڵام چۆنیەتیەکەی علمان پێی نیە و شارەزا نین و نایزانین.

یان لە فەرمودەیەکی تر کە ئەبو سەعیدی خودری فەرمودەیەکی دور و درێژە ڕیوایەتی کردوە و ئیمامی بوخاری دەریخستوە و دەری هێناوە کە دەفەرمویێ: «أنا ربكم، فيقولون: لست ربنا فيكشف عن ساقه أو عن ساق، فإذا رآه المؤمنون خروا سجدا[1]» الله تعالى دەفەرموێ من پەروەردگارتانم لە مەیدانی حەشر و حیسابدا جا ئەوانیش دەڵێن تۆ پەروەردگارمان نی یەعنی نازانن و نایناسنەوە یان هەندێک لە بڕوادارەکان ئینجا الله تعالى ساقی خۆی ئاشکرا دەکا بۆیان، جا ساق بە قاچ دێ بەڵام بەوەی کە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنە- چۆنیەتیەکەی ئێمە ئێمە نایزانین، ئەو کاتەی کە ئەوە ئاشکرا دەکا هەمویان دەکەونە کڕنۆش و سوجدە دەزانن الله تعالى یە -جل شئنە- ئەوەشیان فەرمودەیە و هاتوە و ئەوەی پێ جێگیربوە و ئەهلی سونە و جەماعە وا دەفەرمون.

کەواتە ڕیجل بۆ الله تعالى سیفەتێکی زاتیە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون لەگەڵ قەدەم وە جێگیرە ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە یەکێک ئەگەر ئەوەی جێگیر کرد دەبێتە

[1] **صحيح مسلم** (١٨٣) (٢٧) (١٨٢)، **صحيح البخاري** (٢٢) (٨٠٦) (٤٥٨١)، **سنن الترمذي** (٢٥٥٥) (٢٥٩٨).

موجەسیمە، ئێمە دەزانین هی الله تعالی وەکو هی مەخلوق و بەدیهێنراوەکان نیە وە چۆنیەتیەکەشی علمان پێ نیە بەڵام چونکە لە فەرمودەی سەحیح هاتوە (مُتَّفَق عَلَيْهِ)ە باسی ڕیجل و قەدەمی تێدایە، ئێمەش دەبێ دانی پێدا بێنین و وە بڵێین هەیە بە مانایە حەقیقیەکەی بەس چۆنیەتیەکەی نازانین ئەوە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

ئەوانی تر تەئویلی دەکەن هەندێک دەڵێن کاکە ڕیجل بە مەعنای ئەوەیە هی (حملة العرش)ی لە مەلائیکەتەکانە هەندێک دەڵێن بە مانای خەڵکێکی ترە الله تعالی دروستی دەکا دەیهاوێتە ناو ئاگری دۆزەخ و جەهەننەم ئا ئەوانە هەمویان بە تەئویل دادەنرێن و تەواو نیە.

جا لە فەرمودەیەکی تری سەحیحیشدا هاتوە کە ئاگری دۆزەخ و جەهەنەم و بەهەشت یەکتر دەدوێنن و گفتوگۆ لەگەڵ یەک دەکەن دەڵێ «احْتَجَّتِ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ» واتە کەوتنە موناقەشە و گفتوگۆ و بەڵگە بۆیەک هێنانەوە بەهەشت و دۆزەخ «فَقَالَتِ الْجَنَّةُ» بەهەشت گوتی «مَا لِي لَا يَدْخُلُنِي إِلَّا ضُّعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ؟» بۆچی ئیلا خەڵکە هەژارەکان و لاوازەکان و کەوتوەکان دێنە ناو من؟ «وَقَالَتِ النَّارُ: في الْجَبَّارُونَ وَالْمُتَكَبِّرُونَ؟» ئاگری دۆزەخیش گوتی ئەوانەی لەناو مندان و خسترانە ناو من خەڵکی خۆ بە زلزان بون خەڵکی دەسەڵاتدار بون «فَقَالَ الله تعالی لِلْجَنَّةِ» جا الله تعالی دەفەرموێتە بەهەشت «أَنْتِ رَحْمَتِي، أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أشاء» تۆ ڕەحم و بەزەیی منی من ئەو ڕەحم و بەزەییە بە کەسانێک دەبەم کە دەمهەوێ کە ویستم لەگەڵیەتی «وقَالَ لِلنَّارِ: أَنْتِ عَذَابِي، أعذب بِكِ مَنْ أَشَاءُ» تۆش عەزابی منی ئەی ئاگری دۆزەخ هەر کەسێک ویستم لەگەڵیدا هەبێ عەزابی دەدەم بە تۆ «وَلِكُلِّ مِنْكُمَا علي مِلْؤُهَا» هەریەک لە ئێوەش لەسەرمە من پڕی بکەمەوە، لە پاشان لە تەواوکردنی فەرمودەکە وا گوتراوە «فأما الجنة فلا يزال فيها فضل» یەعنی بەهەشت بە بەردەوام هەر بەشێک لە بۆشایی تێدا دەمێنێتەوە «فينشِئُ الله لها خلقا فيسكنهم إياها بلا عمل» الله تعالی هەندێک لە بەدیهێنراوەکان بەدی دەهێنێ بەبێ کردەوە دەیانبا بۆ بەهەشت

بەهەشتیان پێ پڕ دەكاتەوە «وأما النار فيبقى فيها فضل» وە ئاگریش بۆشایی تێدا دەمێنێ «فيضع فيها رجله أو قدمه فينزوي بعضها إلى بعض[١]» جا الله تعالى قاچی خۆی پێی خۆی بەوەی لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنه- ڕیجل و قەدەمی خۆی دەكاتە ناو جەهەنەم بۆ یەكی دەهێنێتەوە ئینجا جەهەنەم دەڵێ بەسە بەسە ئەی الله تعالى.

ئەوە كەواتە ئەوانە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن بۆ جێگیر كردنی ڕیجل و قەدەم بۆ الله تعالى وەكو ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون وە ابن تیمیةش وایگوتوە و وای هێناوەتەوە لە (الواسطية) بەوەی كە لە الله دەوەشێتەوە و چۆنیەتیەكەی ئێمە نازانین.

**جێگیر كردنی سیفەتی (النداء) لە فەرمودەكاندا:**

وَقَوْلُهُ: «يَقُولُ تَعَالَى: يَا آدَمُ فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ. فَيُنَادِي بِصَوتٍ: إِنَّ اللهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُخْرِجَ مِن ذُرِّيَّتِكَ بَعْثًا إِلَى النَّارِ[٢]». مُتَّفق عَلَيْهِ. وَقَوْلُهُ: «مَا مِنكُمْ مِنْ أَحد إِلاَّ سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ[٣]».

---

لە پاشان گەیشتینە سەر ئەوە ابن تیمیة لە (الواسطية)كەیدا فەرمودەیەكی تر دەهێنێتەوە كە الله تعالى فەرمویەتی و قودسیە ئەویشیان جێگیر كردنی بانگ كردنی الله تعالى یە نیداء بۆ ئەوەی كەلامی الله تعالى ی پێ جێگیربێ، نیدائیش گوتمان لە دور بە دوورییە وە موناجات لە زۆر نزیكیە بەڵام هەردوكیان دواندن و قسە كردنە، وە جێگیر كردنی سەوت و دەنگیش بۆ الله تعالى بەوەی لە الله دەوەشێتەوە چۆنیەتیەكەی ئێمە نازانین ابن تیمیة لە (الواسطية) تۆماری كردوە دەڵێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «يَقُولُ تَعَالَى: يَا آدَمُ» الله تعالى دەفەرموێ ئەی ئادەم «فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ» ئەویش دەڵێ فیدات بم لە خزمەتدام ئەو وشە بۆ ئەوە بەكاردێ واتە لە ئامادە باشیدام بۆ جێبەجێكردنی هەموو شتەكان یان بە قوربانت بین خوایە «فَيُنَادِي بِصَوتٍ» جا الله بانگی لێدەكا بە دەنگ «إِنَّ اللهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُخْرِجَ

[١] صحيح مسلم (٢٨٤٦)، صحيح البخاري (٤٨٤٩) (٤٨٥٠) (٧٤٤٩)، سنن الترمذي (٢٥٥٧) (٢٥٦١).
[٢] صحيح البخاري (٤٧٤١) (٣٣٤٨) (٦٥٣٠)، صحيح مسلم (٢٢٢)، مسند أحمد (١١٢٨٤).
[٣] صحيح البخاري (٧٤٤٣) (١٤١٣) (٣٥٩٥)، صحيح مسلم (١٠١٦)، سنن الترمذي (٢٤١٥).

مِن ذُرِّيَّتِكَ بَعْثًا إِلَى النَّارِ» دەڵێ بەڕاستی خوای تۆ ئەی ئادەم فەرمانت پێدەکا هەندێک وە بە شێک لە ناوەکانت هەڵدەیە ناو ئاگر و دیارییان بکەی بۆ ناو ئاگر.

جا «بِصَوتٍ» ئەوە دەگەیەنێ کە الله تعالی لە کەلام و بانگ کردنەکانی بۆ مرۆڤەکان و بۆ هەرکەسێک دەنگی هەیە -جل شئنە- بەوەی لەخۆی دەوەشێتەوە چۆنیەتیەکەی ئێمە نازانین.

وە هەر لە فەرمودەیەکی تر ابن تیمیة هەر لێرە هێناویەتیەوە دوبارە ئەوەی پێ دەسەلمێنێ دەڵێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحد إلاَّ سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تَرْجُمَان» هیچێکتان نیە هیچ کەسێکتان نیە ئیلا خوای پەروەردگاری دەیدوێنێ و قسەی لەگەڵ دەکا لەنێوان الله تعالی و ئەو کەسە هیچ تەرجومان و کەسێک نیە هیچ واسیتە و نێوانێک نیە یانی ڕاستەوخۆ الله تعالی دەیدوێنێ و قسەی لەگەڵ دەکا.

جا ئەوانە هەردوکیان ئەو فەرمودانە ئەوە دەسەلمێنن کە الله تعالی خاوەن سیفەتی کەلامە هەروەکو لە ئایەتەکە سەلماندمان و ابن تیمیة ئایەتی بۆ هێنایەوە لێرەش ئەو فەرمودانەی بۆ دەهێنێتەوە، الله تعالی خاوەن سیفەتی کەلامە وە کەلامی الله تعالی حەقیقیە وەکو ئەشعەریەکان دەڵێن نەفسیە یان وەکو خەڵکانێکی تر کە هەر دانی پێدا ناهێنن یان کولابیەکان و ئەشعەریەکان لەوە لێک نزیکن دەڵێن نەفسیە وە تەعبیرەکەی لەسەر مەخلوقێکە و لە ڕێگای مەخلوقێکە سەوت و حەرفی بۆ نیە، ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن وا نیە کەلامی الله تعالی حەقیقیە ڕاستە سەدا سەدییە وە لەخۆی دەوەشێتەوە سیفەتێکی زاتیە هەم فعلیشە هەردەمای و لە هەرکاتێک و لە هەر شوێنێک الله تعالی بیەوێ دەتوانێ بدوێ قسان بکا سەوت و حەرفیشی هەیە ئەو سەوت و حەرفانە بەوەی کە لە الله دەوەشێتەوە -جل شئنە-.

ئینجا ئەو بڕگەش کە دەڵێ «يَقُولُ تَعَالَى: يَا آدَمُ» هەر جێگیر کردنی کەلامی پێ دەکرێ «يَقُولُ» قەول لەچیە؟ لە قسە کردنە کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) «يَقُولُ تَعَالَى» الله تعالی

دەفەرموێ، فەرمودە یەعنی چی؟ یەعنی قسە کەواتە الله تعالی قسەی هەیە -جل شئنە- کەلامی هەیە بەوەی لە خۆی دەوەشێتەوە وە «فَيُنَادِي بِصَوتٍ» ئەوەش شاهێد و بەڵگەیەکی تر گوتمان، کەواتە وتە و قسەی الله تعالی دەنگیشی هەیە بەوەی کە لە خۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە-.

لە پاشان دەڵێ هیچ کەسێک نیە لە ئێوە ئیلا الله تعالی دەیدوێنێ و قسەی لەگەڵ دەکا بەبێ ئەوەی تەرجومانیان لە نێواندا هەبێ، ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کە الله تعالی -جل شئنە- سیفەتی کەلامی هەیە و قسەی هەیە بەوەی لە خۆی دەوەشێتەوە وە قسەکانی حەقیقیە و ڕاستە و سەدا سەدییە وە سەوت و حەرفیشی هەیە بەوەی لە الله دەوەشێتەوە.

**جێگیر کردنی (العلو والفوقية) لە فەرمودەکاندا:**

وَقَوْلُهُ فِي رُقْيَةِ الْمَرِيضِ: «رَبَّنَا اللهَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ، تَقَدَّسَ اسْمُكَ، أَمْرُكَ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، كَمَا رَحْمَتُكَ فِي السَّمَاءِ اجْعَلْ رَحْمَتَكَ فِي الأَرْضِ، اغْفِرْ لَنَا حُوبَنَا وَخَطَايَانَا، أَنْتَ رَبُّ الطَّيِّبِينَ، أَنْزِلْ رَحْمَةً مِنْ رَحْمَتِكَ، وَشِفَاءً مِنْ شِفَائِكَ عَلَى هَذَا الْوَجَعِ؛ فَيَبْرَأَ[١]». حديث حسَن، رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَغيرُهُ، وَقَوْلُهُ: «أَلاَ تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ[٢]». حديث صَحيح، وَقَوْلُهُ: «وَالْعَرْشُ فَوْقَ الْمَاءِ، وَاللهُ فَوْقَ الْعَرْشِ، وَهُوَ يَعْلَمُ مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ[٣]». حديث حسَن، رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَغَيْرُهُ، وَقَوْلُهُ لِلْجَارِيَةِ: «أَيْنَ اللهُ؟ قَالَتْ: فِي السَّمَاءِ. قَالَ: مَنْ أَنَا؟ قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللهِ. قَالَ: أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ[٤]». رَوَاهُ مُسْلِم.

---

[١] سنن أبي داود (٣٨٩٢)، حكم الحديث: ضعيف.

[٢] صحيح البخاري (٤٣٥١)، صحيح مسلم (١٠٦٤).

[٣] أخرجه ابن خزيمة في كتاب التوحيد برقم (١٤٩) و (١٥٠) و (٥٩٤) واللفظ له، والبيهقي في الأسماء والصفات رقم (٨٥١)، وأبو الشيخ في العظمة رقم (٢٧٩)، واللالكائي في شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة (٣ / ٣٩٦). والدارمي في الرد على الجهمية ص ٢٦، ٢٧. وفي الرد على المريسي ص ٧٣، ٩٠، ١٠٥. والطبراني في الكبير (٨٩٨٧). عن عاصم بن أبي النجود عن أبي وائل الأسدي عن عبد الله بن مسعود. وصححه الذهبي في العلو كما في مختصره ص ١٠٣، وابن القيم في اجتماع الجيوش ص ١٠٠.

[٤] صحيح مسلم (٥٣٧)، سنن أبي داود (٩٣٠) (٩٣١) (٣٢٨٢)، سنن النسائي (١٢١٨).

لە پاشان ابن تيمية هات و گەیشتە سەر ئەوەی ئەمجارە سیفەتی علو و فەوقیەت بۆ الله تعالی ئەوانە تەبیعەت لە ئایەتەکان جێگیر بوو بوو بەڵام ئەمجارە ابن تيمية چی دەکا؟ چەندین فەرمودەی هێناوەتەوە بە حەدیسیش جێگیریان دەکا لەبەر ئەوە بە درێژی لەسەر کەلامیش نەڕۆیشتین لەوێ زیاتر قسەمان لێکرد و لێرەش بە بیرمان هێنانەوە جا سیفەتی علو و فەوقیەتیش هەر وایە تەنها فەرمودەکە دەخوێنینەوە بە کورتی.

ئەمجارە دەڵێ پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): «فِي رُقْيَةِ الْمَرِيضِ» دەربارەی دۆعا گۆیی و خوێندنی ڕوقیە بۆ نەخۆش «رَبَّنَا اللهَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ» پەروەردگارەکەمان ئەوەی لە ئاسمانە «تَقَدَّسَ اسْمُكَ» واتە پیرۆز بوە و پیرۆزە ناوەکەت «أَمْرُكَ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ» فەرمانەکانت لە ئاسمان و لە زەوییە «كَمَا رَحْمَتُكَ فِي السَّمَاءِ» هەروەک و ڕەحم و بەزەیت لە ئاسمانە «اجْعَلْ رَحْمَتَكَ فِي الأَرْضِ» ڕەحم و بەزەییەکەت بخە زەویش «اغْفِرْ لَنَا حُوبَنَا وَخَطَايَانَا» لە گوناحە گەورە و بچوکەکانمان خۆشبە هەندێک لە زانایان دەفەرمون (حُوب) بە مانای گوناحی (والله أعلم) گەورە دێ (وَخَطَايَا) بە مانای گوناحی بچوک دێ مادەم پێکەوە هاتون لێرە فەرق و جیاوازییان ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) تەنها نەیگوتوە (خَطَايَانَا) (حُوب)ی لەگەڵ بەکار هێناوە واتە ببورە لە گوناحە گەورە و بچوکەکانماز «أَنْتَ رَبُّ الطَّيِّبِينَ» تۆ پەروەردگاری باش و بۆنخۆش و پاک و خاوێنەکانی «أَنْزِلْ رَحْمَةً مِنْ رَحْمَتِكَ» دابەزێنە بەزەیی و ڕەحمەتێک لە ڕەحم و بەزەیی خۆت «وَشِفَاءً مِنْ شِفَائِكَ عَلَى هَذَا الْوَجَعِ» وە لە چاک بونەوە و شیفایەک لەسەر ئەو ئێش و ژانە «فَيَبْرَأَ» جا لە فەرمودەکە هەندێک ڕیوایەت هاتوە دەڵێ چاک بوەوە کەسەکە و چاک دەبێتەوە ئەگەر ئەو دۆعا و ڕوقیەی بۆ بخوێندرێ.

کەواتە ئەو فەرمودە چی تێدابوو هەتا ئێرە؟ بەڵگەی ئەوەی تێدابوو دەفەرموێ خوای ئێمە لە ئاسمانە (فِي السَّمَاءِ)یش گوتمان دایم فیەکە بە عەلا لێکدەنەوە بۆ الله تعالی یانی لە سەروی ئاسمانەکانە هەروەکو لە قورئانیش: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَاءِ﴾ [الملك: ١٦] یانی

(على ٱلسَّمَاءِ أو على ٱلسَّمَاوات) واتە خوای سەرووی ئاسمانەکان نەک لەناو ئاسمانە و ئاسمان دەوری اللهی دابێ پەنا بە خوای رب العالمين ئەوە وا نیە و فیەکان بە مانای عەلا دێ لەو فەرمودە و لە ئایەتەکەی گوتیشمان.

(وَقَوْلُهُ) وە لە فەرمودەیەکی تری پێغەمبەریش (ﷺ) سیفەتی علو و فەوقیەتی پێ جێگیر دەبێ ابن تیمیة هێناویەتیەوە دەڵێ پێغەمبەر فەرموی: «أَلاَ تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ» ئایە ئێوە من بە ئەمین نازانن و قسەم لێ وەرناگرن چونکە من ئەمینی ئەو زاتەم کە لە ئاسمانە واتە لە سەرووی ئاسمانەکانە (ولله المثل الأعلى) ئەوە سیفەتی علو و فەوقیەت لەو فەرمودە جێگیر کرا بۆ الله تعالى.

(وَقَوْلُهُ) وە فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) ئەوەشی بە بەڵگە هێناوەتەوە ابن تیمیة بۆ جێگیر کردنی علو و فەوقیەتی الله تعالى ئەو دوو سیفەتانەی الله تعالى (ولله المثل الأعلى) دەڵێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «الْعَرْشُ فَوْقَ الْمَاءِ» عەرشی الله تعالى لەسەر ئاوە «وَاللهُ فَوْقَ الْعَرْشِ» الله تعالى لەسەر عەرشە «وَهُوَ يَعْلَمُ مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ» الله تعالى عیلم و زانیاری هەیە بەوەی ئێوە لەسەرین و دەیکەن، ئیمامی دارمیش ئەم حەدیسەی هێناوەتەوە وەکو وەڵامێک و ڕەدانەوەیەک لەسەر جەهمیەکان کە دەڵێ جێگیرە کە الله تعالى بە گوێرەی ئەو فەرمودە لەسەر عەرشە -جل شئنه- پێغەمبەر هەر فەوقی بەکار هێناوە کەواتە ئیستیوا بە گوێرەی ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) بە مانای فەوقە یانی لەسەرە (علا وارتفع)یە.

وە فەرمودەیەکی تریشی هێناوەتەوە ابن تیمیة -رحمه الله- بۆ جێگیر کردنی سیفەتی علوایەتی و فەوقایەتی بۆ الله تعالى ئەویش ئەو فەرمودەی جاریەیە مەشهور و بەناو بانگە کە پێغەمبەر (ﷺ) گوتیە جاریەکە: «أَيْنَ اللهُ؟» هەتا بۆی دیارکەوێ ئایە ئەو جاریەیە (جاریە یانی کەنیزە ئەوانەی دەکڕان و دەفرۆشران) ئایە ئەو کەنیزەیە موسڵمان و بڕوادارە تا ڕزگاری بکرێ و وەبەر کەفارەتەکەی بخسترێ یانە نا؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «أَيْنَ

اللهُ؟» الله لەکوێیە ئەی جاریە ئەی کەنیزە؟ «قَالَتْ: فِي السَّمَاءِ» ئەویش گوتی لە ئاسمانە فی بە مەعنای عەلایە چونکە لەلای عەرەبەکان فی بە مەعنای عەلاش دەهات «قَالَ: مَنْ أَنَا؟» گوتی من کێم؟ «قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللهِ» گوتی تۆش ڕەوانەکراو و پێغەمبەری اللهی (ﷺ) «قَالَ: أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ» جا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئازادیکە ئەوە ئیماندارە و بڕوادارە ئەو کەنیزە و جاریەیە، کەواتە گوتی الله لە ئاسمانە.

لێرە وەڵامی زۆر لەجێ هەیە لەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ)، باشە ئەگەر دەڵێن الله تعالی لە هەموو شوێنێکە ئەو تاقم و کۆمەڵانە یان ناگونجێ بڵێین الله لەکوێیە ئەی چۆن پێغەمبەر ئەو پرسیارەی کرد (ﷺ) ؟ (أَيْنَ) لە زمانی عەرەبیدا بۆ شوێنە، ئەی چۆن پێغەمبەر (ﷺ) پرسیار دەکا لە جاریەکە الله لەکوێیە؟ (أَيْنَ) یانی لەکوێیە بۆ شوێنە، کەواتە ئینجا چۆن جاریەکە دەڵێ «فِي السَّمَاءِ» بە مەعنای (على السَّمَاءِ) لە سەروی ئاسمانەکانە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ ئەوە بڕوادارە ڕزگاریکەن ئازادیکەن، کەواتە ئەوەش سەلماندنی ئەوەی تێدایە کە الله تعالی لە سەروی ئاسمانەکانە سیفەتی علو و فەوقیەتی هەیە ئیستیوای کردوە لەسەر عەرش بە مەعنای (علا وارتفع) بە مەعنایە حەقیقیەکەی لوغەوی بۆی جێگیر دەکرێ بەڵام چۆنیەتیەکەی ئێمە نازانین بەوەیە کە لە الله تعالی دەوەشێتەوە، وە ئایەتیشمان زۆر هێنانەوە لە ڕابردودا و بە چاکی و بە درێژی باسی ئەوەمان کرد لەو شوێنەی کە ابن تيمية ئایەتی هێنابۆوە بۆ جێگیر کردنی علو و فەوقیەتی الله تعالی -جل شئنه- لەوانە ئایەتەکانی سورەتی الملك: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَاءِ﴾ یان: ﴿أَمْ أَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَاءِ﴾ کە گوتمان فی بە مەعنای عەلا دێ لەو شوێنانە.

## جێگیر كردنی سیفەتی (المعية) لە فەرموودەكاندا:

وَقَوْلُهُ: «أَفْضَلُ الإِيمَانِ أَنْ تَعْلَمَ أَنَّ اللهَ مَعَكَ حَيْثُمَا كُنْتَ[١]». حديث حَسَن، وَقَوْلُهُ: «إِذَا قَامَ أَحدكُمْ إِلَى الصَّلاة؛ فَلاَ يَبْصُقَنَّ قِبَلَ وَجْهِه، وَلاَ عَنْ يَمِينِه؛ فَإِنَّ اللهَ قِبَلَ وَجْهِه، وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِه، أَوْ تَحْتَ قَدَمِه[٢]». مُتَّفَق عَلَيْه، وَقَوْلُه -(ﷺ)-: «اللهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَالأَرْضِ وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيم، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، مُنْزِلَ التَّوْرَاة وَالإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ أَنْتَ آخِذ بِنَاصِيَتِهَا، أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْء، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيء، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْء، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْء؛ اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ[٣]». رِوَايَةُ مُسْلِم، وَقَوْلُه -(ﷺ)- لَمَّا رَفَعَ الصَّحَابَةُ أَصْوَاتَهُمْ بِالذِّكْرِ: «أَيُّهَا النَّاسُ! أَرْبِعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ؛ فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا، إِنَّمَا تَدْعُونَ سَمِيعًا بَصِيرًا قَرِيبًا. إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ أَقْرَبُ إِلَى أَحدكُمْ مِنْ عُنُقِ رَاحِلَتِه[٤]». مُتَّفَق عَلَيْه.

## جێگیر كردنی بینینی الله تعالی لەلایەن بڕواداران لە قیامەتدا لە فەرموودەكاندا:

قَوْلُهُ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْر، لاَ تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِه، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَّ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَصَلاةٍ قَبْلَ غُرُوبِهَا؛ فَافْعَلُوا[٥]». مُتَّفَق عَلَيْه.

---

[١] أخرجه الطبراني كما في مجمع البحرين برقم (٤٧)، وأبو نعيم في الحلية (٦ / ١٢٤) وقال الهيثمي في المجمع (١ / ٦٥): رواه الطبراني في الأوسط والكبير وقال: تفرد به عثمان بن كثير ولم أر من ذكره بثقة ولا جرح. وهو في ضعيف الجامع رقم (١٠٠٢).

[٢] صحيح مسلم (٣٠٠٦)، سنن ابن ماجه (٢٤١٩)، سنن الدارمي (٢٦٣٠).

[٣] صحيح مسلم (٢٧١٣)، سنن أبي داود (٥٠٥١)، سنن الترمذي (٣٤٠٠).

[٤] أخرجه البخاري برقم (٦٦١٠) في القدر، باب: لا حول ولا قوة إلا بالله . ومسلم برقم (٢٧٠٤) في الذكر والدعاء، باب: استحباب خفض الصوت بالذكر. عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه.

[٥] صحيح البخاري (٥٥٤) (٥٧٣) (٤٨٥١)، صحيح مسلم (٦٣٣)، سنن أبي داود (٤٧٢٩).

**مەوقیفی ئەهلی سونە و جەماعە لەسەر ئەو فەرمودانەی تێیدا ئیثباتی سیفات کراوە بۆ الله تعالی:**

إلَى أَمْثَالِ هَذِهِ الأَحَادِيثِ الَّتِي يُخْبِرُ فِيهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَن رَّبِه بِمَا يُخْبِرُ بِهِ؛ فَإِنَّ الْفِرْقَةَ النَّاجِيَةَ أَهْلَ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ يُؤْمِنُونَ بِذَلِكَ؛ كَمَا يُؤْمِنُونَ بِمَا أَخْبَرَ اللهُ بِهِ فِي كِتَابِهِ؛ مِنْ غَيْرِ تَحْرِيفٍ وَلا تَعْطِيلٍ، وَمِنْ غَيْرِ تَكْيِيفٍ وَلاَ تَمْثِيلٍ.

**ئەم ئومەتە ناوەڕاستە لە نێوان ئومەتاندا:**

بَلْ هُمُ الْوَسَطُ فِي فِرَقِ الأُمَّةِ؛ كَمَا أَنَّ الأُمَّةَ هِيَ الْوَسَطُ فِي الأُمَمِ.

**نێوەندی ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی سیفات لە نێوان جەهمی و موشەبیهەکان:**

فَهُمْ وَسَط فِي بَابِ صِفَاتِ اللهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بَيْنَ أَهْلِ التَّعْطِيلِ الْجَهْمِيَّة، وَأَهْلِ التَّمْثِيلِ الْمُشَبِّهَة.

**نێوەندی ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی کردارەکانی الله لە نێوان جەبری و قەدەریەکان:**

وَهُمْ وَسَط فِي بَابِ أَفْعَالِ اللهِ بَيْنَ الْجَبْرِيَّةِ وَالْقَدَرِيَّة.

**نێوەندی ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی وەعیدی الله لە نێوان مورجیئە و وەعیدیەکان:**

وَفِي بَابِ وَعِيدِ اللهِ بَيْنَ الْمُرْجِئَة والْوَعِيدِيَّة مِنَ الْقَدَرِيَّة وَغَيْرِهِمْ.

**نێوەندی ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی ناوەکان موسەمای ئیمان و دین لە نێوان حەروریەکان و موعتەزیلەکان وە لە نێوان مورجیئەکان و جەهمەکان:**

وَفِي بَابِ أَسْمَاءِ الإِيمَانِ والدِّينِ بَيْنَ الْحَرُورِيَّةِ وَالْمُعْتَزِلَة، وَبَيْنَ الْمُرْجِئَةِ وَالْجَهْمِيَّة.

---

ابن تيمية -رحمه الله- دەفەرموێ (وَفِي بَابِ أَسْمَاءِ الإِيمَانِ والدِّينِ بَيْنَ الْحَرُورِيَّةِ وَالْمُعْتَزِلَةِ، وَبَيْنَ الْمُرْجِئَةِ وَالْجَهْمِيَّةِ) ئەهلی سونە و جەماعە وەسەت و ناوەند و مام ناوەندن لە دەربارەی ناوەکان و موسەمای ئیمان و وە دین، لەنێوان حەڕوریەکان کە خەواریجەکانن وە لە نێوان موعتەزیلەکان کە تاقم و کۆمەڵێکی ترن کە دەرچونە لە بازنەی ئەهلی سونە و جەماعە، وە لەنێوان موڕجیئەکان و جەهمیەکانن.

گوتمان حەڕوری لەبەر ئەوە ئەو ناوەیان لێ نراوە خەواریجەکانن چونکە دێ و گوندێک هەبوە لە نزیک کوفە لە سەردەمی ئیمامی عەلی لەوێوە سەرەتا کۆبونەوە و بەرهەڵستی ئیمامی عەلییان کرد و وە دەرچون لە فەرمان و ئەمری کە بەناوی حەڕوارا بوو ئەو گوند و دێیە لەوەوە ئەو ناوە و نازناوەیان هەڵگرت، لە پاشان خەواریجەکان بۆچونیان وایە دەربارەی ئیمان دەڵێن هەر مرۆڤێک هەر بەندەیەکی الله ئەگەر گوناحێکی گەورەی کرد پێ لە ئیسلام دەردەچێ (پەنا بە الله) کافر دەبێ، وە موعتەزیلەکانیش دەڵێن هەر مرۆڤ و کەسێک هەر بەندەیەک لە بەندەکانی خوای رب العالمین ئەگەر گوناح و تاوانێکی کرد لە ئیسلام دەڵێن دەردەچێ و بەڵام ناگاتە بازنەی کوفر لەو نێوانەدا دەمێنێتەوە لە دونیادا (المنزلة بین المنزلتین) یانی شوێنێک دەگرێ لەنێوان موسڵمان بون و کافر بونی لە ئیسلام دەردەچێ بەهۆی تاوان و گوناحەکەی ناچێتە بازنەی کوفریش ئەوانیش ئەوهایان پێ دەگوترێ ئەهلی سونە و جەماعە وا ناڵێن، لە پاشان موڕجیەئەکانیش لەوسەرن یانی ڕێک پێچەوانەی خەواریجەکان و موعتەزیلەکان و جەهمیەکانن، ئەوانیش بۆچونیان ئەوەیە موڕجیئەکان بەڵکو دەڵێن هەموو بڕوادارێک (کامل الإیمان)ە ئیمانەکەی تەواوە لە ئەسڵ و بنەڕەتدا ئیمانی هەموو کەسێک وەکو ئیمانی مەلائیکەت و فریشتەکانە وەکو ئیمانی سەحابە و هاوەڵەکانە، دەڵێن ئەبو بەکری سەدیق لەگەڵ بچوکترین و ئەدنای موسڵمانان لە ئیمان و بڕوادا لە یەک ئاستدان هیچ فەرق و جیاوازیەکیان نیە، جا ئەهلی سونە و جەماعە لە نێوەندی حەڕوری و خەواریجەکان و موعتەزیلەکان و وە موڕجیئە و جەهمیەکانن ناوەندن ئەهلی سونە و جەماعە کە دەڵێن هەر کەسێک تاوان و گوناحی کرد نە لە ئیسلام دەردەچێ مادەم تاوان و گوناحەکەی شیرک و کوفر نەبێ بە تاوانە گەورەکانیش عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وایە کە موسڵمان لە ئیسلام دەرناچێ، وە لە پاشانەکە ئیمانی هەموو موسڵمانانیش وەکو یەک نیە و لە یەک ئاست نیە بەڵکو ئیمانی ئەبو بەکر لەوپەڕی ئیماندا

بوە ئیمانی کەسێکی تری گوناحکار لە ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێک جار نزمە، کەواتە ئیمان پلە پلەیە ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە بۆچونیانە لەو ناوەڕاست و نێوەندەدان.

**نێوەندی ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی سەحابەکان لە نێوان ڕافیزە و خەواریجەکان:**

وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بَيْنَ الرَّافِضَةِ وَ الْخَوَارِجِ.

---

لە پاشان ابن تیمیة دەفەرموێ (وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بَيْنَ الرَّافِضَةِ وَ الْخَوَارِجِ) ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) سەحابە بەڕێزەکان -رضي الله عنهم- بیروبڕوایان ناوەندە لە نێوانی ڕافیزەکان واتە شیعەکاندان وە لە نێوان خەواریجەکاندان واتە کەوتونەتە ناوەند و ناوەڕاستی هەم شیعە و هەم خەواریجەکان، لەبەر ئەوەی شیعە و ڕافیزەکان ئەوەندە زیادە ڕەوی دەکەن لە خۆشویستنی (أهل البيت) و ئیمامی عەلی و هەندێک لە سەحابەکان هەندێک جار تێدەپەڕێنن (پەنا بە الله) ئیمامی عەلی هەندێکیان دەگەیەننە ئاستی خوا و سیفەتی خوایەتی پێ دەدەن (پەنا بە خوای رب العالمين) هەندێک جار سیفەتی پێغەمبەرایەتی پێ دەدەن زیادەڕەوی دەکەن لە خۆشویستنی ئیمامی عەلی و (أهل البيت)دا ئەهلی سونە و جەماعە وا ناکەن، جا خەواریجەکانیش لە سەرپێچی و ڕقابەری ئیمامی عەلی و (أهل البيت) هەندێکیان و هەندێک لە سەحابەکان خەواریجەکان ئەوانیش زۆر کەمتەر خەمن بێ ئەدەبی دەکەن زۆر جاران وە کافریان دەکەن (پەنا بە خوای رب العالمين)، ئەهلی سونە و جەماعە وا نین ئەهلی سونە و جەماعە لەو ناوەندەدان و لە ناوەڕاستن، (أهل البيت)یان لە پلەیەکی تایبەت خۆشدەوێ چونکە فەرمانی پێغەمبەرە (ﷺ) وە ئیمامی عەلی ڕێزی لێ دەنێن ئەهلی سونە و جەماعە بەڵام بە پلەی چوارەم لەدوای ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر و ئیمامی عوسمان دێ خۆشەویستی ئیمامی عەلی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا وە لە پاشانەکە کافریشیان ناکەن بێ ڕێزیان لەگەڵ ناکەن، لەو ناخۆشی و شەڕ و دوبەرەکیانەی لە نێوان هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) پەیدابوو ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن

ئێمە چۆن شمشێرمان تێیدا بەکار نەهاتوە زمانیشمان ئاوا دەپارێزین ئەوەی پەیدابوو هەبوو لە نێوان سەحابەکان ئێمە ناڵێین هیچ کەسێکیان هەڵەیەکی وای کردوە نە معاویە نە ئیمامی عەلی نە باقی سەحابەکانی تر کە پێی بچنە ناو ئاگری دۆزەخ بەڵکو دەگوترێ ئیمامی عەلی -رضي الله عنه- ئیصابەی کردوە و پێکاوێتی لە ئیجتیهاد و کۆششەکەی دوو ئەجر و پاداشتی هەیە وە ئیمامی معاویە -رضي الله عنه- خەطەئی کردوە لە ئیجتیهادەکەی ئەجر و پاداشتێکی دەست دەکەوێ ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە، نە وەکو ڕافیزە و شیعەکان سنور دەبەزێنن و تێدەپەڕێنن لە خۆشەویستی (أهل البيت) و ئیمامی عەلی و هەندێک لە سەحابەکان وە نە وەکو خەواریجەکانیش زێدەڕەوی لەوەدا دەکەن کە (أهل البيت) و هەندێکیان و ئیمامی عەلی بە کافر دەزانن (پەنا بە خوای رب العالمين) و هەندێک لە سەحابەکان ئەوەش نین بەڵکو لەو ناوەڕاست و نێوەندەدان.

**جێگیر کردنی سیفەتی ئیستیوای الله لەسەر عەرش وە سیفەتی علوی الله بەسەر دروستکراوەکانی وە مەعیەی الله لەگەڵ دروستکراوەکانی:**

فَصْل: وَقَدْ دخَلَ فِيمَا ذَكَرْنَاهُ منَ الإِيمَان بِالله الإِيمَانُ بمَا أَخْبَرَ اللهُ بِهِ فِي كِتَابِهِ، وَتَوَاتَرَ عَن رَّسُولِهِ، وَأَجْمعَ عَلَيْهِ سَلَفُ الأُمَّةِ؛ منْ أَنَّهُ سُبْحَانَهُ فَوْقَ سَمَاوَاتِه، عَلَى عَرْشِه، عَلِيّ عَلى خَلْقِه، وَهُوَ سُبْحَانَهُ مَعَهُمْ أَيْنَمَا كَانُوا، يَعْلَمُ مَا هُمْ عَامِلُونَ؛ كَمَا جَمعَ بَيْنَ ذَلِكَ فِي قَوْلِه: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ [الحديد: ٤].

وَلَيْسَ مَعْنَى قَوْلِه: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾. أَنَّهُ مُخْتَلِط بِالْخَلْقِ؛ فَإِنَّ هَذَا لاَ تُوجِبُهُ، اللُّغَةُ، وهو خلاف ما أجمع عليه سلف الأمة، وخلاف ما فطر الله عليه الخلق، بَلِ الْقَمَرُ آيَةٌ مِنْ آيَاتِ الله مِنْ أَصْغَرِ مَخْلُوقَاتِهِ، وَهُوَ مَوْضُوع فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ مَعَ الْمُسَافِرِ وَغَيْرُ الْمُسَافِرِ أَيْنَمَا كَانَ. وَهُوَ سُبْحَانَهُ فَوْقَ عَرْشِهِ، رَقِيب عَلَى خَلْقِهِ، مُهَيْمِن عَلَيْهِمْ، مُطَّلِع عَلَيْهِم إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ مِن مَّعَانِي

رُبُوبِيَّتِهِ. وَكُلُّ هَذَا الْكَلامِ الَّذِي ذَكَرَهُ اللهُ ـ مِنْ أَنَّهُ فَوْقَ الْعَرْشِ وَأَنَّهُ مَعَنَا ـ حَقٌّ عَلَى حَقِيقَتِهِ، لاَ يَحْتَاجُ إِلَى تَحْرِيفٍ، وَلَكِنْ يُصَانُ عَنِ الظُّنُونِ الْكَاذِبَةِ؛ مِثْلِ أَنْ يُظَنَّ أَنَّ ظَاهِرَ قَوْلِهِ: ﴿فِي السَّمَاءِ﴾. أَنَّ السَّمَاءَ تُظِلُّهُ أَوْ تُقِلُّهُ، وَهَذَا بَاطِلٌ بِإِجْمَاعِ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالإِيمَانِ؛ فَإِنَّ اللهَ قَدْ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَهُوَ يُمْسِكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ أَنْ تَزُولاَ، وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الأَرْضِ؛ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ بِأَمْرِهِ.

جا لە پاشان ابن تيمية -رحمە اللە- هەر لە (الواسطية) دەگاتە سەر ئەوەی دەفەرموێ (فَصْلٌ) فەصل کە زانایانی پێشین لە پەرتوکەکانیان بەکاریان هێناوە مەبەستیان جیاکارییە یەعنی بابەتێکی تر جیاواز لەو بابەتەی لە پێشتر ئەویش دەفەرموێ (وَقَدْ دَخَلَ فِيمَا ذَكَرْنَاهُ مِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ الإِيمَانُ بِمَا أَخْبَرَ اللهُ بِهِ فِي كِتَابِهِ) جا دەچێتە ناو باس و خواسی ئیمان بە اللە و ئیمان بەوەی کە اللە تعالى هەواڵی پێداوە لە پەرتوکەکەی (وَتَوَاتَرَ عَنْ رَّسُولِهِ) وە دەچێتە ناو ئەو بازنەش کە پێغەمبەر (ﷺ) بە موتەواتیری لێی گێڕدراوەیە و هەواڵی داوە (وَأَجْمَعَ عَلَيْهِ سَلَفُ الأُمَّةِ) وە پێشینانی ئومەتی ئیسلام لەسەری کۆ دەنگن (مِنْ أَنَّهُ سُبْحَانَهُ فَوْقَ سَمَاوَاتِهِ) ئەوە ئەو بڕگەیە دەچێتە ناو ئەو ئیمان و بڕوایەی ئیمان و بڕوا بە اللە و بە ڕۆژی دوایی و بەو هەواڵەی کە اللە تعالى لە قورئانی پیرۆز داویەتی و ئەوەی گێڕدراوەیە بە موتەواتیری لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وە ئیجماع و کۆدەنگی سەلەفی ساڵحی لەسەرە سەلەفی ئومەتی ئیسلام ئەوەیە کە اللە تعالى لە سەروی ئاسمانەکانە (عَلَى عَرْشِهِ) لەسەر عەرشی خۆیەتی (عَلِيٌّ عَلَى خَلْقِهِ) بەرزە بەسەر بەدیهێنراوەکانی (وَهُوَ سُبْحَانَهُ) اللە تعالى پاک و بێگەردی بۆ ئەو (مَعَهُمْ أَيْنَمَا كَانُوا) لەگەڵ بەدیهێنراوەکان یشیدایە لە هەر شوێن و جێگایەکبن (يَعْلَمُ مَا هُمْ عَامِلُونَ) دەزانێ و شارەزایە بەوەی ئەوان دەیکەن و ئەنجامی دەدەن (كَمَا جَمَعَ بَيْنَ ذَلِكَ فِي قَوْلِهِ) هەروەکو ابن تيمية دەفەرموێ اللە تعالى لە فەرمودەی خۆیدا کۆیکردوەتەوە لە نێوان ئەوەی هەم ئیستیوای کردوە لەسەر عەرش و

هەم لە سەروی ئاسمانەکانە و هەم بەرزە بەسەر بەدیهێنراوەکانیدا وە لەگەڵ ئەوەدا لەگەڵیشیاندایە الله تعالی -جل شئنه- وە عەمەل و کردەوە و شتەکانیشیان دەزانێ.

کەواتە الله تعالی لەو ئایەتە کە فەرموی دوو شتی دژ بە یەک نیە، ابن تیمیة -رحمه الله- دەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە دوو شتی دژ بە یەک نیە کە بڵێین الله لە سەروی ئاسمانەکانە بەرزە بەسەر بەدیهێنراوەکانیدا وە لەگەڵ ئەوەدا بشگوترێ کە الله تعالی -جل شئنه- لەگەڵیشیاندایە لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیشدایە وە ئاگاداریشە و عیلم و زانستیشی هەیە بە کردەوەکانیان لەو ئایەتە کۆی کردوەتەوە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ [الحديد: ٤] الله فەرموی الله ئەو خوایەیە -جل شئنه- کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە لە شەش ڕۆژدا لە پاشان بەرز بوەتەوە بەسەر عەرشدا ئیستیوای کردوە وە دەزانێ و عیلمی هەیە بەوەی دەچێتە ناو ناخی زەوی و زەوی لە خۆیەوە دەگرێ وە ئەوەی دەردەچێ لە زەوی وە عیلم و زانستی هەیە بەوەی دادەبەزێ لە ئاسمان وە ئەوەی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان وە الله لەگەڵتاندایە ئێوە لە هەر شوێن و جێگایەکدابن وە بەڕاستی الله تعالی بەوەی ئێوە دەیکەن بینەرە.

کەواتە الله لەو ئایەتە سەلماندی -جل شئنه- هەم ئیستیوای کردوە لەسەر عەرش هەم بەرزە بەسەر مرۆڤەکان و بەدیهێنراوەکانی هەم لەگەڵ ئەوەدا لەگەڵیشیاندایە ئاگاشی لێیانە شارەزاشە و عیلمی هەیە بە کردەوەکانی.

ئێمە دێینە سەری و ڕونکردنەوە دەدەین چۆن دەشێ و دەگونجێ وە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە چۆنە ڕونکردنەوەی زیاد دەدەین بەس دەمانەوێ مەتنەکە شەرح کەین ئینجا بێینە سەر ڕونکردنەوە و هەڵوێستە لەسەر هەندێک لە بڕگەکان دەکەین.

جا لە پاشان ابن تیمیة دەفەرموێ (وَلَيْسَ مَعْنَى قَوْلِهِ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾. أَنَّهُ مُخْتَلِطٌ بِالْخَلْقِ) مانای ئەوە ناگەیەنێ ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ کە الله فەرمویەتی الله لەگەڵتانە بە مەعنای ئەوەبێ تێکەڵە خوای رب العالمین لەگەڵ بونەکەی یەعنی تێکەڵە الله -جل شئنه- تێکەڵ بوە بە بەدیهێنراوەکانی یان شی بوەتەوە لەناویاندا (پەنا بە الله) (فَإِنَّ هَذَا لاَ تُوجِبُهُ، اللُّغَةُ) چونکە لە زمانەوانیشدا: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾ ئەوە ناگەیەنێ و لێی وەرناگیرێ ئەوە پێویست بکات بڵێ مەعنای تێکەڵ بوە لەگەڵ بەندەکان و بەدیهێنراوەکانیدا (وهو خلاف ما أجمع عليه سلف الأمة) جا ئەگەر بڵێی (پەنا بە الله) الله تێکەڵ بوە لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدا و شی بوەتەوە لەناویان ئەوە پێچەوانەیە لەگەڵ ئیجماع و کۆدەنگی پێشینانی چاکی ئومەتی ئیسلام کە سەلەفی ساڵحن (وخلاف ما فطر الله عليه الخلق) وە پێچەوانەی فرچک و سروشت و فیطرەتی بەدیهێنراوەکانە کە الله تعالى لەسەر ئەو فیطرەتە پاکە کە تەوحیدە بەدیهێناون (بَلِ الْقَمَرُ آيَةٌ مِنْ آيَاتِ اللهِ مِنْ أَصْغَرِ مَخلُوقَاتِهِ) لێرەوە ابن تیمیة نمونەیەکی جوانی ژیرانە و عاقڵانە و واقیعیانە دەهێنێتەوە دەفەرموێ بەڵکو سەرنج بدەن مانگ یەکێکە لە نیشانەکانی دەسەڵاتی الله تعالى لە بەدیهێنراوەکانە بەڵکو یەکێکە لە بەدیهێنراوە بچوکەکانی الله تعالى (وَهُوَ مَوْضُوعٌ فِي السَّمَاءِ) لەگەڵ ئەوەدا کەس گومانی لەوەدا نیە مانگ لە بۆشاییە لەنێوان زەوی و ئاسمانە وە لە ئاسماندایە (وَهُوَ مَعَ الْمُسَافِرِ وَغَيْرُ الْمُسَافِرِ أَيْنَمَا كَانَ) لەگەڵ ئەوەدا کەسێک کە دەچێ سەفەر دەکا لەگەڵ سەفەر کاردایە و مانگ لەگەڵی دەڕوا هەر هەستیشی پێ ناکا مانگەکە تۆ لێرەدا دەڕۆی چەندەها کیلۆمەترات دەبڕی کە دەچیتە سەفەرێک مانگ لەگەڵتدایە و کە ئەنەهو لەگەڵ تۆدایە و لەگەڵت دەڕوا خۆ مانگ لەگەڵیشت ناڕوا هەر بەرزە و هەر لە شوێنی خۆیەتی و لە ئاسمان دانەبەزیوە لەگەڵ ئەوەدا تۆ وا هەستی پێدەکەی و ئاوا دێتە بەر چاوان و دڵان وە جگە لە موسافیر و سەفەرکاریش مانگ هەر لەگەڵی دەڕوا ئەگەر سەرنجی بدا و تەماشای بکا مانگەکەش لە شوێنی خۆی دانەبەزیوە و هەر لە بەرزییە

(وَهُوَ سُبْحَانَهُ فَوْقَ عَرْشِهِ) خوای پاک و بێگەرد لە سەروی عەرشی خۆیەتی و بارەگای خۆیەتی (رَقِيب عَلَى خَلْقِهِ) چاودێرە موراقیبە بەسەر بەدیهێنراوەکانی (مُهَيْمن عَلَيْهِمْ) بەرز و زاڵە بەسەریاندا (مُطَّلِع عَلَيْهِم) وە خوای رب العالمین ئەوانی هەموو لێ دیارە و ئاگادارە بە هەر هەمویان ( إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ مِن مَّعَانِي رُبُوبِيَّتِهِ) وە جگە لە ماناکانی تریش بۆ الله تعالی -جل شئنه- لە پەروەردگاریەتیدا (وَكُلُّ هَذَا الْكَلامِ الَّذِي ذَكَرَهُ اللهُ -مِنْ أَنَّهُ فَوْقَ الْعَرْشِ وَأَنَّهُ مَعَنَا) هەموو ئەو قسانەی کە الله تعالی فەرموی کە الله تعالی باسی کرد لە قورئانی پیرۆز کە الله لە سەروی عەرشە وە الله لەگەڵیشماندایە لە هەمان کاتدا (حَقّ عَلَى حَقِيقَتِهِ) لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا بە مەعنای ئەوەیە کە حەق و ڕەوایە لەسەر واتای ڕاستی و دروستی خۆی وەریدەگرین وەکو ئەهلی سونە و جەماعە (لاَ يَحْتَاجُ إِلَى تَحْرِيفٍ) وە پێویست نیە بچین پەنا ببەینە بەر تەحریف و گۆڕین و لادان (وَلَكِنْ يُصَانُ عَنِ الظُّنُونِ الْكَاذِبَةِ) بەڵکو دەبێ بشی پارێزین واتاکەی لە گومانە درۆینیەکان کە تاقم و کۆمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە هەندێک لە گومانی درۆینیان دروست کردوە (مِثْلِ أَنْ يُظَنَّ أَنَّ ظَاهِرَ قَوْلِهِ: ﴿فِي السَّمَاءِ﴾. أَنَّ السَّمَاءَ تُظِلُّهُ أَوْ تُقِلُّهُ) نمونەی ئەوەی کە گومان بردراوە لەلای هەندێک لە تاقم و کۆمەڵەکان بە حیسابی خۆیان لەبەر ئەوەی دەڵێن ناڵێین الله لە ئاسمانە و لە سەروی ئاسمانەکانە دەڵێن گومانی ئەوە دەبردرێ لە زاهیر و ڕواڵەتدا ئەگەر بڵێین: ﴿فِي السَّمَاءِ﴾ الله لە ئاسمانە یان لەسەرووی ئاسمانە کە (في) لێرە بە مەعنای عەلایە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن مانای ئەوەی لێ وەردەگیرێ کەواتە ئاسمان اللهی لە خۆیەوە گرتوە (پەنا بە خوای رب العالمین) دەوری اللهی داوە و سێبەری بۆ الله کردوە (پەنا بە الله) (وَهَذَا بَاطِل بِإِجْمَاعِ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالإِيمَانِ) ئەوە بیروبۆچونێکی پوچەڵە بە ئیجماع و کۆدەنگی خاوەن عیلم و زانستیەکان وە خاوەن ئیمانەکانی ئەهلی سونە و جەماعە (فَإِنَّ اللهَ قَدْ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ) چونکە الله تعالی کورسیەکەی فراوانە بەقەد ئاسمانەکان و زەوی (وَهُوَ يُمْسِكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ أَنْ تَزُولاَ) الله تعالی ئاسمانەکان و

زەوی ڕاگرتوە نەجوڵێن لە شوێنی خۆیان و نەکەون هەر الله تعالی ڕاگریانە ئەوانی گرتوە (وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الأَرْضِ) هەر الله ئاسمانی ڕاگرتوە و ئاسمان پێویستی بە اللەیە -جل شئنە- ڕای گرتوە کە نەکەوێتە سەر زەوی (إلاَّ بِإِذْنِهِ) ئیلا بە مۆڵەتی خوای رب العالمین مەگەر الله مۆڵەتی بدا کە بکەوێ (وَمَنْ آيَاتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ بِأَمْرِهِ) یەکێک لە نیشانەکانی گەورەیی الله تعالی و خوایەتی الله تعالی -جل شئنە- بریتیە لەوەی کە ئاسمان و زەوی بە ئەمر و فەرمانی خوای رب العالمین بەڕێوە دەچن الله بەڕێیانەوە دەبا و ئەوانی ڕاگرتوە و دەیانگرێ.

جا ئەوە چەند بڕگەیەکی مەتنی (الواسطیة) بوو ابن تیمیة -رحمە الله- ویستی ئەو گومانانە بڕەوێنێتەوە ئەوانەی تاقم و کۆمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە کە هەندێک لە بیروبۆچونی هەڵە و پوچەڵیان هەیە دەرباری ئیستیوای الله تعالی لەسەر عەڕش و بەرزی خوای رب العالمین بەسەر بەدیهێنراوەکانی و لە هەمان کاتدا لەگەڵدابونی الله لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدا جا بە کورتی و پوختی ابن تیمیة ڕونی کردەوە.

ئێمە هەڵوێستەی یەکەم لەسەر ئەوە دەکەین سەلماندمان لە ڕابردودا لە کاتێک کە ئایەتەکان بە بەڵگە هاتنەوە الله تعالی یەکێک لە سیفەتە فعلی و کرداریەکانی ئیستیوائە ئیستیوای کردوە لەسەر عەڕشی خۆی بە مەعنای حەقیقی و ڕاستیەکەی بەبێ ئەوەی چۆنیەتیەکەی بزانین، ئینجا الله تعالی -جل شئنە- دادەبەزێ بۆ ئاسمانی دونیا لە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) جێگیرە.

ئایە ئێمە بۆمان هەیە لێرەوە بڵێین زاتی الله لەسەر عەڕشە یان زاتی الله دادەبەزێ؟ عثیمین ڕاشکاوانە دەفەرموێ وە باقی زانایەکانی تریش، لە پێش ئەویشدا ئەهلی سونە و جەماعە فەرمویانە ئەولاتر و باشتر وایە ئێمە نەڵێین زاتی الله پێویستمان پێ نابێ ئەو قسە بکەین و بڵێین چونکە الله تعالی نەیفەرموە زاتی بەڵام لە یەک کاتدا و لە یەک حاڵەت پێویستمان بەوە دەبێ لە کاتی وەڵامدانەوەی ئەو تاقم و کۆمەڵانەی کاتێ کە دەڵێن زاتی

الله نيه ئيستيواى كردوه لەسەر عەرش ئەمرى اللهيه يان (استولى)ى كردوه يان زاتى الله نيه دادەبەزێت بۆ ئاسمانى دونيا بەڵكو ئەمرى الله دادەبەزێ يان زاتى الله نيه دێت بۆ مەيدانى حەشر و حيساب بەڵكو ئەمرى اللهيه: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ [الفجر: ٢٢] ئەوان دەڵێن (وَجَاءَ أمر وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا) لەو حاڵەتانە ئەهلى سونە و جەماعە دەفەرمون پێويست بەوە دەكا بۆ وەڵامدانەوەى ئەوان پوچەڵ كردنەوەى بۆچونەكانيان بگوترێ زاتى خواى رب العالمين -جل شئنە- ئەگەر لە وەڵامدانەوەى ئەوان نەبێ زات بەكار نەهێنين ئەولاتر و باشترێكە.

جا لە پاشان ئايە الله تعالى كە لەسەروى ئاسمانانە و سيفەتى علوى هەيە و بەرزە و -جل شئنە- وە بەرزە بەسەر هەموو بەديهێنراوەكانيدا وە ئيستيواى كردوە لەسەر عەرش بەو واتايەى كە لە خۆى دەوەشێتەوە بە مانايە حەقيقيەكەى و چۆنيەتيەكەى ئێمە نازانين ئايە دەشێ و دەگونجێ لە هەمان كاتدا بڵێين لەگەڵ ئێمەدايە الله تعالى؟ بەڵێ لە عەقيدەى ئەهلى سونە و جەماعە ئەوەش سەلمێنراوە لەگەڵماندايە، لەگەڵدابونى خواى رب العالمين بۆ بەندەكانى و بەديهێنراوەكانى دوو بەش بوو لە عەقيدەى ئەهلى سونە و جەماعە:

يەكەميان مەعيەى عام و گشتيە الله تعالى لەگەڵ هەموو بەديهێنراوەكانيدا وە بەچى لەگەڵياندايە لە عەقيدەى ئەهلى سونە و جەماعە؟ بە ئيتيڵاع و ئاگا لێيون بە چاودێرى كردن الله تعالى لەگەڵياندايە بە دەسەڵات و عيلم و زانينەوە لەگەڵياندايە ئەوە مەعيەتە عام و گشتيەكەيە، هەندێک لە زانايان دەفەرمون ئيجماعى سەلەف لەسەر ئەوەيە هەندێكيشيان دەفەرمون جمهورى سەلەف لەسەر ئەوەيە گرنگ ئەوەيە: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ [الحديد: ٤] وا تەفسير دەكرێ بە مەعنايە عامى و گشتيەكەى يەعنى (وَهُوَ مَعَكُمْ بقدرته وعلمه سبحانه وتعالى مع كل شيء) خواى رب العالمين لەگەڵ هەموو شتەكاندايە بە عيلم و زانستى وە بە دەسەڵاتيەوە (ومطلع عليهم) لەسەريان ئاگادارە وە چاودێرە بەسەريانەوە الله -جل شئنە- ئەوە عەقيدەى ئەهلى سونە و جەماعەيە، قەرينە

لەوێ هەیە چونکە شتی ناشیاو دێتە گۆڕێ بۆ الله تعالى ئەگەر بڵێی (بذاته معكم) یەعنی الله بە زاتی خۆی لەگەڵتاندایە بە مەعنای ئایە الله تەجزیئە دەبێ (پەنا بە خوای رب العالمين)؟ یان لە شوێنی ناشیاو و نەگونجاو الله تعالى لێی دەبێ؟ جا ئەوانە بەدورە لە خوای رب العالمين لەبەر ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە وا ڕاڤە و تەفسیریان کردوە وە زیاتریش قسەی لەگەڵ ناکەن.

جۆری دوەم مەعیەت و لەگەڵدابونی الله تعالى -جل شئنه- خاص و تایبەتە ئەویش سەرخستن و پاراستنیانە وە پشتگیری لێ کردنیانە تەهید کردنیانە ئەویش لەگەڵ بڕوادارەکانە وەکو خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحسِنِينَ﴾ [العنكبوت: ٦٩] الله تعالى بەڕاستی لەگەڵ چاکەکارانە، یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحسِنُونَ﴾ [النحل: ١٢٨] الله تعالى لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە تەقوای الله دەکەن و چاکەکارن بە مەعنای پشتیان دەگرێ و سەریان دەخا بەو مانایە لەگەڵیاندا دەبێ، یان دەفەرموێتە موسا و هارون (عليهما الصلاة والسلام) کە دەیان نێرێ بۆلای فیرعەون دەفەرموێ: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه: ٤٦] من لەگەڵ هەردوکتاندام وە دەبینم و دەبیستم ئینجا ئەو لەگەڵدابونە مەعنای سەرتان دەخەم پشتگیریتان لێ دەکەم دەتان پارێزم.

جا ئایە دەشێ و دەگونجێ شتێک بەرزبێ و لەگەڵیشتدابێ ئەو مانایە دێتە بەر عەقڵ و شاشەی عەقڵ و مێشک؟ بەڵێ دێتە بەر شاشەی عەقڵ و مێشکیش بەڵام گریمان ئەگەر عەقڵیش نەیخوێنێتەوە شتە غەیبیەکان لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئێمە تەسلیمی دەبین چۆنیەتیەکانی بیر لێ ناکەینەوە و بڕیاری لەسەر نادەین چۆن الله تعالى فەرمویەتی پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە بڕوای پێ دەهێنین و بەسەریدا دەڕۆین و حەقیقەت و ڕاستیەکەی دەسەلمێنین و لە چۆنیەتیەکەی ناپێچینەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نمونەی عەقڵی و ژیریش هەیە، بەڵێ چۆن مەخلوق و بەدیهێنراوێکی

وەکو مانگ ابن تیمیة نمونەیەکی زۆر جوان و لەجێیە هێناویەتیەوە یەکێکە لە بەدیهێنراوەکانی خوای رب العالمین مانگ لە چواردەدا هەندێک جار تۆ تەماشای ئاسمان دەکەی دەچیتە سەفەر و بەڕێگادا دەڕۆی بە ئۆتۆمبێل و بە پێیان بە وڵاخ و کەر و باری بە فڕۆکە هەندێک جار ئەوکاتە مانگ لە سەروی تۆیە هەر لە شوێنی خۆشیەتی لە هەمان کاتدا ناتوانی بڵێی مانگیشم لەگەڵ نیە، دەگوترێ لە زمانی عەرەبی مانگەکە لەگەڵمدابوو بە مەعنای ئەوەی مانگەکەم هەر لێ دیاربوو ئەگەر مانگیش بینینی هەبێ ئەویش هەر منی لێ دیاربوو، جا ئەگەر مەخلوق و بەدیهێنراوێک وابێ و بشێ و بگونجێ عەقڵیەن کە ئەوەی بۆ بڕیار بدرێ هەر لە بەرزی خۆت بێت و لەگەڵیشتدابێ چۆن ناشێ و ناگونجێ بۆ الله تعالی کە بڕیاری داوە لە قورئانی پیرۆز و وە پێغەمبەریش (ﷺ) ئاوا دانی پێداهێناوە کە الله تعالی ئیستیوای کردوە لەسەر عەرش و بەرزە بەسەر بەدیهێنراوەکانی لە هەمان کاتیشدا لەگەڵیشماندایە بە لەگەڵدابونێکی گشتی و عامەکە لەگەڵ هەموو مەخلوق و بونەوەر و بەدیهێنراوەکان وە تایبەتەکەش لەگەڵ موسڵمان و بڕوادارەکان.

## جێگیر کردنی نزیکی الله تعالی و لەگەڵدابونی:

فَصْل: وَقَد دَّخَلَ فِي ذَلِكَ الإِيمَانُ بِأَنَّهُ قَرِيب مُجِيب؛ كَمَا جَمَعَ بينَ ذَلِكَ فِي قَوْلِه: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيب﴾ [البقرة: ١٨٦]. الآيَة، وَقَوْلِه (ﷺ): «إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ أَقْرَبُ إِلَى أَحدكُم مِّن عُنق رَاحِلَتِه[١]». وَمَا ذُكِرَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّة مِنْ قُرْبِه وَمَعِيَّتِه لاَ يُنَافِي مَا ذُكِرَ مِنْ عُلُوِّه وَفَوْقِيَّتِه؛ فَإِنَّهُ سُبْحَانَهُ لَيْسَ كَمِثْلِه شَيْء فِي جَمِيعِ نُعُوتِه، وَهُوَ عَلِيّ فِي دُنُوِّه، قَرِيب فِي عُلُوِّه.

---

جا لە پاشان ابن تیمیة -رحمه الله- گەیشتە سەر ئەوەی فەرموی (فَصْل: وَقَد دَّخَلَ فِي ذَلِكَ الإِيمَانُ بِأَنَّهُ قَرِيب مُجِيب) وە هەروەها بیروبڕوا بە زاتی خوای رب العالمین وە بیروبڕوا

[١] أخرجه البخاري برقم (٦٦١٠) في القدر، باب: لا حول ولا قوة إلا بالله . ومسلم برقم (٢٧٠٤)- ٤٦ في الذكر والدعاء، باب: استحباب خفض الصوت بالذكر. عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه.

بەوەی كە الله تعالى ئیستیوای كردوە لەسەر عەرش و بەرزە و لەگەڵیشماندایە ئەمجارە بیروبڕوا بەوەش كە الله تعالى لێمان نزیكە وە وەڵام دەرەوەیە بۆ بەندەكان كاتێک داوای لێ دەكەن و لەبەری دەپاڕێنەوە ئەوەش بەشێكە لە بیروبڕوا بون بە الله تعالى و بیروبڕوابون بە ڕۆژی دوایی و بە ڕوكنەكان و كۆڵەكەكانی ئیمان دەفەرموێ دەچێتە ناو ئەو بازنەی ئیمان بە الله، چی؟ (الإِيمَانُ بِأَنَّهُ قَرِيب من خلقه مُجِيب) الله تعالى نزیكە لە بەدیهێنراوەكان و وەڵامدەرەوەیە بۆیان (كَمَا جَمَعَ بينَ ذَلِكَ فِي قَوْله) هەروەكو الله تعالى كۆی كردوەتەوە لە فەرمودەی خۆی: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيب﴾ [البقرة: ١٨٦] الله تعالى دەفەرموێ ئەگەر بەندەكان پرسیاریان كرد دەربارەی من ئەی موحەمەد (ﷺ) لە وەڵامدا پێیان بڵێ من نزیكم لێیان وە زۆریش لێیان نزیكم، لە پاشان پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) «إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ أَقْرَبُ إِلَى أَحدكُم مِّن عُنقِ رَاحِلَتِهِ» كە ئەو فەرمودە لە ڕابردودا شیمان كردەوە و هێنامانەوە كاتێک سەحابەكان بەرەو جەنگێک دەچون لە بەرزاییەكاندا (الله أكبر)یان بە دەنگی بەرز گوت و لە نزماییەكان (سبحان الله)یان بە دەنگی بەرز گوت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەوەی ئێوە بانگی لێ دەكەن و لەبەری دەڕێنەوە و ناوی دەهێنن و زیكری دەكەن زۆر نزیكترە لە ئێوە لە ملی وڵاخەكانتان لە لاتان ئەوان لەسەر پشتی وڵاخدا بون دەڕۆیشتن بەرێوە كەسێک سواری سەر پشتی وڵاخ بێ ملی وڵاخەكەی زۆر لێی نزیكە (ئەسپە گوێدرێژە هەرچیە لە ژێریەوە) نزیكترین شوێنێتی لێی فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی ئێوە بانگی دەكەن لەبەری دەپاڕێنەوە كە الله تعالى یە لە ملی وڵاخەكە كە لە ژێرتانەوەیە لێتان نزیكترە، كەواتە خوای رب العالمين دەشێ و دەگونجێ ئێمە بڵێین زۆر زۆر لێمان نزیكە.

ئایە نزیكی خوای رب العالمين زاتی الله ئەوەندە لێمان نزیكە؟ بەڵێ ئێمە دەڵێین الله تعالى وەكو زاتی -جل شئنە- ناوە زۆر جوانەكانی سیفاتە بەرزەكانی لەوپەڕی بەرزیدایە ئیستیواشی كردوە لەسەر عەرش وە بەرزە بەسەر هەموو بەدیهێنراوەكانی لە هەمان كاتدا

لەگەڵیشماندایە وە لێشمان نزیکە وە وەڵامیشمان دەداتەوە ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە، جا چۆنیەتیەکەی چۆنە؟ ئێمە بزەبت نازانین لە چۆنیەتیەکەی وە عیلممان نیە بە چۆنیەتیەکەی هەر الله دەزانێ -جل شئنە-.

ئینجا دەفەرموێ (وَمَا ذُكِرَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ مِنْ قُرْبِهِ وَمَعِيَّتِهِ لاَ يُنَافِي مَا ذُكِرَ مِنْ عُلُوِّهِ وَفَوْقِيَّتِهِ) جا ئەوەی باسکراوە لە قورئانی پیرۆز و لە سونە و فەرمودەکانی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ) دەربارەی نزیکی الله تعالی لە بەدیهێنراوەکانی وە لەگەڵدابونی الله لەگەڵ بەدیهێنراوەکانی ئەوە ئەوە ڕەت ناکاتەوە (لاَ يُنَافِي مَا ذُكِرَ مِنْ عُلُوِّهِ وَفَوْقِيَّتِهِ) ئەوەی پێ ڕەشنابێتەوە و ڕەت ناکرێتەوە بڵێین الله بەرز نیە و لە سەروی ئاسمانەکان و بەدیهێنراوەکانی نیە (فَإِنَّهُ سُبْحَانَهُ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ) چونکە پاک و بێگەردی بۆ الله سبحانە وتعالی هیچ کەس و شتێک لە زات و ناو و سیفات وەکو ئەو نیە ئەویش وەکو هیچ شتێک نیە (فِي جَمِيعِ نُعُوتِهِ) لە هەموو وەسف و سیفاتەکانی الله تعالی لە هەموو نەعەتەکانی -جل شئنە- وەکو هیچ کەس و شتێک نیە (وَهُوَ عَلِيٌّ فِي دُنُوِّهِ) الله تعالی بەرزە لە نزیکیشی لە ئێمەدا (قَرِيب فِي عُلُوِّهِ) وە الله تعالی نزیکە لە ئێمە لە بەرزیشیدا ئەوها دەگوترێ بۆ الله تعالی.

جا ناسین و زانینی الله تعالی بەو ناو و سیفەتانەیەوە زۆر سود بەخشە گرنگە بۆ بڕواداران چونکە تۆ ئەگەر زانیت الله تعالی زۆر بەرز و مەزنە ئەوکاتە لێشی دەترسێی وە خۆشیشیت دەوێ زۆر وە ئەگەر زانیت الله تعالی زۆر لێت نزیکە ئەوکاتە هەردەم بە نزیکی الله تعالی هۆگرییەکت بۆ دەبێ وە لە پاشانەکە لێشی دەترسێی گوناح و تاوان و سەرپێچی لێبکەی کە ئەوەندە لێت نزیک بێ، کە زانیت الله تعالی هەردەم لەگەڵتە و چاودێرە بەسەرتەوە ناتوانی بە ئاسانی گوناح و تاوان ئەنجام بدەی، وە ئەگەر زانیت الله تعالی مەعیەت و لەگەڵدابونی خاص و تایبەتی هەیە بۆ بڕواداران ئەوکاتە چاونەترس دەبی ئەوکاتە گیان لەسەر دەست دەبی لەبەر ئەوەی دەزانی الله تعالی سەرت دەخا ئەگەر

ڕێبازی الله تعالى بە تەواوی بگریتە بەر وە دەتپارێزێ، جا لەبەر ئەوەیە گرنگە وەکو ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون بیروبڕوا بەو بابەت و شتانە.

**واجبە ئیمانمان وابێ قورئان کلام اللهیە:**

وَمِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ وَكُتُبِهِ الإِيمانُ بِأَنَّ الْقُرْآنَ كَلاَمُ اللهِ، مُنَزَّل، غَيْرُ مَخْلُوق، مِنْهُ بَدَأَ، وَإِلَيْهِ يَعُودُ، وَأَنَّ اللهَ تَكَلَّمَ بِهِ حَقِيقَةً، وَأَنَّ هَذَا الْقُرْآنَ الَّذِي أَنْزَلَهُ عَلَى مُحَمَّد (ﷺ) هُوَ كَلاَمُ اللهِ حَقِيقَةً، لاَ كَلاَمَ غَيْرِهِ. وَلا يَجُوزُ إِطْلاَقُ الْقَوْلِ بِأَنَّهُ حِكَايَة عَنْ كَلاَمِ اللهِ، أَوْ عِبَارَة؛ بَلْ إِذَا قَرَأَهُ النَّاسُ أَوْ كَتَبُوهُ فِي الْمَصَاحِفِ؛ لَمْ يَخْرُجْ بِذَلِكَ عَنْ أَنْ يَكُونَ كَلاَمَ اللهِ تَعَالَى حَقِيقَةً، فَإِنَّ الْكَلاَمَ إِنَّمَا يُضَافُ حَقِيقَةً إِلَى مَنْ قَالَهُ مُبْتَدِئًا، لاَ إِلَى مَنْ قَالَهُ مُبَلِّغًا مُؤَدِّيًا. وَهُوَ كَلاَمُ اللهِ؛ حُرُوفُهُ، وَمَعَانِيهِ؛ لَيْسَ كَلاَمُ اللهِ الْحُرُوفَ دُونَ الْمَعَانِي، وَلاَ الْمَعَانِيَ دُونَ الْحُرُوفِ.

---

جا لە پاشان ابن تیمیة گەیشتە سەر ئەوە دەفەرموێ (وَمِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ وَكُتُبِهِ) جا لە بازنەی ئیمان و بڕوابون بە الله و بە پەرتوکە ئاسمانیەکانی الله (الإيمانُ بِأَنَّ الْقُرْآنَ) ئیمان و بڕوابونە بەوەی بەڕاستی قورئان (كَلاَمُ اللهِ، مُنَزَّل) قورئان فەرمودەی اللهیە کلام اللهیە وە دابەزیوە لەلای الله تعالى وە ئەوەش وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن قورئان هی پێغەمبەرە (ﷺ) لە اللهوە نیە نەخێر قورئان دابەزیوە لە اللهوە بۆسەر پێغەمبەر (ﷺ) هی اللهیە و لە اللهوەیە کلام اللهیە وە لە پاشان کە دەڵێین قورئان مونەزەلە بە مەعنای الله سیفەتی علوی هەیە و بەرزە -جل شئنە- دابەزین لە بەرزیەوەیە بۆ نزمی، لە پاشان دەڵێ (غَيْرُ مَخْلُوق) وە قورئان بەدیهێنراو نیە بەڵکو قورئان یەکێکە لە سیفاتەکانی الله تعالى کلام اللهیە لەگەڵ اللهیە -جل شئنە- موعتەزیلیەکان ئەو بیروبڕوایەیان هێنایە ناو موسڵمانان کە گوتیان قورئان بەدیهێنراوە (پەنا بە خوای رب العالمین) دەیەها موسڵمان و کەڵە زانای وەکو ئیمامی ئەحمەدیان تاقی کردەوە لەسەر ئەو خاڵە و هەیان بوو کۆڵیان نەدا ئازاریاندان جەزرەبەیاندان وە تەعزیبیاندان ئەشکەنجەیان دان لە زیندانەکان (مِنْهُ بَدَأَ) جا قورئان لە اللهوە دەستی پێکردوە -جل شئنە- هاتن و دابەزینەکەی لە اللهوەیە کە کلام اللهیە (وَإِلَيْهِ

يَعُودُ) قورئان لە کۆتا زەمانیش هەموی هەڵدەکێشرێتەوە لای الله بەڵگە لەسەر ئەوەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە یەک پیت و حەرفی قورئان نامێنێ پێش دونیا تێکچون الله هەڵی دەکێشێتەوە و دەیباتەوە لای خۆی -جل شئنە-. وە لە پاشان (وَأَنَّ اللهَ تَكَلَّمَ بِهِ حَقِيقَةً) بەڕاستی الله تعالی دواوە و قسەی کردوە بە قورئان واتە قورئانی پیرۆز هی الله تعالی یە و کلام اللەیە و الله دەری بڕیوە و فەرمویەتی (وَأَنَّ هَذَا الْقُرْآنَ الَّذِي أَنْزَلَهُ عَلَى مُحَمَّدٍ (ﷺ) هُوَ كَلَامُ اللهِ حَقِيقَةً) جا ئەو قورئانەی کە دابەزیوە بەسەر پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) کەلام و فەرمودەی خوای رب العالمین ە بەڕاست و دروستی ئەوە نەبێ بڵێین ئەوەی ئێستا لەو موسحەفانەیش نوسراوەیە هەر کلام اللەیە ئەوەی کە قاریئێکی قورئانیش دەیخوێنێ هەر کلام اللەیە هەر دەبێ بگوترێ ئەوە وتەی اللەیە کلام اللەیە نابێ بگوترێ قسەی قاریئێکە یان قسەی موحەمەدە (ﷺ) (لاَ كَلَامَ غَيْرِهِ) قسەی جگە لە الله نیە -جل شئنە- هەر بە کلام الله دادەنرێ (وَلا يَجُوزُ إِطْلَاقُ الْقَوْلِ بِأَنَّهُ حِكَايَةٌ عَنْ كَلَامِ اللهِ) ناشێ و ناگونجێ وەکو هەندێ تاقم و کۆمەڵ جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن بە ڕەهایی و بە موتڵەقی بڵێی کە قورئان کلام الله حیکایەت و گێڕدراوەیە لە الله تعالی (أَوْ عِبَارَةٌ) یان بڵێی دەربڕینێکە لە الله تعالی وە لەسەر زمانی جوبڕائیل و یان هەر کەسێکی تر نەخێر دەربڕین و کەلام و قسەکە بە حەقیقەت هەموی هی الله تعالی یە لە سەرەتاوە -جل شئنە- (بَلْ إِذَا قَرَأَهُ النَّاسُ أَوْ كَتَبُوهُ فِي الْمَصَاحِفِ) بەڵکو ئەگەر خەڵکانێک بیخوێننەوە قورئانی پیرۆز و بینوسنەوە لە موسحەفەکان و پەڕاوگە و پەرتوکەکان (لَمْ يَخْرُجْ بِذَلِكَ عَنْ أَنْ يَكُونَ كَلَامَ اللهِ تَعَالَى حَقِيقَةً) بەوەوە دەرناچێ لەوەی بڵێین کلام الله نیە بەڵکو هەر دەبێ بگوترێ کەلامی الله تعالی یە بە حەقیقەت و ڕاستی (فَإِنَّ الْكَلَامَ إِنَّمَا يُضَافُ حَقِيقَةً إِلَى مَنْ قَالَهُ مُبْتَدِئًا) چونکە کەلام و قسە ئیزافە دەکرێت و پاڵ دەدرێتە لای ئەو زات و کەسەی کە لە سەرەتاوە و لە دەستپێکەوە فەرمویێتی و قسەی پێکردبێ هەر دەگوترێ کلام الله (لاَ إِلَى مَنْ قَالَهُ مُبَلِّغًا مُؤَدِّيًا) بەڵکو ناگوترێ ئەگەر کەسێک ئەوەی ڕاگەیاند

کەلام و قسەکە یان گەیاندی یان جێبەجێی کرد بڵێن ئەو کەلامە هی ئەوە هەتا لە هی مەخلوق و دروستکراوەکانیش وایە، ئێستا من ئەو پەرتوکەی (الواسطیة) دەخوێنمەوە دەتوانم بڵێم ئەو پەرتوکە هی ئیسماعیلە؟ هەر جارێک من قسە دەکەم دەڵێم ابن تیمیة وای فەرموو، خۆ قسەکان ابن تیمیة ئێستا زیندو نیە ابن تیمیة نیە وا لێرە دانیشتوە و قسەتان لەگەڵ دەکا ئیسماعیلە بەڵام ئایە دەتوانین بڵێین (الواسطیة) هی ئیسماعیلە یان هی ابن تیمیەیە؟ کۆ دەنگین لەسەر ئەوەی هی ابن تیمیەیە ئەو نوسینەی لەو پەرتوکەدا هەیە قسەی ابن تیمیەیە کەواتە قورئانی پیرۆزیش تەشبیە نەبێ بۆ ئەوەی لە مێشکمان نزیک بێتەوە هی اللەیە کلام اللەیە پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) وە کلام اللەیە قاریئێک دەیخوێنێتەوە بەس کلام الله دەخوێنێتەوە لەناو مەسحەف نوسراوەیە و تەماشای دەکەین بەس کلام اللەیە کەواتە هەر خەڵک و کەسێک کە دەیخوێنێتەوە و دەریدەبڕێ و دەیگەیەنێ یان جێبەجێی دەکا کلام اللەیە لە کلام اللەیەتی دەرناچێ قورئانی پیرۆز (وَهُوَ كَلامُ اللهِ) قورئان کلام اللەیە وتەی اللەیە (حُرُوفُهُ) پیتەکانی (ومَعَانِيهِ) مانای پیتەکانیش (لَيْسَ كَلَامُ اللهِ الْحُرُوفَ دُونَ الْمَعَانِي) ناشێ و ناگونجێ بڵێین کلام الله تەنها پیتەکان هی اللەیە مانایەکان هی الله نیە نەخێر پیتەکان و مانایەکان هەموی هی اللەیە (وَلاَ الْمَعَانِيَ دُونَ الْحُرُوفِ) بڵێین مانایەکە هی اللەیە پیتەکان هی الله نیە وەکو ئەشعەری و ماتۆریدی وا دەڵێن دەڵێن کەلامی نەفسیە الله تعالى دەریبڕیوە لەجوبڕائیلەوە دەری بڕیوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) حەرف و پیتەکە کەواتە هی جوبڕائیلە یان (پەنا بە الله) هی پێغەمبەرە (ﷺ) نەخێر حەرف و پیت و سەوت هەموی هی الله تعالى یە مانایەکەی هی الله تعالى یە بەوەی لە خۆی دەوەشێتەوە الله -جل شئنە- ئینجا لە پاشان جوبڕائیل دەیگێڕێتەوە وە فەرمودەی اللەیە دەیڵێتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا پێغەمبەریش بە ئومەتەکەی گوتوە هەر فەرمودەی خوای رب العالمین ە.

ئەوە بیروباوەڕی ئەهلی سونە و جەماعەیە کە دەبیستریش لە خوای رب العالمین دەیەها بەڵگەمان لەسەری هێناوە لەپێشتر لەو ئایەتانەی کە ابن تیمیة -رحمه الله- لە (الواسطية) لە ڕابردوودا سەلماندی بە چەندین ئایەت کە الله تعالی خاوەن سیفەتی کەلامە، کەلامیش سیفەتێکی زاتیە و وە فیعلیە، زاتیە بە مەعنای هەر لە ئەوەڵ و سەرەتاوە الله تعالی -جل شئنه- توانیوێتی قسە بکا و خاوەن کەلام بوە وە لە هەموو کات و زەمانێکیش هەر کاتێک ویستبێتی توانیوێتی و دەتوانێ بدوێ و قسە بکا بەو مەعنایەی سیفەتی فیعلیە بۆی بەردەوام و بەبێ پچڕان هەر قسەی نەکردوە و بڵێ -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

جا موعتەزیلەکان و جەهمیەکان گوتیان قورئان مەخلوقە ئەهلی سونە و جەماعە یەکدەنگن لەسەر ئەوە دەیەها فەرمودە و فتوایان هەیە کە دەڵێن وشەی قورئان مەخلوقە کوفرییە لە ئیسلام دەرچونە هەر یەکێک وابڵێ و حوجەی لەسەر بکرێ و پەشیمان نەبێتەوە پێ کافر دەبێ لە ئیسلام دەردەچێ چونکە سیفەتێکی الله تعالی ی کردوەتەوە مەخلوق و بەدیهێنراو، هەر سیفەتێکی زات و کەسێکت کردە مەخلوق و بەدیهێنراو کەواتە زاتەکە و کەسەکەشت کردوەتە مەخلوق (پەنا بە خوای رب العالمین) ئینجا لە وەڵامی ئەوان ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئایە دەشێ و دەگونجێ بڵێین زاتی خوای رب العالمین مەخلوقە؟ هەمویان بە یەکدەنگی دەڵێن نەخێر نا، ئەی چۆن دەگونجێ بڵێی سیفەتەکەی مەخلوقە؟ کەواتە ئێمە بەخۆمان ئێمەی ئینسان مەخلوقین سیفەتەکانیشمان مەخلوقە بەڵام الله تعالی -جل شئنه- زاتی خالیقە چۆن دەشێ و دەگونجێ بڵێی سیفەتە زاتیەکانی الله تعالی یان بەگشتی سیفەتە بەرز و بەڕێزەکانی الله تعالی مەخلوقە؟ ناشێ و ناگونجێ و جائیز نیە و دروست نیە کە یەک لە سیفەتەکانیشی کەلامە هی الله تعالی.

جا وتەکانی الله تعالی یش ئەوەندە زۆرن لەبن نایەن ئەگەر هەموو دەریایەکان بکەیە مرەکەیە بۆ نوسینەوەی وشە و وتەکانی الله تعالی هەموو دەریاکان وشک دەکەن لەبن دێن بەڵام وتەکانی الله تعالی لەبن نایە چونکە الله بۆخۆی ئەوەلە وە بۆخۆی ئاخیرە الله

تعالى وە وتەكانیشی یەكجار زۆرن وە خاوەن كەلامە -جل شئنە- وەكو الله تعالى دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا﴾ [الكهف: ١٠٩] پێیان بڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەگەر هەموو دەریاكان بێنی بكەیە مرەكەب میداد یانی مرەكەب بۆ پێنوسێک و وتەكانی اللهی پێ بنوسیتەوە ئەوە بەحر و دەریاكان كۆتاییان پێ دێ وتەكانی خوای رب العالمین لەبن نایە و كۆتاییان پێ نایەت وە ئەگەر چەندین جاری تر ئەو مرەكەبانە و بەحر و دەریاكان ئاویان بێتەوە ناو و بەكاریان بێنیتەوە هەر لەبن دێن وتەكانی الله تعالى -جل شئنە- لەبن نایە.

**واجبە ئیمان بون بە بینینی الله تعالى لەلایەن بڕواداران لە ڕۆژی دوایدا:**

وَقَد دَّخَلَ أيْضًا فِيمَا ذَكَرْنَاهُ منَ الإيمَان بِه وَبِكُتُبِه وَبِمَلاَئكَتِه وَبِرُسُلِه: الإيمَانُ بِأَنَّ الْمُؤْمِنينَ يَرَوْنَهُ يَوْمَ الْقِيَامَة عيَانًا بِأَبْصَارِهِمْ كَمَا يَرَوْنَ الشَّمْسَ صَحْوًا لَيْسَ بِهَا سَحَاب، وَكَمَا يَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لاَ يُضَامُونَ في رُؤْيَته. يَرَوْنَهُ سُبْحَانَه وَهُمْ في عَرَصَات الْقيَامَة، ثُمَّ يَرَوْنَهُ بَعْدَ دُخُول الْجَنَّة؛ كَمَا يَشَاءُ اللهُ تَعَالى.

---

ئینجا دەگاتە سەر ئەوە ابن تیمیة -رحمە الله- كە بینینی الله تعالى یش بە چاوی سەر لەلایەن بڕوادارانەوە لە ڕۆژی دوایی و مەیدانی حەشر و حیساب وە هەم لە بەهەشت وە بەكورتی ئیختیلاف و جیاوازیەكانی ئەهلی سونە و جەماعەش باس لێوە دەكەین.

كە دەڵێ ئەوەش لە ئیمان و بڕوابونە بە خوای رب العالمین بە پەرتوكە ئاسمانیەكان بە فریشتەكان و بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەفەرموێ (وَقَد دَّخَلَ أيْضًا فِيمَا ذَكَرْنَاهُ منَ الإيمَان بِه وَبِكُتُبِه وَبِمَلاَئكَتِه وَبِرُسُلِه) جا داخیل بوە و دەچێتە ناو بازنەی ئیمان و بڕوابون بە الله و بە پەرتوكە ئاسمانیەكان و بە فریشتەكانی الله و بە پێغەمبەران و ڕەوانە كراوان (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەی باسمان كرد لە ڕابردو چیبوو؟ (الإيمَانُ بِأَنَّ الْمُؤْمِنينَ يَرَوْنَهُ) ئیمان و بڕوابون بەوەی كە بڕواداران الله دەبینن بە چاوی سەر (يَوْمَ الْقِيَامَة عيَانًا)

لە ڕۆژی دوایدا بە چاوی سەر بەبێ پەردە الله دەبینن -جل شئنە- (بِأَبْصَارِهِمْ) بە چاوەکانیان دەیبینن.

بۆ ئەو تەئکید کردنەوانە دەکا ابن تیمیة -رحمە اللە-؟ چونکە جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە هەندێک دەڵێن الله دەبینن بەبێ ئەبصار، چۆن دەیبینن؟ وەکو ئەشعەریەکان دەڵێن الله نە لە جیهەت دەیبینن وە نە بە بەصەر و بینین و چاوی خۆیانە، بەڵکو الله تعالی هێزێکی توانای بینین دروست دەکا لە مرۆڤەکان و لەناو چاویان بەوەوە الله دەبینن ئەوە بۆچونی زۆرێک لە ئەشعەریەکانە، بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن نا بە چاو الله دەبینن هەر بەو چاوەی خۆمان الله تعالی بە شێواز و هێز و توانایەکی ترەوە گشتی مرۆڤەکە بەدی دەهێنێتەوە و زیندوی دەکاتەوە لە مەیدانی حەشر و حیساب بۆ قیامەت، ئینجا ئەو هێز و توانایەی پێت دەبەخشرێ خۆڕاگرانە خۆڕاگر دەبی بە چاوی سەری خۆت الله تعالی دەبینی -جل شئنە- ئەوە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

(كَمَا يَرَوْنَ الشَّمْسَ صَحْوًا لَيْسَ بِهَا سَحَاب) هەروەکو خۆر دەبینن بڕوادار و بەندەکان و مرۆڤەکان ئەگەر هەور نەبێ ئەو ڕۆژە بە جوانی بەبێ هەور ئەگەر دونیا ساف و بێگەرد و ساماڵ بێ ڕۆژەکە ڕۆژ دەبینرێ بە چاوی سەر و بەبێ پەردە ئاواش الله تعالی دەبینن (وَكَمَا يَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لاَ يُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ) وە هەروەها لە شەوی چواردەی مانگدا مانگ چۆن دەبینن بە ئاشکرایی بەبێ ئەوەی (يُضَامُونَ) لە زمانی عەرەبیدا یانی بەبێ ئەوەی (یضم بعضها إلی بعض) پاڵ بدەنە لای یەکتر لە یەکتر بپرسن ئەرێ دیارە و کامەیە و ئەگەر بەجوانی و ڕێک و پێکی شتەکان دیاربێ لە دورەوە کەس پێویستی بە کەس نیە هانای بباتەبەر ئەرێ ئەو شتە دیارە دیار نیە؟ هەر کەس لە ڕاست و ئاستی خۆی بەبێ کێشە و گیروگرفت بەچاو شتەکە دەبینێ مانگی چواردە وایە وە ڕۆژیش شتەکە کە دەردەکەوێ و هەور نیە هەر وایە بەڵام ئەگەر شتێک لە شک و لە گوماندابی یان پەردەیەک هەبێ هەندێک کەس دەیبینێ و هەندێک نایبینێ خەڵکەکان چیدەکەن؟ پاڵ

دەدەنە لای یەكتر یەك دەچێتە لای یەك ئەرێ ئەوە دیارە و چۆنە؟ ئەویتر لەویتر دەپرسێ چۆنە؟ ئەو چونە پاڵ یەكە (يُضَامُونَ)ی پێ دەڵێن لە زمانی عەرەبی جا ابن تيمية وای هێناوەتەوە وەكو لە فەرمودەی پێغەمبەریش جێگیرە (ﷺ) دەفەرموێ وا الله دەبینن بە چاوی سەر بڕوادارەكان لە قیامەتدا هەروەكو مانگی چواردە دەبینرێ بەبێ ئەوەی كەسیان پێویستیان بە كەس بێ و پاڵ بدەنە لای یەكتر بۆ بینینەكە هەركەس لە ئاست و ڕاستی خۆیدا بە ئاسانی دەیبینێ و بڕوا دەهێنێ كە بینیوێتی (يَرَوْنَهُ سُبْحَانَهَ وَهُمْ فِي عَرَصَاتِ الْقِيَامَةِ) بڕوادارەكان بە چاوی سەر خوای پەروەردگاریان دەبینن لە عەرەساتی قیامەت، عەرەسات چیە؟ عەرەسات بە ساحە و گۆڕەپانێك كە بیناو هیچ شتێكی بەرز و نزمی تێدا نەبێ پان و پۆڕبێ شوێنەكە بەوە دەگوترێ عەرەسات لە زمانی عەرەبی، كەواتە مەیدانی حەشر و حیسابیش پان و پۆڕە بەرز و نزمی تێدا نیە بینای تێدا نیە لەبەر ئەوە ئاوا ناوی لێنراوە و دەهێنرێ، لەو شوێنە پان و پۆڕەی بێ بینا كە مەیدانی حەشر و حیسابە لە ڕۆژی دوایی بە چاوی سەر بڕواداران الله تعالی دەبینن ابن تيمية دەفەرموێ -رحمه الله- (ثُمَّ يَرَوْنَهُ بَعْدَ دُخُولِ الْجَنَّةِ) لە پاشان دوبارە كە چونە بەهەشتیش لە بەهەشتیش هەر الله تعالی دەبینن بە چاوی سەر (كَمَا يَشَاءُ اللهُ تَعَالَى) هەروەك الله بیەوێ و چۆن ویستی اللهی لەگەڵدابێ -جل شئنه-.

جا لێرە ئایە بینینی الله تعالی لە مەیدانی حەشر و حیسابدا بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعە ئیختیلاف و جیاوازیەكانیان چەندە و چۆنە؟ ابن القيم -رحمه الله- لە (حادي الأرواح)دا دەفەرموێ سێ بۆچون هەیە دەربارەی بینینی الله تعالی لە مەیدانی حەشر و حیسابدا، هەر سێ بیروبۆچونیش هی ئەهلی سونە و جەماعەیە دەفەرموێ:

بیروبۆچونی یەكەم لەگەڵ ئەوەدایە تەنها بڕواداران لە مەیدانی حەشر و حیسابدا الله تعالی دەبینن بەبێ پەردە وە بەبێ ئەوەی تەرجومانیان لە نێواندابێ گفتوگۆی لەگەڵ دەكەن قسەی لەگەڵ دەكەن وە دەشی بینن بە چاوی سەر، ئەوە تەنها بۆ بڕوادارە ڕێك و

پێکە ڕاستەقینەکانی ئەهلی سونە و جەماعەیە ئەوانەی دەرباز دەبن دەچنە بەهەشت و لە دۆزەخدا هەمیشەیی نابن.

بۆچونی دوەم دەڵێ کافر و بێ بڕواکان وە موناڧق و دەغەڵەکان لەگەڵ بڕواداران هەر سێ چینەکان (کە لەوانە بەدەر نین هەموو مرۆڤەکان لەو سێ چینەدا خۆیان دەبیننەوە) بە چاوی سەر الله تعالی دەبینن، ئەوە قیلە و زەعیفە و لاوازە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لە سەردەمیەکان والله أعلم شێخ عبد الله بن جبرين ئەوە بۆچونیەتی.

لە پاشان بۆچونی سێیەم دەربارەی بینینی الله تعالی لە مەیدانی حەشر و حیساب ابن القيم دەفەرموێ بۆچونیان وایە تەنها بڕوادارەکان و موناڧقەکان بە چاوی سەر الله تعالی دەبینن -جل شئنە- بەڵام کافرە ڕوت و سەدا سەدیەکان کە لە سەرەوە کافر بونە وە ئاوا ناسراون ئەوان الله تعالی نابینن، موناڧقەکانیش تەنها یەکجار و لەوێدا دەیبینن ئەوەش بۆیان دەبێتە نەوعێک لە عەزاب و حەسرەتێک ئینجا جارێکی تر نایبیننەوە الله -جل شئنە- وە بەدور دەخرێنەوە و ناچنە بەهەشت و دەچنە دۆزەخ موناڧقەکانیش ئەوەش بۆچونی کۆمەڵێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعەیە وە لە سەردەمیەکان عثيمينيش ئەو بۆچونەی هەیە - رحمە الله- ئەوە ڕاجیح و پەسەند دەکا والله أعلم بالصواب.

ئینجا ئایە ئەوانەی کە دەڵێن الله دەبینرێ -جل شئنە- بینینی الله تعالی لەلایەن کافر و بێبڕواکانیش و لەلای موناڧق و دەغەڵەکانیش و لەلای بڕوادارەکانیش هەر بەیەک شێواز بینینە؟ ئیختیلاف و جیاوازییان هەیە ئەوانیش، هەندێک دەڵێن بۆ ئیماندارن بینینێکی عادەتی و سروشتی و هەم تام و چێژیشە و نزیکبونەوەیە، وە بۆ موناڧق و بێبڕوا و کافرەکانیش بینینی عەزاب و ناخۆشیە یەعنی حەزیان بەو بینینە نیە سام و هەیبەت و گەورەیی الله تعالی یە ئەوەندەی تر عەزاب و ناخۆشی پێ دەبینن لەسەر ئەو بۆچونەی کە دەڵێن الله تعالی کەسە کافرەکان و موناڧق و دەغەڵ و بڕوادارانیش دەیبینن لە مەیدانی حەشر و حیسابدا، بەڵام لە بەهەشتدا تەنها بڕواداران دەیبینن.

ئایە چەند جار بڕواداران لە بەهەشتدا الله تعالى دەبینن؟ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا زۆرجار دەیبینن وە هەموو هەفتان لە هەینیەکان بڕوادارانی بەهەشتی لە خزمەت الله تعالى کۆدەبنەوە و دەیبینن وە ڕۆژانەش بەیانیان و ئێواران الله تعالى دەبینن وە هەشە پلەی زیاترە زیاتر دەیبینێ چونکە بینینی الله تعالى لە بەهەشتدا یەکێکە لە تام و چێژە زۆر بەلەزەتەکان (الله تعالى بە نسیبمان بکا و لێی بێ بەشمان نەکا)، گوتراویشە فەرمودەیەک هەیە هی پێغەمبەرە (ﷺ) لە تەفسیری ئەو ئایەتە الله تعالى فەرموی: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ﴾ [القيامة ٢٢-٢٣] ئینجا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) هەر ئومەتێک لە مەیدانی حەشر و حیسابدا شوێنی پەرستراوەکەی خۆی دەکەوێ (یەعنی هەر شتێکی لە دونیادا پەرستبێ شوێنی ئەو دەکەوێ) ئینجا ئەوەی ڕۆژ و خۆری پەرستوە شوێنی ئەو دەکەوێ وە ئەوەی مانگی پەرستوە شوێنی مانگ دەکەوێ وە ئەوەی طاغوتەکانی پەرستوە شوێنی طاغوتەکان دەکەوێ، ئومەتی من دەمێنێتەوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) الله تعالى لە وێنە و دیمەنێک بۆیان دێ کە حەقیقەت و ڕاستیەکەی خۆی نیە -جل شئنە- دەفەرموێ «أَنَا رَبُّكُمْ» من خوای پەروەردگاری ئێوەم «فَيَقُولُونَ : هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِينَا رَبُّنَا» ئەوانیش دەڵێن نا ئێمە جێمان ئێرەیە هەتا خوای پەروەردگاری ئێمە دێ چونکە ئێمە بە ناو و سیفەتەوە خوای پەروەردگاری خۆمانمان ناسیوە، ئینجا «فَيُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ» الله تعالى خۆی ئاشکرا دەکا و ساقی خۆی پێیان نیشان دەدا (ولله المثل الأعلى) «فإذا رأوه عرفوه فخروا سجدا إلا من كان منافقا لا يقدر على السجود[١]» (پەنا بە خوای رب العالمین) هەموو بڕوادارەکان ئا لەو کاتەدا دەکەونە کڕنۆش و سوجدە بۆ خوای رب العالمین و الله دەناسنەوە -جل شئنە- تەنها مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان ناتوانن بچنە کڕنۆش و سوجدە بۆ خوای رب العالمین ئەوە تەفسیری ئەو ئایەتەشە کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ﴾ [القلم: ٤٢] ئەو ڕۆژەی قاچ بەدیار

---

[١] **صحيح البخاري** (٧٤٣٩) (٢٢) (٤٤)، **صحيح مسلم** (١٨٢) (١٨٣) (١٨٤)، **سنن الترمذي** (٢٥٩٣) (٢٥٩٨) (٣١٤٨).

دەكەوێ و ساق بەدیار دەخسترێ و الله تعالى لەلایەن بڕوادارەكان دەناسرێتەوە بەڵام ئەوان دەیانەوێ (مونافق و دەغەڵ و دووڕووەكان) بچنە كڕنۆش و سوجدە بۆ الله بەڵام: ﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ ناتوانن: ﴿خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ﴾ [القلم: ٤٣] بە زەلیلی و زەبونییەوە چاویان ئەبڵەق دەبێ ناتوانن لەوێ كڕنۆش و سوجدە بۆ الله بەرن لەبەر ئەوەی لە دونیادا داوایان لێكرابوو كڕنۆش و سوجدە بۆ الله بەرن ئەوان وا دەمانەوە و خۆیان سەلامەت دەكرد و دور دەخستەوە لە كڕنۆش و سوجدە بردن بۆ خوای رب العالمين جا لەوێشدا كەواتە ناتوانن كڕنۆش و سوجدە بەرن بۆ خوای رب العالمين -جل شئنه- (ولله المثل الأعلى).

جا هەندێک لە تاقم و كۆمەڵەكان دەڵێن ئەی ئەوە نیە الله تعالى گوتویەتی: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ [الأنعام ١٠٣] چۆن دەتوانین ئێمە بڵێین الله دەبینرێ؟ ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن لێرە تەفسیرەكەی وا شیاو و گونجاوە لە مەعنای لوغەویشەوە وە بەڵگەكانی تریش زۆر زۆرن بە ئایەت و بە حەدیس كە دەیسەلمێنن الله تعالى -جل شئنه- بە چاوی سەر دەبینرێ: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ یەعنی ئیحاطەی ناكەن یەعنی ناتوانن موحیطبن بە الله تعالى بە بینینەكەیانەوە چونكە هیچ شتێک دەوری الله تعالى نادا -جل شئنه- بە مەعنای ئەوە نیە نایبینن بە چاوی سەر بەڵكو دەبینرێ بە چاوی سەر كە الله تعالى فەرموی: ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ [القيامة: ٢٣] وە ئەوانەی دەموچاو گەشاوە و بریسكاوەن لە بڕوادارەكان بە چاوی سەر دەڕواننە الله تعالى و دەیبینن (إِلَىٰ) ئەو مانایە دەگەیەنێ و لێی وەردەگیرێ.

جا هەتا ئێرە ابن تيمية -رحمه الله- باس و خواسی ناو و سیفەتەكانی الله تعالى ی كرد و بە دور و درێژی بۆ ئێمەی سەلماند، دائیمەن زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە لە سەردەمەكانی خۆیان كە پەرتوكێكیان دانابێ هەر ئاوا بە هەڕەمەكی دایان نەناوە دائیمەن ئەگەر هەر كێشەیەک لە سەردەمی خۆیان هەبوبێ زیاتر لەسەر ئەوە دوانە و قسەیان كردوە و وەڵامیان داوەتەوە، جا لە سەردەمی ابن قدامة المقدسي ش -رحمه الله- كە (لمعة

الاعتقاد)ی داناوە زۆر بایەخ بە ئەسماء و سیفات دەدا ئەو زانا بەرز و بەڕێزە چونکە لە سەردەمی ئەویش کێشە لە ئەسماء و سیفات هەبوە لەگەڵ تاقم و کۆمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە، لەسەردەمی ابن تیمیة ش هەروا بەردەوام بوە لەبەر ئەوە (الواسطية) کە زۆرێکی هەرە زۆری باس و خواسی ئەسماء و سیفاتە لێرەوە ابن تیمیة کۆتایی هێنا بە باس و خواسی ئەسماء و سیفات بەو دور و درێژیە باسی کرد سەرەتا ئایەتەکانی قورئانی هێنا و چەندین سیفەتی الله تعالى ی پێ جێگیر کرد لە دواتر حەدیس و فەرمودەکانی پێغەمبەری هێنا (ﷺ) چەندین سیفاتی الله تعالى ی پێ جێگیر کرد ئینجا ئەو ڕونکردەوانەی ئەم دواییەی وە لەم وانانەی ڕابردوو باسمان کرد کردی دەربارەی تێگەیشتن لە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)دەربارەی ئەسماء و سیفات.

## ئیمان بون بە فیتنە و عەزابی قەبر:

فَصْلٌ: وَمِنَ الإِيمَانِ بِالْيَوْمِ الآخِرِ الإِيمَانُ بِكُلِّ مَا أَخْبَرَ بِهِ النَّبِيُّ (ﷺ) مِمَّا يَكُونُ بَعْدَ الْمَوْتِ، فَيُؤْمِنُونَ بِفِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَبِعَذَابِ الْقَبْرِ وَنَعِيمِهِ. فَأَمَّا الْفِتْنَةُ؛ فَإِنَّ النَّاسَ يُمْتَحَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ، فَيُقَالُ لِلرَّجُلِ: مَن رَّبُّكَ؟ وَمَا دِينُكَ؟ وَمَن نَّبِيُّكَ؟

فيُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ، فَيَقُولُ الْمُؤْمِنُ: رَبِّيَ اللهُ، وَالإِسْلاَمُ دِينِي، وَمُحَمَّدٌ (ﷺ) نَبِيِّي. وَأَمَّا الْمُرْتَابُ؛ فَيَقُولُ: هَاه هَاه؛ لاَ أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ، فَيُضْرَبُ بِمِرْزَبَةٍ مِنْ حَدِيدٍ، فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا كُلُّ شَيْءٍ؛ إِلاَّ الإِنْسَانَ، وَلَوْ سَمِعَهَا الإِنْسَانُ؛ لَصُعِقَ. ثُمَّ بَعْدَ هَذِهِ الْفِتْنَةِ إِمَّا نَعِيمٌ وَإِمَّا عَذَابٌ، إِلَى أَنْ تَقُومَ الْقِيَامَةُ الْكُبْرَى، فَتُعَادُ الأَرْوَاحُ إِلَى الأَجْسَادِ.

---

ابن تيمية دەفەرموێ (فَصْل) بیروبڕوابون بە سوئال و جوابی قەبر وە عەزابی قەبر (وَمِنَ الإِيمَانِ بِالْيَوْمِ الآخِرِ) لە بازنەی ئیمان و بڕوابون بە ڕۆژی دوایی (الإِيمَانُ بِكُلِّ مَا أَخْبَرَ بِهِ النَّبِيُّ (ﷺ) مِمَّا يَكُونُ بَعْدَ الْمَوْتِ) بیروبڕوا و ئیمان بونە بە هەموو ئەوانەی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێداوە لەوەی کە ڕوودەدا و دەبێ لەدوای مردن (فَيُؤْمِنُونَ بِفِتْنَةِ الْقَبْرِ) ئەهلی سونە

و جەماعە بیروبڕوایان هەیە بە فیتنە و سوئاڵ و پرسیاری ناو گۆڕ (وَبِعَذَابِ الْقَبْرِ وَنَعِيمِهِ) بە ناخۆشی و ئازار و ئەشکەنجەکان وە بەخۆشی و ناز و نیعمەتەکانی نێو گۆڕ بیروبڕوایان پێ هەیە و ئیمانیان پێ هەیە (فَأَمَّا الْفِتْنَةُ؛ فَإِنَّ النَّاسَ يُمْتَحَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ) فیتنەی قەبر بە مەعنای سوئاڵ و پرسیاری ناو گۆڕ مرۆڤەکان و مەردومەکان لێیان دەپرسرێتەوە و پرسیاریان لێ دەکرێ لەنێو گۆڕ ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە (فَيُقَالُ للرَّجُلِ) بە پیاو و یان ئافرەتانیش دەگرێتەوە بە سیغەی تەغلیب هێناویێتی پێیان دەگوترێ (مَن رَّبُّكَ؟) کێیە پەروەردگارت؟ (وَمَا دِينُكَ؟) دین و ئاین و ڕێباز و بەرنامەت چیبوە؟ (وَمَن نَّبِيُّك؟) پێغەمبەرت کێبوە؟ (فيُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ) الله تعالی جێگیریان دەکا ئەوانەی بڕوادار بونە بە قسەی جێگیر بە وەڵامی تەواو هەم لە ژیانی دونیایان لەسەر ئیمان و بڕوا جێگیری کردون وە هەم لە ڕۆژی دوایی کە هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون مەبەستی پێ لەناو گۆڕە لە ڕۆژی دوایی و وەڵامدانەوەی فریشتەکانە لەو پرسیارانەی کە دەیکەن (فَيَقُولُ الْمؤْمِنُ: رَبِّيَ اللهُ) بڕوادار دەڵێ الله پەروەردگاری منە و بەدیهێنەرمە (وَالإِسْلاَمُ دِينِي) ئیسلام و ڕێباز و بەرنامەی ژیانی منە (وَمُحَمَّد (ﷺ) نَبِيِّي) وە موحەمەد پێغەمبەری منە (ﷺ) (وَأَمَّا الْمُرْتَابُ) ئەوانەی لە گوماندان شک و گومانیان لە دڵە و یان مونافقن و دەغەڵن (فَيَقُولُ: هَاه هَاه؛ لاَ أَدْري) دەڵێن هاها نازانم چیە وەڵامی پێ نادرێتەوە (سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ) من گوێبیستی خەڵکان بوم لە کۆڕ و مەجلیسەکان کە هەندێک جار قسەیەکیان دەکرد منیش دەمگوتەوە (فَيُضْرَبُ بِمِرْزَبَةٍ مِنْ حديدٍ) جا لێی دەدرێ (مِرْزَبَةٍ) کاتی خۆی لەنێو کوردەواری هەبوە و بینراوە و باسی لێ دەکرا ئەوانەی بە تەمەنبن ڕەنگە بزانن پێی دەگوترا تۆپز یەعنی ئەو تۆپزە پێی دەگوترێ (مِرْزَبَةٍ) لە زمانی عەرەبی میقرەعیشی پێ دەڵێن لە زمانی عەرەبی یەعنی سەری گەورەیە بەڵێ وە چەکوشی پێ دەگوترێ کە سەری گەورەبێ دەسکێکی هەبێ و بە دەست لە کۆتاییەکەی بگیرێ ئینجا بەرزکرێتەوە و لە شتی

بوەشێنرێ و لێبدرێ شتەکان ئەزیەت دەدا و ئازار دەدا و زەحمەتی پێ دەگەیەنێ بەو (مِرْزَبَةٍ) کە لە ئاسن دروستکراوە پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) لەو مونافق و دەغەڵ و دوڕوانە دەدرێت (فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا كُلُّ شَيْءٍ؛ إلاَّ الإِنْسَانَ) دەنگ و هاوارێکی لێ بەرز دەبێتەوە ئەو مونافقە ئەو گومان لە دڵە لە کاتی لێی دەدرێ هەموو کەس و شتەکان گوێبیستی دەنگەکەی دەبن تەنها مرۆڤەکان نەبن (وَلَوْ سَمِعَهَا الإِنْسَانُ؛ لَصُعِقَ) ئەگەر مرۆڤەکان گوێبیستی بن لە هۆش خۆیان دەچن لەگەڵ هاوار و دەنگی ئەو کەسەی لێی دەدرێ لەنێو گۆڕ (ثُمَّ بَعْدَ هّذِهِ الْفِتْنَةِ إمَّا نَعِيم وَإِمَّا عَذَاب) لەپاش ئەو پرسیارانەی لێی دەکرێ ئینجا یان گۆڕەکەی بۆ دەبێتە خۆشی و ناز و نیعمەت لەسەری فراوان دەبێ دەبێتە مێرگێک لە مێرگەکانی بەهەشت یان دەبێتە عەزاب و ناخۆشی و تەنگتر دەبێ لەسەری (إِلَى أَنْ تَقُومَ الْقِيَامَةُ الْكُبْرى) هەتا قیامەتی گەورە دادێ ئاوا لەناو گۆڕەکەی دەبێ (فَتُعَادُ الأَرْوَاحُ إِلَى الأجْسَادِ) جا ڕۆح و گیانەکانیش دەگەڕێنەوە بەر لاشە و جەستەکان جا عەزابی قەبر و خۆشی قەبریش بۆ ڕۆح و بۆ لاشە و جەستەشە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە.

کە ابن تیمیة -رحمه الله- کاتێک باسی بیروبڕوابون بە ڕۆژی دوایی دەکا یەکسەر باسی بیروبڕوابون بە هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی لەدوای مردن ڕودەدا چونکە سەرەتای قیامەت و ئاخیرەت سەرەتای دوارۆژ بە مردن دەست پێدەکا، هەتا گوتراوە هەرچەندە فەرمودەکە سەحیح نیە بە زەعیف دانراوە لەلایەن فەرمودە ناسان بەڵام واتاکەی ڕاستە دەفەرموێ: «من مات قامت قیامته» هەر یەکێک مرد و وەفاتی کرد قیامەتەکەی بەرپابوو.

جا ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێت لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە کە دەبێ بڕوامان هەبێ بەوەی لەدوای مردن ڕودەدا، لەدوای مردن چەند خاڵ و شتێک ڕودەدەن، یەک لەوانە پرسیارکردنی ناو گۆڕە، پرسیاری ناو گۆڕ کاتێ کە ڕودەدا ئایە ئەو پرسیارە

لە کوێ دەکرێ و چۆن ڕودەدا و وەڵامەکانیان چیە؟ پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکەین و باسی لێوەبکەین.

دیارە ئەو مرۆڤانەی کە دەمرن ابن تیمیة کە بە ناس ناوی بردون لێرە، کە بە ناس ناویان دەبا مەبەست لێی ئەوەیە کە مرۆڤەکان هەتا کافر و موسڵمان و بێ بڕوا و مونافق و دەغەڵیش بگرێتەوە نەک هەر تەنها موسڵمانان، ئایە ئەوانە فیتنە بە مەعنای پرسیار کردن لێیان لەنێو گۆڕدا توشیان دەبێ یان نا؟ چونکە دەفەرموێ (فَيُؤْمِنُونَ بِفِتْنَةِ الْقَبْرِ) (فِتْنَةِ الْقَبْرِ) چیە؟ یەعنی تاقیکردنەوە، تاقیکردنەوەی قەبریش بە مەعنای پرسیاری ناو گۆڕ دێ کە پرسیاریان لێ دەکرێ ئەو کەسە، ئایە ئەو پرسیارانە لە کوێوە دەکرێ؟ دەفەرموێ (فَأَمَّا الْفِتْنَةُ؛ فَإِنَّ النَّاسَ يُمْتَحَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ) دەفەرموێ مرۆڤەکان مەردوم پرسیاریان لێ دەکرێ لەناو گۆڕدا، جا لەبەرچی گوتی مەردوم؟ دەتوانین بڵێین وەکو زانایان دەفەرمون پێنج پۆل مرۆڤ هەن کاتێ کە ئینسان دەچێتە ناو گۆڕ و دەمرێ لەوانە (پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، صدیقەکان، شوهەداکان واتە شەهیدەکان، المرابطون ئەوانەی لە سەنگەر نشینیەوە وەفات دەکەن و دەگەڕێنەوە لای خوای رب العالمین، وە لەوانەش (من لا عقل لە) یەعنی هەیە شێتە و بە شێتێتی دەمرێ یان منداڵە و پێنەگەشتوە و باڵغ نەبوە دەمرێ) ئایە ئەوانە هەر هەمویان پرسیاریان لێ دەکرێ لەناو گۆڕ؟ دیارە هەڵوێستەی لەسەرە لەلایەن ئەهلی سونە و جەماعەوە کە دەفەرمون خەڵکی دابەش دەبێ لەڕوی ئیمان و بڕواهەبون و مونافقایەتی و کافربون بۆ سێ بەشی سەرەکی:

١. یان ئەوەیە مرۆڤەکان بڕوادار و موسڵمانی ڕاستەقینە و تەواون.

٢. یان مونافق و دەغەڵ و دوڕون.

٣. یان ئەوەیە کافرێکی سەدا سەدن.

جا ئەوانەی بڕواداری سەدا سەدن دیارە ئیختیلاف و جیاوازیەکی ئەوتۆ نیە لەلایەن زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە کە یەک دەنگی لەسەرە پرسیاری ناو گۆڕیان لێ دەکرێ

ئیلا هەندێكیان ڕەنگە لێ جیا دەكرێنەوە لەنێو موسڵمانەكان و بڕواداره ڕاستەقینەكانی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ)، كە صدیقەكان ئیختیلافی لەسەرە، وە شەهیدەكان زیاتر بۆچون لەسەر ئەوەیە كە جیا دەكرێنەوە، موڕابیطەكان، بەڵام ئەوانی تر ئەهلی سونە و جەماعە یەكدەنگن لەسەر ئەوەی بڕوادارە ڕاستەقینەكان پرسیاریان لێ دەكرێ.

جا مونافق و دەغەڵ و دوڕوەكانیش بۆچونی ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە لەگەڵ ئەوەدایە كە پرسیاریان لێ دەكرێ، بەڵام كافرەكانی سەد لە سەد كافرن ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە بەس ابن القيم الجوزية -رحمه الله- لە پەرتوكی (الروح) دەفەرموێ بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە لەگەڵ ئەوەیە ئەوانیش پرسیاریان لێ دەكرێ.

ئومەتەكانی پێش ئومەتی پێغەمبەریش (ﷺ) بە گشتی لە بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە وە بە كافر و بێ بڕواكانیشەوە بە مونافق و دەغەڵەكانیشەوە هەتا ئومەتی پێغەمبەریش (ﷺ) بە موسڵمان و بڕوادارەكانەوە ئیلا هەندێكی كەمیان نەبێ كە هەڵدەهێنجرێن و جودا دەكرێنەوە و ئێستا باسیان لێوە دەكەین ئەوانە هەموو پرسیاری ناو گۆڕیان لێ دەكرێ سێ پرسیارە سەرەكیەكە (مَن رَّبُكَ؟ وَمَن نَّبِيُّك؟ وَمَا دِينُكَ؟) واتە پەروەردگارت كێیە؟ پێغەمبەرت كێ بوە (ﷺ)؟ وە دین و ڕێباز و بەرنامەی ژیانت چیبوە؟ جا هەندێك لە زانایان بۆچونیان وایە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەڵهێنجراون پرسیاری ناو گۆڕیان لێ ناكرێ دەفەرمون لەبەر ئەوەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) كاتێ كە شەهیدەكان ئەگەر لێیان نەكرێ و بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە كە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «كَفَى بِبَارِقَةِ السُّيُوفِ عَلَى رَأْسِهِ فِتْنَةً[1]» كە لە پێغەمبەریان پرسیوە (ﷺ) ئایە شەهیدەكان ئەوانەی لەپێناو الله تعالى گیان لەسەر دەستن و گیان لە دەست دەدەن ئایە پرسیاری ناو گۆڕیان لێ دەكرێ و فیتنە و تاقیكردنەوەی ناو گۆڕ دەیان گرێتەوە؟

[1] سنن النسائي (٢٠٥٣).

پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) نەخێر بەسە بۆ ئەوان ئەو بریسکانەوەی شمشێر لەسەر سەریان کاتێک تاقیکردنەوە بۆیان و لێی ڕزگار بونە لەبەر ئەوەی گیان لەسەر دەست بونە و ئامادە بونە گیانی خۆیان بەختکەن لەپێناو خوای رب العالمین، واتە تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ شەهیدەکان ناگرێتەوە وە پرسیاریان لێ ناکرێ جا ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەگەر شەهیدەکان پرسیاریان لێ نەکرێ خۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەولاترە و لەجێترە کە پرسیاریان لێ نەکرێ چونکە پلەیان مەزنترە لە شەهیدەکانیش لەپێناو خوای رب العالمین.

لە پاشان بەڵگەیەکی تری ئەهلی سونە و جەماعە کە دەڵێن نابێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پرسیاری ناو گۆڕ و قەبریان لێ بکرێ دەڵێن لەبەر ئەوەی یەک لە پرسیارەکانی ناو گۆڕ و قەبر ئەوەیە دەڵێن (مَن نَّبِيُّك؟) پێغەمبەرەکەت کێ بوە؟ جا پێغەمبەرەکەت کێ بوە ئەوکاتە خۆ موحەمەد (ﷺ) بۆخۆی پێغەمبەری الله بوە (ﷺ) پرسیار دەربارەی خۆی لێی دەکرێ، بەڵێ ئەوە شتێکی سروشتی نیە تەبیعی نیە پرسیار دەربارەی خۆی لێی بکرێت و وەڵام بداتەوە لەبەر ئەوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «إنه أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ[1]» هەر پێغەمبەرە هەواڵی ئەوەی بە ئێمە داوە (ﷺ) دەفەرموێ وەکو نیگا و وەحی بۆمن هاتوە کە ئێوە تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ دەتانگرێتەوە و پرسیارتان لێ دەکرێ لەناو گۆڕەکەتان نەیفەرموو من پرسیارم لێ دەکرێ لەگەڵ ئێوە یان باسی خۆی کردبێ پێغەمبەر (ﷺ).

وە لە پاشان صدیقەکان صدیقەکانیش پرسیاریان لێ ناکرێ بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە لەگەڵ ئەوەدایە لەبەر ئەوەی پلەی صدیق لە شەهیدەکان بەرزترە، صدیق وەکو ئەبو بەکری صدیق کە سەد لە سەد دڵنیا بونە لە ئیمان و بیروبڕوایان تەسلیمی فەرمانەکانی الله بوە وە تەسلیمی فەرمانەکانی پێغەمبەر بوە (ﷺ) بەڕاستی زانیوە، جا بۆچونی ڕاجیح

[1] **صحيح البخاري** (٨٦) (١٨٤) (٧٤٥)، **سنن النسائي** (٢٠٦٢)، **موطأ مالك** (٥١٠).

و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە صدیقەکانیش پرسیاری ناو گۆڕیان لێ ناکرێ و تاقی ناکرێنەوە لەناو گۆڕدا، هەندێکی کەم لە زانایان بۆچونیان وایە صدیقەکانیش پرسیاریان لێ دەکرێ.

جا شەهیدەکانیش گوتمان و دەرمان خست لە هی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئەوانیش پرسیاریان لێ ناکرێ لەبەر ئەوەی لە مەیدانی جەنگ و جیهاد و گیان لەسەر دەستیەوە تاقی دەکرێنەوە کە شمشێر لەسەر سەریان بریسکە دەدات و لەو کاتەوە دەرکەوتوە ئەوان چەند بڕوادارن و لەسەر چ ڕێبازێکی چاکن و شوێنی پێغەمبەر کەوتونە (ﷺ).

جا لە پاشان موڕابیطون ئەو کەسانەی کە سەنگەر نشینن و لەسەنگەرەوە وەفات دەکەن و دەمرن لەپێناو خوای رب العالمين ئەوانیش بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە پرسیاری ناو گۆڕیان لێ ناکرێ وە تاقی ناکرێنەوە لەناو گۆڕ، لەبەر ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر فەرموی: «رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ» فەرموی شەو و ڕۆژێک خۆبەستان و لە سەنگەربوندا لەپێناو خوای رب العالمين چاکتر و باشترێکە لە ڕۆژوگرتنی مانگێک لەسەر یەک و شەو هەستانەوەی مانگێک لەسەر یەک و شەو زیندو کردنەوە «وَإِنْ مَاتَ جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُهُ» ئەگەر بمرێ لە سەنگەر نشینیەکەیدا ئەو عەمەل و کار و کردەوە چاکانە و خۆبەستنەکەی لەپێناو الله تعالى و سەنگەر نشینیەکەی بە بەردەوام خێرەکەی بۆ دەچێت و لێی نابڕێ «وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ» وە لە پاشان ڕزق و ڕۆزیەکەشی هەر بۆی دەچێ «وَأَمِنَ الْفُتَّانَ[١]» وە ئەمینیش دەکرێ وە ئەمانەتی دەدرێتێ لە (فُتَّانَ) بە مانای تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ دێ زانایان دەفەرمون، کەواتە ئەوەش بەڵگەیەکی ڕاشکاوانەیە لەسەر ئەوەی سەنگەر نشینەکان ئەگەر لەپێناو

[١] صحيح مسلم (١٩١٣)، سنن الترمذي (١٦٦٥)، سنن النسائي (٣١٦٧) (٣١٦٨).

خوای رب العالمین خۆیان ببەستن و لە سەنگەردابن ئەوە پلە و پایەی ئەو کەسانەیە کە پرسیاری ناو گۆڕیان لێ ناکرێ و توشی تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ نابن.

سەبارەت بە منداڵەکانی کە باڵغ نەبون یان شێتیش کە هەر بە شێتێتی دەمرێ ئایە ئەوانیش پرسیاری ناو گۆڕیان لێ دەکرێ؟ هەندێک لە زانایان فەرمویانە بەڵێ لێیان دەکرێ لەبەر ئەوە هەندێک لە زانایان دەفەرمون بەڵگەکان گشتین ئەوەی کە دەڵێ پرسیاری نێو گۆڕ دەکرێ لە مرۆڤەکان کەواتە ئەوانیش لە چینی مرۆڤن لەبەر ئەوە پرسیار لەوانیش دەکرێ، وە هەندێکیش لە زانایان بۆچونیان وایە دەفەرمون پرسیاریان لێ ناکرێ لەبەر ئەوەی ئەوان تەکلیفی شەرعییان لەسەر نیە، شێتێکی تەواو شێتی سەدا سەد تەکلیفی شەرعی لەسەر نیە، وە لە پاشانەکە منداڵیش هەتا باڵغ نەبێ و خۆی نەناسێ تەکلیفی شەرعی لەسەر نیە، جا کەسێک تەکلیفی شەرعی لەسەر نەبێ چۆن دەبێ پرسیاری لێبکرێتەوە و تاقی بکرێتەوە؟ لەو پێناوەدا کۆمەڵێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وایە کە دەفەرمون بەڵێ تاقیکردنەوەکەیان نابێت و پرسیاری ناو گۆڕیان لێ ناکرێت.

ئایە ئەوانەی ئەی لەناو گۆڕ نانرێن کەسانێک هەن کە پارچە پارچە دەبن ئێسک و پێست و پارچەیەکەیان نابینرێتەوە کەسانێک هەن دەکەونە دەریایەکان و ماسی و حوتەکان دەیانخۆن کەسانێک هەن کە دەمرن دەبنە خۆڵەمێش لەگەڵ سوتانی ئایە ئەوانە کە لەنێو گۆڕ دانانرێن هەر ئەوانە پرسیاریان لێ دەکرێت و تاقی دەکرێنەوە کە لەنێو گۆڕ دادەنرێن چونکە لە فەرمودەکانی پێغەمبەریش وا هاتوە (ﷺ) وە ابن تیمیەش لەوانی وەرگرتوە و لە دەقەکەیدا دەفەرموێ (يُفْتَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ) لەنێو گۆڕەکانیاندا پرسیاریان لێ دەکرێ و تاقی دەکرێنەوە؟ لە وەڵامدا ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون نا لەبەر ئەوەی غالیبەنما و زۆربەی جاران مردو کە دەمرێ لەنێو گۆڕ دادەنرێ ئاوا هاتوە وشەکە، ئەگەرنا ئەوەی لەنێو گۆڕیش دانەنرێ پارچە پارچەش بێ ببێتە خۆراکی ماسی و حوتەکانیش لە

دەریایەکان وە وەکو خۆڵەمێشیشی لێبێ هیچ پارچە و ئاسەوارێکی نەمێنێ لە لاشە و جەستەی ئیلا هەر ئەو تاقیکردنەوەی بەسەردێ مادەم لە چینی پێغەمبەران نیە (علیهم الصلاة والسلام) وە لە شەهیدەکان و صدیقەکان و مورابیطەکان نیە ئەوەش ئەو تاقیکردنەوە و پرسیاری وەکو ناو گۆڕی لێ دەکرێ لەدوای مردنەکەی چونکە مەبەست ئەوەیە کە کەسەکە بمرێ و بکەوێتە ژیانی بەرزەخی نێوان دونیا و قیامەتی ئەو پرسیارانە دەیگرێتەوە و لێی دەکرێ ئەوە بۆچونی پەسەند و تەواو و وە دروستی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

ئەو سێ پرسیارانە زۆر گرنگە هەر لە ئێستاوە کەواتە وەکو وەرگیراوە لە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی بۆ بەدەست بێنین، بە دڵنیاییەوە ئەگەر ئێمە پلەی شەهیدیمان بە نسیب نەبێ کە ناشزانین بە نسیبمان دەبێ یان نا؟ دۆعا دەکەین دەپاڕێینەوە لەبەر خوای رب العالمین الله بە نسیبمان بکا یا ڕەبی، بەڵام ئەگەر بە نسیبمان نەبوو؟ وە ئەگەر ئێمە لە چینی صدیقان نەبوین؟ ئەگەر موڕابیط نەبوین؟ ئەگەر لەو چینانە نەبوین خۆ پرسیاری ناو گۆڕ و قەبرمان لێ دەکرێ لە ئەگەری ئەوەدا کە لێمان دەکرێ پێویستە لە ئێستاوە ئێمە ئامادەباشی بۆ بکەین بە چاکی و بە جوانی وەڵامەکان بە دەست بێنین، چەند گرنگ و موهیمە پرسیارەکانمان بۆ ئاشکرا کراوە هی ئەو تاقیکردنەوەی لەناو گۆڕدا بەسەرماندا دێ، کە یەکەم پرسیار (مَن رَّبُكَ؟) پەروەردگارت کێیە -جل شئنە-؟ دەبێ پێناسەی بکەی ئەگەر لە دونیادا عیلم و زانستیت پەیدا نەکردبێ بە ناسینی الله تعالی بە کورتی و پوختی لایەنی کەم الله تعالی ت بە زات و ناوە زۆر جوانەکان و سیفاتە بەرزەکانیەوە نەناسیبێ بە دڵنیاییەوە لەوێ زمانت تێک دەئاڵێ و وەڵامت بەدەست نابێ، وە لە پاشان دوو مەرجی زۆر سەرەکی هەیە وەکو زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون کەسێک بتوانێ وەڵامی ئەو سێ پرسیارە بداتەوە لەناو گۆڕ، یەکەمیان دەبێ عیلم و زانستیەکەت هەبێ بە الله ناسی وە پێغەمبەر بناسی (ﷺ) وە بە ئاینی ئیسلام و بە ڕێبازی الله تعالی کە دینی

ئیسلامە، ئینجا لە پاشان دەبێ عەمەلی چاكیشت هەبێ كردەوەشت كردبێ بە عیلم و زانستیەكەت ئینجا پرسیارەكان دەتوانی وەڵام بدەیتەوە و وەڵامت بۆ دێ، ئەگەر عەمەلت نەبێ چەند عیلمیشت هەبێ وەكو شەیتانی ئیبلیسی نگریس ئەو كاتە كرداری نەكرد بە عیلمەكەی خۆی لێت قبوڵ نابێ و ڕەتكراوە دەبێ و عەزابی قەبر دەتگرێتەوە و وەڵامت بە دەست نایە، ئەگەر عەمەلیشت زۆر چاكبێ و بەڵام عیلمت نەبێ و بە عیلمەوە بایی ئەوەندەی كە الله لەسەری دانای اللهت نەناسیبوو -جل شئنە- دوبارە وەڵام بە دەست نابی، كەواتە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿فَٱعلَم أَنَّهُۥ لَا إِلَـٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ [محمد: ١٩] بزانە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) عیلمت هەبێ بە (لا إله إلا الله) كە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق و ڕەوا جگە لە الله، كەواتە عیلم پەیدا كردن بەوەی كە الله تعالی -جل شئنە- تاک و تەنهایە لە زاتیدا لە ناوە زۆر جوانەكانی لە سیفاتە بەرزەكانی وە دان پێداهێنانی پەروەردگاریەتی الله تعالی كە تاک و تەنهایە لە بەدیهێنان لە خاوەنیەتی و موڵک وە لە پاشان بەڕێوەبردن وە لە هەموو كار و كردارەكانی تاک و تەنهایە شەریک و هاوبەشی نیە وە دەبێ دان بنێین بە تەوحیدی ئولوهیە كە الله تعالی تاک و تەنهایە لە پەرستندا هەر ئەوە شایستەی ئەوەی بپەرسترێ هاواری لێبكرێ پشتی پێ ببەسترێ ئومێدت پێی هەبێ كە بتباتە بەهەشت و وەبەر ڕەزامەندی خۆت بگرێ زەرەر و زیانەكانت لەسەر لابدا ئا ئەوە هەر تەنها الله تعالی یە -جل شئنە- لە هەموو كەس و شتێكت زیاتر خۆشتر بوێ تەنانەت لە پێغەمبەریش (ﷺ) ئینجا لە پاشان ناو و سیفاتەكانی ئەوەی بۆخۆی بڕیاری داوە لە قورئانی پیرۆز یان پێغەمبەر (ﷺ) بۆی جێگیر كردوە لە فەرمودەی سەحیح و ڕاست و دروست ئەوە ئەو كاتە ئەگەر وا علیم و زانستیت پەیدا بوو كار و كردەوەشت پێ كرد وەڵام بە دەست دەبی لەناو گۆڕدا، كەواتە ئەوەندەی ئێمە لە سەرمانە بایەخ بدەین بە الله ناسی و بە پێغەمبەر ناسی (ﷺ) و بە ئاین ناسی زۆر زۆر زیاترە لەوەی كە بایەخ دەدەین بە شەهادە و بڕوانامەكانی دونیا چونكە بە دەیەها پرۆفیسۆری دونیا هەیە ڕەنگە زۆر زیرەكبێ لە دونیا پلەی

پڕۆفیسۆریەتیشی بڕیبێ چەندەها بەحسی نوسیبێ زیرەک و دانابێ بڕوانامەکانی هەموو بەدەست هێنابێ ئەوانەی هی دونیایە ڕەنگە لەنێو گۆڕدا لە وەڵامی فریشتەکان (پەنا بە الله) ئەوە بیگرێ و بڵێ (هَاه هَاه؛ لاَ أَدْرِي) نازانم زمانی تێک بئاڵێ بە زیرەکی نیە هەموو زمانی دونیا بزانێ کەسەکە هەموو بڕوانامەکانی ئەکادیمی بەدەست بێنێ مادەم اللەی نەناسیوە بە تەواوی پێغەمبەری نەناسیوە (ﷺ) ڕێبازی ئیسلامی نەناسیوە و دینی ئیسلامی نەناسیوە و کار و کردەوەی چاکی نەبوە ناتوانێ وەڵام بداتەوە قەبر و گۆڕەکەی لەسەر تەنگ دەبێ.

جا لە پاشان دەگەینە سەر ئەوەی ئایە لەناو گۆڕدا عەزاب و ئەشکەنجەکان وە خۆشی و فراوانی گۆڕ تەنها بۆ لاشەی مرۆڤە یان بۆ ڕۆح و گیانێتی بە تەنها یان بۆ هەردوکیانە پێکەوە ؟ گیانی ئینسان و ڕۆحی ئینسان و مرۆڤ چەند نەوعێک پەیوەندی هەیە لەگەڵ لاشە و جسمی مرۆڤ، جارێکیان ڕۆحی مرۆڤ لە سەرەتای لەناو سکی دایکی و کۆرپەلەیە نەوعێک لە پەیوەندی لەگەڵ لاشە و جسمی مرۆڤ هەیە، کە دێتە دەرەوە و لە سکی دایکی لە دایک دەبێ پەیوەندیەکان ئەو کاتە لاشە و جسمەکە سەرەکیە و ڕۆح و گیانەکە بە دوایەوەیە لە خۆشی و ناخۆشیەکان وە لە هەر هەموو بواری ژیان، ئەمجارە لەدوای مردنە و ژیانی بەرزەخییە ئەوکاتە ڕۆح و گیانەکە سەرەکیترە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لاشە و جەستەکە بەدوایەوەیە، بەڵام لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە ڕاجیح و پەسەندە کە خۆشی و ناخۆشیەکان وە بەرفراوانی قەبر و ناز و نیعمەتەکانی وە بەر تەنگی و ئەشکەنجە و عەزابی قەبر بۆ ڕۆح و گیانیشە بۆ لاشە و جەستەشە بەو شێوازەی کە خوای رب العالمین دەزانێ -جل شئنە- ئەوە شتێکی پەنهان و نادیار و غەیبیە دەبێ تەسلیم بین و بڕوامان پێی هەیە، باشە ئەگەر بڵێن چۆن دەبێ ئێمە تەماشا دەکەی ئەگەر دەڵێی قەبر فراوان دەبێ کوا قەبر بڕۆین هەڵی کۆڵین قەبرەکان هەر لە شوێنی خۆیەتی؟ ئەوە عەقڵی تۆ وا دەڵێ شتێکە غەیبیە زۆر شت هەیە عەقڵی تۆ نایخوێنێتەوە

ئەی لەوە دڵنیا نی خوای رب العالمین دەفەرموێ دوو فریشتەم لەسەر تۆ داناوە یەکیان چاکەت دەنوسێ یەکیان هەڵە و تاوانت لەسەر دەنوسێ؟ کوان فریشتەکان؟ خۆ هەردەم لەگەڵمانن بۆ تۆ بە چاوی سەر نایبینی؟ شتێکی غەیبە پەنهانە بەڵام بڕوامان پێی هەیە سەدا سەد چونکە الله فەرمویەتی -جل شئنه- پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ)، باشە ئەو عەقڵەی تۆ هەتە کە پێی دەنازی پێی جیا دەکرێیتەوە لە حەیوان و ئاژەڵ پێ جیا دەکرێیەوە لە شێت و گێل و نەفام خەڵکی خاوەن عەقڵ و هۆش و ژیری، عەقڵەکەت لەکوێیە؟ ئەو عەقڵە هەردەم لەگەڵتدایە تۆ هەتا عەقڵت هەبێ و لە دەستت نەدابێ ئایە عەقڵەکەی خۆت دەبینی؟ نەخێر نایبینی، ئەی عەقڵەکەت کە نایبینی ئایە عەقڵت نیە؟ بە دڵنیاییەوە عەقڵت هەیە، کەواتە زۆر شت هەیە هەر لە دونیاشدا الله تعالی مرۆڤی وا دروستکردوە شتی غەیبی و پەنهانن یان نادیارن یان تۆ بە ئاسانی نایبینی وە شتی بەرچاوی و هەستەوەری نین ئیلا ئاسەوار و شوێنەوارەکانیان هەندێک جار دیارە جا ئاوا عەزابی قەبر و وە نەعیم و خۆشیەکانی قەبریش بە هەمان شێوە ئاوا شتێکی غەیبیە و دەبێ بڕوات پێی هەبێ وە بەسەر مرۆڤەکان دێ بە دڵنیاییەوە، جاروبارێکیش ئەگەری ئەوەی هەیە وە دەگونجێ و بێشەرعیش نیە دەرچون نیە لە بازنەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەگەر هەندێک لە ئاسەوار یان شوێنەوار یان عەزاب و ناخۆشی و ئەشکەنجەکانی قەبر بۆ مرۆڤەکان لەسەر ڕوی زەوی ئاشکرا ببێ کەسێک ببینرێ یان گۆڕی هەڵبکەنەنرێ عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وایە جاروبارێک ئەگەر الله پیشانی بدا بۆ ئیمان بەهێزبونی بڕوادارانە وە بۆ ترساندنی کافر و بێ بڕوایانە، جا ئەگەر عەزابی قەبر و وە خۆشی قەبر تەواو ئاشکرابێ هەرچی چوو لە قەبر ئەو شتە غەیب و پەنهانانەی بینی ئەو ئەجر و پاداشتەی بیروبڕوا بە غەیبیات کە الله تعالی بۆی دیاری کردوین ئەوە نامێنێت ئەو تاقیکردنەوە نامێنێت هەموو کەسێک ئەو کاتە بڕوا دەهێنێ ئەو مەعنا و واتای تاقیکردنەوەکە لەجێی خۆی نابێ، هەر لەبەر ئەوەیە الله تعالی -جل شئنه- هەموی وا دانەناوە کە ئاسان ببینرێ.

ابن القيم دەفەرموێ ژیانی ناو ڕەحم و سکی دایکی کۆرپەلە کاتێک کە لەناو ڕەحمی دایکێتی بەرتەسکە، بەڵام ژیانی دونیا زۆر بەرفراوانترە لەو ژیانەی کە کۆرپەلەکە لەناو ڕەحم و سکی دایکێتی، وە ژیانی بەرزەخیش بە قەد ئەوە فراوانترە لە ژیانی دونیات، کە ژیانی دونیا چەند فراوانە بە قەد ژیانی ناو ڕەحمی دایکت کاتێ کە کۆرپەلەی یەعنی لەناو ڕەحمی دایکت زۆر بەرتەسکە ژیانەکەت یەعنی ناگاتە چەندەها سانتی مەترێک کە تۆ تێیدا دەژی و دەحەوێیەوە، جا کە دێیتە دونیا دونیا زۆر فراوانترە چەندەها هەزارەها کیلۆمەتراتە دونیا ملیۆنەها کیلۆمەتراتە دونیا زۆر بەرافراوانترە کە تێیدا دەژی، ابن القيم دەفەرموێ ژیانی بەرزەخیش هی دوای مردن کە دەچیە ناو ئەو ژیانە زۆر زۆر بەرفراوانترە لە ژیانی دونیا چۆن ژیانی دونیا چەند فراوانە بەقەد ژیانی نێو ڕەحمی دایکت و کاتی کۆرپەلەی ئاوا ژیانی بەرزەخی و دوای مردنیش ئەوەندە فراوانترە بەقەد ژیانی دونیا ئینجا ژیانی قیامەتیش دەفەرموێ ئەوەندە فراوانترە بەقەد ژیانی بەرزەخی، هێواش هێواش ژیانەکان فراوانتر دەبێ.

جا بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە کافر و بێ بڕواش تاقی دەکرێنەوە وە پرسیاریشیان لێ دەکرێ لەنێو گۆڕدا وە کاتی ڕۆح کێشانەکان هەردولا دەگرێتەوە بڕوادار و وە کافریش پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکدا ئاماژەی پێکردوە کە بەڕائی کوڕی عازب بۆمان دەگێڕێتەوە -رضي الله عنه- باس لە گیان کێشانی بڕوادار و کافر و بێ بڕوا دەکا کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «إِنَّ العبدَ المؤْمن إذا كان في انْقِطاعٍ من الدُّنْيا، وإِقْبالٍ من الْآخِرَةِ، نزل إليه من السَّماءِ ملائكةٌ بِيضُ الوجُوهِ» عەبد و بەندەکان کە نزیک ببنەوە لەوەی لە دونیا بچنە دەر و بەرەو قیامەت و ئاخیرەت بچن و سەرەمەرگ بچن فریشتە و مەلائیکەتانێک کە دەموچاویان سپیلکەیە لە ئاسمانەوە دادەبەزن بەسەریەوە «معهُمْ أَكْفانٌ من الجنَّةِ» کفنی بەهەشتییان پێیە «وحَنُوطٌ من الجَنَّةِ» بۆنی زۆر خۆشی لە میسک خۆشتریان پێیە لە بەهەشتەوە «ويجلِسُونَ مِنه مدَّ البصرِ» هەتا چاوی مردوەکە و مرۆڤەکان حوکم دەکا لە

دەوروبەری دادەنیشن ئەو جۆرە فریشتانە «ويأته ملك الموت» لە کۆتایدا فریشتەی گیان کێشان دێتە لای و سەری «فيقف عند رأسه» لەلای سەریەوە دەوەستێ و «ويقول أيَّتُها الروح الطَّيِّبةُ» پێی دەڵێ ئەی گیانی پاک و خاوێنی بۆن خۆش «كانت في الجسدِ الطيّب» کە لەناو لاشە و جەستەیەکی چاکی بۆن خۆش بوی «اخرُجي إلى رَوحٍ ورَيحان» وەرە دەرەوە وەرە بڕۆ لای خۆش و بۆن خۆشی «وربٍّ غيرِ غضبانَ» وەرە بڕۆ لای پەروەردگارێکی کە تورە نیە لێت «فتسل روحه من جسده كما تسل الشعرة من العجين» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئاوا گیانەکەی دێتە دەرەوە زۆر بە ئاسانی هەروەکو موو لەناو ئارد یان هەویر چەند بە ئاسانی ئەگەر پارچە مویەک دەربکێشرێ ئاوا بە ئاسان دێ یان لە ڕیوایەتی تر دەفەرموێ هەروەکو ئاو لە دەمی ئەگەر مەشکەیەک سەراو ژێرەوە هەڵواسرابێ یان دۆلکەیەک ئاوی تێدابێ شۆڕی بکەیتەوە چەند بە ئاسان لێی دادەبەزێ ئاوا بە ئاسان گیان و ڕۆحی بڕوادار دەکەوێتە دەستی فریشتەی گیان کێشان و ئەویش وەریدەگرێ «فإذا أخَذَها، لم تدَعها الملائكة في يَدِه طَرْفَةَ عَينٍ» ئەوەندەی چاو قوچانێکی فریشتەکانی تر لە دەستی فریشتەی گیان کێشان نایهێڵنەوە گیانەکەی لێی وەردەگرن «حتى يجعلوها في ذلك الحنوط وتلك الأكفان» هەتا وەریدەگرن لەو کفنە بەهەشتیانەی بۆیان هێناوە و دەیپێچن وە ئەو بۆنە خۆشەی حەنوطی لێ دەدەن کە خۆشترە لە بۆنی میسک «ثم يَصْعَدُونَ بها إلى السماء» لە پاشان هەڵی دەکێشن بەرەو ئاسمان «كلما مرُّوا إلى الملأ من الملائكة قالوا ما هذه الرُّوحُ الطَّيِّبةُ؟» بەلای هەر کۆمەڵێک لە فریشتەکان دەچن دەڵێن ئەو گیانە بۆنخۆشە چاکە هی کێیە؟ جا ئەوانیش لە وەڵامدا پێیان دەڵێن «فيقولونَ: فلانُ بنُ فلانٍ، بأحسَنِ أسمائِه» دەڵێن ئەوە گیانی فلانی کوڕی فلانە بە باشترین ناو ناوی دەبەن «التي كان يُسَمى بها في الدُّنْيا» کە لە دونیا ئەو ناوەی لێ نراوە «فيخرج منها كأطيب ريح وجدت على وجه الأرض» بۆنێکی زۆر خۆش کە لە بۆنە هەرە خۆشەکانی سەر ڕوی زەوییە لێی دێت و بۆن و بەرامەی دەڕوا «فإذا وصلوا بها إلى السماء وستفتحوا» لەپاش ئەوەی دەیگەیەننە دەرگای

ئاسمانی یەکەم و داوای بونەوەی دەرگای ئاسمانی لێ دەکەن ئینجا لە پاشان دەرگای لێ دەکرێتەوە و هەڵدەکێشرێ هەتا دەچێتە ئاسمانی حەوتەم و لە خزمەت الله تعالی ئینجا الله تعالی دەفەرموێ «ردوا روح عَبدِي إلى الأرضِ، فإنيِّ مِنها خَلَقتُهم، وفِيها أُعِيدُهُم، ومِنها أُخْرِجُهم تارةً أُخْرى[١]» دەفەرموێ بیبەنەوە ژێر زەوی و هەڵیدەنەوە بۆ زەوی و ناو گۆڕەکەی چونکە من ئەوانم لە گڵ و خۆڵی زەوی بەدی هێناوە وە دەیان گەڕێنمەوە بۆ ئەوێ جارێکی تر هەر لە زەویەوە زیندویان دەکەمەوە و دەریان دەهێنم لەناو گۆڕەکان.

ئینجا لە پاشان کە تەواو دەشاردرێتەوە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە جێگیرە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەدوای شاردنەوە و ناشتنی مردوەکان هەندێک جار فەرمویەتی «استغفروا لأخيكم ، و سَلوا له بالتثبيت» ئێوە داوای لێبوردن بۆ برا موسڵمانەکەتان بکەن وە داوا بکەن کە جێگیربێ لە وەڵامدانەوەی فریشتەکان «فإنه الآن يسأل[٢]» چونکە ئێستا ئەو پرسیاری لێ دەکرێ بە مەعنای لەدوای ئەوەی دەشاردێتەوە لەناو گۆڕەکەی (والله أعلم بالصواب)، جا فریشتەکانی پرسیار دەکەن یەکیان ناوی نەکیرە و ئەویتریان مونەکەر[٣] ئەگەر هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن جێگیریش نیە و نابێ ئەو ناوەیان لێ بنەێ بەڵام لەلای کۆمەڵێکی تریان جێگیرە و ئەو بەڵگانەی بۆ دەهێننەوە. ئەمجارە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی بەندە کافر و بێ بڕواکان دەفەرموێ: «وإنَّ العبدَ الكافرَ أو الفاجر إذا كان في انقطاعٍ من الدُّنيا وإقبالٍ من الآخرةِ نزلت عليه ملائكةٌ سودُ الوجوهِ» دەفەرموێ بەندە کافر و بێ بڕواکان یان گوناحکار و تاوان کارەکان ئەگەر لە دونیادا نزیک بوو بونەوە دەربچن و نزیک بوو بون بچنە قیامەت واتە گیانیان دەربچێ و بمرن فریشتانێکی دەموچاو ڕەشیان بەسەر دادەبەزێ «معهم أكفان من النار» کفنی دۆزەخی و ئاگریان بۆیان هێناوە «وحنوط من النار» حەنوطی ئاگرینیان بۆ هێناون لە یەک لە

[١] صحيح الجامع (١٦٧٦)، صحيح الجامع (١٦٧٦).
[٢] صحيح الترغيب (٣٥١١)، أخرجه أبو داود (٣٢٢١)، والبزار (٤٤٥)، والحاكم (١٣٧٢).
[٣] سنن الترمذي (١٠٧١) حديث حسن غريب، حكم الحديث: حسن، سنن النسائي (١٨٣٣)، سنن ابن ماجه (٤٢٦٢) (٤٢٦٨).

ڕیوایەتەکانی تر دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) مەسوحیان بۆ هێناوە، مەسوح دەڵێن زانایان وەکو پێستی ژوژک دڕکاوییە یانی ئەو ڕۆح و گیانەی لەناو وەر بئاڵێنن (پەنا بە خوای رب العالمين) الله بمان پارێزێ لە گوناحکارەکانی ئاوامان نەکا کە گیانمان دەکێشرێ زۆر زەحمەت و ناخۆشە، ئینجا دەفەرموێ «فيجلِسون منه مدَّ البصرِ» ئەو فریشتە دەموچاو ڕەشانەی کە کفنی دۆزەخیان بۆ هێناوە وە مەسوحیان بۆ هێناوە هەتا چاوی حوکم دەکا لە دەوروبەری دادەنیشن «فيأتيه ملَكُ الموتِ» ئینجا دوایی فریشتەی گیان کێشان دێتە لای «ويقولُ: اخرجي أيَّتها الروح الخبيثةُ» وەرە دەرەوە و دەربچۆ ئەی گیان و ڕۆحی پیس «كانت في الجسدِ الخبيثِ» لە لاشە و جەستەیەکی پیس بوو «فتتفرق رُوحه في جسده» جا لەوێ گیانەکەی پەرت دەبێ بەناو هەموو لاشە و جەستەی دەیەوێ نەیەتە دەرەوە دەزانی ئاخر لەحزە و چرکەیەتی تەواو ژیان و تاقیکردنەوە و هەموو هەلەکانی ژیانی لە دەست چوە، ئینجا لە پاشان «فينتزعها كما ينتزع السَّفُّود من الصُّوف المبلول» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) فریشتەی گیان کێشان کە (ملك الموت)ە دەست و چنگ لە ڕۆح و گیانەکەی گیر دەکا دەری دەکێشێ هەروەکو چۆن ئاسنێکی دور و درێژ ئەگەر قولابەی هەبێ و گەرم کرابێ لەنێو خورییەکی وەڵئانرابێ و ئاوی پێداکرابێ خوریەکە تەڕبێ چەند بە زەحمەتی لێک دەبێتەوە موو لەگەڵ خۆی رادەکێشێ ئاوا بە زەحمەتی و ناخۆشی گیان و ڕۆحی ئەو کافرە دەردەکێشرێ یان هی ئەو گوناحکار و تاوانکارە «فإذا أخَذَها لم يَدَعُوها في يدِه طَرْفَةَ عينٍ» ئەوەندەی چاو قوچانێک فریشتە دەموچاو ڕەشەکان ناهێڵن گیانی ئەو کافرە یان ئەو تاوانکارە لە دەستی فریشتەی گیان کێشان بمێنێتەوە و لێی وەردەگرن «حتّى يجعَلوها في تلْكَ الأكفان وذلك الحنوط من النار» هەتا دایدەنێن لەناو ئەو کفنە دۆزەخیە وە لەناو ئەو بۆنە ناخۆش و یان مەسوحە جەهەنەمیەی و ئاگریەی «ويخرج منها كأنتن الريح وجدت على وجه الأرض» ناخۆشترین بۆنی بۆگەنی لێدێ کە بۆنی بۆگەنی وەها زۆر ناخۆش کەم و دەگمەن بێ لەسەر ڕوی زەوی ناخۆشترین بۆن چیە لە بۆگەنی و گەندەڵی ئەو بۆنەی

لێ دێ «فيصعدون بها إلى السماء» هەڵی دەكێشن بەرەو ئاسمان «كلما مروا على الملائكة قالوا: ما هذه الروح الخبيثة؟» بەلای هەر پۆلە مەلائیكەت و فریشتەیەكدا دەڕۆن دەڵێن ئەو ڕۆح و گیانە پیسە هی كێیە؟ پێتانە «فيقولون: الروح فلان بن فلان» دەڵێن گیان و ڕۆحی فلانی كوڕی فلانە پێیانە «بأقبحِ أسمائه الَّتي كان يُسمّى بها في الدُّنيا» بە ناخۆشترین و ناشرینترین ناو كە لە دونیادا ناوی پێ دەركردبوو ناوی لێ ترابوو «فإذا وصلوا إلى السماء لن تفتح لها» كاتێك دەگەنە ئاسمانی دونیا دەرگای ئاسمانی لێ ناكرێتەوە «يقول الله تعالى» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) الله تعالى دەفەرموێ: ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلۡخِيَاطِ﴾ [الأعراف: ٤٠] الله تعالى فەرموی دەرگای ئاسمانەكانیان لێ واڵا ناكرێ و نابێتەوە وە ناچنە بەهەشت مەگەر هەتا حوشتر بە كونی دەرزیدا نەڕوا حوشتر بە كونی دەرزی قەتاوقەت ناڕوا كەواتە قەتاوقەت ئەوانیش ناچنە بەهەشت «فتُطرَحُ روحُه طرحًا» جا الله تعالى فەرمان دەكا و گیانەكەی هەڵ دەدرێ و فڕە دەدرێ بە فڕەدانێك كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتەی خوێندەوە لەو كاتە: ﴿وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٖ سَحِيقٖ﴾ [الحج: ٣١] هەریەك شیرك و هاوبەشی بۆ الله پەیدا بكا وەكو ئەوە وایە لە ئاسمان هەڵدرێتە خوارەوە و بكەوێ تەیر و باڵندەكان بیگرنەوە و ئینجا ئەوانیش دایبەزێنن یان فڕەیبدەن: ﴿أَوۡ تَهۡوِى بِهِ ٱلرِّيحُ﴾ یان با و هەوا بیهێنێ و بیبا گیانەكەی فڕەی بدا لە شوێنێكی دور ئاوا دێتەوە بەر لاشەكەی و ڕۆحەكەی «فتُعادُ روحُه في جسدِه» ئاوا بە زەحمەتی و ناخۆشی هەڵدەدرێتەوە ناو گۆڕەكەی و دەكەوێتەوە بەر لاشەی ئەو گیان و ڕۆحە «ويأتيه ملَكان فيُجلسانه فيقولان له» دوو فریشتە دێنە سەری دایدەنێن یەكیان مونكەرە یەكیان نەكیر گوتمان هەندێك لە زانایان دەڵێن نابێ ئەو ناوانە ناوی فریشتەكان بێ چونكە ناوەكان ناوی شیاو و گونجا و خۆش نین بەڵام بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە چونكە بە بەڵگەی فەرمودەی سەحیح جێگیرە دەگوترێ و ئاساییە لەبەر خراپەی

مەلائیکەتەکان نیە بەڵکو لەبەر ئەوە وایە کە مرۆڤەکان لێیان دەترسێن ئینکارییان دەکەن حەز دەکەن نەیان بینن ئەو پرسیارانەیان لێ نەکرێ تاقیکردنەوەیە لەو پێناوە ئەو ناوەیان لێ نراوە، ئایە ئەو فریشتانە ئەو فریشتانەی سەر شانمانن یان فریشتەی نوێن و هەر یەک لە مردوەکان فریشتەیەک دوو فریشتەی نوێ دەچێتە سەری؟ ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون دەشێ و دەگونجێ شتەکە غەیبیە هەریەک لە مرۆڤەکان دوو فریشتەی لە نوێ بچێتە سەریان و فریشتەکانی سەر شانیان نەبن هەندێکیش دەفەرمون فریشتەکانی سەر شانی مرۆڤەکانن، ئینجا دایدەنێن لەنێو گۆڕەکەی و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن «من ربُّك؟» کێ بوو پەروەردگارت؟ پرسیاری یەکەم چەند زەحمەت و ناخۆشە لەنێو ئەو گۆڕە تەنگەی بە تاق و تەنها کەس و شتێک دێتە سەرت کە لە ژیانتدا نەت بینیوە فریشتە خۆی لە خۆیدا سام و هەیبەتی هەیە، ئینجا «وما دينُك؟» دین و بەرنامە و ڕێبازی ژیانت چیبوو؟ «وَمَن نَّبِيُّك؟» پێغەمبەرەکەت کێبوو؟ «فيقولُ هاه هاه لا أدري» دەڵێ نازانم زمانی تێک دەئاڵێ، ئینجا لە پاشان «فيقول فيقال لا دريت ولا تليت فَيُضْرَبُ بِمِرْزَبَةٍ مِنْ حديدٍ» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) پێی دەڵێن جا باشە نەتزانی (چۆن ئێمە بڵێینە کەسێک کە پرسیارەکە و وەڵامەکەی نەزانێ پێی بڵێین باشە دەی باش یان چاوت دەربێ) کە پرسیارەکەت نەزانی ئاوا فریشتەکان پێی دەڵێن دەباشە هەر نەتزانی چونکە نەتخوێندەوە و وازبێنە لەوەی لێی دەدەن بە میرزەبەیەک، میرزەبە یەعنی وەکو تۆپز وایە سەری ئەستور و خڕکرابێتەوە سەریەک وە قوڵپەکەی ئەوسەری کە بە دەست بگیرێ باریکبێ، میطرەقیشی پێ دەڵێن لە زمانی عەرەبی لە هەندێک لە ڕیوایەتەکان وا جێگیر بوە، ئینجا بەوە فریشتەکان لێی دەدەن لە نێو چاوانی یان لە تەوقی سەری دەدەن کە لە ئاسن ئەوە دروستکراوە (پەنا بە خوای رب العالمين) «وذكر ثقلها وعضمها» وە باسی قورسایی دەکرێ وە باسی گەورەیی ئەو تۆپزە دەکرێ کە لێی دەدرێ «فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا كُلُّ شَيْءٍ؛ إلاَّ الإِنْسَانَ» هاوار و دەنگێکی لێ هەڵدەستێ ئەو مردوە هەموو کەس و شتێک گوێی لێ

دەبێ تەنها مرۆڤ و ئینسانەكان نەبێ «وَلَوْ سَمِعَهَا الإِنْسَانُ؛ لَصُعِقَ» ئەگەر مرۆڤەكان گوێبیستی بوبان پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) لەهۆش خۆیان دەچون.

جا كەواتە یەک لە حیكمەت و كارلەجێیەكانی الله تعالى كە مرۆڤ گوێی لێ نەبێ ئەوەیە هەتا لە هۆش خۆیان نەچن، ئینجا یەكێكی تر لە حیكمەتەكان ئەوەیە هەتا مردوەكە نهێنی پارێزراوبێ ئەوە ڕەحم و بەزەیی خوای رب العالمین ە لەگەڵی، یەكێكی تر لە حیكمەتەكان زانایان دەفەرمون لەوانە عثيمين -رحمه الله- دیاری كردوە كە ئەویش دەڵێ ئەوەیە هەتا خزم و كەسی مردوەكە پێیوە نەشكێنەوە وە دڵ غەمگین نەبن چونكە ئەگەر بزانن ئەو دەنگە گوێبیست بن لە مردوەكەی خۆیان هەردەم دڵیان تەنگ دەبێت و پێی سەرشۆڕ و شەرمەزار دەبن لەنێو خەڵكیدا، وە یەكێكی تر لە حیكمەتەكەی ئەوەیە هەتاوەكو خەڵكەكان بە هیلاک نەچن و لەناو نەچن چونكە هەندێک جار هەیە لەخۆی دەچێ هەیە ڕەنگە گیانی پێ لە دەست بدا لە ترسان، وە یەكێكی تر لە حیكمەتەكان ئەوەیە كە هەتا نهێنی پارێزراوبێ غەیب بێ ئەجر و پاداشت و تاقیكردنەوەكان چاكتر و لەجێ بێ ئێمە ئیمان و بڕوامان بە شتە غەیبیەكان هەبێ، لەو پێناوانەدایە كە مرۆڤەكان گوێبیستی عەزابی ناو گۆڕ نابن هەروەكو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «لولا أن لا تدافنوا لدعوتُ اللهَ عزَّ وجلَّ أن يُسمِعَكم من عذابِ القبرِ[1]» ئەگەر بێو ژێر گڵ نەبا و وە دەفن كردنی مردوەكان نەبا من داوام دەكرد لە الله تعالى واتان لێبكا گوێبیستی عەزابی و ئەشكەنجەكانی مردوەكانی ناو گۆڕبن.

جا لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە فەرمودەكەی بەڕائی كوڕی عازب دەفەرموێ «ثم يُضيَّقُ عليه قبرُه حتّى تختلِفَ أضلاعُه» لە پاشان گۆڕەكە لەسەر مونافقەكان و كافر و بێ بڕواكان ئەوەندە تەنگ و تەسكتر دەبێتەوە لەخۆی هەتا پەراسوەكانی لە یەک تیز و فیز

[1] السلسلة الصحيحة | الصفحة أو الرقم : ١٥٨ | خلاصة حكم المحدث : إسناده صحيح | التخريج : أخرجه مسلم (٢٨٦٨) مختصرا.

دەبن، بە مەعنای ئەو کۆڵەکەی سینگی زانایان دەفەرمون لە هەندێک ڕیوایەتی تری فەرمودەکەش پێغەمبەر جێگیربوە (ﷺ) دەشکێ وە پەراسوەکانی ئاوا لێک تیز و فیز دەبن بەناو یەکدا دەڕۆن «ويُفتح له بابٌ إلى النارِ» دەرگایەکیش بۆی دەکرێتەوە هەر لەناو گۆڕەکەی لە ئاگری دۆزەخەوە «ويأتيه من حرّها وسمومها» ناخۆشی و تیشک و گەرمایی ئاگری دۆزەخ لەو دەرگایە بۆی دێ «ويقولُ ربِّ لا تُقِم السّاعةَ[1]» دەپاڕێتەوە و دەڵێ ئەی الله تعالى قیامەتم لێ دامەهێنە ئەوە وا جەهەنەم دەبینم ئەو ناخۆشیەی قەبر زۆر ناخۆشە بەڵام هێشتا لە هی جەهەممەم ئاسانترە و سوکترە.

جا گۆڕ و قەبر لەسەر بڕواداران دەبێتە مێرگێک لە مێرگەکانی بەهەشت فراوان دەبێ ژیانی تێدا خۆش دەبێ، وە بۆ کافر و بێ بڕواکانیش دەبێتە قۆرتێک لە قۆرتەکانی ئاگری دۆزەخ، ئینجا لە پاشان ئەو کەسە کە لەناو گۆڕدا دەمێنێتەوە ئایە کافر و بێ بڕوا یان ئەوانەی عەزاب دەدرێن بە بەردەوامی عەزابەکە لەسەریانە؟ لە عەقیدە و بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعە بەڵێ کافر و موشریکەکان بە بەردەوامی عەزاب و ئەشکەنجەیان دەدرێ لەناو گۆڕدا، تەنها بڕوادارەکان بە قەد گوناحەکان و تاوانەکانیان عەزاب و ئەشکەنجە دەدرێن هەندێک جار الله تعالى لێیان دەبورێ لێیان خۆشدەبێ لەسەریان سوک دەکا دۆعا و پاڕانەوەی زیندوەکان بۆیان کاریگەری دەبێ لەسەریان یان سەدەقە و خێر و چاکەکان بەڵام بۆ کافر و بێ بڕوا و موشریکەکان بە بەردەوامی عەزاب و ناخۆشیەکان دەبینن، یەک لە بەڵگەکان ئەوەیە کە فیرعەون و دار و دەستەی الله تعالى بە ڕاشکاوانە لە قورئان تۆماری کرد دەفەرموێ: ﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗا﴾ [غافر: ٤٦] الله تعالى سەبارەت بە فیرعەون هەر بە ڕاشکاوانەتر دەفەرموێ فیرعەون و ئالی فیرعەون بخەنە ناو ئاگر یان بەیانیان و ئێوارانیش بەو مانایەی بە بەردەوامی لە

[1] **حديث البراء بن عازب الطويل أخرجه أبو داود رقم (٤٧٥٣) كتاب السنة، وأحمد في المسند (٤ / ٢٨٧، ٢٨٨، ٢٩٥، ٢٩٦)، والطيالسي في المسند رقم (٧٥٣)، وهو حديث صحيح: صححه غير واحد من الأئمة كالذهبي وأبي نعيم وابن القيم وغيرهم.**

عەزاب و ئەشکەنجەدا دەبن کافر و بێ بڕواکان، بەڵگەکان زۆرن بەڵام لەبەر کەمی کات دەمانەوێ تەواو بە (العقيدة الواسطية) ڕابگەین هەر ئەوەندە دەڵێین یەک لە بەڵگەکانی کە جێگیربونی پرسیارەکانی ناو گۆڕی پێ دەبێ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و وە خۆشی و ناخۆشیەکانی ناو گۆڕی پێ دەبێ ئەو ئایەتەیە کە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ [إبراهيم: ٢٧] جا زانایان دەفەرمون: ﴿وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ئەوە بۆچونی ڕاجیح و پەسەندە (والله أعلم) کە مەبەست پێی نێو گۆڕ و قەبرە نەک مەبەستنی پێی هاتنی قیامەتە الله تعالى بڕوادارەکان جێگیر دەکا لەنێو گۆڕ و قەبر هەروەکو لە دونیا جێگیری کردبون لەسەر ئیسلام و ئیمان کە بە دەستی خۆیان ڕێگای هیدایەت و ڕێنوێنیان هەڵبژاردبوو.

### ئیمان بون بە قیامەت و دوارۆژی مەزن و گەورە:

وَتَقُومُ الْقِيَامَةُ الَّتِي أَخْبَرَ اللهُ بِهَا فِي كِتَابِهِ، وَعَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ، وَأَجْمَعَ عَلَيْهَا الْمُسْلِمُونَ. فَيَقُومُ النَّاسُ مِنْ قُبُورِهِمْ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً، وَتَدْنُو مِنْهُمُ الشَّمْسُ، وَيُلْجِمُهُمُ الْعَرَقُ. فَتُنْصَبُ الْمَوَازِينُ، فَتُوزَنُ بِهَا أَعْمَالُ الْعِبَادِ، ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ﴾ [المؤمنون: ١٠٢-١٠٣]. وَتُنْشَرُ الدَّوَاوِينُ، وَهِيَ صَحَائِفُ الأَعْمَالِ، فَآخِذٌ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ، وآخِذٌ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ أَوْ مِنْ وَّرَاءِ ظَهْرِهِ؛ كَمَا قَالَ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا * اقْرَأْ كَتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾ [الإسراء: ١٣-١٤].

---

جا دەگەینە سەر ئەوەی ابن تيمية -رحمه الله- ئێنجا دێ باسی قیامەت و دوارۆژی مەزن و گەورەمان بۆ دەکا کە دەفەرموێ (وَتَقُومُ الْقِيَامَةُ الَّتِي أَخْبَرَ اللهُ بِهَا فِي كِتَابِهِ) بەرپا دەبێ و دێتەجێ و ڕوودەدا ئەو قیامەت و دوارۆژەی کە الله تعالى لە پەرتوکەکەی کە قورئانی پیرۆزە هەواڵی پێداوە (وَعَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ) وە لەسەر زمانی پێغەمبەر و ڕەوانەکراوەکەی کە موحەممەدە (ﷺ) هەواڵی پێداوە (وَأَجْمَعَ عَلَيْهَا الْمُسْلِمُونَ) وە موسڵمانانیش کۆ دەنگن

لەسەر هاتن و بەرپابونی ئەو قیامەت و دوارۆژە (فَيَقُومُ النَّاسُ مِنْ قُبُورِهِمْ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) مرۆڤەکان و مەردوم زیندوو دەبنەوە و هەڵدەستنەوە لە قەبر و گۆڕەکانیان بۆ خزمەتی الله تعالى ی جیهانیان (حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً) ئەوانە (حُفَاةً) یەعنی بە پێ خواسی (عُرَاةً) یەعنی بە ڕوت و قوتی شمەک و جل و بەرگیان لەبەر نیە (غُرْلاً) بەبێ خەتەنەکراوی بەبێ سونەت کراوی (وَتَدْنُو مِنْهُمُ الشَّمْسُ) وە خۆر لەسەریان نزیک دەبێتەوە (وَيُلْجِمُهُمُ الْعَرَقُ) وە ئارەقەی گوناح و تاوانەکان هەندێک جار دەیانگرێتەوە لەیەک لە فەرمودەکان دەفەرموێ هەتا گۆزینگیان پێغەمبەر (ﷺ) هەیە دەڵێ هەتا ئەژنۆی و هەیە هەتا ناوقەد و ناوکی و هەیە هەتا سەر شانەکانی و هەیە هەتا سەر گوێچکەکانی دەکەوێتە ناو ئارەقەی تاوان و گوناح، لە پاشان دەفەرموێ (فَتُنْصَبُ الْمَوَازِينُ) ئینجا لە مەیدانی حەشر و حیسابدا میزان و تەرازوو دادەنرێ (فَتُوزَنُ بِهَا أَعْمَالُ الْعِبَادِ) کردەوەکانی بەندەکانی الله ی پێ وەزن و کێش دەکرێ ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە و تۆماری کردوە ابن تيمية لە پەرتوکەکەی کە الله تعالى فەرموی: ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ هەریەک لە بڕواداران کە پێ تەرازوی خێر و چاکەی قورس بوو لەسەر شەڕ و تاوان و گوناحەکانی ئا ئەوانە بەڕاستی الله دەفەرموێ براوەن سەرفرازن: ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ﴾ [المؤمنون: ١٠٢- ١٠٣] هەر کەسێکیش کە تەرازوە شەڕەکەی قورس تر بێ یان تەرازوە خێرەکەی سوک بێ ئا ئەوانەن کە زەرەریان هەڵبژاردوە بۆخۆیان وە ئەوانە لەنێو ئاگری دۆزەخ کە کافر و بێ بڕواکانن هەمیشەین، چونکە ئیختیلاف و جیاوازی هەیە ئایە کافر و بێ بڕواکان کار و کردەوەکانیان تەرازو دەکرێ و دەکێشرێ لە مەیدانی حەشر و حیساب لە هەڵوێستەکان دەگەینە سەری بە پشتیوانی خوای رب العالمين ڕونی دەکەینەوە، لە پاشان ابن تيمية دەفەرموێ (وَتُنْشَرُ الدَّوَاوِينُ) ئەو کاتەی ئەوەی چاکە و خراپەکانی مرۆڤەکانی تێدا تۆمار بوە و نوسراوە پەڕاوگەکان ئەوانە بڵاو دەبێتەوە بە سەریان و بڵاو دەکرێتەوە هەمویان دەخرێتە ڕوو (وَهِيَ صَحَائِفُ الأَعْمَالِ) پێناسەی دەکا

دەواوین چیە؟ دەڵێ ئەو لاپەڕانەی كردەوەكانی مرۆڤەكانە (فَآخِذٌ كِتَابَهُ بِيَمِينِه) هەیانە بە دەستی ڕاست پەرتوكەكەی وەردەگرێ (الله لەوانمان بكا) (وآخِذٌ كِتَابَهُ بِشِمَالِه) وە هەشیانە بە چەپە واریدەگرێ (الله لەوانمان حیساب نەكا) (أَوْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِه) یان لە پشتەوە وەریدەگرێتەوە (الله لەوانیشمان نەكا) ئینجا ابن تيمية فەرموی خوای پەروەردگار و پاك و بێگەر و بەرز دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا * اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾ [الإسراء: ١٣: ١٤].

كەواتە ئەلێرەدا ابن تيمية باسی ئەوەی هێنایە بەر باس كە قیامەتی گەورەش پەیدا دەبێ لەدوای ئەوەی مرۆڤەكان یەكە یەكە یان پۆل پۆل دەمرن و وەفات دەكەن كاتێكی دیاریكراویش هەیە الله تعالی قیامەتی گەورە و مەزنی لێ بەرپا دەكا و دەیهێنێتەجێ ئا ئەوەش بەچی ڕوودەدات و دێتەجێ؟ بەوە ڕوودەدا كە فوو دەكرێتە صور، فوكردنە صور لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە جێگیرە، فوو كردنە صور فریشتەیەكی تایبەتی بۆ دانراوە كە ئیسرافیلە، فوو دەكاتە ئەو صورەی كە الله تعالی -جل شئنه- بۆی داناوە، یەكەمجار كە فوی پێدا دەكا چی بەرپا دەبێ؟ مردنی هەموو مرۆڤەكان و لەناو چونی گیان لەبەرەكانی سەر ڕوی زەوی هەر هەموی وە گیانلەبەر گیانی لەبەر نامێنێ و وەفات دەكا و دەمرێ ئینجا لە پاشان لە جاری دوەم فوی كە بە فەرمانی الله پێدا دەكا ئا ئەوكاتە صەعق توشی مرۆڤەكان دەبێ لەسەر ئەو بۆچونەی كە دەڵێن سێ نەفخ و فوو كردن بە صورەوە هەیە ئەوەش بۆچونێكە لە بۆچونەكانی ئەهلی سونە و جەماعە، وە جاری سێیەمیش كە فوی پێدا دەكا گیانیان دێتەوە بەر و هەڵدەستنەوە لە گۆڕەكانیان بەرەو مەیدانی حەشر و حیساب بەڕێدەخرێن و كۆ دەكرێنەوە ئەوانەی كە مردونە لە مرۆڤ و مەردومەكان، جا هەندێكیش لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن نەخێر تەنها دوو فوكردن هەیە بە صوردا، یەكەمیان فوكردنی مردن و لەناو بردنی هەر هەموو گیان لەبەرەكان و مرۆڤەكانە گیانیان پێی دەردەچێ صورەكە و فوكردنەكە پێیدا لێك دەكێشرێتەوە تا هەمویان

صەعقیان توش دەبێ، وە جۆری دوەمیشیان ئەوەیە کە فوی دە کرێ پێدا هەتا زیندوو ببنەوە و گیانیان وەبەر بنرێتەوە.

پێویست دەکا هەڵوێستە لەسەر ئەوە بکەین ئایە زیندوبونەوە شتێکی ڕاست و ڕەوایە؟ بەڵێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا زیندوبونەوە شتێکی ڕاست و ڕەوایە و جێگیرە، تەنها بێ بڕوایان وە کافرە قوڕەیشیەکان دەهریەکان وە مولحید و زندیقەکان بیروبڕوایان پێ نەبوە و زۆرجار ڕەتیان کردوەتەوە، بە دەیەها ئایەتی قورئانی پیرۆز ئەوەی جێگیر کردوە و وەڵامی هەر هەموو چین و توێژەکانی داوەتەوە کە نمونەی جوان و لەجێی واقیعیانەی الله تعالی هەندێک جار عاقڵ و ژیری مرۆڤەکانیش و هۆشیشیان پێ جوڵێنراوە کە جێگیر بوە بەوەی مرۆڤەکان زیندو دەبنەوە و زیندو بونەوە شتێکی جێگیرە و هەیە و دەبێ، بەڵگەکان زۆرن لەسەر ئەوەی کە خوای رب العالمین زیندومان دەکاتەوە بەڵام ئێمە لە وەڵامی کافر و بێ بڕوایان الله تعالی دەیەها ئایەتی هێناوەتەوە پێویستە داعیەکان موسڵمانان بڕواداران ئەو ئایەتانە بزانن و شی بکەنەوە لە وەڵامی کافر و بێ بڕواکان بۆیان بێننەوە.

لە پاشان ڕەنگە دوبارە بگوترێ باشە هەیە ناشاردرێتەوە لەنێو گۆڕ و قەبرەکان پارچە پارچە بوە هەیە بوەتە خۆراکی ئاژەڵەکان هەیە بۆتە خۆراکی ماسی و حوتەکان لەنێو دەریایەکان هەیە بوەتە خۆڵەمێش ئینجا ئەوانەش ئایە کە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) (فَيَقُومُ النَّاسُ مِنْ قُبُورِهِمْ) یان ابن تیمیة وای جێگیرکرد کە لە گۆڕەکانیان زیندو دەبنەوە (لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) ئایە ئەی ئەوانەی لەناو گۆڕدرا نین و شاردراوە نەبونە و ژێر خاک نەکراون؟ دەڵێین ئەوە بە سیغەی تەغلیب و زۆربەی هەرە زۆری کە ژێر خاک کراون ئاوا دەگوترێ ئەگەرنا مەبەست پێی ئەوەیە ئەوەی بمرێ و گیان لە دەست بدا ژێر خاک بکرێ نەکرێ ئەو ڕۆژەی کە زیندوبونەوە دێ و زیندو دەبێتەوە و لاشە و جەستەکەی زیندو دەبێتەوە و ڕۆح و گیانی وەبەر دەنرێتەوە.

لێرەدا هەندێک لە زانایان دەفەرمون باشە بۆچی باسی نیشانەکانی دوارِۆژیشی نەکردوە ابن تیمیة وە هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە و لە پەرتوکەکانی عەقیدە باسی نیشانەکانی قیامەت دەکەن ئینجا دەچنە سەر بڕوابون بە قیامەت و ئینجا باس و خواسەکانی قیامەت و زیندوبونەوە؟ بەڵام هەندێک لە زانایانی ئەهلی تەحقیق دەفەرمون هی ابن تیمیة لەجێترە چونکە (اشراط الساعة) نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی پەیوەندی بە قیامەتەوە نیە شتێکە پەیوەندی بە دونیاوە هەیە زیاتر ئەگەر باس و خواسی بە تایبەتی لێبکرێ و لە شوێنێکی تایبەتدا ئەولاتر و باشترێکە لەوەی کە لەگەڵ قیامەتدا باسی لێبکرێ.

ئینجا ئەو خۆرەی کە لەسەرمان نزم و نزیک دەبێتەوە ابن تیمیة فەرموی لە مەیدانی حەشر و حیسابدا هەڵوێستەی دەوێ ئایە نزیکبونەوەکەی چۆنە؟ ئەوە شتێکی غەیبیە نادیارە ئێمە دەبێ تەسلیمی بین سەرەتا بڕوامان پێی هەبێ ئینجا نزیکبوونەوەکەی بەو ئەندازەیە کە لە فەرمودەی پێغەمبەر هاتوە (ﷺ) دەفەرموێ ئەوەندەی میلێک لەسەر سەرتان نزم دەبێتەوە، جا میل هەندێک لە زانایان فەرمویانە بەوە دەگوترێ بەو کلچوکەی پارچە دارێک لە دار دروست دەکرا یان لە قۆچی کار مامز و هەندێک لە حەیوان و ئاژەڵە قۆچ ناسکەکان و بچوکەکان دروست دەکرا کاتی خۆی کلی پێ لە چاوی ئافرەتان دەدرا و دەکرا کە سەرەکەی باریکە و دەسکەکەی ئەستور ترە ئەوە پێی دەڵێن لە زمانی عەرەبی میل، یان بە قەد ئەوە لەسەر سەرت نزم دەبێتەوە خۆر (پەنا بە خوای رب العالمین) یان ئەوەیە بە مەسافەش دەگوترێ یەعنی ماوەیەک لەسەر زەوی ڕۆیشتن پێی دەگوترێ میل وەکو کیلۆمەتر.

ئایە میل چەند کیلۆمەترە؟ بەڵێ میل زیاترە لە کیلۆمەتر بە ئیتیفاقی زانایان و ئەوانەی پێوەرن شتەکان دەپێون بەڵام چەندە بزەبت؟ ئیختیلافی لەسەرە هەندێک لە زانایان دەفەرمون لە کیلۆمەتر و نیوێک زیاترە کیلۆمەترێک هەزار مەترە ئەوان دەڵێن هەزار و

حەوت سەد و بیست و چوار مەترە، واتە لە کیلۆمەتر و نیوێک زیاتر دوو سەد و بیست و چوار مەتریشی زیاترە لە کیلۆمەتر و نیوێک، هەندێک لە زانایانیش بۆچونی تر دەڵێن (والله أعلم).

لە پاشان ئەو خۆرە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا بەڕاستی زەحمەتە ناخۆشە الله تعالى لەوانمان بکا کە هەندێک لە مرۆڤ و چینەکان وەبەر سێبەرێکی خوایی دەکەون ئەو سێبەرە خواییە ئایە (پەنا بە الله) بۆمان هەیە بڵێین سێبەری اللهیە «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ[1]» حەوت جۆرە کەس هەن دەخرێنە بەر سێبەری خوایی لەو ڕۆژەی کە هیچ سێبەرێک نیە جگە لە سێبەری خوایی؟ نا عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن یان سێبەری عەرشی الله لە هەندێک دەق و ڕیوایەتەکان وا هاتوە یان دەبێ بڵێی ئەو سێبەرە خواییەی بەو مانایەی نسبەتی دەدرێتە لای الله یانی ئەوەی الله دایدەنێ و دروستی دەکا و تایبەتی دەکا بەو مەیدانە نەک سێبەری زاتی الله (پەنا بە خوای رب العالمين) ئەوە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە، یەعنی ئەو سێبەرەی وەکو عثیمینیش پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە الله خەلقی دەکا و دروستی دەکا و تایبەتە بەو مەیدانی حەشر و حیساب (والله أعلم بالصواب).

لە پاشان خەڵکی دەکەوێتە ناو ئارەقەی تاوان و گوناحی الله تعالى ئەو حەوت جۆرە کەسە دەپارێزێ لە ژێر ئەو سێبەرە خواییەوە دەوەستن کە (یەکێکیان سەرکردەیەکی دادوەر، وە گەنجێک نەش و نمای کردبێ لەناو عیبادەت و پەرستش، وە کەسێک دڵی بەند و پەیوەست بوبێ بە مزگەوتی ماڵی خوای رب العالمين، وە دوو پیاو و کەس لە پێناو الله یەکتریان خۆشبوێ کۆبونەوەیان و لێک جیابونەوەیان تەنها لەپێناو الله بێ، وە مرۆڤ و کەس و پیاوێک کە ئافرەتێکی جوانی پلەدار داوای لێبکا لەگەڵی زینا بکا (پەنا بە الله) ئەویش تەنها لە ترسی الله بگەڕێتەوە و نەیکا بڵێ منله الله دەترسێم، وە پیاوێکیش کە

---

[1] **صحيح البخاري** (٦٦٠) (١٤٢٣) (٦٤٧٩)، **صحيح مسلم** (١٠٣١)، **سنن الترمذي** (٢٣٩١).

خێر و چاکە بکا بە دەستی ڕاستە ئەوەندە بە نهێنی بیکا دەستی چەپەی ئاگای لێ نەبێ، وە کەس و پیاوێکیش لەپێناو الله تعالی فرمێسکی لەچاو بێتە خوار کە کەسی لێ دیار نەبێ لە شوێنێکی بەتاڵ و کەس نەدیتە بێ) ئەوانە لە ژێر سێبەری خواییین (الله تعالی لەوانمان بکا).

لە پاشان هەڵوێستەیەکی تر لەسەر ئەوەی ئایە تەرازوی مەیدانی حەشر و حیساب چەند شتی پێ دەکێشرێ؟ شتێکی حەقیقیە و ڕاستە یان هەر مەعنەوییە تەئویل دەکرێ؟ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە حەقیقی و ڕاستە تەئویل ناکرێ وە ئەو بۆچونانەش هەن هەندێکیان لە زانایان پێیان وایە تەنها کردەوەی مرۆڤەکان کێش دەکرێ، هەندێک دەفەرمون نا مرۆڤەکانیش لەگەڵ کردەوەکانیان کێش دەکرێن، هەندێک دەفەرمون نا مرۆڤەکان و کردەوەکانیان و پەڕاوگە و سجیلەکانیشیان کێش دەکرێن هەرسێکیان، ئەو بۆچونانە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەن.

وە میزانیش هەندێک جار بە کۆ ناوی هاتوە لە قورئانی پیرۆز و لە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێک جاریش بە تاک هاتوە، بۆچونی پەسەند و ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە ئەو کاتەی بە کۆ ناوی هاتوە مەبەست پێی ئەو شتانەی پێی دەکێشرێ کە کۆن و تاک نین هەندێک جار کردەوەکانن نەک زات و خودی میزانەکە و پێوەرەکە (والله أعلم بالصواب).

تەرازو و میزان حەقیقەت و ڕاستی هەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دوو کەفە و دوو لای هەیە، هەندێک لە بۆچونەکان دەڵێ زمانەیەکیشی هەیە ئەگەر ئەو دەلیلی سەریح و ئاشکرا و سەدا سەدیشی لەسەر نەبێ، جا کردەوەکانی مرۆڤ وە لە پاشان پەڕاوگە و سجیلەکان وە لە پاشان مرۆڤەکان خۆشیان دەکێشرێن ئەوە بۆچونێکە لە هی ئەهلی سونە و جەماعە کە بەڵگەی زۆریش لەسەر ئەوەیە و ئەوەیان (والله أعلم) ڕاجیح تر و پەسەندتر و سەحیح ترە لەگەڵ ئەوەدا بۆچونی تریش هەبوو باسمان لێوە کرد.

## ئیمان بون بە حیساب:

وَيُحَاسِبُ اللهُ الخَلائِقَ، وَيَخْلُو بِعَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ، فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ؛ كَمَا وُصِفَ ذَلِكَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ. وَأَمَّا الْكُفَّارُ؛ فَلا يُحَاسَبُونَ مُحَاسَبَةَ مَنْ تُوزَنُ حَسَنَاتُهُ وَسَيِّئَاتُهُ؛ فَإِنَّهُ لاَ حَسَنَاتَ لَهُمْ، وَلَكِنْ تُعَدُّ أَعْمَالُهُمْ، فَتُحْصَى، فَيُوقَفُونَ عَلَيْهَا وَيُقَرَّرُونَ بِهَا ويخزون بها.

---

ئەمجارە گەیشتە سەر ئەوەی ابن تيمية -رحمه الله- دەفەرموێ (وَيُحَاسِبُ اللهُ الخَلاَئِقَ، وَيَخلُو بِعَبْدِهِ المُؤمِنِ فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ، كَمَا وُصِفَ ذَلِكَ فِي الكِتَابِ وَالسُّنَّةِ) الله تعالى حیساب لەگەڵ بەدیهێنراوەكانی دەكا وە لەگەڵ بڕوادار بە تەنها دەدوێ و وای پێدەكا كە دانبنێ بە تاوان و سەرپێچی و گوناحەكانی هەروەكو وەسف كراوە و ئەوە باسكراوە لە قورئان و لە فەرمودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) (وَأَمَّا الكُفَّارُ فَلاَ يُحَاسَبُونَ مُحَاسَبَةَ مَن تُوزَنُ حَسَنَاتُهُ وَسَيِّئَاتُهُ) هەرچی كافر و بێ بڕواكانن حیسابی ئەوەیان لەگەڵ ناكرێ كە چاكە و خراپەكانیان كێش بكرێت (فَإِنَّهُ لاَ حَسَنَاتَ لَهُمْ) چونكە كافر و بێ بڕواكان چاكەیان بۆ نیە و لێیان وەرگیراو نیە چونكە كافر بونە و بێ بڕوا بونە ئەوە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەو چاكانەی كە نیەتی پێویستە كە موسڵمانێتی پێویستە ئەوانەیان نیە كافرەكان و لێیان قبوڵ نابێ بەڵام خێر و بێری دونیا كە سود دەگەیەنن بە خەڵكی وەكو ئەدیسۆن كە كارەبای داهێناوە ئەو خێر و بێرە ئایە پاداشتی دەدرێتەوە یانە نا؟ بەڵێ لە دونیادا الله تعالى پاداشتی ئەوەی دەداتەوە ناوبانگی پێ دەردەكا لەناو خەڵكی بە باش ناوی دەبردرێ هەر لە دونیادا وەری دەگرێتەوە و لە قیامەتدا هیچ ئەجر و پاداشتێكی بۆ نیە چونكە ئەو كەسە موسڵمان نیە بڕوادار نیە شایستەی ئەوە نیە پاداشتی بدرێتەوە (وَلَكِن تُعَدُّ أَعمَالُهُم) بەڵام كردەوەكانیان دەژمێردرێ بە بەرچاو پێی نیشان دەدرێ بۆ سەرزەنشتی كردن پێی دەگوترێ تۆ واتكرد واتكرد بۆ ئەوە نا ئەو كردەوانە بزانێ وە لە پاشان یان دانی پێدابێنی و یان ئەگەر لە پێناو ئەوەبێ ئەگەر چاكەبێ پاداشتی بدرێتەوە (فَتُحصَى) دەژمێردرێن

(فَيُوقِفُونَ عَلَيْهَا) لەسەری دەوەستێنرێن کافر و بێ بڕواکان (وَيُقَرَّرُونَ بِهَا ويخزون بها) جا دانپێدا دەهێنن و لە پاشان بەهۆیەوە سەرشۆڕ دەبن و الله تعالی سەرشۆڕییان توش دەکا.

جا لێرەدا لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە حیسابی خوایی -جل شئنە- لە مەیدانی حەشر و حیسابدا بۆخۆی الله -جل شئنە- دێ: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ [الفجر: ٢٢] ئەوە بەڵگەیەکی ئەهلی سونە و جەماعەیە الله تعالی دێ فریشتەکان پۆل پۆل و ڕیز بە ڕیز ڕاوەستاون کاتێ کە دێ مەحکەمەی خەڵکەکە بکا وە حیسابیان لەگەڵدا بکا، هاتنەکەی الله تعالی چۆنە؟ الله دەزانێ -جل شئنە- ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین بەڵام ئێمە ناڵێین ئەمر و فەرمانی الله دێ لە وەڵامی ئەو کەسانەی دەڵێن الله بە زاتی خۆی نایە ئەمر و فەرمانی دێ ئینجا ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن الله زاتی دێ -جل شئنە- بەڵام هاتنەکە چۆنە؟ ئێمە نایزانین لەخۆی دەوەشێتەوە -جل شئنە- هەر لە ئایەتەکەش وا گوتراوە.

ئینجا ئەوەی حیسابی لەگەڵدا بکرێ بڕوادار هەیە الله تعالی دەیباتە لای خۆی نزیکی دەخاتەوە حیسابەکەی سوک و ئاسان دەبێ بەڵام دەیهەوێ الله تعالی ناز و نیعمەتەکانی فەزڵ و بەخششەکانی خۆی تەواو پێ نیشان بدا بەوەی پێی دەڵێ ئەی بەندەی من تۆ ئەو کردەوەت کرد ئاوات کرد ئەها ئەو تاوانەت ئەنجامدا ئەو حیسابەت کرد ئەوانە هەمویان وا نیە؟ ئەی وات نەکرد؟ ئەویش هەموی دان پێدا دەهێنێ لە خزمەت الله تعالی بەبێ ئەوەی خەڵکی بیزانێ و ئاگاداربن، ئینجا لە کۆتاییەکەی الله تعالی پێی دەفەرموێ من لە دونیا دامپۆشت لەسەرت ئاشکرام نەکردی جا لێرەش لێت دەبورم و لێت خۆش دەبم بۆ ئەوە نیە کە ئاشکرات بکەم یان وات لێبکەم پێی سەرشۆڕبی و پێی بتبەمە ئاگری دۆزەخ و جەهەنەم.

ئەوەش فەزڵ و بەخششی خوای رب العالمین ە لەگەڵ بڕواداران وە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿فَسَوفَ يُحَاسَبُ حِسَابا يَسِيرا﴾ [الانشقاق: ٨] موسڵمان و بڕوادار حیسابیان لەگەڵ دەکرێ بەڵام حیسابێکی سوک و ئاسانیان لەگەڵدا دەکرێ ئاشکرا ناکرێن ڕوو ڕەش

ناکرێن وە سەرزەنشت ناکرێن بەدیار خەڵک و بەدیهێنراوەکانی مەیدانی حەشر و حیساب، ئینجا ئەو فەرمودەش هەیە «مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ عُذِّبَ» هەریەک حیسابی موناقەشەی لەگەڵ بکرێ ئەوە عەزابی دەدرێ بەو مانایەی هەر نەوعێکە لە عەزاب و ناخۆشە و ترسی لێ دەنیشێ کەسەکە کە ئەو بیتاقە و ئەو سجیل و گوناح و تاوانانەی پێ نیشان دەدرێ وە هەندێک جاریش ئەگەر حیسابی لەگەڵ بکرێ بە وردی هەر پێوە توشی عەزابی خوای رب العالمین یش دەبێ کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «إِنَّمَا ذَلِكِ الْعَرْضُ ﴿فَسَوفَ يُحَاسَبُ حِسَابا يَسِيرا﴾ [الانشقاق ٨]» بۆ بڕواداری ڕاستەقینە تەنها الله تعالى بۆی نمایش دەکا پێی نیشان دەدا دەڵێ ئەوەت کرد ئاوابوو ئەوانە، ئینجا «ولكن مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ عُذِّبَ[١]» بەڵام ئەگەر موناقەشەی لەگەڵ بکا الله تعالى -جل شئنه- ئەوە عەزابە ناخۆشیە یانی بڕیاردانی تۆڵە لێسەندنەوەی لەسەر دەبێ، بەڵام لەگەڵ بڕواداری ڕاستەقینە دوو بە دوو الله تعالى -جل شئنه- بە تەنها بەبێ ئەوەی کەس هەستی پێبکا و گوێبیست بن خەڵک و مەردومەکەی ڕاوەستێنراون لە مەیدانی حەشر و حیساب الله حیسابەکەی عەمەل و کردەوەکانی دەهێنێتە بەرچاوی و پێی دەڵێ تۆ واتکرد تۆ واتکرد ئەها ئەو هەڵەت هەبوو ئەو گوناحەت هەبوو ئەوەت ئەنجامدا ئەو سەرپێچیەت کرد هەموی بزانە کردوە بەڵام من لە دونیادا بۆم داپۆشی چونکە تۆ ئاشکرات نەکرد بەخۆت بێباک نەبوی لێی وە لە قیامەتیش لێت دەبورم و لێت خۆش دەبم.

لەبەر ئەوە گرنگ و موهیمە هەرکەسێک ئەگەر گوناح و تاوانێکی ئەنجامدا بە زوترین کات تەوبەی لێبکا و بگەڕێتەوە لایەنی کەم ئاشکرای نەکا بۆ کەس نەیگێڕێتەوە شانازی پێوە نەکا هەردەم بە بیری بێتەوە دڵی پێ هەڵبقرچێ بە دڵنیایی الله تعالى لێبوردەیە و بەڵکو ئەو فەرمودە بیگرێتەوە و خوای تبارك وتعالى لێی خۆشبێ لە مەیدانی حەشر و حیسابدا.

[١] صحيح البخاري (٦٥٣٦) (٦٥٣٧) (١٠٣)، صحيح مسلم (٢٨٧٦)، سنن أبي داود (٣٠٩٣).

کافر و بێ بڕواکانیش کار و کردەوەکانیان هیچ حیسابی بۆ نیە لێیان قبوڵ ببێ لە باشەش تەنها ئەوەیان بۆ هەیە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا کە پێیان دەگوترێ وەکو سەرزەنشت ئەوانیش دانی پێدا دەهێنن وە الله تعالی تۆڵەشیان لێ دەسێنێتەوە.

## ئیمان بون بە حەوز و ڕونکردنەوەی شێوەکەی:

وَفِي عَرَصَاتِ الْقِيَامَةِ الْحَوضُ الْمَوْرُودُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) ماؤُه أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ نُجُومِ السَّمَاءِ، طُولُهُ شَهْرٌ، وَعَرْضُهُ شَهْرٌ، مَن يَّشْرَبُ مِنْهُ شَرْبَةً؛ لاَ يَظْمَأُ بعْدَهَا أَبَدًا.

---

جا لەو مەیدانەدا لە پاشان پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دیارییەکی پێ بەخشراوە ابن تیمیة دێ باس لەوە دەکا کە حەوزە دەفەرموێ (وَفِي عَرَصَاتِ القِيَامَةِ الحَوضُ المَورُودُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)) لە گۆڕەپانی مەیدانی حەشر و حیساب گوتمان عەرەسات لە زمانی عەرەبیەوە بە گۆڕەپانێکی پان و فراوان دێ کە بەرز و نزمی تێدا نەبێ ئەوسەر ئەوسەری لێ دیاربێ بەوە دەگوترێت مەیدانی قیامەت و حەشر و حیسابیش هەر وایە ئینجا لەو مەیدانەدا حەوز هەیە ئەو حەوزەی کە خەڵکی بەسەریەوە دێ بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دیارییە لەلای الله تعالی وە (مَاؤُهُ أَشَدُّ بَاضًا مِنَ اللَّبَنِ) ئاوەکەی سپیترە لە شیر (وَأَحلَىٰ مِنَ العَسَلِ) وە شیرینتر و بەتام و چێژترە لە هەنگوین (آنِيَتُهُ عَدَدُ نُجومِ السَّمَاءِ) ئەو گڵاس و جامیلکانەی پێی دەخورێتەوە بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان مانای ئەوە دەگەیەنێ و دەگرێتەوە زانایان دەفەرمون یان ئەوەیە وەکو ئەستێرەکانی ئاسمان دەبریسکێتەوە جوان و ڕێک و پێک و بریسکاوەیە، وە ئەوەش دەگەیەنێ ژمارەیان زۆرە ئەستێرەکانی ئاسمان ناژمێردرێن بە ئاسانی واتە ئەو جامیلکە و گڵاسانەی ئاوی کەوسەریشی پێ دەخورێتەوە و یان لەو حەوزەی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو ژمارەی ئەستێرەکان زۆرە، جا هەتا کەس توشی ئەوە نەبێ ڕابوەستێ و چاوەڕوانی ئەوە بکا کە بڵێ چاوەڕێمە ئەوەی تر لێ ببێتەوە و گڵاسەکە و جامێلکەکە دابنێتەوە ئینجا من

بیخۆمەوە نا ئەوە وانیە بەڵکو لە زۆرییان دەتوانن هەموو کەسێک بچێ جامێلکەیەک دەست بداتێ و ئەوەندە زۆرە ژمارەیان، هەندێک لە زانایان دەفەرمون لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەی سەحیحدا وای تەشبیە کردوە دەڵێ ژمارەیان بە قەدەر ژمارەکانی ئەستێرەکانە لە زۆرییان (طُولُهُ شَهرٌ) جا درێژایی حەوزی پێغەمبەر (ﷺ) بە قەد مانگێک لێی برۆی ئەوەندە دور و درێژە، مانگێک ڕۆیشتن بە ئۆتۆمبێل و سەیارە یان بە تائیرە چونکە ئێستا شتی نوێش دەرهاتوە یان بە پشتی حوشتر یان بە پێیان برۆی؟ بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە و زانایانی سەردەمیش لەوە دەڵێن مەبەست پێی ڕۆیشتنی بە حوشترە چونکە پێشان زیاتر نمونەکان بە ڕۆیشتنی حوشتر دەهات لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو نمونەی لە سەردەمی خۆی هێنانەیەوە، یانی مانگە ڕێیەک برۆی بە پشتی حوشتر چەند دور و درێژە حەوزی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەیدانی حەشر و حیسابدا و حەوزەکەی لە قیامەتدا هەیەتی ئەوەندە دور و درێژە (وَعَرضُهُ شَهرٌ) بەرینایەکەشی بە قەد مانگێک ڕۆیشتنی حوشترە، ئەوە بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعەیە کەواتە مورەبەع هەڵکەوتوە چوارگۆشەیە (مَن يَشْرَبُ مِنهُ شَربَةٌ) هەریەک قومێک بخواتەوە لەو ئاوەی لەو حەوزەدا هەیە (لَا يَظْمَا بَعدَهَا أَبدًا) قەت تینوو نابێتەوە لەپاش ئەو کاتە پێویستی بە خواردنەوەی هیچ خواردنەوەیەک و ئاوێک نابێ.

ئەو حەوزە هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن بە ئیشارەت و ئاماژە بەڵگەی ئایەتیشیان هەیە کە الله تعالى فەرموی: ﴿إِنَّا أَعطَينَـٰكَ ٱلكَوثَرَ﴾ [الكوثر: ١] ئێمە کەوسەرمان بەتۆ بەخشیوە ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، جا کەوسەر دوو بۆچون هەیە:

١. هەندێک دەڵێن ناوە بۆ ئەو حەوزەی پێغەمبەریش (ﷺ) لە مەیدانی حەشر و حیسابدا.

٢. هەندێکیش دەڵێن نا ڕوبارەکەی بەهەشتە بەڵام ئاوەکەی ناو حەوزەکە لەو ڕوبارەوە سەرچاوەی گرتوە و دێ تێی دەکاتەوە و تێی دەکرێ لەبەر ئەوە هەریەک حیسابن سەرچاوەکەی ئاوی کەوسەرە.

جا پێغەمبەر (ﷺ) ئەو وەسفە جوانانەی بۆ ئێمە کرد بەڕاستی ئێمە دەبێ ئاگاداربین لە فەرمودەی سەحیحی پێغەمبەرە (ﷺ) ئەو وەسفانە کە هاتوە لە سەحیحی بوخاری تۆمار بوە فەرمودەکان بە ژمارە (٦٥٧٩) (٦٥٨٠) (٦٥٨٣) وە لە سەحیحی موسلیمدا بە ژمارە (٢٢٩٣) (٢٣٠٠) دەربارەی حەوزی پێغەمبەر (ﷺ) چەندین فەرمودە هاتوە و تۆمار بوە.

ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەمویان بەڵگەی ئەوەن ئەو حەوزە بونی هەیە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا بۆ ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەچێتە سەر لێی دەخواتەوە، بەڵام ئەو حەوزە ئایە لەپێش پردی سیڕاتە یان دوای پردی سیڕاتە؟ ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن دوو حەوز هەیە، یەکیان لەپێش پردی سیڕاتە ئەوەی تریان لەدوای پردی سیڕاتە، وە هەندێکیان دەڵێن یەک حەوزە و لەدوای پردی سیڕاتە، هەندێکیشیان دەڵێن لەپێش پردی سیڕاتە و یەک حەوزە (والله أعلم) ئەوەیان تەواوترە کە دوو حەوز هەبێ یەکیان لەپێش پردی سیڕات ئەوی تریشیان لەدوای پردی سیڕات.

ئینجا خەڵکانێک هەن لەسەر ئەو حەوزە ڕەت دەکرێنەوە پێغەمبەر (ﷺ) چەندین فەرمودە هاتوە کە خەڵکێک دێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ئاوی لێ بخواتەوە، جا لەبەر ئەوە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن لەپێش پردی سیڕاتە چونکە کافرەکان مونافقەکانی تەواو و ڕاستەقینەش ناتوانن بپەڕنەوە لە پردی سیڕات لەبەر ئەوەش بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی مونافقەکان ئەوانەی هەڵگەڕاوەن لەپاش پێغەمبەر (ﷺ) ناتوانن لە ئاوی کەوسەر و حەوەزەکە بخۆنەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ پۆلە خەڵکانێک دێن من باوەشیان بۆ دەکەمەوە و پێشوازییان لێ دەکەم فریشتەکان دێن دەڵێن نا نەکەی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەتیان بکەوە دەڵێ منیش دەڵێم «أُصَيْحَابِي أُصَيْحَابِي» دەڵێم ئەوانە هاوەڵۆکەکانی منن هاوەڵۆکەکانی منن بە مەعنای بە کەم ناویان دەهێنێ لەڕوی ژمارە چونکە کەمن ئەوە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە چونکە شیعەکان ئەوە دەکەنە بەڵگە (پەنا بە الله) لە

ڕەدی ئەوان ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن ژمارەیان زۆر نیە ئەوان دەڵێن سەحابەکان چەندێک بە ژمارەی پەنجەی دەستەکان ڕزگاریان بوە و هەڵگەڕاوە نەبونە و ئەوانی تر هەمویان مورتەدن و پێغەمبەر ڕەتیان دەکاتەوە (ﷺ) لەسەر حەوز بەڵام ئەوە بۆچونی شیعەکانە ئەهلی سونە و جەماعە ڕەدیان دەدەنەوە دەڵێن بەو بەڵگانەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ژمارەیان کەمە ئەوانەی ڕەت دەکرێنەوە چونکە ئەوانەی ڕەت دەکرێنەوە کێن؟ ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە، ئایە ئەو هاوەڵانەن کە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بڕواداربون و لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێکیان مورتەد بونەوە هەڵگەڕانەوە کە ئیمامی ئەبو بەکریش شەڕ و جەنگی لەگەڵ بەرپا کردن؟ هەندێک لە زانایان دەڵێن بەڵێ بەس ئەوانن، هەندێکی تر دەڵێن نەخێر بەڵکو مونافقەکان و دوڕوەکانن کە بە مونافقی مردبون لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) وە لە سەردەمەکانی تر، هەندێکیش دەڵێن نا گشتیە لە سەردەمی سەحابەش و تا قیامەتیش دادێ هەرچی هەڵگەڕێتەوە و لاڕێ ببێ و مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکانیش هەمویان دەگرێتەوە ئەوانە ڕەت دەکرێنەوە بەس لە چاو ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) ژمارەیان زۆرینە نیە کەمینەن وە ڕەت دەکرێنەوە، لەلایەن ئەهلی سونە و جەماعە ئەو بۆچونە پەسەندترە (والله أعلم) پێغەمبەر (ﷺ) پێیان دەفەرموێ مادەم لاڕێ بون «سُحْقًا سُحْقًا[١]» بەدور کەونەوە بەدور کەوتووە بەدور کەونەوە بەدور کەونەوە لێم ئینجا لایان دەدەن و ناتوانن لە ئاوی حەوزەکە بخۆنەوە (الله تعالى لەوانمان نەکا) ئەوانەش لە فەرمودەی سەحیحدا تۆمار بوە.

وە ئەوەتا فەرمودەیەکیان پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «إنه تأتي فرقة من أمة» تاقم و کۆمەڵێک لە ئومەتی من دێن «فإذا قرب من الحوض أحل بيني وبينه» گەر نزیک دەبنەوە لە حەوز لەنێوان من و ئەوان پەردەیەک دروست دەبێ و ناتوانن بگەنە من «ثم تأتي فرقة الثانية فإذا قرب صريف» لە پاشان تاقم و کۆمەڵێکی تریش دێن کە نزیک دەبنەوە لادەدرێن

[١] **صحيح البخاري** (٧٠٥٠) (٦٥٨٣)، **صحيح مسلم** (٢٢٩٠)، **مسند أحمد** (١١١٣٨) (١١٢٢٠) (١١٣٤٥).

و ناتوانن بێن «فلا أُراهُ يَخلُصُ إليَ إلا كهمل النِعم[1]» پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) ئیلا ژمارەیەکی کەم دەمێنێنەوە بە گوێرەی ئەو فەرمودە تەواو لە ئاوی حەوزەکە دەخۆنەوە وە زۆرێکیان ڕەت دەکرێنەوە، ئەوەش بەڵگەی هەندێکە لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە کە دەڵێن کەواتە هەر سەحابەکان و هەڵگەڕاوەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) نین، بەڵکو هەموو مونافق و دەغەڵ و هەڵگەڕاوەکان تا قیامەت دادێ ئەوانە هەمویان لادەدرێن و ناگەنە حەوزی کەوسەر وە ناگەنە ئەو حەوزەی ئاوی لێ بخۆنەوە ئەوە ئەوە دەگەیەنێ چونکە پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) ئیلا کەمێکی کەم دەمێنێنەوە.

حەوز یەکێکە لە شتە غەیبیەکان و نادیارەکان دەبێ ئێمە بڕوامان پێی هەبێ چۆن پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) ئەوەش خاڵێکە لە خاڵەکانی بیروبڕوا بە ڕۆژی دوایی.

## ئیمان بون بە سیڕات و سیفەت و شوێنەکەی:

وَالصِّرَاطُ مَنْصُوبٌ عَلَى مَتْنِ جهَنَّمَ، وَهُوَ الْجِسْرُ الَّذِي بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّار، يَمُرُّ النَّاسُ عَلَيْهِ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ، وَمِنْهُمْ مَن يَمُرُّ كَالْبَرْقِ، وَمِنْهُم مَن يَمُرُّ كَالرِّيحِ، ومِنْهُم مَن يَمُرُّ كَالْفَرَسِ الْجَوَاد، وَمِنْهُمْ مَن يَمُرُّ كَرِكَابِ الإبلِ، ومِنْهُم مَن يَعْدُو عَدْوًا، وَمِنْهُمْ مَن يَمْشِي مَشْيًا، وَمِنْهُم مَن يَزْحَفُ زَحْفًا، وَمَنْهُم مَن يُخْطَفُ خَطْفًا وَيُلْقَى فِي جَهَنَّمَ؛ فَإِنَّ الْجِسرَ عَلَيْهِ كَلاَلِيبُ تَخْطفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِم.

---

ئینجا لە پاشان ابن تيمية دێتە سەر ئەوەی -رحمە اللە- باسی سیڕاتمان بۆ دەکا دەفەرموێ (وَالصِّرَاطُ مَنْصُوبٌ عَلَى مَتْنِ جَهَنَّمَ) دەبێ بیروبڕواشمان وابێ پردی سیڕات ڕاکێشراوە و دانراوە لەسەر پشتی ئاگری دۆزەخ (وَهُوَ الْجِسْرُ الَّذِي بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ) ئەو پردەیە کەوتوەتە نێوان دۆزەخ و بەهەشت (يَمُرُّ النَّاسُ عَلَيْهِ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ) مرۆڤ و مەردوم بەسەریدا دەڕۆن بە گوێرە و ئەندازەی کردەوەکانیان (فَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ) هەیانە وەکو چاو تروکانێک لەسەری دەرباز دەبێ و تێ دەپەڕێ وە نامێنێتەوە لەسەری (وَمِنْهُم

[1] صحيح البخاري (٦٥٨٧) (٢٣٦٧) (٦٥٨٣)، صحيح مسلم (٢٤٦) (٢٤٧) (٢٤٩)، سنن ابن ماجه (٤٣٠٦).

مَن يَمُرُّ كَالْبَرْقِ) وە هەیانە وەکو بروسک کە تیشک دەدا بایی ئەوەندە لەسەری دەبێ و تێدەپەڕێ و دەڕوا (وَمِنْهُم مَن يَمُرُّ كَالرِّيحِ) وە هەیانە وەکو با دەڕوا لەسەری (وَمِنْهُم مَن يَمُرُّ كَالْفَرَسِ الْجَوَادِ) وە هەشیانە وەکو وڵاخە بەرزەی چاک کە وڵاخێک بێ سوار چاکی پێ بکرێ ئاوا دەتوانێ لەسەری بڕوا بە خێرایی (وَمِنْهُم مَن يَمُرُّ كَرِكَابِ الإِبِلِ) وە هەشیانە وەکو حوشتر چۆن لەسەر پشتی حوشتربێ و ڕۆیشتنی حوشتر ئاوا دەتوانێ بڕوا لەسەری یانی نزمتر و هێواش تر لەوەی لەسەر وڵاخ دەڕوا (ومِنْهُم مَن يَعْدُو عَدْوًا، وَمِنْهُم مَن يَمْشِي مَشْيًا) وە هەشیانە پاس دەهاوێ وە هەشیانە دەڕوا بە ڕۆیشتن (وَمِنْهُم مَن يَزْحَفُ زَحْفًا) وە هەشیانە دەخشێ لەسەری و بەو لاو لادا دەچێ یەعنی وەکو زەحف بە مەعنای لەسەر سک خشان دێ زیاتر و بە گاگۆڵە ڕۆیشتن (وَمَنْهُم مَن يُخْطَفُ خَطْفًا وَيُلْقَى فِي جَهَنَّمَ) هەشیانە دەیەوێ بەسەریدا بڕوا بەڵام جەهەنەم بۆخۆی ڕای دەکێشێ (پەنا بە خوای رب العالمین) دەکەوێتە ناو دۆزەخ (فَإِنَّ الْجِسرَ عَلَيْهِ كَلاَلِيبُ تَخْطِفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِم) چونکە ئەو پردەیە هەندێ قولابەی لەسەرن ئەو قولابانە هەندێک جار پڕ دەدەنە خەڵکی و ڕایان دەفڕێنن و دەیان فڕێنن و دەیانبەن بە گوێرەی کردەوەکانیان دەیانبەنە ناو ئاگری دۆزەخ (پەنا بە خوای رب العالمین) (الله لەوانمان نەکا).

جا پردی سیراط جێگیرە لە عەقیدەی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا کە لەسەر پشتی جەهەنەمە وە ئەو ئایەتەش کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنكُم إِلَّا وَارِدُهَا﴾ [مريم: ٧١] وە هەریەک لە ئێوە هەر دەبێ ببیبنێ، بینینەکە زیاتر مەبەست پێی ئەوەیە یانی هەمویان بەسەریدا دەڕۆن کە پردی سیراطە بەڵام بڕوادار تیشکی ئاگری جەهەننەم نایگرێتەوە بە گوێرەی کردەوە چاکەکانی و ئیمانی تێپەڕ دەکا لەوێ هەریەک بە جۆرێک کە باسمان لێوە کرد، دەڕوا هەیە زۆر بە خێرا هەیە بە نزمتر و هێواش تر بەقەدەر ئیمانی هەشە بە حاڵ قوتاری دەبێ و هەشە لە ناوەڕاستی (پەنا بە خوای رب العالمین) یان

لە سەرەتای ئەو کەلالیبانە خەطفی دەکات و دەیرفێنێ و هەڵی دەداتە ناو ئاگری دۆزەخ (پەنا بە خوای رب العالمين).

جا هەندێک لە وەسف و ئاوەڵناوی پردی سیڕاتیش هەیە و کراوە کە ابن تيمية ڕەنگە لێرەدا باسی نەکردبێ ئەویش یەک لەوان فەرمودەیەکە کە دەڵێ «أَدَقُّ مِنَ الشَّعْرَةِ وَأَحد مِنَ السَّيْفِ[١]» یەعنی باریکترە لە موو وە لە پاشان تیژترە لە شمشێر.

وە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) وەکو دڵسۆزیەک بۆ ئومەتەکەی لەسەر دەرکی پردی سیڕات دەوەستێ هەموو ئومەتەکەی خۆی بەڕێ دەکا ئەو کاتە هەر دۆعا و پاڕانەوەشی ئەوە دەبێ «وَدَعْوَى الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ[٢]» هەرکەس لە پێغەمبەران دەفەرمون و هاوار دەکەنە الله تعالى دەڵێن خوایە سەلامەت بن سەلامەت بن دەربازبن دەربازبن، جا ئێمە بالێرەوە بۆخۆمان وابکەین کە دەربازمان بێ.

## پردی نێوان بەهەشت و دۆزەخ:

فَمَنْ مَرَّ عَلَى الصِّرَاطِ؛ دَخَلَ الْجَنَّةَ. فَإِذَا عَبَرُوا عَلَيْهِ؛ وَقَفُوا عَلَى قَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقْتَصُّ لِبَعْضِهِم مِن بَعْضٍ، فَإِذَا هُذِّبُوا وَنُقُّوا؛ أُذِنَ لَهُمْ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ.

---

لە پاشان ابن تيمية دەگاتە سەر ئەوەی دەفەرموێ (فَمَنْ مَرَّ عَلَى الصِّرَاطِ؛ دَخَلَ الْجَنَّةَ) هەریەک قوتاری ببێ و دەربازی ببێ لەسەری پردی سیڕات ئەوە چوە بەهەشت و تەواو بەهەشتیە (فَإِذَا عَبَرُوا عَلَيْهِ؛ وَقَفُوا عَلَى قَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ) بەڵام ئەگەر لە پردی سیڕات تێپەڕیان کرد دەگەنە سەر قەنطەڕەیەک، قەنطەڕەیەک بە مەعنای ئەویش لە پردێک و جسرێک دەگەنە ئەو شوێنەی لەنێوان بەهەشت و دۆزەخە (فَيُقْتَصُّ لِبَعْضِهِم مِن بَعْضٍ) هەریەک لەوانە قیساس و تۆڵەیان لێ دەستێنرێتەوە هەندێک لە هەندێک ئەگەر غەدرێکی لێ کردبێ یان مافێکی خواردبێ (فَإِذَا هُذِّبُوا وَنُقُّوا؛ أُذِنَ لَهُمْ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ)

---

[١] **صحيح مسلم** (١٨٣) (٢٧) (١٨٢)، **صحيح البخاري** (٢٢) (٨٠٦) (٤٥٨١)، **سنن الترمذي** (٢٥٥٥) (٢٥٩٨).

[٢] **صحيح مسلم** (١٨٢) (١٨٣) (١٨٤)، **صحيح البخاري** (٢٢) (٨٠٦) (٤٥٨١)، **سنن أبي داود** (٤٧٣٠).

لەدوای ئەوەی پاک دەکرێنەوە و خاوێن دەبنەوە ئینجا دەنێردێنە ناو بەهەشت چونکە بە پاکی دەبێ بچنە بەهەشت بۆیان نیە بە گوناح و تاوانەوە بچنە بەهەشت.

جا ئەو قەنطەرەیە کە ابن تیمیة باسی کردوە لە ئەسڵدا بە مانا و واتای ئەوە دێ شوێنێکە کە وەکو ئەگەر بڵێی پارچەیەک لە وشکانی بکەوێتە نێوان دوو ئاو و دەریا ئەوە پێی دەگوترێ قەنطەرە یان وەکو پردێک نەک بەسەر ئاودا بڕوا شوێنێکی وشکانی پارچە شتێک بکەوێتە نێوان دوو ئاو کە ئاوەکان لێک جیا بکاتەوە دەڵێ شوێنەکەی کە قەنطەرەیە ئەو مەبەست و مانایە دەگەیەنێ جا لەوێوە ئەو خەڵکە خاوێن دەبنەوە.

جا فەرمودەیەکی تریشمان هەیە هی پێغەمبەرە (ﷺ) کە هەندێک لە دیمەنەکانی ژیانی بەرزەخی پێغەمبەر (ﷺ) لە یەک لە شەوەکان لە خەودا میکائیل و جوبڕائیل پێیان نیشاندا کە فەرمودەکە سەحیحە و لە سەحیحی بوخاری هاتوە، پێغەمبەر (ﷺ) لە یەک لە بڕگەکان فەرموی منیان بەسەر دارێکی بەرز خست، بینیم شورەیەکی یەک لە زێڕی یەک لە زیوی، وە ڕوبارێکی ڕەنگ شیری بەناودا دەهات، خەڵکانێک تێیدا وەستابون نیوەیان ڕەش هەڵگەڕابوو نیوەشیان سپی بوو، دەڵێ خەڵکانێک دەهاتن ئەو ڕەش و سپیانەیان لەناو ئەو ڕوبارە هەڵدەهێنا مەلەیان دەکرد دەهاتنە دەرەوە و پاک دەبونەوە لە کۆتاییەکەی کە پێغەمبەر پرسی (ﷺ) ئەوانە کێن؟ جوبڕائیل پێی دەڵێ ئەوانە ئومەتی تۆن گوناحکارەکان ئەوانەی خێر و شەڕیان بەرامبەر یەکە ئەو شوێنەش (جنة العدن) بوو پێشی تەواو داغڵی بەهەشتەکان ببن بە فەرمانی خوای رب العالمين یان ئەگەر بەبەر تکای پێغەمبەر کەوتبن (ﷺ) یان بە فەزڵی الله قوتاریان بوبێ و گوناحەکانیان هەموو لەسەر حیساب نەبوبێ ئەلەوێ خاوێن دەبنەوە و ئینجا تەواو دەچنە ناو بەهەشت.

**یەکەم کەس کە دەچێتە بەهەشت:**

**وَأَوَّلُ مَن يَسْتَفْتِحُ بَابَ الْجَنَّةِ النبي مُحَمَّدٌ (ﷺ) وَأَوَّلُ مَن يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنَ الأُمَمِ أُمَّتُهُ.**

جا لە پاشان کێ یەکەم کەسە کە بچنە بەهەشت لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە؟ ابن تیمیة -رحمە اللە- دەفەرموێ (وَأَوَّلُ مَن يَسْتَفْتِحُ بَابَ الْجَنَّةِ النبي مُحَمَّدٌ (ﷺ)) یەکەم کەس کە داوای کردنەوەی دەرگای بەهەشت دەکا و لێی دەکرێتەوە پێغەمبەرمان موحەمەدە (ﷺ) (وَأَوَّلُ مَن يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنَ الأُمَمِ أُمَّتُهُ) وە یەکەم ئومەتەکان کە بچنە بەهەشت لەدوای ئەوەی پێغەمبەران دەچن (علیهم الصلاة والسلام) ئومەتی پێغەمبەرە (ﷺ) (ئێمە اللە تعالی بەو ئومەتەمان حیسابکا و دەرگامان لێبکرێتەوە).

کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکی سەحیحدا دەفەرموێ: «أَنَا أَوَّلُ النَّاسِ يَشْفَعُ فِي الْجَنَّةِ» من یەکەم کەسم کە تکار کارم لە بەهەشتیان یەعنی تکا دەکەم و شەفاعەتم ڕادەگیرێ بەهەشتیش لە وەڵامی پێغەمبەر (ﷺ) کە داوای لێدەکا دەرگای لێبکرێتەوە خارزینی بەهەشت چ دەڵێ؟ دەڵێ «أُمِرتُ أن لا أفتحَ لأحدٍ قبلَكَ[1]» من فەرمانم پێکراوە لەلای اللە تعالی ئەو دەرگا نەکەمەوە لە کەس لە پێش تۆ تۆ یەکەم کەسی لێت دەکەمەوە و دەچیە ژورەوە ئینجا دەرگای لێ دەکەنەوە دەڵێن تۆ کێی؟ دەڵێ من موحەمەدم (ﷺ) دەرگاکە دەبێتەوە و پێغەمبەر دەچێتە ژورەوە (ﷺ).

## جۆرەکانی شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ):

وَلَه (ﷺ) فِي الْقِيَامَة ثَلاثُ شَفَاعَات: أَمَّا الشَّفَاعَةُ الأُولَى: فَيَشفَعُ فِيَ أَهْلِ الْمَوْقف حَتَّى يُقْضَى بَيْنَهُمْ بَعْدَ أَنْ يَتَرَاجَعَ الأَنْبِيَاءُ؛ آدَمُ، وَنُوحٌ، وَإِبْرَاهِيمُ، وَمُوسَى، وَعِيسى ابْنُ مَرْيَم عَنِ الشَّفَاعَة حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَيْه. وَأَمَّا الشَّفَاعَةُ الثَّانِيَةُ؛ فَيَشْفَعُ فِي أَهْلِ الْجَنَّة أَن يَدْخُلُوا الْجَنَّةَ. وَهَاتَانِ الشَّفَاعَتَانِ خَاصَّتَانِ لَهُ. وَأَمَّا الشَّفَاعَةُ الثَّالِثَةُ؛ فَيَشْفَعُ فِيمَن اسْتَحَقَّ النَّارَ، وَهَذِهِ الشَّفَاعَةُ لَهُ وَلِسَائِرِ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَغَيْرِهِمْ، فَيَشْفَعُ فِيمَن اسْتَحَقَّ النَّارَ أَن لاَّ يَدْخُلَهَا، وَيَشْفَعُ فِيمَنْ دَخَلَهَا أَن يَخْرُجَ مِنهَا. وَيُخْرِجُ اللهُ مِنَ النَّارِ أَقْوَامًا بِغَيرِ شَفَاعَةٍ؛ بَلْ بِفَضْلِه

[1] صحيح الجامع (١)، خرجه مسلم (١٩٧) باختلاف يسير.

وَرَحْمَتِهِ، وَيَبْقَى فِي الْجَنَّةِ فَضْلٌ عَمَّنْ دَخَلَهَا مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، فَيُنْشِئُ اللهُ لَهَا أَقْوَامًا فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ.

---

له شەرحی (الواسطية) گەیشتینه سەر باسی شەفاعەت و تكا كردن كه ئەویش خاڵێكی گرنگ و موهیمه له بڕوابون به ڕۆژی دوایی كه له قیامەتدا ڕوودەدات دەفەرموێ (وَلَه (ﷺ) فِي الْقِيَامَةِ ثَلاثُ شَفَاعَاتٍ) یانی باسی جۆرەكانی شەفاعەت و تكا دەكا دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) له قیامەتدا سێ شەفاعەت و تكای بۆ هەن (أَمَّا الشَّفَاعَةُ الأُوْلَى) شەفاعەت و تكاكردنی یەكەم (فَيَشفَعُ فِي أَهلِ المَوقِفِ حَتَّى يُقضَى بَيْنَهُم بَعدَ أَن يَتَرَاجَعَ الأَنْبِيَاءُ) ئەوە (الشفاعة العظمى)ی پێ دەگوترێ واته تكای مەزن ئەویش ئەو كاتەیه دەفەرموێ پێغەمبەر تكا دەكا (ﷺ) بۆ ئەهلی مەوقیف ئەوانەی له مەوقیفی مەیدانی حەشر و حیساب وەستاون مرۆڤ و مەردومەكان به تێكڕا هی هەموو گەل و نەتەوەكان هەتا الله تعالى دەست به مەحكەمه و قەزا و حوكمەكەی بكا له نێوانیاندا لەدوای ئەوەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) پاشەكشه دەكەن لەوەی كه داوا له الله تعالى بكەن ئەو تكایه بكەن مەحكەمەكه دەست پێبكا هەمویان دەینێرن بۆلای پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) له كۆتایی (آدَمُ وَنُوحٍ وَإِبْرَاهِيمُ وَمُوسَى وَعِيسَى بْنُ مَرْيَمَ عَنِ الشَّفَاعَةِ حَتَّى تَنتَهِيَ إِلَيهِ).

جا فەرمودەیەكی سەحیحه لەبەر دەستمان هەیه كه پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) له مەیدانی حەشر و حیسابدا خەڵكەكه تینی بۆ دێ نوێنەرانێك بۆخۆیان دروست دەكەن ئەو نوێنەرانه دەچنه لای باوكه ئادەم، داوای لێ دەكەن ئەی ئادەم تۆ باوكی هەموانی بپاڕێوه لەبەر خوای رب العالمين تكامان بۆ بكه كه الله مەحكەمەمان دەست پێبكا بەس حیسابمان لەگەڵ بكا دادوەری لەگەڵمان جێبەجێ بكا تا ئێمه ڕزگارمان بێ لەو ڕاوەستانەی مەوقیفی مەیدانی حەشر و حیساب، ئەویش دەڵێ من كاتی خۆی سەرپێچیەكم كردوه هی الله تعالى من ئەمڕۆ وا دەزانم الله تعالى غەزەب و توڕەبونێكی گرتوه نه له پێشتر ئەو

غەزەب و تورەبونەی هەبوە و نە لە پاشتر دەبیێ من «نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي» هەر خۆم هەر خۆم هەر خۆم ئەگەر قوتارم ببێ باشە واز بێنن لە من بڕۆنە لای نوح پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوانیش دێنە خزمەت نوح پێغەمبەر (ﷺ) کە نوح بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە یەکەم ڕەسولە وە ئادەمی دوەم حیسابە چونکە خەڵکەکە کە هەموی لەناوچوو لە نوحەوە خەڵک دوبارە بە پاشی داوە و زۆر بوەوە لەسەر ڕوی زەوی، ئەوەبوو پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) دەڵێن یا نوح تکامان بۆ بکە نوح پێغەمبەریش (ﷺ) بە هەمان شێوەی باوکە ئادەم وەڵامیان دەداتەوە و ڕەتیان دەکاتەوە بۆلای ئیبراهیم ڕەوانیان دەکا، ئیبراهیم پێغەمبەریش (ﷺ) بۆلای موسا ڕەوانەیان دەکا، موساش (ﷺ) بۆلای عیسای کوڕی مەریەم ڕەوانەیان دەکا، عیساش (ﷺ) دەفەرموێ ئەگەر ئەمڕۆ کەسێک شتێکی پێ بکرێ ئەها ئەو زاتەیە ئاماژە بۆ پێغەمبەرمان موحەمەد دەکا (ﷺ)، جا پێغەمبەر فەرموی نوێنەرەکان دێنە لای من، من وەکو پێغەمبەران وەڵامیان نادەمەوە و ڕەتیان ناکەمەوە دەچمە ژێر عەرشی الله تعالى سوجدە و کڕنۆش دەبەم حەمد و سوپاس و ستایشی الله دەکەم هەتا غەزەبی الله دەنیشێتەوە، لەگەڵ حەمد و سوپاس و ستایشەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا لە پاشان دەفەرموێ «ارْفَعْ رَأْسَكَ يَا مُحَمَّدُ» الله تعالى دەفەرموێ سەرت بڵندکە ئەی موحەمەد (ﷺ) «سَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ[1]» داوا بکە پێت بدەم تکا بکە تکات ڕابگرم، ئەوەیە (مَقَاما مَّحمُودا) کە دەفەرموێ پلە هەرە بەرزەکە بە پێغەمبەر دەبەخشرێ کە (الشفاعة العظمى)یە تکای هەرە مەزنە بە کەس ناکرێ و لە دەست کەسدا نیە تەنها هی پێغەمبەرە (ﷺ) ڕاگیر دەبێ لەلای الله تعالى مەحکەمەی خەڵکەکە دەست پێدەکا.

وە لە پاشان ابن تيمية دەفەرموێ (وَأَمَّا الشَّفَاعَةُ الثَّانِيَةُ) تکای دوەم بۆ پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) (فَيَشْفَعُ فِي أَهْلِ الْجَنَّةِ أَن يَدْخُلُوا الْجَنَّة) تکاکار دەبێ بۆ بەهەشتیەکان کە

[1] **صحيح البخاري** (٣٣٤٠) (٣٣٦١) (٤٧١٢)، **صحيح مسلم** (١٩٤) (١٩٥) (٢٢٧٨)، **سنن الترمذي** (٢٤٣٤).

بچنە نێو بەهەشت (وَهَاتَانَ الشَّفَاعَتَانِ خَاصَّتَانِ لَهُ) ئەو دوو شەفاعەت و تکاکارییە تایبەتن بە پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) کەس ناتوانێ بیکا ئیلا پێغەمبەرمان (ﷺ) دەیکا و لە توانایدا هەیە و الله تعالی ئەو ڕێزەی لێناوە (وَأَمَّا الشَّفَاعَةُ الثَّالِثَةُ) تکای سێیەم هی پێغەمبەر (ﷺ) (فَيَشْفَعُ فِيمَنِ اسْتَحَقَّ النَّارَ) تکاکار دەبێ بۆ ئەو کەسانەی لە بڕواداران کە شایستەیە بچێتە ناو ئاگری دۆزەخ کە داوا دەکا نەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ تکای بۆ دەکا (وَهَذِهِ الشَّفَاعَةُ لَهُ وَلِسَائِرِ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَغَيْرِهِمْ) بەڵام ئەو جۆرە لە شەفاعەت و تکاکارییە هەر هی پێغەمبەر نیە (ﷺ) بۆ پێغەمبەرەکانی تریش هەیە بۆ صدیقەکانیش هەیە بۆ جگە لەوانیش هەیە لە شەهیدەکان و هەتا زانایانیش (فَيَشْفَعُ فِيمَنِ اسْتَحَقَّ النَّارَ أَن لاَّ يَدْخُلَهَا) جا شەفاعەت و تکا دەکا بۆ ئەوەی شایستەیە بچێتە ناو ئاگری دۆزەخ تکا دەکا کە ئەی خوایە مەیبە ناو ئاگری دۆزەخ جا (وَيَشْفَعُ فِيمَنْ دَخَلَهَا أَن يَخْرُجَ مِنْهَا) بۆ ئەوانەش تکا دەکا کە چونەتە ناو ئاگری دۆزەخ الله تعالی دەریان بێنێ لەناو ئاگری دۆزەخ (وَيُخْرِجُ اللهُ مِنَ النَّارِ أَقْوَامًا بِغِيرِ شَفَاعَةٍ) خەڵکانێکیش الله تعالی دەری دەهێنێ لەناو ئاگری دۆزەخ بەبێ شەفاعەت و تکا (بَلْ بِفَضْلِهِ وَرَحْمَتِهِ) بەڵکو تەنها بە بەخشش و بەزەیی خۆی دەریان دەهێنێ (وَيَبْقَى فِي الْجَنَّةِ فَضْلٌ عَمَّنْ دَخَلَهَا مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، فَيُنْشِئُ اللهُ لَهَا أَقْوَامًا فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ) جا لە بەهەشتدا فەزڵ و زیادە دەمێنێتەوە لەوەی کە خەڵکی دونیا هەموی چوە و بەهەشتی بەشی خۆیانیان بردوە بەڵام هێشتا جێگا دەمێنێتەوە الله تعالی خەڵکانێک لە نوێ بەدی دەهێنێ و دەیانباتە ناو بەهەشت و بەهەشتیان پێ پڕ دەکاتەوە.

جا شەفاعەت و تکا کاری پێغەمبەر (ﷺ) (الله تعالی وەبەرمان بخا) زۆر گەورە و مەزنە (مَقَاما مَّحمُودا)ە، کە دەتوانین بڵێین هەندێک لە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەگەر هەمویان پاڵ بدەینە یەک شەفاعەت و تکار کاریەکان دەبێتە پێنج شەفاعەت و تکا کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی هەڵدەستێ و مافێتی بیکا:

یەکەمیان شەفاعەتی پێغەمبەرە (ﷺ) بۆ ئەوەی خەڵکی لە مەیدانی حەشر و حیسابدا ڕزگاریان ببێ و حیساب و مەحکەمەیان دەست پێبکا.

دووەمیان شەفاعەت و تکا بۆ بەهەشتیەکان کە بچنە ناو بەهەشت، هەر بەبێ شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەرگای بەهەشت ناکرێتەوە بۆ کەس نیە بەهەشتیش بێ و بچێتە ناو بەهەشت ئەوانە زۆر تایبەتن بە پێغەمبەر (ﷺ).

وە شەفاعەت و تکای سێیەم دەفەرموێ بۆ خەڵکانێکە کە چونە بەهەشت الله تعالی ئەجر و پاداشت و ثەوابیان زیاد بکا و بە زیادەوە بیانداتێ یانی پلەیان بەرزتر بێتەوە لە بەهەشت ئەوەش جۆرێکە لە تکاکاری کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هەیە و پێی دەکرێ.

وە شەفاعەت و تکای چوارەم ئەویش ئەوەیە هەندێک لە ئەهلی دۆزەخ شەفاعەت و تکایان بۆ دەکا هەتا الله تعالی دەریان بخا لەناو ئاگری دۆزەخ.

وە شەفاعەت و تکای پێنجەمیش شەفاعەت و تکای پێغەمبەرە (ﷺ) بۆ هەندێک لە دۆزەخیەکان کە الله تعالی عەزابی ئاگری دۆزەخیان لەسەر سوک بکا ئەگەر دەریشیان نەهێنێ.

وە هەندێک لە زانایانیش بەڵکو دەڵێن شەش شەفاعەتی هەیە پێغەمبەر (ﷺ) حەوتی هەیە و هەشتی هەیە و ...هتد بەڵام زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە لەوانە عبد الله بن جبرین - رحمە الله- ئەو زانایەی سعودیا دەفەرموێ هەمویان تێک هەڵکێشن لەو پێنجەدا خۆیان دەبیننەوە و خۆیان کۆ دەکەنەوە شەفاعەت و تکاکانی پێغەمبەر (ﷺ).

جا شەفاعە بە مانای ناوبژیوان و ناوەندکاری دێ بە مانای ناوەندی دەکەی و تکا دەکەی لەنێوان ئەو کەسە و لەلای کەسێکی دەسەڵاتدار کە الله تعالی یە -جل شئنە- لە قیامەتدا. جا ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە گوتمان (مَقَاما مَّحمُودا) بە پێغەمبەر (ﷺ) دەبەخشرێ وە تکای هەرە تایبەتە وە تکایە هەرە مەزن و (الشفاعة العظمی) و گەورەکەیە ئەویشیان سەحیحە بۆمان باس کردن کە لە کۆتایی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ «أَنَا لَهَا أَنَا

لَهَا» من بۆ ئەو شەفاعەت و تكایەم من بۆ ئەو شەفاعەت و تكایەم، هەتا ئایەتی قورئانیش موفەسیرین دەفەرمون مەبەست پێی ئەوەیە كە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحۡمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] وە ڕەنگە الله تعالى زیندوت بكاتەوە و پێت ببەخشێ (مَقَامًا مَّحۡمُودًا) كە ئەو شەفاعەت و تكایە مەزن و گەورەیە تایبەتە بە پێغەمبەر (ﷺ).

ئەوانەی كە خاوەن ئیمانبن بە زەڕەیەک و گەردیلەیەک ئیمانیان لە دڵدا جێگیر بوبێ و لێیان قبوڵ بوبێ نامێنێنەوە بە هەمیشەیی لەناو ئاگری دۆزەخ ئەگەر وەبەر شەفاعەت و تكای پێغەمبەریش نەكەون (ﷺ) وەبەر شەفاعەت و تكای هیچ كەسێكیش نەكەون چونكە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) «حَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ مِن ابن آدَمَ أَثَرَ السُّجُودِ[١]» هەریەک سوجدەیەكیشی بۆ الله بردبێ الله تعالى حەرامی دەكا شوێنی كڕنۆش و سوجدە بردنەكان بسوتێنرێ، لە پاشان ڕۆژێک دادێ یان فەرمویەتی بە هەمیشەیی نابێ ئەوەی بە قەد گەردیلەیەک ئیمانی لە دڵدا هەبێ جا خوای رب العالمين یش دەفەرموێ دەریان بێنن لەناو ئاگری دۆزەخ ئەوانەی كە بە قەدەر گەردیلەیەک لە دڵیاندا ئیمان و بڕوا جێگیربوە یان «مثقال أدنى ذرة من إيمان[٢]» كەمتر لە گەردیلەیەكیش ئەگەر ئیمان و بڕوا لەناو دڵیان هەیە ئەو فەرمودانەس لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە جێی دڵخۆشیە.

شەفاعەت و تكا دیارە مەرجی هەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە هەرچی هەستاوە و ڕاستبوەوە شەفاعەت و تكای پێ ناكرێ بەڵكو:

﴿وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ﴾ [الأنبياء: ٢٨] مەرجی یەكەم ئەوەیە دەبێ مۆڵەت و ئیزنی اللهی لەگەڵ بێ الله ئیزنی ئەو كەسە بدا كە شەفاعەت و تكا بكا.

دوەم جار مەرجی ئەوەیە دەبێ الله تعالى ڕازی بێ لەوەی شەفاعەت و تكای بۆ دەكرێ ئەویش یەعنی هەر الله تعالى دیاری دەكا لەخۆڕا ناتوانن پێغەمبەران و هیچ كەسێک

[١] صحيح البخاري (٦٥٧٣) (٢٢) (٨٠٦)، صحيح مسلم (١٨٢) (١٨٣) (١٨٤)، سنن أبي داود (٤٧٣٠).

[٢] أخرجه البخاري برقم (٧٥١٠) في التوحيد، باب: (كلام الرب عز وجل يوم القيامة مع الأنبياء وغيرهم . ومسلم برقم (١٩٣) [٣٢٦] في الإيمان، باب: في أدنى أهل الجنة منزلة فيها. عن أنس بن مالك رضي الله عنه.

شەفاعەت و تكا بۆ كەسێک بكا ئەگەر الله پێی ڕازی نەبێ -جل شئنه-، ئینجا الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ﴾ [النجم: ٢٦] چەند فریشتانێكیش هەن لە ئاسمان كە شەفاعەت و تكاكانیان هیچ دەور و ڕۆڵێک نابینێ بەڵكو ئیلا لەدوای ئەوە دەور و ڕۆڵی دەبێ كە الله تعالی مۆڵەت بدا بۆ كەسێكیش كە الله بیەوێ -جل شئنه- شەفاعەت و تكای بۆ بكرێ یان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ﴾ [البقرة: ١٢٣] هەیە شەفاعەت و تكا كاری بۆ ناكا، پێغەمبەر (ﷺ) چەند شەفاعەت و تكای بۆ ئەبو تاڵیبی مامی كرد داوایشی لێكرد ئیمان بێنێ پێی نەكرا هیدایەتی بدا و ڕێنوێنی بكا.

**ئەوەی لە ڕۆژی دوایی ڕوودەدات لە كیتاب و ئاثار باسكراوە:**

وَأَصْنَافُ مَا تَضَمَّنَتْهُ الدَّارُ الآخِرَةُ مِنَ الْحِسَابِ وَالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ وَالْجَنَّةِ وَالنَّارِ وَتَفَاصِيلُ ذَلِكَ مَذْكُورَةٌ فِي الْكُتُبِ الْمُنَزَّلَةِ مِنَ السَّمَاءِ، وَالآثَارِ مِنَ الْعِلْمِ الْمَأْثُورِ عَنِ الأَنْبِيَاءِ، وَفِي الْعِلْمِ الْمَوْرُوثِ عَنْ مُحَمَّدٍ (ﷺ) مِنْ ذَلِكَ مَا يَشْفِي وَيَكْفِي، فَمَنِ ابْتَغَاهُ وَجَدَهُ.

---

ئینجا ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ (وَأَصْنَافُ مَا تَضَمَّنَتْهُ الدَّارُ الآخِرَةُ مِنَ الْحِسَابِ وَالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ وَالْجَنَّةِ وَالنَّارِ وَتَفَاصِيلُ ذَلِكَ مَذْكُورَةٌ فِي الْكُتُبِ الْمُنَزَّلَةِ مِنَ السَّمَاءِ، وَالآثَارِ مِنَ الْعِلْمِ الْمَأْثُورِ عَنِ الأَنْبِيَاءِ، وَفِي الْعِلْمِ الْمَوْرُوثِ عَنْ مُحَمَّدٍ (ﷺ) مِنْ ذَلِكَ مَا يَشْفِي وَيَكْفِي، فَمَنِ ابْتَغَاهُ وَجَدَهُ) دەفەرموێ سنف و پۆلێنەكانی كە ڕۆژی دوایی لە خۆیەوە بگرێ لە حیساب كردن و ئەجر و پاداشت و تۆڵە سەندنەوە و بەهەشت و دۆزەخ و درێژەی ئەوانەش هەموی هاتوە لە پەرتوكی دابەزیو لە ئاسمان كە قورئان پیرۆزە وە لەو ئاسار و ڕیوایەتانەس هاتوە كە عیلم و زانستیەكە گێڕدراوەیە لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) یانی لە ڕێگای ئەوانیشەوە درێژەی پێ دراوە و بە تەفسیلی هاتوە ئەوەی من لێرە گوتومە مەبەستی لەوەیە یانی كورتە پوختە، وە لەو عیلمەش كە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمودە سەحیحەكان و گێڕدراوەیە، جا بایی ئەوەندە قورئان و سونە تێدا هەیە مەبەستی

لەوەیە ابن تیمیة کە (مَا یَشْفِي وَیَكْفِي) تەواو شیفای دڵت دەهێنێ و وە بەسیشە هەموو شتێکی تێدا باسکراوە بۆ کەسێک کە بیەوێ پێی دەگا وە تێدەگا ئەو کاتە.

**ئیمان هێنان بە قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕی:**

وَتُؤْمِنُ الْفِرْقَةُ النَّاجِيَةُ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ. وَالإِيمَانُ بِالْقَدَرِ عَلَى دَرجَتَينِ؛ كُلُّ دَرجَةٍ تَتَضَمَّنُ شَيْئَيْنِ. فَالدَّرَجَةُ الأُولَى: الإِيمَانُ بِأَنَّ اللهَ تَعَالَى عَلِيمٌ بِالْخَلْقِ، وَهُمْ عَامِلُونَ بِعِلْمِهِ الْقَدِيمِ الَّذِي هُوَ مَوْصُوفٌ بِهِ أَزَلاً وَأَبَدًا، وَعَلِمَ جَمِيعَ أَحْوَالِهِم مِّنَ الطَّاعَاتِ وَالْمَعَاصِي وَالأَرْزَاقِ وَالآجَالِ، ثُمَّ كَتَبَ اللهُ فِي اللَّوْحِ الْمَحْفُوظِ مَقَادِيرَ الْخَلْقِ. فَأَوَّلُ مَا خَلَقَ اللهُ الْقَلَمَ قَالَ لَهُ: اكْتُبْ. قَالَ: مَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبْ مَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. فَمَا أَصَابَ الإِنْسَانَ لَمْ يَكُن لِّيُخْطِئَهُ، وَمَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُن لِّيُصِيبَهُ، جَفَّتِ الأَقْلاَمُ، وَطُوِيَتِ الصُّحُفُ؛ كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ [الحج: ٧٠]، وَقَالَ: ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي أَنفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ [الحديد: ٢٢]. وَهَذَا التَّقْدِيرُ التَّابِعُ لِعِلْمِهِ سُبْحَانَهُ يَكُونُ فِي مَوَاضِعَ جُمْلَةً وَتَفْصِيلاً: فَقَدْ كَتَبَ فِي اللَّوْحِ الْمَحْفُوظِ مَا شَاءَ. وَإِذَا خَلَقَ جَسَدَ الْجَنِينِ قَبْلَ نَفْخِ الرُّوحِ فِيهِ؛ بَعَثَ إِلَيْهِ مَلَكًا، فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، فَيُقَالُ لَهُ: اكْتُبْ: رِزْقَهُ، وَأَجَلَهُ، وَعَمَلَهُ، وَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ.. وَنَحْوَ ذَلِكَ. فَهَذَا التَّقْدِيرُ قَدْ كَانَ يُنْكِرُهُ غُلاَةُ الْقَدَرِيَّةِ قَدِيمًا، وَمُنْكِرُهُ الْيَوْمَ قَلِيلٌ.

---

لە پاشان ابن تیمیة -رحمە اللە- کۆتایی هێنا بە بیروبڕوابون بە مردن و ژیانی بەرزەخی و ڕۆژی دوایی و حەشر و حیساب و میزان و سیرات و حەوز و وە لە پاشان ئەوەی لەوێ دەگوزەرا باسی لێوەکرد ئێستا دێتە سەر ئیمان و بڕوا بون بە قەزا و قەدەر دەفەرموێ (وَتُؤْمِنُ الْفِرْقَةُ النَّاجِيَةُ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ) دەفەرموێ کۆمەڵی ڕزگاربوو لە ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوایان هەیە بە قەدەری خوایی چ خەیربێ چ شەڕ ئیمانیان بە قەدەر هەیە.

جا قەدەر چیە؟ قەدەر ئەندازە کردنی هەموو شتەکانە لەلای الله تعالى -جل شئنه- کە الله دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيءٍ خَلَقنَـٰهُ بِقَدَر﴾ [القمر: ٤٩] دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيء فَقَدَّرَهُۥ تَقدِيرا﴾ [الفرقان: ٢] کەواتە الله تعالى هەموو شتێکی بەدی هێناوە بە ئەندازە کردنەوە ئەندازەی کردوە، هیچ شتێک نیە هەر لە خۆوەبێ و بە هەڕەمەکی بێ و بەبێ ئەوەی حیسابی بۆکرابێ هەموو شتێک ئەندازە کراوە حیسابی بۆ کراوە تەقدیر کراوە لەلای الله تعالى، تەقدیری خەلق و بەدیهێنان وە تەقدیری مشور خواردن و بەڕێوەبردن وە بەرنامە ڕێژی بۆی وە خەم لێخواردنی بە مانای ئەوەی ئەگەر مرۆڤ و ئینسانەکانن ناردنی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەموو تەقدیر و ئەندازەیەکی لەوپەڕی ڕێک و پێکی بۆ کراوە.

جا ابن تيمية -رحمه الله- دێ باسی مەڕاتیب و خاڵەکانی قەدەرمان بۆ دەکا کە ئەوە زۆر گرنگ و موهیمە جێگای سەرنجە ئەوها بە ڕێک و پێک دی و ڕیز کردنەوە ابن تيمية وای هێناوە و وەریگرتوە لە پێشینانی چاک زۆر کێشەکانی ئەو سوئاڵ و پرسیارانەی کە دەکرێ دەربارەی قەدەر چارەسەر دەبێ لێرەوە خەڵکانێکی قەدەری یان گومانیان بۆ دروست دەبێ ئایە الله تعالى دادوەرە لەوەی کە خەڵکێک گومڕایە خەڵکێک بڕوادارە وە خەڵکێک هیدایەت دراوە وە خەڵکێک گوناح و تاوان دەکا و تۆڵەشی لێ دەستێندرێتەوە ئەوانە چۆنە؟ بەو خاڵانە ڕون دەبێتەوە جێگای سەرنجە و دەبێ بایەخی باشی پێبدەین چونکە قەدەر و قەزا و قەدەر باس و خواسێکە قسەی لەسەر کراوە وە تاقم و کۆمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە لا ڕێ بونە زۆربەیان بەتایبەتی جەبریەکان و قەدەریەکان تێیدا.

جا دەفەرموێ (وَالإِيمَانُ بِالْقَدَرِ عَلَى دَرَجَتَينِ؛ كُلُّ دَرَجَةٍ تَتَضَمَّنُ شَيْئَيْنِ) ئیمان و بڕوابون بە قەدەری الله لەسەر دوو پلانە یانی لەسەر دوو خاڵە وە هەر یەک لەو خاڵ و پلانە دوو شت لەخۆوە دەگرێ، شێخ عبد العزيز بن باز -رحمه الله- دەفەرموێ ئێمە ئەگەر خەڵکی وا

تێنەگەیشت بڵێین ئیمان بە قەدەر چوار خاڵە مانیع نیە ئەو کات بە خەڵکەکە هەرچی بڵێین دوو دەرەجەیە و هەر دەرەجەیەکیشی دوو شت لەخۆوەگرێ هەر دەبێتەوە چوار لە کۆتاییەکەی چ بڵێین چوار خاڵە گرنگ ئەوەیە خەڵکەکە تێبگا هەر یەک قسەیە، جا ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ (الدَّرَجَةُ الأُولَى) دەرەجە و پلەی یەکەم لە قەدەردا (العلم والكتاب)ە عیلم و زانستی الله تعالی و کیتابەت و نوسینەوەی ئەو عیلم و زانستیەی لە (اللوح المحفوظ)دا (فَالدَّرَجَةُ الأُولَى) جا پلەی یەکەم و دەرەجەی یەکەم (الإيمَانُ بِأَنَّ اللهَ تَعَالَى عَلِيمٌ بِالْخَلْقِ، وَهُمْ عَامِلُونَ بِعِلْمِهِ الْقَدِيمِ الَّذِي هُوَ مَوْصُوفٌ بِهِ أَزَلاً وَأَبَدًا) دەفەرموێ ئیمان و بڕوامان دەبێ هەبێ بەوەی بەڕاستی و بێگومان الله تعالی عیلم و زانستی هەبوە بە بەدیهێنراوەکان وە ئەوەی کار و کردەوەیە کە بەدیهێنراوەکان دەیکەن و ئەنجامی دەدەن الله تعالی -جل شئنه- عیلم و زانستی ئەزەل و ئەوەلی پێ هەبوە (الَّذِي هُوَ مَوْصُوفٌ بِهِ أَزَلاً وَأَبَدًا) ئەو عیلم و زانستیەی الله تعالی یش سیفەتێکە بۆ الله الله تعالی وەسفێتی و وەسفی پێکراوە لە ئەزەل واتە ئەوەل و بەبێ سەرەتا وە تا ئەبەدیش بەبێ کۆتا (وَعَلِمَ جَمِيعَ أَحْوَالِهِم مِّنَ الطَّاعَاتِ وَالْمَعَاصِي وَالأَرْزَاقِ وَالآجَالِ) الله تعالی لە ئەزەل و ئەوەلەوە بەبێ سەرەتا عیلم و زانستی هەبوە بە حاڵ و باڵی مرۆڤەکان ئەوانەی تاعەتی دەکەن وە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەن ئەوانەی گوناح و تاوان دەکەن هەموی زانیوە الله تعالی بە ڕزق و ڕۆزیەکانیان بە ئەجەل و کاتە دیاریکراوەکانیان (ثُمَّ كَتَبَ اللهُ فِي اللَّوْحِ الْمَحْفُوظِ مَقَادِيرَ الْخَلْقِ) لە پاشان الله تعالی لە (اللَّوْح الْمَحْفُوظ)دا ئەندازەی بەدیهێنراوەکانی تۆمار کردوە وە نوسیوێتی (فَأَوَّلُ مَا خَلَقَ اللهُ الْقَلَمَ) یەکەمین شت کە الله بەدی هێنابێ قەڵەم بوە (قَالَ لَهُ: اكْتُبْ) فەرموی بنوسە (قَالَ: مَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبْ مَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) قەڵەمیش گوتی چی بنوسم ئەی خوای پەروەردگارم؟ الله تعالی فەرموی بنوسە ئەوەی دەبێ تا ڕۆژی دوایی.

جا دێینە سەری لە هەڵوێستەکان لە دوایی، ئایە قەڵەم لە پێش عەرش دروستکراوە و بەدیهێنراوە؟ یان عەرش لەپێش قەڵەمە؟ ئایە یان ئاو لەپێش عەرش و قەڵەمە؟ ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە لەنێوان ئەهلی سونە و جەماعەش باسی لێوە دەکەین بەس ئێستا بە کورتی دەمانەوێ بیکەینەوە کوردی.

ئینجا دەفەرموێ (فَمَا أَصَابَ الإِنْسَانَ لَمْ يَكُن لِّيُخْطِئَهُ) هەر کار و شتێک توشی مرۆڤ بوو نابێ ئەوە بەسەریدا بڕوات و هەڵە بکات و هەر دەبێ توشی بێ (وَمَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُن لِّيُصِيبَهُ) هەر شتێک بەسەری نەیە و ڕونەدا لەو تێپەڕ بکا نابێ توشی ببێ (جَفَّتِ الأَقْلاَمُ) قەڵەمەکان وشک بون مرەکەب و ئەوانەی پێی دەنوسرێ (وَطُوِيَتِ الصُّحُفُ) وە پەڕاوگەکان و ئەوانەی تێیدا دەنوسرێن لول درانەوە بە مەعنای هیچ نەماوەتەوە هەموو شتێک نوسراوەیە لەلای الله تعالی (كَمَا قَالَ تَعَالَى) هەروەکو الله تعالی فەرمویەتی: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ [الحج: ٧٠] الله تعالی دەفەرموێ ئایە نازانن کە بەڕاستی الله تعالی شارەزایە و عیلمی هەیە بەوەی لە ئاسمانە و لە زەوییە وە بەڕاستی ئەوە نوسراوەیە لە پەرتوکێک وە ئەوەش لەلای الله تعالی ئاسانە و سوک و سانایە قورس نیە، وە الله فەرمویەتی: ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي أَنفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ [الحديد: ٢٢] هیچ بەڵا و موسیبەتێک نیە لەسەر ڕوی زەوی یان لە خودی خۆتان کە توشتان ببێ ئیلا لە پەرتوکی دیاریکراو کە (اللَّوْح الْمَحْفُوظ)ە نوسراوەیە پێشی ئەوەی بەسەرتان بێ و ڕوبدا پێشی ئەوەی بۆتان باسبکرێ بەڕاستی ئەوە لەلای الله تعالی سوک و ئاسانە هیچ قورسی و گرانیەکی تێدا نیە.

جا کەواتە ئێمە دەبێ بێین ئەوە شیبکەینەوە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وەکو ابن تیمیة فەرموی چوار خاڵمان هەیە: (دەرەجەی یەکەم و دوەم): (دەرەجەی یەکەم دوو خاڵە: (العلم الكتاب)) (دەرەجەی دوەم دوو خاڵە: (الإرادة الخلق)).

کەواتە ئەو چوار خاڵە دەبێ شیکەینەوە و ڕونیان بکەینەوە تەواو پێی لە قەزا و قەدەر تێدەگەین وە کار و ئیشەکان لەلامان ئاسان دەبێ.

یەکەمیان کە دەڵێین (العلم) مەبەستمان پێی چیە؟ یانی الله تعالى -جل شئنە- عیلمی هەبوە مەبەستمان پێی عیلمی اللەیە (علم الله سبحانه وتعالى بجميع الأشياء محيط أزلا) عیلم و زانستی الله تعالى بە هەموو شتێک دەوری داوە یانی دەوری هەموو شتێکی داوە بە مانای ئەوەی هیچ شتێک نیە لە عیلمی الله بەدەربێ لە ئەزەل و ئەوەلەوە تا کۆتا و ئەبەدیش عیلمی الله تعالى بە هەموو شتێک هەیە ئەوەی شت بێ لە عیلمی الله تعالى دا هەیە -جل شئنە- بە ورد و درشتیەوە، جا الله تعالى ئەو عیلمەی تەقدیر کرد بۆ مرۆڤ و شتەکان وە نوسیشیەوە لە (اللَّوْح الْمَحْفُوظ) و تۆماری کرد.

جا لە پاشان ئیرادە و ویستی الله هەر شتێک ئیرادە و ویستی اللەی لەگەڵ نەبێ نابێ جا ئیرادەش گوتمان دوو جۆرە لە سەرەتای دەرسەکان (ئیرادەی کەونی تەقدیری، وە ئیرادەی شەرعی)، ئیرادەی کەونی و تەقدیری ئەو ئیرادەیە لەگەڵ هەموو شتێکدا دەبێ هەبێ خێربێ یان شەڕ باش بێ یان خراپ ئەوەی شتبێ بەدیبێ دەبێ ئیرادە و ویستی اللەی لەگەڵبێ ئەوە ئەوە دەگەیەنێ (إذا شاء كان وإذا لم يشأ لم يكن) هەر شتێک الله بیەوێ و ویستی لەگەڵدا بوبێ بەدیهاتوە و دەبێ هەر شتێک الله نەیهەوێ و ویستی لەگەڵدا نەبێ بەدی نایە و نابێ قەتاوقەت.

ئینجا لە پاشان لە ئیرادە دەبێ ئێمە هەڵوێستەیەک بکەین لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە چەند تێبینی و ڕونکردنەوەیەکی پێویستە:

یەکەم لەو ئیرادەی الله تعالى کە مەرتەبەیەکە و خاڵێکە لە خاڵەکانی قەزا و قەدەر دەبێ ئێمە پێمان وانەبێ عیلممان بە ئیرادەی الله تعالى وە هەیە -جل شئنە- پێش ئەوەی ڕوبدا، ئێمە نازانین ئایە بەیانی چی ڕوودەدا بۆخۆشمان عیلممان کەم و کورتە، بەس الله لە عیلمیدا هەبوە لە ئەزەل و ئەوەل لە (اللَّوْح الْمَحْفُوظ)یش نوسیویەتی بەیانی چی ڕودەدا ویستیشی

لەگەڵدا دەبێ هەتا ڕونەدا و نەیەتە بەردەست و چاوی ئێمە ئێمە هەستی پێناکەین و نازانین چیە، لەبەر ئەوە لەسەرمانە کەمتەر خەم نەبین لە ڕێگا گرتنەبەری هیدایەت و ڕێنوێنی و چاکە و خێر هەتاوەکو ئیرادەکەی خوای رب العالمین بەڵکو لەگەڵ خێر و چاکەکەماندابێ هەتا ئێمە چاکەکانمان بۆ تۆمار ببێ ئێمە نازانین بەیانیمان خێرە یان شەڕ بەڵام الله دەزانێ -جل شئنە-، بەڵام دەبێ تۆ بەرەو پیری خێرەکە بڕۆی الله عەقڵ و بیر و هۆشی پێداوی توانا و هێزیشی پێداوی وە ئەگەر تۆ ئەو نیەتەت لێهێنا و بەرەوچاکە چوی بۆشت بەدی دەهێنێ و ئیرادەشی لەگەڵدا دەبێ -جل شئنە-، بەڵام تۆ نازانی ئایە کامەیە لەبەر ئەوەی هێشتا نەتکردوە و عیلمت پێ نیە و عیلمت کەم و کورتە بەس الله دەزانێ -جل شئنە- لە ئەوەل و ئەزەلەوە کامەیە تۆی دەیکەی بەیانی خراپەکەیە یان چاکەکەیە.

ئینجا ئیرادەی شەرعییش ئەوەیە کە الله تعالی بە شتەکە ڕازییە و خۆشی دەوێ ناردنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموو پەرتوکە ئاسمانیەکان فەرمانەکانی الله تعالی ئەوانەی خۆش دەوێ ڕازییە پێی، ئەگەر تۆ کردت هەر شتێک لە ئیشە خێرەکان ئیرادەی کەونیشی لەگەڵ بوە کە الله بۆی هێنایتە کایەوە بۆی بەدیهێناوی وە ئەوکاتە ئیرادەی شەرعیشی لەگەڵە، ئەگەر هەر شتێک لە شەڕ و خراپە و تاوانەکان بەرپا بوو کرا لە تاوان و گوناحەکان بەس ئیرادەی کەونی لەگەڵە ئیرادەی شەرعی لەگەڵ نیە ئەوکاتە چونکە الله تعالی پێی ڕازی نیە و خۆشی ناوێ بەس بۆت بەدی دەهێنێ و دروستی دەکا لەپێناو تاقیکردنەوەت.

وە خاڵی کۆتایی لە مەڕتەبە و خاڵەکانی قەزا و قەدەر خەلقە ئیجادە الله تعالی خێر و شەڕ دەهێنێتە کایەوە و ئیجادی دەکا و خەلقی دەکا بەڵام بە شەڕ ڕازی نیە بە خێر ڕازییە، لەبەرچی بە شەڕ ڕازی نیە و دەیهێنێتە کایەوە و دروستیشی دەکا مۆڵەتی تۆش دەدا بیکەی؟ هەتا ئینتیحان و تاقیکردنەوە دروستبێ خۆ ئەگەر وا نەکا -جل شئنە- ئینتیحان و تاقیکردنەوە دروست نابێ ئەو کاتە لێنەگەڕێ تۆ شەڕەکە بکەی لەگەڵیشیدا نەبێ الله

تعالی ڕێت پێ بگرێ وە بۆت نەهێنێتە کایەوە و دروست نەکا ئیشەکە نابێ، ئا ئەو کاتە فەرقت نیە لەگەڵ کەسە باشەکە باش و خراپەکە لێک جیا ناکرێتەوە، بەدیار ناکەوێ کێ بە ویستی خۆی بە ئارەزوی خۆی باشەی دەوێ کێ خراپەی دەبێ، ئەوکاتە ڕەش و سپی تێکەڵ یەک دەبێ باش و خراپ لێک جیا نابێتەوە لەو پێناوەدا ئینتیحان و تاقیکردنەوە بەدی ناهێ و دروست نابێ هەر لەبەر ئەوەیە الله تعالی لەگەڵ شەڕ و خراپەدا نیە وە خۆشی ناوێ وە دژە پێی ئەوەشی بۆمان ڕون کردوەتەوە لە ڕێی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەس تەنها ویستی کەونی لەگەڵدا دەبێ وە بۆشت دەهێنێتە کایەوە و دروستی دەکا کە بە دڵی خۆت تۆ یان بە دەستی خۆت هەڵی دەبژێری ئەو کاتە تا ئینتیحان و تاقیکردنەوەکە دروست ببێ.

ئایە کامە لە مەخلوق و بەدیهێراوەکان لە پێشتر دروستکراوە و بەدیهێنراوە ئایە عەڕشی خوای رب العالمین بوە یان قەڵەم بوە یان ئاو بوە یان تاریکی و ڕوناکی بوە؟ کە ئیختیلاف و جیاوازی لەسەر ئەو خاڵ و قسانە هەن کە ئێستا گوتمان لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە و لە تاقم و کۆمەڵەکانی تریش.

ئەهلی سونە و جەماعە ئیختیلاف و جیاوازییان هەیە لەسەر ئەوەی ئایە عەڕش لەپێش قەڵەم بەدیهێنراوە و دروستکراوە ئەویش کە مەخلوقی الله تعالی یە یەکێکە لە هەرە مەخلوقە گەورەکان عەڕشی الله تعالی یان قەڵەم بەپێش عەڕش کەوتوە لە بەدیهاتن و دروستکردنیدا، ئەهلی سونە و جەماعە کە جمهور و زۆرینەی سەلەف ابن تیمیة -رحمه الله- وای ڕیوایەت دەکا لە پەرتوکە نایابەکەی مجموع الفتاوی (ج: ١٨ ص: ٢١٣) دەفەرموێ جمهور و گۆڕی سەلەفی ساڵح لەسەر ئەو بۆچونەن کە ابن تیمیةش ئەوەی پێ ڕاجیح و پەسەندە دەفەرموێ عەڕشی خوای رب العالمین لەپێش قەڵەم بەدیهاتوە و دروستکراوە بەو بەڵگانەی داهاتوو:

یەکەم دەفەرموێ بەڵگەی ئەو فەرمودەی کە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس گێڕاویەتیەوە -رضي الله عنهما- فەرموی: «سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ» گوێبیستی پێغەمبەری الله (ﷺ) بوم فەرموی «كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ» الله تعالی ئەندازە و تەقدیر کردنی هەموو بەدیهێنراوەکانی لەپێش بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ ئەندازە کردوە و نوسیویەتیەوە و دایناوە جا لە پاشان دەفەرموێ «قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ[1]» ئەوکاتە عەرشی الله تعالی لەسەر ئاو بوو.

کەواتە ئەو بەڵگەیە وە ئەو فەرمودەیە ابن تیمیة و کۆڕی سەلەفی ساڵح دەفەرمون بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەقدیر کردن ئایە لەپاش خەلقە یان خەلق لەپاش تەقدیرە؟ دەفەرمون تەقدیر ڕویداوە و دەبێ لەپاش خەلقی یانی بەدیهاتنی دروستکردنی عەرش، بۆ؟ چونکە دەڵێن «وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ» لەو فەرمودە ئەوە دەگەیەنێ کە الله تعالی عەرشی لەسەر ئاو بوە ئینجا تەقدیری ئەو شتانەی کردوە پەنجا هەزار ساڵ پێشی ئەوەی کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی بێنێ، کەواتە دەڵێن ئەوە بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆیە بەڵام کە قەڵەمی دروستکردوە الله تعالی ئا ئەو کاتە فەرمویەتی بنوسە ئەو شتانە ئەو کاتە بوە کە سەرەتای نوسینی ئەو تەقدیرانە بوە، کەواتە تەقدیرەکانی شتەکان وە نوسینیان لەدوای ئەوەی کە قەڵەمی دروست کردوە الله تعالی هەموی دەکەوێتە دوای بەدیهاتنی عەرشی الله تعالی لەپێشتر عەرشی الله تعالی هەبوە.

جا عوبادەی کوڕی صامیتیش دەفەرموێ: «سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمُ» یەکەمین شت کە الله بەدی هێناوە قەڵەم بوە «فَقَالَ لَهُ: اكْتُبْ. قَالَ: يا رَبِّ، مَا أَكْتُبُ؟» الله تعالی گوتیە قەڵەم بنوسە، قەڵەم گوتی چی بنوسم ئەی خوای پەروەردگارم؟ «قَالَ:

[1] صحيح مسلم (٢٦٥٣)، سنن الترمذي (٢١٥٦)، مسند أحمد (٦٥٧٩).

اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ[1]» ئەندازە و تەقدیر کردنی هەموو شتەکان بنوسە هەتا قیامەت دادێ.

ئینجا لە فەرمودەیەکی تریش کە عیمڕانی کوڕی حوسێن گێڕاویەتیەوە -رضي الله عنهما- دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: «كَانَ اللَّهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ غَيْرُهُ» الله هەبوو لە ئەوەل و ئەزەلەوە هەر هەبوە هیچ شتێک جگە لە الله نەبوە «وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ» جا عەرشی الله تعالی یش لەسەر ئاو بوە، ئینجا لە پاشان دەفەرموێ «وَكَتَبَ فِي الذِّكْرِ كُلَّ شَيْءٍ، وَخَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ[2]» ئینجا لە زیکر واتە لە (اللوح المحفوظ) شتەکانی نوسی الله تعالی هەموو شتەکان ئینجا ئاسمان و زەویشی بەدیهێنا و دروستی کرد.

جا بەو بەڵگانە جمهوری سەلەفی ساڵح وە ابن تیمیة دەفەرمون ئەوە ڕاجیح و پەسەندە عەرشی الله تعالی پێشی قەڵەم بەدیهاتوە و دروست کراوە، ئینجا ئایە دەشێ و دەگونجێ شتێکی بێ گیان الله تعالی بیدوێنێ و قسەی لەگەڵ بکا و فەرمانی پێبکا و وەڵامی هەبێ بۆ الله؟ بەڵێ لەلای الله تعالی شتێکی ئاساییە وە زۆریش ئاسانە شتە بێ گیانەکانیش دەدوێنرێن و فەرمانیان پێ دەکرێ و وەڵام و جوابیشیان دەبێ هەندێک جار دەیەها بەڵگەمان هەیە یەکێک لە بەڵگەکان ئەوەیە کە الله تعالی لەگەڵ قەڵەم دواوە و قسەی لەگەڵ کردوە کە قەڵەم شتێکی جامیدە و بێ گیانە وە قەڵەمیش وەڵامی هەبوە بۆ الله تعالی ئەوەی لە الله دەوەشێتەوە و بۆ الله دەگونجێ بۆ ئێمەی مەخلوق و بەدیهێنراو هەندێک جار ناشێ و ناگونجێ و ناتوانین.

جا بۆچونێکیش هەیە هی کەمینەی پێشینانی چاکە وە ژمارەیەک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعەش ئەو بۆچونەیان هەیە کە دەڵێن قەڵەم لەپێش عەرش بەدی هاتوە.

[1] سنن أبي داود (٤٧٠٠)، حكم الحديث: صحيح، سنن الترمذي (٢١٥٥) (٣٣١٩)، مسند أحمد (٢٢٧٠٥) (٢٢٧٠٧).

[2] صحيح البخاري (٣١٩١) (٣١٩٠) (٤٣٦٥)، سنن الترمذي (٣٩٥١)، مسند أحمد (١٩٨٢٢) (١٩٨٧٦) (١٩٨٨٦).

وە دوو بۆچونی زۆر لاوازیش هەن کە بەڵگەکانیان ئەوەندە بەهێز نین بەڵام هەر باسی لێکراوە لە پەرتوکەکانی دەربارەی عەقیدە و بیروبڕوا بە دور و درێژی یان فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک شەرح و ڕاڤە کراون ئەویشیان دەڵێن هەندێک لە زانایان بۆچونیان وایە ئاو یەکەم بەدیهێنراوی الله تعالى یە واتە بەدیهاتنی ئاو لەپێش عەرش و قەڵەمیشە، وە بۆچونەکەی تر ئەویشیان هەر لاواز و زەعیفە کە دەڵێن ڕوناکی و تاریکایی بە دیهێنراوی الله تعالى ن ئەو دوانەیان لەپێش عەرش و قەڵەم و ئاو، ئەو بۆچونانە بەڵگە و دەلیلێکی ئەوتۆیان نیە بەڵام لە شەرحی عەقیدەی (الطحاوية) باسی لێوە کراوە.

ئایە عەرشی خوای رب العالمين -جل شئنه- لە چیەوە دروستکراوە؟ ئێمە ئێستا باسی عەرشی نیە بەڵام زۆر بە کورتی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە چونکە باسەکە هاتە بەرباس ئێمە نازانین بزەبت لەچی دروستکراوە گرنگ ئەوەیە دەزانین عەرش یەکێکە لە بەدیهێنراوە زۆر گەورەکانی الله تعالى وە عەرش زۆر گەورەترە لە کورسی الله تعالى وە کورسی الله تعالى یش: ﴿وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ [البقرة: ٢٥٥] یەعنی لە ئاسمانەکان و زەوی فراوانترە گەورەترە هەموی لەخۆوە دەگرێ ئەوەندە فراوان و گەورەیە، دەبێ عەرش چەندبێ کاتێ کە ئەگەر کورسی الله تعالى بە قەدەر عەرشی الله تعالى لە ئەثەردا هاتوە وەکو ئەڵقەیەکە هەڵیدەیتە بیابان و سەحرا و چۆڵایەتیەک.

وە لە پاشان دەگەینە سەر ئەوەی ئایە هەندێک لە مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان هەمیشەین و ئەبەدین دەمێنێنەوە قەت لەناو چونیان بۆ نەبێ؟ بەڵێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونی ڕاجیح و پەسەند بەڵکو تەنانەت ابن تيمية دەفەرموێ (اتفق سلف الأمة وأئمتها وسائر أهل السنة والجماعة على ذلك) دەفەرموێ یەک دەنگی زانایان و پێشینانی ئومەت وە زانایان و پێشەوایانی ئومەتی ئیسلام وە تێکڕای ئەهلی سونە و جەماعە لەسەر ئەوەیە هەشت شت هەن هەمیشەین لەناو چونیان بۆ نیە، سەرەتایان بۆ هەیە بەدیهێنراون مەخلوقن

بەڵام کۆتاییان بۆ نیە، ئەو هەشت شتەش هەندێک لە زانایان کۆیان کردوەتەوە لەو دوو دێرە شیعرەدا کە دەفەرمون:

(ثمانية حكم البقاء يعمها

من الخلق والباقون في حيز العدم

***

هي العرش والكرسي ونار وجنة

وعجب وأرواح كذا اللوح والقلم)

دەفەرمون هەشت شت هەن حوکم و مانەوەی هەمیشەییان بۆ دراوە دەیانگرێتەوە و گشتیە بۆیان ئەو حوکمە لە مەخلوق و بەدیهێنراوی الله تعالی ن وە باقی شتەکانی تر جگە لە ئەو هەشت شتە دەچنەوە فەنا و لەناو دەچن، یەکەم لەو هەشت شتانە عەرشی الله تعالی یە عەرشی الله تعالی سەرەتای بۆ هەیە و بەدیهێنراوە مەخلوقە بەڵام کۆتایی بۆ نیە و لەناو ناچێ، وە کورسی الله تعالی یە -جل شئنە- سەرەتای بۆ هەیە و بەدیهێنراوە بەڵام کۆتایی بۆ نیە و لەناو ناچێ، وە ئاگری دۆزەخە سەرەتایی و بەدیهاتنی بۆ هەیە بەڵام لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لەناو ناچێ، وە لە پاشان بەهەشتی پان و پۆڕ و پڕ ناز و نیعمەتە سەرەتای بۆ هەیە لە بەدیهاتندا بەڵام کۆتایی بۆ نیە لەناو ناچێ، عەجب و ذەنبە واتە ئەو عەجب و ذەنبەی کە مرۆڤەکان تێیاندا دەمێنێتەوە لەسەر ئەوە مرۆڤ جارێکی تر زیندو دەکرێنەوە ئەوەشیان هی مرۆڤە و قەتاوقەت لەناو چونی نیە الله تعالی وایکردوە بەڵام سەرەتای بۆ هەبوە و دروستکراوە و بەدیهێنراوە، وە لە پاشان ڕۆح و گیانی مرۆڤەکان و هی گیان لەبەران ئەوانە لەناو چونی بۆ نیە ڕۆح و گیانی مرۆڤەکان ئەگەر لاشە و جەستەیان دەڕزێ دەمرێ لەناو چونی بۆ هەیە بەڵام ڕۆح و گیان دەکێشرێ لە لاشەکەیدا و دەبردرێتە دەر ئەو کاتە ئەو کەسە پێی دەگوترێ مردو ڕۆح و گیانەکە نامرێ هەر دەمێنێتەوە و هەمیشەییە بەڵام سەرەتای هەیە لەبەر ئەوەی بەدیهێنراوە، لەوحی الله تعالی

(اللوح المحفوظ) کە شتەکانی تێدا نوسراوەیە و زۆریش فراوانە بە ورد و درشتی الله تعالی فەرمانی کرد بە قەڵەم شتەکانی تێدا بنوسێتەوە ئەویشیان لە بەدیهێنراوەکانە سەرەتای بۆ هەیە بەڵام کۆتایی بۆ نیە، وە قەڵەمیش ئەو قەڵەمەی یەکەمین جار الله تعالی بەدی هێناوە ئەو قەڵەمە سەرەتای بۆ هەیە لە بەدیهاتندا بەڵام کۆتایی بۆ نیە و لەناو ناچێ. جا لە پاشان دەمانەوێ بچینە سەر ئەوەی با بزانین قەڵەمەکان ئایە یەک قەڵەمن یان زۆرن؟ وە نوسینەکان چەندن بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعەش لەو بوارە بخەینە بەر دەستی ئێوەی بەڕێز و سەنگین.

تەقدیر کردنی ئەندازە کردنی شتەکان و نوسینەوەیان هەر یەک شت نیە وە هەریەک قەڵەمیش نیە قەڵەم هەندێک جار بە ئەقلام ناوی هاتوە لە دەقەکان هەندێک جار بە قەڵەم و موفرەد و تاکیش ناوی هاتوە واتە هەر یەک نین، بەڵکو تەقدیرەکان لەلای الله تعالی زانایان هەندێکیان دەفەرمون چوار تەقدیرن هەندێک دەفەرمون پێنجن بەڵام بۆچونی ڕاجیح و پەسەند ئەوەیە کە (والله أعلم) شێخ عبد العزيز بن باز -رحمە الله- لە شەرح و ڕاڤەی طەحاویە زۆر جوان و لەجێ دەفەرموێ دەفەرموێ (الأقلام لا يُحصيها إلا الله جلَّ وعلا) قەڵەمەکانی خوایی ناژمێردرێن و ناتوانی بڵێی چەندن و ژمارەیان بۆ دیاری بکەی ئیلا الله دەزانێ -جل شئنە- چەندن (فالجزم بأنها أربعة ليس بجيدٍ) دەفەرموێ پێداگری لەسەر ئەوەی بڵێی تەنها چوارن کە هەندێک لە زانایان دەفەرمون دەڵێ بە باشی نازانم (وقد ذكر ابنُ القيم في بعض كتبه كذلك الأقلام الأربعة) ابن القيم لە هەندێک لە پەرتوکەکانی فەرمویەتی چوار قەڵەمەکان باسی لەوە کردوە (ولكن ليس المعنى أنه ليس هناك قلم آخر) بەڵام قسەکەی ابن القيم یش ئەوە ناگەیەنێ کە هەر تەنها چوارن و پێنجەمیان بۆ نەبێ و قەڵەمی تر نەبێ وە (قد قيل: إن هناك قلمًا خامسًا) هەندێک جار ڕیوایەت کراوە و گوتراویشە دەڵێن قەڵەمی پێنجەمیش هەیە (وهو ما يُكتب به الحوادث في السنة؛ فإنَّ في السنة في ليلة القدر) کە لە دوای ئەو چوارەی ئێستا ئێمە باسی دەکەین

پێنجەمەکەشی دەفەرموێ هەندێک لە زانایان دەڵێن ئەو قەڵەمە تایبەتەیە کە لە شەوانی قەدر ئەندازەی شتەکانی پێ دەکرێ ئەجەل و تەمەنی مرۆڤەکان وە ڕزق و ڕۆزی ساڵێکیان بۆ دیاری دەکرێتەوە و دەنوسرێتەوە (فالحاصل) دەفەموێ دروێنەی قسەکان (أنَّ الأقلام لا يجوز الجزم بأنها أربعة فقط) دەفەرموێ نابێ بگوترێ تەنها چوار قەڵەمە و پێداگری لەسەر ئەوە بکرێ (فالأقلام كثيرة، والله هو الذي يعلمها ويُحصيها؛ ولهذا قال في حديث المعراج: يسمع به صريف الأقلام) دەفەرموێ جا قەڵەمەکان زۆرن تەنها الله ژمارەیان دەزانێ وە الله عیلم و زانستی پێیان هەیە لەبەر ئەوەشە دەڵێ لە فەرمودەی میعڕاج دەگوترێ گوێبیستی دەنگی چیڕە چیڕی نوسینی قەڵەمەکان بون بە ئەقلام ناوی هاتوە جەمع و کۆیە مەعنای زۆرە (قد تكون أربعةً) ڕەنگە چواربێ (وقد تكون مئةً) ڕەنگە سەدیش بێ ئێمە نازانین (وقد تكون آلافًا) ڕەنگە هەزاریش بێ ئێمە نازانین (وقد يكون لكل شيءٍ قلم خاصّ) وە دەشبێ و دەگونجێ و ئەگەری ئەوەش بەخۆیەوە هەڵدەگرێ هەر شتێک قەڵەمێکی تایبەتی خۆی هەبێ بینوسێ (فربنا هو العالم بهذه الأشياء سبحانه وتعالى) خوای پەروەردگاری ئێمە عیلم و زانستی هەیە بەوە ئەو دەزانێ چەندە ئەو بۆچونە پەسەندە و ئێمەش قەناعەتمان پێی هەیە (والله أعلم بالصواب).

جا قەڵەمەکان کە چوارەکە ناوی دەهێنرێ هەندێک لە زانایان باسیان کردوە و ابن القيم یش دەفەرموێ دەڵێن:

قەڵەمی یەکەم ئەوەیە قەڵەمە گشتیەکەیە کە هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان دەگرێتەوە.

قەڵەمی دوەم ئەو پێنوس و قەڵەمەیە کە الله تعالى لەو کاتەی ئادەمی دروستکرد ئەویشیان عام و گشتیە بەڵام لە ئادەمەوە دەست پێدەکا و لە بەدیهێنراوێکی تایبەتی الله کە ئادەمە لەو کاتەوە نوسراوەکانی پێ دەکرێ.

وە قەڵەمی سێیەمیشیان ئەو کاتەیە کە الله تعالى فریشتە ڕەوانە دەکات بۆلای کۆرپەلە لەنێو ڕەحمی دایکی کە شتەکانی لەسەر دەنوسێ چوار وشەکان کە ڕزق و ڕۆزی لە پاشان ئایە بەد بەختە یان بەختەوەرە ئەو کەسە وە لە پاشانەکە تەمەنی دیاری دەکرێ و ئەجەلەکەی لەسەر دەنوسێ.

وە قەڵەمی چوارەمیشیان ئەو قەڵەمەیە کە مرۆڤەکان کاتێک پێدەگەن و باڵغ دەبن فریشتەکانی لای ڕاست و چەپی یان ئەو فریشتانەی چاکە و خراپە دەنوسن ئەوان ئەو قەڵەمەیە کە پێی دەنوسن لەسەری چاکە و خراپەکان.

جا هەندێکیش دەفەرمون قەڵەمی پێنجەمیش ئەوەی شەوی (ليلة القدر)ە کە تەمەنی ساڵانەی مرۆڤی پێ دیاری دەکرێ وە ئەجەلی پێ دیاری دەکرێ وە لە پاشان ڕزق و ڕۆزی مرۆڤەکانی پێ دیاری دەکرێ.

چونکە دیارە تەقدیر کردنەکان لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەو تەقدیرانەن:

یەکەم تەقدیرکردنێکی شامیل و گشتی بۆ هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان عەمەلەکانیان وە عیلمیان هەموی نوسراوەیە کە لە (اللوح المحفوظ)دا بۆچونی ڕاجیح و پەسەندیش لە (اللوح المحفوظ)دا بە ورد و درشتی شتەکان نوسراوە و هیچ شتێک نیە وردیش بێ لە عیلمی الله بەدەربێ -جل شئنه- وەکو هەندێک تاقم و کۆمەڵ دەڵێن.

وە تەقدیر و ئەندازەی دوەم میثاقەکەیە کاتێک خوای رب العالمين دەفەرموێ لە ئادەم و نەوەکانی وەریگرتوە کاتێک ئێمە زورییەت بوینە و لە پشتی باوکە ئادەم بوینە لەو ئایەتەی کە خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ﴾ [الأعراف: ١٧٢] ئەو کاتەی الله تعالى لە پشتی باوکە ئادەم زورییەتەکەی دەرهێنا هەر هەمویان لە نێر و لە مێ لە هەموو مرۆڤەکانی نەوەی ئادەم لە ئادەمەوە تاوەکو قیامەت دادێ الله تعالى دەری هێنان فەرموی ئایە من الله و پەروەردگاری ئێوە نیم

هەمویان بە یەكدەنگی گوتیان بەڵێ ئەوە فیطرەتە كە هەموو نەوەكانی ئادەم و مرۆڤەكان لەسەر ئەو فیطرەتەدان و لە كاتی (قالوا بلى) كە وا مەشهورە و دەگوترێ الله تعالى كە پرسیاری لێكردونە دانیان بە بون و وجودی اللەدا ناوە و وە بە خوایەتی الله تعالى -جل شئنە-.

وە تەقدیر و ئەندازەی سێیەم تەقدیر كردنی عومر و تەمەنەكانە تەقدیری ڕزق و ڕۆزی بەندەكانە وە مۆڵەتی دیاریكراویان لە ئەجەل بۆیان دیاری دەكرێ عەمەل و كردەوەكانیانە ئایە بەدبەختن یان بەختەوەرن لە كاتی كۆرپەلەن لەناو ڕەحمی دایكیان ئەو فەرمودەش لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە و زۆرجار بەبەر گوێتان كەوتوە كە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) لە تەمەن و كاتێكی دیاریكراودا فریشتەكان دێن ئەو چوار شتە لەسەر كۆرپەلە دادەمەزرێنن و دەینوسن و دادەنێن.

ئینجا تەقدیری چوارەمیشیان تەقدیری ساڵانەیە كە خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾ [الدخان: ٤] كە ابن عباس لە تەفسیری ئەو ئایەتە دەفەرموێ (يكتب من أم الكتاب في ليلة القدر ما هو كاهن في السنة من الخير والشر والأرزاق) دەفەرموێ ساڵانە الله تعالى لە (أم الكتاب) كە (اللوح المحفوظ)ە لە شەوی (ليلة القدر)دا ئەوەی دەگوزەرێ و ڕوددەدا ساڵێكی تەواو بەسەر ئەو مرۆڤە لە خەیر و شەڕ وە لە ڕزق و ڕۆزی وە لە ئەجەل و تەمەن هەموی دیاری دەكرێ.

وە پێنجەمینیان تەقدیری ڕۆژانەیە كە الله تعالى هەموو ڕۆژێك تەقدیر و ئەندازەی هەیە بۆ ئەو ڕۆژە كە چی تێدا ڕوددەدا لە خەیر و لە شەڕ و لە مردن و لە ژیان و لە ڕزق و لە ڕۆزی كە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ [الرحمن: ٢٩] ئەو مانایە دەگەیەنێ زانایان دەفەرمون (فالله تعالى كل يوم يغفر ذنبا، ويفرج كربا، ويرفع قوما، ويضع آخرين) ڕۆژانە الله تعالى لە یەك ڕۆژ هەندێك جار لە هەندێك تاوان و گوناح خۆش دەبێ هەندێك دەرگای بەخێر و فەرەحنایی دەكاتەوە لە خەڵكێكی كە دەرگای لەسەر

گیراوەیە و بەر تەنگی توش بوە وە هەندێکیان بەرز دەکاتەوە هەندێکیان نزم دەکا، جا بەڵێ ئەو تەقدیر و ئەندازانە ئاوان لەلای الله تعالی -جل شئنه-.

جا لە پاشان گرنگ ئەوەیە ئێمە سەبارەت بە تەقدیری الله تعالی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەبێ چۆن تەسلیم بین؟ چۆن بڕوامان پێی هەبێ؟ دەبێ بڕوامان وابێ: ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ [الحدید: ٢٢] الله تعالی دەفەرموێ هیچ بەڵا و موسیبەتێک نیە کار و ئیشێک نیە لەسەر ڕوی زەوی توشی ئێوەبێ وە بە خودی ئێوە توشتان ببێ لە گەورە لە بچوک ئیلا لە پەرتوکێکی دیاریکراو کە مەبەست پێی (اللوح المحفوظ)ە نوسراوەیە پێشی شتەکە ڕوبدا و بێتە کایەوە.

جا ﴿نَّبۡرَأَهَآ﴾ هایەکەی ئێمە بیگێڕینەوە بۆ موسیبە؟ یانی بڵێین پێشی ئەوەی موسیبەتەکە ڕوبدا یان بۆ عەرزی بگێڕینەوە؟ ئەوەی لەسەر زەوی ڕوددەدا یان بۆ ئەنفوسی بگێڕینەوە؟ لە خودی خۆتان، هەموو یەک مانای دەگەیەنێ عثیمین دەفەرموێ -رحمه الله- و زانایانی تری پێشتریش کەواتە گرنگ ئەوەیە ڕوداوەکان هیچیان لە بەڵا و موسیبەت لە خێر و خۆشی لە ئەوەی توشتان دەبێ هەر هەموی پێشی بەدیهاتنی پێشی ڕودانی نوسراوەیە لەلای الله تعالی لە (اللوح المحفوظ)دا وە پێش ئەوەی نوسراوەبێ لە (اللوح المحفوظ)یشدا لەناو عیلمی الله تعالی هەبوە -جل شئنه- الله عیلم و زانستی پێی هەبوە ئەوەش ئاسانە بۆ الله تعالی.

ئینجا الله دەفەرموێ: ﴿لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ﴾ ئەوەتان پێ ڕادەگەیەنم بۆ ئەوەیە هەتا ئێوە لەو شتەی لە دەستان چوە، ئەسەفی زۆر لێ مەخۆن بڵێن ئەوە لە دەستمان چوو ئەوە ئەگەر وامان نەکردبا وا دەبوو ئەوها نەبا ئەوها دەبێ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ» تۆ دەست بە سەبەب و هۆکارەکانەوە بگرە پێداگربە لەسەر ئەو شتەی کە سود و قازانجت پێ دەگەیەنێ «وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ» پشتیش بە الله ببەستە

«وَلَا تَعْجِزْ» خۆت دەستە وەسان مەکە، ئینجا «وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ» ئەگەر شتێکت توش بوو کاتێک تۆ (الأخذ بالأسباب)ت کرد سەبەبەکانت هێنایەجێ ئەوە تەوەکول ڕەتناکاتەوە، وەکو لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا ابن تیمیة و ابن القیم الجوزیة و باقی زانایەکانی تریش یەکدەنگن لەسەر ئەوەی دەڵێن (نحن) یانی ئێمەی ئەهلی سونە و جەماعەیان پێ مەبەستە (نحن نأخذ بالأسباب ونكفر بها) دەست دەگرین بە سەبەب و هۆکارەکان بەڵام کافریشین بە سەبەب و هۆکارەکان، مانای چیە؟ یانی ئەمرمان پێکراوە لەلای الله ئێمە سەبەب و هۆکار دەهێنینەجێ و تەواکول و تەمبەڵی ناکەین بەڵام پێشمان وا نیە ئەو سەبەب و هۆکارە شتەکانمان بۆ دەهێنێتە دی و بۆمان بەبەرهەم دەهێنێ پێمان وایە تەنها الله تعالی یە -جل شئنە- سەبەبەکەشی بۆمان بەدیهێناوە تاقەت و توانا و وزەکەشی داوەتە ئێمە وە پشتیوانمان دەبێ ئەگەر سەبەبەکان خەیربێ و بەدەستی بێنین لە پاشان ئەوە شتەکانمان بۆ دەهێنێتەجێ ئەوە نەبێ تەنها سەبەب شتێکی پێ بکرێ، وەکو دەرمان کاتێک دەیخۆی یان پزیشک دەچیە لای چارەسەری تەواو لەلای ئەوان نیە ئەوانە سەبەب و هۆکارن الله تعالی ئەوانی بەدیهێناوە ڕێنوێنی تۆشی کردوە بچیتە لایان بەڵام پشتت دەبێ تەواو بە الله بەستابێ، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ «فَلَا تَقُلْ» مەڵێن ئەگەر شتێکتان توش بوو «لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا» ئەگەر من وام کردبا ئاوا دەبوو ئاوا دەبوو (لەو) چونکە دەرگایەکە لە دەرگای شەیتان، بەڵکو چی بڵێی؟ ئەو دەرگایە دابخە مەڵێ ئەگەر وا نەبا وا دەبوو ئەوهام کردبا ئەوها نەدەبوو ئەوە نا «وَلَكِنْ قُلْ» بەڵکو بڵێن «قَدَرُ اللَّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ[1]» ئەوەی هات و بەسەرتدا ڕابورد بڵێ ئەوە تەقدیر و ئەندازەی الله تعالی بوە ئەوەی الله بیەوێ هەر ئەو بوە و دەبێ تەسلیمی بە.

جا کەواتە ئێمە لەسەرمانە بەرامبەر بە قەزا و قەدەر هەر شتێک ڕوودەدا سەرەتا ئێمە کە شتەکەمان نەهاتوەتە پێش هەوڵی بۆ بدەین دەست بە سەبەب و هۆکارەکانەوە بگرین

[1] **صحيح مسلم** (٢٦٦٤)، **سنن ابن ماجه** (٧٩) (٤١٦٨)، **مسند أحمد** (٨٧٩١) (٨٨٢٩).

ئەوەی خەیر و چاکەیە بەرەو پیری بچین لە پاشانەکە پشت بە الله ببەستین دەستە وەسان نەبین نەوەستین تەمبەڵی لێنەکەین تەواکول نەکەین لە پاشان چیمان هاتە پێش و ڕویدا تەسلیمی بین پێی ڕازی بین پێمان وابێ ئەوە نوسراوە بوە لە (اللوح المحفوظ)دا بیروبڕومان وابێ پێمان وابێ کە هیچ شتێک نیە لە (اللوح المحفوظ)دا وە لە عیلمی الله تعالی لەسەرمان دانرابێ و نوسرابێ ئیلا بەسەرمان دێ وە توشمان دەبێ بە تەواوەتی تەسلیمی بین و پشت بە الله ببەستین و کاری ئەوەمان تێنەکا لێی دوو دڵ بین.

کەواتە بەڵێ الله تعالی حیکمەتی بۆ ئەوە ڕونکردەوە کە ئەوەی نوسراوە لە (اللوح المحفوظ)دا پێش ئەوەی شتەکان بەدی بێ هەر تەنها بۆ ئەوەیە تۆ نابێ دڵتەنگ بی: ﴿لِّكَيلَا تَأسَوا عَلَىٰ مَا فَاتَكُم﴾ لەبەر ئەوە الله تعالی دەفەرموێ هەتا تۆ ئەسەف نەخۆی لەوەی کە بلێی لە دەستم چوو: ﴿وَلَا تَفرَحُوا بِمَا ءَاتَىٰكُم﴾ [الحديد: ٢٣] زۆر دڵیشت خۆش نەبێ و بە مەعنای ئەوەی سنور بەزێنی بکەی و مەغروربی بەوەی دێتە دەستت لە داهاتوو، هەموی لەلای الله تعالی براوەیە نوسراوە عیلمی پێی هەیە لە (اللوح المحفوظ) نوسیوێتی بە ویستی ئەو پەیدا دەبێ بۆشت بەدی دەهێنێ بەڵام زوڵم و ستەمیش نیە لێت دەکا زۆرییش نیە لێت دەکا تۆ بە دەستی خۆت توانای داوەتە تۆ الله تعالی عەقڵ و ژیری داوەتە تۆ ڕێی چەوت و هەڵەی بە تۆ نیشان داوە پێغەمبەرانی ناردوە (عليهم الصلاة والسلام): ﴿رُّسُلا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُ بَعدَ ٱلرُّسُلِ﴾ [النساء: ١٦٥] ئەو پێغەمبەرانەش موژدەدەرن ترسێنەرن هەتا خەڵکی بەڵگەیان بە دەستەوە نەمێنێ لەپاش هاتنی پێغەمبەران نەڵێن نەمان دەزانی الله تعالی.

کەواتە ئەوە هەموی ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە غەدرمان لێ ناکرێ کاتێک هەڵە و گوناهێک دەکەین و تۆڵەشمان لێ دەستێندرێتەوە، کەسێک گومڕا بوە بە دەستی خۆی ئەو کەسە گومڕایی هەڵبژاردوە وە الله تعالی لەگەڵ گومڕا کردندا نیە لەگەڵ شەڕ و خراپەدا نیە بەو مەعنایەی کە پاڵی بدەیتە لای الله تعالی، بەڵام شتەکە کە مەقدورە و دێتە پێش لە شەڕ

و لە خراپە و لە گومڕایش هەر الله تعالی یە ویستی لەگەڵە ویستە کەونیەکە و دروستکردنەکە و بەدیهێنانەکە تا ئینتیحان و تاقیکردنەوە دروست ببێ.

ئایە ئەو شتانەی لە (اللوح المحفوظ)دا کە عیلمی الله تعالی یە نوسراوەیە عیلمی کولیاتە یان جوزئیاتە؟ وە لە پاشان ئایە ئەوەی لەوێوە نوسراوەیە گۆڕانکاری بەسەردا دێ بەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمودەیەکی هەیە ئەگەر سیلەی ڕەحم جێبەجێ بکەی تەمەنت درێژتر دەبێ؟ ئایە لە (اللوح المحفوظ) نوسراوە نیە تۆ تەمەنێکی دیاریکراوت هەیە لەوێ گۆڕانکاری بەسەر بڕگەکان و نوسراوەکان و فەرمانەکانی ناو (اللوح المحفوظ) دێ یان نایە؟ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوەی لە (اللوح المحفوظ)دا نوسراوەیە هیچ جیاوازی نەختراوەتە نێوان عیلمی کولی و جوزئی عیلمی الله تعالی -جل شئنە- لەوێ نوسراوەیە بە هەموو کولیاتەوە بە هەموو جوزئیاتەوە بە ورد و درشتیەوە، ئەو جیاوازیەی نابێ بخسترێتە نێوان.

سەبارەت بە پرسیارەکەی تر کە لە خۆمانمان کرد کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿يَمۡحُوا ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ [الرعد: ٣٩] الله تعالی هەندێک شت ڕەش دەکاتەوە ئەوەی دەیهەوێ وە هەندێکی جێگیر دەکا وە الله تعالی ئومول کیتاب کە (اللوح المحفوظ)ە لەلایەتی، جا عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی (اللوح المحفوظ) ئەو بڕگانەی تێیدا نوسراوە گۆڕانکاری بەسەر نایە، ئەو گۆڕانکاریانەی دێن تەنها لەلای ئەو تەقدیر و ئەندازانەی ترە کە فریشتەکان دەیکەن ئاگادار نین بەناو هەموو (اللوح المحفوظ) چی تێدایە گۆڕانکاری لەوانەوە دەبێ، ئەگەرنا الله تعالی ئاگادارە و عیلمی هەبوە ئەو گۆڕانکاریانە کە ڕوودەدا یەکلا کەرەواتی نوسیوە -جل شئنە- لە (اللوح المحفوظ)دا.

بۆ نمونە هەتاوەکو بە ئاسانی و بە چاکی بۆمان ڕونبێتەوە کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) هەریەک سیلەی ڕەحم جێبەجێ بکا تەمەنی درێژ دەبێ، ئایە ئەو تەمەن درێژ بونە مەبەست

لێی ڕۆژانی تەمەنی و ساڵانی تەمەنی زیاد دەكا؟ بۆ نمونە ئەگەر ئەجەلی دیاریكراوبێ ئەو كەسە لە تەمەنی شەست ساڵی بمرێ بەڵام ئەگەر سیلەی ڕەحمی جێبەجێ كرد دەبێتە شەست و پێنج ساڵ؟ ئەوە ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون پیت و بەرەكەت و خێر دەكەوێتە ناو عومرەكەی لە تەمەنی شەست ساڵیدا زۆر خێر و چاكەی بە نسیب دەبێ بە قەدەر كەسێک كە لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا ئەوەندەی پێبكرێ یان حەفتا ساڵیدا ئەوەندەی پێبكرێ، وەكو ئیمامی نەوەوی لە تەمەنی چل و پێنج ساڵیدا كە ئەنەهو سەد ساڵ ژیاوە سەد و قسور ساڵ ژیاوە پیت و بەرەكەت كەوتە ژیانی بەوەی ئەو هەموو پەرتوكانەی دانا تەقدیر و ئەندازە دەكرێ ئەگەر كەسێک سەد ساڵ ژیابا هەر ئەوەندەی ئیمامی نەوەوی دەیتوانی ئەو عیلم و زانستیانە وەربگرێ و بنوسێتەوە و بڵاویكاتەوە.

كۆمەڵێكی تر لە زانایان بۆچونیان ئەوەیە دەفەرمون بەڵێ ڕۆژەكان و مانگەكان و ساڵەكان لە تەمەنی زیاد دەكا، ئەویش ئایا لە (اللوح المحفوظ)دا ئەو گۆڕانكارییە دەكرێ؟ نەخێر بۆچونیان وا نیە ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن الله تعالی لە (اللوح المحفوظ)دا نوسیوێتی فلانی كوڕی فلان تەمەنی دیاریكراوی یەكەمجارەی شەست ساڵە بەڵام هەر لە (اللوح المحفوظ)دا دوبارە نوسراوەیە لەپاڵ ئەوەدا فلانی كوڕی فلان تەمەنی شەست ساڵمان بۆ داناوە بەڵام لە فلان كاتدا سیلەی ڕەحم جێبەجێ دەكا لەلای ئێمە جێبەجێ كردنی سیلەی ڕەحمیش وەكو پێغەمبەر (ﷺ) بە خەڵكەكە ڕادەگەیەنێ بۆ ئەو كاتە درێژ بونەوەی تەمەنێتی لەبەر ئەوە پێنج ساڵیشی دەچێتە سەر دەبێتە شەست و پێنج ساڵ، لە (اللوح المحفوظ) ئەو كولیات و جوزئیاتە نوسراوە، ئینجا فریشتەكان كە دێن ئەوە منداڵ و كۆرپەلەیە لەناو ڕەحم و سكی دایكی كە لەسەری دەنوسن یەكەمین جار شەست ساڵەكەیان ڕەنگە پێدەگوترێ زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوانە دەفەرمون، پێیان دەگوترێ تەمەنی شەست ساڵە شەست ساڵەكە دەنوسن، ئینجا كە سیلەی ڕەحم جێبەجێ

دەكا الله تعالی ئەوەی لەلای فریشتەكانە و ئەندازەكەی كە بەوانی فەرمان كردوە و نوسیویانەتەوە ئەوە یەمحو ڕەشی دەكاتەوە جارێكی تر گۆڕانكاری بەسەردا دێ نەك ئەوەی (اللوح المحفوظ)، فەرمانە پێیان دەكا دەفەرموێ ئەی فریشتەكان بۆی بكەنە شەست و پێنج ساڵ چونكە ئەمرۆ لە فلان ڕۆژ سیلەی ڕەحمی جێبەجێ كرد ئەو بەندەی من، ئەوەیە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئا ئاواش دەبێ ئێمە بیروبڕوامان پێی هەبێ ڕونكردنەوەیەكی جوان و لەجێیە.

**مەشیئەتی الله تعالی و ئیرادەی لەگەڵ خەلق و ئیجادی شتەكان:**

وَأَمَّا الدَّرَجَةُ الثَّانِيَةُ؛ فَهِيَ مَشِيئَةُ اللهِ النَّافِذَةُ، وَقُدْرَتُهُ الشَّامِلَةُ، وَهُوَ: الإِيمَانُ بِأَنَّ مَا شَاءَ اللهُ كَانَ، وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ، وَأَنَّهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِنْ حَرَكَةٍ وَلاَ سُكُونٍ؛ إِلاَّ بِمَشِيئَةِ اللهِ سُبْحَانَهُ، لاَ يَكُونُ فِي مُلْكِهِ مَا لاَ يُرِيدُ، وَأَنَّهُ سُبْحَانَهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ مِنَ الْمَوْجُودَاتِ وَالْمَعْدُومَاتِ، مَا مِنْ مَخْلُوقٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ إِلاَّ اللهُ خَالِقُهُ سُبْحَانَهُ، لا خَالِقَ غَيْرُهُ، وَلاَ رَبَّ سِوَاهُ. وَمَعَ ذَلِكَ؛ فَقَدْ أَمَرَ الْعِبَادَ بِطَاعَتِهِ وَطَاعَةِ رُسُلِهِ، وَنَهَاهُمْ عَنْ مَعْصِيَتِهِ. وَهُوَ سُبْحَانَهُ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ وَالْمُحْسِنِينَ وَالْمُقْسِطِينَ، وَيَرْضَى عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ، وَلا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ، وَلاَ يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ، وَلاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ، وَلاَ يَرْضَى لِعِبَادِهُ الْكُفْرَ، وَلاَ يُحِبُّ الْفَسَادَ.

---

ئینجا ابن تیمیة -رحمه الله- دەگاتە سەر بڕگەیەكی تر هەر باسی قەزا و قەدەر كە دەرەجە و پلەی دوەمە كە دوو خاڵ ئەویش لەخۆوە دەگرێ مەشیئەتی الله تعالی و ئیرادەی لەگەڵ خەلق و ئیجادی شتەكان كە دەفەرموێ (وَأَمَّا الدَّرَجَةُ الثَّانِيَةُ) پلەی دوەم لە قەزا و قەدەر (فَهِيَ مَشِيئَةُ اللهِ النَّافِذَةُ) بریتیە لە ویستی الله تعالی كە ویستێكی هاتوە جێیە (النَّافِذَةُ) بە مانای دێتەجێ و جێبەجێ دەبێ (وَقُدْرَتُهُ الشَّامِلَةُ) وە دەسەڵات و توانای بەرفراوانی الله تعالی یە -جل شئنە- كە گشتگیرە و شتەكان لەخۆوە دەگرێ (وَهُوَ) ئەویش بریتیە لەوەی (الإِيمَانُ بِأَنَّ مَا شَاءَ اللهُ كَانَ) دەبێ ئێمە ئیمان و بڕوامان وابێ ئەوەی الله تعالی ویستی

لەگەڵدابێ و بیەوێ ئەو بوە و دەبێ (وَمَا لَم يَشَأْ لَم يَكُن) ئەوەی الله تعالى نەیهەوێ و ویستی لەگەڵدا نەبێ نابێ (وَأَنَّهُ مَا فِي السَّموات وَمَا فِي الأَرضِ مِن حَرَكَةٍ وَلَا سُكُون إِلَّا بِمَشِيئَةِ اللَّهِ سُبحَانَهُ) هیچ شتێک نیە لە ئاسمانەکان و لە زەویدا لە جوڵان و لە سکون و وەستاندا ئیلا بە مەشیئەت و ویستی الله دەبێ اللەی پاک و بێگەرد -جل شئنه- (لَا يَكُونُ فِي مُلكِهِ مَا لَا يُرِيدُ) هیچ شتێک نیە لە موڵک و دەسەڵاتی الله تعالى کە الله نەیهەوێ ئەو شتە ڕوبدا و ببێ (وأَنَّه سُبحَانَهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) جا اللەی پاک و بێگەرد لەسەر هەموو شتێک توانایە (مِنَ المَوجُودَاتِ وَالمَعدُومَاتِ) ئەو شتانەی دەبێت و دێتە کایەوە وە ئەو شتانەی لە نەبوندایە و نایەتە کایەوە (فَمَا مِن مَخلُوقٍ فِي الأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ إِلَّا اللهُ خَالِقُهُ سُبحَانَهُ) هیچ بەدیهێنراوێک نیە لە زەوی و لە ئاسمان ئیلا الله تعالى بەدیهێنەرێتی سبحانه وتعالى (لَا خَالِقَ غَيْرُهُ وَلَا رَبَّ سِوَاهُ) هیچ کەس و شتێکی تر بەدیهێنەری نیە جگە لە الله تعالى وە هیچ شتێکی تر خاوەنی نیە بەدیهێنەری نیە بەڕێوبەری نیە جگە لە الله تعالى (لا تعارض بين القدر والشرع) جا تێک گیربون نیە یان لە دژ یەک وەستانەوە نیە لە نێوان قەدەر و ئەندازە کردن لە نێوان شەرع و ئەمر و فەرمانی خوایی (وَمَعَ ذَلِكَ) لەگەڵ ئەوەشدا (فَقَد أَمَرَ العِبَادَ بِطَاعَتِهِ وَطَاعَةِ رُسُلِهِ) ابن تيمية دەفەرموێ الله تعالى فەرمانی کردوە بە بەندەکانی کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەو و پێغەمبەر و ڕەوانە کراوەکانی بن و بکەن (وَنَهَاهُم عَن مَعصِيَتِهِ) قەدەغەشی کردون مرۆڤەکان لە سەرپێچی فەرمانەکانیان و تاوان و گوناحەکان ئەنجام بدەن (وَهُوَ سُبحَانَهُ يُحِبُّ المُتَّقِينَ وَالمُحسِنِينَ وَالمُقسِطِينَ) الله تعالى سبحانه وتعالى جا خۆپارێزکاران و لە الله ترسانی خۆشدەوێ چاکەکارانی خۆش دەوێ دادوەرانی خۆشدەوێ (وَيَرْضَى عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا، الصَّالِحَاتِ) وە ڕازییە لەوانەی کە بڕوادارن و بڕوا دەهێنن و هێناویانە وە کار و کردەوەی چاکیان کردوە و دەیکەن (وَلَا يُحِبُّ الكَافِرِينَ) کافر و بێ بڕوایانی خۆش ناوێ (وَلَا يَرْضَى عَنِ القَومِ الفَاسِقِينَ) ڕازی نیە الله تعالى لە خەڵکانێکی فاسق و لە فەرمان دەرچوو (وَلَا يَأْمُرُ

بِالْفَحْشَاءِ) فەرمان ناكا الله تعالى بە شتە سنور بەزێنیە بێ شەرعیەكان (وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الكفر) ڕازی نیە بۆ بەندەكانی كوفر و بێ بڕوایی (وَلَا يُحِبُّ الفَسَادَ) الله تعالى فەساد و خراپەی خۆشناوێ.

جا لێرەدا بەڕێزان ئەوە كردمانەوە كوردی و هەڵوێستە دەكەین لەسەر ئەو خاڵانەی ابن تيمية فەرموی.

یەكەمیان ئایە الله تعالى مەشیئەت و ویستی الله تعالى بە مانای چی دێ؟ لەگەڵ خراپە و تاوانیشدایە؟ بەڵێ لە ڕوی بەدیهێنان و كەونیەوە هیچ شتێك نیە بەبێ ویست و مەشیئەتی الله تعالى ببێ و ڕوبدا، واتە مەشیئەتی الله تعالى -جل شئنە- خراپە و تاوانیش ئەگەر لەگەڵیدا نەبێ بە تەئكید نایەتە كایەوە و نایەتە بون و وجود، جا لەبەر ئەوە هەر شتێك الله تعالى بیەوێ (مَا شَاءَ اللهُ كَانَ) كە بیەوێ دەبێ (وَمَا لَم يَشَأْ لَم يَكُن) كە ویستی كەونی اللەی لەگەڵدا نەبێ قەتاوقەت نابێ.

جا لەبەر ئەوەیە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئیرادەی خوای رب العالمين دابەشە بۆ دوو بەش:

١. ئیرادەی كەونی و تەقدیری.

٢. ئیرادەی شەرعی.

ئیرادەی كەونی و تەقدیری بریتیە لەوەی هەموو شتێك كە دێتە كایەوە ئەندازە كراوە لە بون و وجوددا دەیبینی ویستی الله تعالى ی لەگەڵە الله بەدی هێناوە الله هێناویەتیە كایەوە -جل شئنە- ئەندازەی كردوە، جا خەیربێ یان شەڕبێ خراپ بێ یان باش بێ تاوان بێ گوناح بێ یان خێر و چاكەبێ هەر شتێكبێ لە شتەكان ئیلا الله تعالى ئەندازەی هاتنە كایەوە و تەقدیری كەونی و لە پاشان ئیرادەی كەونی لەگەڵدا بوە.

ئیرادەی شەرعی بەو مانایە دێ ئەو شتانەی الله پێی ڕازیە و خۆشی دەوێ -جل شئنە-، ئەوانەی پێی ڕازیە و خۆشی دەوێ بریتیە لە فەرمانەكانی وە لە پاشان بریتیە لەو ڕێ و

شوێنانەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بە مەردوم و مرۆڤەکانیان ڕاگەیاندوە بریتیە لە ڕەوشتە جوان و بەرزەکان کە خۆشی دەوێ.

جا هەندێک جار ئیرادەی کەونی لەگەڵ ئیرادەی شەرعی یەک دەگرێتەوە، یەعنی الله تعالى ئەو شتەی ویستوە بێتە کایەوە شتەکە کە هاتە بون و وجود خەیر و چاکەیە هەم کەونی لەگەڵدایە بە مەعنای هێناویەتیە کایەوە و دروستی کردوە وە هەم شەرعیشە بەو مەعنایەی خۆشی دەوێ و چاکەیە، بۆ نمونە نوێژ بەرپا کردن و ئەنجامدانی نوێژ الله تعالى بۆت دروست دەکا هێز و توانات دەداتێ وە لە پاشان الله تعالى فەرمانی پێکردوە و نوێژ خوێنانی خۆشدەوێ کە ئەنجامی دەدەی هەم ئیرادەی شەرعیشی لەگەڵدایە پێی ڕازییە و خۆشی دەوێ و پاداشتیشت دەداتەوە بەڵام گوناح و تاوانەکان شیرک و کوفرەکان الله تعالى تەنها ئیرادەی کەونی لەگەڵدا دەبێ پێی ڕازی نیە ڕقیشی لێیە غەزەبیش دەگرێ لەبەر ئەوەی چونکە لە ڕێی پێغەمبەرانەوە (عليهم الصلاة والسلام) ڕونی کردوەتەوە ئەو ئیشە خراپە تاوانە گوناحە خۆشیشم ناوێ بەڵام لەبەرچی ئیرادەی کەونی لەگەڵدا دەبێ؟ چونکە ئەگەر لەگەڵیدا نەبێ شتەکە نایەتە بون و وجود کە نەیەتە بون و وجودیش تاقیکردنەوە و ئنتیحانەکە دروست نابێ کە لەو پێناوەدا الله تعالى ئێمەی بەدی هێناوە کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلْمَوتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبلُوَكُم﴾ الله تعالى مردن و ژیانی بەدیهێناوە تا ئێوە تاقی بکاتەوە: ﴿أَيُّكُم أَحسَنُ عَمَلا﴾ [الملك: ٢] کێ لە ئێوە شاکار دەکا بە مەعنای کاری زۆر چاک دەکات و ئەنجام دەدا، جا لەبەر ئەوە الله تعالى ئیرادەی کەونی لەگەڵ تاوان و گوناح و شیرک و کوفریشدا دەبێ بەوەی دەیهێنێتە کایەوە بەڵام پێی ڕازی نابێ، جا هەموو جارێکیش مەرج نیە ئیرادەی شەرعی بێتەجێ خوای رب العالمین بۆ هەموو مرۆڤ و مەردوم بۆ جنوکەکانیش ئیمانی ویستوە وەکو ئیرادەیەکی شەرعی بەڵام وەکو ئیرادەی کەونی هەموو مرۆڤەکان ئایە هاتوەتەجێ کە بڕواداربن؟ یان هەموو جنۆکەکان بڕواداربن؟ نا ئەوەی الله شەرعەن ویستویەتی و ئیرادەی شەرعی لەگەڵدا بوە هەندێک

جار ئیرادەی کەونی لەگەڵدا نابێ لەبەر ئەوە نایەتەجێ چونکە مرۆڤەکە یان جنۆکەکە بە دەستی خۆی ڕێگای کوفری ڕێگای بێدینی ڕێگای بێشەرعی هەڵدەبژێرێ لا ڕێ دەبێ لەڕێی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

جا لە پاشان تێبینیەکی تر لەلای ئەهلی سونە و جەماعە لەسەر ئیرادە و مەشیئەی الله تعالی، ئیرادە و مەشیئەی الله تعالی لە تۆ دیار نیە هەتا نەیەتە کایەوە لەبەر ئەوە نابێ تۆ تەمبەڵی بکەی لە کارە خێر و چاکەکان و دەستگرتن بە سەبەب و هۆکارەکان وە هاتنەجێی ئیشە خێر و چاکەکان بەڵکو دەبێ بەرەو پیری بچی و بیکەی و دەستی پێوە بگری و ئینجا پشت بە الله ببەستی لە پاشان بۆت دەردەکەوێ ئیرادەی اللەی لەگەڵ بوە یان نا، ئەگەر ئیشەکە نەبێ ئیرادەی اللەی لەگەڵ نەبوە ئەگەر بوو ئیرادەی اللەی لەگەڵە، بە هەردوو سەرانیش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بە بون و نەبونی شتەکە دەبێ تەسلیم بی ئەوەت پێ خەیربێ و پشت بە الله ببەستی -جل شئنە-.

تێبینی ئەوەش ئایە الله تعالی -جل شئنە- ئەو شتانەی کە ابن تیمیة فەرموی (وأنَّه سُبحَانَهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ مِنَ المَوجُودَاتِ وَالمَعدُومَاتِ) ئەو شتانەی نەبوە و هەیە الله تعالی لەسەر هەموی توانایە هەندێک شتیش لەو ناوەڕاستەدا مەحاڵاتە یانی مەحاڵە ئەو شتە ببێ و ڕوبدا، ئایە الله تعالی لەسەر شتە مەحاڵەکانیش توانایە؟ بۆ نمونە خوایەکی تر هەبێ لەگەڵ الله تعالی؟ ئەوە بۆ ئەوەی ڕونکردنەوەی لەسەر بدەین ئەگەرنا ئەو پرسیارانە پرسیاری نابەجێن لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە تەنها بۆ شەرح و ڕاڤە و ڕونکردنەوە پەسەند کراوە و دەهێندرێتەوە، ئینجا ئایە الله تعالی مرۆڤێک کە ئەجەل و مردنی بۆ داناوە دەتوانێ الله تعالی قەت نەیمرێنێ و هەر هەمیشەیی بێ مرۆڤەکە؟ بە دڵنیاییەوە الله تعالی کە دەڵێین (عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) لەسەر هەموو شتێک توانایە بەس مەحاڵەکە قەتاوقەت ڕونادا، ئێمە عەقیدەمان وایە ڕەتکراوەیە لەلای الله تعالی لەبەر ئەوە ئێمە نادوێین ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێ باس و خواسی لێناکەین و ناشی هێنینە ناو بابەت و مەوزوعەکان

قسەی لێبکرێ ئەگەرنا الله تعالى لەسەر هەموو شتێک بە توانایە بەڵام مەحاڵ ناهێنێتەجێ -جل شئنە- لەبەر ئەوەی لێوەشاوە نیە وە چاک نیە وە حیکمەت نیە وە ڕەتکراوەیە.

ئینجا لە پاشان الله تعالى -جل شئنە- کاتێک کە بەندەکانی خوای رب العالمین کوفر دەکەن بێ بڕوایی دەکەن کە الله تعالى ئەندازەی ئەوەیان بۆ دەکا تەقدیری کردوە لە (اللوح المحفوظ)دا نوسیوێتی ئایە ئەوە بەسەریدا چەسپێنراوە؟ وەکو جەبریەکان دەڵێن یەعنی ناتوانێ ئەو کەسە ڕابکا لەبەر ئەو خاڵ و شتە و هەر لەسەری دێتەجێ، ئەگەر بەسەریدا سەپێنراوە و دەستی خۆی تێدا نیە کەسەکە بۆچی تۆڵەی لێ دەستێنرێتەوە و عەزاب دەدرێ؟ ئایە ئەوە زوڵم و ستەم نیە؟ لە وەڵامی ئەو کەسانە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون نەخێر الله تعالى -جل شئنە- بە زۆرە ملێ بەسەریدا نەچەسپاندوە شتەکە بەڵام الله عیلمی هەبوە -جل شئنە- لە ئەزەل و ئەوەلەوە بەبێ سەرەتا فڵانی کوڕی فڵان ئەبو جەهل بۆ نمونە الله عیلمی پێی هەبوە -جل شئنە- ئەبو جەهل ڕێی کوفری هەڵدەبژێرێ بە دەستی خۆی ڕێی گومڕایی هەڵدەبژێرێ بە دەستی خۆی وەڵامی پێغەمبەر ناداتەوە (ﷺ) بە دەستی خۆی چونکە الله تعالى عەقڵ و ژیری دابویە پێغەمبەریشی بۆ ڕەوانە کردوە (ﷺ) ڕێی چەوت و هەڵەشی پێ نیشان دراوە بەڵام تەکەبوری هەیە خۆی بە زل دەزانێ عینادی دەیگرێ ئەو دوو وەسفەی شەیتان لە خۆی دەهێنێتەجێ کوفر هەڵدەبژێرێ ئەبو جەهل بەسەر حەق و ڕەوایی و هیدایەت لەبەر ئەوە الله تعالى لەسەر کوفر دەیژێنێ و دەیمرێنێ زوڵم و ستەم نیە لێی کراوە ئینجا تۆڵەشی لێ دەستێنێتەوە الله تعالى -جل شئنە- ، لە سەرەمەرگدا عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەچێتە سەری هەتا هیدایەت و ڕێنوێنی ببێ تەنانەت چەند لەحزە و چرکەیەکی ماوە بەو برینەی کە تێشی بوە جوڵەیەکیشی ئاوا پێ ناکرێ ئینجا هەر پێداگرە و عینادە لەسەر کوفرەکەی ئەبو جەهل لەبەر ئەوەیە عەبدوڵای کوڕی مەسعود سەری دەبڕی لە پێناو خوای رب العالمین، کەواتە بەڵێ الله تعالى عیلمی

هەبوە لە ئەوەلەوە لە ئەزەلەوە بێ سەرەتا ئەبو جەهل لەسەر کوفر دەژی و دەمرێ بە دەستی خۆی ئەو ڕێیە هەڵدەبژێرێ بەسەریدا نەچەسپاندوە الله تعالى ئەوە عەدالەت و دادپەروەری خوای رب العالمین یشە کە تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە.

ئەبو لەهەب الله تعالى عیلم و زانستی هەبوە کە ئەبو لەهەب ئیمان ناهێنێ پێشی ئەوەی ئەبو لەهەب بمرێ ئایەتی بەسەر دابەزاندوە خوای رب العالمین وە سەلماندویەتی کە ئەبو لەهەب لەسەر کوفر دەمرێ، ئایە ئەوە بەسەریدا چەسپێنراو بوو؟ بۆ ئەبو لەهەب نەهات بە دەستی خۆی ببێتە موسڵمان هەتا ئەو ئایەتە هەڵوەشێتەوە؟ نەدەبویە بۆ نەدەبویە چونکە خوای رب العالمین عیلمی هەبوو ئەبو لەهەب نابێت و هەڵنابژێرێ بە دەستی خۆی ئیسلام لەبەر ئەوە ئەوەی لەسەر ئەو عیلمەی پێی هەبوو لە (اللوح المحفوظ) نوسیبویەوە -جل شئنە- ئەویش هاتەجێ و ئەبو لەهەب نەهات بێت موسڵمان بێ و ئایەتەکەی پێ هەڵبوەشێتەوە هەر عینادی گرتی و لەسەر کوفر ژیا و لەسەر کوفریش مرد گەڕایەوە لای خوای رب العالمین کەواتە زوڵم و ستەم نیە.

وەکو ئەوەی لێ دێ لە قەزا و قەدەردا ئەگەر چەند نمونەیەکی عەقڵی و ژیری و واقیعیانەش بێنینەوە بە تەواوەتی بۆمان ڕون دەبێتەوە کە الله تعالى لەوپەڕی دادوەری و عەدالەتە کە کافر و بێدین و گوناحکاران تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە کوفر و بێدینی و گوناحی بەسەردا نەچەسپاندون تەنها عیلمی پێی هەیە -جل شئنە- لە (اللوح المحفوظ) نوسیوێتیەوە و ویستی لەگەڵە، ویستە کەونیەکە لەگەڵ ئەو تاوان و خراپە و شیرک و کوفرانە هەتا بێتە کایەوە و بێتەجێ ئینتیحان و تاقیکردنەوەکە دروست ببێ بۆیان دەهێنێتە کایەوە و بەدی دەهێنێ، پێغەمبەرانیشی بۆ ناردون (علیهم الصلاة والسلام) ڕێگای ڕاست و چەوتی پێ نیشان داون ئەوە هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نەماوە.

نمونەیەک ئەگەر کورسیەکی کارەبایی بێنینە بەر شاشەی خەیاڵمان، کورسیەکی کارەبایی هەبێ تەزوی کارەباکەی لە شوێنێکی دیاریکراوبێ دوگمەیەک بێ

هەڵبگیرسێنرێ، ئینجا ئەو تەزوە کارەباییە بێتە ناو کورسیە کارەباییەکە، کەسێک بچێ لەسەر ئەو کورسیە کارەباییە دابنیشێ، ئەگەر تەزوەکەی بۆ هەڵنەکرێ دوو گمەکەی بۆ دانەگیرێ هیچ تەزو و توانای تێدا نەبێ کورسیەکە تەزوی کارەباییەکەی پێ نەگا ئەو کورسیە ڕەق و ڕوتە و جوڵەی نابێ، بەڵام کەسێک کە دێ دوگمەکە دادەگیرسێنێ ئینجا تەزوە کارەباییەکە دێتە ناو کورسیەکە بادان و سوڕان و جوڵانی کورسیەکە دەکەوێتە دەستی ئەو کەسەی لەسەر کورسیەکە دادەنیشێ، جا ئەو کەسەکەی دوگمەکەی بۆ داگیرساندوە گوناح و تاوانباری لە ملی نیە ئەگەر ئەو کەسە کورسیەکەی بە ڕاستدا بسوڕێنێتەوە یان بە چەپدا بیسوڕێنێتەوە یان لەسەر یەکی بسوڕێنێ گوناح و تاوان لە دەست خۆیەتی ئەو کەسەی کە لەسەر کورسیەکە دەسوڕێ، تەشبیە نەبێ بۆ ئەوەی لە عەقڵمان نزیک بێتەوە (ولله المثل الأعلى) الله تعالى یش تواناکەی بە مرۆڤەکە بەخشیوە ویستیشی لەگەڵدا دەبێ کە ئەو توانایەی پێ دەدا و مرۆڤەکە بە دەستی خۆی کورسیەکە دەسووڕێنێ یان ڕوی خۆی دەسوڕێنێ بەرەو شیرک و کوفر یان دەسوڕێنێ بەرەو خێر و چاکە ئینجا لە هی خێر و چاکەکە الله تعالى پێی خۆشە پێی شادە -جل شئنە- وە پێی ڕازییە یارمەتیشی دەدا کە ئەو ڕوی خۆی سوڕاند بەرەو چاکە، ئەوە هیدایەتە تەوفیقیەکەیە کە بە دەستی خۆی کەسەکە هەڵدەبژێرێ و الله یارمەتیشی دەدا بەرەو کوفر کە دەبا الله تعالى یارمەتی نادا بەڵام قەدەغەشی ناکا ڕێشی پێ ناگرێ چونکە بە دەستی خۆی هەڵیبژاردوە بۆ ئەوەی ئینتیحان و تاقیکردنەوەکە دروست بێ.

وە نمونەیەکی تر ئەوەیە مامۆستا کاتێ کە تاقیکردنەوە و ئەزمونی لەگەڵ قوتابیەکانی دروست دەکا و بۆیان دادەنێ، ئەگەر مامۆستایەکی بیرکاری بە نمونە بێنینەوە، ڕۆژانە دەرس و وانە بە کەسێک بڵێ ناوی موحەمەدە یەکیشیان ناوی سەرکەوتە یەکیشیان ناوی ڕێبوارە، ئەگەر ئەو مامۆستایە دەرس و وانەی بیرکاری پێگوتن ڕۆژانە هاتن لە قوتابخانە دەرسیان خوێند یەکەم دەرس و وانە گوتی با ئێمە کۆ بخوێنین، گوتی یەک کۆ یەک

دەکاتە دوو، دوو کۆ دوو دەکاتە چوار، ئینجا ڕۆژێکی تر هاتەوە گوتی با جاران بخوێنین، گوتی یەک جاران یەک هەر دەکاتە یەک، دوو جاران دوو دەکاتە چوار، ئەمجارە گوتی بەیانی وەرنەوە تاقیکردنەوە و ئینیتیحانە هەموی بۆ ڕونکردنەوە پرسیارتان هەیە قوتابیەکان؟ گوتیان نەخێر یان بەڵێ هەموی بۆ ڕونکردنەوە، بەیانی هاتنەوە موحەمەد دەفتەرێکی ئینتیحان و تاقیکردنەوەکەی پێدرا وە ڕێبوار پێی درا سەرکەوت پێی درا، پرسیاری بۆ هێنانەوە مامۆستا، پرسیاری یەکەم لە جاران بۆی هێنانەوە نوسیویەتی دوو جاران دوو یەکسانە بە چەند؟ تەبعەن ئەگەر مامۆستاکە بڵێ دوو جاران دوو هەر لە پرسیار هێنانەوەکە بڵێ دەکاتە چوار ئەوە ناکاتە ئینتیحان و تاقیکردنەوە دەکاتە دەرس و وانە گوتنەوە مانای ئینتیحانی تێدا نامێنێ هەر بەخۆی وەڵامی داوەتەوە بۆیان، هەتا ئینتیحانەکە دروست بێ نابێ وەڵامی ڕاستیان پێ بڵێ هەڵەشیان پێ بڵێ ئاوا بیان هێڵێتەوە بۆخۆیان دەبێ وەڵام بدەنەوە، پرسیار دەهێنێتەوە یەک کۆ یەک یەکسانە؟ پێیان ناڵێ چەندە، ئەو مامۆستایە چاودێرە بەسەریان تەماشا دەکا خۆ ئەو مامۆستایە عیلم و زانستی هەیە دوو جاران دوو دەکا چوار، عیلم و زانستی هەیە یەک کۆ یەک دەکاتە دوو بەڵام پێیان ناڵێ ئەو عیلمە، مۆڵەتیان دەدا بەخۆیان ڕاستیەکە هەڵبژێرن یان چەوت هەڵبژێرن، گریمان موحەمەد نوسی دوو جاران دوو یەکسانە بە چوار، یەک کۆ یەک یەکسانە بە دوو ئەو مامۆستایە بینی هی موحەمەد نابێ پێی بڵێ ڕاستت کردوە هەتا ئینتیحان و تاقیکردنەوەکە دروست ببێ، ئینجا چوو لەسەر ڕێبوار ڕاوەستا ڕێبوار نوسیوێتی دوو جاران دوو یەکسانە بە دوو یەک کۆ یەک یەکسانە بە یەک، ئەو مامۆستایە ئایە عیلم و زانستی نیە هی ڕێبوار کە دەفتەرەکە بداتەوە ئەو مامۆستایە سفر وەردەگرێ؟ عیلم و زانستی وایە، ئایە ئەگەر دەفتەرەکەی وەرگرتەوە ئەو مامۆستایە لە ڕێبوار و لە موحەمەد ئەگەر هی ڕێبوار لەجیاتی سفر دەرەجەی بداتێ ئایە ئەو دەرەجەیە عەدالەتە دەیداتێ؟ نەخێر ئەوکاتە زوڵمە لە موحەمەدی کردوە، هی موحەمەد چەندی پێ دەدا؟ سەد لە سەدی

پێدەدا هەردوو پرسیارەكەی ڕاستە، ئایە هی ڕێبوار چەندە پێی دەدا؟ سفرِی پێدەدا هەڵەیە لەبەر ئەوەی، ئەگەر سفرِی دایە ڕێبوار و سەدی دایە موحەمەد ئەوە ئەوكاتە مامۆستایەكە عەدالەتی كردوە دادوەری كردوە كەس گلەیی لێی نیە، جا تەشبیە نەبێ بۆ ئەوەی لە عەقڵمان نزیک بێتەوە الله تعالی یش كاتێک توانا بە ئێمە دابەخشێ ڕێی چەوت و هەڵەی بە ئێمە نیشان داوە لە ڕێی پێغەمبەرەكان (علیهم الصلاة والسلام) دەرس و وانەی بە ئێمە گوتوە ئەو كاتە تۆ بە دەستی خۆت چەوت هەڵدەبژێری وەكو ڕێبوارەكە الله تعالی دەزانێ ئەو چەوتیە دەتگەیەنێ بە دۆزەخ و جەهەنەم تۆڵەت پێ لێ دەسێنێتەوە سفرِ وەردەگری بەڵام نایە بتگەڕێنێتەوە نایە الله تعالی ڕێت لێ بگرێ لێت دەگەڕێ و بۆشت دروست دەكا و ویستیشی لەگەڵدا دەبێ و بەدیشی دەهێنێ هەتا ئینتیحان و تاقیكردنەوە دروست ببێ، ئەگەر الله تعالی ئەبو جەهلی هیدایەت بدابا و ئەبو جەهلیش خۆی هیدایەتی كە نەویستوە و نەیدا هیدایەتی ئەبو بەكریشیدا كە خۆی هیدایەت و ڕێنوێنی ویست، ئەو كاتە جیاوازی نێوان ئەبو بەكر و ئەبو جەهل نەدەبوو ئەوكاتە عەدالەت و دادوەری نەبوو ئەبو بەكر خۆی ڕێی هیدایەتی ویستوە و چاكی خوێندوە و وەڵامەكانی بەدەست هێناوە خۆی ماندوو كردوە بەڵام ئەبو جەهل نەیویستوە و ڕەتی كردوەتەوە بەڵام الله تعالی هەر ئاوا پێی داوە ئەو كاتە عەدالەت و دادوەری نیە زوڵم و ستەمە لە ئەبو بەكر دەكرێ.

جا لەبەر ئەوە مەسەلەی قەزا و قەدەر ئیرادە و ویستی الله تعالی وە هیدایەت و ڕێنوێنی الله تعالی وە گومڕا كردنی الله تعالی بۆ مرۆڤەكان هەموی لەوەوە دەسوڕێتەوە و دەخولێتەوە الله تعالی -جل شئنە- بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە زوڵم و ستەم لە كافر و موشریک و بێدین و گوناحكار ناكا بە دەستی خۆی زاڵم و بێدین و كافر و موشریک ئەو ڕێگایەی هەڵبژاردوە الله تعالی یش تۆڵەی لێ دەسێنێتەوە، وە كەسە بڕواداره ئیماندارەكە بە دەستی خۆی ڕێگای پێغەمبەرانی هەڵبژاردوە (علیهم الصلاة والسلام) الله تعالی چونكە ئەو ڕێباز و ڕێگایەی خۆش دەوێ یارمەتیشی دەدا كە

مرۆقەکە هەڵی بژارد ئەو کاتە ڕێنوێنی دەبێ کەسەکە دەبێتە خاوەنی هیدایەت و ڕێنوێنی، جا ئەوەیە هیدایەت و ڕێنوێنی تەوفیقی چونکە هیدایەت و ڕێنوێنی دوو بەشە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە:

جۆری یەکەمیان تەوفیقیە ئەوە تەنها لە دەستی الله تعالی یە ئەو هیدایەتەیە کە ئێمە باسمان کرد و نمونەکانمان بۆ هێنایەوە.

وە جۆری دوەمیان هیدایەتی ڕێنوێنی و ئیرشادییە ئەویش پیشەی پێغەمبەرانیشە (علیهم الصلاة والسلام) وە ئەوانەی شوێنکەوتەی پێغەمبەرانیشن (علیهم الصلاة والسلام) تا قیامەت دادێ کە ڕێنوێنی خەڵکی دەکەن دەعوە و بانگەوازی دەکەن وە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکەن خاڵ و شتەکان بۆ خەڵکی ڕون دەکەنەوە.

**کار و کردەوەی بەندەکان:**

وَالعِبَادُ فَاعِلُونَ حَقِيقَةً، وَاللَّهُ خَلَقَ أفْعَالَهُم. وَالْعَبْدُ هُوَ: الْمُؤْمِنُ، وَالْكَافِرُ، وَالْبَرُّ، وَالْفَاجِرُ، وَالْمُصَلِّي، وَالصَّائِمُ. ولِلْعِبَادِ قُدْرَةٌ عَلَى أَعْمَالِهِمْ، وَلَهُمْ إِرادَةٌ، وَاللهُ خَالِقُهُمْ وخالق قُدْرَتِهِمْ وَإِرَادَتِهِمْ؛ كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿لِمَن شَاء منكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ * وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ [التكوير: ٢٨-٢٩]. وَهَذِه الدَّرَجَةُ منَ الْقَدَرِ يُكَذِّبُ بِهَا عَامَّةُ الْقَدَرِيَّةِ الَّذِينَ سَمَّاهُمُ النَّبِيُّ: «مَجُوسَ هَذِهِ الأُمَّةِ[١]» وَيَغْلُو فِيهَا قَوْمٌ منْ أَهْلِ الإِثْبَاتِ، حَتَّى سَلَبُوا الْعَبْدَ قُدْرَتَهُ وَاخْتِيَارَهُ، وَيُخرِجُونَ عَنْ أَفْعَالِ اللهِ وَأَحْكَامِهِ حُكْمَهَا وَمَصَالِحَهَا.

---

باس و خواسی کار و کردەوەکانی بەندەکانی خوای رب العالمین ئایە بەدیهێنراوی اللەن یان عەبد و بەندەکان بۆخۆیان بەدییان دێنن؟ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە مرۆڤەکان تەنها الله تعالی توانای ئەوەی پێداون کار و کردەوەکان بکەن ئیختیار و هەڵبژاردنیش لەبەر دەستی ئەوانە وە عەقڵ و هۆشیشی پێداون بەڵام الله تعالی بەدیهێنەری

[١] في قوله صلى الله عليه وسلم : إن لكل أمة مجوسا، وإن مجوس هذه الأمة الذين يزعمون أن لا قدر.
أخرجه أبو داود برقم (٤٦٩٢) في السنة، وأحمد في المسند ( ٥ \ ٤٠٦ ، ٤٠٧ )، وهو حديث حسن بشواهده. انظر: السنة لابن أبي عاصم بتحقيق الألباني (١\ ١٤٤- ١٤٦).

ڕاستەقینەی هەموو کار و کردەوەکانە دەفەرمویٚ (وَالْعِبَادُ فَاعِلُونَ حَقِيقَةً، وَاللَّهُ خَلَقَ أَفْعَالَهُم) بەندەکان بکەر و کارکەری کردەوەکانی خوٚیانن بەڕاستی بەس الله تعالی بەدیهێنەری کار و کردەوەکانیانە (وَالْعَبْدُ هُوَ: الْمُؤْمِنُ، وَالْكَافِرُ) هەر بەندە و عەبدەکەیە پێی دەگوترێ بڕوادار یان پێی دەگوترێ کافر و بێ بڕوا بەهوٚی عەقیدە و عەمەل و کردارەکانی (وَالْبَرُّ، وَالْفَاجِرُ) هەر ئەوە پێی دەگوترێ چاکەکار یان پێی دەگوترێ گوناحکار (وَالْمُصَلِّي، وَالصَّائِمُ) هەر بەندەیە و مروٚڤەکانە پێی دەگوترێ نوێژ خوێن یان پێی دەگوترێ ڕوٚژو وان (وَلِلْعِبَادِ قُدْرَةٌ عَلَى أَعْمَالِهِمْ) دەفەرموێ بەندەکان توانایان هەیە لەسەر کردنی کارەکانیان (وَلَهُمْ إِرَادَةٌ) ویستیشیان هەیە الله تعالی ویست و حەزیشی بەخشیوە و موٚڵەتی داون هی بەندەکان بوٚ کردنی کار و کردەوەکانیان (وَاللهُ خَالِقُهُمْ) الله تعالی بەدیهێنەری مروٚڤەکانە وەکو خودی خوٚیان (وخالق قُدْرَتَهُمْ وَإِرَادَتَهُمْ) وە الله تعالی بە هەمان شێوە چوٚن ئەوانی بەدیهێناوە ئاوا تواناکان و ویستەکانی مروٚڤەکانیش هەر الله تعالی پێی داون و بەدی هێناوە (كَمَا قَالَ تَعَالَى) وەکو خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿لِمَن شَاء مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ * وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ [التكوير: ٢٨-٢٩] جا هەریەک لە ئێوە و مروٚڤەکان توانا و ویستیان الله تعالی پێی داون -جل شئنه- بەڵام هیچ شتێکیش بەبێ ویستی خوای رب العالمين نابێ -جل شئنه-.

لێرەدا تاقم و کوٚمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە هەندێکیان تێکەوتون وەکو قەدەریەکان جەبریەکان وە جگە لەوانیش ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون مروٚڤەکان خوٚیان ویستیان هەیە الله تعالی تواناشی پێداون موٚڵەتیشیان دەدا وە بوٚشیان بەدی دەهێنێ و دروست دەکا هەر کار و کردەوەیەک خوٚیان بە ویستی خوٚیان هەڵی دەبژێرن بەڵام قەدەریەکان وا ناڵێن هەندێکیان خوٚیان بەر دەدەنەوە و دەڵێن مادەم هەموو شتەکان لە دەستی الله تعالی بێ مروٚڤەکان ویستیان نیە وەکو جەبریەکان بوٚچونیان وایە دەڵێن بە جەبرەن و بە زوٚرە ملێ مروٚڤەکان ئەو کار و ئیشانەیان پێدەکرێ ویست و قسەی خوٚیان و

هەڵبژاردنی خۆیانیان لە دەستدا نیە بە پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە، بەڵکو دەڵێن مرۆڤەکان لە ئاستی کردنی کار و کردەوەکانیان وەکو پەڕە موچەیەک وان کە با دەیان هەژێنێ چۆن پەڕە موچە هیچی لە دەست خۆیدا نیە ئەگەر هەوا و بایەک بێ پەڕە موچەیەک لە شوێنێک چەقێنرابێ دەیهەژێنێ و دەیسوڕێنێ بایەکە مرۆڤەکانیش ئاوان، ئەوە پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە بەڵکو لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە خوای رب العالمین فەرمویەتی: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُم وَمَا تَعمَلُونَ﴾ [الصافات: ٩٦] گومان لەوە نیە الله تعالى ئێوەی بەدی هێناوە وە کار و کردەوەکانی ئێوەش بەدی دەهێنێ چونکە ئەگەر الله بەدی نەهێنێ و دروستی نەکا کەس پێی ناکرێ دروستی بکا ئەگەر الله ویستی لەگەڵدا نەبێ کەس ناتوانێ ئیش و کارەکە بێنێتەجێ لەبەر ئەوەی الله تعالى هەر کار و کردەوەیەک مرۆڤەکان ئینسانەکان بیانەوێ بیکەن یان ئەنجامی بدەن بە دڵنیاییەوە الله بۆی دروست کردون الله بۆی بەدی هێناون وە الله تعالى ویستی لەگەڵ بوە -جل شئنه- ئەگەر شەڕ و خراپەش بێ بەڵام ئەوکاتە ویستی کەونی لەگەڵە بۆ ئەوەی ئینتیحان و تاقیکردنەوەکە دروستبێ بەڵام مرۆڤەکەش الله تعالى ویستی پێداوە توانای پێداوە عەقڵ و ژیری پێداوە وە پێغەمبەرانی بۆ ناردوە (علیهم الصلاة والسلام) بە دەستی خۆشی مرۆڤەکە بە ویستی خۆشی بەو توانایەی الله پێی داوە کار و ئیشەکە دەکا لەبەر ئەوە الله تعالى ئەوپەڕی دادوەرییە کە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکا و لە کاتی سەرپێچی و گوناح و تاوانەکان تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە.

جا خوای رب العالمين هیدایەت و ڕێنوێنی کە دەڵێین لە دەستدایە -جل شئنه-: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهدِي مَن هُوَ كَـٰذِب كَفَّار﴾ [الزمر: ٣] ئەوکاتەی الله تعالى کافرە درۆزنەکان هیدایەت و ڕێنوێنی ناکا، لەبەر چی؟ چونکە بۆخۆیان ڕێی کوفریان هەڵبژاردوە و درۆزنن ڕێی درۆزنییان هەڵبژاردوە لەبەر ئەوە هیدایەتیان نادا الله تعالى نەک زوڵم و ستەمیان لێبکا بەرژوەندی و مەسڵەحەت لەلای الله تعالى نیە یان تەعەسوب لەلای الله (پەنا بە الله

تعالی) نیە ئەوە خزمەە ئەوە بەرژەوەندیەکم لەگەڵە ئەوە فڵانێکم لەگەڵە بە پێش کەسێکی تری بخا لە ئیشە خێر و چاکەکان هەموی بۆ الله تعالی بەندەی اللەن بەدیهێنراوی الله تعالی ن الله تعالی لە یەک ئاست تەماشایان دەکا، کاتێک هەندێکیان هیدایەت دەدا شایستەی هیدایەت دانن الله تعالی عیلم و زانستی پێی هەیە بۆخۆی دروستی کردون ئەوان ڕێگای هیدایەت دەگرنەبەر بەو ویستەی الله تعالی پێی بەخشیون بەو توانایەی الله تعالی پێی داون ئینجا لەدوای ئەوەی ئەوان هەڵی دەبژێرن ڕێگای هیدایەت الله تعالی یارمەتیان دەدا ڕێنوینیان دەکا پشتیان دەگرێ چونکە ڕێگای هیدایەت و چاکە و باشەی پێخۆشە الله تعالی لەگەڵیدایە پێی ڕازییە هەر یەکێکیش ڕێگای گوناح و تاوان دەگرێتەبەر ڕێگای پێ ناگرێ خوای رب العالمین لەبەر ئەوەی چونکە ئینتیحان و تاقیکردنەوە دروست نابێ ئەگەر ڕێگای پێبگرێ ئەویش لێی دەگەڕێ و بۆی دروست دەکا و ویستی لەگەڵدا دەبێ کاتێ کە کافرێک ڕێی کوفری هەڵدەبژێرێ بێدینێک ڕێی بێدینی هەڵدەبژێرێ تاوانکارێک ڕێگای تاوان و گوناح هەڵدەبژێرێ ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

جا چاکتر و باشتر بۆمان ڕون دەبێتەوە پەرتوکی (القضاء والقدر)ی دکتۆر عومەر سولەیمان ئەشقەرمان هێناوە لەدوای ئەو بڕگەی تریش بخوێنینەوە لە (العقيدة الواسطية) مەتنەکەی شەرح و ڕاڤەیەکی کورتی بکەین چەند خاڵێک هەیە لەوێدا باسی لێوە دەکەین و بەڵگەگان دەهێنینەوە و ڕونکردنەوەی لەسەر دەدەین چاکتر بەرچاوتان ڕون دەبێ لە هەموو ئەو شتانەی تر کە پەیوەستە و پەیوەندە بە عەقیدەی قەزاو قەدەرەوە بۆ ئەوەی ئا ئەوکاتە هیچ ئیشکال و کێشەیەکمان بۆ نەمێنێ.

جا لە مەتنی (الواسطية) ابن تيمية گەیشتە سەر ئەوەی دەفەرموێ (وَهَذِهِ الدَّرَجَةُ مِنَ الْقَدَرِ يُكَذِّبُ بِهَا عَامَّةُ الْقَدَرِيَّةِ الَّذِينَ سَمَّاهُمُ النَّبِيُّ: «مَجُوسِ هَذِهِ الأُمَّةِ») دەفەرموێ ئەو پلە و ئەندازە و دەرەجە و خاڵە لە دەربارەی قەدەر کە زۆربەی قەدەریەکان بە درۆی دەهێننەوە

بەڕاستی دانانێن ئەو قەدەریانەی کە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ناوی بردون بە مەجوس و ئاگر پەرستی ئەو ئومەتە.

جا لە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ مَجُوسًا» هەر ئومەت و گەلێک کۆمەڵێکیان هەن مەجوسی حیسابن «وَإِن مَجُوسُ هَذِهِ الْأُمَّةِ الَّذِينَ يزعمون: أَلَا قَدَرَ[1]» مەجوسی ئومەتی منیش پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەوانەن کە دەڵێن قەدەر نیە بەو مانایەی قسە دەکەن لە قەدەری خوای رب العالمین یان کەمتەر خەمی دەکەن بەوەی دەڵێن کار و کردەوەی ئێمە چاک بۆ بکەین مادەم هەموو شتێک لەلای الله بڕاوەتەوە؟ و تەمبەڵی لێدەکەن و وازی لێ دەهێنن یان ئەوەیە کە جەبریەکانن ئەوانە زیاتر لە تیرەی قەدەریەکان لاڕێ بونە یان ئەوەیە کە هەندێک جار قسە دەکەن قسەی نابەجێ دەربارەی الله تعالى لە ڕوی هیدایەت دانی خەڵکەکان یان گومڕایی کردنی خەڵکان شتی ناشیاو پاڵ دەدەنە لای الله تعالى (پەنا بە الله).

لە پاشان ابن تيمية دەفەرموێ (وَيَغْلُو فِيهَا قَومٌ مِنْ أَهْلِ الإِثْبَاتِ) هەندێکیش لەو گەل و خەڵکانەی کە جێگیری قەدەر دەکەن بۆ الله تعالى و لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوانیش زیادە ڕەوییان تێدا کردوە و دەکەن (حَتَّى سَلَبُوا الْعَبْدَ قُدْرَتَهُ وَاخْتِيَارَهُ) گەیاندویانەتە ئەو ئەندازەی کە بەندەکان هیچ قودرەت و توانایان نیە هەڵبژاردنیان نیە لە کار و کردەوەکانیان کە ئەوە پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە دەربارەی قەدەر (وَيُخرِجُونَ عَنْ أَفْعَالِ اللهِ وَأَحْكَامِهِ حُكْمَهَا وَمَصَالِحَهَا) جا دەیبەنە دەرەوە لە کار و کرداری الله تعالى وە لە حوکمەکانی الله تعالى حوکمی کار و کردەوەی مرۆڤەکان یان بەرژەوەندی و مەسڵەحەتەکان بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە وا نین.

[1] في قوله صلى الله عليه وسلم : إن لكل أمة مجوسا، وإن مجوس هذه الأمة الذين يزعمون أن لا قدر.
أخرجه أبو داود برقم (٤٦٩٢) في السنة، وأحمد في المسند ( ٥ \ ٤٠٦ ، ٤٠٧ )، وهو حديث حسن بشواهده. انظر: السنة لابن أبي عاصم بتحقيق الألباني (١\ ١٤٤- ١٤٦).

جا لە درێژەی ئەو فەرمودەی ئایە ئەوانە مەجوسی ئەو ئومەتەن؟ حوزەیفە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: «إنَّ مجوسَ هذهِ الأمَّةِ الذين يقولونَ لا قدَرَ، إنْ مرِضوا فلا تعودوهم، وإنْ ماتوا فلا تتبعوهم[١]» جا فەرمویەتی ئەگەر نەخۆش کەوتن مەچونە لایان یانی قەتعی ئیلاقەیان لەگەڵ بکەن لەگەڵ قەدەریەکان گومڕابونە لاڕێ بونە با کار نەکەنە سەر ئێوەش لە عەقیدە وە ئەگەر مردن شوێنی جەنازەکانیان مەکەون، ئەوە پچڕانی پەیوەندییە لە نێوان ئەهلی سونە و جەماعە و ئەهلی بیدەع ئەوانەی ئەهلی بیدەعی عەقیدەیین ئەو بابەتە تاقم و کۆمەڵانەن، نەک خەڵکانێک لە بواری فیقهیەوە لە مەسەلە فیقهیەکانی فەرعیات کە ئەگەر جیاوازی و ئیختیلافێکیان هەبێ ئیجتیهاد و بیروبۆچونێکیان هەبێ تۆ بڕیاری ئەوەی لەسەر بدەی بڵێی ئەهلی بیدعەیە و لەگەڵی دەپچڕێنم و سەلامی لەگەڵ ناکەم کەلامی لەگەڵ ناکەم شوێنی جەنازەکەی ناکەوم نا ئەوانەی کە لە عەقیدە و بیروبڕوا ڕافیزە و شیعەکان یان قەدەری و جەبریەکان یان موعتەزیلە و جەهمیەکان ئەوانە پشتیان تێدەکرێ و سەردانیان مەکە و بەدوایاندا مەڕۆ لە شوێن جەنازەکانیان مەڕۆ.

جا لە پاشان لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە گوتمان جێگیرە کە الله تعالى بەدیهێنەری هەموو کار و کردەوەکانی مرۆڤەکانە چونکە ئەگەر الله بەدییان نەهێنێ بەدی نایە کار و کردەوەکان وە لە پاشان الله تعالى ویستی لەگەڵدایە خێربێ یان شەڕ چونکە ئەگەر ویستی لەگەڵدا نەبێ دوبارە شتەکە ڕونادا بەڵام بە ئیختیار و هەڵبژاردنی مرۆڤەکانە وە بە توانای مرۆڤەکانیشە کە ئەو هەڵبژاردن و ئەو توانایەش الله تعالى بە مرۆڤەکانی بەخشیوە و بۆی بەدیهێناون ئینجا دەتوانن وە عەقڵ و ژیریشی پێداون الله تعالى بە مرۆڤەکان ئینجا لەولاشەوە پێغەمبەرانی بۆ ناردون (عليهم الصلاة والسلام)، کەواتە هەر کەسێک گومڕابێ بەدەستی خۆی خۆی گومڕا کردوە هەر کەسێک تاوان دەکا بە دەستی خۆی ئەو

---

[١] **أخرجه أبو داود برقم (٤٦٩٢) في السنة، وأحمد في المسند ( ٥ \ ٤٠٦ ، ٤٠٧ )، وهو حديث حسن بشواهده. انظر: السنة لابن أبي عاصم بتحقيق الألباني (١\ ١٤٤- ١٤٦).**

تاوانەی بەدەست هێناوە، ئەوپەڕی عەدالەت و دادوەرییە کە الله تعالی -جل شئنە- ئەگەر ویستیشی لەگەڵە و ئەگەر بۆشی بەدیهێناوە و ئەگەر مۆڵەتیشی داوە ئەو کارە دەکا بۆ تاقیکردنەوە و ئینتیحان بوە ئەوپەڕی عەدالەتیشە لە سەرپێچی و تاوان و ڕێگا کوفرەکە کە هەڵیبژاردوە تۆڵەی لێ بسێنێتەوە.

دەیەها بەڵگە هەن لەسەر ئەوە کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ [المزمل: ١٩] ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ [التكوير: ٢٩] ئەگەر ویستیان با هەر ڕێگایەک دەگرنەبەر بۆ ناسینی الله و ڕێگای خوای رب العالمین، یان: ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ [الكهف: ٢٩] خوای رب العالمین دەفەرموێ ئەوەی دەیهەوێ با بڕواداربێ و ئەوەی دەیهەوێ با کافربێ، کەواتە ویستی مرۆڤەکان لە دەست مرۆڤەکاندایە ئیختیار و هەڵبژاردن لە دەست ئەوان دایە بەڵام هیچ شتێکیش بەبێ ویستی الله نابێ، ئەگەر کوفر و بێدینیەکەشە ئەگەر کافر بونەکەشە مرۆڤەکە الله تعالی مۆڵەتی داوە ویستی پێداوە توانای پێداوە کە هەڵبژێرێ بەڵام ویستی اللەشی لەگەڵدا دەبێ کاتێ کوفرەکە و بێدینیەکە هەڵدەبژێرێ بۆ ئەوەی تاقیکردنەوە و ئینتیحانەکە دروستبێ ویست و ئیرادەی کەونی نەک شەرعی بەڵام لەرێی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) الله تعالی پێی ڕاگەیاندوە حوجەی لەسەر کردوە کە ئەو ڕێگایەی تۆ هەڵدەبژێری هەڵەیە چەوتە تۆڵەشت لێ دەستێنمەوە ئەگەر لەسەر ئەو ڕێگایە بەردەوام بی.

ئینجا خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾ [النحل: ٣٦] الله تعالی دەفەرموێ هەیانە لە مرۆڤەکان الله تعالی ڕێنوینی کردون بە دەستی خۆیان ڕێگای ڕێنوێنی هەڵدەبژێرن جا الله یارمەتیان دەدا لەگەڵیاندا دەبێ ئەوکات ئیرادەی کەونی اللەشی لەگەڵدا دەبێ بەدی دەهێنێ بۆیان وە ئیرادەی شەرعیشی لەگەڵدا دەبێ کە پێی خۆشە پێی ڕازییە کەسێک ڕێگای هیدایەت و ڕێنوینی هەڵبژێرێ و پشتگیریشیان لێ دەکا و کار ئاسانیشیان بۆ دەکا الله -جل شئنە- وە هەندێک لە

خەڵکەکانیش هەن الله تعالی دەفەرموێ گومڕایی بەسەریاندا هاتوە بەدەستی خۆیان وایان کردوە موستەحەق و شایستەی ئەوەبن گومڕابن بە دەستی خۆیان ئەو ڕێگایەیان هەڵبژاردوە. ئەبو جەهل بە دەستی خۆی و بە هەڵبژاردنی خۆی نەیویست ببێتە موسڵمان چەند پێغەمبەر (ﷺ) ڕێنوێنی ئیرشادی کرد لەبەر ئەوەی الله تعالی عیلم و زانستی پێ هەبوو لە ئەوەل و ئەزەلەوە ئەبو جەهل نابێتە موسڵمان بە کافری و گومڕایی مایەوە، جا ئەبو لەهەب بە دەستی خۆی ڕێگای کوفرەکەی و گومڕاییەکەی هەڵبژارد جا خوای رب العالمین یش ویستی لەگەڵ بوو ئیختیاریشی دابوە دەستی ئەو تاوەکو ئینتیحان و تاقیکردنەوەکە دروست بێ.

ئینجا الله تعالی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەش: ﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ﴾ [الأنبياء ٢٣] الله بۆ ئەوەندەش اللهیە -جل شئنە- نابێ پرسیاریشی لێبکرێ لەوەی دەیکا لەبەر ئەوەی چونکە گەورەیە خاوەن حیکمەتە وە اللهیە -جل شئنە-، تۆ هەرچی الله تعالی کردی لێی بپێچیتەوە لێی ورد بیتەوە وەکو هەندێک لە تاقم و تیرەکان تەنانەت ئەشعەریەکان هەموو جارێ دەڵێن دەبێ تۆ غایەت یان حیکمەت یان مەبەست لە مەبەستەکانی الله تعالی تێبگەی هەموو شتێکی الله تعالی لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بێ حیکمەت نیە و حیکمەتی تێدایە بەڵام مەرج نیە تۆ بزانی تۆ هەموو جارێکیش بۆت نەهاتوە لێی بپێچیتەوە و ئیلا ئەگەر بیزانی ئینجا بەدوای کەوی ئەوکات ئەوە تەسلیم بونێکی بەندایەتی تەواو نیە ئەوکات مەسڵەحەت و بەرژەوەندیەکەت پاڵت پێوە دەنێ کار و ئیشەکە بکەی، عەبدایەتی تەواو بۆ خوای رب العالمین وە ڕاگەیاندنی خوایەتی الله تعالی بە تەواوەتی لەلای تۆ لەوەدایە هەر ئیش و کارێک الله تعالی فەرموی و کردی تەسلیمبە ملکەچبە دڵ کەچبە ئینجا لە دوایە ئەگەر حیکمەتەکەشت بۆ ڕون بویەوە ئا ئەو کاتە چاکتر و زیاتر دڵت پێی خۆش دەبێ.

جا هەندێک خاڵ هەیە لە دەربارەی قەزا و قەدەر لە پەرتوکەکەی (القضاء والقدر)ی دکتۆر عومەر سولەیمان ئەشقەر حەزمان بەوەبوو ئەوە پیاوێکی بەرز و بەڕێزە لە چەند ڕۆژی ڕابردودا وەفاتی کرد زانایەکی یەکجار گەورەیە وە زۆر سود و کەڵکمان لێ وەرگرتبوو، دەتوانین بڵێین ئەستێرەیەک بوو لە ئەستێرەکانی ئەهلی سونە و جەماعە و ئەو ئەستێرە ڕۆیشتەوە بۆلای الله تعالی الله تعالی هەموو عیبادەت و دینداری و نوسین و عیلم و خێر و چاکە و دەعوەکانی لێ قبوڵ کردبێ بەڕاستی داعی بوو مامۆستا بوو بەڕێز بوو، ئێمە هەوڵی ئەوەماندا کە بچینە خزمەتی ئەمساڵ بێتەوە لەدوای سەردانی سودانی ئەمجارەمان بەس دیارە بە قیسمەت و نسیب نەبوو لەگەڵ کوڕەکەی تەعاروفمان پەیدا کردبوو کە یەک لە کوڕەکانیشی ئاوا زانایە و دکتۆرای هەیە و لە شەریعەت دەزانێ و شتی زۆر باشی هەیە الله پاداشتیان بداتەوە پیاوێکی موتەوازیع، جا بۆ ئەوەی خێر و بێریش بە ئەو بگا دیارە ئاخیر خێریش بوە زاهیریەکەی لەبەر ئەوەی الله تعالی لە شەوی جومعە وە لە مانگی ڕەمەزان لەو دە شەوەی ئاخیری گیانی کێشا و گەڕایەوە لای خوای رب العالمين الله تعالی لە ڕیزی پێغەمبەران و پیاوچاکان و سدیق و شوهەدا حەشری بکا و ئێمەش لەگەڵ.

ئەو پیاوە بەڕێزە ئەو سیلسیلە و زنجیرەی داناوە (العقيدة في ضوء الكتاب والسنة) هەشت پەرتوکە بەڕاستی زۆر نایابە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەی بەهەموو بەڵگەکانەوە وە بە هەموو ئیختیلاف و جیاوازیەکانەوە تێدا هێناوە، لە زنجیرەی هەشتەمی کە دەربارەی قەزا و قەدەرە زۆر بە کورتی و پوختی شتەکانی باسکردوە، جا ئێمە هەندێک لە بڕگەکانی دەهێنینەوە کە بۆ نمونە دەربارەی فیعل و کرداری بەندەکان ئایە بەدیهێنراوی الله تعالی یە و بەندەکانیش ویست و هەڵبژاردنیان بۆ هەیە بۆ فیعل و کارەکانی خۆیان؟ بەڵێ دەیەها بەڵگەمان هەیە لەوانە جابر دەگێڕێتەوە دەفەرموێ سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشەم هات گوتی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) «بَيِّنْ لَنَا دِينَنَا كَأَنَّا خُلِقْنَا الْآنَ، فِيمَا الْعَمَلُ

الْيَوْمَ، أَفِيمَا جَفَّتْ بِهِ الْأَقْلَامُ وَجَرَتْ بِهِ الْمَقَادِيرُ؟ أَمْ فِيمَا نَسْتَقْبِلُ ؟ قَالَ: لَا، بَلْ فِيمَا جَفَّتْ بِهِ الْأَقْلَامُ، وَجَرَتْ بِهِ الْمَقَادِيرُ» ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە گوتی بۆمان ڕونکەوە ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) ئێمە کە ئەنەهو ئێستا بەدیهاتوین و دروستکراوین ئایە عەمەل و کردەوەکانی ئەمڕۆمان ئایە بە گوێرەی ئەو مرەکەبەی قەڵەمی خواییە کە وشک بوەتەوە و هەموو شت بڕاوەتەوە و نوسراوەیە و ئەندازە کراوە یان بەوەی داهاتوو ئێمە بڕیاری لەسەر دەدەین و دەیکەین؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بەوەیە کە مرەکەبی خوایی لێ وشک بوەتەوە بەوەیە کە ئەندازە کراوە و دانراوە لە (اللوح المحفوظ)، ئەوە مانای ئەوە دەگەیەنێ ئەمجارە ئەو گوتی «فَفِيمَ الْعَمَلُ؟» ئینجا بۆ ئێمە کار و کردار بکەین ئایە بۆ لێی دانەنیشین و مادەم هەموو شتێک لەسەرمان بڕاوەتەوە؟ جا فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ[١]» فەرموی ئێوە کار و کردار بکەن بەس هەر یەکێکیشتان ئەوەی نوسراوە لە سەری هەر ئەوی بۆ دەبێ و بەسەری دێ، لەبەر چی؟ چونکە تۆ نازانی لە داهاتودا کامە کردەوە دەکەی ویستی الله لەگەڵ کامەیانە.

کەواتە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی کار و کردەوەکان دەبێ تۆ قۆڵ و باسکت هەڵماڵی ئیش و کارەکانت بکەی پشتیش بە الله ببەستی ڕێگای خەیر بگریتەبەر دوایە هەرچیت بەسەرهات ئا ئەو کاتە پێی ڕازی بی و خوای رب العالمین -جل شئنه- ئەوەی بۆ هێنای بزانە ئەو تەواوە و ئەو نوسراو بوە لە (اللوح المحفوظ).

لەبەر ئەوە بزانن عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ابن تيمية ئیمامی تەحاوی ئەو دەقانەی ئەوان دەهێنینەوە بزانە چەند چاک حاڵیان دەکەن و تێیان دەگەیەنن، ئایە چۆن دەبێ ئێمە تەسلیم بین بە قەزاو قەدەر و کار و کردەوەکان؟ هەڵبژاردن لە دەست خۆمانە ویستمان هەیە ئێمەش بەڵام هەموشی بە ویستی الله تعالی دەبێ وە لە عیلمی الله تعالی دا هەبوە لە

[١] صحيح مسلم (٢٦٤٨)، مسند أحمد (١٤١١٦) (١٤٢٥٨) (١٤٦٠٠).

ئەوەل و ئەزەل چی دەکەین لە (اللوح المحفوظ)یش ئەوە نوسراوەیە هیچ شتێکیش بەسەرماندا نەسەپێنراوە بە زۆر پێمان بکرێ ویست و ئیرادە و هەڵبژاردنی خۆشمانی لەگەڵە.

ئەوەتا ابن تيمية دەفەرموێ: (أن يعلم الإنسان أن مذهب أهل السنة والجماعة في هذا الباب وغيره ما دل عليه الكتاب والسنة) ڕێڕەوی ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی قەزاو قەدەر ئەوەیە کە لە قورئان و سونە بەڵگەنە لەسەری (وكان عليه السابقون الأولون من المهاجرين والأنصار) کە پێشینانی چاکی ڕابردوو یەکەمینەکان لە موهاجیر و کۆچبەران وە لە ئەنسار و پشتیوانان لەسەری ڕۆیشتون (والذين اتبعوهم بإحسان) وە ئەوانەی شوێنی ئەوانیش کەوتون بە چاکە (وهو) ئەویش ئەوەیە عەقیدەکە (أن الله خالق كل شيء ومليكه) الله تعالى بەڕاستی و بێگومان بەدیهێنەری هەموو شتێکە هەر ئەویش خاوەنە بۆ شتەکان (وقد دخل في ذلك جميع الأعيان القائمة بأنفسها وصفاتها القائمة بها من أفعال العباد وغير أفعال العباد) جا ئەوە هەموو شتێک دەگرێتەوە کە الله بەدیهێنەرە بۆی -جل شئنه- وە خاوەنیەتی چ عەین زات و خودی شتەکان بێ چ سیفەت و ئاوەڵناوەکانی لە خودی شتەکان دێتەجێ وەکو کار و کردەوەی مرۆڤەکان وە جگە لە کار و کردەوەی مرۆڤەکان خودی مرۆڤەکانیش هەر الله بەدیهێنەرە بۆیان -جل شئنه- (وأنه سبحانه ما شاء كان) جا الله تعالى هەر شتێک ویستی لەگەڵدابێ ئەوە بوە و دەبێ (وما لم يشأ لم يكن) ئەوەی الله تعالى ویستی لەگەڵدا نەبێ نابێ (فلا يكون شيء إلا بمشيئته وقدرته) هیچ شتێک نیە ببێ و بەدی بێ مەگەر بە مەشیئەت و ویست و دەسەڵات و توانای الله تعالى یە دەبێ (لا يمتنع عليه شيء شاءه) هیچ شتێک ناتوانێ ئەو شتەی الله ویستی لەگەڵدابێ قەدەغەی بکا و لێنەگەڕێ بێتەجێ (بل هو قادر على كل شيء) بەڵکو الله تعالى توانایە لەسەر هەموو شتێک (ولا يشاء شيئا إلا وهو قادر عليه) هیچ شتێک نیە الله ویستی لەگەڵدابێ ئیلا تواناشی هەیە بەسەر شتەکە کە بێتەجێ (وأنه سبحانه يعلم ما كان وما يكون) الله تعالى عیلم و زانستی هەیە بە ڕابردوەکان لە ئەوەل و ئەزەلەوە وە بە داهاتوەکانیش و بە ئێستاش

و هیچ شتێک بەدەر نیە لە عیلم و زانستی الله (وما لم یکن لو کان کیف یکون) هەر شتێک نەبێ چۆن دەبێ هەر الله تعالی عیلم و زانستی پێی هەیە ئایە لە موستەقبەل و داهاتوو دەبێ و چۆنیش دەبێ (وقد دخل في ذلك أفعال العباد وغيرها) جا دەچێتە ئەو بازنەیەوە کار و کردەوەی بەندەکان جگە لە کار و کردەوەکانیشیان الله عیلم و زانستی پێی هەیە و ویستیشی لەگەڵدا دەبێ کاتێک کار و کردەوەکان مرۆڤەکان ئەنجامی دەدەن (وقد قدر الله مقادير الخلائق) بێگومان الله تعالی ئەندازەی هەموو بەدیهێنراوەکانی کردوە و داناوە (قبل أن يخلقهم) پێش ئەوەی بەدییان بێنێ و دروستیان بکا (قدر آجالهم وأرزاقهم) هەموی ئەندازە کردوە و بۆی داناون هەم ئەجەل و مۆڵەتی دیاریکراویان هەم ڕزق و ڕۆزییان (وأعمالهم) هەم کار و کردەوەکانیان (وكتب ذلك) ئەو عیلم و زانستیەی خۆی نوسیوەتەوەش لە (اللوح المحفوظ)دا (وكتب ما يصيرون إليه من سعادة وشقاوة) ئەوەشی تۆمار کردوە و نوسیویەتیەوە ئەوەی مرۆڤەکان پێی دەگەن لە بەختەوەری یان لە بەد بەختی (فهم يؤمنون بخلقه لكل شيء وقدرته على كل شيء) ئەوان بڕوادارن بەوەی کە هەموو بەدیهێنراوەکان لەلای الله تعالی یە بەدیهێنانی وە قودرەت و دەسەڵاتی الله تعالی ی ە ل‌ەس‌ەر هەموو شتەکان (ومشيئته لكل ما كان) وە ئەو شتانەی ڕویداوە هەموی ویستی الله تعالی ی لەگەڵدا بوە (وعلمه بالأشياء قبل أن تكون) وە عیلم و زانستی هەیە بە شتەکان پێش ئەوەی بێتەجێ (وتقديره لها) هەموشی ئەندازەی بۆ کردوە (وكتابته إياها قبل أن تكون[1]) پێش ئەوەی شتەکانیش ڕوبدا نوسیویەتیەوە الله تعالی ئەو شتانەی لە داهاتوش ڕوودەدەن لە (اللوح المحفوظ)دا.

دوایە درێژە بە قسەکانی دەدا ڕونکردنەوەی جوانتریش دەدا دەفەرموێ: (وسلف الأمة وأئمتها متفقون أيضا على أن العباد مأمورون بما أمرهم الله به) جا پێشینانی ئومەتی ئیسلام وە پێشەواکانیان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی بەندەکانی خوای رب العالمین فەرمان پێکراون

[1] مجموع الفتاوى ج: ٨ ص: ٤٤٩.

بەوەی كە الله تعالى فەرمانی پێكردون (ومنهيون عما نهاهم الله عنه) وە قەدەغە كراون لەو شتانەی كە الله قەدەغەی لێكردون (ومتفقون على الإيمان بوعده ووعيده الذي نطق به الكتاب والسنة) جا دەفەرموێ وە یەک دەنگیشن لەسەر ئیمان و بیروبڕوا بون بە وەعد و بەڵێنەكانی الله بۆ دانەوەی پاداشتی بڕواداران و چاكەكاران وە توڵە سەندنەوە لە بێدینان و گوناحكاران ئەوەی كە لە قورئان و سونە هاتوە و باسكراوە (ومتفقون أنه لا حجة لأحد على الله في واجب تركه) هیچ كەسێک بەڵگەی بە دەستەوە نەماوە لەسەر الله تعالى ئەگەر شتێک الله واجب و ئەمری پێكردبێ وازی لێ بێنێ و نەیكا (ولا محرم فعله) یان حەرام و تاوانێک كە دەیكا حوجەی لەسەر كراوە ئەگەر كردی شایستەی ئەوە دەبێ كە توڵەی لێ بسێنرێتەوە (بل لله الحجة البالغة على عباده[١]) بەڵكو الله تعالى بەڵگەی زۆر بەهێزی لەسەر بەندەكانی هەیە كە پێغەمبەرانی ڕەوانە كردوە (عليهم الصلاة والسلام).

لە كۆتایی هەر ئەو چەند دێڕەی (مجموع الفتاوى)ی ابن تيمية باس دەكەین كە دەفەرموێ: (ومما اتفق عليه سلف الأمة وأئمتها مع إيمانهم بالقضاء والقدر وأن الله خالق كل شيء) یەكێكیش لەو شتانەی تر كە سەلەف و پێشینانی ئومەتی ئیسلام وە پێشەواكان ئیمانیان پێی هەیە لەگەڵ قەزاو قەدەر كە یەكدەنگیشن لەسەری ئەوەیە كە الله تعالى بەدیهێنەری هەموو شتەكانە (وأنه ما شاء كان) ئەوەی كە الله بیەوێ و ویستی لەگەڵ بوە بوە و دەبێ (وما لم يشأ لم يكن) ئەوەی ویستی لەگەڵ نەبێ نابێ (وأنه يضل من يشاء ويهدي من يشاء) الله تعالى ئەوەی بیەوێ دەتوانێ گومڕای بكا وە ئەوەی بیەوێ هیدایەت و ڕێنوێنی دەدا (وأن العباد لهم مشيئة وقدرة) بەڵام بەندەكانی اللهیش و مرۆڤەكانیش ویستیان هەیە تواناشیان هەیە الله ئەو ویست و توانایەی بۆ دروست كردون و پێی داون (يفعلون بمشيئتهم وقدرتهم) بەندەكانی خوای رب العالمين ئەو ئیش و كارانە دەكەن بەو تواناوە دەیكەن كە الله بەوانی داوە بەو ویستە و حەزە و ئارەزوە دەیكەن كە الله تعالى بۆ ئەوانی

[١] مجموع الفتاوى ج: ٨ ص: ٤٥٢.

بەدی هێناوە (ما أقدرهم الله علیه) ئەو توانایەی کە الله تعالى بە ئەوانی بەخشیوە لەسەری کە بتوانن بیهێننەجێ (مع قولهم إن العباد لا یشاءون إلا أن یشاء الله[١]) لەگەڵ ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە و پێشینانی چاک و پێشەوایانی ئەهلی سونە و جەماعە یەک دەنگیشن لەسەر ئەوەی بەندەکان هیچ ویستێکیان نابێ ئیلا ویستەکانیان دەبێ تێک بکاتەوە لەگەڵ ویستی الله تعالى ئینجا ئیش و کارەکان دەبێ و ڕوددەدا.

کەواتە ئەوەیە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە وەکو ابن تیمیة بە درێژی لە مجموع الفتاوی فەرموی و وە دکتۆر عومەر سولەیمان ئەشقەر لە (القضاء والقدر) ئەو پەرتوکە نایابەی هێنا بویەوە.

چەند خاڵێکی تر هەیە حەز دەکەین ڕونی کەینەوە یەک لەو خاڵانە ڕونکردنەوە و بەڵگە لەسەر ئەوەی خەڵکی دۆزەخ و خەڵکی بەهەشت لە عیلمی الله تعالى دا بونە -جل شئنە- لە ئەزەل و ئەوەلەوە دیاریکراون، بەس بەو مانایە دێ دیاریکردنەکەیان کە الله تعالى زوڵمیان لێ ناکا بە دەستی خۆی کەسەکە ڕێگای بەهەشت هەڵدەبژێرێ الله ویستی پێدەدا توانای پێدەدا، وە ئەوەی دۆزەخیشە بە دەستی خۆی ڕێگای دۆزەخ هەڵدەبژێرێ بەڵام ئەو شتانە براوەیە، وەکو لە سەحیحی بوخاری هاتوە لە عیمرانی کوڕی حوسێن دەفەرموێ پیاوێک گوتیە پێغەمبەر (ﷺ): «أَيُعْرَفُ أَهْلُ الْجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؟» ئایە بەهەشتی و دۆزەخی دەناسرێن و لێک جیا دەکرێنەوە؟ «فقَالَ: نَعَمْ» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بەڵێ «قَالَ: فَلِمَ يَعْمَلُ الْعَامِلُونَ؟» کەواتە بۆ کار و کردار بکەن ئەوەی بەهەشتیە هەر بەهەشتیە و ئەوەی دۆزەخیە هەر دۆزەخیە؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «كُلٌّ يَعْمَلُ لِمَا خُلِقَ لَهُ[٢]» هەریەک ئەو کار و کردەوە دەکا کە لە پێناویەوە بەدیهاتوە و دروست بوە، یەعنی بەهەشتی کاری ئەهلی

[١] مجموع الفتاوی، ج: ٨ ص:٤٥٩.

[٢] صحیح البخاري (٦٥٩٦) (٥٧٠٥) (٧٥٥١)، صحیح مسلم (٢٦٤٩)، سنن أبي داود (٤٧٠٩).

بەهەشتی دەکەن دۆزەخی کاری ئەهلی دۆزەخ دەکەن بە ویستی خۆیان بە هەڵبژاردنی خۆیان ئینجا الله تعالى عیلمی پێ هەبوە ئەو بڕیارەی داوە و لێکی جیا کردونەتەوە.

ئینجا لە سەحیحی موسلیمیشدا هاتوە کە ئیمامی عەلی -رضي الله عنه- دەفەرموێ: «كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ فَأَتَانَا النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ، فَنَكَّسَ فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحد مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلَّا كُتِبَ مَكَانُهَا مِنَ الْجَنَّةِ، وَالنَّارِ، وَإِلَّا قَدْ كُتِبَ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً» ئیمامی عەلی دەفەرموێ ئێمە جەنازەی موسڵمانێکمان پێبوو (سەحابەیەک) لە گۆڕستانی بەقیعی غەرقەد بوین، کە شوێنێکی دیاریکراوە بە قەبرستانی مەدینە مەشهورە لە نزیک مزگەوتەکەی پێغەمبەرە (ﷺ) زۆربەی هاوەڵان و سەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەدوای هیجرەتی بۆ مەدینە لەوێ شاردراوەن، دەفەرموێ پێغەمبەر هاتە لامان (ﷺ) گۆچانێکی بچوکی بە دەستەوە بوو ئینجا دانیشت و لە پاشان بەو گۆچانە پێغەمبەر (ﷺ) سەری خۆی نزم کردبۆوە و لە عەرز دەیخشاند و نوکەکەی لە عەرز دەدا ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی هیچێک نیە لە ئێوە یەکێک نیە لە ئێوە ئیلا گیان لەبەربێ ڕۆحی لەبەربێ ئیلا ئەو کەسە الله تعالى شوێنی دیاریکردوە و بۆی نوسیوە لە بەهەشتە یان لە دۆزەخە وە بۆی نوسراوە بەدبەختە یان بەختەوەرە.

کەواتە ئەوە زوڵم و ستەم نیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە الله تعالى بەسەر دۆزەخیانی سەپاندبێ ئیلا دەبێ تۆ دۆزەخی بی بەبێ هەڵبژاردنی خۆی و توانای خۆی نا توانا و هەڵبژاردنی داوەتە دەستی بەندەکەی وە پێغەمبەری بۆ ناردوە (ﷺ)، بۆخۆی ڕێگای جەهەنەمی بە ویستی خۆی بەو توانا و هەڵبژاردنەی الله پێی داوە هەڵیبژاردوە ئینجا خوای رب العالمین وای دیاری کردوە.

ئینجا «فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ» ئیمامی عەلی دەفەرموێ جا پیاوێک گوتی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) «أَفَلَا نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا» جا بۆ ئێمە نەمێنینەوە لەسەر ئەو نوسراوەی لەسەرمان نوسراوە «وَنَدَعُ الْعَمَلَ» وازبێنین لە کردەوەکان «فَقَالَ : مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ

فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) هەر یەکێک ئەهلی بەختەوەری بێ و چونە بەهەشت بێ ئەوە دەڕوا بەرەو ڕێگای کردنی ئەو کردەوانەی کە ڕێگای بەهەشتیانە «وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ» هەر یەکێکیش لە دۆزەخی بێ دەچێ ئەو کار و کردەوانە دەکا بەڵام الله تعالی لە ئەوەڵ عیلمی پێی هەیە ئەوە بە دەستی خۆی بە ویستی خۆی ئەو ڕێیە هەڵدەبژێرێ لەبەر ئەوە لە سەرەتاوە یەکلای کردوەتەوە و دیاری کردوە، ئینجا «فَقَالَ : اعْمَلُوا؛ فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ، أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ» جا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) هەموتان بە گوێرەی ئەوەی لەسەرتان نوسراوە کار و کردەوەکانتان وا دەبێ بەو مانایەی بە دەستی خۆتان بە ویستی خۆتان ئەوە هەڵدەبژێرن الله عیلمی پێی هەبوە و لەبەر ئەوە ئەوەی لەسەرتان نوسیوە جا ئەوەی بەختەوەری بێ کار و کردەوەی بەختەوەرییان دەکا و هی بەهەشتیان دەکا ئەوەی دۆزەخی بێ و بەدبەخت بێ کار و کردەوەی بەدبەختان دەکا و هی دۆزەخیان دەکا ئەوەی یەکەمیان هی بەهەشتیان دەکا، ئینجا دوایە پێغەمبەر ئەوەی خوێندەوە (ﷺ): ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ * وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ * فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ * وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ * وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ * فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ[1]﴾ [الليل: ٥-١٠] کەواتە سەبەب و هۆکارەکان دیاریکران هەریەکێک پێی ببەخشرێ و تەقوای الله تعالی بکا ببەخشێ و تەقوا بکات ئەو ڕێگا چاک و باشانە بەڕاست دابنێ کە ڕێی پێغەمبەرە (ﷺ) ئەوە کار ئاسانی بۆ دەکرێ الله لەگەڵیدا دەبێ سەری دەخا پشتی دەگرێ بەڵام هەریەکێک ڕەزیلی و قرچۆکی بکا بەوەی ڕێگای پێغەمبەر نەگرێتەبەر (ﷺ) پێیوابێ دەوڵەمەندە لەوە و پێویستی بەو ڕێگا و ڕێبازە نیە وەکو ئەبو جەهل وایکرد وە بە درۆی بێنێتەوە ڕێباز و ڕێگا چاکەکەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئا ئەوەیە یارمەتی نادرێ الله تعالی لەگەڵیدا نابێ بەڵام ویستی لەگەڵ ئەوەدا دەبێ الله تعالی کە ڕێگای پێ ناگرێ بە دەستی

[1] صحيح البخاري (١٣٦٢) (٤٩٤٥) (٤٩٤٦)، صحيح مسلم (٢٦٤٧)، سنن أبي داود (٤٦٩٤).

خۆی بە ویستی خۆی ئەو مرۆڤە ئەو ڕێگایەی هەڵبژارد خوای رب العالمين یش وازی لێ دەهێنێ و کارەکەی بۆ ئەنجام دەدا و بۆی دەهێنێتەجێ و ویستیشی لەگەڵدا دەبێ هەتا ئینتیحان و تاقیکردنەوەکە دروست ببێ.

لە پاشان خاڵێکی تر ئەوەیە کە دەمانەوێ باسی لێوە بکەین ئایە عەقڵی مرۆڤ بۆی هەیە قسە بکا لە شتە غەیبیەکان یان لە تەقدیر و قەدەری الله تعالى؟ نەخێر عەقڵ و هۆشی ئینسان سنورداره نابێ قسە بکا لە شتە غەیبیەکان دەبێ بەدوای نەقڵ و فەرمودەکانی الله و پێغەمبەر بکەوێ (ﷺ) وەکو أبو المظفر السمعاني کە ابن حجر لێی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ فەرمویەتی: (سبيل المعرفة في هذا الباب) ڕێگای شارەزابون و عیلم بە دەست هێنان دەربارەی عەقیدە و قەدەری خوای رب العالمين (التوقيف من الكتاب والسنة) دەبێ تۆ بوەستی لەسەر کیتاب و سونە نابێ لە خۆتەوە قسەی لێبکەی (دون محض القياس والعقل) نابێ بە ڕوتی عەقڵ بەکار بێنی و قیاسی بکەی لەسەر شتە بەدیهێنراوەکان شتە غەیبی و نادیارەکان (فمن عدل عن التوقيف فيه ضل وتاه في بحار الحيرة) هەر یەکێک ڕانەوەستا لەسەر بەڵگەکانی قورئان و سونە عەقڵی خۆی بەکار هێنا ئەوە وندەبێ گومڕا دەبێ دەچێتە ناو دەریای سەرگەردانی سەرگەردان دەبێ (ولم يبلغ شفاء العين) ناگاتە بەڕاستی چارەسەرییەکی تەواو و بەرچاو ڕونی (ولا ما يطمئن به القلب) ناگاتە ئەو شتانەی کە دڵی پێی ئاسودە دەبێت (لأن القدر سر من أسرار الله) چونکە قەدەری الله تعالى یەکێکە لە نهێنیەکانی الله تعالى (اختص العلم الخبر به) الله تعالى تایبەتی کردوە بە خۆی زانای وردزان بە ئیش و کارەکان (وضرب دونه الأستار) وە الله تعالى هەندێک شت هەیە غەیبیە و نادیارە پەردەی بۆ داناوە نەیویستوە مرۆڤ و مەردومەکان بزانن (وحجبه عن عقول الخلق، ومعارفهم؛ لما علمه من الحكمة) لەپێناو حیکمەتێک کە هەندێک جار ئێمە نایزانین الله تعالى پەردەی داناوە لەنێوان عەقڵی بەدیهێنراوەکان و زانستی و

عیلمیان ئاگاتە ئەو ئاست و دەرەجە (فلم يعلمه نبي مرسل، ولا ملك مقرب[١]) جا هەندێک جار پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراویش عیلم و زانستی بە شتەکانی غەیبی نەبوە و نابێ وە فریشتە نزیکەکانیش لە الله تعالى.

وە ئیمامی تەحاویش دەفەرموێ لە عەقیدە مەشهورەکەی کە هی ئەهلی سونە و جەماعەیە دەفەرموێ: (وأصل القدر سر الله) بنەڕەت و بنچینەی قەدەر یەکێکە لە نهێنیەکانی الله (في خلقه) دەربارەی بەدیهێنراوەکانی (فلم يطلع على ذلك ملك مقرب) هەندێک شتی غەیبی هەیە لە قەدەردا فریشتە نزیکەکانیش ئاگایان لێ نیە ئەوەی لە (اللوح المحفوظ)دا هەیە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە فریشتەکانیش نازانن هەموی مەگەری ئەوەی الله پێیان دەڵێ -جل شئنە- زۆر شت هەیە الله تعالى پێیان ناڵێ هیچی لێ نازانن (ولا نبي مرسل) پێغەمبەری ڕەوانەکراویش لێی نازانێ (والتعمق في ذلك ذريعة الخذلان) دەفەرموێ چونە بنج و بنەوانی و زۆر قوڵ بونەوە تێیدا دەبێتە مایەی ئەوەی تۆ سەرشۆڕبی گوماڕبی ئاگات نەمێنێ هەندێک شت هەیە نابێ زۆری لێ بپێچیتەوە تەسلیم بونە ئەو اللهیە و تۆ بەندەی ئەوی (وسلم الحرمان) دەبێتە قادرمە و پەیژەی مەحرۆم بونت (ودرجة الطغيان) دەبێتە پلەی زێدەڕەویت (فالحذر الحذر من ذلك نظرا وفكرا ووسوسة) ئیمامی تەحاوی دەفەرموێ توخوا هۆشیاربن هۆشیاربن ئاگاداری ئاگاداری لەوەی بیربکەیتەوە ئاوا وەسوەسە ئاوا بەدڵتدابێ لێی ورد بیتەوە (فإن الله تعالى طوى علم القدر عن أنامه) هەندێک شتی قەدەر هەیە الله تعالى پێچاویەتیەوە لە مرۆڤ و مەردوم پێی ڕانەگەیاندون (ونهاهم عن مرامه) وە قەدەغەی کردوە لێشی بپێچنەوە و بەدوایدا بچن و بچی هەموو شتەکان بزانی تۆ بەندەیەکی عیلم و زانستیەکانت کەم و کورتە بەقەدەر پێویستی خۆت الله تعالى بەتۆی ڕاگەیاندوە وەکو دەفەرموێ: ﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ

[١] فتح الباري: ١١/ ٤٧٧، وراجع شرح النووي على مسلم: ١٦ / ١٩٦.

يُسۡـَٔلُونَ[١]﴾ [الأنبياء: ٢٣] خوای رب العالمين دەفەرموێ پرسيار لە الله ناكرێ -جل شئنه- لە هەموو ئيش و كارەكانی بۆ وايكردوه و بۆ وادەكا ئەوان پرسياريان لێ دەكرێ كە بەندەی اللەن الله تعالی لە هەموو شتێک لێيان دەپێچێتەوە.

كەواتە قاعيدەكانی ئەهلی سونە و جەماعە وەكو دكتۆر عومەر سولەيمان ئەشقەر (الله پاداشتی بداتەوە) هەڵی هێنجاوە لە فەرمودە و وتەكانی پێشينانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرموێ ئەو خاڵانە پێويستە تۆ لێت بێتەجێ نابێ لێرە زياتر بڕۆی و تێپەڕ بكەی:

يەكەم (وجوب الإيمان بالقدر) ئێمە واجبە لەسەرمان دەبێ ئيمان و بڕوايەكی تەواو لە دڵمان جێگيربێ بە زمانی دانی پێدابێنين بە كردەوە بيسەلمێنين كە قەدەر شتێكی ڕاست و دروستە و ئيمانمان پێی هەبێ.

دووەم (الاعتماد في معرفة القدر وحدوده وأبعاده على الكتاب والسنة) دەبێ پاڵپشتيمان و بەڵگەكانمان بۆ شارەزابون و زانين دەربارەی قەدەر و سنورەكانی قەدەر و باس و بابەتی قەدەر لەسەر كيتاب و سونە كورت هەڵبێينين نابێ زياتر بڕۆين و عەقڵی تێدا بەكار بێنين قياسی تێدا بەكار بێنين يان قسەی مرۆڤەكان تێدا بەكار بێنين (وترك الاعتماد في ذلك على نظر العقول ومحض القياس) دەبێ ئێمە وازبێينين لەوەی بڵێين وەڵا عەقڵ وا دەڵێ قياس وا دەڵێ تاقم و كۆمەڵەكانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە بەوە تێكەوتون، لە سيفەتی الله تعالی يان لە شتە غەيبيەكان لەبەر چی زۆرجار ڕەتی دەكەنەوە دانی پێدا ناهێنن تەئويلی دەكەن دەيگۆڕن تەحريفی دەكەن؟ چونكە دەڵێن چۆن دەگونجێ ئەی ئەگەر ئێمە بڵێين الله تعالی لەسەر عەرشە ئيستيوای كردوە مەعنای وايە دەبێ پێويستی بە عەرش بوبێ و دانيشتبێ لەسەر عەرش و وابوبێ و وا بوبێ (پەنا بە الله) ئەوە هەموی لەبەر ئەوەيە چونكە قياسی دەكات لەسەر خۆی مرۆڤ، مرۆڤ كە بڵێی لەسەر شتێكە يانی يان ڕاوەستاوە بەپێوە يان دانيشتوە يان فلانە الله تعالی: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ

---

[١] شرح الطحاوية: ص٢٧٦.

﴿ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١] تۆ نابێ عەقڵی بۆ بەكار بێنی نابێ قیاسی بكەی لەسەر مرۆڤ و مەخلوق و بەدیهێنراوەكان لەوەوە تێدەكەوی هی قەدەریش هەر وایە هەر دەبێ تەسلیم بی و پێی ڕازی بی و بڵێی حەقیقەت و ڕاستیە و چۆنیەتیەكەشی من عیلمم پێ نیە.

وە لە پاشان قاعیدە و بنچینەیەكی تر دكتۆر عومەر سولەیمان ئەشقەر دەفەرموێ (ترك التعمق في البحث في القدر) نابێ زۆر حەزت بەوەبێ بچیتە بنج و بنەوانی لێكۆڵینەوە دەربارەی هەموو شتەكانی قەدەر (فبعض جوانبه لا يمكن للعقل الإنساني مهما كان نبوغه أن يستوعبها) ئەگەر هەرچەند زیرەك و دانابی هەندێك شت هەیە لە بوارەكانی قەزا و قەدەر تۆ لەو ئاستەدا نی عەقڵی تۆ قبوڵی بكا و وەریبگرێ (وبعضها الآخر لا يستوعبها إلا بصعوبة كبيرة) وە هەندێك لایەنیش هەیە دەبێ تۆ زۆر ماندوبی زۆر عاقڵبی زۆر ژیربی ئەوكات لێی حاڵی دەبی تێیدەگەی، ئەو ئەمر و فەرمانەشت پێنەكراوە ئەو ئەمر و تەكلیفەشت لەسەر نیە لەلای الله تعالی كەواتە تەسلیمیبە و ئەوەندە مەچۆ بنج و بنەوانی شتەكانی كە الله بە دور و درێژی بۆی باس نەكردی و بۆی نەهێنایەوە ئەوە سەلامەتترە بۆ دینمان وە بۆ دونیامان بۆ هەموو شتەكان تەسلیم بونی الله تعالی یە.

جا دەڵێ ئەگەر هەندێك كەسیش دەڵێن ئەی ئەوە نیە مادەم ئێمە مەودای عەقڵمان كورت كردەوە نەمان هێشت عەقڵ ئیش بكات؟ نا كاكە مەودای عەقڵ كورت نەكراوەتەوە بەڵكو ئێمە ئەهلی سونە و جەماعە دكتۆر عومەر سولەیمان ئەشقەر دەفەرموێ عەقڵی پاراستوە كە سنور بۆ شتێكی دادەنێن بۆ نمونە سەیارە و ئۆتۆمبێلێك كە گێچەكەی نوسراوە دوو سەد و بیست دەڕوا لە هەندێك جادە و شوێنان سەد لێبوخڕە، ئایە ئەگەر تۆ بتەوێ زیاتر پێی لێ نێی لە دوو سەد و بیستیش زۆر زیاتر و تێپەڕی بكەی، ئایە ئەوە سەیارەكەت ماندو كردوە و ئەگەری ئەوەی هەیە توشی وەرگەڕان و توشی حادیسەیەك و لەناو بردنی بكەی بەڵام ئەگەر لە شوێنی خۆیدا بەكاری بێنی بە ئەندازەی خۆی كە بۆی دیاریكراوە لە

کەتەلۆکەکە هی کامیان باشترە؟ ئەو کەسەی لە شوێنی خۆی بە کەتەلۆکەکە بەکاری دەهێنێ سەلامەتی سەیارەکەی ویستوە سەیارەکە سەلامەتتر دەبێ، ئەهلی سونە و جەماعەش سەلامەتی مرۆڤەکان بە عەقیدە و بیروبڕوا و سەلامەتی عەقڵیان دەوێ دەیپارێزن عەقڵەکە دەڵێن ماندوی ناکەین تێپەڕی ناکەین لە حەدی خۆی زیاتر پێی لێ نانێین بۆ ئەوەی ئەزیەت نەخوا ئازار نەخوا گومڕا نەبێ لاڕێ نەبێ.

جا لە ئیسلامەتی گوتمان مەراتیبەکان دیاریکراوە هی قەدەر ئەوەی کە الله پێویست بوە بۆ مرۆڤەکان بایی ئەوەندە بزانە سەلامەت دەبێ عەقیدەت هەر ئەوەندەش بۆتۆ پێویستە زیاترت پێویست نیە.

جا جمهوری ئەهلی عیلمی سەلەف وە خەلەف وە ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وایە ئەمر و فەرمانەکانی الله تعالی هەموی عیلەت و سەبەب و هۆکار و حیکمەتی هەیە بەڵام مەرج نیە تۆ هەموو حیکمەتەکان بزانی وە لێشت داوا نەکراوە بەدواداچونیان بۆ بکەی لەبەر ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە نایانەوێ هەموو بەدواداچونێک بکەن هەندێک جار کات بەفیڕۆدانە هەندێک جار خۆ ئەزیەتدانە هەندێک جار گومڕا دەبی لەو ڕێگایە عەقڵت تەواو وەرناگرێ و نایخوێنێتەوە.

وە لە پاشان ئایە تاقم و کۆمەڵەکان دەربارەی قەدەر چەندن؟ وە کێن؟ ڕونکردنەوەیان لەسەر بدەین، خەڵکانێک هەن گومڕا بونە دەربارەی قەدەر وە قەدەریان بە درۆ هێناوەتەوە (پەنا بە خوای رب العالمین) ئا ئەوانە قەدەریەکانن جەبریەکانن وەکو پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردون کە دەفەرموێ «الْقَدَرِيَّةُ مَجُوسُ هَذِهِ الْأُمَّةِ[١]» لە پێشتریش کە گوتمان ئەوانە قەدەریان بە درۆ هێناوەتەوە وە نابێ ئێمە بە باشیان بزانین هاتوچۆیان بکەین وە لەگەڵیان تێکەڵ بین مەگەر کەسێکی زۆر زانا ئەگەر ئێستا ژمارەیان نەماوە و زۆریشیان کەمن

[١] سنن أبي داود (٤٦٩١) حکم الحدیث: حسن، مسند أحمد (٥٥٨٤).

بەڵام کەسی زانا بۆ دەعوە لەگەڵیان فەرمان بە چاکە ڕێگری لە خراپە هەر بایی ئەوەندە دروستە لێیان بچنە پێش.

هەندێک جار موناقەشە بوە لە بەینی ئەهلی سونە و جەماعە و ئەو نەوعە قەدەریانە بەڵام ئەوان قسەیان پێ نەماوە، بەس کەسەکە دەبێ زانابێ چەکداربێ بە چەکی عیلمی و عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەوە ئینجا لەگەڵیان بچێتە مەیدان خەڵکانی تری ئەهلی سونە و جەماعە دەبێ خۆیان لێ بەدور بخەنەوە نەوەک گومڕایی ئەو کارت تێبکا.

بۆ نمونە یەک لە جارەکان دەڵێن کەسێکی ئەعڕابی (بە مەعنای دەشتەکی و نەخوێندەوار بوە) عەمری کوڕی عەبید کە یەکێک بوە لەسەرەکانی قەدەریەکان لە قەدەر قسەی هەبوە کاتێک حوشترێکی لێ بزبوە ئەو ئەعڕابیە ڕۆیشتوە و پێیگوتوە (إن ناقتي قد سُرقت، فادعوا الله أن يردها علي) گوتویەتی حوشترەکەم لێم بزریوە دۆعام بۆ بکە الله بۆم بگەڕێنێتەوە ئەی عەمری کوڕی عەبید ئەویش لە وەڵامدا گوتویەتی (اللهم إن ناقة هذا الفقير سرقت) ئەی خوای پەروەردگار حوشترەکەی ئەو فەقیر و هەژارە دزراوە (ولم تُرِدْ سرقتها) تۆ نەت ویستوە بدزرێ چونکە ئەوان پێیان وایە الله ویستی لەگەڵ خراپەدا نیە (پەنا بە الله) ئەهلی سونە و جەماعە پێی وایە ویستی لەگەڵدایە الله ئەگەر ویستی لەگەڵدا نەبێ ئیشەکە ڕونادا ویستی کەونی لەگەڵدایە لەلای ئەهلی سونە و جەماعە (اللهم، اردها عليه) خوایە بۆشی بگەڕێنەوە، تۆ ویستت لەگەڵدا نەبوە بدزرێ بۆشی بگەڕێنەوە ئەعڕابیەکە لە شوێنی خۆی گوتی بابە ئەو دۆعایەم ناوێ (الآن ذهبت ناقتي، وأيست منها) گوتی تەواو لەگەڵ دۆعاکەی تۆ ئەوە حوشترەکەم ڕۆیشت و تازە مەئیوس بوم ناگەڕێتەوە، گوتی بۆ؟ گوتی (وكيف؟!) لەبەرچی عەمری کوڕی عەبید گوتی ئەو قسەیە دەکەی، گوتی (لأنه إذا أراد أن لا تسرق فسرقت) ئەگەر الله نەیویستبێ بدزرێ و ئینجا دزرابێتیش مەعنای ئەو کەسەی دزیویەتی دەسەڵاتدارترە لە الله (نعوذ بالله) توانیوێتی بەبێ ویستی الله بیدزێ (لم آمن أن يريد رجوعها فلا ترجع) بیەوێ بۆم

بگەڕێنێتەوە بە قسەی ناکا دزەکە مادەم لەو بەتواناتر بوە و ڕەنگە بۆم ناگەڕێنێتەوە (ونهض من عنده منصرفًا[١]) لەلای ڕۆیشت گوتی ئەو دۆعایەت هەر بۆ نەکردبام.

وە هەندێک لە زانایانی تری ئەهلی سونە و جەماعەش هەندێک جار هەبوە موناقەشەیان هەبوە لەوانە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەگەڵ غەیلانی دیمەشقی کە ئەویش لە قەدەریەکان بوە موناقەشە و گفتوگۆی کردوە هەر بانگی کردوە کە لە قەدەر قسەی کردوە، گوتویەتی ئەی غەیلان بە من گەیشتوە تۆ دەربارەی قەدەر قسان دەکەی، ئەویش گوتی (یکذبون علي یا أمیر المؤمنین) ترساوە چونکە ئەو ئەمیری موسڵمانان بوە و گەورەبوە و دەسەڵاتدار بوە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئینجا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز زاناش بوە ئەو ئایەتانەی سوڕەتی یاسینی بەسەردا خوێندەوە گوتی دەنا گوێ بگرە ئەی غەیلانی دیمەشقی الله دەفەرموێ: ﴿یس * وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِیمِ * إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِینَ * عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِیمٖ * تَنزِیلَ ٱلۡعَزِیزِ ٱلرَّحِیمِ * لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ * لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا یُؤۡمِنُونَ * إِنَّا جَعَلۡنَا فِیٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا فَهِیَ إِلَى ٱلۡأَذۡقَانِ فَهُم مُّقۡمَحُونَ * وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَیۡنِ أَیۡدِیهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَیۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا یُبۡصِرُونَ﴾ [یس ١-٩] جا غەیلان گوتی (والله لكأني لم أقرأها قط إلا الیوم) گوتی من کەئەنەهو ئەو ئایەتانەم نەخوێندوەتەوە و قەتیش گوێم لێ نەبوە ئەمڕۆ نەبێ، چونکە لەو ئایەتانە دەردەکەوێ الله تعالی ویستی لەگەڵ هەموو شتێکدایە پێغەمبەرانیشی ڕەوانە کردوە (علیهم الصلاة والسلام) ڕێگای چەوت و هەڵەی بە خەڵکی پیشان داوە وە حوجەی لەسەریان کردوە کار و ئیشەکانیش کە دەیهێنێتەجێ الله تعالی دروستیان دەکا ئەگەر خراپە و تاوانیشە بۆ تاقیکردنەوەیە، ئینجا ئیمامی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز فەرموی (اللهم إن كان صادقاً فتب علیه) ئەگەر ڕاست دەکا و خەڵک درۆی پێ هەڵبەستوە و ئەو ئایەتە کە ئەنەهو ئەمڕۆ

[١] شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة (٤/٧٤٠)، الإبانة (٢/٢٨٠) لابن بطة.

گوێی لێبوە و تەواو شتەکانی لە دڵ دەرهات یارەبی خوایە تەوبەی لێ قبوڵکەی (وإن كان كاذباً فاجعله آية للمؤمنين) ئەگەر درۆش دەکا خوایە بیکەیتە پەند و عیبرەت بۆ بڕواداران، ئینجا هەندێک لە زانایان دەگێڕنەوە لەوانە موعازی کوڕی موعاز دەڵێ برادەرێک بۆی باسکردم دەڵێ (مر التيمي بمنزل ابن عون فحدثه بهذا الحديث. قال ابن عون: أنا رأيت مصلوباً بدمشق[١]) دەڵێ دیارە ڕاستی نەکردوە لەگەڵ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پیاوێکی باش و وەلی الله بوە دۆعاکەی قبوڵ بوە دەڵێ هەندێک خەڵک بینیان لە کۆتایی ژیانی لە خاچ درابوو ئەو کەسە ئاوا بوە پەند و عیبرەت خەڵک هەموو دەیبینی لە شاری دیمەشق.

لە پاشان ئەو خاڵەش گرنگە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە باسی بکرێ بە کورتیش پێشتر باسمان کرد، ئایە هەندێک شت هەیە ڕەش دەکرێتەوە لە قەدەری خوای رب العالمين؟ لە کوێدا ڕەش دەکرێتەوە لە (اللوح المحفوظ) یان لەلای فریشتەکانی تر؟ ئایە قەدەر گۆڕانی بەسەردا دێ یانە نا؟ ئایە تەمەن زیاد و کەمی بۆ هەیە کە نوسراوەیە لە (اللوح المحفوظ)دا؟ جا خوای رب العالمين کە دەفەرموێ: ﴿يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُ﴾ [الرعد: ٣٩] خوای رب العالمين هەندێک شت ڕەش دەکاتەوە لە قەدەر وە هەندێک شتیش جێگیر دەکا، ئایە ئەوە لە (اللوح المحفوظ)ە یان نا؟ یان پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ[٢]» هەریەک دەیهەوێ ڕزقی فراوان بێ وە تەمەنی درێژ بێ با سیلەی ڕەحم جێبەجێ بکا، ئایە ئەو فەرمودە چۆن دەگونجێ تەمەن دیاریکراو نیە لە (اللوح المحفوظ)دا؟ لە وەڵامدا ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون: (إن الأرزاق والأعمار) یانی ئەو شتانەی کە ڕەش دەکرێنەوە هەندێکیان و گۆڕانکارییان بەسەردا دێ بە کورتی لە (اللوح المحفوظ) گۆڕانکاری بەسەردا نایە و جێگیرە و یەک جۆر

[١] شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة اللالكائي - أبو القاسم هبة الله بن الحسن بن منصور الطبري، صفحة: ٧٨٧ جزء: ٤.

[٢] صحيح البخاري (٢٠٦٧) (٥٩٨٦)، صحيح مسلم (٢٥٥٧)، سنن أبي داود (١٦٩٣).

نوسراوەیە بە تەفسیلی و دور و درێژی بەڵام ئەوەی لەلای فریشتەکانە گۆڕانکاری بەسەردا دێ چونکە ڕزق و ڕۆزی و تەمەن دوو جۆری هەیە (نوع جرى به القدر وكُتِب في أم الكتاب) جۆرێکیان ئەوەیە قەدەر و ئەندازە کراوە لەلای الله تعالى الله عیلمی پێی هەبوە لە (اللوح المحفوظ)ەوە (فهذا لا يتغير ولا يتبدَّل) ئەوەیان نە گۆڕانکاری بەسەردا دێ نە تەبدیل دەبێ و هیچی تر بچێتە شوێنی (ونوع أعلم الله به ملائكته، فهذا هو الذي يزيد وينقص[1]) جۆرێکیشیان الله تعالى عیلم و زانستی و فەرمانی داوە بە فریشتەکانی بەڵام ئەوەیان گۆڕانکاری بەسەردا دێ زیاد و کەمی تێدا دەکرێ کە فریشتەکە هاتوە لەناو سکی دایکی شتی لەسەر نوسیوە ئەوەی (اللوح المحفوظ)ی بە تەفسیلی پێنەگوتوە الله تعالى و فەرمانی پێ نەکردوە بۆ نمونە فلانی کوڕی فلان لەو تەمەنەدا سیلەی ڕەحم جێبەجێ دەکا تەمەنەکەی لە (اللوح المحفوظ) نوسراوە سەرەتا شەست ساڵە پێنج ساڵیش حەقی ئەوەی سیلەی ڕەحم جێبەجێ دەکا ئەوە لە (اللوح المحفوظ) هەیە سەرەتا الله تعالى ئەوەی لە (اللوح المحفوظ)ە و یەکەم جارەکەیە بۆی دیاری کردوە شەست ساڵەکەیە دەیداتە دەستی فریشتەکە بۆ نمونە ئەو فریشتە ئەمجارە دێ ئەوەی لەسەر دەنوسێ لە کۆتایی و لە کاتی سیلەی ڕەحمەکەی جێبەجێ دەکا الله تعالى فەرمان بە فریشتەکە دەکاتەوە پێنج ساڵیشی بۆ زیاد بکە ئەو شەست ساڵەی لای خۆت ڕەشکەوە و زیادەی بێتە سەرەوە لەبەر ئەوەی سیلەی ڕەحمی جێبەجێ کرد ئەوە ئاوا دەبێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿يَمۡحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۚ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَـٰبِ﴾ [الرعد: ٣٩] ئینجا ئومول کیتاب (اللوح المحفوظ)ە هەموو ئیش و کارەکانی تێدا نوسراوەیە.

کەواتە ڕزق و ڕۆزیش هەر وا زیاد دەکا عومریش هەر وا زیاد دەکا وەکو ابن حجر عەسقەلانی دەفەرموێ: (الذي سبق في علم الله لا يتغيَّر) ئەوەی لە عیلمی اللهدا هەبوە لە ئەزەل و ئەوەلەوە گۆڕانکاری بەسەر نایە (ولا يتبدَّل) تەبدیل نابێ و ناگۆڕێ (والذي يجوز

[1] (مجموع الفتاوى: ٨/٥٤٠).

عليه التغيير) ئەوەی کە دروستە و جائیزە گۆڕانکاری بەسەردا بێ (والتبديل ما يبدو للناس من عمل العامل، ولا يَبعُد أن يتعلَّق ذلك بما في علم الحَفَظة والموكَّلين بالآدمي) ئەوانە بەدور نازانرێ گۆڕانکاری لە مەلائیکەتەکانی کە حەفەظەن لەسەر شانی ئەو بەندە و مرۆڤە کە ئەوەیان پێ سپێردراوە چاکە و خراپە بنوسن یان لە کۆرپەلە ئەجەلی دیاری بکەن وە بەدبەختی دیاریبکەن یان بەختەوەری دیاری بکەن ڕزق و ڕۆزی بۆ دیاری بکەن تەمەنی دیاری بکەن ئەوان گۆڕانکاری بەسەردا دێ (فيقع فيه المحو والإثبات) ابن حجر دەفەرموێ جا لەوێوە جێگیری یان ڕەشکردنەوەی هەندێکی و زیاد و کەمی دەبێ (کالزيادة في العمر والنقص) هەندێک جار تەمەن لەوێوە و لەلای فریشتەکان زیاد دەبێ یان کەم دەبێ (وأما ما في علم الله، فلا محوَ فيه) ئەوەی لە عیلمی الله هەبوە لە ئەزەل و ئەوەلەوە و لە (اللوح المحفوظ) نوسراوە ڕەشنابێتەوە (ولا إثبات) وە جێگیر نابێتەوە یان زیاد نابێ و کەم نابێ (والعلم عند الله[1]) عیلم و زانستی تەواویش لەلای الله تعالی یە.

یەکێک لە فەرمودەکان کە قسەی لەسەرە هی پێغەمبەرە (ﷺ) دەربارەی قەزاو قەدەر ئەو فەرمودەیە کە لە سەحیحدا هاتوە پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو هورەیرە لێی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: «احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلَامُ عِنْدَ رَبِّهِمَا، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى» کە موسا و باوکە ئادەم (عليهما الصلاة والسلام) لە خزمەت الله تعالی قسەیان لەسەر یەک هێناوە و بەڵگەیان لەسەر یەک هێناوە کە موسا فەرمویەتی «قَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ» فەرموی ئەی ئادەم تۆ ئەو ئادەمەی الله تعالی بە دەستی خۆی بەوەی لێی دەوەشێتەوە (ولله المثل الأعلى) تۆی بەدیهێناوە «وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِه الله» الله فوی کردە تۆ لەو ڕۆح و گیانەی کە بەدی هێنا -جل شئنه- «وَأَسْجَدَ لَكَ مَلَائِكَتَهُ» وە الله تعالی فریشتەکانی فەرمان پێدا کڕنۆش و سوجدەت بۆ بەرن.

[1] فتح الباري: ١١/٤٨٨.

ئایە ئەو کڕنۆش و سوجدەی الله تعالى فەرمانی بە فریشتەکاندا بۆ ئادەمی بەرن چ کڕنۆش و سوجدەیەک بوە؟ ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە زۆرێک لە زانایان بۆچونیان وایە سوجدە و کڕنۆشی ڕێز لێنان بوە وە عثیمین -رحمه الله- دەفەرموێ ئێمە نابێ ئاوا بە ڕاشکاوانە ئەوە بڵێین لەبەر ئەوەی لێیان دیار نیە سەدا سەد وە ئەگەر الله تعالى فەرمانی بە فریشتەکان دابێ کە کڕنۆش بە مەعنای کڕنۆشی حەقیقیش ببەن بۆ ئادەم ئەوە ئەوە ناگەیەنێ چونکە الله ئەو فەرمانەی داوە -جل شئنه- دەگونجێ و دەشێ و نابێ ئێمە بڵێین ئیلا کڕنۆشی ڕێز گرتن بوە.

ئینجا موسا (ﷺ) هێشتا بەڵگە دەهێنێتەوە و قسە لەگەڵ باوکە ئادەم دەکا دەفەرموێ «وَأَسْكَنَكَ فِي جَنَّتِه» وە تۆی نیشتەجێ کرد لە بەهەشتەکەی خۆی الله تعالى «ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إِلَى الْأَرْضِ؟» لە پاشان خەڵکی بە تاوانەکەی تۆوە ئەی باوکە ئادەم کەوتنە سەر ڕوی زەوی و دەرچون لە بەهەشت «فَقَالَ آدَمُ» ئادەمیش گوتیە موسا (ﷺ) «أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِه وَبِكَلَامِه» دەنا تۆش ئەو موسایەی کە الله تعالى تۆی هەڵبژارد بە پەیامەکانی و بە وتەکانی «وَأَعْطَاكَ الْأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شَيْءٍ» وە ئەلواحی بە تۆ بەخشی کە تەوراتت تێدا نوسی ڕونکردنەوەی هەموو شتەکانی تێدابوو «وَقَرَّبَكَ نَجِيًّا» وە الله تعالى تۆی نزیک کردەوە و ڕزگاریشی کردی لە دەستی فیرعەون و ئەو دوژمنانەی کە هەتبون «فَبِكَمْ وَجَدْتَ اللَّهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟» بە چەندیەوە لەپێشی ئەوەی تەورات دابەزێنێ الله تعالى تۆی بەدی هێناوە و دروستی کردوە «قَالَ مُوسَى: بِأَرْبَعِينَ عَامًا» موساش فەرموی بە چل ساڵەوە لەپێشتر «قَالَ آدَمُ : فَهَلْ وَجَدْتَ فِيهَا ﴿وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى﴾؟» ئایە لەناو تەوراتەکەی خۆت کە بەسەری دابەزاندی ئەو بڕگەیەت بینی کە الله تعالى بفەرموێ ئادەم سەرپێچی خوای پەروەردگاری خۆی کرد و لاڕێ بوو «قَالَ: نَعَمْ» گوتی بەڵێ «قَالَ: أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلًا كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟» ئایە تۆ ئەی موسا سەرزەنشتی من دەکەی لەسەر شتێک کە چل ساڵ پێشی

ئەوەی بەدیم بێنێ الله تعالى لەسەر منی نوسیوە؟ یان پێش ئەوەی تۆ بەدی بێنێ لەسەرم نوسراوە و لەلای تۆ تۆمار بوە؟ ئەی موسا لەسەر ئەوە سەرزەنشتم دەكەی كە من دەبا ئەو عەمەل و كردارە بكەم؟ بەو مانایەی ئەو عەمەلەی من كردم كە هەڵە بوو لە بەهەشت بەڵێ هەڵە بوو ئادەم دەفەرموێ بەڵام خۆ من لەسەرم نوسرابوو ئەو عەمەل و كردارە بكەم لەلای الله تعالى، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ «قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى[١]» ئادەم حوجەی بە دەستەوە بوو لەسەر موسا، ئەو فەرمودە بزانین ئایە مانای چیە؟

هەندێک لە خەڵكی و قەدەریەكان ئەو فەرمودە دەكەنە بەڵگەی ئەوەی دەڵێن ئێمەش ئەگەر گوناحێكمان كرد تاوانێكمان كرد دەتوانین بڵێین الله لەسەر ئێمەی نوسیبوو، چۆن ئەی ئادەم قسەكەی مانای ئەوە نیە؟ الله لەسەرمی نوسیبوو بۆ سەرزەنشتم دەكەی و من هەر دەبوا بەسەرم بێ، ئەوە مانای چی دەگەنێ؟ جا زانایان دەفەرمون: (وليس في هذا الحديث حجة للذين يحتجون بالقدر على القبائح والمعايب) ئەوە نابێتە بەڵگە بۆ قەدەریەكان و خەڵكە نەزانەكان كە بیكەنە بەڵگەی ئەوەی لەسەر تاوان و گوناح و عەیبداریەكانی هەیانە و دەیكەن بڵێن الله لەسەر ئێمەی نوسیبوو (فآدم عليه السلام لم يحتج بالقضاء والقدر على الذنب) ئادەم لەوێوە خۆ ئەوەی نەكردە بەڵگە بڵێ قەزاو قەدەر بوو من بەسەرم هات لەسەر گوناح و تاوانەكە (وموسى عليه السلام لم يلم أباه آدم على ذنب تاب منه) بەڵكو موساش سەرزەنشتی كردنەكەی لەو تاوانە نەبوو لە ئادەمەوە كە سەرزەنشتی كرد كە ئادەم تەوبەی لێكرد بوو (وتاب الله عليه منه واجتباه وهداه) الله تعالى تەوبەكەشی لێ قبوڵ كردبوو ڕێنمونیشی كردبوو هەڵیشی بژاردبوو لە پاشان (وإنما وقع اللوم من موسى) بەڵكو قسەكەی موسا وە لۆمە و سەروەنشتیەكەی بۆ باوكە ئادەم تەنها لەوەدا بوە (على المصيبة) لەسەر ئەو بەڵا و موسیبەتەی كەبەسەر نەوەكانی ئادەم هاتوە (لا على الخطيئة) نەک لەسەر تاوان و گوناحەكەی (فإن القدر يحتج به عند المصائب لا عند

[١] صحيح البخاري (٣٤٠٩) (٤٧٣٦) (٤٧٣٨)، صحيح مسلم (٢٦٥٢)، سنن أبي داود (٤٧٠١).

المعايب[١]) جا قەدەری خوای رب العالمين وەكو لە شەرحی تەحاویش هاتوە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعەی تریش وایان گوتوە دەفەرمون لەكاتی بەڵا و موسیبەت دەكرێتە حوجە و بەڵگە ئەوە الله بەسەری هێنام بەو مانایەی عیلمی پێ هەبوو لە (اللوح المحفوظ) نوسیبوی نەک ئەو بەسەریدا سەپاندم هەر كاتێک كە شتەكە ڕوودەدا بەس نەک لە كاتی عەیبداری كە بڵێی عەیب و عارەكە خوای رب العالمين بەسەریدا سەپاندوم.

كەواتە (فعلى العبد أن يستسلم للقدر إذا أصابته مصيبة) بەندەكان لەسەریانە تەسلیمی قەدەری اللەبن هەر بەڵا و موسیبەتێكیان بەسەردا دێ كاتێ كە خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿الذين إذا أصابتهم مصيبةٌ قالوا إنا لله وإنا إليه راجعون﴾ [البقرة: ١٥٦] ئەوە سیفەتی ئیماندارانە الله تعالى فەرموی ئەوانەی كە بەڵا و موسیبەت و ناخۆشیەكیان بەسەردا دێ و توشیان دەبێ دەڵێن ئێمە موڵک و دەسەڵاتی اللەین هی اللەین وە گەڕانەوەشمان تەنیا بۆلای خوای رب العالمين ە (أما المذنبون فليس لهم الاحتجاج بالقدر) كەسی گوناحگار نابێ بەڵگە بە قەدەری الله بێنێتەوە بڵێ لەسەرم نوسرابوو لەبەر ئەوە من وامكرد چۆن دەبێ عەزاب بدرێم؟ (بل الواجب عليهم أن يتوبوا ويستغفروا) بەڵكو لەسەریانە كاتێک تاوانیان كرد بەندەكانی الله بە زوترین تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە و داوای لێبوردن لە خوای رب العالمين بكەن وەكو الله دەفەرموێ: ﴿فاصبر إنَّ وعد الله حق واستغفر لذنبك﴾ [غافر: ٥٥] ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئارامگربە وە ئارامبگرە وەعد و بەڵێنی الله حەق و ڕەوایە وە داوای لێبوردن بكە لە تاوانەكان لە الله تعالى.

كەواتە پێویستە كە لە كاتی تاوانێک گوناحێک شتێک هەڵەیەک لێت ڕوودەدا نابێ بڵێی قەدەری الله بەسەر منیدا سەپاندبوو، نەیسەپاندوە الله تعالى بەسەرتدا بەڵكو عیلمی پێ هەیە خوای رب العالمين تۆ ئەو هەڵە دەكەی ئەو گوناحە دەكەی لە (اللوح المحفوظ)یش نوسیویەتی مەشیئەت و ویستیشی دەبێ هەتا شتەكە بێتە كایەوە و دروست ببێ ئینجا

---

[١] شرح الطحاوية : ص١٥٤. وأجاب بهذا الجواب شيخ الإسلام أيضا: انظر شفاء العليل: ص ٣٥.

بۆشت دەهێنێتەجێ و دەهێنێتە کایەوە و بەدی دەهێنێ تا تاقیکردنەوەکە دروست بێ ئینجا ڕێگاشی پێ نیشانداوی ئەوە ڕێگایەکی هەڵەیە غەڵەتە کە دەیکەی دەبێ داوای لێبوردن لە الله بکەی کەواتە ڕێی شەیتانت گرتوەتەبەر وەکو شەیتان الله تعالی زەمی لە ئایەتی قورئان دەفەرموێ شەیتانی ئیبلیس چی وەڵامی الله دایەوە: ﴿بِمَا أَغْوَيْتَنِي[1]﴾ [الحجر: ٣٩] پەروەردگارم تۆ منت پێ گومڕا کرد، خۆ الله تعالی شەیتانی گومڕا نەکردوە و الله تعالی غەزەبی لێگرت وەبەر لەعنەتی خۆی خست چونکە شەیتان پێداگری کرد لەسەر گوناحەکەی تۆمەت و گوناح و تاوانەکەی (پەنا بە الله) پاڵداوە لای خوای رب العالمین گوتی تۆ وات بەسەر من هێناوە وە عینادیش گرتی خۆشی پێ زلتر بوو تەکەبوری هەبوو کەواتە کوفری تەکەبور و عیناد شەیتانی گرت بەوەوە الله تعالی ئاوا تاقیکردەوە و لە تاقیکردنەوەکە شەیتان دەرنەچوو وەبەر لەعنەتی خۆی کرد.

ابن القيم الجوزية -رحمه الله- زۆر جوان وەڵامی ئەو حەدیسە دەداتەوە ئەویش وتەکەی ئەویش دەهێنێنەوە و ئینجا کۆتایی بەو حەدیسە دەهێنین دەچینە سەر بڕگەیەکی تری قەزاو قەدەر ابن القيم -رحمه الله- دەفەرموێ لە پەرتوکە نایابەکەی (شفاء العليل) کە ئەو (شفاء العليل)ە دەربارەی قەزاو قەدەر زۆر بە دور و درێژی باس و خواسەکانی هێناوەتەوە و موجەلەدێکێ گەورەیە دەفەرموێ: (الاحتجاج بالقدر على الذنب ينفع في موضع) لە یەک شوێن سود و قازانج دەگەیەنێ دەستگرتن و بەڵگە هێنانەوە بە قەدەری الله لەسەر تاوان و گوناحەکان (ويضر في موضع) لە هەندێک شوێنیش زەرەر دەگەیەنێ (فينفع إذا احتج به بعد وقوعه والتوبة منه) ئەگەر شتەکە ڕویدا لە پاشانەکە تەوبەشی لێکرد ئەوکاتە قەینا بڵێ ئەوە قەدەری الله بوو ئەویش بەو مانایەی الله عیلمی پێ هەبوە لە (اللوح المحفوظ) نوسیوێتی ویستی لەگەڵدا بوە هەتا شتەکە بێتە کایەوە وە بۆی دروست کردوە هەتا ئینتیحان و تاقیکردنەوەکە دروست بێ ئەوە بەو مانایە سود بەخشە ئاساییە کە لە قەدەری

[1] كتاب القضاء والقدر - الأشقر [عمر سليمان الأشقر] ص: ٩٢.

الله نوسرابوو تۆ وادەکەی و ئێستاش لەتۆ بەدیار کەوت تەوبەی لێدەکەی (وترك معاودته) وە لەدوای ئەوە وازی لێبێنی و جارێکی تر نەچیەوە سەر تاوانەکە (كما فعل آدم) وەکو باوکە ئادەم (ﷺ) وایکرد (فيكون في ذكر القدر إذ ذاك من التوحيد) ئەو کاتە باسی قەدەری الله بکەی و بڵێی قەدەری الله وابوو ئەوە لە تەوحید و الله بەیەکگرتنە (ومعرفة أسماء الرب وصفاته) شارەزابونە لە ناوەکانی الله و سیفەتەکانی (وذكرها ما ينتفع به الذاكر والسامع) جا باسکردنی ئەو کاتە بە قەدەری خوای رب العالمین لەسەر تاوان و گوناحەکە سود بەخش دەبێ بۆ کەسی بیسەر و گوێی لێ دەبێ وە بۆ کەسێک کە بەبیری دێتەوە و یان کەسەکە بۆخۆشی کە بەبیر خۆی دەهێنێتەوە (لأنه لا يدفع بالقدر أمراً ولا نهياً) چونکە نەهی و ئەمر نابێ بە قەدەری الله دەفع بکرێ و پاڵی پێوە بنرێ بڵێی ئەو کارە جێبەجێ ناکەم چونکە لە قەدەری الله وایە جێبەجێی نەکەم هێشتا نەهاتوەتەجێ یان ئەو نەهی و قەدەغە دەکەم چونکە لە قەدەری الله تعالی وایە (نعوذ بالله) هێشتا نەهاتوەتە جێش ئەوە نابێ (ولا يبطل به شريعة، بل يخبر بالحق المحض على وجه التوحيد والبراءَة من الحول والقوة) بەڵکو تەنها هەواڵدانە بە حەق و ڕەوایەتیەکی ڕوت و تەواو لەسەر ڕوی الله بەیەکگرتن -جل شئنە- کە دەڵێی من هێز و توانام نیە ئادەم مەبەستی ئەوەبوو واتە من هیچ نیم بەرامبەر بە خوای رب العالمین لە تواناما نەبوە شتێک کە هەڵمبژارد ئەگەر هەڵەش بوم نەیکەم چونکە لە قەدەری خوای رب العالمین دا نوسرابوو ڕاستە بە دەستی خۆم هەڵمبژارد تۆڵەکەشم لێ سەندرایەوە دوایی الله عەفوی کرد چونکە تەوبەی کرد و نەگەڕایەوە سەر تاوانەکەی (يوضحه أن آدم قال لموسى: أتلومني على أن عملت عملاً كان مكتوباً عليَّ قبل أن أخلق؟) ئادەم گوتیە موسا تۆ سەرزەنشتی من دەکەی لەسەر کار و کردارێک کە لەسەرم نوسرابوو پێش ئەوەی من بەدی بێم؟ (فإذا أذنب الرجل ذنباً ثم تاب منه توبة) ابن القیم دەفەرموێ جا هەر پیاو و مرۆڤێک ئەگەر تاوانێکی کرد دوایی تەوبەی کرد تەوبەیەکی تەواو (وزال أمره حتى كأن لم يكن) ئیش و کارەکەی لەسەر نەما لەسەر

تەوبەکەی بەردەوام بوو هەتا وای لێهات کەئەنەهو نەیکردوە و خاوێن بووەوە (فأنَبَّهُ عليه ولامه) کەسێک هاتە لای وەکو موسا کە بە ئادەمی گوت سەرزەنشتی ئەو کەسەی کرد ئەمجارە (حسن منه أن يحتج بالقدر بعد ذلك) وەکو باوکە ئادەم بۆ ئەو کەسە دروستە مادەم ئیشەکە نەما و تەوبەی لێ کرد و ئیستیغفاری کرد و لەبیر چۆوە و زۆری بەسەر چوو بڵێت ئەوە قەدەری الله بوو بەسەرم هات سەرزەنشتم مەکە لەسەری ڕۆیشت و ڕابردوو تەوبەم لێکرد (ويقول: هذا أمر كان قد قدر علي قبل أن أخلق) ئەوە شتێک بوو لەسەرم نوسرابوو پێش ئەوەی من بەدی بێم خۆ مانای وا نیە (پەنا بە خوای رب العالمين) خوای رب العالمين زوڵمە و ستەمە لێی کردوە (فإنه لم يدفع بالقدر حقاً) چونکە بە قەدەر ئەو کاتە حەق و ڕەوایەکی ڕەت نەکردۆتەوە (ولا ذكره حجة له على باطل ولا محظور في الاحتجاج به) ئەو باس و خواسەش کە دەکا و دەڵێ لە قەدەر وا نوسرابوو پێش ئەوەی من بەدی بێم مەبەستی نیە بەڵگەبێ بۆ شتێکی پوچەڵ و باتڵ کە کردویەتی بۆ شتێکی کە نەهی لێکراوە و بەڵگەی پێ هێنابێتەوە (وأما الموضع الذي يضر الاحتجاج) ئەوە شوێنی ئەوە بوو ڕونکردنەوەکەی ابن القيم زۆر لەجێ و چاکە بەڵام بە وردی دەبێ سەرنجی بدەن ئینجا تەواو لێی حاڵی دەبن و تێیدەگەن.

ئەی لەو شوێنەش ئەگەر باسی قەدەری الله بکەی لەسەر تاوان و گوناح و حوجەی پێبکەی کە زەرەر بەخشە کەیە؟ (ففي حال المستقبل) بۆ داهاتوو بیکەیتە حوجە و بەڵگە (بأن يرتكب فعلاً محرماً أو يترك واجباً) کەسێک بێ کارێکی تاوان و گوناح ئەنجام بدا یان واجێبک و فەرمانێکی الله پێشێلی لێبکا و نەیکا (فيلومه عليه لائم) کەسێکیش بێ سەرزەنشتی بکا (فيحتج بالقدر على إقامته عليه) بڵێ من وا لەناو ئەو گوناحەم لێم گەڕێ دەشیکەم بەیانیش گوناحەکە ئەوە لە قەدەری اللهیە بەڵگە بە قەدەری الله بێنێتەوە لەسەری (وإصراره) بەردەوام بونیشی لەسەر گوناحەکە (فيبطل به حقاً) ئەوە ئەو کاتە حەقێکی پێ پوچەڵ کردوەتەوە (ويرتكب به باطلاً) ئەو کاتە باتڵ و پوچەڵێکی پێ ئەنجام

داوە (كما احتج به المصرون على شركهم وعبادتهم غير الله[1]) هەروەکو ئەوانەی پێداگرن لەسەر شیرک و هاوبەشی و کوفر کە جگە لە الله دەپەرستن دەڵێن لە قەدەری الله وایە ئێمە لەبەر ئەوە وا دەکەین (پەنا بە الله) ئەوە بۆت نیە وابکەی و وابڵێی چونکە قەدەری خوای رب العالمين هەتا نەیەتەجێ لەتۆ دیار نیە تۆش لەسەرتە سەرەتا وە یەکەمجار لە ڕابردوش گوتمان دەست بگری بە ڕێگایە چاکەکان و شەرعیەکان و واز بێنی لە نەهی و قەدەغە و خراپەکان ئینجا پشت ببەستی بە خوای رب العالمين دوایە بۆت بەدیار دەکەوێ قەدەری خوای رب العالمين چیبوە.

لە پاشان خاڵێکی تر ئەوەیە دەبێ ئێمە ڕازی بین بەو شتانەی بەسەرمان دێ وە بە قەدەری اللهی بزانین، هیچ شتێک نیە لەو دونیایە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون وە ابن تيمية تەئکیدی لێ کردوەتەوە لە مجموع الفتاوى ئیلا بە قەدەری اللهیە (أنه لا يوجد في كتاب الله، ولا في سنة رسوله صلى الله عليه وسلم آية ولا حديث يأمر العباد بأن يرضوا بكل مقدر من أفعال العباد حسنها وسيئها) جا تۆ داوات لێ نەکراوە بە یەک ئایەتی قورئانیش نیە یەک حەدیسی سەحیحی پێغەمبەریش نیە (ﷺ) داوای کردبێ لە بەندەکان ڕازی بن بە شتێکی بڵێ ئەوە ئەندازە کراوە لە کار و ئیشی بەندەکان لە باشە و لە خراپە هەردوکیان بەڵام واجب چیت لەسەرە لە ئایەت و حەدیس لێت داوا کراوە (ولكن الواجب على الناس أن يرضوا بما أمر الله به) دەبێ تەنها ئەوەت لێ داوا کراوە ئەوەی الله ئەمری پێکردوە بەوە ڕازیبی (فليس لأحد أن يسخط ما أمر الله به) بۆ کەس نەهاتووە تورەبێ و نەیهەوێ و ڕەتکاتەوە ئەوەی الله تعالى ئەمر و فەرمانی پێکردوە وەکو الله دەفەرموێ: ﴿فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجاً مما قضيت ويسلموا تسليماً﴾ [النساء: ٦٥] کەواتە (وينبغي للعبد) ابن تيمية دەفەرموێ پێویستە بۆ بەندەی الله (أن يرضى بما يقدره الله عليه من المصائب التي ليست ذنوباً) ئەو

[1] شفاء العليل: ص٣٥.

بەڵا و موسیبەتانەی کە تاوان و گوناح نیە بەسەرت دێ وەکو تەقدیر و قەدەری الله دەبێ پێی ڕازیبی تۆ (مثل أن يبتليه بفقر) ئەگەر تۆ فەقیر و هەژاری بڵێی ئەوە قەدەری اللهیە و دەبێ پێی ڕازیبی (أو مرض) نەخۆشیەکت بەسەردا دێ دەبێ تەسلیم بی و ڕازی بی پێی (أو ذل وأذى الخلق له) یان خەڵکێک ئازارت دەدا یان زەلیل دەکەویتە بەردەستی خەڵکی ئەوانە دەبێ بڵێی تەقدیری خوای رب العالمين ە پێی ڕازی بی کە الله وای بەسەر هێنای (فإن الصبر على المصائب واجب) چونکە واجبە سەبر و ئارامی گرتن لەسەر بەڵا و موسیبەتەکان (وأما الرضا بها فهو مشروع) ڕازی بونیش ئەگەر لە سەبر زیاتر پێیوە بچی و تەقوات زیاتربێ پێی ڕازی بی ئەوەی الله بەسەرت دەهێنێ ئەوەشیان شتێکی شەرعیە (ولكن هل هو واجب أو مستحب؟) ئایە ڕازی بون خێری پترە و چاکترە یان واجبە لەسەرت یان تەنها سەبر گرتن واجبە؟ (على قولين لأصحاب أحمد وغيرهم) دەفەرموێ دوو بۆچون هەیە لەلایەن زانایانی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد و جگە لەوانیش (أصحهما أنه مستحب ليس بواجب[1]) لە هەمویان بۆچونەکە ڕاستر ابن تيمية دەفەرموێ ڕازی بون بە قەدەری خوای رب العالمين بەڵا و موسیبەت و ناخۆشیەکانی بەسەرت دێ لە فەقیری و هەژاری و هەریەک لەو شتانە ئەوە سونەتە و خێرت زۆرتر پێدەگا بەڵام لایەنی کەم واجبە لەسەرت دەبێ سەبر و ئارامی لەسەر بگری.

لە پاشان دەگەینە سەر ئەوە لە قەزاو قەدەر ئەو قەزاو قەدەرە چەند بەروبومێکی هەیە ئەگەر تۆ ئیمان و بڕوات پێ هێنا ئەو بەروبومانە بە کورتی دەڵێین و لە بابەتی قەزاو قەدەر دەچینە دەر و کۆتایی پێ دەهێنین:

یەکەم (الإيمان بالقدر طريق الخلاص من الشرك) ئەگەر ئیمان و بڕوای تەواوت هێنا بە قەزاو قەدەر ئەوە ڕێگایە بۆ تەواو بونت لە شیرک و هاوبەشی یانی بەدەر دەبی لە شیرک هاوبەشی چونکە زۆربەی ئەهلی فەلسەفە کە دەڵێن ئەوەی خەیرە لە اللهوەیە بەڵام شەڕ

[1] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: ١٩٠/٨.

پاڵ نادەنە لای خوای رب العالمين ئەویش بە بیانوی ئەوەی دەڵێن الله تعالى بەریئە چۆن دەبێ شەڕ پاڵ بدرێتە لای؟ بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن الله تعالى شەڕی مەحز پاڵ نادرێتە لای بەڵام هەموو شەڕەكان بە مەعنای دروستكردن و بەدیهێنان وە الله تعالى لەگەڵیدایە و ویستی لەگەڵدایە ئەگینا شتەكە نابێ و نایەتەجێ لەپێناو تاقیكردنەوەی بەندەكانی وە شەڕی مەحزیش نیە لەلای خوای رب العالمين كاتێک تۆش تاقی دەكاتەوە هەر شتێک بەسەر تۆدا دەهێنێ هەندێک شت هەیە لەلای تۆ شەڕ و خراپەیە لەلای خوای رب العالمين خەیرە و بۆتۆش ئاخیری بە خێر تەواو دەبێ، بۆ نمونە تۆ نەخۆش دەكەوی بە شەڕ و خراپەی تێدەگەی بۆخۆت جسم و لاشەت دێشێ منداڵێكت لێ دەمرێ ئەوانە بە خراپە تێدەگەی، بەڵام لەولاوە ئەگەر تەماشای ئەجر و پاداشتەكان دەكەی كە الله وا ئینتیحان و تاقیت دەكاتەوە تێیدا دەردەچی خێرێكی تەواوە، كەواتە هەموی سەدا سەد شەڕ نیە، جا لەبەر ئەوە ئەگەر تۆ ئیمانی تەواوت بە قەزاو قەدەر هەبوو وە تەواو لێی حاڵی بوی و تێی گەیشتی بەو سنور و ئەندازەی ئەهلی سونە و جەماعە دیاریان كردوە تۆ بەدەر دەبی لە شیرک و هاوبەشی شیرک و هاوبەشی ناتگرێتەوە.

لە پاشان سود و قازانج و بەروبومی دوەمی ئیمان بە قەزاو قەدەر ئەویش ئەوەیە (الاستقامة على منهج سواء في السراء والضراء) تۆ بەردەوام دەبی وە ڕاستەڕێ دەبی لەسەر مەنهەج و پڕۆگرامێكی تەواو لەكاتی خۆشی و ناخۆشیدا لە هەردوكیان هەر پشت بە الله دەبەستی هەر هاواری خوای رب العالمين دەكەی وەكو كافر و موشریكەكان نابی.

وە بەروبومێكی تری قەزاو قەدەر ئەوەیە (المؤمن بالقدر دائماً على حذر) بڕوادار كە ئیمانی هەیە و بڕوای هەیە بە قەزاو قەدەر دائیمەن لە هۆشیاری و ئاگاداریدایە دائیمەن لە حەزەردایە خۆی دەپارێزێ خۆی ناخاتە ئاستی ئەوەی كە الله تعالى عەزابی بدا تۆڵەی لێ بستێنێتەوە چونكە: ﴿فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ [الأعراف: ٩٩] خوای رب العالمين دەفەرموێ كەس نابێ ئەمین بێ لە تۆڵەی خوای رب العالمين لە مەكری خوایی

ئیلا ئەوانەی کە زەرەر مەندن واتە کافرن بێ بڕوانە تێنەگەیشتونە بێ ئیمانن بە قەدەری خوای رب العالمین ئیمانیان پێی نیە.

هەردەم دەبێ ئیماندار بترسێ لەوەی ئاخیرەتی خێر دەبێ یان شەڕ؟ گوناحی توش دەبێ یان خێر؟ بەرەو خێر بچێت و لە گوناح بەدور بکەوێتەوە هەردەم لە حەزەردایە ئەوەی شارەزای قەزاو قەدەربێ.

بەروبومێکی تری قەزاو قەدەر ئەوەیە (مواجهة الصعاب والأخطار بقلب ثابت) ڕوبەڕوی شتە تەنگەبەریەکان و خەتەرناکیەکان دەبیتەوە بە دڵێکی جێگیر وەکو پێغەمبەر (ﷺ) کە گوتیان ئەوە کافرەکان دوبارە بەسەرتاندا گەڕانەوە لە جەنگی ئوحود پێغەمبەر (ﷺ) گیانمان فیدای بێ زۆر ماندوو بوو بوو، دیمەنەکانی دەگێڕنەوە بەڕاستی دڵ هەڵقرچێنەرە فرمێسکت دەهێنێ لەچاو ئەو دیمەنانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە جەنگی ئوحود بەسەری هاتوە، شمشێری زۆری وەشاندوە خوێنی زۆری لێ هات پێغەمبەر (ﷺ) لە یەک لە ڕیوایەتەکان بەناو چاڵێکدا کەوت و سەرچۆکەکانی هەموی داماڵرا و نزیک لەوە بوو کە ئێسکەکانی بەدیار کەوێ پێستەکەی نەما و خوێنی پێدا دەهاتە خوارەوە و زۆر ماندوو بوو ئارەقێکی زۆری ڕشتبوو دوو کەس خۆیان دابوە بەر شانی پیلی ڕاست و چەپی هەتا دەیتوانی بڕوا و لەسەر وڵاخ و ئەسپی خۆی پێڕا نەدەگیرا ئەوەندە ماندوو بوو بوو، ئینجا هەواڵیان هێنا گوتیان کافرەکان خۆیان کۆ کردوەتەوە دوبارە بە لەشکرێکی یەکجار زۆر وا هێرشتان دەکەنەوە سەر، پێغەمبەر ورەی بەرنەدا (ﷺ) لە قەزاو قەدەر تێگەیشتبوو ئیمانی پێی هەبوو بە سەحابەکانیشی فەرموو وەرن لە مەیداندا ڕادەوەستین (حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ) پشتمان بە الله قایمە اللهمان بەسە کۆڵی نەدا، بڕوادار ئەگەر چەند ماندوبێ چەند بریندار‌بێ خوێنی لێ هاتبێ ئەزیەتی بەسەر هاتبێ ماڵ و منداڵی فەوتابێ پارەی لێ ڕۆیبێ بە دڵێکی جێگیرەوە دەبێتە خاوەن سەبات ئیستیقامەی دەبێ خۆڕاگر دەبێ لە مەیداندا پێداگر دەبێ بە قەزاو قەدەر وات لێدێ جەریء دەبێ ترسی نابێ لە کوشتن و لە

ڕزق و ڕۆزی بڕین چونکە دەزانێ هەموی بە قەدەری خوای رب العالمین ە وە هەموی لەلای الله تعالی بڕاوەیە وە خوای رب العالمین ئەجەلی تۆی لە دەستدایە مردنی تۆی لە دەستدایە ژیانی تۆ لە دەست ئەوە هەر ئەو خاوەنە هەر ئەو بڕیار دەرە ئەوەی ئەو بڕیار بدا ڕەتبونەوەی بۆ نیە، ئەگەر وابوو قەزاو قەدەر ئەو کاریگەریەی بەسەرتەوە هەبوو تۆ کەسێکی بڕواداری ڕێک و پێکی تەواوی خاوەن مەوقیف و هەڵوێستی مەردانە پێ چەقیو لە مەیدانەکان وە دڵ ڕاگیر لە بەڵا و موسیبەتەکان لە ناخۆشی و تەنگەبەریەکان لە تەنگەشەکان خۆڕاگر دەبی ئاوات لێ دەردەچێ جا الله تعالی وامان لێبکا ئێمەش ئاوا لە عەقیدە تێبگەین لەسەر عەقیدەیەکی ئاوا بژین و بمرین کە بۆخۆی پێی ڕازییە -جل شئنە- وەکو هی پێغەمبەربێ (ﷺ) وەکو هی هاوەڵە بەڕێزەکانی بێ.

## پێناسەی ئیمان:

فَصْلٌ: وَمِنْ أُصُولِ الفرقة الناجية أَنَّ الدِّينَ وَالإِيمَانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، قَوْلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ، وَعَمَلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ وَالْجَوَارِحِ. وَأَنَّ الإيمانَ يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ، وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ.

---

دەفەرموێ (فَصْلٌ: وَمِنْ أُصُولِ الفرقة الناجية) لە بنەماکانی کۆمەڵی ڕزگاربوو کە ئەهلی سونە و جەماعەن (أَنَّ الدِّينَ وَالإِيمَانَ) دین کە بە مانای پڕۆگرامی ژیان و بەرنامە و ڕێباز و یاسا و ئەو هەموو مانایانە دەگرێتەوە دین کە دینی ئیسلامیش بەو مانایانە دێ بە مانای تۆڵە و جەزا و پاداشتیش دێت بەس لێرە مەبەستی پێی ڕێباز و بەرنامەی خوایی کە ئیسلامە وە ئیمان و بڕواش (قَوْلٌ وَعَمَلٌ) قسە و گوتنە وە کار و کرداریشە (قَوْلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ) ابن تیمیة دەفەرموێ قسە و گوتنی دڵەکان و زمانە (وَعَمَلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ وَالْجَوَارِحِ) وە کار و کرداری دڵ و زمان و ئەندامەکانیشە (وَأَنَّ الإيمانَ يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ) ئیمان زیاد دەکا بە تاعەت و گوێڕایەڵی و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی الله و پێغەمبەر (ﷺ) (وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ) وە کەمیش دەکا ئیمان و بڕوا بە تاوان و گوناح و سەرپێچی فەرمانەکانی الله و پێغەمبەر (ﷺ).

ئەو بابەتە بابەتێکی گرنگە لەبەر ئەوەی کۆمەڵێک لە تاقم و کۆمەڵەکانی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە لەو بوارە تێکەوتون، بە تایبەتی مورجیئەکان کێشەیەکی سەردەمیشە پێویست دەکا هەڵوێستەی لەسەر بکەین لە پێناسەی ئیمان، وە لە پاشان ئایە عەمەل تەواوکەری ئیمانە؟ وە مەرج و شەرتی صحەتە یان هی کەمالیەتە بۆ ئیمان؟ وە لە پاشان ئایە جنسی عەمەل مەعنای چیە؟ فەرد و تاکەکانی عەمەل مانای چیە؟ وە ئەو تاقم و کۆمەڵانە بە ئەشعەریەکانیشەوە بۆچونیان چیبوە لە پێناسەی ئیمان؟

بە کورتی و پوختی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لە پێناسەی ئیماندا یەک لە بۆچونەکانیان ئەوەیە دەڵێن ئیمان لەلای ئەهلی سونە و جەماعە بە پێنج نونەکان جیا دەبێتەوە لە پێناسەی تاقم و کۆمەڵەکانی تر بۆ ئیمان، ئەوە مانای چیە بە پێنج نونەکان؟ وەکو ابن تیمیةش -رحمه الله- لێرە وای پێناسە کرد، دەفەرمون ئیمان بریتیە لە (التصدیق) یان (الإعتقاد) ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە ئەوە ئێستا دەگەینە سەری لە هەڵوێستەکان لە پێناسەی ئیمان لە ڕوی زمانەوانی وە لە ڕوی شەرعی و لەلایەن زانایانی بیروبڕوا و عەقیدە، ئایە بۆ تەصدیق ناشێ و ناگونجێ بیکەینە پێناسە و مانای ئیمان بە گوێرەی شەرع و لەلایەنی زاراوەییەوە؟ (التصدیق بالجنان) یان (الإعتقاد بالجنان) هەندێک لە زانایانی تر دەفەرمون، بیروبڕوابون و بەڕاست دانانی دڵان، هەیە بە جینان دەیخوێنێتەوە جینان لەگەڵ جنان فەرقی هەیە، جینان کۆ و جەمعی جەنەت و بەهەشتە جنان بە مانای دڵ دێ لە زمانەوانیدا لە زمانی عەرەبیدا، کەواتە ئەگەر خوێندتەوە دەبێ بخوێنیتەوە (التصدیق) یان (الإقرار) یان (الإعتقاد) ئەو مانایانە ڕاست و دروستن (بالجنان) یانی بە دڵ، ئێستا (جنان) کۆتاییەکەی نون نیە؟ ئەوە نونی یەکەم کە دەڵێن پێنج نونەکە، وە نونی دوەم دەڵێن (الإقرار باللسان) ئیمان بریتیە لە بیروبڕوای ناو دڵان وە لە پاشان دان پێداهێنانی زمان (اللسان) ئاخیر و کۆتاییەکەی پیتی نونە دوبارە ئەوە نونی دوەم، وە نونی سێیەم لە پێناسەی ئیمان دەفەرمون (والعمل بالجوارح والأرکان) کار و کردار کردن بە ئەندامەکانی لاشەی مرۆڤ

ئەرکان ئاخیری نونە ئەویش، وە دەڵێن (یزید بالطاعة الرحمٰن) ئیمان زیاد دەبێ بە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی اللەی ڕەحمان ئەوەش بوە نونی چوارەم، وە نونی پێنجەم (وینقص بالمعصیة الرحمٰن) یان (وینقص) ئینجا لەوێدا دەڵێن (بالطاعة الشیطان) بە گوێڕایەڵی کردنی شەیتانیش کەم دەبێتەوە ئیمان، کەواتە ئەو پێنج نونانە جیا کەرەوەی پێناسەی ئیمانن لەلایەن ئەهلی سونە و جەماعە سەبارەت بە تاقم و کۆمەڵەکانی تر کە ئەوان کەم و کورتیان هەیە لە پێناسەی ئیماندا و وا ناڵێن و وا نافەرمون.

ئیمان بۆ نمونە لەلای ئەشعەریەکان پێناسەکەی بریتیە لەوەی هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون وە لەوانە ابن تیمیة دەڵێ ئەشعەریەکان لە پێناسەی ئیماندا زۆربەی هەرە زۆریان (مرجئة جهمیة) هەم موڕجیئەن و هەم جەهمیشن، بۆ؟ چونکە دەڵێ ئەوان دەڵێن (أن الإیمان هو تصدیق القلب) لەلای ئەوان ئیمان بریتیە لە بەڕاست دانانی دڵ، ئیختیلاف و جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی ئایە گوتنی بە زمان تەواوکەرە بۆ بەڕاستدانانی دڵان یان هەر بە دڵ بەڕاستی دابنێ تەواوە، دەڵێ لەوانە شێخ حەسەن ئەیوب بەڕەحمەت بێ کە ساڵێک دوو ساڵە وەفاتی کردوە و شێخێکی گەورەبوو زانایەک و داعیەکی بەڕێز و بەرز بوو بەڵام زیاتر عەقیدەی بەلای ئەشعەریەتدا بوو میسری بوو دەفەرموێ (أن المصدق بقلبه ناجٍ عند الله) دەڵێ ئەگەر کەسێک بەڕاستی دانا بون و وجودی الله تعالی و وەحدانیەتی الله تعالی ئەوەندە بەسە و ڕزگاری دەکا لەلای خوای رب العالمین (وإن لم ینطق بالشهادتین[1]) ئەگەر شاهێدومانیەکە بە زمانیشی نەیگوت بەس بە دڵ جێگیری کرد و بەڕاستی دانا ڕزگار دەبێ لەلای الله هەتا، موحەمەد ڕەمەزان بوطی ئەویشیان ئەشعەری و موتەسەویفە وەلەو ئێستا ناوی نەهێنرێتە ناو ناوان باشە لەگەڵ ئەو فتوا و هاوڕابونەی لەگەڵ ئەسەد و تاقم و کۆمەڵەکەی زیاتر خۆی والێکرد کە خەڵکی دڵی لەسەر بچێ و وە گوێ لە قسەکانی ڕانەگرێ بەڵام ئەویش لە پەرتوکەکانی کە لە سەردەمیەکانیشە ئەویش

[1] (تبسیط العقائد الإسلامیة ٢٩-٣٢).

ئەوە بۆچونیەتی، کەواتە بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە زۆر هەڵەیە کەم و کورتیە ئێستا حاڵی دەبین تێی دەگەین چونکە بەڕاستدانانی دڵان بەڕاستی بە تەنیا بەس نیە و ڕزگارت ناکا لەلای خوای رب العالمين، ئەگەر بەڕاستدانانی دڵان ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ڕزگارت بکا ئەوکاتە شەیتانیش دەبێ ڕزگاری ببێ، بە دڵنیاییەوە و سەدا سەد شەیتان لە دڵەوە بڕوای بە الله هەیە، زۆر چاکتر و زیاتریش لە ئێمە الله دەناسێ چونکە ئەو نزیک بوە سەردەمانێک لە ئاسمان ژیاوە لەگەڵ فریشتەکاندا بوە عیلم و زانستی زۆری هەبوە، بەڵام ئەگەر ئیمان عەمەل و کرداری لەگەڵ نەبێ و دانپێداهێنانی زمانی لەگەڵ نەبێ لەلای ئەهلی سونە و جەماعە ئینجا ڕزگارت دەکا لەلای الله ئەگەرنا ڕزگار نابی پێی.

جا پێناسەی ئیمان کەواتە لەسەرمانە بیکەین لەڕوی زمانەوانی، ئیمان بە مانای چی دێ؟ یەکەم لە مانایەکانی لەلای زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون پێویستە لە زمانەوانیشدا ئیمان بەو پێناسانە پێناسە بکرێ و مانا بکرێ یەکەم (الأمن) واتە (إعطاء الأمن والأمان والطمأنينة) مەعنای بەخشینی ئەمن و ئاسایش و دڵنیا کردنی بەرامبەرەکەت کە پێچەوانەی خەوف و ترسە ئەوە بە مانای ئیمان دێ، وەکو خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿وَءَامَنَهُم مِّن خَوفِ﴾ [قريش: ٤] لە قورئانی پیرۆز بەو مانایەش هاتوە واتە الله تعالى قوڕەیشیەکانی دڵنیا کرد و ئەمن و ئاسایشی بەسەردا هێنان لە ترس و بیم، وە لە پاشان ئیمان بە مەعنای (التصديق)یش دێ (التصديق) لە زمانەوانیدا بەو مانایەی (الذي يصدق قوله بالعمل) کە قسەکانی بە کردار تەصدیق بکات و بەڕاست دابنێ یەعنی پێچەوانەی (تەکذیب) بە درۆ هێنانەوە، بەڵام وشەی تەصدیق لە زمانەوانیدا دیارە بەوە دەگوترێ کە ئێمە دەڵێین (صدقت به) من بەڕاستم دانا (وآمنت به) بەو مانایەش دەبێ یان (آمنت بالله) بەڵام (آمنت بالله) یان (وآمنت به) کە دەڵێی بڕوام پێکرد بڕوام پێهێنا بە مەعنای تەصدیق

دێ، هەندێک جار ئیمان مانای تەصدیق کت و مت بۆی ناشێ و ناگونجێ وەکو ئێستا کە دێتە بەر شاشەی خەیاڵتان و نمونەی لەسەر دەهێنینەوە.

لە پاشان دەتوانین بڵێین ئیمان بە مەعنای ئەمن و تەصدیق دێ ئەو دوو مانایە تێک هەڵکێشیشن لە ڕوی زمانەوانیدا بەڵام ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ لە زمانەوانیدا دەشێ وەگونجێ بڵێین ئیمان بە مانای ئیقرار دێ ئەو مانایە زیاتر لەگەڵ پێناسە شەرعیەکە و زاراوەییەکەی ئیمان دەگونجێ ئیقرار یەعنی کەسێک کە بڵێت من دانت پێدا دەهێنم واتە وەکو بیروبڕوا لە دڵدا جێگیری دەکەم نەک هەر تەنها بەڕاستی دەزانم.

دەگەینە سەر ئەوەی پێناسەی ئیمان لەلایەن ئەهلی سونە و جەماعەوە زۆر گرنگ و موهیمە هەستی لێ ڕاگرن، لەبەر ئەوە بەو وردییە باسی دەکەین ئەوە کێشەی لەسەرە لە کۆنەوە و تا ئێستاش ئێستاش لەناو ئێمەدا تەواو سەدا سەد یەکلا نەبوەتەوە بە تایبەتی خەڵکانێک ئەمڕۆ هەن لەسەر ئیمان و موسەمای ئیمان یان لەسەر کوفر و موسەمای کوفر کێشەیان هەیە و پێویست دەکا ڕونکردنەوەی چاکی لەسەر بدەین.

چەند پێناسەیەک دەهێنینەوە هی زانا زۆر گەورەکان کە کەس قسەی نەمێنێ یانی ئەو زانایانە بن کە ئەهلی سونە و جەماعەن زۆر گەورەن لەوەدا کەسێک بڵێ فڵان لە خۆڕە وایگوت فیسار لەخۆڕە وایگوت لە پەرتوکەکانیش تۆمارە، کورتەی هەموو قسەکان و پێناسەی هەموو زانایان لەوانە ئیمامی شافیعی ئیجماعی لەسەر دەهێنێ ابن تیمیة لێی ڕیوایەت دەکا وە ئیمامی ئەحمەدیش بە هەمان شێوە ڕیوایەت دەکا لە زیاتر نەوەت زانا و تابیعین کە وایان گێڕاوەتەوە ئیمان بریتیە لە (الإقرار) یان (الإعتقاد) یان (التصدیق بالجنان) یەکەم خاڵی ئیمان بەڕاست دانان و بە ئیقرار کردن و بیروبڕوای دڵانە، دوەم (وقول باللسان) قسە و گوتنە بە زمان (وعمل بالجوارح والأركان) ئیمان کار و کردار کردنە بە ئەندامەکانی لاشە (یزید بالطاعة وینقص بالمعصیة) ئەوە پێناسەی ئەهلی سونە و جەماعەیە زیاد دەکا

ئیمان بە تاعەت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی الله وە کەم دەکاتەوە بە مەعصیەت و تاوان و گوناحەکان.

نمونە لەسەر ئیعتیقاد و تەصدیقی دڵ بریتیە لەوەی لە دڵدا تۆ شارەزایت هەبێ عیلم و زانستیش هەبێ و دانبێنێ بە حەق و ڕەوایەتیەکان بە تاک و تەنهایی الله بە بون و وجودی الله بەوەی کە الله تعالی هەر ئەو تەنها بەدیهێنەرە ئەو ڕۆزیدەرە مردن و ژیان تەنها بە دەستی ئەوە، ئەوە لە دڵدا هەموی دەبێ جێگیر بکەی دایبنێی بڕوایەکی تەواوت پێی هەبێ، دانپێداهێنانی زمان بە زمانیش ئەو قسانە بڵێیتەوە و بیکەی نەک هەر لەناو دڵت بمێنێتەوە، وە لە پاشان عەمەل و کرداری جەواریح و ئەندامەکانیش ئەوەی الله فەرمانی پێکردوە ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردوە و بە واجبی داناوە جێبەجێی بکەی ئەوەی قەدەغەیان لێکردوە و نەهییان لێکردوە نەیکەی لە حەرام و تاوان و گوناحەکان، ئینجا ئەندامەکانیشت لە نوێژکردن و ڕۆژوگرتن و زەکاتدان و حەجکردن و سوجدە و کڕنۆش بردن بۆ الله و سەدەقە کردنت و جەنگ و جیهاد و تێکۆشانت و فەرمان بە چاکە ڕێگری لە خراپە ئەوانە کار و کردەوەی ئەندامەکانی مرۆڤەکانن ئەوانەش هەموی سەلمێنەری ئەو بیروبڕوای ناو دڵت و دانپێداهێنانی زمانتە بە ئەندامەکانی لاشەت دەیکەی و ئەنجامی دەدەی.

کەواتە ئایە عەمەل (کێشە زیاتر لەسەر ئەوەیە) چ مەرجێکە بۆ ئیمان؟ مەرجی تەواوکەرە بۆ ئیمان ئەگەر کەسێک عەمەلی نەبوو لەگەڵ ئیمانەکەی ئیمانی تەواوە یان ناتەواوە یان ئیمانی هەر نیە؟ ئایە یان مەرجی صحەتە یان مەرجی کەمالیەتە تەواوکەریەتی؟ ئەهلی سونە و جەماعە زیاتر لەگەڵ ئەوەدان یەکەمین جار دەڵێن عەمەل و کردار جوزء و بەشێکی ئیمانە واتە ئەگەر ئیمانت لە دڵدا هەبوو بە زمانیش گوتت عەمەلی لەگەڵدا نەبوو ئەگەر جنسی عەمەلی لەگەڵدا نەبوو ئەو ئیمانە درۆیە نیە حیسابی بۆ ناکرێ لە تەرازوی ئەهلی سونە و جەماعە، جنسی عەمەل یەعنی چی؟ یەعنی خودی عەمەلەکە بەشێکی بنەما

و ناوی ئەوەی عەمەلە دەبێ بێتەجێ بەڵام ئەو عەمەلە كە جنسی هەیە فەرد و تاكیشی هەن بۆ نمونە كە دەڵێی عەمەل نوێژ دەگرێتەوە ڕۆژو جنسێكە ناوێكە كۆكەرەوەیە بۆ ئەو هەموو شتانە فەرد و تاكەكانی بریتیە لە نوێژ لە ڕۆژوو لە زەكات لە حەج لە جەنگ و جیهاد لە فەرمان بە چاكە لە ڕێگری لە خراپە هەتا كۆتایی و زۆرە ئەوەی فەرمانی اللەبێ فەرمانی پێغەمبەربێ (ﷺ) ئەوەی نەهی و قەدەغەی الله و پێغەمبەربێ هەر هەموی دەگرێتەوە ئەوە عەمەلە كە دەڵێی جنسی عەمەل ئەوانە تاكەكانین، جا تۆ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەبێ جنسی عەمەل لە ئیماندا بێنیتەجێ یانی كەسێك ئەوكات ئیماندارە لە دڵدا جێگیری بكا و بڕوای وابێ بە زمانیش بیڵێ جنسی عەمەلیش ئەساسیەكان بێنێتەجێ، ئەگەر لە فەردی عەمەل هەندێكی نەشهێنایەجێ بەو مەرجەی ئەو فەردە عەمەلە حوكمێكی خاصی تایبەتی نەبێ وەكو نوێژ لەلای هەندێك لە زانایان تەنها بە نەكردنی كافر دەبێ كەسەكە ئاوا نەبێ ئەو كاتە تەنها ئیمانەكەی كەم دەكاتەوە نوقسان دەكا وا نابێ هەموی لابدات.

كەواتە ئیمان هەندێك جار شەرتی صحەتە هەندێك جار شەرتی كەمالیەت و تەواویەتە، لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە كەسێك ئەگەر بیروبڕوای بە دڵ هەبوو بە زمان دانی پێدا هێنا جنسی عەمەلیشی هێنایەجێ بەڵام هەندێك تاك و فەردی عەمەلەكانی نەبوو و نەیكرد بەو مەرجەی تاك و فەردەكانی ئاوا نەبێ كە لە ئیسلامی دەباتە دەرەوە و حوكمی تایبەت و خاصی هەیە ئەوە ئەوكاتە پێی ناگوترێ بێ ئیمان ئیمانی هەموی لەسەر ڕەش بێتەوە و بێ ئیمان حیساب بكرێ پێی دەگوترێ ئیمان نوقسان و كەم و كورت چەند فەردێكی عەمەلی نەهێناوەتەجێ بەڵام ئەگەر جنسی عەمەلی نەبوو پێی دەگوترێ ئیمانی نیە ناكرێ لە ئیسلام ئیمان بەبێ عەمەل، كەواتە ئەو كاتە شەرت و مەرجی صحەتە بەو مانایە جنسی عەمەل كە دەبێ بێتەجێ بۆ ئیمان، ئەوە وەكو پێشەكیەك بوو حەزمان لێبوو كە باسی لێوە بكەین.

ئینجا وەکو بەڵگە هێنانەوەکان سەبارەت بە پێناسەی ئیمان کە ئیمان بریتیە لە ئیقرار و ئیعتیقاد و تەصدیقی دڵان و دانپێداهێنانی زمان و کار و کردەوەی ئەندامەکانی لاشەی مرۆڤ ئەوەش بەڵگە زۆرن، بۆ نمونە یەک لەوان کە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز خوای رب العالمين دەیەها نمونەی داوەتە ئێمە کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی عەمەل هەندێک جار تەواوکەرە هەندێک جار مەرجی صحەتی ئیمانە الله تعالی لە یەک لە ئایەتەکان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَـٰهَدُوا بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُولَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ﴾ [الحجرات: ١٥] (إِنَّمَا) لە زمانی عەرەبیدا بۆ حەصر و قەصرە، یانی خوای رب العالمين دەفەرموێ تەنها ئەو بڕوادارانەی کە بڕوایان هێناوە بە الله یانی لە دڵدا جێگیر بونە وە ئیمان و عەقیدەیان وایە بە الله کە الله بون و وجودی هەیە الله تاک و تەنهایە لە ڕبوبیەت و ئولوهیەت و لە ئەسماء و سیفاتدا وە بڕوایان هێناوە بە پێغەمبەری الله (ﷺ) لە پاشان گومانیان لەدڵدا نەماوە سەبارەت بە بڕواهێنان بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا: ﴿وَجَـٰهَدُوا بِأَمْوَٰلِهِمْ﴾ بە ماڵیان دەبەخشن و تێدەکۆشن، ماڵ بەخشین بە دەستە ماڵ بەخشین عەمەل و کردەوەیە کەواتە لێرە خوای رب العالمين لەپاڵ ئیمان و لەگەڵ ئیمان عەمەلی باسکرد کە عەمەل تەواوکەری ئیمانە ئەگەر عەمەلی لەگەڵدا نەبێ و جنسی عەمەلی لەگەڵدا نەبێ ئیمانەکە هەر نیە ئەگەر جنسی عەمەلی لەگەڵدا بوو فەردەکان و تاکەکانی عەمەلی کەم و کورتی هەبوو ئیمانەکە نا کاملە و ناتەواوە، ئینجا: ﴿وَأَنفُسِهِمْ﴾ جەنگ و جیهاد و کوشتار دەکەن بە نەفسی خۆشیان دەبەخشن و لە پێناو خوای رب العالمين خۆیان بەخت دەکەن کەواتە ئەوەش عەمەل و کردارە: ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُولَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ﴾ الله دەفەرموێ ئا ئەوانە ڕاستگۆن لەگەڵ ئیمانەکەیان، یانی کەسێک ئیمانی ڕاستە و دروستە و ڕاستگۆیە لەگەڵ دانپێداهێنانی دڵ و زمان کە بە کردەوە بیسەلمێنێ کە جەنگ و جیهاد بکا بە ماڵ و سەروەت و سامان وە بە گیانی خۆشی.

وە لە ئایەتی تر خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ [فاطر: ١٠] پێشەوای موفەسیران ئیمامی ئەبو جەعفەری طەبەری دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ﴾ بە مانای ئەوەی دێ یانی (إلى الله يصعد ذكر العبد إياه وثناؤه) یانی زیكر و یادەكانی الله كە عەبد و بەندەكان دەیكەن ئەوە بەرز دەبێتەوە بۆ الله: ﴿وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ دەفەرموێ (ويرفع ذكر العبد ربه إليه عمله الصالح، وهو العمل بطاعته، وأداء فرائضه والانتهاء إلى ما أمر به. وبنحو الذي قلنا في ذلك قال أهل التأويل) كەواتە عەمەلی صاڵحی خوای رب العالمین باسكرد ئا ئەویش دەبێتە مایەی ئەوەی زیكری الله بەرزكاتەوە كە ئیمان وات لێدەكا لە دڵدا و بە زمان كە زیكری خوای رب العالمین بكەی ئینجا الله تعالى كردەوەی چاكیشی لەگەڵ باسكرد.

ئایەتەكان زۆرن لەسەر ئەوەی كە دەسەلمێنن عەمەل بەشێكە لە ئیمان وە تەواوكەری ئیمانە هەندێک جار هەندێک جاریش بەڕاست دانانی ئیمان و مەرجی صحەتە كە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ * ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَـٰشِعُونَ﴾ وەسفی ئیماندارانی ئەمجارەش بە عەمەل كرد الله تعالى دەفەرموێ بێگومان سەرفراز و براوەن بڕواداران، كێن ئەو بڕوادارانە؟ ئیمان بریتیە لە چی؟ بریتیە لەوە لە دڵیاندا هەیە بە زمان دەیڵێن: ﴿هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ﴾ لە نوێژەكانیشیان: ﴿خَـٰشِعُونَ﴾ لە الله دەترسن نوێژ عەمەلە خوای رب العالمین باسیكرد كردیە پێناسە و وەسفی ئیمانداران: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾ ئەوەش بە عەمەل دەكرێ پشت دەكەنە شتە نارێک و نالەبار و لەغو و تاوان و گوناحەكان: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَـٰعِلُونَ﴾ بڕوادار ئەوەشە كە زەكات دەبەخشن بە كار و كردار دەیدەن ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَـٰفِظُونَ﴾ ئەوەش بە عەمەل و كردار دەبێ: ﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ هەتا كۆتایی.

وە پێغەمبەری پێشەواش (ﷺ) لە دەیەها حەدیس سەلماندویەتی کە عەمەل و کردار هەندێک جار تەواوکەرە هەندێک جار مەرجی صحەتی ئیمانە کە دەفەرموێ: «قُلْ آمَنْتُ بِاللَّهِ فَاسْتَقِمْ[1]» یان «ثُمَّ اسْتَقِمْ» لە ڕیوایەتێکی تر لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە کە کابرای سەحابی لێی پرسی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) شتێکم فێرکە لەپاش ئەوە من پێویستم بە هیچ کەس نەبێ هەر ئەوە دەربازمکا لە خزمەت الله تعالى لە عەزاب و ئاگری دۆزەخ، فەرموی تۆ بڵێ بڕوام هێنا بە الله (ئیمان) «فَاسْتَقِمْ» ئیستیقامە یانی چی؟ جا بەردەوامیشبە لەسەری و ئیستیقامەت هەبێ، ئیستیقامە لەسەر ئیمان ئیمان بڵێی قبوڵ نیە هەتا ئیستیقامەی لەسەر عەمەلەکان دەبێ هەبێ بە عەمەلەکان بیسەلمێنێ ئیستیقامە خۆی لە خۆیدا یانی عەمەل و کردار.

یان پێغەمبەر (ﷺ) دوبارە لە سەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: «الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ[2]» دەفەرموێ ئیمان حەفتا و ئەوەندە پۆل و شوعبەیە لە هەمویان پلەدارتر (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)یە لە هەمویان نزمتر لادانی بەردێکە لەسەر ڕێگا، لادانی بەرد لەسەر ڕێگا بە کردار و عەمەلە بە دەست لایدەدەی بە قاچ لای دەدەی ئەو کاتە ئەویش لە ئیمانە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بەشێکی ئیمانە.

یان دەفەرموێ: «ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ: مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ أَحَبَّ عَبْدًا لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَمَنْ يَكْرَهُ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ[3]» یان «لَا يُؤْمِنُ أَحدكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ،

[1] صحيح مسلم (٣٨)، سنن الترمذي (٢٤١٠)، سنن ابن ماجه (٣٩٧٢).

[2] صحيح مسلم (٣٥)، صحيح البخاري ( ٩ )، سنن أبي داود (٤٦٧٦).

[3] صحيح البخاري (٢١) (١٦) (٦٠٤١)، صحيح مسلم (٤٣)، سنن الترمذي (٢٦٢٤).

وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ[١]» جا ئەو فەرمودانە و زۆرێکی تریش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) عەمەل و کرداری کردوەتە بەشێک لە ئیمان.

ڕاشکاوانەتر پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ کە لێی دەپرسن وەفدی عبدولقەیس کە پرسیار دەربارەی دین لە پێغەمبەر دەکەن (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامیاندا دەفەرموێ ئەمریان پێدەکا «بِالْإِيمَانِ بِاللَّهِ وَحْدَهُ» دەڵێ دەبێ ئیمانتان هەبێ بە تاک و تەنهایی بە الله کە الله تاک و تەنهایە «أَتَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ وَحْدَهُ؟» پێشیان دەڵێ ئایە دەزانن ئیمان بە تاک و تەنهایی الله مانای چیە؟ «قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ» گوتیان الله و پێغەمبەری الله دەزانێ (ﷺ)، پێغەمبەر فەرموی «شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ» ئیمان بە تەنهایی خوای رب العالمین بریتیە لە شاهێدومانی هیچ پەرستراوێکی حەق و ڕەوا نیە جگە لە الله وە موحەمەد ڕەوانەکراوی اللەیە «وَإِقَامُ الصَّلَاةِ» وە کردن و بەرپاکردنی نوێژەکان ئەوە عەمەل و کردار «وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصِيَامُ رَمَضَانَ، وَأَنْ تُعْطُوا مِنَ الْمَغْنَمِ الْخُمُسَ[٢]» ئەوانە هەمویان کردارن کە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ).

لە ڕیوایەتێکی تر ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە دەڵێ پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا کامە کردار لە هەموو کرداران پلەدار ترە؟ فەرموی: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ» لەدوای ئەوە پێیان گوت کامەی تر فەرموی «الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ» عەمەل و کردار کە جەنگ و جیهادە، دوایە فەرموی «حَجٌّ مَبْرُورٌ[٣]» کەواتە ئەوانە هەموی عەمەل و کردارن پێغەمبەر (ﷺ) لە پاڵ ئیمان و لە پێناسەی ئیمان هێناویەتی.

کەواتە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بەو بەڵگانەی ڕابردوو بە زۆرێکی تریش دەیسەلمێنن کە ئیمان بریتیە لەوەی جێگیر دەبێ لەناو دڵ دانپێداهێنانی ناو دڵە بەڕاست

[١] صحيح البخاري (١٤)، سنن النسائي (٥٠١٥).

[٢] صحيح البخاري (٥٣) (٨٧) (٥٢٣)، صحيح مسلم (١٧)، سنن أبي داود (٣٦٩٢) (٤٦٧٧).

[٣] صحيح البخاري (٢٦) (١٥١٩)، صحيح مسلم (٨٣)، سنن الترمذي (١٦٥٨).

دانان و گوتنی زمانە وە لە پاشان عەمەل و کردەوەکەشت ئەندامەکانی لاشەشت دەبێ بیسەلمێنی.

لەبەر ئەوەیە زانایان فەرمویانە لەوانە سوفیانی کوڕی عویەینە کە یەکێکە لە پێشینانی چاک دەفەرموێ: (الإيمانُ قَولٌ وعمَلٌ، أخذناه ممن قبلنا قول وعمل وإنَّه لا يكونُ قَولٌ إلَّا بعَمَلٍ[١]) دەفەرموێ ئیمان بریتیە لە قسە و گوتن لە کار و کردار وە ئێمە وەرمان گرتوە لەوانی پێش خۆمان واتە لە تابیعی گەورەکان و لە سەحابەکان کە ئیمان بریتیە لە قەول و گوتن لە عەمەل و کردار وە قەولیش بە تەنها نابێ دەبێ عەمەلیشی لەگەڵدابێ.

وە ئیمامی شافیعی فەرمویەتی: (كان الإجماع من الصحابة والتابعين ومن بعدهم یەکدەنگی و کۆ دەنگی سەحابەکان و تابیعی لەپاش سەحابەکان کە هاتون (ممن أدركناهم) ئەوانەی ئێمە پێیان گەیشتوین و بە خزمەتیان گەیشتوین لەسەر ئەوە بوە (أن الإيمان قول وعمل ونية) ئیمان قسە و گوتن بوە وە کار و کردار بوە وە نیەتی دڵان بوە (لا يجزئ واحد من الثلاثة إلا بالآخر[٢]) هیچێک لەوانە بەبێ ئەوی تر تەواو نابێ، یەعنی نیەت بە تەنها تەواو نیە بەبێ گوتنی قسە قەول، وە قەول بە تەنها تەواو نیە بەبێ نیەت، نیەت و قەول تەواو نیە بەبێ عەمەل، قسەکەی شافیعی وا دەگەیەنێ -رحمه الله-.

وە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش فەرمویەتی: (أجمع تسعون رجلاً من التابعين، وأئمة المسلمين، وأئمة السلف، وفقهاء الأمصار على أن السنة التي توفي عنها رسول الله صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ ڕێککەوتون و یەک دەنگ بونە نەوەت لە پیاوانی تابیعی شوێنکەوتوانی سەحابەکان -رضي الله عنهم- وە لە پێشەوایانی موسڵمانان وە لە پێشەوایانی پێشینان وە لە فەقیە و شارەزایانی وڵات و شوێنەکان لەسەر ئەوەی کە سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی پێغەمبەر لێی وەفاتی کردوە (یەک لە زاراوەکانی عەقیدە

---

[١] شرح العقيدة الطحاوية - عبد الرحيم السلمي [عبد الرحيم السلمي] ج: ٤ ص: ١٧.

[٢] لوائح الأنوار السنية ولواقح الأفكار السنية [السفاريني] ج: ٢ ص: ٢٩٢.

و عینوانی عەقیدەی پێشان سونەتی پێدەگوترا) فەرموی جا ئەوەی باسکرد فەرموی یەک لە بڕگەکان ئەوەبوو (الإیمان قول وعمل) ئیمان بریتیە لە قسە و گوتن لە عەمەل و کردار (یزید بالطاعة) زیاد دەکا بە تاعەت و (وینقص بالمعصیة[١]) وە کەم دەکا بە تاوان و گوناح.

جا ئیمامی بەغەویش دەفەرموێ: (اتفقت الصحابة، والتابعون، فمن بعدهم من علماء السنة على أن الأعمال من الإیمان) دەفەرموێ یەک دەنگ بونە سەحابە و تابیعین وە ئەو زانایانەی لەدوای ئەوانیش هاتون زانایانی ئەهلی سونە کە عەمەل و کردار لە ئیمانەوەیە یان تەواوکەری ئیمانە یان مەرجی صحەتە (وقالوا: إن الإیمان قول، وعمل، وعقیدة[٢]) ئیمان بریتیە لە قسە و گوتن لە عەمەل و کردار لە بیروبڕوای دڵان.

ابن أبي العز الحنفي لە شەرحی طەحاویە دەفەرموێ: (فذهب مالك والشافعي وأحمد والأوزاعي وإسحاق بن راهویه وسائر أهل الحدیث) ئەو ناوانەی هێنای ناوی پێشینانی چاکن زانا دیارەکانی پێشینانی چاکن ئینجا دەفەرموێ ئیمامی مالیک و ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد و ئیمامی ئەوزاعی و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویهی وە تێکڕای زانایانی شارەزا لە حەدیس (وأهل المدینة) وە زانایانی مەدینە (رحمهم الله) ڕەحمەتی الله لە هەمویان بێ (وأهل الظاهر وجماعة من المتكلمین) وە زانایانی ئەهلی ظاهیر وە کۆمەڵێکیش لە زانایانی موتەکەلیم کە موتەکەلیمین بەوانە دەگوترێ زیاتر کە بۆچونیان هەبوە لەسەر مەسائیلی ئیمان و عەقیدە و بیروبڕوا (إلى أنه تصدیق بالجنان وإقرار باللسان وعمل بالأركان[٣]) دەفەرموێ هەموو ئەوانە بۆچونیان وایە ئیمان بریتیە لە تەصدیق و دانپێداهێنان و بەڕاستدانانی دڵان وە دانپێداهێنان و ئیقڕار کردن و ئیعتیراف کردن بە زمان وە عەمەل و

[١] الإیمان حقیقته، خوارمه، نواقضه عند أهل السنة والجماعة [عبد الله بن عبد الحمید الأثري] ص: ٦٥.
[٢] شرح السنة للبغوي (١/ ٤٤).
[٣] شرح العقیدة الطحاویة - ابن أبي العز الحنفي - الصفحة ٣٧٣.

کار و کردەوەی ئەندامەکان، ئەوەیە پێناسەی ئەهلی سونە و جەماعە بە تەواوی بۆ ئیمان و بیروبڕوا.

ئەهلی سونە و جەماعە بەوە جیا دەکرێنەوە لە جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە ئیمان زیاد دەکا وە کەمیش دەکا، جارێ بۆ زیادکردنی ئیمان ئەهلی سونە و جەماعە یەکدەنگن ئیختیلاف و جیاوازییان نیە بەڵام سەبارەت بە کەم کردنی ئیمان دەڵێن بەڵگەی ڕاشکاوانەی لەسەر نیە کەمێکی کەم لە ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وایە دەڵێن کەم ناکا بەڵام سەبارەت بە زیادبونی ئیمان هەمویان یەکدەنگن وە بە کەم کردنی ئیمانیش زۆربەی هەرە زۆری ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وایە کە کەمیش دەکا.

بەڵگەکان لەسەر ئەوەی کە ئایە ئیمان چۆن دەتوانین بڵێین زیاد دەکا یان کەم دەکا؟ لە بەڵگە قورئانیەکان خوای رب العالمین ڕاشکاوانە فەرمویەتی: ﴿وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗا﴾ [المدثر: ٣١] کە لێرەدا ئەو ئایەتە ڕاشکاوانە تێیدا دیارە دەفەرموێ بڕوادارەکان زیاد دەکەن ئیمانیان، الله تعالى دوبارە فەرمویەتی: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ [التوبة: ١٢٤] الله تعالى دەفەرموێ ئەگەر سوڕەت و ئایەتانێک دابەزیبان هەیانبوو دەیانگوت کێ لە ئێوە ئیمانی پێ زیاد دەکا بەڵام بڕوادارەکان بڕوایان زیاد دەکا و ئیمانیان زیاد بوە پێی وە ئەوان موژدە دەدەنە یەک و دڵیان پێی خۆش دەبێ، ئەو ئایەتانە ڕاشکاوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئیمان زیاد دەکا، وە خوای رب العالمين فەرمویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ * ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ * أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَمَغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ [الأنفال: ٢-٤] خوای رب العالمين فەرموی ئەوانە تەنها بڕوادارن کە زیکر و یادی الله دەکرێ دڵیان هەڵدەقرچێ و ڕادەچڵەکێ وە ئەگەر ئایەتەکانی اللهیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە ئیمانیان زیاد دەبێ و زیاد دەکا وە پشت دەبەستن بە الله تعالى، کەواتە دەڵێ

ئیمانیان زیاد دەبێ و زیاد دەکا دیارە ئیمان زیاد دەبێ، خوای رب العالمین ئەمجارە لە سورەتێکی تر دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ﴾ [الفتح: ٤] الله ئەو خوایەیە -جل شئنە- سەکینەت و ئارامی دابەزاندوە بەسەر دڵی بڕواداران تا ئیمانیان لەگەڵ ئیمانەکانی تر کە هەیانە زیاد ببێ بە مەعنای ئیمان زیاد دەبێ، وە خوای رب العالمین لە سورەتی الکهف فەرمویەتی: ﴿وَزِدْنَـٰهُمْ هُدًى﴾ [الكهف: ١٣] هودا بریتیە لە ڕێنوێنی ڕێنوێنیش بریتیە لە ئیمان کەسی خاوەن ئیمان کەواتە هیدایەتمان زیاد کرد یەعنی ئیمانمان زیاد کردن هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون.

کەواتە ئایەتەکان زۆرن کە ئەهلی سونە و جەماعە ئەوەندە ئایەتەی هێنامانەوە و زۆری تریش لە ئایەتەکان دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئیمان زیادیش دەبێ وە کەمیش دەبێ حەسەنی بەصری دەفەرموێ: ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا﴾ [الأحزاب: ٢٢] (وَمَا زَادَهُمُ الْبَلَاءُ إِلَّا إِيمَانًا بِالرَّبِّ وَتَسْلِيمًا لِلْقَضَاءِ[١]) دەڵێ مانای ئەوە دەگەیەنێت بەڵا و موسیبەت کە بەسەریاندادێ بەو مانایە دێ کە ئیمانیان بە خوای پەروەردگاریان بەهێزتر دەبێ و زیاد دەکا وە تەسلیم دەبن بۆ قەزاو قەدەر، کەواتە بەڵێ ئەوانە سەلماندیان ئەو ئایەتانە کە ئیمان زیاد دەکا وە دەشتوانرێ ئیمان زیاد بکرێ بە تاعەت و گوێڕایەڵی کردن و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی الله -جل شئنە-.

پێغەمبەریش (ﷺ) دەیەها حەدیس و فەرمودەی هەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمان زیاد دەبێ ئەوەتا لە یەک فەرمودەکانی دەفەرموێ: «أوثق عرى الايمان الموالاة في الله والمعاداة في الله والحب في الله والبغض في الله[٢]» کە دەڵێ «أوثق عرى الايمان» یانی قوڵپی بەهێزی ئیمان بە مەعنای ئەوەی دیارە ئیمان بەهێزیشی هەیە لاوازیشی هەیە کە گوتمان بەهێزی و لاوازی هەیە مەعنای دیارە زیاد و کەمی تێدایە ئیمان، کە دەفەرموێ دۆستایەتیە

[١] شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة [اللالكائي] ج: ٥ ص: ١٠٢٣.
[٢] سلسلة الأحاديث الصحيحة : ٩٩٨.

لەپێناو الله دوژمنایەتیە لەپێناو الله وە خۆشویستنە لەپێناو الله ڕق لێبونەوەیە لەپێناو الله، لە پاشان لە ڕیوایەتێکی تر پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «مَن أحبَّ للهِ، وأبغَضَ للهِ، وأَعْطَى للهِ، ومنَعَ للهِ، فقد استَكْمَلَ الإيمانَ[1]» هەریەک خۆشەویستی لەپێناو الله بوو ڕق لێبونەوەی لەپێناو الله بوو بەخشینی لەپێناو الله بوو وە قەدەغە و دەستگرتنی لەپێناو الله بوو ئەوە ئیمانی تەواو کردوە، تەواوی کردوە یانی چی؟ یانی دیارە ئیمانی ناکامڵ و ناتەواویش هەیە کە مادەم ناتەواو هەیە و تەواو هەیە دیارە زیاد و کەمی تێدایە ئیمان، وە لە پاشان پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «أكملُ المؤمنين إيمانًا أحسنُهم خُلقًا[2]» تەواوترین ئیمانداران لە ئیمان و بیروبڕوا تەواوترین و چاکترینیانە لە هەڵسوکەوت و لە خولوق و تەحامول و ئەخلاق و ڕەوشتی جوان، کەواتە کە دەڵێ «أكملُ المؤمنين» دیارە ئیمانی کاملیش هەیە وە ئەکمەلیش هەیە باشتر و تەواوتر، وە مادەم پلە پلەییدایە دیارە زیاد و کەمی تێدایە، یان پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «مَن رأى مِنكم مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بيدِه، فإنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلسانِهِ، فإنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وذلكَ أضْعَفُ الإيمانِ[3]» دەفەرموێ هەریەک لە ئێوە خراپە و تاوان و مونکەرێکی بینی با بەدەست بیگۆڕێ ئەگەر لە توانایدا نەبوو بە زمان بیگۆڕێ ئەگەر لە توانایدا نەبوو بە دڵ بیگۆڕێ و پێی ناخۆشبێ ئا ئەوەیان ئیمان لاوازە (أضْعَفُ الإيمانِ)ە ئیمانی لەوپەڕی لاوازییە کەواتە لایەنە لاوازیەکەی ئیمانە کە تەنها بە دڵ پێت ناخۆش بێ، جا کەواتە دەڵێ (أضْعَفُ) بە مەعنای دیارە ئەوەی بە دەست دەیگۆڕێ ئەوە ئیمانی زیاترە کە دەڵێ زیاترە ئیمان (أضْعَفُ) هەیە و زیاتر هەیە بە مەعنای دیارە زیاد و کەمی تێدایە، جا بەڵگەکان زۆر زیاترن بەڵام ئێمە بە کورتی و پوختی هەر ئەوەندەمان هێنایەوە هەتا بەهەمویرا بگەین.

[1] **صحيح الجامع** (٥٩٦٥)، **أخرجه أبو داود** (٤٦٨١)، **والطبراني** (٨/١٥٩) (٧٦١٣).
[2] **أخرجه أبو داود** (٤٦٨٢)، **والترمذي** (١١٦٢)، **وأحمد** (٢/ ٤٧٢) **واللفظ له.**
[3] **صحيح مسلم** (٤٩)، **سنن أبي داود** (١١٤٠) (٤٣٤٠)، **سنن الترمذي** (٢١٧٢).

جا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعەش قسەیان لەسەر ئەوە هەیە دەیەها پێناسامان هێنایەوە لە ڕابردودا وە باسمان لێوەکرد هی چەندین زانا کە ئەهلی سونە و جەماعە بون پێناسەی ئیمانیان کرد ئەو بڕگەیان بەگەڵ خستوە (يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ، وَيَنْقُصُ بِالْعصيان) یان (بِالْمَعْصِيَةِ) ئینجا ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێ و لێی دەگێڕدرێتەوە کە: (فكما يزيد كذا ينقص[١]) ئیمان هەروەکو زیاد دەکا ئاواش کەم دەکا، ئیمامی بەیهەقیش فەرمویەتی: (وأن الإيمان يزيد وينقص) بەڕاستی ئیمان زیاد و کەمیش دەکا هەم زیاد دەکا و هەم کەمیش دەکا (وإذا قبل الزيادة قبل النقص[٢]) ئیمان مادەم بڵێین قبوڵی ئەوە دەکا کە زیاد ببێ دەبێ قبوڵی ئەوەش بکا کە کەم ببێ، وە سوفیانی کوڕی عویەینە کە یەکێکە لە تابیعیە بەرز و بەڕێزەکان دەفەرموێ: (الْإِيمَانُ يَزِيدُ وَيَنْقُصُ) ئیمان زیاد و کەم دەکا دەڵێ (أليس تقرؤون القران) ئایە وە کەسانەی بڵێن ئیمان زیاد و کەم ناکا قورئانیان نەخوێندوەتەوە کە الله دەفەرموێ (﴿فزادتهم إيمانًا﴾ في غير موضع؟) نەک هەر لە یەک شوێن لە چەندین شوێن الله تعالى فەرمویەتی: ﴿فزادتهمإيمانًا﴾ باسی زیادبونی ئیمان دەکا (قيل ينقص؟ قال: ليس شيء يزيد إلا وهو ينقص[٣]) جا پێیان گوت باشە ئەوە سەلماندت ئەی سوفیانی کوڕی عویەینە لە قورئان باسکراوە و ئیمان زیاد دەکا، چۆن دەیسەلمێنی کەم دەکا؟ فەرموی هەر شتێک زیاد بونی قبوڵ بکا و تێیدابێ دەبێ بڕواشت بەوە هەبێ کەم بونیشی تێدایە و کەمیش دەکا، وە ابن تيمية دەفەرموێ (وقد ثبت لفظ الزيادة والنقصان في الإيمان عن الصحابة ولم يعرف فيه مخالف من الصحابة[٤]) دەفەرموێ جێگیر بوە وشە و دەربڕینی زیاد بون و کەم بون لە

---

[١] رواه أبو داود في "مسائله" عن الإمام أحمد (١٧٦٣)، وابن هانئ في "مسائله" (١٨٩٧)، وعبد الله في "السنة" ١/ ٣٠٠ (٦٠٤)، ورواه الخلال في "السنة" ٢/ ٢٨ (١١٢٨) عن المروذي، وابن بطة في "الإبانة" كتاب الإيمان ٢/ ٨٥٢ (١١٤٩) عن الفضل، عن أحمد به.

[٢] (الاعتقاد) الإمام البيهقي: ص ١١٥ باب: (القول في الإيمان).

[٣] الإبانة (٢/ ١١٤٢/٨٥٠) والشريعة (١/ ٢٦٤/٢٧١).

[٤] مجموع فتاوى ابن تيمية صفحة ٢٢٢ جزء ٧.

ئیماندا لە سەحابە و هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە (ﷺ) -رضي الله عنهم- وە نەزاندراوە هیچێک لە سەحابەکان موخالەفە و پێچەوانەی ئەو لێدوان و قسە و دەربڕینەیان هەبوبێ.
کەواتە ئێمە باشە بێینە سەر ئەوەی بزانین بەچی ئیمان زیاد دەکا هەتا ئیمانمان زیاد کەین بەچی کەم دەکا خۆمانی لێ بەدور بخەینەوە چونکە ئەوە سەلمێندراوە بە ئایەت و حەدیس و وتەی زانایان و سەلەفی ساڵح و وە ئەهلی سونە و جەماعە کە ئیمان زیاد و کەم دەکا:
یەکەم لەو خاڵانەی کە ئیمانی پێ زیاد دەبێ عیلم و زانستی سود بەخشە کە وەرگیرابێ لە قورئان و لە سونەی پێغەمبەر (ﷺ) وە کار و کردەوەشی پێبکەی چونکە عیلم و زانستی ئەگەر عەمەلی لەگەڵدابێ ترسی اللەت لە دڵ زیاد دەکا هەر کەسێکیش ترسی اللەی لە دڵدا زیاد ببێ ئیمانی پێ بەرز دەبێتەوە لە گوناح زیاتر بەدور دەکەوێتەوە جا کەواتە ئیمان بە عیلم و زانستی وەرگیراو لە قورئان و سونە زیاد دەکا.
وە دوەمین ئیمان بە لە الله نزیک بونەوە زیاد دەبێ، یانی ئەو ڕێگا و شوێنانەی کە لە اللەت نزیک دەخاتەوە وەکو تاعەت و عیبادەتەکان زیکر و یادی خوای رب العالمین وە عەقیدە پاکبونەوە و پاککردنەوە الله تەواو ناسین ئەوانە لە اللەت نزیک دەخاتەوە، کەواتە ئەگەر لە الله نزیک کەوتیەوە اللەت بە ناو و سیفەتەکانی ناسی بە دڵنیاییەوە ئیمانت بەرزتر دەبێتەوە، ئینسان هەر لە خۆشی هەست پێدەکا واقیعییەن کە ئیمان زیاد و کەمی تێدایە لەبەر ئەوەی هەندێک جار تۆ لە وانە و دەرزێک دانیشتوی یان لە محازەرە و وتارێک گوێ دەگری یان گوێ لە قاریئێکی قورئان ڕادەگری یان قورئان دەخوێنیتەوە هەست دەکەی خۆت لە خۆتدا ئیمانت بەرزە فولە گوناح و تاوان بێتە بەر دەستیشت پشتی تێدەکەی چاوتی لێ دەنوقێنی دڵت پێی ناخۆش دەبێ بەڵام هەندێک جاریش کە دور دەکەویتەوە لە تاعەت و عیبادەت لە قورئان خوێندنەوە وە گوێ دەگری لە گوناح و تاوانێک و هێواش هێواش دەچیتە کۆڕ و مەجلیسێک کە گوناح و تاوانی لێ ئەنجام دەدرێ هەست بەخۆت دەکەی ئیمانت دابەزیوە لەواز بوە ئەو کاتە ئەگەر گوناح بێتە

بەردەستت ئاسانتر دەیکەی و ئەنجامیشی دەدەی و پێشت ئەوەندە شتێکی گەورە نیە، کەواتە ئینسان و مرۆڤ لە خۆشی هەست دەکا کە ئیمان زیاد و کەم دەکا بە لە الله نزیک بونەوە بە تاعەت کردن ئیمان زیاد دەکا.

وە خاڵێکی تر کە پاڵنەرە و ئیمانمان پێی زیاد دەبێ ئیقتیداکردنە بە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) وە شوێنکەوتنی سونەتەکانی وە جێبەجێکردنی لە ژیانی ڕۆژانەمان لە هەموو گەورەیی و بچوکیەکیدا لە ڕیش و ئیشدا لە شێوە و شکڵدا لە هەستان و دانیشتنتدا لە دەرەوە و لە بازاڕ و لە ماڵەوە و لە سوار بونی ئۆتۆمبیل و دابەزینت و لەگەڵ منداڵ گەورە بچوک خێزانت دایکت باوکت خوشکت برات لەگەڵ هەموو کەسێک هەڵسوکەوتەکانت هەستان و دانیشتنەکانت وە نوستن و خەوتنت وە ڕاستبونەوە و بە ئاگاهاتنت لە خەوتن ئەوانەت هەموی بە گوێرەی سونەتی پێغەمبەربێ (ﷺ) بە دڵنیایی ئیمانت بەرز دەبێتەوە و فول دەبێ.

وە لە پاشان وازهێنان لە تاوان و گوناحەکان لەو قەدەغانەی کە الله کردویەتی و پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) ئا ئەوەش لە اللەت نزیک دەخاتەوە و ئیمانت پێی زیاد دەکا.

ئینجا ڕوکردنە ژیانی قیامەت و بیرکردنەوە لە قیامەت و ژیانی بەرزەخی ئیمانی پێ زیاد دەبێ.

ئینجا خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و تەدەبور تێدا کردن و لێوردبونەوە وە هەندێک جار ئایەت هەیە پێویستە چەندین جار بیخوێنیتەوە هەتا لێی حاڵی دەبی تێدەگەی لێی ورد دەبیتەوە ماناکەی بە دڵت و مێشکتەوە دەنوسێ وات لێدەکا جێبەجێی بکەی لە ژیانی ڕۆژانەت ئەو تەئەمول و تەدەبورە وات لێدەکا ئیمانت زیادبێ.

زۆر دۆعا کردن و پاڕانەوە زۆر کردنی زیکری خوای رب العالمين زۆر داوای لێبوردن زۆر (سبحان الله) گوتن زۆر (لا إله إلا الله) دەربڕین ئەوانە هەر هەمویان ڕێگا و شوێنن بۆ ئەوەی کە ئیمانتی پێ زیاد ببێ.

ئینجا کردنی سونەتەکان ئەگەر فەرزەکانت هەموی تەواو جێبەجێ کرد سونەتەکانیش بکە ئیمانت پێی بەرز دەبێتەوە.

ئینجا چاکە کردن لەگەڵ بەندەکانی خوای رب العالمین لە خێر و چاکە و بەخشین لە قسەی خۆش لە دەعوە و بانگەوازی ئیمانت پێی بەرز دەبێتەوە.

ئینجا ورد بونەوە لە نیشانە و بەڵگەکانی خوای رب العالمین هەم لە ئایەتەکانی قورئان هەم لە شاخ و داخ و زەوی و ئەستێرە و ئاسمان و باقی بەڵگەکانی تر و نیشانەکانی تری گەورەیی خوای رب العالمین.

ئینجا دەعوە و بانگەوازی کردن فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە خۆی لە خۆیدا ئیمانت بەرز دەکاتەوە.

ئینجا دوربونەوە لە شیرک و کوفر و ئەو کۆڕ و مەجلیسانەی شیرک و کوفری لێدەکرێ یان بیدعە و خوڕافیاتی لێدەکرێ یان تاوانە گەورەکانی لێ ئەنجام دەدرێ یان لە خودی کافر و مونافقەکان تاوانکارەکان ئەگەر لێیان بەدور کەویتەوە زاڵم و ستەمکارەکان ئیمانت بەرز دەبێتەوە.

کەواتە ئێمە پێویستە ئەو خاڵانەی گوتمان زۆری تریش ئەگەر بیری لێبکەیەوە دەبێتە مایەی ئیمان بەرز بونەوە لە خۆمانی بێنینەجێ هەتا هەردەم ئیمانمان لە بەرزیدابێ و دانەبەزێ وە نزم نەبێتەوە.

وە سەبەب و هۆکارەکانی ئیمان دابەزین و کەم کردنی ئیمانیش بە پێچەوانەی ئەو خاڵانەی تر گوتمان کە ئیمانی پێ بەرز دەبێتەوە و زیاد دەکا، کە عیلم و زانستی یەکەمیان بوو جەهل و نەفامی بە دین ئەوەشیان ئیمانت نزم دەکاتەوە، شارەزا نەبون لە دین وە تەقلید و بەدواکەوتنی شتەکان بە چاوبەستەکێ و بە کوێرانە ئەوانە ئیمانتی پێ کەم دەبێتەوە و لاواز دەبێ، وە بیدعە کردن و وازهێنان لە سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئیمانی پێ کز و لاواز دەبێ، وە شوێنکەوتەبونی ئەو زانا و خەڵکانەی کە ئەهلی ئەهوان بەڵگە و دەلیلیان لە

دەست نیە یان بیدعە و خورافیات دەکەن ئیمانتی پێ کەم دەبێ و لاواز دەبێ، وە شوێنکەوتەبونی هەواو هەوەس و ئارەزوەکانت وە شوبوهات و دودڵیەکان ئیمانت پێی لاواز دەبێ و کەم دەبێ، وە ئیقتیداکردن و شوێن پێ هەڵگرتنی ئەوانەی کە تاوانکارن گوناحبارن یان بیدعەچین هەریەک لەوانە یان کافرن یان زاڵمن یان ستەمکارن ئیمانتی پێ لاواز دەبێ، وە لە پاشان ئەگەر تۆ خۆت نەکەیتە کەسێکی خاوەن مەوقیفی وەلاء و بەڕاء بە دڵنیاییەوە ئیمانت دادەبەزێ لاواز دەبێ، وە لە پاشان ئەگەر هەست نەکەی بە مەسولیەت بەرامبەر بە ئومەتی ئیسلام و موسڵمانان ئیمانت لاواز دەبێ، ئەگەر گوێڕایەڵی هەواو هەوەس و نەفست بکەی ئیمانت لاواز دەبێ، ئەگەر بچیتە ئەو کۆڕ و مەجلیسانەی کە گوناح و تاوانی لێ دەکرێ یان دۆست و برادەری خراپت هەبێ بە دڵنیاییەوە ئیمانت لاواز دەبێ، ئەگەر تۆ خۆت بێ ئاگا بکەی و پشت بکەی لە قورئان و ئاینی خوای رب العالمین یاد و زیکری الله نەکەی ئیمانت لاواز دەبێ، کردنی تاوان و گوناحەکان هەرکاتێک هەر تاوان و گوناحێک ئەنجام بدەی و بیکەی ئیمانت پێی کەم دەبێتەوە و لاواز دەبێ، وە لە پاشان دڵت تەواو بە دونیاوە ببەستیتەوە وە دڵت زۆر خۆش بکەی بە زینەت و ڕازاوەییەکانی دونیا ئەوە بەدورت دەخاتەوە لە دینداریەکی تەواو و ڕێک و پێک و ئیمانتی پێ لاواز دەبێ، وە بیر نەکردنەوە لە قەبر و قیامەت و مردن و وە لە پاشان مەیدانی حەشر و حیساب ئەوە ئیمانت لاواز دەبێ و دڵت ڕەق دەبێ، وە لە پاشان دورکەوتنەوە لە تاعەت و عیبادەتەکان ئیمانتی پێ لاواز دەبێ، وە شوێنکەوتنی ئەو خوت خوتە و خەیاڵات و وەسوەسەی شەیتان ئیمانت لاواز دەکا.

کەواتە ئەوانەش چەند خاڵێک بون بە کورتی و پوختی ئیمانی پێ لاواز دەبێ ئەوەی لە سەرمانە ئێمە دەبێ ئەو خاڵانە بێنینەجێ کە ئیمانمان پێی بەرز دەبێتەوە خوا نەخواستە نەک ئەوانە بێنینەجێ ئیمانمان پێی کەم و لاواز ببێ.

کەواتە کورتە و پوختەی قسان ئیمان شتێکە لاواز دەبێ و بەهێز دەبێ زیاد دەبێ و کەمیش دەبێ لەلای ئەهلی سونە و جەماعە، هەیە لە مرۆڤەکان ئیمانی لەوپەڕی تەواوی و ڕێک و پێکیە کەم و کورتی نیە و لە قیمەی ئیماندایە نمونە وەکو ئەبو بەکری صدیق وەکو عومەری کوڕی خەتاب وە باقی سەحابەکانی تریش نمونە زۆرن وە هەشە ئیمانی یەکجار لاوازە بەڵام لە ئیسلام نەچوەتە دەرەوە تاوان و گوناحەکان ئەنجام دەدا بێ موبالاتە بەڵام هەر لە بازنەی ئیمانداران حیساب دەبێ بەڵام لەلای غەیری ئەهلی سونە و جەماعە ئیمان زیاد و کەم ناکا بە تایبەت لەلای مورجیئەکان وە هەموی لە یەک ئاستی ئیماندان وە جەهمیەکانیش ئەوە بۆچونیانە، کەواتە ئیمانی جوبرائیل کە مەلائیکەتێکە الله تعالی وەحی پێ دەنارد بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ ئیمانی کەسێکی زۆر گوناحکار لە یەک ئاست دادەنێن ئەو تاقم و کۆمەڵانەی جگە لە ئەهلی سونە و جەماعە لەبەر ئەوە ئەو قسانەیان هەڵەیە تاوانە وە گوناحە پێچەوانەی قورئان و سونەی پێغەمبەرە (ﷺ).

## حوکمی بکەری تاوانە گەورەکان:

وَهُمْ مَعَ ذَلِكَ لا يُكَفِّرُونَ أَهْلَ الْقِبْلَةِ بِمُطْلَقِ الْمَعَاصِي وَالْكَبَائِرِ؛ كَمَا يَفْعَلُهُ الْخَوَارِجُ؛ بَلِ الأُخُوَّةُ الإِيمَانِيَّةُ ثَابِتَةٌ مَعَ الْمَعَاصِي؛ كَمَا قَالَ سُبْحَانَهُ: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ﴾ [البقرة: ١٧٨]، وَقَالَ: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ [الحجرات: ٩]، ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ﴾ [الحجرات: ١٠].

---

جا ابن تیمیة دێ باسێکی تری گرنگ و موهیم دەرباری عەقیدە دەوروژێنێ و باس دەکا کە ئەویش مەسەلەی کافر کردنی خەڵکانێکە ئایە دەتوانی ئەهلی قیبلەی موسڵمانان بە کافر دابنێی؟ مەسەلەی تەکفیر کە زۆر گرنگ و حەساسە وە تێیدا دەبێ وردبین دەقیق

بین ئەهلی سونە و جەماعە مام ناوەندین لەو مەسەلەیەشدا نە زێدەڕەوییان تێدا کردوە نە کەمتەر خەمن تێیدا لەبەر ئەوە ابن تيمية دەفەرموێ (وَهُمْ مَعَ ذَلِكَ) ئەهلی سونە و جەماعە کە پێشتر پێناسەی ئیمانیان کردوە و باسی ئیمانیان کرد فەرموی (وَأَنَّ الإيمَانَ يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ، وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ) ئیمان بە تاعەت و گوێڕایەڵی الله تعالی و فەرمانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زیاد دەکا وە بە مەعسیەت و تاوان و گوناحەکان کەم دەکا ابن تيمية فەرموی ئینجا لەگەڵ ئەوەدا ئەهلی سونە و جەماعە کە وایان گوتوە و واش دەڵێن (مَعَ ذَلِكَ لا يُكَفِّرُونَ أَهْلَ الْقِبْلَةِ بِمُطْلَقِ الْمَعَاصِي وَالْكَبَائِرِ) ئەهلی قیبلە کە ئەوانەن ڕودەکەنە قیبلە واتە بڕوادارن موسڵمانن لە زاهیری و ڕواڵەتدا وا دیارن بە موتڵەقی مەعصیەکان و بە ڕەهاییەتی تاوان و گوناحەکان و گوناحە گەورەکان کافریان ناکەن.

(مطلق المعاصي) یەعنی چی یان (مطلق الكبائر)؟ بەو مانایە دێ یەعنی هەندێک لە گوناحەکان هەندێک لە تاوانەکان هەندێک لە گوناحە گەورەکانیشیان ئەنجامدا نەک هەر هەموو گوناحەکان سەدا سەد ئەنجامدەن هیچ عەمەلی چاکیان نەبێ یان هیچ جنسی عەمەلیان لێ نەهێتەجێ بەڵکو بە موطڵەقی یان هەندێک لە گوناحەکان ئەگەر ئەنجامیشیاندا هەندێک لە کەبیرەکانیان ئەگەر ئەنجامیشدا لە تاوانە گەورەکان ئەهلی سونە و جەماعە ئەو کەسانە کافر ناکەن بە کردنی ئەو گوناح و تاوانانە ئەو گوناحانە هەر چەندێک مەزن و گەورەشبن، ئەوە پیشە و ئیشی خەواریجەکانە کە بە گوناحە گەورەکان موسڵمانان کافر دەکەن، لە عەقیدەی خەواریجەکان ئەگەر کەسێک ئارەقی خواردەوە ئەگەر کەسێک زینای کرد ئەگەر کەسێک قەتڵێکی کرد و موسڵمانێکی کوشت بە کردنی ئەو گوناح و تاوانە لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە بە کافری دادەنێن خوێنی حەڵاڵ دەکەن وە دەڵێن هەمیشەیش دەبێ لە ئاگری دۆزەخ، موعتەزیلەکانیش پلەیەک نزمترن لە خەواریجەکان بەس قسەکانیان زۆر لێک نزیکە کە دەڵێن ئێمە بە کردنی تاوان و گوناح لەلایەن موسڵمانێکەوە ئەگەر ئەهلی قیبلەش بێ بە موتڵەقی مەعاصی و کەبیرەکان دەڵێن

دەردەچێ لە ئیسلام بەس ناچێتە بازنەی کوفر (في منزلة بین المنزلتین) لەو شوێن و ناوەڕاستەدا دەمێنێتەوە لەنێوان ئیسلام و کوفردا بەڵام لە قیامەت و لە دۆزەخ هەمیشەیی دەبێ، لە قیامەت تێک دەکەنەوە لەگەڵ خەواریجەکان لە دونیاش قسەیەکی بێ مانای پڕوپوچی بێ بەڵگەیە کە دەڵێن لە ئیسلام دەردەچێ و ناچێتە بازنەی کوفریش، بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن هیچ ئیماندار و ئەهلی قیبلەیەک نیە هیچ موسڵمانێک نیە بە کردنی هەندێک لە گوناحەکان یان بە کردنی تاوان و گوناحە گەورەکان مادەم بڕوای بە حەلاڵ بونی نەبێ لە ئیسلام دەربچێت و بەکافر دابنرێ بەڵکو هەر لە بازنەی ئیسلام دەمێنێتەوە بەڵام کەسێکی ئیمان نوقسانە کەسێکی تاوانکارە کەسێکی گوناحکارە هەر ئەو بڕیارەی لەسەر دەدرێ.

(كَمَا يَفْعَلُهُ الْخَوَارِجُ) ابن تیمیة دەفەرموێ ئەهلی سونە و جەماعە ئەهلی قیبلە بە کافر دانانێن بە کردنی گوناحەکان یان گوناحەکان ئەگەر گەورەش بێ هەروەکو خەواریجەکان بە کافریان دادەنێن (بَلِ الأُخُوَّةُ الإِيمَانِيَّةُ ثَابِتَةٌ مَعَ الْمَعَاصِي) بەڵکو برایەتی ئیمانی لەگەڵ کەسێکی تاوانکار ئەگەر گوناحە گەورەکانیش ئەنجام بدا جێگیرە لەلایەن ئەهلی سونە و جەماعە وە هەر دەمێنێ برایەتیەکە و هەر هەیە لەگەڵ کردنی تاوان و گوناحەکانیش (كَمَا قَالَ سُبْحَانَهُ في آية القصاص) هەروەکو الله تعالی و پاک و بێگەرد لە ئایەتی القصاص فەرمویەتی: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ﴾ [البقرة: ١٧٨] هەریەک شتێکی عەفو کرد لە براکەی خۆی، کە دەڵێ لە براکەی خۆی ئەو کەسەی تۆ عەفوی دەکەی وەلی ئەمری مەقتولەکە کوژراوەکە قاتیلەکەیە کە عەفوی دەکا شتێکی لێ عەفو دەکا قاتیلیش یانی گوناحە گەورەکەی ئەنجام داوە کە عەمدەن قەتڵی کردوە و کەسێکی موسڵمانی کوشتوە یان بە خەطەء کوشتویەتی کەواتە ئەو تاوانە گەورە کە کوشتنە ئەو کەسەی لە برایەتی تۆ نەخست کە خوای رب العالمین بە برا ناوی هێنا نەیبردە بازنەی کوفر و لە ئیسلامی دەرنەخست، خوای رب العالمین ئەمجارە فەرموی: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ

الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تبغي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ [الحجرات: ٩] الله تعالى فەرموی ئەگەر دوو تاقم و کۆمەڵی بڕواداران شەڕی یەکتریان کرد لەگەڵ یەکتر جەنگین دەفەرموێ ئێوە ناوبژیوانیان بکەن و وە ئیسلاح و ئاشتەوایی و پێکهاتنەوە بخەنە نێوانیان ئەگەر یەکێکیان بەسەر ئەوەیتریانەوە دەرچونی کرد ئەوە ئەوەی کە دەرچونی کردوە و باغی بوە و لە ئەمر و فەرمانی خەلیفە و ئیمام و وەلی ئەمری موسڵمانان دەردەچێت ئەوە شەڕی لەگەڵ بکەن کوشتاری لەگەڵ بکەن هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ئەمر و فەرمانی خوای رب العالمین و سەر دادەنەوێنێ و ملکەچ دەکا جا ئەگەر ملی کەچ کرد وە تەسلیم بوو ئەو کاتە نێوانیان چاک بکەنەوە بە عەدل و دادوەری وە خوای رب العالمین کەسی دادوەری خۆشدەوێ.

کەواتە فەرموی خوای رب العالمین ابن تيمية بە بەڵگەی ئەوە هێناویەتیەوە: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا﴾ ئەگەر دوو تاقم و کۆمەڵ لە بڕواداران یەکتریان کوشت، جا هەندێک جار کوشتن مەعنای چیە کە بەشەڕ یەک دێن لەگەڵ یەکتر دەجەنگن؟ مەعنای هەندێک جار نەفەر و کەسێک لە تاقمێک لە تاقمەکانی لەگەڵ بەرامبەرەکەی کوشتنی توش دەبێ کوشتن کە قەتڵە لە تاوانە گەورەکانە لەگەڵ ئەوەدا خوای رب العالمین نەیفەرموو بەو کوشتنە لە بازنەی برایەتی ئیمانی دەردەچێ دەفەرموێت: ﴿فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ خوای رب العالمین دەفەرموێت، ئینجا لە کۆتایی ئایەتەکە چی دەفەرموێ؟ لەدوای ئەو ئایەتە ئایەتی دە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ بەڕاستی تەنها بڕواداران بران.

کەواتە ئەو دوو تائیفە ئەگەر یەکتریش دەکوژن قەتڵیش دەکەوێتە نێوانیان مادەم قەتڵیان پێ حەڵاڵ نیە گوناحە گەورەکانیان پێ حەڵاڵ نیە وەکو گوناحێکی گەورە تەنها ئەنجامیان داوە و عەمەلیان بەو گوناحە گەورە کردوە بە بڕوادار دەمێنێنەوە وە برایەتی بڕواداری و ئیمان لەنێوانیان دەمێنێ لەبەر ئەوەیە خوای رب العالمین دەفەرموێ نێوانی براکانتان

چاککەن: ﴿فَأَصۡلِحُوا بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡ﴾ نێوانی براکانتان چاککەن سوڵح و ئاشتەوایی بخەنە نێوانیان: ﴿وَٱتَّقُوا ٱللَّهَ﴾ لە الله بترسن وە خۆ پارێزکاربن: ﴿لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ [الحجرات: ١٠] بەڵکو خوای رب العالمين ڕەحم و بەزەییتان پێبکا.

**حوکمی کەسی فاسق لە ئیسلامدا:**

وَلاَ يَسْلُبُونَ الْفَاسِقَ الْمِلِّيَّ اسْمَ الإيمَانِ بِالْكُلِّيَّةِ، وَلاَ يُخَلِّدُونَهُ فِي النَّارِ؛ كَمَا تَقُولُ الْمُعْتَزِلَةُ. بَلِ الْفَاسِقُ يَدْخُلُ فِي اسْمِ الإيمَانِ؛ كَمَا فِي قَوْلِهِ: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ [النساء: ٩٢]، وَقَدْ لاَ يَدْخُلُ فِي اسْمِ الإيمَانِ الْمُطْلَقِ؛ كَمَا فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ [الأنفال: ٢]، وَقَوْلُهُ: (ﷺ): «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَنْتَهِبُ نَهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ[١]».

ونقول: هُوَ مُؤْمِنٌ نَاقِصُ الإيمَانِ، أَوْ مُؤْمِنٌ بِإِيمَانِهِ فَاسِقٌ بِكَبِيرَتِهِ، فَلاَ يُعْطَى الاسْمَ الْمُطْلَقَ، وَلاَ يُسْلَبُ مُطْلَقَ الاسْمِ.

---

ئەمجارە ابن تيمية دەفەرموێ (وَلاَ يَسْلُبُونَ الْفَاسِقَ الْمِلِّيَّ الإسلامالإسلام بِالْكُلِّيَّةِ) وە هەروەها ئەهلی سونە و جەماعە کەسێکی لە فەرمان دەرچوو وای دانانێن سەدا سەد بڵێن لە ئیسلام دەرچوە بە کردنی لە فەرمان دەرچونێک و بە تاوان و گوناحێک (وَلاَ يُخَلِّدُونَهُ فِي النَّارِ؛ كَمَا تَقُولُ الْمُعْتَزِلَةُ) بڕیاری هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخی بەسەردا نادەن هەروەکو موعتەزیلەکان ئەو بڕیارەی بەسەردا دەدەن، چونکە گوتمان موعتەزیلەکان دەڵێن هەرکەسێک فسقێکی کرد بە مەعنای تاوانێکی کرد کەبیرەیەکی ئەنجامدا هەمیشەییە لە ئاگری دۆزەخ لە قیامەت (پەنا بە خوای رب العالمين) (بَلِ الْفَاسِقُ يَدْخُلُ فِي اسْمِ الإيمَانِ) بەڵام لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کەسی فاسق، فاسق بە مەعنای فسقی بچوک

---

[١] **صحيح البخاري** (٥٥٧٨) (٢٤٧٥) (٦٧٧٢)، **صحيح مسلم** (٥٧)، **سنن أبي داود** (٤٦٨٩).

یان بە مەعنای فسقی تاوان و گوناح نەک فسق بە مەعنای کوفر چونکە هەندێک جار فسق لە موستەڵەحی قورئانی بە مەعنای کوفریش دێ ئەوە کوفری مەبەست نیە، بەڵام فسق بە مەعنای تاوانە گەورەکان کە ئەنجام بدا گوناح و تاوان بکا لە فەرمانی الله دەربچێ بەڵام هەر لە بازنەی ئیمان و ئیسلام بمێنێتەوە بڕوای بە حەڵاڵ بونی تاوان و گوناحەکە نەبێ لەلای ئەهلی سونە و جەماعە کەسی ئاوا فاسق لە بازنە و لەناو بازنەی ناوی ئیمان دەمێنێتەوە یانی ناوی ئیماندار و موسڵمانی هەر پێ دەگوترێ وەکو خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ [النساء: ٩٢] جا ڕزگار کردن و ئازاد کردنی کۆیلەیەک و کەسێکی ئیماندار کەواتە هەندێک جار ئەوەی کەسە و تاوانباریشە و گوناحگاریشە و فاسقیشە و الله بە ئیماندار ناوی بردوە (وَقَدْ لاَ يَدْخُلُ فِي اسْمِ الإِيمَانِ الْمُطْلَقِ) هەندێک جاریش ناچێتە ناو ناوی ئیمانی موتڵەق.

(مطلق الإيمان)مان هەیە ئیمانی موتڵەقمان هەیە، ئایە جیاوازییان چی دەبێ؟ ئەو موستەڵەحە موستەڵەحێکی ئوسوڵیە پێویستی بە هەڵوێستە و ڕونکردنەوەیەکی بچوک هەیە بۆ ئەوەی لێتان هەڵە نەبێ، لە پێشتردا ابن تيمية باسی کرد فەرموی (وَهُمْ مَعَ ذَلِكَ لا يُكَفِّرُونَ أَهْلَ الْقِبْلَةِ بِمُطْلَقِ الْمَعَاصِي وَالْكَبَائِرِ) (مطلق المعاصي والكبائر) یان (مطلق الإيمان) کە دەگوترێ بە مەعنای هەندێک دێ بەشێک دێ لێی بەڵام کە دەڵێن ئیمانی موتڵەق یەعنی سەدا سەد مەبەستی لەوەیە لێی ڕەش ناکرێتەوە، یەعنی کەسەکە پێی ناگوترێ ئیمان دارێکی سەدا سەدی پلە سەدی یان تەواو وەکو بڵێین عەیارە بیست و یەک یان عەیارە بیست و چوار کە ئەو وشە بەکار دەهێنرێ بەڵکو فاسقەکە پێی دەگوترێ ئیمان کەم و کورت پێی دەگوترێ تاوانبار پێی دەگوترێ لەلایەن ئەهلی سونە و جەماعە کە ئیمانەکەی تەواو نیە پلەی ئیمانەکەی نزمە لەبەر ئەوە ئەو تاوان و گوناحەی کردوە بەڵام ناوی (مطلق الإيمان)ی هەر لەسەر دەمێنێ لەسەری لاناچێ بڵێی ئیمانەکەی تەواو سەدا سەد لەسەر ڕەش بێتەوە و پێی بگوترێ کافر (پەنا بە خوای رب العالمين).

(كَمَا فِي قَوْلِهِ تَعَالَى) هەروەکو خوای رب العالمین فەرمویەتی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ [الأنفال: ٢] فەرموی ئەو بڕوادارانەی کە زکر و یادی خوای رب العالمین دەکەن یان لەلایان دەکرێ ئەوە دڵیان ڕادەچڵەکێ بە مەعنای ئیمانیان زیاد دەکا بەسەر خۆیاندا دەچنەوە وە ئەگەر ئایەتەکانی اللەیان بەسەردا بخوێندرێتەوە ئیمانیان زیاد دەکا، کە دەڵێ ئیمانیان زیاد دەکا دیارە ئیمان لە پێشتریش باسمان کرد و سەلماندمان ابن تیمیة بە بەڵگەی ئەوە هێناویەتیەوە زیاد و کەمی تێدایە کەواتە فاسقیش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە تاوانباریش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەگەر گوناح و تاوانێکی ئەنجام داوە پێی دەبێتە فاسق، بەڵام ئایە ئیمانی فاسقێک لەگەڵ ئیمانی کەسێکی صدیق وەکو ئەبو بەکری صدیق وەکو یەکە؟ نەخێر ئیمانی ئەبو بەکری صدیق لەوپەڕی تەواوی و زۆرییە وە ئیمانی فاسقەکە لە کەمیدایە بە قەدەر گوناح و تاوانەکەی لێی نوقسان بوە کەم و کورتە، کەواتە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەگوترێ کەسێکی فاسق یان تاوانبار یان گوناح ئەنجام دەدا پێی بڵێی ئیمان نوقسان ئاساییە وە دروستە پێی بڵێی ئیمانی کەم و کورتی هەیە دروستە بەڵام نابێ پێی بڵێی ئیمانی نیە ئیمانەکەی تەواو لێ بستێنیتەوە.

خوای رب العالمین کە وای فەرموو ئەوەتا پێغەمبەریش دەفەرموێ (ﷺ) ابن تیمیة بە بەڵگەی هێناوەتەوە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ» زیناکەر زینا ناکا لە کاتی زینادا بڕواداربێ بە مەعنای بڕوادار نیە، ئایە سەدا سەد بڕوادار نیە و ئیمانی تەواو لێ دەستێنرێتەوە یان ئیمانی کەم و کورتە؟ ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە و دێین ئێستا لە هەڵوێستە کردن لەسەری بەڵگەی لەسەر دەهێنینەوە و بۆچونی زانایانی ئەهلی سونە و جەماعەش دەخەینە بەر دەستان، وە دەش فەرموێ «وَلا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ» دزیکەر لەو کاتەی دزی دەکا پێی ناگوترێ بڕوادار بڕوادار نیە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ)، ئایە سەدا سەد بڕوادار نیە و کافرە ئیمانی لێ دەستێنرێتەوە؟ یان

بڕواداریکی گوناحکارە ئەو لەو حاڵەتەدا و لە دزیەکەدا بڕوادار نیە؟ ئەوە ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە و دوایە باسی لێوە دەکەین لە هەڵوێستەکان «وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ» وە نایخواتەوە ئارەق کەسێکی ئارەقخۆر لەو کاتەی دەیخواتەوە بڕواداربێ کەواتە بڕوادار نیە «وَلاَ يَنْتَهِبُ نَهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ» مەبەست پێی (والله أعلم) بردنی شت و ڕفاندنێتی یان هی ئافرەت هەندێک جار کە لەو کاتە خەڵک چاوی تێدەبڕێ کە ئەویش ئیشەکە ئەنجام دەدا و دەیبا و داگیری دەکا بڕواداربێ پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ).

ئینجا ابن تيمية شیدەکاتەوە و وتەی خۆی دەهێنێ دەفەرموێ (ونقول) (ونقول) مەبەست پێی چیە؟ ئەو زانا بەڕێزانە خۆیان پێ گەورە نەبوە خاوەنی تەواضوع و خاکی بونە هەتا نونی عەضەمە بۆخۆیان بەکار بێنن بڵێن منی گەورە وا دەڵێم، نا دەفەرموێ (ونقول) لە مەسائیلی عەقیدە ئیمامی تەحاویش کە دەفەرموێ (ونعتقد) مەبەستیان پێی ئەوەیە یەعنی ئێمەی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە نەبێ تەنها ابن تيمية بۆچونی وابوبێ. کە دەڵێ (ونقول) نونەکەی چوەتە سەر (نقول) ئەگەر بیگوتبا من وا دەڵێم دەیگوت (أقول) کە نون هەندێک جار بۆ عەضەمەتە کە خۆی پێ گەورەبێ (پەنا بە الله) بە دڵنیاییەوە ئەو پیاوە باشانەی پێشان و ئەو زانایانە ئەوەندە خاکی و موتەواضیع بونە قەت خۆیان پێ گەورە نەبوە کە دەڵێن (ونقول) لە دەربارەی عەقیدە نونەکە نونی جەماعەیە بە مەعنای ئێمەی ئەهلی سونە و جەماعە وا دەڵێین ئەو کەسەی تاوان دەکا فاسقە کە کوفر ناکا یان بڕوای بە حەڵاڵی تاوان و گوناحەکە نیە (هُوَ مُؤْمِنٌ نَاقِصُ الإِيمَانِ) لە پێناسەی ئەهلی سونە و جەماعە چ ناز ناوێک و ناوێکی بۆ دادەنرێ؟ دەگوترێ ئەوە بڕوادارە بەڵام ئیمان و بڕواکەی کەم و کورتە (أَوْ مُؤْمِنٌ بِإِيمَانِهِ فَاسِقٌ بِكَبِيرَتِهِ) یان پێی دەگوترێ بایی ئەوەندە بڕوادار و ئیماندار موئمینە بە بڕوادار لە قەڵەم دەدرێ وە بە گوناح و تاوانە کەبیرەکەش کە ئەنجامی داوە فاسقە هەردوو ناو بەخۆیەوە هەڵدەگرێ، لە یەک کاتدا ئیمانداره و بایی ئیمانداریەکەی موئمینە

ناوی بە بڕوادار دەبردرێ وە لە هەمان کاتدا مادەم تاوان و گوناحی گەورەشی کردوە بە تاوان و گوناحە گەورەکەشی پێی دەگوترێ فاسق یەعنی ئیماندارێکی فاسق (فَلاَ يُعْطَى الاسْمَ الْمُطْلَقَ، وَلاَ يُسْلَبُ مُطْلَقَ الاسْمِ) ئەوەبوو کە لەپێشتر ڕونکردنەوەماندا جا نە ناوی ڕەهای پێدەدرێ وە نە ڕەهای ناوی لێ دەستێنرێتەوە بەو مانایەی (اسْمَ الْمُطْلَقَ) بە مانای ئەوەی ناوێکی سەد لە سەدی بڕواداری پێ نادرێ ناگوترێ بڕوادارێکی سەد لە سەدە بێ کەم و کورتی وە (مُطْلَقَ الاسْمِ)یشی لێ ناسێنرێتەوە کە بڵێی هەر بڕوادار نیە و ئیمانی لێ بستێنرێتەوە بەڵکو دەگوترێ بڕوادارێکی تاوانبارە بڕوادارێکی بڕوا نوقسان و کەم و کورتە یان بڕوادارێکی فاسقە.

کەواتە ئەوەی ئەگەر لەسەری بڕۆین و زۆریشی لەسەر بڵێین هەر ئەوەیە خەواریج لێرە زۆر تێپەڕیان کردوە کە مرۆڤەکان وە بڕوادارەکان هەندێک جار بە گوناح و تاوانێکی گەورە کافریان دەکەن (پەنا بە خوای رب العالمين) دەڵێن لە بازنەی ئیسلام دەردەچێ هەر یەکێک لە عەقیدەی خەواریجەکان ئەگەر زینای کرد بڕوای بە حەڵاڵی زیناش نەبوو ئەگەر ڕیبای خوارد ئەگەر قەتڵی کرد هەریەک لە تاوان و گوناحە گەورەکانی ئەنجامدا دەڵێن ئەوە کافر بوو تەواو لە ئیسلام چوە دەرەوە ئەوە حوکمی دونیای، لە قیامەتیش دەڵێن هەمیشەیی دەبێ لە ئاگری جەهەنەم وەکو ئەبو جەهل و کافرەکانی تر (پەنا بە خوای رب العالمين)، موعتەزیلەکان وەکو خەواریجەکان دەڵێن لە ئیسلام دەردەچێ بە کردنی تاوان و گوناحە گەورەکە بەس وەکو ئەوان ناڵێن بڵێن کافر دەبێ دەڵێن لەو ناوە دەمێنێتەوە لە ئیسلام دەردەچێ بەڵام داغڵی کافر بون و کوفریش نابێ، بەڵام لە قیامەتدا وەکو خەواریجەکانن دەڵێن بەهۆی ئەو گوناحە گەورە هەمیشەیی دەبێ لە ئاگری جەهەنەم و دۆزەخ، ئەهلی سونە و جەماعە وا ناڵێن.

(المنزلة بين المنزلتين) یەکێکە لە پێنج بنەماکانی موعتەزیلەکان چونکە موعتەزیلەکان بڕوایان بە پێنج بنەما هەیە یەعنی پێنج ڕوکنیان هەیە ئەوان نەک وەکو ئەهلی سونە و

جەماعە شەش ڕوكنی ئیمان ئەوان دەڵێن: یەكەم ڕوكن تەوحیدە، دووەمیان عەدلە، سێیەمیان (إنفاذ الوعید)ە، وە چوارەمیان (المنزلة بین المنزلتین)ە، وە پێنجەمیان فەرمان بە چاكە و ڕێگری لە خراپەیە، بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وایە دەڵێن هیچ كەسێک نیە بە كردنی تاوانەكان ئەگەر تاوان و گوناحەگە گەورەترین تاوان و گوناحیش بێ مادەم شیرک و كوفر نەبێ لە ئیسلام دەرناچێ و وە داغڵی كوفریش نابێ بەڵكو هەڵسوكەوتی موسڵمانانەی لەگەڵ دەكرێ بایی ئەوەندەی بڕواداره و موسڵمانە دەبێ وەلائت بۆی هەبێ خۆشت بوێ سەریبخەی وە بایی گوناح و تاوانەكانیشی دەبێ لێی بەریبی لەگەڵیدا نەبی نەسیحەت و ئامۆژگاری بكەی وە لەگەڵ گوناح و تاوانەكانیدا نەبی، بۆ قیامەتیش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە كەسێک ئەگەر تاوان و گوناحی گەورەشی كرد مادەم لە ئیسلام دەرنەچوو دەكەوێتە ژێر مەشیئەت و ویستی الله تعالی ئەگەر تەوبەشی لێ نەكا ئەگەری ئەوەی هەیە الله بە بەخششی خۆی لێی خۆشبێ وە ئەگەری ئەوەشی هەیە بە عەدالەت و دادوەری خۆی عەزابی بدا و لێشی خۆش نەبێ ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

بەڵام لێرەدا چەند دەقێک هەیە وەكو ئایەت وەكو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ماناكانیان ئایە چۆن دەكرێ؟ كە باسی ئەوەی تێدا هاتوە خەڵكانێک بە گوناحی گەورە زاهیر و ڕواڵەتیەكەی ئەگەر تێی بڕوانی لە نەص و دەقەكەی ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە هەمیشەیی بێ لە ئاگری دۆزەخ یان بڕوا و ئیمانی لێ بستێنرێتەوە و بە بڕوادار لە قەڵەم نەدرێ، زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە ئیختیلاف و جیاوازییان هەیە لە پێناسەی وە لە تەفسیر و ڕاڤەی ئەو ئایەت و دەقانە وە ئەو حەدیس و فەرمودانە بۆ نمونە یەک لە ئایەتەكان كە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا﴾ [النساء: ٩٣] خوای رب العالمین دەڵێ هەر كەسێک بڕوادارێک بە عەمدەن و ئەنقەست بكوژێ ئەوە تۆڵەكەی ئاگری دۆزەخی

هەمیشەییە تێیدا یەعنی بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە: ﴿خَـٰلِدًا فِيهَا﴾ وە الله غەزەبی لێ دەکرێ وەبەر لەعنەتی خۆی دەخا وە عەزابێکی زۆر مەزنی بۆ ئامادە کردوە.

باشە: ﴿خَـٰلِدًا فِيهَا﴾ ئەگەر بە مانای ئەبەدی بون و هەمیشەیی بون بێ کەسەکە ئەگەر بڕوای بە حەڵاڵ بونی قەتڵیش نەبێ خۆ قەتڵ تەنها گوناح و تاوانێکی کەبیرەیە بۆچی هەمیشەیی دەکا لە ئاگری جەهەنەم؟ جا موفەسیرینی ئەهلی سونە و جەماعە ئیختیلاف و جیاوازیان هەیە لەسەر تەفسیری ئەو ئایەتە، ئایە هەمیشەیی بونەکە: ﴿خَـٰلِدًا فِيهَا﴾ قەت قەت نایەتە دەرەوە وەکو کافر و بێ بڕوایەک ئەگەر کەسێک کەسێکی کوشت؟ هەندێک لە ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن ئێمە زاهیریەکەی وای تەفسیر دەکەین و ناچین بەدوادا چونی تری بۆ ناکەین و (والله أعلم بمراده) خوای رب العالمین دەزانێ مەبەستی چیبوە و چی بەسەر دەهێنێ ئێمە زاهیریەکەی وا دەڵێین، بەڵام بۆچونی پەسەند و زۆرینەی ئەهلی سونە و جەماعە لەگەڵ ئەوەدایە کەسەکە ئەگەر بە حەڵاڵی نەزانی بێ دوو تەفسیری بۆ دەکەن، دەڵێن ئەوە لە حاڵەتێکدا ئەگەر قەتڵەکەی بە حەڵاڵ زانیبێ کەواتە کافر بوە و هەمیشەیی دەبێ لە ئاگری جەهەنەم گوناحەکەی پێ حەڵاڵ بوە لەبەر ئەوە کافر دەبێ وە ئەگەر بە حەڵالی نەزانی هەمیشەیی نابێ بەو مانایەی کە قەت دەرنەچێ لە ئاگری دۆزەخ وەکو کافر و بێ بڕواکان ڕۆژێک دادێ دەردەچێ بەڵام وەکو تەهدیدێکە بە واتای زۆر زۆر دەمێنێتەوە لە ناویدا مادەم تەوبەی نەکردبێ، چونکە لەوەوە هاتوە ئەهلی سونە و جەماعە جیاوازییان بۆ دروست بوە ئایە تەوبەی قاتڵی عەمد بکوژی ئەنقەست کەسێک کەسێک بە ئەنقەست بکوژێ بڕواداربێ کەسەکەی تر ئایە تەوبەی لێ قبوڵە یانە نا؟ دوو بۆچون هەیە بۆچونی زۆرینەی هەرە زۆری ئەهلی سونە و جەماعە بە پێداگرییەوە دەڵێن تەوبەی لێ قبوڵە تەنها ابن عەباس نەبێ و چەند زانایەکی کەم لە ژمارە شوێنی ابن عەباس کەوتون، لە یەک لە ڕیوایەتەکانی لە ابن عەباس کراوە دەڵێ تەوبەی لێ قبوڵ نابێ (والله أعلم بالصواب).

یان خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿فَمَن جَاءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ * يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ﴾ [البقرة ٢٧٥-٢٧٦] سەبارەت بە ڕیبا خۆر خوای رب العالمین دەفەرموێ ئەوەی ئامۆژگاری لە الله تعالى وە بۆ هاتبێ لەو ئیش و کارەی کە لە ڕابردودا كردویەتی فەرمان و وەزع و كار و بارەكەی دەكەوێتە دەست خوای رب العالمین جا ئەوانەی بگەڕێنەوە سەر تاوان و گوناحەكە خوای رب العالمین دەفەرموێ پەند وەرنەگرن: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ كە پەندی وەرنەگرن و بگەڕێنەوە سەر گوناحەكە بە مەعنای ڕیبا خۆری بكەن نەک بچن كافر ببن پێشتر باسی ئەوەیە، دەڵێ ئەوانە لەناو ئاگری جەهەنەمدا خالید و هەمیشەین.

جا ئایە بە ڕیبا خواردن كە ڕیبا یەكێكە لە تاوانە گەورەكان كەسەكە هەمیشەیی دەبێ لە ئاگری دۆزەخ و جەهەنەم؟ وەكو گوتمان ئەهلی سونە و جەماعە ئێستا دێین هەموو دەقەكان دەخوێنینەوە ئینجا بۆچونەكانیان دەڵێین با یەک یەک لەسەریان نەوەستین و نەڵێین تەنها هی مەسەلەی قەتڵ تایبەتمەندتر بوو ئینجا ئەهلی سونە و جەماعە ئیختیلاف و جیاوازییان هەیە هەندێكیان دەڵێن زاهیرەن ئێمە تەفسیری دەكەین (وأمرهم إلى الله) مادەم الله تعالى وای فەرموو، هەندێكیش دەڵێن نا مەبەست پێی هەمیشەیی بونی تەواوی سەدا سەد نیە وەكو كافرەكان مەگەر بە حەلاڵیان دانابێ ئەوەیان بۆ هەیە.

یان خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾ [النساء: ١٠].

ئەو ئایەت و دەقانە وە چەندین فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) كە پێغەمبەر فەرمویەتی: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ[1]» لە ئێمە نیە، ئایە لە ئێمە نیە یەعنی لە بڕواداران نیە و لە بازنەی ئیسلام دەردەچێ؟ بەو مانایە دێ؟ ئەوەی كە

[1] **صحيح البخاري** (١٢٩٧) (١٢٩٤) (١٢٩٨)، **صحيح مسلم** (١٠٣)، **سنن الترمذي** (٩٩٩).

لە ڕوی خۆی بڕنێنتەوە و لە ڕوو و دەموچاوی خۆی بدا یان شمەک و جل و بەرگەکەی دابڕزێنێ و دابدڕێنێ لەو کاتەی یەکێکی لێ دەمرێ یان هاوار هاواری جەهالەت و نەفامی بکا دەنگی لێوە بێ و یان سەر دولکە و ئەوانەی کە ئافرەتان دەیکەن لە کاتی مردویان لێ دەمرێ ئەوە بکەن.

یان لە فەرمودەی تریش دەفەرموێ: «مَنْ عَقَدَ لِحْيَتَهُ، أَوْ تَقَلَّدَ وَتَرًا ، أَوِ اسْتَنْجَى بِرَجِيعِ دَابَّةٍ أَوْ عَظْمٍ، فَإِنَّ مُحَمَّدًا بَرِيءٌ مِنْهُ[١]» هەریەک ئەو شتانەی کرد پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) کە ڕیشی خۆی گرێدا و تێکی لولدا وە لە پاشان دەفەرموێ بە پاشماوە و تەرسی وڵاخ و حەیوان خۆی پاککردەوە و تارەتی گرت پێغەمبەر (ﷺ) لێی بەرییە، لێ بەریبونی پێغەمبەر بە مەعنای ئەوەی کەسەکە کافرە و دەچێتە بازنەی کوفر لە ئیسلام دەردەچێ یان نا؟

وە لە فەرمودەی تر پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): «مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا[٢]» هەریەک غەشی کرد لە ئێمە نیە، ئایە تەواو لە ئیسلام دەردەچێ؟

جا ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەو دەقانە ئایەتەکانی ڕابردوو و ئەو فەرمودانەی پێغەمبەر و (ﷺ) دەق و نمونەی تریش هەن دەفەرمون ئێمە لە زاهیریەکەی وەریان دەگرین زاهیری و ڕواڵەتیەکەی چیە؟ بۆ ئەوەیە زاهیری و ڕواڵەتیەکەشی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون هەتا خەڵکەکە سەر زەنشتربێ زیاتر وە زیاتر پەند و عیبرەت و وانە وەربگرێ زەجر ببێ واز بێنێ لەو کار و ئیشانە، لەگەڵ ئەوەدا هەندێکیش لە ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن نا ئێمە تەئویلی دەکەین بە مەعنای تەفسیر کردنەوە ئەویش تەئویلەکان بەو واتایەی بۆ نمونە ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: (قد تأول كثيرا منها وحاول صرفها، وأكثر العلماء قالوا: إنها في مستحل ذلك) دەفەرموێ ئێمە تەئویلی دەکەین دەیگۆڕین زۆربەی

[١] سنن النسائي (٥٠٦٧)، سنن أبي داود (٣٦)، مسند أحمد (١٦٩٩٥) (١٦٩٩٦) (١٧٠٠٠).

[٢] صحيح مسلم |كتاب: الإيمان| باب: من غشنا فليس منا.

زانایان بۆچونیان وایە دەڵێن ئەوە لەو حاڵەت و کاتانە ئەو دەقانە وا بەکاردێ و کەسەکە لە ئیسلام حیساب نابێ و هەمیشەیی دەبێ لە ئاگری جەهەنەم ئەگەر گوناح و تاوانەکەی بە حەرام نەزانی بە حەڵاڵی زانی حەڵاڵی کرد بە حەڵاڵ کردنەکەش پێی کافر دەبێ لە ئیسلام دەردەچێ ئەوکات هەمیشەیی دەبێ (يعني محمولة على من فعل ذلك مستحلا) ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ ئاوا بڕیار دەدرێ حەمل دەکرێتە سەر ئەوەی کە هەریەک ئەو کار و کردەوەی کرد و پێی حەڵاڵ بوو (بخلاف ما إذا فعله متأولا أو متساهلا في اعتقاده للتحريم) بە پێچەوانەی ئەوەی ئەو کەسە هەمیشەیی نابێ و لە بازنەکەی دەرناچێ و بەڕائەتی پێغەمبەر (ﷺ) لێی نابێ بەو مەعنایەی بە کافری دابنێ و بە موسڵمانی دانەنێ یان کە دەڵێ لە ئێمە نیە کەسێک بێ تەئویلێکی لە دەست بێ یان کەمتەرخەم بێ لە بیروبڕوابون بەوەی شتەکە حەرامە (فإنه لا يخرج من الملة) ئەو کەسە لە ئیسلام دەرناچێ (ولا يدخل في الكفر) ناچێتە بازنەی کافرەوە (ولا يحكم بخلوده في النار) بڕیاری هەمیشەیی بونی لە ئاگری جەهەنەم بەسەردا نادرێ (وذلك لأنه جاءت مع هذه الأحاديث التي في الوعيد أحاديث أخرى كثيرة في الوعد وفي إخراج الموحدين من النار[١]) لەبەر ئەوەی چونکە لەپاڵ ئەو فەرمودانەوە چەندین فەرمودەی تری پێغەمبەریش هاتوە (ﷺ) کە وەعد و بەڵێنی تێدایە بەوەی کە ئەهلی تەوحید کەسێک کە ئیمانی هەبێ لە ئیسلام دەرنەچوبێ بە گوناح و تاوانەکان نیە ئەگەر بە گوێرەی گوناح و تاوانیشی بچێتە ئاگری دۆزەخ هەر دەردەچێ لە ئاگری دۆزەخ قەت هەمیشەیی نابێ.

ئینجا ئەو ڕونکردنەوە و هەڵوێستەیە گرنگ و موهیم بوو پێمان لەبەر ئەوە لەسەری وەستاین، هەندێک لە زانایان دەربارەی ئەو فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) کە پێغەمبەر فەرمویەتی: «مَن قَتَلَ نَفْسَهُ بحديدَة» یەک خۆی بە ئاسنێک بکوژێ «فحديدته يجأ بها نفسه في نار جهنم خالدا مخلدا فيها أبداً» ئەو ئاسنەی کە خۆی پێ کوشتوە وای لێدەکا

[١] في أول المجلد الثاني في الجزء الثالث من صحيح مسلم وغيره.

هەمیشەیی بکا لەناو ئاگری دۆزەخ و قەتاوقەت لێی دەرنەیە، لە پاشان «ومن تحسى سما فقتل نفسه» هەریەک دەستی لە ژەهرێکدا و یان خواردی خۆی پێ کوشت «فسمه في يده يتحساه في نار جهنم خالدا مخلدا فيها أبدا» ئەو ژەهرە هەر لە دەستیەوە دەبێ و لە قیامەتیش هەر وا لەخۆی دەکاتەوە و دەیهاوێتە ناو ئاگری دۆزەخ بە هەمیشەیی «ومن تردى من جبل فقتل نفسه» هەریەک خۆی لە شاخێک بهاوێ و خۆی کوشت (ئینتیحار کرد) «فإنه يتردى في نار جهنم خالدا مخلدا فيها أبدا[1]» لە ئاگری جەهەنەم هەر وای بەسەر دێتەوە و دەچێتە سەر شاخێک و خۆی هەڵدەداتەوە و هەر دەکوژرێتەوە بە هەمیشەیی دەبێ لەناو ئاگری دۆزەخ و جەهەنەم.

ئینجا ئایە ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی ئەو حەدیسەش چی دەڵێن؟ کەسێک بکوژی خۆی بێ خۆی ئینتیحار بکا پێشتریش بڕواداره (ئیماندارە) لەو حاڵەتەی کە خۆی دەکوژێ تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە کە بە ئەنقەست موسڵمانێکی کوشتوە کە خودی خۆیەتی، ئایە ئەوە هەمیشەیی دەبێ لەناو ئاگری جەهەنەم؟ ئەهلی سونە و جەماعە وەکو گوتمان ئەوانەی کە تەئویلی دەکەن و تەفسیری دەکەن دەڵێن حەمل دەکرێ لەسەر ئەوەی کەسێک خۆ کوشتنی پێ حەڵاڵ بێ بەڵام ئەگەر پێی حەرامە و شەیتان کارەکەی پێکردوە و نەفس پێی کردوە ئەوە هەمیشەیی نابێ هەتا هەتایی لەناو ئاگری جەهەنەم و بمێنێتەوە ئەوە بۆ کەسێکە کە پێی حەڵاڵ بێ ئەو هەمیشەییە (والله أعلم بالصواب)، جا کەسێک ئەگەر خۆشی دەسوتێنێ پێی حەڵاڵ بێ هەر وایە ئەگەر کەسێک بە هەر ئالەت و شتێک هۆی بکوژێ هەر وایە.

هەندێک لە زانایانیش بۆچونیان وایە لەوانە شێخ عبد الله بن جبرين -رحمه الله- دەفەرموێ بەڵکو حەدیسەکانی وەعید ئەولاتر و باشتر وایە، حەدیسی وەعید یانی چی؟ مەبەستی پێی ئەو فەرمودانەی دەربارەی وەعید یەعنی تۆڵە سەندنەوەی تێدایە، باشتر وایە لەسەر

[1] **أخرجه البخاري برقم (٥٧٧٨) في الطب، باب: "شرب السم والدواء به". ومسلم برقم (١٠٩).**

زاهیری و ڕواڵەتەکانی خۆی تەفسیر بکرێ و وەربگیرێ هەتا خەڵکەکە چاکتر توشی کشانەوە و دەستبەرداربێ لەو تاوان و گوناحانە زەجربێ و وە ترسی لێ بنیشێ وە لەگەڵ ئەوەشدا بڕواشمان وابێ ئەوەی ئەهلی تەوحیدبێ جا ئەو کار و ئیشانەش لەگەڵ خۆی ئەنجام بدا و بشیکا کە لە فەرمودەکان هاتوە مادەم تەوحیدی هەر لەلا مابێ و خاوەن تەوحیدبێ هەمیشەیی نابێ لەناو ئاگری جەهەنەم مادەم لەسەر ئیمان و تەوحید مردبێ ئیلام بە قەدەر تاوان و گوناحەکەی دەسوتێنرێ و ئەزیەت دەدرێ.

جا ئەوەبوو کە دەڵێ ابن تیمیة فەرمویەتی (إن أهل السنة يقولون في صاحب الكبيرة: إنه لا يُعطى اسم الإيمان المطلق، ولا يسلب مطلق الإيمان) جا ئەو فەرق و جیاوازییە لەو نێوانەدا ئەوەیە کە ئەگەر دەڵێین ئیمامی موتڵەقی نیە یانی ئیمانی کامیلی نیە و تەواوی نیە ئیمانەکەی نوقسانە و کەم و کورتە بەوەی کە تاوان و گوناحی ئەنجام داوە، وە کاتێکیش کە دەڵێین (مطلق الإيمان)ی لێ ناسێنرێتەوە و لەسەری ڕەش نابێتەوە بە مەعنای ئەوەی ناوی ئیمانی لەسەر ڕەش نابێتەوە و ناوی کافر لە شوێنی دابنێی هەر پێی دەگوترێ ئیماندار بەس ئیماندارێکی ئیمان نوقسان و کەم و کورت.

بیروبڕوای ئەهلی سونە و جەماعە سەبارەت بە تەکفیر کردن بە کورتی و پوختیەکەی ئاوایە، ئەهلی سونە و جەماعە مام ناوەندن لەوەدا کە خەڵکی ئاسان تەکفیری ناکەن و بە کافری دانانێن چونکە ئەو بڕیاردانە بڕیاردانی خوای رب العالمين ە -جل شئنه- لە دەست هیچ کەسێک نیە کەسێک کافر بکا مەگەر خوای رب العالمين کافری کردبێ، ئینجا بە کافر دانانی ڕێباز و بەرنامەیەک و خەڵکانێک بە گشتی بەبێ تەعین کردن و دیاری کردن ئەوە ڕێبازی ئەهلی سونە و جەماعەیە ئەوەی بە بەڵگەی قورئانی و سونەتی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) جێگیر بوبێ بڕیاریان لەسەر داوە و ڕایان گەیاندوە بەبێ دوو دڵی بەڵام دیاریکردنی کەسێک و پێی بڵێی کافرە ئەو کەسە کوفری بەسەردا بڕیار بدەی ئا ئەوەیان لەلای ئەهلی سونە و جەماعە کارێکی یەکجار قورسە ئاسان نیە، لەبەر ئەوە چیان کردوە

ئەهلی سونە و جەماعە -رحمهم الله-؟ زانایانی پێشین هەستاون زەوابیتیان بۆ داناوە چوار چێوەیەكیان بۆ داناوە چەند مەرجێكیان داناوە مەرجی كافر بونە وە چەند قەدەغەیەكیشیان داناوە دەڵێن ئەگەر هەر كەسێک ئەو مەرجانەی لێ هاتەجێ قەدەغەكان و مانیعەكان نەبوو ئەو كاتە بۆت هەیە بڕیاری لەسەر بدەی كافر بوە، كەواتە هەندێک جار مەرجی كافر بونی لێ دێتەجێ بەڵام قەدەغەیەک لە قەدەغەكان مانیعێک لە مانیعەكان لێ ناگەڕێ تۆ بڕیاری كافر بونی لەسەر بدەی.

بۆ نمونە ئەگەر كەسێک كوفر بەسەر زمانیدا هات بەڵام لە حاڵێكیدا ئەو كەسە زۆرە ملێی لێ كرابوو تفەنگ لەسەر سەری ڕاگیرابوو واتە كەسەكە (مكره) بوو زۆرە ملێی لێكرابوو بە مەرجە شەرعیەكانی موكرەهیەوە هەموی لێ هاتبوەجێ ئەو كەسە ئەگەر بەسەر زمانیشیدابێ كوفرەكە پێی كافر نابێ وەكو عەماری كوڕی یاسر لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَـٰنِ﴾ [النحل: ١٠٦] دڵی جێگیر بوە لەسەر ئیمان بە زمان وایگوتوە بەڵام لە ترسان بوە چونكە دەیانكوشت و بڕیاری كوشتنیان لەسەر دابوو، كەواتە ئەگەر مەرجی كافر بونیشی لێ بێتەجێ قەدەغە و مانیعێک هەبێ هەر نابێ كافری بكەی.

دوایە تێبینیەكی زۆر گرنگ ئەگەر كەسێكی ڕاوەستاو لە تەكفیر حاڵی كافرەكانی نەدەزانی ئەوە هەندێک جار عوزری بۆ هەیە بۆی ڕونكەوە بەڵگەكانی بۆ بێنەوە تێی بگەیەنە خەیرت پێ دەگا بەڵام ئەگەر بێو بڵێ هەر بە گشتی كەس كافر نیە لەسەر ڕوی زەوی و كەس بە كافر نازانم ئەوە كافر دەبێ (پەنا بە الله) چونكە ئەوانەی لە قورئان كە كافر كراون پێویستە پیر و گەنج و لاو و هەموو كەسێک شارەزابن بیزانن جولەكەكان دیانەكان موشریكەكان كە شیركی زاهیر و تەواو دەكەن ئا ئەوانە عوزر بە جەهل نەیانگرێتەوە كەسێكیش كە كافریان نەكا ئەوانەی بە ئیجماع و لە قورئان ناویان تۆمارە كافر دەبێ (والله أعلم بالصواب).

## باسی خۆشویستنی سەحابە و هاوەڵەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):

فَصْلٌ : وَمِنْ أُصُولِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ سَلاَمَةُ قُلُوبِهِمْ وَأَلْسِنَتِهِمْ لأَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) كَمَا وَصَفَهُمُ اللهُ بِهِ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَانِ وَلا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاًّ لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحشر: ١٠]، وَطَاعَةَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي قَوْلِهِ: ((«لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهُ لَوْ أَنَّ أَحدكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحدهِمْ وَلا نَصِيفَهُ» وَيَقْبَلُونَ مَا جَاءَ بِهِ الْكِتَابُ وَالسَّنَّةُ وَالإِجْمَاعُ مِنْ فَضَائِلِهِمْ وَمَرَاتِبِهِمْ.

---

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- دێتە سەر باس و خواسێکی تری جیا لەو باس و خواسە ئەویش دەربارەی خۆشویستنی سەحابە و هاوەڵەکانی پێغەمبەرە (ﷺ)، ئایە ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان چیە؟ وە سەبارەت بە ئەرکی سەرشانی ئێمە بەرامبەر بە سەحابەکان -رضي الله عنهم-، دەست بەو باس و خواسە دەکا چونکە پێچەوانەی بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعە دروست بوو لەوەدا سەرەتا شیعەکان کە زێدەڕەوییان کرد لە خۆشویستنی ئیمامی عەلی دوایە ئەوەبوو بونە ڕافیزە، وە نەواصیب و خەواریجەکان کە بێ ئەدەبی و بێ ڕێزی و سوکایەتیان کرد بە سەحابەکان تەنانەت بڕیاری کوشتنیشیان دان لەوەوە ئەوە پەیدا بوو کە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە لە پەرتوکەکانی عەقیدە ئەو بابەتە زیاد بکەن و باسی ئەوە بکەن پلە و پایەی سەحابەکان وە لە پاشان ئەرکی سەرشانی ئێمەی موسڵمان بەرامبەریان وە لە پاشان خۆشویستنی سەحابەکان و بێ ڕێزی لەگەڵ نەکردنیان.

دەفەرموێ (فَصْلٌ: وَمِنْ أُصُولِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ سَلاَمَةُ قُلُوبِهِمْ وَأَلْسِنَتِهِمْ لأَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)) دەفەرموێ یەکێکی تر لە بنچینە و بنەماکانی ئەهلی سونە و جەماعە دڵ سەلامەتیانە وە زمان سەلامەتیانە دەربارەی ئەسحابە و هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) وە -رضي الله عنهم-، واتە دڵیان سەلامەتە یانی کێشەیان نیە لە دڵەوە ڕقیان لێ نابنەوە بوغزیان بەرامبەریان نیە حەقدیان نیە ڕقیان لەگەڵیان نیە وە لە پاشان بە زمان سەلامەتن لەگەڵیان

بەو مانایەی قسەی نارێک و ناشایستە و سوکایەتیان پێ ناڵێن و ناکەن تەنها ڕێزیان لێ دەنێن، وە سەحابەکان کەواتە لە دڵ و لە زمانی ئەهلی سونە و جەماعە ئەمینن سەلامەتن، جا بۆچی گوتی هەر دڵ و زمان؟ ئەی لە کار و کردەوەکان؟ چونکە سەحابەکان ئێستا نەماون وە لە سەردەمی ابن تیمیەش نەمابون وەفاتیان کردوە ئەوەی شەهید بوە و ئەوەی وەفاتی کردوە جا تۆ بچی بە کردار هەرچیان لەگەڵ بکەی لەگەڵ گۆڕەکانیان لەگەڵ لاشە و جەستەکانیان ئەوانەی کە ئەگەر لاشە و جەستەیان مابێ و نەڕزیبێ لەناو گۆڕ و قەبرەکانیان وە ئەوانەی ڕزیشن لەگەڵ ئێسکەکانیان هەرچیان لەگەڵ بکەی هیچ ئازار و ئەزیەتیەک بەوان ناگا ئەو کاتە ئەو ئازار و ئەزیەتە هەر تاوان و گوناحە بۆ خاوەنەکەی چونکە ئەوان گەڕاونەتەوە خزمەت الله تعالی کە خۆشی پێداون و ڕێزی لێگرتون و لێیان ڕازییە بە کار و کردەوەی تۆ هەر سوکایەتیەک بە عەمەلی و کرداری لەگەڵیان بکەی ئەوە هیچ بەوان ناگا بەڵام سوکایەتی بە دڵ و بە زمان کە بڕیار دەدرێ زۆر خەتەرناکە ترسناکە ئەوە زەرەر و زیان بە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەگەیەنێ و وە گەیاندویەتی هەروەکو تیرە و تاقم و کۆمەڵەکان لەوانە شیعە و ڕافیزەکان وە خەواریجەکان هەریەک بە ئاستێک و لە ڕویەک بێ ڕێزییان کردوە هەندێکیان لە زیادە ڕەویی کردن لە خۆشەویستی و لێ نزیکبونەوەیان وە هەندێکیشیان لە کەمتەر خەمی بون بە بێ ڕێزی و سوکایەتی پێیان، جا لە پاشان دەفەرموێ (كَمَا وَصَفَهُمُ اللهُ بِهِ فِي قَوْلِــــهِ تَعَالَى) هەروەکو الله تعالی وەسفی ئەوانەی کردوە لە قورئانی پیرۆز، کە دەفەرموێ وەسفی ئەوانەی کردوە مەبەستی پێی ئەوەیە ئەهلی سونە و جەماعە دەبێ ئاوابن کە ئەو وەسفەیان هاتوە لە قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ خوای رب العالمين: ﴿وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَانِ وَلا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاًّ لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحشر: ١٠] واتە ئەوانەی کە تابیعین و شوێنکەوتەی سەحابەکانن لە ئەهلی سونە و جەماعە هەتا دەگاتە سەردەمی ئێمە و قیامەتیش الله وای

وەسف کردون ئاوان ئەهلی سونە و جەماعە کە لە دوای ئەوان هاتون دەڵێن ئەی خوای پەروەردگارمان ببورە لەو برایانەی ئێمە لەو خوشکانەی ئێمە کە لەپێش ئێمە هاتون بە ئیمان و بڕواوە وە لەناو دڵمان حقد و ڕق و کینە بەرامبەریان مەهێڵە و دامەنێ بۆ ئەوانەی کە لەپێش ئێمە هاتن لە بڕوادارەکان، کە کێ لەپێش ئێمە هاتوە؟ سەحابەکان لەپێش ئێمە هاتونە وە لە پاشان بۆ ئێمە تابیعیش هەر لەپێش ئێمە هاتوە تابیعی تابیعیش لەپێش ئێمە هاتوە و وە باقی موسڵمانەکانی تری ئەهلی سونە و جەماعە.

کەواتە ئەوە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە چونکە ئایەتەکانی پێشی ئەو ئایەتەی دەیەم واتە ئایەتی هەشتەم و نۆیەم خوای رب العالمین لە سوڕەتی الحشر چی فەرموە؟ فەرمویەتی: ﴿لِلْفُقَرَاءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ﴾دەفەرموێ هەژارە کۆچ ڕەوەکان کە موهاجیرینی مەککە بون چون بەرەو مەدینە ئەوانەی لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەرخران پارەو پولەکانیان دەستی بەسەردا گیرا ئەوانە دەرچون و هیجرەتیان کرد و کۆچیان کرد لە پێناو بەدەستهێنانی فەزڵ و بەخششی خوای رب العالمین وە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی الله تعالی وە سەرخستنی الله تعالی و پێغەمبەری الله (ﷺ) الله دەفەرموێ بەڕاستی ئەوانە ڕاستگۆن لەگەڵ ئیمان و عەقیدەکەیان.

جا ئەوانەی موهاجیر بون کێ بون؟ یەکەم ئەبو بەکری صدیق بوو، دوەم عومەری کوڕی خەتاب بوو، سێیەم عوسمانی کوڕی عەفان بوو، چوارەم عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بوو، وە باقی سەحابەکانی تریش کە هیجرەتیان کرد، جا: ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا﴾ مانای ئەوە دەگەیەنێ خاوەن ئیخلاس بون خوای رب العالمین ئەو بڕیارەیان بۆ دەدا نیەت پاک بون: ﴿وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ مانای ئەوە دەگەیەنێ کردەوە چاک بون بە عەمەل ویستیان الله تعالی و پێغەمبەری الله (ﷺ) سەربخەن، ئینجا لە پاشان: ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ﴾ مانای ئەوەیە ڕیاباز نەبون هەڵە و کەم و کورتیان نەبوو لەو بوارانەدا لەپێناو

ئەوەیان نەبوو خەڵکی پێیان بڵێ پیاوی باشن وە خەڵکی پێیان بڵێ پلە و پایەیان هەیە خەڵکی پێیان بڵێ ئازان تەنها ڕاستگۆبون لەگەڵ خوای رب العالمين لەپێناو ڕەزامەندی الله تعالى بوو -جل شئنه-.

ئینجا الله دەفەرموێ لە ئایەتی نۆیەمیش: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمۡ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٌ﴾ ئەمجارە باسی ئەنصارەکان دەکا خوای رب العالمين دەفەرموێ ئەوانەش کە لە ماڵی خۆیان دانیشتبون خاوەن ئیمان و بڕوابون وە پێشی ئەوەی کە ئەوانیشیان بچێتە لا ئەوانیان هەر خۆش دەویست لەپێناو خوای رب العالمين ئەوانەی هیجرەتیان دەکرد و بۆلایان دەچون موهاجیرەکانیان خۆش دەویست ئەنصاریەکان لە دڵیان هیچ شتێکیان نەدەهێشتەوە هەر شتێکی دونیاش ئەوانیان بەپێش خۆیانیان دەخست و ئیثاریان هەبوو لەگەڵیان ئەگەر بیو بۆخۆشیان پێی موحتاج و پێداویستبان بۆ شت و کارەکەی دونیا هەر ئەوانیان بەپێش خۆیان دەخست خاوەن ئیمان بون.

کەواتە خوای رب العالمين ئەنصاریەکانیشی بە سێ سیفەت وەسف کرد: یەکەم سیفەتی ئەنصاریەکان ئەوەبوو موهاجیرەکانیان خۆشدەویست، دوەم سیفەتیان ئەوەبوو لە دڵیان هیچ نەمابۆوە لەگەڵیان بە هیچ حقد و غەل و غەش و خیانەت و هیچ شتێکیان نەبوو، وە لە پاشان سێیەمیان ئەوانیان بە پێش خۆیان دەخست لە ئیش و کارەکانی دونیا و بەرژەوەندیەکانی دونیا ئیثاریان لەگەڵ بەکار دەهێنان، ئینجا لە پاش ئەو ئایەتانە الله دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ﴾ ئەوانەی لەدوای ئەوانیش دێن واتە تابیعیەکان هەتا ئێمە و هەتا قیامەتیش دەگرێتەوە.

لەبەر ئەوەیە ابن تيمية -رحمه الله- ئەو ئایەتەی بە بەڵگە هێنایەوە بۆ وەسفی ئەهلی سونە و جەماعە واتە ئەهلی سونە و جەماعە لە تابیعیەوە ڕابگرە هەتا ئێستا و هەتا قیامەتیش ئەوە وەسفیانە کە لەپاش ئەوان هاتون و دێن بیروبڕوایان وایە پاڕانەوە و دۆعا دەکەن دەڵێ

ئەی خوای رب العالمين لە براكانمان خۆشە ئەوانەی بە ئیمانەوە لەپێش ئێمە هاتبون كە سەحابەكانن بۆ ئێمە تابیعینیش و تابیعی تابیعینیش وە هەتا دەگاتە ئێمە هەمویان دەگرێتەوە لە زانا و شوێنكەوتوانی ئەهلی سونە و جەماعە، كەواتە ئەوە ئەوە دەگەیەنێ بەڵێ ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە بۆچونیان بوە و بۆچونیانە دۆعای خەیریان بۆ دەكەن بە باش ناویان دەهێنن حقد و غەل و غەش و خیانەتیان وە بوغز و رِق لێبونەوەیان نیە لەناو دڵیان بەرامبەر بە سەحابە بەرِێزەكانی پێغەمبەر (ﷺ) وە بەرامبەر زانایانی تری ئەهلی سونە و جەماعەی لەپێشتر هاتون و وە تێكرِای ئەهلی سونە و جەماعە.

لە پاشان ابن تيمية لە تەواو كردنی قسەكانی دەفەرموێ (وَطَاعَةَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي قَوْلِهِ) دەفەرموێ وە گوێرِایەڵی كردنی فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەر ئەهلی سونە و جەماعە چەسپیوە كە كردوشیانە و جێبەجێشیان كردوە كە پێغەمبەر وەسێتی كردوە بە ئومەتەكەی دەربارەی سەحابەكان كە پێیان دەفەرموێ: «لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهُ لَوْ أَنَّ أَحدكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحدهِمْ وَلا نَصِيفَهُ» كە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) جوێن فرِۆش مەبن بە سەحابەكانم واتە جوێنیان پێ مەدەن ئەمر و فەرمان دەكا بەوەی كە قەدەغەمان دەكا لەوەی جوێن بدەین بە سەحابەكان دەفەرموێ سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بە دەستە كە الله تعالى یە هەریەک لە ئێوە ئەگەر بە قەد كێو و شاخی ئوحود لە زێر ببەخشێ هێشتا ناگاتە چنگێكی سەحابەكان یان نیو چنگێكی ئەوان واتە نیو مست و گۆڵی ئەوان كە دەیبەخشن لەپێناو خوای رب العالمين.

دیارە كێشانی زێرِ وەزنكردنە و نەوعێكە لە كێشان جیاوازە بە مست و گۆڵم ناكێشرێ زێرِ، كەواتە هەندێک لە زانایان دەفەرمون بە مانای ئەوەی هێناوە ئەگەر ئێوە هەر شتێک ببەخشن كەم بێ یان زۆر سەحابەكان كەم یان زۆریان بەخشیبێ ئەگەر شتی بەقیمەتتر لەوانیش ئێوە ببەخشن بە قەد شاخی ئوحودیش بێ هەر لێتان قبوڵ نیە ئیلا خوای رب

العالمین ئێوە ناگەنە ئاستی ئەوان ئیلا خوای رب العالمین لەوانەچاکتر و زیاتر قبوڵی کردوە و پلە و پایەی ئەوان بەرزترە لە ئێوەوە.

ئینجا ئەو فەرمودە ئەوەش دەگەیەنێ کە نابێ و قەدەغە کراوین ئێمە جوێن فڕۆشی و قسەی ناشرین و سوکایەتی بە سەحابەکان بکەین وەسیەتی پێغەمبەرە (ﷺ) ئەهلی سونە و جەماعە هێناویانەتەجێ.

جا ئەو ڕوداوە ئەو ڕوداوە بوو کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید کێشەیەک ڕویدا لە نێوانیان ئەوەبوو خالیدی کوڕی وەلید قسەیەکی بەسەر زماندا هات بەرامبەر بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف کە قسەکە سوکایەتی بوو جوێن فڕۆشی بوو، جا پێغەمبەر کە بۆی گێڕدرایەوە (ﷺ) بە خالیدی فەرموو وە ڕویکردە سەحابەکانی تریش لەبەر ئەوەی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە پلەدارتر بوو لە خالیدی کوڕی وەلید چونکە ئەو یەکێک بوو لە موسڵمانە یەکەمیەکان کە موسڵمان بوو بوو لە موهاجیرەکانیش بوو، خالیدی کوڕی وەلید لەپاش هیجرەت بۆ مەدینە موسڵمان بوو بوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بە خالید وا فەرموو ئەی بە خەڵکانێک کە لەدوای سەحابەکان دێت تابیعینن یان تابیعی تابیعینن یان ئەوانەی سەردەمی ئێمەی ئێستا کە سوکایەتی بکەن بە سەحابەکان؟ ئەوە نەهی و قەدەغەکە زۆر لەسەریان جێگیرترە و گەورەترە و شتێکی یەکجار هەڵەیە دەرچونە لە بازنەی

ئەهلی سونە و جەماعە.

جا لە پاشان ابن تيمية دەفەرموێ (وَيَقْبَلُونَ مَا جَاءَ بِهِ الْكِتَابُ وَالسَّنَّةُ وَالإِجْمَاعُ مِنْ فَضَائِلِهِمْ وَمَرَاتِبِهِمْ) ئەهلی سونە و جەماعە وەریان گرتوە و قبوڵیان کردوە و دەیکەن ئەوەی لە ئایەتەکان و لە حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەر و (ﷺ) ئیجماعی ئومە دەربارەی پلە و پایە و مەرتەبە و دەرەجەی سەحابەکان چونکە سەحابەکان هەمویان لە یەک ئاست نین لە ڕوی فەزڵ و پلەداریدا هەندێکیان لە هەندێکیان مەزنترن.

ئاوا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە لە پەرتوکە دور و درێژەکان باسیان لێوە دەکەن: یەکەمیان عەشەرەی موبەشەرە پلە دارترن لە هەر هەموو سەحابەکان، لەناو عەشەرەی موبەشەرەش هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکان پلەدارترن لە شەشەکەی تر، لەناو ئەو چوارانەشیان ئەبو بەکری صدیق لە هەر چواران پلەدارترە، عومەری کوڕی خەتاب بە پلەی دوو دێ لەدوای ئەبو بەکری صدیق وە لەوانی تر پلەدارترە، ئیمامی عوسمان و ئیمامی عەلی -رضي الله عنهما- ئەو دوانە ئیختیلاف و جیاوازییان لەسەرە، ئایە عەلی پلەدارترە لە عوسمان یان عوسمان پلەدارترە لە عەلی؟ لەنێو ئەهلی سونە و جەماعەش، بەس بۆچونی پەسەند و ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە عوسمان پلەدارتربوە لە ئیمامی عەلیش پلەکە وا دێ ئینجا ئیمامی عەلی دێ ئینجا لە پاشان باقی ئەوانی تری عەشەرەی موبەشەرە.

مەرتەبەی یەکەم عەشەرەی موبەشەرەن و ئەو پلە دارییەش لەنێوان عەشەرەی موبەشەرە هەیە کە بۆمان گوتن، لە پاشان لە دوای عەشەرەی موبەشەرە موهاجیرەکان دێن ئەوانەی کە موهاجیرن پلەدارترن لە ئەنصاریەکان و باقی سەحابەکانی تر کە لەدوای هیجرەت موهاجیر نین و ئیمانیان هێناوە، لە پاشان پلەی بەدریەکان دێ، وە لەنێو موهاجیرەکانیش ئەوانەی ئەهلی بەدرن پلەدارترن لە سەحابەکانی تر، وە لە پاشان ئەوانەی لە پێش فەتحی مەککە بونە موسڵمان پلەدارترن لەوانەی لەدوای فەتحی مەککە بونە موسڵمان، ئینجا لە پاشان ئەوانەی لەدوای فەتحی مەککە بونە موسڵمان پلەی ئەوان دێ، ئاوا بەو پلە پلەییە ئەهلی سونە و جەماعە لەدوای یەکیان ڕیز دەکەن.

ئەوەتا خوای رب العالمین یش بۆ نمونە لە یەک لە ئایەتەکان دەفەرموێ وەکو ئەهلی سونە و جەماعە بڕوایان بەو ئایەتانە هەیە دەربارەی پلە و پایەکان کە دیاری دەکا خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿لا يَستَوِى منكُم مَّن أَنفَقَ مِن قَبلِ ٱلفَتحِ وَقَـٰتَلَ أُولَـٰٓئِكَ أَعظَمُ دَرَجَة مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعدُ وَقَـٰتَلُوا وَكُلّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلحُسنَىٰ﴾ [الحديد: ١٠] کەواتە الله تعالی لێرە پلەداری دادەنێ لەنێوان سەحابەکان، دەفەرموێ ئەوانە وەکو یەک ئاست نین سەحابەکان

هەر هەموویان ئەوانەی لەپێش فەتحی مەککە بەخشیویانە بە ماڵ و سامان وە لەپێش فەتحی مەککە وە لە پاشان جەنگ و جیهاد و تێکۆشان و کوشتاریان کردوە پلەیان بەرزترە لەوانەی کە لە دوای فەتحی مەککە بەخشیویانە و جەنگ و جیهاد و تێکۆشانیان کردوە لەگەڵ ئەوەدا هەموشیان خوای رب العالمین وەعد و بەڵێنی چاکە و زۆر چاکە کردنی لەگەڵ داون بە مەعنای ئەوەی هەموویان بەڕێزن پلە دارن بەڵام لەنێوان خۆیاندا هەندێکیان لە هەندێکیان پلەدارترن.

وە لە پاشان خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَـٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَـٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾ [التوبة: ١٠٠] یەکەمینەکانی پێشین کە لە موهاجیر و کۆچبەرەکانن وە لەگەڵ ئەنصاریەکان ئەوانەی شوێنی ئەوانیش کەوتون اللە تعالی لە هەر هەموویان ڕازییە و لە هەر هەموویان ڕازی بوە و ئەوانیش لە اللە ڕازین -جل شئنە-، کەواتە موهاجیرین و (ٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ) بە موهاجیرینی پێش ئەوانی تری خست و وە موهاجیرینی پێش ئەنصار خست و ئەنصار لەدوای ئەوان هێنا وە ئەوانەی شوێنی ئەوانیش کەوتون خوای رب العالمین پلەیەکی تری پێدان بەڵام لە کۆتاییەکەی لە هەر هەموشیان ڕازییە و ئەوانیش لە اللە ڕازین.

وە لە پاشان خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَـٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ﴾ [التوبة ١١٧] خوای رب العالمین تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەرەکەی لە موهاجیرین و لە ئەنصاریش، موهاجیرینی بەپێش ئەنصار خست ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون بەپێش خستنی موهاجیرین لەو ئایەتە یانی پلەدارترن لە ئەنصارەکان ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە.

ئینجا ئەهلی بەدریش حەدیسی سەحیح هەیە دەربارەیان کە پلەدارترن لە سەحابەکانی تر کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی اللە تعالی -جل شئنە- فەرمویەتی بە ئەهلی بەدر: «اعْمَلُوا مَا

شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ[1]» هەرچی دەکەن بیکەن ئەوەی دەتانەوێ بیکەن الله تعالی فەرمویەتی من لە ئێوە خۆشبومە.

لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن چۆن دەبێ و دەگونجێ الله تعالی بڵێ هەرچی دەیکەن بیکەن بێ منەت بن واتە لە گوناح و تاوان و ئەوانە تازە من لە ئێوە خۆشبوم؟ ئەوە پلەیەکە الله تعالی بە ئەهلی بەدری بەخشیوە چونکە الله عیلمی پێ هەبوو دەگەڕێینەوە سەر قەزاو قەدەر، ئەهلی سونە و جەماعە وا دەفەرمون الله عیلمی پێ هەبوو لە (اللوح المحفوظ)یشی نوسیبوو دەیزانی ئەهلی بەدر شتێکی وا ناکەن ببنە جەهەنەمی هەڵەی وا ناکەن کە تاوان و گوناحێکی گەورەبێ لەبەر ئەوە ئەو بڕیارەشی بەسەردان زانی لەو پلەدان ئەو پلەیەی بۆ ڕاگەیاندون مانا و واتاکەی ئاوا دەبێ ئەوە ڕاست و دروستەکەیە کە ئەهلی سونە و جەماعە دەیفەرمون.

## پلە داریەکان و مەرتەبەکانی سەحابەکان:

وَيُفَضِّلُونَ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ -وَهُوَ صُلْحُ الْحُدَيْبِيَةِ- وَقَاتَلَ عَلَى مَنْ أَنْفَقَ مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلَ. وَيُقَدِّمُونَ الْمُهَاجِرِينَ عَلَى الأَنْصَارِ. وَيُؤْمِنُونَ بِأَنَّ اللهَ قَالَ لأَهْلِ بَدْرٍ -وَكَانُوا ثَلاثَ مِائَةٍ وَبِضْعَةَ عَشَرَ-: «اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ[2]». وَبِأَنَّهُ لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحد بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ؛ كَمَا أَخْبَرَ بِهِ النَّبِيُّ (ﷺ) بَلْ لَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ، وَكَانُوا أَكْثَرَ مِنْ أَلْفٍ وَأَرْبَعِ مِائَةٍ. وَيَشْهَدُونَ بِالْجَنَّةِ لِمَنْ شَـهِدَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) كَالْعَشَرَةِ، وَثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بنِ شَمَّاسٍ، وَغَيْرِهِمْ مِّنَ الصَّحَابَةِ.

---

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- دێتە سەر ئەوەی کە تازە ئێمە بە کورتی باسمان کرد دەگاتە سەری کە ئایە پلە داریەکان و مەرتەبەکانی سەحابەکان دیارییکا دەفەرموێ (وَيُفَضِّلُونَ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ -وَهُوَ صُلْحُ الْحُدَيْبِيَةِ-) لەلای ئەهلی سونە و جەماعە پێش دەخسترێن

[1] صحيح البخاري (٣٠٠٧) (٣٠٨١) (٣٩٨٣)، صحيح مسلم (٢٤٩٤)، سنن أبي داود (٢٦٥٠).

[2] صحيح البخاري (٣٠٠٧) (٣٠٨١) (٣٩٨٣)، صحيح مسلم (٢٤٩٤)، سنن أبي داود (٢٦٥٠).

لە پلە و پایە ئەوانەی موسڵمان بونە پێشی فەتحی مەککە کە فەتح مەبەست پێی سوڵحی حودەیبیەیە چونکە ئەوانەی لەپێش سوڵحی حودەیبیە موسڵمان بونە ئەوانەی لە دوای سوڵحی حودەیبیە بە پاش فەتح حسابە چونکە سوڵحی حودەیبیە پێشەکی بوو بۆ فەتحی مەککە (وَقَاتَلَ عَلَى مَنْ أَنْفَقَ مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلَ) ئەوانەی تێیان کۆشاوە و جەنگاوەر بونە و بەخشیویانە لەپێناو خوای رب العالمين و موسڵمان بونە پێشی سوڵحی حودەیبیە پێشی فەتحی مەککە ئەوانە پلە دارترن لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بەسەر ئەوانەی کە لەدوای سوڵحی حودەیبیە و لەدوای فەتحی مەککە بونە موسڵمان و بەخشیویانە و جەنگاوەر بونە و کوشتاریان کردوە لە پێناو الله (وَيُقَدِّمُونَ الْمُهَاجِرِينَ عَلَى الأَنْصَارِ) وە ئەهلی سونە و جەماعە سەحابە موهاجیرە کۆچبەرەکانیان پێ پلەدارترە و بەپێشیان دەخەن بەسەر ئەنصاریەکان کە ئەوانەی لە مەدینە بون و پێغەمبەریان سەرخست (ﷺ) (وَيُؤْمِنُونَ بِأَنَّ اللهَ قَالَ لأَهْلِ بَدْرٍ) ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕواشیان وایە کە الله تعالى بە ئەهلی بەدری فەرموە، واتە بەو سەحابانەی بەشداری جەنگی بەدریان کرد کە ژمارەیان چەند بوو؟ (وَكَانُوا ثَلاثَ مِائَةٍ وَبِضْعَةَ عَشَر) ابن تيمية دەفەرموێ سێ سەد و هەندێک بون، سێ سەد و هەندێک لە ڕیوایەتەکانی سیرە (والله أعلم) سێ ڕیوایەتیان وەرگیراوە یان سێ سەد و سێزدە بونە یان چواردە یان حەڤدە ئەو ڕیوایەتانە لە ڕیوایەتەکانی تر لەپێشترن بەڵام هەندێک لە زانایانی مێژونوس و ئەهلی سونە و جەماعە سێ سەد و سێزدە ڕاجیح دەکەن کە دەفەرمون سێزدە (والله أعلم) یان چواردەیان شەهید بون لە سەحابەکانی بەدر جا ئەوانە بون کە ئەهلی سونە و جەماعە ابن تيمية دەفەرموێ بڕوایان وایە الله تعالى بە ئەهلی بەدری فەرموە بەوەندە سەحابەی فەرموە «اعْمَلُوا مَا شِئْتُم. فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ» هەرچی دەکەن بیکەن من لە ئێوە خۆشبوم (وَبِأَنَّهُ لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحد بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ) ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوایان وایە هیچێک لەو سەحابانەی لەژێر دارەکە بەیعەتیاندایە پێغەمبەر (ﷺ) ناچنە ناو ئاگری دۆزەخ (كَمَا أَخْبَرَ بِهِ النَّبِيُّ (ﷺ)) هەروەکو پێغەمبەر وا هەواڵی داوە

بە ئێمە و ئومەتەکەی، کە لە سەحیحی موسلیمدا لە (فَضَائِلِ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ) لە ئومی موبەشیر گێڕدراوەیە ئیمامی موسلیم هێناویێتی بە ژمارە (٢٤٩٦) دوایە لە درێژیدان فەرمودەکانیش دەهێنینەوە، دەفەرموێ (بَلْ لَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ، وَكَانُوا أَكْثَرَ مِنْ أَلْفٍ وَأَرْبَعِ مِائَةٍ) دەفەرموێ الله تعالى بەڵکو لە ئەوان ڕازییوو ئەوانەی بەیعەتیان دایە پێغەمبەر (ﷺ) لە ژێر دارەکە وە ئەوانیش لە الله ڕازیبون الله ئەو پلەشی پێ بەخشین وە ئەوانە زیاتربون لە هەزار و چوار سەد سەحابی، هەندێک نزیکیان دەکەنەوە لە هەزار و پێنج سەد سەحابی کە ئەوەش جابری کوڕی عەبدوڵا دەفەرموێ «قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ: أَنْتُمْ خَيْرُ أَهْلِ الأَرْضِ» دەڵێ پێغەمبەری الله (ﷺ) لە سوڵحی حودەیبیە وە لەو کاتەی بەڵێن و وەعد و بەیعەتمان پێیدا لە ژێر دارەکە فەرموی ئێوە چاکترینی خەڵکی سەر ڕوی زەوین «وَكُنَّا أَلْفًا وَأَرْبَعِمِائَةً[١]» جابر دەفەرموێ ئێمە هەزار و چوار سەد بوین.

ئینجا ابن تیمیة دەگاتە سەر ئەوە و دەفەرموێ (وَيَشْهَدُونَ بالجَنَّةِ لِمنَ شَهِدَ لَهُ رَسُولُ الله (ﷺ)) وە ئەهلی سونە و جەماعە شاهێدی چونە بەهەشتیش دەدەن بۆ ئەوانەی کە پێغەمبەری الله (ﷺ) شاهێدی بۆ داون (كَالعَشَرَةِ) کە عەشەرەی موبەشەرە پێغەمبەر (ﷺ) شاهێدی بۆدان کە لە حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە (وَثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ) وە لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بە جوداش شاهێدی بۆ ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسدا کە دەنگێکی جەوهەری هەبوو کە ئایەتی قورئان دابەزی لە هەڵوێستەکان لەسەری باسی لێوە دەکەین پێی وابوو ناچێتە بەهەشت لەبەر ئەوەی الله تعالى -جل شئنە- بە پێغەمبەری ڕاگەیاند (ﷺ) پێغەمبەر فەرموی بەڵکو ئەو بەهەشتیە ئەوەش موژدەیەکی تایبەتی بۆ درا کە بەهەشتیە، مادەم پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندوە بەهەشتیە ئەهلی سونە و جەماعە شاهێدی بۆ ئەویش دەدەن (وغيرِهم مِنَ الصَّحَابَةِ) وە جگە لە عەشەرەی موبەشەرە و لە ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسیش سەحابەی تریش هەبوە شاهێدی

[١] **صحيح البخاري** (٤١٥٤)، **صحيح مسلم** (١٨٥٦)، **مسند أحمد** (١٤٣١٣).

چونە بەهەشتیان بۆ دراوە لەوانە عوكاشە پێغەمبەر (ﷺ) شاهێدی بۆ داوە لەوانە دایكی ئیماندارانی هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) شاهێدیان بۆ دراوە كە لەوێش دەبنەوە هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە مەبەستی لەوەیە ابن تیمیة -رحمه الله-.

جا ئەو فەرمودەی كە باسی عەشەرەی موبەشەرە دەكا فەرمودەیەكی سەحیحە كە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «وَأَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ فِي الْجَنَّةِ[١]» ئەوانە عەشەرەی موبەشەرەن هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەكان ئینجا ئەو شەشەی تریش لە دوای ئەوان دێ ئەوانە تەواوی دەكەن.

جا لە پاشان هی ثابیت كە الله تعالى ئەو ئایەتەی دابەزاند فەرموی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا لَا تَرْفَعُوٓا أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ [الحجرات: ٢] كە ئەو ئایەتە دابەزی ثابیتی كوڕی قەیسی كوڕی شەماس دەنگێكی جەهوەری هەبوو دەنگیشی گەورەبوو لەوەوە ترسا عەمەل و كردەوەكانی هەڵوەشێتەوە و هیچی بۆ نەمێنێتەوە و نەچێتە بەهەشت جا لەو پێناوەدا ئەو هەواڵە بە پێغەمبەر گەیشت (ﷺ) پێغەمبەر فەرموی: «ارجع إليه وقل له: إنك من أهل الجنة[٢]» گوتیە ئەو هاوەڵە بەڕێزە بڕۆوە لای ثابیت پێی ڕابگەیەنە كە ئەو بەهەشتیە، كە پێغەمبەر (ﷺ) شاهێدی چونە بەهەشتی بۆ ثابیتی كوڕی قەیسی كوڕی شەماس یشدا لەبەر ئەوە ابن تیمیة لێرەدا ئەو ئاماژەی پێكرد.

---

[١] أخرجه أبو داود برقم (٤٦٤٩، ٤٦٥٠) في السنة. والترمذي برقم (٣٧٤٨،٣٧٥٧) في المناقب وقال عن الثاني: حسن صحيح. وابن ماجه برقم (١٣٣) في المقدمة وأحمد في المسند (١ / ١٨٧، ١٨٩) وصححه الألباني وهو في صحيح الجامع الصغير رقم (٥٠). وقال أحمد شاكر (١٦٢٩): إسناده صحيح.

[٢] أخرجه البخاري برقم (٣٦١٣) في المناقب، باب: علامات النبوة في الإسلام . ومسلم برقم (١١٩) في الإيمان، باب: مخافة المؤمن أن يحبط عمله . عن أنس بن مالك رضي الله عنه.

ئینجا جگە لە عەشەرەی موبەشەرە و جگە لە ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس ئەوانی تریش کە دەچنە بەهەشت لەوانە هەردوو نەوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) حەسەن و حوسێن کە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «إنهما سيدا شباب أهل الجنة[١]» فەرموی حەسەن و حوسێن دوو گەورەی گەنجەکانی بەهەشتن، کەواتە بڕیاری چونە بەهەشتی بۆ ئەوانیشدا.

وە لە پاشان دەربارەی فاتیمەی دایکی حەسەن و حوسێنیش کە کچی پێغەمبەرە (ﷺ) هاوسەری ئیمامی عەلی بوە -رضي الله عنه- پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «إنها سيدة نساء المؤمنين[٢]» ئەو گەورەی ئافرەتانی بڕواداره وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ گەورەی ئافرەتان بەهەشتە، کەواتە بەڵێ فاتیمەش یەکێکە لەو ئافرەتە سەحابیانە کە بەهەشتیە و پێغەمبەر شاهێدی بۆ داوە (ﷺ).

ئەوانە هەموی بەڵگەن لەسەر چی؟ لەسەر ئەوەی کە ابن تيمية -رحمه الله- فەرموی ئەهلی سونە و جەماعە شاهێدی دەدەن بە چونە بەهەشت بۆ ئەوانەی کە پێغەمبەر شاهێدی بۆ داون (ﷺ) کە بەهەشتین وەکو عەشەرەی موبەشەرە وەکو ثابیتی کوڕی زەیدی کوڕی شەماس وە جگە لەوانیش جا جگە لەوان وەکو حەسەن و حوسێن و وەکو فاتیمە و وە وەکو عوکاشە و باقی ئەوانی تریش دەگرێتەوە.

## تەفضیلی نێوان خەلیفە ڕاشیدیەکان:

وَيُقِرُّونَ بِمَا تَوَاتَرَ بِهِ النَّقْلُ عَنْ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ وَغَيْرِهِ مِنْ أَنَّ خَيْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا : أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرُ. وَيُثَلِّثُونَ بِعُثْمَانَ، وَيُرَبِّعُونَ بِعَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ؛ كَمَا دَلَّتْ عَلَيْهِ الآثَارُ، وَكَمَا أَجْمَعَ الصَّحَابَةُ عَلَى تَقْدِيمِ عُثْمَانَ فِي الْبَيْعَةِ. مَعَ أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ السُّنَّةِ كَانُوا قَدِ اخْتَلَفُوا فِي عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ـ بَعْدَ اتِّفَاقِهِمْ عَلَى تَقْدِيمِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ ـ أَيُّهُمَا أَفْضَلُ؟ فَقَدَّمَ قَوْمٌ عُثْمَانَ: وَسَكَتُوا، أَوْ رَبَّعُوا بِعَلِيٍّ، وَقَدَّمَ قَوْمٌ عَلِيًّا، وَقَوْمٌ

[١] أخرجه الترمذي برقم (٣٧٦٨) في المناقب. وأحمد في المسند (٣ / ١٦٦، ١٦٧) وقال الترمذي: حسن صحيح.
[٢] أخرجه مسلم برقم (٢٤٥٠) [٩٨، ٩٩] في فضائل الصحابة، باب: فضائل فاطمة بنت النبي عليهما الصلاة والسلام . عن عائشة رضي الله عنها.

تَوَقَّفُوا. لَكِن اسْتَقَرَّ أَمْرُ أَهْلِ السُّنَّة عَلَى تَقْدِيمِ عُثْمَان، ثُمَّ عَلِيٍّ. وَإِنْ كَانَتْ هَذِهِ الْمَسْأَلَةُ ـ مَسْأَلَةُ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ ـ لَيْسَتْ مِنَ الأُصُولِ الَّتِي يُضَلَّلُ الْمُخَالِفُ فِيهَا عِنْدَ جُمْهُورِ أَهْلِ السُّنَّة. لَكِن الَّتِي يُضَلَّلُ فِيهَا: مَسْأَلَةُ الْخِلاَفَة، وَذَلِكَ أَنَّهُمْ يُؤْمِنُونَ أَنَّ الْخَلِيفَةَ بَعْدَ رَسُولِ الله (ﷺ) : أَبُو بَكْرٍ، ثم عُمَرُ، ثُمَّ عُثْمَانُ، ثُمَّ عَلِيٌّ. وَمَنْ طَعَنَ فِي خِلاَفَةِ أَحد مِنْ هَؤُلاَءِ؛ فَهُوَ أَضَلُّ مِن حِمَارِ أَهْلِه.

---

جا لە پاشان ابن تیمیة دێت دەفەرموێ (وَيُقِرُّونَ بِمَا تَوَاتَرَ بِهِ النَّقْلُ عَنْ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ وَغَيْرِهِ مِنْ أَنَّ خَيْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا : أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرُ) جا دەفەرموێ ئەهلی سونە و جەماعە دانیش بەوەدا دەنێن کە بە موتەواتیری، موتەواتیر یانی چیە گوتمان؟ لە هەر چین و تەبەقەیەک خەڵکانێکی زۆر ڕیوایەت و گێڕانەوەی ئەو قسەیان کردبێ کە عەقڵ قبوڵی ئەوە نەکا ئەو خەڵکە زۆرە بەیەکەوە لەو چین و لەو تەبەقە کۆببێتەوە لەسەر قسەیەکی درۆیی، ئینجا دەفەرموێ بە تەواتورەوە گێڕدراوەیە و گواستراوەیە لە (لە أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ) گەورەی بڕواداران عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب -رضي الله عنه- وە جگە لەویش گێڕدراوەیە کە چاکترینی ئومەتی پێغەمبەر لە پاش پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئەبو بەکری صدیقە لەپاش ئەبو بەکری صدیقیش عومەری کوڕی خەتابە -رضي الله عنهما- ئەوەش پلە و پایەی ئەو دوو زادە بەڕێزە لەلای پێغەمبەر (ﷺ) گەورە بوە ئەوەتا لە سەحیحی بوخاری تۆمارە کە پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): «وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً[1]» یان موحەمەدی کوڕی حەنەفیە دەفەرموێ: «قُلْتُ لأَبِي : أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ؟» موحەمەدی حەنەفیەی کوڕی ئیمامی عەلی -رضي الله عنهما- دەڵێ لە باوکی خۆمم پرسی لەپاش پێغەمبەری الله (ﷺ) کێ پلەدارترە لە ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ)؟ «قَالَ : أَبُو بَكْرٍ» ئیمامی عەلی فەرموی ئیمامی ئەبو بەکرە «قُلْتُ : ثُمَّ مَنْ ؟» دەڵێ گوتم لەپاش ئیمامی ئەبو بەکریش کێ پلە دارترە لە هەموو ئومەتی پێغەمبەر

[1] صحيح البخاري (٤٦٧) (٣٦٥٦) (٣٦٥٧)، سنن الدارمي (٢٩٥٣)، مسند أحمد (٢٤٣٢) (٣٣٨٥).

(ﷺ)؟ «قَالَ : ثُمَّ عُمَرُ» لە پاشان ئیمامی عەلی فەرمووی ئیمامی عومەرە «وَخَشِيتُ أَنْ يَقُولَ : عُثْمَانُ، قُلْتُ : ثُمَّ أَنْتَ، قَالَ : مَا أَنَا إِلَّا كَرَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ[١]» دەڵێ ترسام کوڕی ئیمامی عەلی ئەگەر ئەمجارە لێی بپرسم بڵێ ئیمامی عوسمانە حەزم لێبوو باوکم بێ لەبەر ئەوە دەڵێ گوتم لە پاشان تۆی ئەی باوکە؟ دەڵێ گوتی نەخێر من تەنها پیاوێکم لە موسڵمانان، جا ئەو ڕیوایەتە ڕیوایەتێکی تریشی بەدوادا دێ کە لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەد هاتوە ئەو زیادەی لەگەڵە کە ئەلبانیش بە سەحیحی داناوە شێخ ئەحمەد شاکریش دەفەرموێ سەنەدەکەی سەحیحە کە فەرمووی «أَبو بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرُ، ولو شِئتُ لَسَمَّيتُ الثّالثَ» ئیمامی عەلی فەرمووی کوڕەکەم پلەدارترین پیاو و گەورەترین پیاو لە پاش پێغەمبەر (ﷺ) لە ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی ئەبو بەکرە، لەپاش ئەو ئیمامی عومەرە، ئەگەر سێیەمەکەشت دەوێ ئەویشت بۆ دەڵێم.

کەواتە ئەوانە بەڵگەن وەکو ابن تيمية فەرمووی لە مەتنی (الواسطية) هێنایەوە کە ئیمامی عەلی بە تەواتور لێی گێڕدراوەیە بە فەرموودە و ڕیوایەتی سەحیحەوە ئەوەندەی ڕێزناوە لە ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر وە لە ئیمامی عوسمانیش کە لەپێش خۆی ناوی هێناون بە تایبەت ئەبو بەکر و عومەر شیعەکان ئێستا ئەو بێ ئەدەبی و بێڕێزی و سوکایەتیەی دەیکەن بەرامبەریان ئیمامی عەلیش لێیان بەرییە وە قسەکانیان لەگەڵ قسەکانی ئیمامی عەلیش تێک ناکاتەوە -رضي الله عنه-.

لە پاشان ابن تيمية دەفەرموێ (وَيُثَلِّثُونَ بِعُثْمَانَ) ئەهلی سونە و جەماعە سێیەمیەکەی لەدوای ئەو دوانە ئەبو بەکر و عومەر عوسمان دادەنێن وەکو خەلیفەی ڕاشیدە وەکو پلە و پایەش (وَيُرَبِّعُونَ بِعَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) وە چوارەمینەکان تەواو دەکەن بە ئیمامی عەلی دەڵێن ئیمامی عەلی چوارەمینە نەک سێیەمینە (كَمَا دَلَّتْ عَلَيْهِ الآثَارُ) هەروەکو بەڵگە و ئاثار و ڕیوایەتەکان بەڵگەن لەسەر ئەوە یەکەم ئیمامی ئەبو بەکر دووەم ئیمامی عومەر

[١] صحيح البخاري (٣٦٧١)، سنن أبي داود (٤٦٢٩).

سێیەم ئیمامی عوسمان چوارەم ئیمامی عەلیە (وَكَمَا أَجْمَعَ الصَّحَابَةُ عَلَى تَقْدِيمِ عُثْمَانُ فِي الْبَيْعَةِ) هەروەکو سەحابەکانیش یەک دەنگ بون لەسەر پێش خستنی عوسمانی کوڕی عەفان بۆ بەیعەت پێدان کە بکرێتە خەلیفەی موسڵمانان (مَعَ أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ السُّنَّةِ كَانُوا قَدِ اخْتَلَفُوا فِي عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ -رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا-) لەگەڵ ئەوەدا ابن تیمیة دەفەرمویَ جێگای شاردنەوەش نیە هەندێک لە ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وابوە ئیختیلاف و جیاوازی هەیە لەسەر پێشخستنی ئیمامی عەلی و ئیمامی عوسمان کامە لەپێشتر بونە بۆ خەلیفایەتی و لە پلەداریەتیدا (بَعْدَ اتِّفَاقِهِمْ) لەدوای یەک دەنگییان (عَلَى تَقْدِيمِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ) لەسەر بە پێش خستنی ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر، واتە ئەهلی سونە و جەماعە یەک دەنگن یەکەم ئیمامی ئەبو بەکرە و دوەم ئیمامی عومەرە لەوەدا ئیختیلاف و جیاوازی نیە و ئەو دوو زاتە لەپێش ئیمامی عوسمان و ئیمامی عەلی بونە لە پلەداریەتیدا و لە خەلیفایەتیدا بەڵام ئەو هەندەی ئەهلی سونە و جەماعە کە ژمارەیەکن و زۆریش نین بۆچونیان وایە کە ئیمامی عوسمان هەندێک دەڵێن لەپێشترە هەندێک دەڵێن ئیمامی عەلی لەپێشترە دەفەرمویَ (أَيُّهُمَا أَفْضَلُ؟) کامەیان لەپێشترن؟ ئەو جیاوازییە هەیە لەلای هەندێک لە ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی ئیمامی عوسمان و ئیمامی عەلی نەک ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر ئەو دوانە بە یەک دەنگی ئەهلی سونە و جەماعە پلەدارترن و لەپێشترن لە ئیمامەکانی تر دەفەرمویَ (فَقَدَّمَ قَوْمٌ عُثْمَانَ) هەندێک لە ئەهلی سونە و جەماعە ئیمامی عوسمانیان پێشخستوە (وَسَكَتُوا) وە بێدەنگ بونە (أَوْ رَبَّعُوا بِعَلِيٍّ) ئیمامی عەلیان هەندێک بە چوارەم داناوە (وَقَدَّمَ قَوْمٌ عَلِيًّا) هەندێکیش ئیمامی عەلی یان پێشخستوە (وَقَوْمٌ تَوَقَّفُوا) وە هەندێکیشیان ڕاوەستاون لێی ناڵێن کامەیان لەپێش کامەیانە هیچ قسە و بۆچونیان دەرنەبڕیوە (لَكِنِ اسْتَقَرَّ أَمْرُ أَهْلِ السُّنَّةِ عَلَى تَقْدِيمِ عُثْمَانَ) ابن تیمیة دەفەرمویَ بەڵام لە کۆتایدا بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعە جێگیر بوو لەسەر پێشخستنی عوسمانی کوڕی عەفان بەپێش عەلی کوڕی ئەبو تالیب -رضي الله عنهما- (ثُمَّ عَلِيٍّ) لەپاش ئیمامی عوسمان

ئینجا عەلی دێ (وَإِنْ كَانَتْ هَذِه الْمَسْأَلَةُ) ئەگەر بێ و ئەو باس و خواسە (مَسْأَلَةُ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ لَيْسَتْ مِنَ الأُصُولِ الَّتِي يُضَلَّلُ الْمُخَالِفُ فِيهَا عِنْدَ جُمْهُورِ أَهْلِ السُّنَّةِ) ئەگەر بێو ئەو باس و خواسەی ئایە عوسمان لەپێشترە یان عەلی لەپێشترە؟ لە بنچینە و بنەماکانی ئەهلی سونە و جەماعە نیە کە خەڵکانی پێ گومڕا بکرێ و بڕیاری ئەوە بدرێ ئەگەر کەسێک لەگەڵ کەسێک لەو بۆچونە ئیختیلافی هەبێ بڵێین گومڕایە نەخێر لەلای جمهوری ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرموێ ئەگەر کەسێک ئیمامی عەلیش بە پێش ئیمامی عوسمان بخا لە پلە و پایەدا یان لە خەلیفایەتیدا ئەوە گومان لەوەدا نیە ابن تيمية دەفەرموێ ئەو کەسە بە گومڕا دانانرێ بنەمای ئەهلی سونە و جەماعە باسی ئەوەیان نەکردوە ئەو کەسە گومڕا بکرێ (لَكِنِ الَّتِي يُضَلَّلُ فِيهَا: مَسْأَلَةُ الْخِلاَفَةِ) بەڵام کێشە لەوەدایە کە گومڕا دەکرێن لە مەسەلەی خەلیفایەتیە ئایە لە پلە و پایە و فەزڵ دانە ئیمامی عەلی بەسەر ئیمامی عوسمان گومڕا ناکرێن لەلای ئەهلی سونە و جەماعە کەسێک بۆچونی وابێ بەڵام بەپێش خستنی ئیمامی عەلی بەپێش ئیمامی عوسمان بڵێین خەلیفایەتی حەقتربوو بدرابایە ئیمامی عەلی نەدرابایە ئیمامی عوسمان لەوەوە ئەهلی سونە و جەماعە ئەو کەسانەی وا دەڵێین بە گومڕایان دادەنێین بە دەرچویان دادەنێن لە بازنەی ئەهلی سونە و جەماعە (وَذَلِكَ أَنَّهُمْ يُؤْمِنُونَ) وە هەروەها ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوایان وایە (أَنَّ الْخَلِيفَةَ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَبُو بَكْرٍ) بیرو بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعە وایە کە یەکەم خەلیفە لەپاش پێغەمبەر ﷺ ئەبو بەکری صدیق بوە (ثم عُمَرُ) لەپاش ئیمامی ئەبو بەکریش ئیمامی عومەر بوە -رضي الله عنهما- (ثُمَّ عُثْمَانُ) لەپاش ئیمامی عومەریش -رضي الله عنهم- ئیمامی عوسمان بوە (ثُمَّ عَلِيٌّ) وە لەپاش ئیمامی عوسمانیش -رضي الله عنهم- ئیمامی عەلی بوە (وَمَنْ طَعَنَ فِي خِلاَفَةِ أَحد مِنْ هَؤُلاءِ) هەر یەکێک تانە و تەشەر بگرێتە خیلافە و خەلیفایەتی هەریەک لەو خەلیفانە ئەو چوار جێنشینە کە بۆیان جێگیر بوە بەو تەرتیب و لەدوای یەک هاتنە

(فَهُوَ أَضَلُّ مِنْ حِمَارِ أَهْلِهِ) ئەوە گومڕاترە لە گوێ درێژی خزم و کەسەکانی بە مەعنای لەلای ئەهلی سونە و جەماعە کەسێکە عەقڵی نیە هۆشی نیە وە بە گوێدرێژ حیساب دەکرێ.

جا پێغەمبەر (ﷺ) دەیەها فەرمودەی هەیە دەربارەی پلە و پایەی ئیمامی ئەبو بەکر هیچ گومان لەوەدا نیە ئەهلی سونە و جەماعە یەک دەنگن ئیمامی ئەبو بەکر پلەدارتربوە لە هەموو ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) وە لە هەموو وەلیەکان وەلی تر بوە ئیمامی ئەبو بەکر، ئیختیلاف و جیاوازی لەسەر ئەوە هەیە ئایە ئیمامی ئەبو بەکر لە هەموو ئومەتەکانی تریش گەورەترە؟ بەڵێ بۆچونی پەسەند و ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە ئیمامی ئەبو بەکر بەس ناگاتە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئەگەرنا لە هەموو ئومەتەکانی تر پلەدارترە گەورەترە بەڕێزترە سەنگین ترە (والله أعلم بالصواب).

وە ئیمامی عومەریش لەدوای ئەو دێ لە پلە و پایە، وە لە پاشان ئیمامی عوسمانیش پلەی زۆری هەبوە لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، پلەکانی ئیمامی عوسمان لەوەدایە کە لە یەکەمەکانی کۆچکەران بوە بەرەو حەبەشە، وە لە پاشان دوو کچی پێغەمبەری پێدراوە، (ﷺ) کە پێغەمبەر دەفەرموێ «لو كانت لي بنت ثالثة لزوجتها عثمان[1]» لەسەر قەبران کە دەهاتنەوە ئیمامی عوسمان هاوسەری کە کچی پێغەمبەر بوو وەفاتی کرد و شاردبویانەوە دەڵێ پێغەمبەر توند دەستی ئیمامی عوسمانی گرت دڵی دەدایەوە فرمێسکیان لە چاو دەهاتە خوار ئیمامی عوسمان زۆر غەمگین بوو بوو هاوسەرەکەی سەرەڕای ئەوەی هاوسەری بوو کچی پێغەمبەری اللەش بوو (ﷺ)، پێغەمبەر سەری لەبن گوێی نا فەرموی وەڵاهی یا عوسمان ئەگەر کچی سێیەمیشم هەبا پێمدەدای، ئەوە پلە و پایەیەکی یەکجار گەورەیە کەس نیە لەسەر ڕوی زەوی دوو کچی پێغەمبەری لەلا بوبێ (ﷺ) غەیری عوسمانی کوڕی عەفان.

[1] **أخرجه الطبراني (١٧ / ١٨٤) برقم (٤٩٠) من حديث عصمة قال: لما ماتت بنت رسول الله صلى الله عليه وسلم التي تحت عثمان قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: زوجوا عثمان، لو كان لي ثالثة لزوجته، وما زوجته إلا بالوحي من الله عز وجل . وذكره الهيثمي في مجمع الزوائد (٩ / ٨٣) وقال: فيه الفضل بن المختار وهو ضعيف.**

وە لە پاشان عوسمانی کوڕی عەفان ئەو پیاو و زاتە بوو کە جەیشی عوسرە جەیشی تەنگەبەری لەشکری تەنگەبەری کە یەکجار زەحمەت و ناخۆش بوو کە موسڵمانەکان ڕۆیشتن بەرەو تەبوک ئیمامی عوسمان هەموو ئەرک و وەزع و تەجهیز کردن و کار و بارەکانی خستە ئەستۆی خۆی چەند پێی کرا ئەوەشیان دیارە پلە و پایەیەکی ترە.

ئیمامی عوسمان بوو کە بیری ڕۆمەی کڕییەوە لە جولەکەکان وە کردیە خێر بۆ موسڵمانەکان ئەوەشیان پلە و پایەیەکی یەکجار گەورە بوو.

لە پاشان ئەهلی سونە و جەماعە یەکدەنگن لەسەر ئەو فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) کە پێغەمبەر دەفەرموێ: «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الراشدين المهديين من بعدي» دەفەرموێ دەست بگرن بە ڕێباز و سونەتی من لەدوایی دەست بگرن بە ڕێباز و سونەتی خولەفای ڕاشیدین ئەوانەی ڕێنوێنی کارن و بەخۆشیان لەسەر ڕێنوێنین لەدوای من دێن کە ئەبو بەکری صدیق و عومەر و عوسمان و عەلییە بە ئیتیفاقی ئەهلی سونە و جەماعە «تَمَسَّكُوا بِهَا» دەست بگرن بە ڕێباز و سونەتەکانیان «وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ» وە بە خرێنەکانتان بە تەواوی بیگرن و لە دەستان نەچێ، یەعنی شتێک ئەگەر تۆ لە قوەتی دەستت دەرچوو ددان زۆر بەهێز و بەقوەتە کاتێک بە ددان شتێک بگری و دەستیشی لەگەڵدابێ بەهێزتر دەبێ جا (نَوَاجِذِ) بە خرێنەکانیش دەڵێن بە ددانی جیڕەش دەڵێن بە ددانی پێشەوەش دەڵێن ئیمامی بەغەوی وای ڕیوایەت کردوە دەفەرموێ لە زمانەوانیش هەر وای پێدەگوترێ ئەو ئیختیلاف و جیاوازییە هەیە بۆ ئەوەی لێوەشاوەتربێ بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەو فەرمودانەی کە دەڵێ پێغەمبەر پێکەنی و زەردەخەنەی هاتێ و «وبدا النَوَاجِذه» نەواجیزەکانی بەدیارکەوت، ئەگەر نەواجیز بڵێین خرێنەی پشتەوەیە مەعنای (پەنا بە خوای رب العالمين) ئیمامی بەغەوی و هەندێک لە زانایان دەفەرمون یەعنی پڕ بە دەمی پێغەمبەر پێکەنیوە (ﷺ) هەموو ددانی دەرکەوتوە ئەو نەوعە پێکەنینە لە پێغەمبەر ناوەشێتەوە (ﷺ) نەیبوە، بەڵکو دەڵێ لەوێ نەواجیز بە مەعنای ددانەکانی پێشەوە دێ بایی ئەوەندە پێکەنیوە و

گرژیتەوە و زەردەخەنەیەکی هەبوە تەنها ددانەکانی پێشەوەی دەرکەوتوە ئەوە زیاتر لە پێغەمبەر دەوەشێتەوە (ﷺ) بەڵام بۆ گرتنی شتەکان بە خرێنە یان بە ددانی پێشەوە هەردوکیان هەر بەهێزن لێرە ئەوە دەگەیەنێ (والله أعلم بالصواب).

وە لە پاشان ئیسلامەتی و دینداریێتی بە تەواوەتی هەر یەک لەو خەلیفانە توانیان بیگەیەنن ئەوانە ئەڵقەی وەصڵن لەنێوان ئێمە و لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو بەکر هەوڵ و هیمەتێکی گەورەی هەبوو کە خەریکی تەواو کردنی ڕێباز و بەرنامەکەی پێغەمبەر بوو (ﷺ) بەوەی خەڵکانێک هەڵگەڕانەوە زەکاتیان نەدا شەڕ و جەنگی لەگەڵ کردن هەموی گەڕاندنەوە سەر پاپەند بون بە قورئان و بە سونە، لە پاشان ئیمامی عومەر برەویدا بە پەرتکردنی موسڵمانان و دەعوە و بانگەوازیەکی زۆر و جەنگ و جیهادێکی زۆر ئەوەبوو خاکی دەوروبەری مەککە و مەدینە کەوتە دەستی موسڵمانان ڕۆمەکان زۆریان شکان فارسەکان شکان لەسەردەمی ئیمامی عومەر، وە لە سەردەمی ئیمامی عوسمان (بيت المال) پڕبوو وە دوبارە جەنگ و جیهاد زۆر بەرەو پێشەوە چوو، وە لە سەردەمی ئیمامی عەلیش زۆر شت ڕویدا و لنگ چەقینی ئیمامی عەلی لەسەر دینداری و وە ڕێیە ڕاست گرتنەبەرەکەی، هەریەک لەو بەرز و بەڕێزانە لەو خەلیفە ڕاشیدانە پلە و پایەی تایبەتیان هەبوە، کە کۆتایی خەلیفەی ڕاشیدەش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە بە شەش مانگەکەی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی -رضي الله عنهما- دێت ئەویش شەش مانگ بوە خەلیفە لە شوێنی باوکی خەڵک بەیعەتی پێدا لەدوایی فیتنەکەی کوژاندەوە ئاشوبەکەی نەهێشت تەسلیمی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانی کرد.

لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە لە کاتی ئیمامی حەسەن بەیعەتیدا بە معاویە معاویە لەو کاتەوە بوە خەلیفە، هەتا ئەوکاتیش معاویە بەرییە لەو قسانەی پێی هەڵدەبەستن داوای خەلیفایەتی نەدەکرد وە نەشی کردوە نەشیگوت من خەلیفەم و عەلی خەلیفە نیە، بەس ڕەخنەی ئەوەی هەبوو قسەی ئەوەی هەبوو کە بکوژانی ئیمامی عوسمان دەبێ تەسلیم

بکرێ وە تۆڵەیان لێ بستێنرێتەوە ئەگەرنا لەسەر ئەوە بوو بەیعەتی نەدایە ئیمامی عەلی و وە نەهاتە ژێر ئاڵای خەلافەتی ئیمامی عەلی ئەگەرنا داوای خەلیفایەتی نەدەکرد، لەدوای ئەو حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی -رضي الله عنهم- بەیعەتی پێدا بوە خەلیفەی موسڵمانان.

**خۆشویستنی (أهل البيت)ی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):**

**وَيُحِبُّونَ أَهْلَ بَيْتِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَيَتَوَلَّوْنَهُمْ، وَيَحْفَظُونَ فِيهِمْ وَصِيَّةَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) : حَيْثُ قَالَ يَوْمَ غَدِيرِ خُمٍّ: «أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي[1]». وَقَالَ أَيْضًا لِلْعَبَّاسِ عَمِّهِ ـ وَقَدِ اشْتَكَى إِلَيْهِ أَنَّ بَعْضَ قُرَيْشٍ يَجْفُو بَنِي هَاشِمٍ ـ فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ؛ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحِبُّوكُمْ؛ للهِ وَلِقَرَابَتِي[2]». وَقَالَ: «إِنَّ اللهَ اصْطَفَى بَنِي إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى مِنْ بَنِي إِسْمَاعِيلَ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ كِنَانَةَ قُرَيْشًا، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ[3]».**

---

لە پاشان ابن تیمیة -رحمه الله- دەگاتە سەر ئەوەی باسی (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرموێ (وَيُحِبُّونَ أَهْلَ بَيْتِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)) دەفەرموێ ئەهلی سونە و جەماعە (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەریشیان (ﷺ) زۆر خۆش دەوێ خۆشیان دەوێن (وَيَتَوَلَّوْنَهُمْ) وەلائیان بۆیان هەیە واتە سەریان دەخەن لێیان نزیک دەبنەوە خۆشیان دەوێن شوێنکەوتەیان دەبن (وَيَحْفَظُونَ فِيهِمْ وَصِيَّةَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)) وە دەربارەی ئەوان وەسیەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەپارێزن و جێبەجێ دەکەن (حَيْثُ قَالَ يَوْمَ غَدِيرِ خُمٍّ) پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەی کە لە (حجة الوداع) گەڕایەوە لەو شوێنە پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی ئومەتەکەی خۆی کرد کە باشبن و چاکبن هەردەم ڕێزیان بۆ (أَهْلُ البَيْت) هەبێ و لەگەڵیاندابن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: «أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي» من توخواتان لێدەکەم و هەردەم اللهتان دەهێنمەوە بیر دەربارەی (أَهْلُ البَيْت)ی من واتە لە الله ترسبن ئاگاتان لێیان بێ ڕێزیان لێ بنێن

[1] أخرجه مسلم برقم (٢٤٠٨) في فضائل الصحابة، باب: من فضائل علي بن أبي طالب رضي الله عنه . عن زيد بن أرقم رضي الله عنه.

[2] أخرجه أحمد في المسند (١ / ٢٠٧، ٢٠٨). والحاكم في المستدرك (٣ / ٣٣٣). قال أحمد شاكر: (إسناده صحيح).

[3] أخرجه مسلم برقم (٢٢٧٦) في الفضائل، باب: فضل نسب النبي عن واثلة بن الأسقع رضي الله عنه.

خۆشتان بوێن (وَقَالَ أَيْضًا لِلْعَبَّاسِ عَمِّه ـ وَقَدِ اشْتَكَى إِلَيْهِ أَنَّ بَعْضَ قُرَيْشٍ يَجْفُو بَنِي هَاشِمٍ ـ فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ؛ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحِبُّوكُمْ؛ للهِ وَلِقَرَابَتِي») جا ابن تيمية دەفەرموێ هەتا ئەو وەسیەتەش جێبەجێ دەکەن ئەهلی سونە و جەماعە کە پێغەمبەر (ﷺ) بە عەباسی مامی گوت -رضي الله عنه- کاتێک سکاڵای هێنایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوتی هەندێک لە قورەیشیەکان جەفایان هەیە بەرامبەر بە بەنو هاشم واتە وشکن لە تەحامول و هەڵسوکەوتدا ئەو ڕێزەیان لێ نانێن کە پێویستە جا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) سوێند بەو خوایەی کە نەفسی منی بەدەستە ئەوان ئیمانیان نیە یان تەواو نیە هەتا ئێوەیان خۆش نەوێ لەپێناو الله و وە لە پێناو نزیکیتان، بەنو هاشم کە ئێوە (أَهْلُ البَيْت)ی منن و لە من نزیکن لەسەر بۆچونی هەندێک لە زانایان ئەوان (أَهْلُ البَيْت)ن، وە فەرموی: «إِنَّ اللهَ اصْطَفَى بَنِي إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى مِنْ بَنِي إِسْمَاعِيلَ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ كِنَانَةَ قُرَيْشًا، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ» ابن تيمية دەفەرموێ ئەهلی سونە و جەماعە ئەو فەرمودانە بە هەند وەردەگرن و جێبەجێیان دەکەن کە پێغەمبەر فەرموی بەڕاستی الله تعالی نەوەکانی ئیسماعیلی هەڵبژارد وە لە نەوەکانی ئیسماعیل تیرەی کینانەی هەڵبژارد وە لە کینانە قورەیشی هەڵبژارد وە لە قورەیشیەکانیش بەنو هاشمی هەڵبژارد وە لەنێو بەنو هاشمیشدا منی هەڵبژارد پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ).

کەواتە ئێمە دەبێ (أَهْلُ البَيْت)مان خۆشبوێ وەکو ئەهلی سونە و جەماعە پشتگیریان لێبکەین لەگەڵیاندابین وەسیەتی پێغەمبەرە (ﷺ) پلە و پایەی تایبەتیان هەیە، ئایە (أَهْلُ البَيْت) کێن؟ (أَهْلُ البَيْت) ئیختیلاف و جیاوازییان لەسەر هەیە لە نێوان ئەهلی سونە و جەماعە هەندێک لە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ) ئەتباعی پێغەمبەرە (ﷺ) هەتا قیامەت هەر وەکو خوای رب العالمين لە قورئاندا فەرمویەتی: ﴿أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾ [غافر: ٤٦] چونکە ئال بە مەعنای

شوێنکەوتەش دێ، لەو ئایەتە واتە شوێنکەوتوانی فیرعەون بخەنە ناو بەئێش و ژانترین و توندترین عەزاب و تۆڵە سەندنەوە.

جا هەندێک لە زانایانیش دەفەرمون نا (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ) ئالی پێغەمبەر خەڵکانێکی تایبەتن لە نزیکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) منداڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێک دەڵێن هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) لە (أَهْلُ البَيْت) نین بەڵام بۆچونی ڕاجیح و سەحیح لە سەردەمیەکان عبد الله بن جبرين یش -رحمه الله- بۆچونی وایە هاوسەرانی پێغەمبەریش (ﷺ) لە (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەرن (ﷺ)، ئەوە وەڵامێکیشە بۆ شیعەکانیش و ڕافیزەکانیش کە بێرێزی دەکەن لەگەڵ هەندێک لە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ).

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لەو فەرمودە کە ابن تیمیة تەنها بڕگەکەی ئاخیری هێنابۆوە گوتمان فەرمودەکە وا دور و درێژە کە پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە و دابەزی لە شوێنی غەدیر ڕویکردە سەحابەکان فەرموی: «إنما أنا بشر، يوشك أن يأتيني رسول ربي فأجيبه» فەرموی منیش مرۆڤێکم ڕەنگە ڕەوانەکراوی الله تعالى پێم بگا و من وەڵامی دەمەوە یانی دابڕێم و بمرم لێتان «إني تارك فيكم ما إن تمسكتم به لن تضلوا» فەرموی بەس لەناو ئێوە لەدوای مردنی خۆم شتێک بەجێ دێڵم ئەگەر ئێوە دەستی پێوە بگرن گومڕا نابن، یەکەمیان فەرموی «كتاب الله» پەرتوکی خوایی کە قورئانی پیرۆزە دەستی پێوە بگرن ئێوە گومڕا نابن دوەمیان فەرموی «وأهل بيتي» (أَهْلُ البَيْت)ی خۆم لە ناوتان بەجێ دێڵم «أذكركم الله في أهل بيتي[1]» ئینجا ئێوە توخواتان لێ دەکەم و دەتان دەمە الله وە اللەتان بەبیربێ دەربارەی (أَهْلُ البَيْت)ی من هەموو دەمێک «أذكركم الله في أهل بيتي» دوبارە دوبارەی کردەوە پێغەمبەر (ﷺ).

[1] أخرجه مسلم برقم (٢٤٠٨) في فضائل الصحابة، باب: من فضائل علي بن أبي طالب رضي الله عنه عن زيد بن أرقم رضي الله عنه.

ئایە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) (أهْلُ البَیْت) بونە یانە نا؟ بەڵێ بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە هاوسەرانی پێغەمبەریش (ﷺ) (أهْلُ البَیْت) حیسابن کە خوای رب العالمین دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿يَٰنِسَاءَ ٱلنَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَاءِ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ﴾ [الأحزاب: ٣٢] یان دەفەرموێ: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾ [الأحزاب: ٣٣] یان: ﴿لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ﴾ [الأحزاب: ٥٣] دەربارەی سەحابەکان کە دەبێ ئاداب و ڕەوشتان ڕێز و ئیحتیرامتان لەگەڵ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) و لەگەڵ هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) وابێ، جا ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون لە کۆتایی سورەتی (الأحزاب)یش ئایەتی سی و دوو سی و سێ خوای رب العالمین بەوە دەگا کە دەفەرموێ: ﴿يَٰنِسَاءَ ٱلنَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَاءِ﴾ لە ئاخیریەکەی خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ دەفەرمون ئەو خیطاب و دواندنەی الله تعالی کە مەبەستی پێی دایکی ئیماندارانە کە هاوسەرانی پێغەمبەرە (ﷺ)، جا لەوێدا خوای رب العالمین بە (أهْلُ البَیْت) ناوی ئەوانی برد دەش فەرموێ بۆ ئەوەشمە تا پاکتان بکەمەوە بەوپەڕی پاککردنەوە، جا ئەوە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) هەر هەمویان (أهْلُ البَیْت) بونە لە (أهْلُ البَیْت) حیسابن، یان شیعەکانیش ئەوە وەڵامە بۆیان چونکە شیعەکان هەندێک لە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) بێ ڕێزییان لەگەڵ دەکەن لەوانە دایکە عائیشە (پەنا بە خوای رب العالمین) بوختانەکەی لەسەر نوێ دەکەنەوە و پێی هەڵدەبەستنەوە، لەبەر ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەوەی بڵێ بوختانەکەی دایکە عائیشە ڕاستە هەر پێی کافر دەبێ پێی لە ئیسلام دەردەچێ لەبەر ئەوەی چونکە هەڵوەشاندنەوە و بەدرۆ هێنانەوەی ئەو ئایەتانەیە کە دایکە عائیشەی بەریی کرد الله تعالی دایبەزاند و فەرموی.

جا ئەوانەش کە دەڵێن ئەو حەدیسە دەربارەی تەفسیری ئەو ئایەتەی سورەتی (الأحزاب) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: «اللهم هؤلاء أهل بيتي» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) خوایە ئەوانە

(أَهْلُ الْبَيْت)ی منن «فأذهب عنهم الرجس وطهرهم تطهيرا[١]» کە دەڵێن کێ بوە ئەوە؟ فاتیمەی هێناوە هەردوو کوڕەکانی حەسەن و حوسێن و وە ئیمامی عەلی بونە عاباکەی خۆی تێوەرگرتون پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ئەوانە (أَهْلُ الْبَيْت)ی منن.

جا ئەو بەڵگەیە کە ئەهلی سونە و جەماعە ئەوانەی کە دەڵێن هاوسەرانی پێغەمبەری (ﷺ) تێدایە دەفەرمون یان سەحیح نیە یان ئەگەر سەحیحیش بێ ئەوە ئەوە ناگەیەنێ بەس ئەوانە (أَهْلُ الْبَيْت) بونە، ئەوانەی لەلا بوە ئەو کاتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانی بە (أَهْلُ الْبَيْت) داناوە وە هاوسەرەکانی تریشی هەر (أَهْلُ الْبَيْت) بونە و ئەو دەمە لەلای نەبونە کە عەبایەکەیان تێوەرگرێ و ئاوا بفەرموێ، ئەی ئەوە نیە لە ڕیوایەتی سەحیح هاتوە زۆرجار سیغەی سەڵاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەگوترێ و پێغەمبەریش وای فەرموە: «اللهم صل على محمد وعلى آل محمد» لە هەندێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ «وعلى أزواجه وذريته[٢]» یەعنی کە دەڵێن خوایە سەڵات لێبدە لەسەر موحەمەد (ﷺ) و ئالی موحەمەد، سەڵات لە اللهوە ئەبو عالیە دەفەرموێ کە لە سەحیحی بوخاری تۆمار بوە یەعنی ثناء و پێدا هەڵگوتنی خوای رب العالمين بۆ ئەو زات و کەسەی کە سەڵاواتی لەسەر لێدەدرێ و لەنێو فریشتەکان، ئینجا گوتراویشە لەو ڕیوایەتە و زیادەییە کە لەسەر ئەزواج و هاوسەرانی پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەر ذوڕییەتی پێغەمبەریش (ﷺ)، دەڵێن ئەوە عەطفی خاصە لەسەر عام، ئال هەموو ئالی دەگرێتەوە، وە ئەزواجیش لێرە تایبەت کراونەتەوە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) وە ذوڕییەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانیش -رضي الله عنهم- کەواتە لە هەندێک ڕیوایەت دەڵێ «وأهل بيته[٣]» (أَهْلُ الْبَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ).

[١] أخرجه الترمذي برقم (٣٨٧١) في المناقب، وقالت الترمذي: هذا حديث حسن. قلت: فيه شهر بن حوشب سيئ الحفظ.

[٢] وهذه إحدى صيغ الصلاة على النبي صلى الله عليه وسلم أخرجها البخاري برقم (٣٣٦٩) في الأنبياء، باب: ١٠ ومسلم برقم (٤٠٧) في االصلاة ، باب: الصلاة على النبي صلى الله عليه وسلم بعد التشهد. عن أبي حميد الساعدي رضي الله عنه.

[٣] أخرجه الإمام أحمد في المسند (٥ / ٣٧٤)- عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم، وصححه الألباني في صفة الصلاة ص (١٣٠).

کەواتە بەڵێ ئەهلی سونە و جەماعە مەحەبەت و خۆشەویستیان هەیە بۆ (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەرانی پێغەمبەریش (ﷺ) لە (أَهْلُ البَيْت)ن وە بەنو هاشم و بەنو موتەڵیبیش کە ئیمامی شافیعی دەفەرموێ ئیماندارەکانیان لە (أَهْلُ البَيْت)ن بەڵام کافرەکانیان نا وەکو ئەبو لەهەب ئەوان دوژمنانی الله و پێغەمبەر بونە (ﷺ).

جا (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە وەسیەتیش کراوین دەبێ خۆشمان بوێن ڕێزیان لێ بنێین وە لەگەڵیاندابین بەرێز و سەنگینیەوە تەماشایان بکەین بەو مەرجەی ئەگەر ئێستاش هەبن لەسەر ڕوی زەوی بەڵام لەسەر ڕێز شوێنی پێغەمبەربن (ﷺ) بەدین بن لە الله ترسبن وە ڕێک و پێکبن، ئەگەرنا ئەو نەسەب و باوک و باپیرایەتیە هیچ کەڵک و نرخێکی بۆیان نیە ئەوەتا ئەبو هورەیرە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «من بطَّأ به عمله، لم يسرع به نسبه[١]» دەفەرموێ هەر یەکێک عەمەل و کردارەکەی تەمبەڵی بکا و لەسەر خۆیی بکا و دوای بخا قەتاوقەت نەسەب و باوک و باپیرەی پێشی ناخا، یەعنی ئەگەر عەمەلی چاکی نەبێ پێی بەرەو پێش بچێ و اللەی پێ لە خۆی ڕازی بکا بەوە نیە کە بڵێن کوڕی فلانە کچی فلانە باوک و باپیرەی وایە ئەوە لەلای خوای رب العالمين ناخوا ئەگەر کەسێک بەخۆی باشبێ لەسەر ڕێبازی الله و پێغەمبەربێ (ﷺ) ئینجا باوکیشی وا باشبوبێ ئینجا سود و کەڵک و قازانجیان بۆ یەکتر دەبێ.

وە پێغەمبەر (ﷺ) هەڵبژاردەی بۆخۆشی گوتی نەوەکانی ئیسماعیلە وە هەڵبژاردەی کینانەیە وە هەڵبژاردەی قورەیشیە وە هەڵبژاردەی ناو بەنو هاشمیشە ئەوانەش پلە و پایەی تایبەتیان هەیە.

## هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):

وَيَتَوَلَّوْنَ أَزْوَاجَ رَسُولِ الله (ﷺ) أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، وَيُؤْمِنُونَ بِأَنَّهُنَّ أَزْوَاجُهُ فِي الآخِرَةِ: خُصُوصًا خَدِيجَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أُمَّ أَكْثَرِ أَوْلاَدِهِ، وَأَوَّلَ مَنْ آمَنَ بِهِ وَعَاضَدَهُ عَلَى أَمْرِهِ، وَكَانَ

[١] أخرجه مسلم برقم (٢٦٩٩) في الذكر والدعاء، باب. فضل الاجتماع على تلاوة القرآن وعلى الذكر. عن أبي هريرة رضي الله عنه.

لَهَا مِنْهُ الْمَنْزِلَةُ الْعَالِيَةُ. وَالصِّدِّيقَةَ بِنْتَ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، الَّتِي قَالَ فِيهَا النَّبِيُّ (ﷺ) : «فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ[١]».

---

جا ابن تيمية لە پاشان دێ دەگاتە سەر هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دەربارەی ئەوان دەفەرموێ (وَيَتَوَلَّوْنَ أَزْوَاجَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ) وە ئەهلی سونە و جەماعە وەلاء و پشتگیری و سەرخستن و خۆشەویستیان هەبوە و هەیە بۆ هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) دایکانی ئیماندارن -رضي الله عنهن- (وَيُؤْمِنُونَ بِأَنَّهُنَّ أَزْوَاجُهُ فِي الآخِرَةِ) وە ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوایان وایە کە ئەوانە دەبنەوە هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) لە قیامەت و لە بەهەشتدا.

لە پێناو ئەو فەرمودەی کە خوای رب العالمين دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ * رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ [غافر: ٧-٨] کەواتە: ﴿وَأَزۡوَٰجِهِمۡ﴾ ئەوە ئەوە دەگەیەنێ لەپاش چونە بەهەشتیان خەڵکانێک زەوج و هاوسەرەکانیشیان ئەگەر باشبن و ڕێگای ئەوان بگرن دەچنە بەهەشت هەندێک لە زانایان دەفەرمون هی پێغەمبەریش (ﷺ) بە دڵنیایی و سەدا سەد خۆی بەهەشتیە ئەوانیش باشن و ڕێبازی ئەویان گرتوە لەدوای ئەوەوە لەگەڵی دەچنە بەهەشت دەفەرمون ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوانیش بەهەشتین.

جا لە پاشان ابن تيمية دەفەرموێ (خُصُوصًا خَدِيجَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أُمَّ أَكْثَرِ أَوْلادِهِ) بە تایبەت لەنێو هاوسەرەکانی ئەهلی سونە و جەماعە پشتگیری و سەخستن و خۆشەویستیان بۆ خەدیجە هەیە -رضي الله عنها- کە دایکی زۆربەی منداڵەکانی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لە

---

[١] أخرجه البخاري برقم (٣٧٧٠) في فضائل الصحابة، باب: فضل عائشة رضي الله عنها. ومسلم برقم (٢٤٤٦) في فضائل الصحابة، باب: في فضل عائشة رضي الله تعالى عنها عن أنس بن مالك رضي الله عنه. وأخرجه مسلم برقم (٢٤٤٦) عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه.

ڕیوایەتی سەحیحەوە خەدیجە دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) تەنها هی ئیبراهیم نەبێ ئەویان لە ماریەی قبتی بوە ئەگینا کوڕ و کچەکان هەموی هی خەدیجە بوە دایکی ئیماندارن -رضي الله عنها- (وَأَوَّلَ مَنْ آمَنَ بِهِ وَعَاضَدَهُ عَلَى أَمْرِه) خەدیجە یەکەم هاوسەری پێغەمبەریش بوە (ﷺ) کە بڕوای پێ هێناوە پشتگیری لێ کردوە لەسەر کار و ئیش و دەعوە و ئیسلامەتیەکەی (وَكَانَ لَهَا مِنْهُ الْمَنْزِلَةُ الْعَالِيَةُ) جا خەدیجە لەلای پێغەمبەر (ﷺ) پلە و پایەی زۆر گەورەی هەبوە و پێغەمبەر زۆر خۆشی ویستوە (ﷺ)، لە پاشان دەفەرموێ (وَالصِّدِّيقَةَ بِنْتَ الصِّدِّيقِ -رَضِيَ اللهُ عَنْهَا-) لەدوای خەدیجە پلەی کێ دێ؟ دایکە عائیشە -رضي الله عنها- کە خۆی صدیقەیە و وە کچی صدیقە واتە ئەبو بەکری صدیق -رضي الله عنهم- (الَّتِي قَالَ فِيهَا النَّبِيُّ (ﷺ)) دایکە عائیشە ئەو کەسەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی فەرموی «فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ» دەفەرموێ پلە و پایەی دایکە عائیشە بەسەر ئافرەتانی تر وەکو پلە و پایەی ثەریدە، یەعنی تێکوشە بە گۆشت و چەلاو کە ئاوی نانی تێ بکوشرێ لەلای پێغەمبەر (ﷺ) وە لەناو عەرەبەکانیش لە کاتی خۆی لە هەموو خواردنێک بەتامتر و بەچێژترە و خەڵکی پێ دەعوەت دەکرا، دەفەرموێ جا پلە و پایەی دایکە عائیشە بەسەر ئافرەتانی تر وەکو پلە و پایەی ثەرید و تێگوشەی چەلاو و گۆشتە بەسەر خواردنەکانی تر.

جا لێرەدا با بێین هەڵوێستە بکەین لەسەر ئەو خاڵانە ئایە دایکە خەدیجە لەگەڵ دایکە عائیشە -رضي الله عنها- کامەیان پلەیان بەسەر ئەویتردا هەیە؟ جیاوازی و ئیختیلاف هەیە لەنێوان ئەهلی سونە و جەماعەدا، وە ئەوانە سەبارەت بە هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر (ﷺ).

بە دڵنیاییەوە بەبێ ئیختیلاف و جیاوازی ئەو دوانە پلەدارترن لە هەموو هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ)، لەنێوان ئەو دوانەشدا هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وایە کە دایکە خەدیجە -رضي الله عنها- لەپێشترە و پلەدارترە بەسەر دایکە

عائیشە -رضي الله عنها-، کە بۆچونی دووەمیش دەڵێن نا دایکە عائیشە -رضي الله عنها- پلەدارترە بەسەر دایکە خەدیجە -رضي الله عنها-، وە هەندێکیش لە زانایان لەوانە ابن کثیر دەفەرموێ پێویستە ڕابوەستین هیچ قسەیەکی لێ نەکەین بەڵگەی سەحیح هیچمان بۆ یەکلا ناکاتەوە کامەیان پلەدارترە بەسەر ئەوەیتریان، ابن تیمیةش -رحمه الله- جەمع و تەوفیقێکی جوان دەکا کە ئەو دەفەرموێ سەبارەت بە سەرەتای موسڵمان بون و پشتگیری کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ڕاگەیاندنی ئیسلام لە سەرەتاوە پشتیوانی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دایکە خەدیجە پلەی بەسەر عائیشەوە هەیە، وە سەبارەت بە ڕاگەیاندنی عیلم و زانستی و ئیسلامەتی و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش پێغەمبەر دایکە عائیشە پلەی بەسەر دایکە خەدیجەوە هەیە، ئەوەش بەڵگەی سەحیحیان لەسەرە و ڕاستە کە ابن تيمية -رحمه الله- وای فەرموە، بەڵام ئیمامی ذەهەبی دەڵێ دایکە خەدیجە پلەی زیاترە بەسەر دایکە عائیشە نەک دایکە عائیشە پلەی زیاتربێ بەسەر دایکە خەدیجە بە هەموو جۆرەکانیەوە، ابن کثیریش وەستانی پێ باشبوە کە هیچ قسەیەکی لێ نەکات (والله أعلم بالصواب).

جا گرنگ ئەوەیە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانیش -رضي الله عنهن- دەبێ زۆر لەلامان بەڕێزین وەکو دایکی ئیمانداران تەماشایان بکەین خۆشمان بوێن ڕێزیان لێ بنێین وە پلەداربن لەلامان لە هەموو ئافرەتەکانی تری سەحابیە لەلامان پلە دارتربن و بەڕێزتربن و ڕێزیان لێ بنێین.

## هەڵوێستی ڕافیزە و نەواصیب و دەربارەی سەحابەکان -رضي الله عنهم-

وَيَتَبَرَّؤُونَ مِنْ طَرِيقَةِ الرَّوَافِضِ الَّذِينَ يُبْغِضُونَ الصَّحَابَةَ وَيَسُبُّونَهُمْ. وَطَرِيقَةِ النَّوَاصِبِ الَّذِينَ يُؤْذُونَ أَهْلَ الْبَيْتِ بِقَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ. وَيُمْسِكُونَ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَ الصَّحَابَةِ، وَيَقُولُونَ: إِنَّ هَذِهِ الآثَارَ الْمَرْوِيَّةَ فِي مَسَاوِيهِمْ مِنْهَا مَا هُوَ كَذِبٌ، وَمِنْهَا مَا قَدْ زِيدَ فِيهِ وَنُقِصَ وَغُيِّرَ عَنْ وَجْهِهِ، وَالصَّحِيحُ مِنْهُ هُمْ فِيهِ مَعْذُورُونَ: إِمَّا مُجْتَهِدُونَ مُصِيبُونَ، وَإِمَّا مُجْتَهِدُونَ مُخْطِئُونَ. وَهُم مَّعَ ذَلِكَ لاَ يَعْتَقِدُونَ أَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنَ الصَّحَابَةِ مَعْصُومٌ عَنْ كَبَائِرِ الإِثْمِ وَصَغَائِرِهِ؛ بَلْ يَجُوزُ عَلَيْهِمُ

الذُّنُوبُ فِي الْجُمْلَةِ. وَلَهُم مِّنَ السَّوَابِقِ وَالْفَضَائِلِ مَا يُوجِبُ مَغْفِرَةَ مَا يَصْدُرُ مِنْهُمْ ـ إِنْ صَدَرَ ـ حَتَّى إِنَّهُمْ يُغْفَرُ لَهُم مِّنَ السَّيِّئَاتِ مَا لاَ يُغْفَرُ لِمَنْ بَعْدَهُمْ؛ لأَنَّ لَهُم مِّنَ الْحَسَنَاتِ الَّتِي تَمْحُو السَّيِّئَاتِ مَا لَيْسَ لِمَنْ بَعْدَهُمْ. وَقَدْ ثَبَتَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُمْ خَيْرُ الْقُرُونِ، وَأَنَّ الْمُدَّ مِنْ أَحدِهِمْ إِذَا تَصَدَّقَ بِهِ كَانَ أَفْضَلَ مِنْ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهَبًا مِمَّن بَعْدَهُمْ. ثُمَّ إِذَا كَانَ قَدْ صَدَرَ مِنْ أَحدِهِمْ ذَنْبٌ؛ فَيَكُونُ قَدْ تَابَ مِنْهُ، أَوْ أَتَى بِحَسَنَاتٍ تَمْحُوهُ، أَو غُفِرَ لَهُ؛ بِفَضْلِ سَابِقَتِهِ، أَوْ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ (ﷺ) الَّذِي هُمْ أَحَقُّ النَّاسِ بِشَفَاعَتِهِ، أَوْ ابْتُلِيَ بِبَلاَءٍ فِي الدُّنْيَا كُفِّرَ بِهِ عَنْهُ. فَإِذَا كَانَ هَذَا فِي الذُّنُوبِ الْمُحَقَّقَةِ؛ فَكَيْفَ الأُمُورُ الَّتِي كَانُوا فِيهَا مُجْتَهِدِينَ: إِنْ أَصَابُوا؛ فَلَهُمْ أَجْرَانِ، وَإِنْ أَخْطَؤُوا؛ فَلَهُمْ أَجْرٌ وَاحِدٌ، وَالْخَطَأُ مَغْفُورٌ. ثُمَّ إِنَّ الْقَدْرَ الَّذِي يُنْكَرُ مِنْ فِعْلِ بَعْضِهِمْ قَلِيلٌ نَزْرٌ مَغْفُورٌ فِي جَنْبِ فَضَائِلِ الْقَوْمِ وَمَحَاسِنِهِمْ؛ مِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ، وَرَسُولِهِ، وَالْجِهَادِ فِي سَبِيلِهِ، وَالْهِجْرَةِ، وَالنُّصْرَةِ، وَالْعِلْمِ النَّافِعِ، وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ. وَمَن نَّظَرَ فِي سِيرَةِ الْقَوْمِ بِعِلْمٍ وَبَصِيرَةٍ، وَمَا مَنَّ اللهُ عَلَيْهِم بِهِ مِنَ الْفَضَائِلِ؛ عَلِمَ يَقِينًا أَنَّهُمْ خَيْرُ الْخَلْقِ بَعْدَ الأَنْبِيَاءِ؛ لاَ كَانَ وَلاَ يَكُونُ مِثْلُهُمْ، وَأَنَّهُمُ الصَّفْوَةُ مِنْ قُرُونِ هَذِهِ الأُمَّةِ الَّتِي هِيَ خَيْرُ الأُمَمِ وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللهِ.

---

لە پاشان ابن تيمية باسی مەوقیف و هەڵوێستی ڕافیزە و شیعەکان لەگەڵ نەواصیب و خەواریجەکان دەربارەی هاوەڵ و سەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکا و دەفەرموێ (وَيَتَبَرَّؤُونَ مِنْ طَرِيقَةِ الرَّوَافِضِ الَّذِينَ يُبْغِضُونَ الصَّحَابَةَ وَيَسُبُّونَهُمْ. وَطَرِيقَةِ النَّوَاصِبِ الَّذِينَ يُؤْذُونَ أَهْلَ الْبَيْتِ بِقَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ) ابن تيمية دەفەرموێ ئەهلی سونە و جەماعە ڕەتی دەکەنەوە و بەریئن لە ڕێگای ڕافیزەکان کە شیعەکانن ئەوانەی کە ڕقیان لە سەحابەکان دەبێتەوە و لە هەندێکی کەمیان نەبێ وە لەو ڕێگایەی نەواصیبەکانیش کە ئەوانیش (أَهْلُ الْبَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ) بە قسە یان بە کردار ئازار و ئەزیەتیان داون و دەیاندەن (وَيُمْسِكُونَ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَ الصَّحَابَةِ) ئەهلی سونە و جەماعە خۆیان دەگرن لەوەی ڕویدا لەنێوان سەحابەکان (وَيَقُولُونَ: إِنَّ هَذِهِ الآثَارَ الْمَرْوِيَّةَ فِي مَسَاوِيهِمْ مِنْهَا مَا هُوَ كَذِبٌ) دەفەرمون ئەهلی سونە و جەماعە ئەو ڕیوایەت و گێڕانەوە و قسانەی دەربارەی باسی

خراپەی هەندێک لە سەحابەکان گێڕدراوەیە و کراوە ئەوانە هەیانە درۆیە و هەڵبەستراوە ڕیوایەتەکان (وَمَنْهَا مَا قَدْ زِيدَ فِيهِ وَنُقِصَ) وە هەشیانە لە ڕیوایەت و گێڕانەوەکان زیادە و کەمی تێدا کراوە (وَغُيِّرَ عَنْ وَجْهِهِ) لەڕوی خۆی و مانا و واتاکەی لادراوە (وَالصَّحِيحُ مِنْهُ هُمْ فِيهِ مَعْذُورُونَ) لەو ڕیوایەتانەش کە سەحیحە دەربارەی کەم و کورتی سەحابەکان ئەگەر گوترابێ سەحابەکان خاوەن عوزر و بیانوی شەرعی بونە تێیدا (إِمَّا مُجْتَهِدُونَ مُصِيبُونَ) یان ئەوەیە خاوەن ئیجتیهاد بونە و پلەی ئیجتیهادیان هەبوە و ئیصابەیان کردوە و پێکاویانە دوو ئەجر و پاداشتیان بۆ هەبوە وەکو ئیمامی عەلی لە ڕوداوەکەی لەگەڵ معاویە (وَإِمَّا مُجْتَهِدُونَ مُخْطِئُونَ) یان خاوەنی ئیجتیهاد بونە و پلە و پایەی ئیجتیهادیان هەبوە و هەڵەیان کردوە وەکو ئیمامی معاویە -رضي الله عنه- لەگەڵ ئیمامی عەلی لە ڕوداوەکەی کە ئەجر و پاداشتێکی دەست دەکەوێ ئەگەر دوو ئەجر و پاداشتیشی نەبێ (وَهُم مَّعَ ذَلِكَ) وە لەگەڵ ئەوەدا ئەهلی سونە و جەماعە (لاَ يَعْتَقِدُونَ أَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنَ الصَّحَابَةِ مَعْصُومٌ عَنْ كَبَائِرِ الإِثْمِ وَصَغَائِرِهِ) ئەهلی سونە و جەماعە لەگەڵ ئەوەشدا بیروبروایان وا نیە کە هەریەک لە سەحابەکان تاکی سەحابەکان مەعسوم و بێ گوناح بوبێ لە گوناحە گەورەکان یان لە گوناحە بچوکەکان (بَلْ يَجُوزُ عَلَيْهِمُ الذُّنُوبُ فِي الْجُمْلَةِ) بەڵکو دەشێ و دەگونجێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە سەحابە و هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) گوناحی گەورە یان بچوکیان توش بوبێ (وَلَهُم مِّنَ السَّوَابِقِ وَالْفَضَائِلِ مَا يُوجِبُ مَغْفِرَةَ مَا يَصْدُرُ مِنْهُمْ ـ إِنْ صَدَرَ ـ) دەفەرموێ بەڵام لەبەر زۆر پێشینی چاک و فەزڵ و پلە و پایەیان سەحابەکان ئەگەر گوناحیشیان لێ ڕودرابێ لێخۆشبونی خوای رب العالمین بۆیان دەرچوە و دەیانگرێتەوە چونکە پلە و پایەی بەرز و خێر و چاکەی زۆریان هەبوە (حَتَّى إِنَّهُمْ يُغْفَرُ لَهُم مِّنَ السَّيِّئَاتِ مَا لاَ يُغْفَرُ لِمَنْ بَعْدَهُمْ) جا ئەوەی لەوان دەبوردێ و خوای رب العالمين لەوان خۆش دەبێ لە خەڵکی تر لەپاش ئەوان خۆش نابێ چونکە ئەوان پلە و پایەیان نەبوە و ئەو دەستپێشخەریەیان نەبوە بۆ ئیسلام (لأَنَّ لَهُم مِّنَ الْحَسَنَاتِ الَّتِي تَمْحُو السَّيِّئَاتِ مَا

لَيْسَ لِمَنْ بَعْدَهُمْ) چونکە ئەوان خاوەنی هەندێک لە چاکەکانن ئەو چاکانەی کە خراپەکانی ڕەش کردوەتەوە و ڕەش دەکاتەوە بەڵام ئەوانەی لەدوای ئەوان هاتون خاوەنی ئەو چاکانە نین (وَقَدْ ثَبَتَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)) جێگیر بوە بە فەرمودەی پێغەمبەری الله (ﷺ) (أَنَّهُمْ خَيْرُ الْقُرُونِ) ئەوان باشترین سەدە و قەڕن بونە سەحابەکان -رضي الله عنهم-.

کە عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي» باشترینی خەڵکان قەڕن و سەدەی منە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) کە زانایان وا پێناسەی دەکەن و ڕاڤەی دەکەن واتە سەحابەکانن، ئینجا «ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ[1]» لەپاش خەيرييەت و پلە و پایەی سەحابەکان تابیعیەکان دێن ئینجا تابیعی تابیعیەکان دێن.

جا ابن تیمیة لە درێژەی قسەکانی لە مەتنی (الواسطیة) دەفەرموێ (وَأَنَّ الْمُدَّ مِنْ أَحدهِمْ إِذَا تَصَدَّقَ بِهِ كَانَ أَفْضَلَ مِنْ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهَبًا مِمَّن بَعْدَهُمْ) یەک لە مست و چنگی سەحابەکان یان نیوەی مست و چنێگێک کە ئەوان بیبەخشن لەپێناو خوای رب العالمین وەکو سەدەقە و خەیر چاکتر و پلەدارترە لە بەخشینی ئەوانەی لەدوای سەحابەکان دێن ئەگەر بە قەد کێو و چیای ئوحودیش ببەخشین لە زێڕ.

ئەوەشیان لەبەر ئەو فەرمودە سەحیحەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە لە ڕابردوش باسمان لێوەکرد کاتێ کە خالیدی کوڕی وەلید قسەیەک و بێڕێزی و جوێن فڕۆشیەکی بەسەر زماندا دێ بەرامبەر بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي» جوێن فڕۆش مەبن بەرامبەر هاوەڵانم «لَوْ أَنْفَقَ أَحدكُمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ[2]» ئەگەر هەریەک لە ئێوە بە قەد کێو و شاخی ئوحود لە زێڕ ببەخشن ناگەنە

[1] صحيح البخاري (٣٦٥١) (٢٦٥٢) (٦٤٢٩)، صحيح مسلم (٢٥٣٣)، سنن الترمذي (٣٨٥٩).

[2] أخرجه البخاري برقم (٣٦٧٣) في فضائل الصحابة، باب: قول النبي صلى الله عليه وسلم لو كنت متخذا خليلا. ومسلم برقم (٢٥٤١) في فضائل الصحابة، باب: (تحريم سب الصحابة رضي الله عنهم . عن أبي هريرة رضي الله عنه.

بەخشینی سەحابەکان بەقەد چنگێک ئەگەر ئەوان بەخشی بێتیان یان نیو چنگێک و نیو گۆلمێگ.

لە پاشان ابن تيمية دەفەرموێ (ثُمَّ إِذَا كَانَ قَدْ صَدَرَ مِنْ أَحدهِمْ ذَنْبٌ) لە پاشان ئەگەر جارێک یان جار و بارێک لە هەر یەکێک لە سەحابەکان تاوان و گوناحێک ڕویدابێ (فَيَكُونُ قَدْ تَابَ مِنْهُ) تەوبەی لێکردوە سەحابەکە و هەندێک جار لێی گەڕاوەتەوە (أَوْ أَتَى بَحَسَنَاتٍ تَمْحُوهُ) یان لە پاشان کردەوەی چاکی کردوە و ئەو کردەوە چاکانە سەیئات و خراپە و گوناحەکەی ڕەش کردوەتەوە (أَو غُفِرَ لَهُ) یان خوای رب العالمين بە فەزڵ و بەخشش خۆی لێی بوریوە (بِفَضْلِ سَابِقَتِهِ) لەپێناو ئەوەی کە لەپێشتردا پلەی چاکی پێشینی هەبوە و دەستپێشخەری هەبوە لە چاکە (أَوْ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ (ﷺ)) یان بە تکا و شەفاعەتکردنی پێغەمبەر بۆی (ﷺ) (الَّذِي هُمْ أَحَقُّ النَّاسِ بِشَفَاعَتِهِ) کە لە هەموو خەڵکی لەپێشتر بۆ شەفاعەت و تکای پێغەمبەر (ﷺ) سەحابەکانن (أَوْ ابْتُلِيَ بِبَلاَءٍ فِي الدُّنْيَا كُفِّرَ بِهِ) یان هەر لە دونیادا الله تعالى بەڵا و موسیبەتێکی بەسەر هێناوە بوەتە مایەی ڕەشبونەوە و کەفارەتی گوناح و تاوانی سەحابەکە (فَإِذَا كَانَ هَذَا فِي الذُّنُوبِ الْمُحَقَّقَةِ) جا ئەگەر ئەوە سەبارەت بەو گوناح و تاوانە سەد لە سەدیانەی کە هاتوەتەجێ (فَكَيْفَ الأُمُورُ الَّتِي كَانُوا فِيهَا مُجْتَهِدِينَ) ابن تيمية دەفەرموێ ئەی چۆن شیعە و خەڵکانێک بۆیان هەیە قسە بکەن لەو ئیش و کار و مەسەلە و بابەتانەی کە ئەوان تێیدا موجتەهید بونە نەک گوناحکاری سەدا سەد و حەقیقی بێ و شتەکە ڕون و ئاشکرا نەبوە و ئیجتیهادیان تێدا کردوە وەکو ئەوەی لە نێوان ئیمامی عەلی و ئیمامی معاویە -رضي الله عنهما- ڕویدا (إِنْ أَصَابُوا) جا ئەگەر لە باس و خواس و شتێک ئەوان موجتەهید بونە ئەگەر ئیصابەیان کردبێ و پێکابێتیان (فَلَهُمْ أَجْرَانِ) لەسەر حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ) دوو ئەجر و پاداشتیان هەبوە (وَإِنْ أَخْطَؤُوا) ئەگەر هەڵەیان کردبێ (فَلَهُمْ أَجْرٌ وَاحِدٌ) یەک ئەجر و پاداشتیان دەست

کەوتوە (وَالْخَطَأُ مغْفُورٌ) هەڵە و کەم و کورتیەکانیش شایستەی لێبوردنە و الله تعالى لێی دەبورێ.

ئەوەتا کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ[1]» الله تعالى لەسەر ئومەتەکەم نانوسێ و دایبەزاندوە و حیسابیان لەسەر ناکا لە شتەکانی بە هەڵە دەیکەن یان بە لەبیرچونەوە یان بە زۆرە ملێ پێیان دەکرێت، ئەوەش بەو مەرجانەی کە (مکره) دەگرێتەوە و زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە باسیان لێوە کردوە، جا سەبارەت بەوەش موجتەهید ئەگەر ئیصابەی کرد و پێکای دوو ئەجری هەیە و ئەگەر نەیپێکا وە هەڵەی کرد یەک ئەجر و پاداشتی هەیە لەبەر ئەو حەدیسەی پێغەمبەرە (ﷺ) ئەوەیە بەڵگە لەسەری کە عەمری کوڕی عاص دەفەرموێ گوێبیستی پێغەمبەری الله بوم (ﷺ) فەرموی: «إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ» ئەگەر حاکم حوکمیدا و ئیجتیهادی کرد «ثُمَّ أَصَابَ، فَلَهُ أَجْرَانِ» لە پاشان ئیصابەی کرد و پێکای حوکمەکەی ڕاست دەرچوو دوو ئەجر و پاداشتی دەست دەکەوێ ئەو حاکمە «وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ، فَلَهُ أَجْرٌ[2]» ئەگەر حاکمەکە ئیجتیهادی کرد و هەوڵیدا لە پاشانەکە هەڵەی کرد ئەوە ئەجر و پاداشتێکی دەست دەکەوێ تەنها هی هەوڵدان و ماندوبونەکەی دەست دەکەوێ.

کەواتە ئەهلی سونە و جەماعە بەرین لە ڕێباز و ڕێگای ڕافیزە و شیعەکان وە هی خەواریجەکان کە هەریەک بە نەوعێک بێ ڕێزیان کردوە لەگەڵ (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ) وە لەگەڵ سەحابەکان، ئەوەتا شیعەکان هەندێک جار زێدەڕەوییان کردوە وە ڕافیزەکان بەو ئەندازە و دەرەجە گەیشتون وەکو تاقمەی عەلەویەکان و عەلیلاهیەکان و نوصەیریەکان کە بنەماڵەی حافظ الأسد لە سوریا و خەڵکانێکی تریشیان لە دەوروبەرە و هەندێکیشیان لە میسردا دەژین کە (نعوذ بالله) پلەی خوایەتیان داوەتە ئیمامی عەلی ئەوە

[1] سنن ابن ماجه (٢٠٤٣).

[2] صحيح البخاري (٧٣٥٢) |كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة| باب أجر الحاكم إذا اجتهد فأصاب أو أخطأ.

ئەهلی سونە و جەماعە لەو قسە و ئیشەی ئەوان بەرین، یان دەڵێن ئیمامی عەلی ئەحەقتر بوە وەكو ئیمامیەكان بە خەلافەت لە ئیمامی ئەبو بەكر كە دەبا یەكەم خەلیفەبا لەوە بەرین ئەهلی سونە و جەماعە وە ڕاست نیە و ڕەتكراوەیە و ئیمامی ئەبو بەكر وە ئیمامی عومەر ئەحەقتر بونە لە ئیمامی عەلی بە خەلیفایەتی و ئەوەی ئەهلی سونە و جەماعە بڕوایان پێی هەیە ڕاستترە كە ئیمامی ئەبو بەكر یەكەم خەلیفەیە و ئیمامی عومەر دوەمە، ئینجا نەواصیب و خەواریجەكانیش كە ئەگەر هەندێكی كەمیش بونە بەڵام لە سەردەمی بەنی ئومەیە هەندێک لەوانەی كە موالات و دۆستایەتی و نزیكیان لەگەڵ بەنو ئومەیە هەبوە ڕقیان لە ئیمامی عەلی هەڵگرتوە و وە لە (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ) بەوانە گوتراوە نەواصیب، بۆ؟ چونكە (نصبوا العداوة لأهل البيت) لەوە ئەو ناوەیان بۆ هات كە پێداگرییان كرد و دوژمنكارییان جێگیر كرد لە بەرامبەر (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ)، ڕافیزەش لەبەر ئەوە ناویان لێ نراوە ڕافیزە شیعەكان كە زۆر پێیان ناخۆشە چونكە دژایەتی نەواصیبەكانیان دەكرد كە پێچەوانەی یەكترن، ڕافیزە و شیعەكان ئیمامی ئەبو بەكر (نعوذ بالله) لەعنەتی لێدەكەن قسەی ناشرین و نابەجێی پێدەڵێن وە بێڕێزیان لەگەڵ دەكەن ئەهلی سونە و جەماعە لەو شتانە بەرین، وە ناصیبەكانیش دوژمنكاری ئیمامی عەلیان كردوە وە هی ذوریەتەكەیان كردوە ئا ئەوانە هەموی هەڵەیە و ئەهلی سونە و جەماعە بە هیچ نەوع و شێوازێک لەگەڵیاندا نین، و وە ئەهلی سونە و جەماعە سۆز و خۆشەویستی و وەلائیان هەیە بۆ (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر (ﷺ) وە ڕێزیان لێ دەنێن وەسیەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) جێبەجێ دەكەن كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ڕێزیان لێ بنێن و دەستیان پێوە بگرن، وە ئەهلی سونە و جەماعە ئەو ڕوداوانەی كە لە نێوان سەحابەكان ڕویداوە بە تایبەت لە نێوان ئیمامی عەلی و ئیمامی معاویە -رضي الله عنهما- بە ئیجتیهادیان داناوە، ئیمامی معاویە هەڵەی تێدا كردوە ئەجرێكی دەست دەكەوێ و كەوتوە، وە ئیمامی عەلی ئیصابەی تێدا كردوە و پێكاوێتی دوو ئەجر و پاداشتی دەست كەوتوە، ئەوە بۆچونی ئەهلی

سونە و جەماعەیە ئەگەر سەحابەکان هەڵە و کەم و کورتیان هەبوە وە تاوان و گوناحیان هەبوە لەبەر باشی پێشتریان الله تعالى لێیانی بوریوە یان چاکەیان کردوە و گوناحەکانی پێ ڕەشبوەتەوە یان تەوبەیان لێکردوە و الله تعالى لێی قبوڵ کردون، جا نابێ بە هیچ شێوازێک بێ ڕێزییان لەگەڵ بکرێ و بیری شتی تریان لێ بکرێتەوە، ئەوە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە و تا ئەو کاتە ئێمە بە تەواوەتی کەواتە لەسەر ڕێبازێکی ڕاست و دروستی ئەهلی سونە و جەماعەین ئەگەر بیروبڕوامان وابێ.

## فەزڵ و پلە و پایە و قەدر گرانی سەحابەکان:

ثُمَّ إِنَّ الْقَدْرَ الَّذِي يُنْكَرُ مِنْ فِعْلِ بَعْضِهِمْ قَلِيلٌ نَزْرٌ مَغْفُورٌ فِي جَنْبِ فَضَائِلِ الْقَوْمِ وَمَحَاسِنِهِمْ؛ مِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ، وَرَسُولِهِ، وَالْجِهَادِ فِي سَبِيلِهِ، وَالْهِجْرَةِ، وَالنُّصْرَةِ، وَالْعِلْمِ النَّافِعِ، وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ. وَمَن نَّظَرَ فِي سِيرَةِ الْقَوْمِ بِعِلْمٍ وَبَصِيرَةٍ، وَمَا مَنَّ اللهُ عَلَيْهِم بِهِ مِنَ الْفَضَائِلِ؛ عَلِمَ يَقِينًا أَنَّهُمْ خَيْرُ الْخَلْقِ بَعْدَ الأَنْبِيَاءِ؛ لاَ كَانَ وَلا يَكُونُ مِثْلُهُمْ، وَأَنَّهُمُ الصَّفْوَةُ مِنْ قُرُونِ هَذِهِ الأُمَّةِ الَّتِي هِيَ خَيْرُ الأُمَمِ وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللهِ.

---

گەیشتینە سەر باس و خواسی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و فەزڵ و پلە و پایە و قەدر گرانیان ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ (ثُمَّ إِنَّ الْقَدْرَ الَّذِي يُنْكَرُ مِنْ فِعْلِ بَعْضِهِمْ قَلِيلٌ نَزْرٌ مَغْفُورٌ فِي جَنْبِ فَضَائِلِ الْقَوْمِ وَمَحَاسِنِهِمْ) دەفەرموێ ئەو ئەندازەی کە ڕەتدەکرێتەوە لە ئیش و کارەکانی هەندێک لە سەحابەکان کە زۆر کەمە لێبوردنی پێوەیە سەبارەت بەو فەزڵ و پلە و پایە زۆرە و چاکیانەی هەیانە، مەبەستی لەوەیە واتە هەندێک لە تاوان و گوناحی کەم ئەگەر هەندێکی کەم لە سەحابەکان لێیان ڕوشی دابێ هەندێک جار گێڕدراوەیە ئەگەر دزی هەندێک جار ڕویدابێ یان زینا ڕویدابێ و خۆیان تەسلیمی شەرعی الله تعالى کردبێ یان ئارەق خواردنەوە ڕویدابێ جا ئەوانە هەر هەمویان سەبارەت بە فەزڵ و بەخشش و پلە و پایە زۆرەکانیان یەکجار یەکجار کەم ڕویداوە لەو سەردەمە وە لە کەسانێکی زۆر کەم بوە فەزڵ و بەخشش و بەرەکەت و پلە و پایە و چاکەیان زۆر

زۆر زیاتر بوە، کەواتە تەرازووی چاکەی سەحابەکان بەگشتی زۆر بەرزترە قورسترە لە ئیش و کارە کەمە گوناحانەی کە لە هەندێکیان ڕویداوە وە تەوبەیان لێکردوە یان لێی گەڕاونەتەوە و قبوڵی ئەوەیان بوە حەد و سنوری خواییان بەسەردا جێبەجێ بکرێ ئەوە ناکرێ کە بڵێین بەهۆیەوە کەم و کورتی بڕیار بدرێ بەرامبەر بە سەحابەکان بڵێین لە ئاستیان کەم بکرێتەوە لە ڕێزیان کەم بکرێتەوە، دەفەرموێ باشی و چاکەکانیان لەچی؟ باسی فەزڵ و پلە و پایە و چاکیەکانیان دەکا (مِنَ الإِيمَانِ بِاللهِ) یەک لە فەزڵ و چاکە و پلە و پایەکانی سەحابەکان لە ئیمان بە اللەیە یەکجار پلەیان بەرز بوە (وَرَسُولِهِ) وە ئیمان بە پێغەمبەری الله (ﷺ) (وَالْجِهَادِ فِي سَبِيلِهِ) لە جەنگ و جیهاد و تێکۆشان لەپێناو الله (وَالْهِجْرَةِ) وە لە هیجرەت کردن و کۆچکردنیان لەپێناو الله (وَالنُّصْرَةِ) وە لەسەرخستنی الله و پێغەمبەری الله و (ﷺ) دینی ئیسلام (وَالْعِلْمِ النَّافِعِ) لەو عیلم و زانستیە سود بەخشانەی هەیان بوە (وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ) لەو کار و کردەوە چاکانەی کە هەیان بوە یەکجار زۆربوە و پلە و پەیەیان زۆر بەرز بوە ئەگەر کەم و کورتیەکیش جار و بارێکیش لە هەندێکی کەمیان ڕوشی دابێ ئەوە بەهیچ دانانرێ سەبارەت بەو فەزڵ و پلە و پایە و چاکیانە لەو بوارە کە هەیان بوە، چونکە پێغەمبەریش (ﷺ) ئەو شاهێدیەی کە بۆی دان ئەوانە هەڵدەوەشێنێتەوە دەفەرموێ: «خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ[١]» فەرموی باشترین خەڵکان ئەو خەڵکەی سەدەی منن پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) کە لە قەڕن و سەدە و چاخی مندا دەژین لە پاشان ئەوانەی لەپاش ئەوان دێن کە تابیعیەکانن ئەوانەی لەپاش ئەوانیش دێن کە تابیعی تابیعیەکانن، کەواتە بەوە خەیریەت و چاکترینی سەحابەکان بەدیار کەوت وە هی تابیعیەکان بەدیار کەوت هی تابیعی تابیعیەکان بەدیارکەوت تازە هەرچیان پێ بگوترێ سەحابەکان لەوەندە کەم و کورتیەی کە کەم بوە لە ژیانیان و هەیان بوە ئەوە نایەتە تەرازوی بەرامبەر ئەو هەموو چاکە و فەزڵ و پلە و

[١] **صحيح البخاري** (٣٦٥١) (٢٦٥٢) (٦٤٢٩)، **صحيح مسلم** (٢٥٣٣)، **سنن الترمذي** (٣٨٥٩).

پایە و ئەو خێر و چاکانەی کە هەیان بوە، لە پاشان ابن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ (وَمَن نَّظَرَ فِي سِيرَةِ الْقَوْمِ بِعِلْمٍ وَبَصِيرَةٍ) هەریەک بڕوانێتە مێژو و ژیاننامەی ئەو خەڵکانە، قەوم بە کۆمەڵە کەسێک دەگوترێ لێرەش ابن تیمیة مەبەستی پێی سەحابەکانە، ئەوەی بڕوانێتە ژیاننامەی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە عیلم و زانینەوە و بە بەصیرەت و چاو ڕونیەوە (وَمَا مَنَّ اللهُ عَلَيْهِم بِهِ مِنَ الْفَضَائِلِ) وە بڕوانێتە ئەو فەزڵ و بەخشش و منەتانەی الله بەسەر ئەوانیدا هەبوە و لەگەڵی کردون لەگەڵ سەحابەکان (عَلِمَ) ئەوکات ئەو کەسە دەزانێ (عَلِمَ يَقِينًا أَنَّهُمْ خَيْرُ الْخَلْقِ بَعْدَ الأَنْبِيَاءِ) چاک ڕون دەبێتەوە بۆی ئەو کەسە و دەشزانێ کە سەحابەکان باشترینی بەدیهێنراون لەدوای پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) (لاَ كَانَ وَلا يَكُونُ مِثْلُهُمْ) نە لە پێشتر نمونەیان هەبوە نە ئێستاش دەبێ و نە لە داهاتوش دەبێ (وَأَنَّهُمُ الصَّفْوَةُ مِنْ قُرُونِ هَذِهِ الأُمَّةِ الَّتِي هِيَ خَيْرُ الأُمَمِ وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللهِ) جا بەدیار دەکەوێ بۆی بەڕاستی ئەوانە هەڵبژاردەی زۆر پاک و خاوێنی ئەو چاخە بونە لەناو چاخ و کات و قەرنەکان هی ئومەتی پێغەمبەرە (ﷺ) لە باشترینی ئومەتەکان بونە وە بەڕێزترینیان بونە لە خزمەت الله و لەلای الله تعالى -جل شئنه-.

کەواتە بەڵێ بەدیار کەوت کە خوای رب العالمين دەفەرموێت: ﴿كُنتُم خَيرَ أُمَّةٍ أُخرِجَت لِلنَّاسِ تَأمُرُونَ بِٱلمَعرُوفِ وَتَنهَونَ عَنِ ٱلمُنكَرِ وَتُؤمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ [آل عمران: ١١٠] ئێوە ئەی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) چاکترین ئومەتن کە دەرچونە الله تعالى بەدیهێناون فەرمان دەکەن بە چاکە ڕێگری دەکەن لە خراپە بڕوا دەهێنن بە الله تعالى، ئینجا الله تعالى کە وا دەفەرموێ پێغەمبەریش دەفەرموێ (ﷺ) باشترین قەرن لەناو ئەو ئومەتە قەرنی سەردەمی پێغەمبەرە (ﷺ) کە سەحابەکان دەگرێتەوە، کەواتە سەحابەکان باشترین خەڵکن لەو ئومەتە ئەو ئومەتەش باشترین ئومەتە بەسەر ئومەتەکانی ترەوە، کەواتە ئەوە بەڵگەیە لە ئەهلی سونە و جەماعە بە بەڵگەی دەهێننەوە سەحابەکان باشترینی هەموو ئومەتەکانن

باشترینی هەموو خەڵکەکانن ئەوانەی لەپێشتر هاتون و ئەوانەی لەپاشتریش دێن هەرکەسێک بێ ناگاتە سەحابەکان لە پلە و پایە و وە لە فەزڵ و گەورەییدا.

تابیعی تابیعیەکان هەتا چ سەردەم و مێژویەک ئەو پلەی خەیرول قرونیەتیان پێدەگا کە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) چاکترین قەرن سەردەمی منە و ئەوەی لە دوای ئەوان ئەوەی لەدوای ئەوان؟ الحافظ ابن حجر العسقلانی دەفەرموێ: (واتفقوا أن آخر من كان من أتباع التّابعين ممن يقبل قوله من عاش إلى حدود العشرين ومئتين[١]) ئیتیفاق و یەک دەنگی هەیە لەسەر ئەوەی کۆتایی ئەتباعی تابیعین شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان بە خەیرول قرون هەر دادەنرێ هەتا سنوری ساڵانی دوو سەد و بیستی کۆچی، هەتا ئەو کاتانیش ئەگەر یەکێک ژیابێ لە تابیعی تابیعین هەر لەو سنورە حیساب بونە کە خەیرول قرونیەتیان بەردەکەوێ و ئەو پلە و پایەی پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمونە.

## ئیمان هەبون بە کەرامەتی وەلیەکان:

وَمِنْ أُصولِ أَهْلِ السُّنَّة: التَّصْدِيقُ بِكَرَامَاتَ الأَوْلِيَاءِ وَمَا يُجْرِي اللهُ عَلَى أَيْدِيهم مِّنْ خَوَارِقِ الْعَادَاتِ فِي أَنْوَاعِ الْعُلُومِ وَالْمُكَاشَفَاتِ وَأَنْوَاعِ الْقُدْرَةِ وَالتَّأْثِيرَاتِ، والمأثور عَنْ سَالِفِ الأُمَمِ فِي سُورَةِ الْكَهْفِ وَغَيْرِهَا، وَعَنْ صَدْرِ هَذِهِ الأُمَّةِ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَسَائِرِ فرق الأُمَّةِ، وَهِيَ مَوْجُودَةٌ فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ.

---

جا لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- دەگاتە سەر باس و بابەتێکی تر کە بۆمان باس دەکا ئەویش مەسەلەی کەرامەتی وەلیەکانە، ابن تيمية جێگیری دەکا لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە کە کەرامەتی وەلیەکان شتێکی جێگیرە.

کەرامەت سەرەتا بزانین چیە؟ کەرامەت شتێکە ڕێز لێنانە هی الله تعالى کە دەیبەخشێ بە وەلیەکانی خۆی و دۆستەکانی خۆی ئەو ڕێز لێنانە وەکو پلە و پایەیان لە دونیا و لە قیامەتدا بەرز دەکاتەوە، وە کەرامەت بەوەش دەگوترێ هەندێک جار (خارق العادة)یە

---

[١] الفتح" (٧/ ٦).

شتێکی لە عادەت بەدەر لەسەر دەستیان ڕودەدا و الله تعالى دەیهێنێتەجێ ئەوە ئەو کاتە ڕێز لێنانە بۆ وەلیەکان الله تعالى کە دەیکا ئەوە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە جێگیرە.

کە ابن تيمية فەرموی (وَمِنْ أُصَولِ أَهْلِ السُّنَّة: التَّصْدِيقُ بِكَرَامَاتَ الأَوْلِيَاءِ وَمَا يُجْرِي اللهُ عَلَى أَيْدِيهِم مِّنْ خَوَارِقِ الْعَادَاتِ فِي أَنْوَاعِ الْعُلُومِ وَالْمُكَاشَفَاتِ وَأَنْوَاعِ الْقُدْرَةِ وَالتَّأْثِيرَاتِ، والمأثور عَنْ سَالِفِ الأُمَمِ فِي سُورَةِ الْكَهْفِ وَغَيْرِهَا، وَعَنْ صَدْرِ هَذِهِ الأُمَّةِ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَسَائِرِ فرق الأُمَّةِ، وَهِيَ مَوْجُودَةٌ فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) دەفەرموێ یەکێکی تر لە بنەماکانی ئەهلی سونە و جەماعە کە بەڵگەی لە قورئان و سونە بۆ دەهێننەوە بەڕاست دانانی کەڕامەتی وەلیەکانە ابن تيمية دەفەرموێ، ئەو کەڕامەتانەی کە الله تعالى لەسەر دەستی وەلیەکان بەدی دەهێنێ کە (خوارق العادة)ن، (خوارق) یانی کون کردن و تێپەڕ کردن، عادەتیش یەعنی عورف و عادەت ئەوەی لەناو خەڵک باوە، بۆ نمونە لەناو ئێمە باوە شەو و ڕۆژ هەبێ بۆ نمونە لەناو ئێمە باوە ئەگەر ڕۆژ لە دەرەوە بوو ئەو کاتەی گەیشتە نیوەڕۆ ئەوە کاتی نوێژی نیوەڕوانە (ئەگەر زەوال هات) بۆ نمونە لەناو ئێمە باوە لە کاتی زستانان دونیا ساردبێ بە تایبەت لە وەرز و وڵاتی ئێمەدا وە لە هاوینان دونیا گەرم بێ وە لە بەهاران دونیا فێنکیەکی خۆشی شێداربێ وە لە پاشان لە پایزان گەڵاکان هەڵوەرێ بە نەوعێکی تربێ جەو، جا ئەوانە هەر هەموی عادەت وایە ئەگەر کەسێک دەستی لەسەر ئاگر دابنێ بسوتێ ئەگەر کەسێک گولەی لێبدرێ یان بریندار بێ یان بکوژرێ ئەوانە هەموو عادەت و عورف سەلماندویەتی و ئەو ڕوداوانە ڕودەدەن، جا هەندێک جار پێچەوانەی عادەت تێپەڕ دەکا لە عادەت هەندێک شت ڕودەدا بۆ وەلیەکان الله تعالى وەکو ڕێز لێنانە لێیان دەنێ، ئینجا ابن تيمية دەڵێ ئەو شتانەی لە عادەت تێپەڕ دەکەن وەکو عادەت نایەنەجێ ئەوانە الله تعالى وەکو کەڕامەت ئەهلی سونە و جەماعە بڕوایان پێی هەیە بە ئایەت و حەدیس جێگیرە لەسەر دەستی وەلیەکان ڕودەدا (فِي أَنْوَاعِ الْعُلُومِ

وَالْمُكَاشَفَاتِ) هەندێک جار لە زۆرێک لە عیلم و زانستیەکان، بۆ نمونە (خوارق العادة)ی عیلمی چیە؟ الله تعالی ئەوەی بە ئیمامی ئەبو بەکر بەخشی کە زانی لەناو ڕەحمی خێزان و هاوسەرەکەی ئەو کۆرپەلەی تێیدایە مێینەیە زانی کچە، ئەوە عیلم و زانستێک بوو کە تەکنەلۆجیای سەردەمی ئێستاش تەواو پێی نەگەیشتوە سۆنەریش سەدا سەد نازانێ ئایە کچە یان کوڕە؟ بە ئەگەر دەزانێ بە هەندێک لێکدانەوە دەزانێ هەندێک جار هەڵەش دەردەچێ، ئیمامی ئەبو بەکر سەد لە سەد زانی ئەو عیلمەی پێ زیاد بوو چونکە وەلی خوای رب العالمین بوو الله تعالی ئەو کەرامەتەی هێنایە سەر دەستی ئیمامی ئەبو بەکر و بۆی ڕویدا (وَالْمُكَاشَفَاتِ) موکاشەفە کەشف دەکا شتێکی دور بە دوری وەکو ئیمامی عومەر ئەو شاخ و چیایەی بۆ ئاشکرا کرد الله تعالی وەکو شاشەیەک هاتە بەرچاوی سارییە کە لەوێ دەجەنگی و جەنگی دەکرد چەند لە ئیمامی عومەر دور بوو؟ ئیمامی عومەر بۆی کەشف بوو وەکو وەلیەکی خوای رب العالمین وە گوتی ئەی سارییە چیایەکە چیایەکە شاخەکە شاخەکەی پشتت سارییە گوێبیستی قسەکانی ئیمامی عومەر بوو، وە لە پاشان (وَأَنْوَاعِ الْقُدْرَةِ وَالتَّأْثِيرَاتِ) وە هەندێک جار هەندێک لە کاریگەریەکان وە دەسەڵات و هێزی زیاتر خوای رب العالمین دەبەخشێ وەکو مەریەم (عليها السلام) مەریەم ئافرەتێک بوو وەکو کوردەواری دەڵێ لەسەر مانگ و ڕۆژی خۆی بوو عیسا پێغەمبەری بێ (ﷺ) ئافرەت بەخۆی بێتاقەت تریشە دار خورما پیاوی زۆر بە توانا ئینجا دەتوانێ بیهەژێنێ الله تعالی کە فەرموی: ﴿وَهُزِّي﴾ [مريم: ٢٥] هوزی یانی هەژاندن ڕاهەژاندن، دار خورماکە ڕابهەژێنە بەو بێتاقەتیە الله ئەو قودرەت و توانا و دەسەڵاتەی بە مەریەم بەخشی وەکو کەرامەتێک لە عادەت بەدەر بوو ئافرەت ئەو ئیشەیان پێ نەدەکرا ئەگەر حەملیان نەبا وە ئەگەر حەملی هەبێ و لە مانگی ئاخیری بێ زۆر بێتاقەتترە و هەر پێی ناکرێ لە عادەت بەدەر بوو کە مەریەم خورماکە و دار خورماکەی هەژاند ڕوتەب و خورمای زۆر تەڕ و پڕی پێوەهات کە پێشتر وشک بوو وە دابەزی بەسەری و وە هەژا و لێشی خوارد مەریەم

(عليها السلام)، ئینجا کەواتە ئەوانە زۆر هەن بە بەڵگەش جێگیرن ابن تيمية دەفەرموێ (والمأثور عَنْ سَالِفِ الأُمَمِ) وە ئەهلی سونە و جەماعە بڕوایان بەو کەڕامەتانەش هەیە کە گێڕدراوەیە وەکو ئەثەر (مأثور) یەعنی گێڕدراوە وەکو ئەثەر و ڕیوایەت هەیە لێیان لە ئومەتەکانی پێش ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو (فِي سُورَةِ الْكَهْفِ وَغَيْرِهَا) ئەوەی گێڕدراوەیە لە ئایەتەکانی قورئان لەنێو سوڕەتی کەهفدا یارانی ئەشکەوت ئەصحابی کەهف ئەوەی الله تعالى بۆی ڕودان کەڕامەت بوو ڕێز لێنان بوو (خارق العادة) بوو سێ سەد و ئەوەندە ساڵە بنون هیچیشیان بەسەر نەیە هەڵیش بستنەوە لە پاشان وە لە پاشان قوتاریان ببێ کەس نەوێرێ بچێتە سەریان ئەوانە هەموی کەڕامەت و ڕێز لێنان بوو الله تعالى پێی بەخشیبون (وَغَيْرِهَا) جگە لەو ڕوداوەی ئەصحابی کەهفیش وەکو هی مەریەم (عليها السلام)، وە وەکو هی ئەو پیاوە کە گوێدرێژەکەی لێ دەمرێ و لە پاشان الله بۆی زیندو دەکاتەوە، وە دەیەها ڕیوایەت و وە قسە و گێڕانەوەی تر هەیە، وەکو هی جوڕەیجی عابید کە ئەوکاتە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی دایکی دێ و هاواری لێدەکا و سێ ڕۆژان و دوایی دۆعای لێدەکا الله تعالى تاقی بکاتەوە لەگەڵ ئافرەتێکی داوێن پیس ئەوەبوو تاقی دەکرێتەوە و ئافرەتە داوێن پیسەکە لە فەرمودەی سەحیح هاتوە کە بوختان بە جوڕەیج دەکا دەڵێ ئەو حەملەی هەمە لە جوڕەیجە و منداڵەکەی دەبێ دەڵێ جوڕەیج باوکێتی و لە پاشان خەڵک کۆدەبنەوە و صەومەعەکە لە جوڕەیج تێک دەدەن و دەیڕوخێنن و لە جوڕەیج دەدەن و جوڕەیج دوو ڕکاعەت نوێژ دەکا و سوجدە و کڕنۆش بۆ الله دەبا و سەلام دەداتەوە و کۆرپەلە و منداڵەکەی داوا دەکا بۆلای بێنن بە پەنجەی تێوەی دەژەنێ لە سکی و پەنجەی لێدەدا و دەڵێ ئەی منداڵ کێ باوکتە؟ منداڵ بە دەنگ دێ منداڵی کۆرپەلەی مەلۆتکە قسە نازانێ و نایکا خوای رب العالمين وەکو کەڕامەتێک بۆ جوڕەیج لە فەرمودەی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) جێگیر بوە ابن تيمية مەبەستی ئەوانەیە کە دەڵێ لە ئومەتەکانی پێشتر ڕویداوە وەکو کەڕامەتێک جوڕەیج پێغەمبەریش نەبوە بەڵکو تەنها وەلی خوای

رب العالمين و عابيد بوە لە حەديسە سەحيحەكە وا ناوی هاتوە وەكو كەرامەتێک الله تعالی منداڵەكەی وە دەنگ هێنا گوتی فڵانە شوان باوكمە نەک جورەيج، ئەو كاتە بەربونە جورەيج بە ماچ كردن و دەست پێداهێنان و گوتيان صەومەعەيەک لە زێرت بۆ دروست دەكەينەوە، گوتی هيچێک لەوانەم ناوێ بەڵكو تەنها هەروەكو خۆی لە خۆڵ و گڵ وە لە قورِ بۆم دروست كەنەوە و بەسمە.

ئينجا ابن تيمية دەفەرموێ (وَعَنْ صَدْرِ هَذِهِ الأُمَّةِ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ) وە ئەو كەرامەت و (خوارق العادة)انەی روشی داوە ئەهلی سونە و بڕوايان پێی هەيە لە يەكەمينەكانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و سەرەتا و تازەی هاتنی ئيسلام و سەردەمی سەحابە لە سەحابە و هاوەڵەكان ئيمامی ئەبو بەكر كەرامەتی بۆ روداوە ئيمامی عومەر كەرامەتی بۆ روداوە ئيمامی عوسمان لێی رويداوە ئيمامی عەلی لێی رويداوە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاس لێی رويداوە وە دەيەها فەرمودە و بەڵگەی سەحيحی تر كە ئيمامی اللالكائي لە يەكێک لە بەرگەكانی ئصوڵی ئيعتيقادی ئەهلی سونە و جەماعە تۆماری كردوە دەيەها فەرمودە و روداو و ئەثەری گێراوەتەوە بۆ كەرامەتەكانی وەليەكانی خوای رب العالمين هی سەردەمی سەحابە و تابيعين و تابيعی تابيعين هەتا گەيشتوەتە سەرەخۆی و كاتی خۆی، ئينجا (وَالتَّابِعِينَ) ئەوەی لە سەردەمی تابيعين رويداوە كە ئەبو موسليمی خەولانی بە ئاگر نەسوتا ئيمامی عومەر كە بينی شانازی پێوە كرد كاتێ كە ئەو كابرايە ئەسوەدی عەنەسی داوای پێغەمبەرايەتی دەكرد (پەنا بە خوای رب العالمين) ئەبو موسليمی خەولانی ئەو پياوە بەرز و بەرێزە كە بە درۆی هێنايەوە ئەويش بانگی لێكرد و ئاگری بۆ هەڵكرد و گوتی دەتسوتێنم شاهێدی بدە كە من پێغەمبەری اللهم (پەنا بە الله)، ئەبو موسليمی خەولانی گوتی نابيستم گوێچكەم نابيستێ كەرِم لە ئاستی ئەو قسە وە شاهێديەكەی بۆ نەدا، گوتی ئەی شاهێدی دەدەی موحەمەد پێغەمبەر و رەوانەكراوی اللهيە (ﷺ)؟ ئەبو موسليمی خەولانی گوتی بەڵێ ئەو قسەم بيستوە و لەتۆشم بيست و شاهێديەكەش دەدەم، گوتی

هەڵیدەنە ناو ئاگر، هەڵیاندایە ناو ئاگر ئەبو موسلیمی خەولانی نەسوتا، ابن تیمیة لە مجموع الفتاوی دەیهێنێتەوە و دەڵێ سەنەدەکەی جێگیرە و وەرگیراوە، ئیمامی عومەر پێشوازی لێکرد فەرمووی سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) نەمردم بە چاوی خۆم کەسێکم بینی وەکو ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) تاقی بکرێتەوە و هەڵبدرێتە ناو ئاگر و نەسوتێ نەش سوتا و دەربازیشی بوو ئەبو موسلیمی خەولانی، هەندێک جار سەحابە هەبوە لە ئاو پەڕیوەتەوە بەسەر ئاودا ڕۆیوە جا لەبەر ئەوەیە هەندێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن بەڵکو هەندێک جار ئەو کەرامەتانەی سەحابەکان کە جێگیر بوە تەواوکەری موعجیزەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) یان لە ئومەتەکەی کە جێگیر دەبێ، کە دەفەرمون بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) وەکو موسا پێغەمبەر (ﷺ) دەریا و ئاوی بۆ شەق و لەت نەبوە بۆی نەبوەتە کۆڵان و پێیدا تێپەڕ بکا وەکو موعجیزەیەک هەر لە ئومەتەکەی ئەو شتانە ڕویانداوە و بوە، وە هەندێک دەفەرمون ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر پێغەمبەری الله لەناو ئاگر نەهاوێشتراوە و ئاگر نەیسوتێنێ وەکو ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) لە ئومەتەکەی ئەوەتا ئەبو موسلیمی خەولانی ئەوە وەکو کەرامەتێک بۆی ڕویداوە و ئەوانە هەموی تەواوکەری موعجیزەکانی پێغەمبەرن (ﷺ)، ئەگەر بتانەوێ باسی بکەن و لێی وردبنەوە و زۆری لەسەر بخوێننەوە چاکترین کتاب لەو بوارە کتابێکی سەربەخۆی خۆشی هەیە ابن تیمیة کتابێکی یەکجار پلەدارە بەناوی (الفرقان بین أولیاء الرحمن وأولیاء الشیطان) جیاوازی دەخاتە نێوان دۆستانی اللەی ڕەحمان و دۆستانی شەیتان ئەوانەی کەرامەتیان بەڕاستی لەسەر دەست ڕودەدا یان ئەوانەی ئیستیدراجن و کەرامەتی ڕاستەقینە نیە، ئینجا زۆر زۆرن ئەگەر نمونەکان بێنینەوە نمونە لەسەر کەرامەتی وەلیەکان هەندێک نمونەمان بۆتان هێناوە لەوانی تر حەواڵەی ئەو پەرتوکانەتان دەکەین بە تایبەتی پەرتوکەکەی ئیمامی اللالکائي بە سەنەدەوە ئەو هێناویەتیەوە وە لە (أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة) باسی کەرامەتی سەحابەکان

تابيعی تابيعی لەدوای یەک ڕیزیان دەکا وە ئەو پەرتوکە بە تەحقیق و تەخریجیش هەیە دەتوانن سود و کەڵکی لێوەرگرن و ببینن.

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- دەفەرمویٚ (وَعَنْ صَدْرِ هَذِهِ الأُمَّةِ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ) وە ئەهلی سونە و جەماعە گوتمان بڕوایان هەیە بە کەرامەتی وەلیەکان هی سەردەمی سەحابەکان و هی تابيعين و وە هی تێکڕای خەڵکانی تر کە ڕویدابێ لە هەر سەردەمێک هی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) کەواتە هەتا ئێستاش دەمێنێ (وَهِيَ مَوْجُودَةٌ) ماوە و دەمێنێ (فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) هەتا ڕۆژی قیامەتیش دادێ کەڕامەتی وەلیەکان دەمێنێ و ئەهلی سونە و جەماعە بڕوایان پێی هەیە و وە جێگیری دەکەن.

## شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و شوێنکەوتنی خولەفا ڕاشیدیەکان:

فَصْلٌ: ثُمَّ مِنْ طَرِيقَةِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ اتِّبَاعُ آثَارِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بَاطِنًا وَظَاهِرًا، وَاتِّبَاعُ سَبِيلِ السَّابِقِينَ الأَوَّلِينَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ، وَاتِّبَاعُ وَصِيَّةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حَيْثُ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ مِنْ بَعْدِي، تَمَسَّكُوا بِهَا، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ؛ فإن كل محدثة بدعة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ[1]» وَيَعْلَمُونَ أَنَّ أَصْدَقَ الْكَلامِ كَلامُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) وَيُؤْثِرُونَ كَلاَمَ اللهِ عَلَى غَيْرِهِ مِنْ كَلامِ أَصْنَافِ النَّاسِ، وَيُقَدِّمُونَ هَدْيَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) عَلَى هَدْيِ كُلِّ أَحَدٍ. وَلِهَذَا سُمُّوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، وَسُمُّوا أَهْلَ الْجَمَاعَةِ؛ لأَنَّ الْجَمَاعَةَ هِيَ الاجْتِمَاعُ، وَضِدُّهَا الْفُرْقَةُ، وَإِنْ كَانَ لَفْظُ الْجَمَاعَةِ قَدْ صَارَ اسْمًا لِنَفْسِ الْقَوْمِ الْمُجْتَمِعِينَ. وَالإِجْمَاعُ هُوَ الأَصْلُ الثَّالِثُ الَّذِي يُعْتَمَدُ عَلَيْهِ فِي الْعِلْمِ وَالدِّينِ. وَهُمْ يَزِنُونَ بِهَذِهِ الأُصُولِ الثَّلاثَةِ جَمِيعَ مَا عَلَيْهِ النَّاسُ مِنْ أَقْوَالٍ وَأَعْمَالٍ بَاطِنَةٍ أَوْ ظَاهِرَةٍ مِمَّا لَهُ تَعَلُّقٌ بِالدِّينِ. وَالإِجْمَاعُ الَّذِي يَنْضَبِطُ هُوَ مَا كَانَ عَلَيْهِ السَّلَفُ الصَّالِحُ؛ إِذْ بَعْدَهُمْ كَثُرَ الاخْتِلاَفُ، وَانْتَشَرَ فِي الأُمَّةِ.

---

[1] اخرجه الترمذى برقم (٢٦٧٦) في العلم. وأبو داود برقم (٤٦٠٧) في السنة. وابن ماجه رقم (٤٢) في المقدمة. وأحمد في المسند (٤ / ١٢٦، ١٢٧). والحاكم في المستدرك (١ / ٩٥، ٩٦) وقال الترمذي: حسن صحيح. وقال الحاكم: صحيح ووافقه الذهبي.

لە پاشان ابن تيمية -رحمه الله- دەگاتە سەر ئەوەی ڕێبازی ئەهلی سونە و جەماعە بریتیە خاڵی سەرەکییان شوێنکەوتنی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) وە شوێنکەوتەبونی خەلیفە ڕاشیدەکان ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر و ئیمامی عوسمان و ئیمامی عەلی دەفەرموێ (فَصْلٌ: ثُمَّ مِنْ طَرِيقَةِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ اتِّبَاعُ آثَارِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بَاطِنًا وَظَاهِرًا) دەفەرموێ باس و خواسێکی تر ئەویش بریتیە لەوەی لە پاشان ئەهلی سونە و جەماعە ڕێباز و ڕێگایان ئەوەیە کە شوێنکەوتەی ئاثار و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەون لە ڕواڵەتی و لە نهێنی و پەنهانیدا لە هەموی تەسلیمی سونەتەکانی پێغەمبەر دەبن (ﷺ) (وَاتِّبَاعُ سَبِيلِ السَّابِقِينَ الأَوَّلِينَ) وە شوێنی ئەو خەڵکانەی لە پێشتردا کە هاتون و یەکەمینەکانن واتە سەحابەکان و تابیعین (مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ) سەرەتا ئەهلی سونە و جەماعە شوێنکەوتەی پێغەمبەر دەبن (ﷺ) پێیەوە پابەند دەبن دەستی پێوە دەگرن ئینجا لە پاشان دەست دەگرن بە ڕێباز و ڕێگای سەحابەکان موهاجیرەکان و کۆچکەرەکان وە لەگەڵ ئەنصارەکان و پشتیوانان (وَاتِّبَاعُ وَصِيَّةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)) وە ئەهلی سونە و جەماعە شوێنی وەسیەتی پێغەمبەریش دەکەون (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيْينَ مِنْ بَعْدِي، تَمَسَّكُوا بِهَا، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ؛ فإن كل محدثة بدعة، وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ» پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) لەسەرتانە دەست بگرن بە سونەت و ڕێبازەکەی من لە پاشان دەست بگرن بە سونەت و ڕێبازی چوار خەلیفە ڕاشیدەکە کە هیدایەت و ڕێنوێنیان دراوە لەپاش من دێن کە ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر و ئیمامی عوسمان و ئیمامی عەلی و خولەفای ڕاشیدینیان پێ دەڵێن لە پاشان فەرموی دەستی پێوە بگرن بە ڕێبازەکانیان وە بە خرێنەکانتان بیگرن ئەوەندە بە توندی و واتە لەدوایان بڕۆن وە ئاگادارتان دەکەمەوە لە شتەکانی بەرپا دەبن و دێنە پێش و پێشتر نەبوە (مُحْدَثَاتِ الأُمُورِ) چونکە فەرموی «فإن كل محدثة بدعة» چونکە هەموو شتێکی داهێنراو بیدعە و داهێنراوە یەعنی هەموو شتێکی

نوێ ڕودەدا لە خۆتانەوە کە بیکەن بەڵگەی لەسەر نەبێ سونەتی پێغەمبەر نەبێ (ﷺ) سونەتی خولەفای ڕاشیدین نەبێ ئەوانە داهێنراوە «وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ» ئەوەی بیدعە و داهێنراویش بێ گومڕاییە.

ئەوانە هەڵوێستەیان لەسەر دەکەین (إن شاء الله) لە داهاتودا بەڵام ئێستا بە کورتی ئەوەندە دەکەینەوە کوردی و ڕاڤەی دەکەین لە مەتنەکە دەفەرموێ (وَيَعْلَمُونَ أَنَّ أَصْدَقَ الْكَلامِ كَلامُ اللهِ) ئەهلی سونە و جەماعە دەزانن بێگومان شارەزان و عیلمیان هەیە کە ڕاسترین وشە و وتە و قسە هی الله تعالی یە (وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (ﷺ)) باشترین ڕێباز و ڕێنوێنی کار ڕێباز و ڕێنوێنی کاری پێغەمبەری پێشەوایە (ﷺ) (وَيُؤْثِرُونَ كَلامَ اللهِ عَلَى غَيْرِهِ مِنْ كَلامِ أَصْنَافِ النَّاسِ) فەرمودەی الله بەپێش قسەی هەموو خەڵکانی تر دەخەن هەر کەسێک بێ و لە هەر ئاستێک بێ، ئەهلی سونە و جەماعە دەست یەکەمجار بە قورئانەوە دەگرن و قورئان و فەرمودەی الله پێش هەموو قسان دەخەن (وَيُقَدِّمُونَ هَدْيَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) عَلَى هَدْيِ كُلِّ أَحَدٍ) وە ڕێباز و ڕێ و شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) و سونەتەکانی ئەو پێش هەموو ڕێ و شوێن و ڕێباز و سونەتی خەڵکانی تر دەخەن هەر کەسێک هەبێ ئەوە وەسف و سیفەت و هاوەڵناوی سەحابە بەڕێزەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) هی ئەهلی سونە و جەماعەیە ئەوانە بە تێکڕا ابن تیمیة دەفەرموێ ئەوە وەسفیانە و ئەوە مواسەفاتیانە ئەهلی سونە و جەماعە ئاوا دەست دەگرن بە ڕێبازی الله و پێغەمبەر (ﷺ).

چەند هەڵوێستەیەک لەسەر ئەو بڕگانە دەکەین بە تایبەت کە فەرموی پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): «عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي، تمسكوا بها، وعضوا عليها بالنواجذ، وإياكم ومحدثات الأمور؛ فإن كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة» پێویستە هەڵوێستەیەک لەسەر ئەوە بکەین و ڕونکردنەوەیەک لەسەر بیدعە بدەین (شتە داهێنراوەکان)، ئایە بیدعە چەند بەشە؟ وە لە عەقیدە و بیروبڕوا کە باس لە بیدعە دەکرێ چ جۆرە بیدعەیەکیان مەبەستە ئەهلی سونە و جەماعە کاتێک دەڵێن موبتەدیعەکان

ئەوانەی ئەو بیدعانە دەکەن و بیدعەچیەکان پشتیان تێبکرێ سەلامیان لێ نەکرێ لە کۆڕ و مەجلیسیان دانەنیشن، ئایە ئەوە چ نەوعە کەسانێکن لە دیدگای ئەهلی سونە و جەماعە چ نەوعە بیدعە چیەکن؟ تەبعەن پێغەمبەر (ﷺ) وشەی کوللی بەکارهێنا دەفەرموێ ئەوەی بیدعە و داهێنراوە گومڕاییە، کەواتە فیعلەن عامە گشتیە بیدعە و داهێنراو مادەم سەلمێنرا بیدعەیە شتێکی ڕاست و ڕەوا نیە پێچەوانەی سونەتی پێغەمبەرە (ﷺ) پوچەڵە ڕەتکراوەیە گومڕاییە.

وە لە پاشان لێرەدا دەبێ هەڵوێستەی ئەوە بکەین بیدعە بە گشتی دەبێتە دوو جۆر: (بیدعەی موکەفیرەمان هەیە، بیدعەی موفەسیقەمان هەیە).

بیدعەی موکەفیرە خاوەنەکەی کە دەیکات و ئەنجامی دەدا ئەگەر هیچ مانیع و قەدەغەیەک نەبێ کافری دەکا لەوەی کە کافربێ چونکە بیدعەی موکەفیرە بە مەعنای بیدعەی کافرکار خاوەنەکەی کافر دەکا لە ئیسلام دەیباتە دەرەوە ئەوەش وەکو بیدعە و گومڕایی عەقیدەیی مونافقەکان یان فیرقەکانی عەقیدە و بیروبڕوا وەکو جەهمی موعتەزیلە خەواریج مورجیئە ئەوانە بە ئەهلی بیدەع دادەنرێن بەو واتایەی بیدعەیان لە عەقیدە و بیروبڕوا هەبوە گومڕانە لا ڕێنە دەرچونە لە ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕێبازی ئەهلی سونە و جەماعە، جا زیاتر ئەهلی سونە و جەماعە کە لە پەرتوکەکانی عەقیدە و بیروبڕوا باس لەوە دەکەن ئێوە تێکەڵ مەبن لەگەڵ بیدعە چیەکان مەبەستیان پێی بیدعەی موکەفیرە و ئەو فیرەقە بیدەعیانەن لە ڕافیزە و شیعەکانەوە بیگرە هەتا خەواریجەکان ئینجا لە پاشان مورجیئەکان ئینجا جەهمیەکان موعتەزیلەکان قەدەریەکان جەبرییەکان لەگەڵ ئەوانە نەوەک کاریگەری خراپ بخەنە سەرت لەوەیە سەرنجت ڕابکێشن بۆ ڕێباز و ڕێگاکانی خۆیان و ڕێچەکەکانی خۆیان ئەوکاتە تۆ لاڕێ بی لە ڕێباز و ڕێگای ئەهلی سونە و جەماعە لابدەی، لەبەر ئەوەی ئەگەر بە عیلم و زانستیەوە لەگەڵیان تێکەڵ بی و موناقەشە و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەی ڕێگا دراوە بۆ ئەوەی هیدایەتیان ببێ ڕێنوێنیان ببێ

ئەگەرنا خەڵکانی بە گشتی ئەهلی سونە و جەماعە نابێ تێکەڵ بن لەگەڵ ئەو بیدعاچیانەی کە لە عەقیدە و بیروبڕوا بیدعەیان هەیە و فیرەقی ضالە و گومڕان، وەکو ئەوانەی ناومان هێنان و ژماردمان.

جۆری دوەم بیدعەی موفەسیقە هەیە بەو واتایەی ئەو بیدعانەی خاوەنەکانیان لە فەرمان دەردەچوێنێ توشی تاوان و گوناحیان دەکا بەس کافریان ناکا لە ئیسلامیان بەدەر نانێ ئەو نەوعە بیدعانە هەندێک جار بیدعەیە لە بواری عیبادەت و پەرستشەکان کە ئەنجام دەدرێ، عیبادەت و پەرستش مافی الله تعالی یە کە دیارییان بکا بیانکا سنورت بۆ دابنێ چوارچێوەت بۆ دابنێ دەبێ لەو چوار چێوە لەو دیاریکردنە لەو بابەتە دەرنەچی، تەنانەت بە نمونەیەکی ژیری و عەقڵی و واقیعیانەش دەتوانین نمونە بێنینەوە خەریتە و نەخشە کێشانی هەر بینا و شوێنێک کە تۆ خاوەنی کاتێک لەگەڵ موهەندیس و ئەندازیارێک ڕێک دەکەوی و دایدەنێی تۆ بە حەز و ویستی خۆت دایدەنێی بەوەی کە تۆ دەتەوێ ئینجا ئەگەر داتە هەر وەستایەک، بۆ نمونە دامانناا دوو سەد مەتر موڕەبەعی دوجات هەیە دەتەوێ بیکەیتە خانویەکی غەربی، ئەگەر دەیکەیتە دوو ژوری نەوم لە پشتەوە و هۆڵێکی هەبێ و مەتبەخێکی هەبێ و دیوەخانەیەک و ئیستیقبالێکی هەبێ ژوری پێشوازی گەڕاجێکی هەبێ و وە لە پاشان حەدیقەیەکی هەبێ وە ئەو موهەندیسە ئەندازەکەش دیاری بکا لەسەر ویستی تۆ لەسەر داوای تۆ بۆ نمونە بڵێت ژورە نەومەکان چوار بە پێنج بێ یەکێکیشیان سێ و نیو بە پێنج بێ هۆڵەکە ئەوەندە بەوەندەبێ ئەویتر ئاوابێ دەرگاکانیان ئاوا بکرێتەوە و ئاوا دابخرێ، ئەگەر داتە دەستی وەستایەک ئەو ئیش و کارەت بۆ ئەنجام بدا کاتێک تۆ چویتە سەر خانوەکە وەستاکە دوو ژوری نەومی نەکردبوو یەکی کرد، بەس ژورە نەومەکەی زۆر گەورە کردبوو کردبویە حەوت بە شەش، لە پاشان هۆڵەکەی بە نەوعێکی تر کردبوو ئەوەی لەسەر خەریتەیە نەیکردبوو، ئیستیقبالەکەی بە نەوعێکی تر کردبوو، ئەگەر جوانیش بێ بە حیساب ڕێک و پێکیش

بێ لە زاهیر و ڕواڵەتی تۆ ئەوپەڕی مافی خۆتە بڵێی من ئەوەم ناوێ، وەستایەکە پێت بڵێ بۆ ناتەوێ فڵانە کەس؟ ئەوەتا کورە من لە جیاتی دوو ژور ژورێکی گەورەم بۆ کردی جێی هەموتان دەبێتەوە تێیدا، کاکە ئەو ئیشەت باش نیە من چیم داوات لێکردبوو؟ من خاوەنی موڵکەکەم من خاوەنی خانوەکەم دەبا ئاوام بۆ بکەی ڕێک و پێک من ئەوەم لەتۆ داوا بوو باشترە خراپترە من ئەوە نازانم و لێت وەرناگرم، تەشبیە نەبێ بۆ ئەوەی لە عەقڵمان نزیک بێتەوە داواکاریەکانی اللەش لە عیبادەت و پەرستشدا شتێکی خواییە الله خاوەنە و دەتوانێ ئەو بڕیارە بدا و نەخشەکەت دەداتە دەست تۆ بۆت نەهاتوە، زۆرجار خەڵکێک هەیە کە لە زیکر و یادی الله یان لە سەڵاوات لێدان شتێکی بیدعەیی دەکا کە موخالیفە لەگەڵ سونەی پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامتدا بیانوو بە چێ دەگرێ؟ زانایان دەفەرمون ئیمامی شاطیبی -رحمه الله- لە ئیعتیصام و وە باقی زانایانی تری ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون هەندێک جار بیانوی ئەوەت پێ دەگرێ دەڵێ باشە مامۆستا! من چ قەیدی دەکا سەڵاواتم لێداوە، سەڵاوات شتێکی خراپە؟ کاکە خۆ تۆ نەتگوتوە سەڵاوات خراپە، وەکو ئەوەی لێدێ بەس الله خەریتەکەی داوەتە تۆ سەڵاوات ئێرە شوێنی نیە لێی بدەی لە خۆڕا زیادت کردوە لێتداوە سەڵاواتەکە، ئایە ئەگەر من فڵان زکر زیاد بکەم خراپە؟ نا ئەی ئەگەر وابێ کەواتە نوێژی بەیانیان دوو ڕکاعەتە زاهیرەن بەو قسە ئەگەر بڕۆین لە شوێنی بڵێین زیاد کردن لە خێر و چاکە خراپ نیە بۆ دوو ڕکاعەت دەکەی شەش ڕکاعەت بکە بەسەر یەکەوە؟ شەش ڕکاعەت زۆرتر نیە لە دوو ڕکاعەت؟ چەندین فاتیحە چەند جار چەند بارە دەبێتەوە لەناو زیاتر، وە لە پاشان چەند جار ئەتەحیاتی تێدا دەخوێنرێ، سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر لێدەدرێ (ﷺ)، زکرەکانی لەناو دەکرێ، سوجدەی چەند زیاد دەکا؟ ڕکوعی چەند زیاد دەکا؟ ئەوانە تەوقیفیە عیبادات، لەبەر ئەوە نابێ خەڵکێک خۆی بێنێتە ئەو ئاستەی ئەو نەخشەی الله تعالى تێک بدا لە عیبادەت و پەرستش لە زیکر و یادی خوای رب العالمين الله بۆی دیاری کردی پێغەمبەر بۆی هێناوی (ﷺ) بۆی ڕونکردیتەوە دەبێ لەسەر ئەو

خەریتە بڕۆی لەسەر ئەو نەخشە بڕۆی، ئەگەرنا خۆ ئێمە نالێین خودی شتەکە خراپە زیکری الله قەت خراپ نیە هەردەم باشە بەڵام کردنی زیکری الله لە هەندێک کات کە الله تعالی فەرمانی پێنەداوە و پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای نەداوە و نەیکردوە خراپیەکە لەوەیە لەو کاتە تۆ ئەو مافەت نیە ئەو سەڵاحیەتەت نیە تۆ لەو ئاستەدا نی ئەو بڕیارە بدەی ئەو شتە بخەیتە ئەو شوێنە ئەو شتە باشە، لەبەر ئەوە هەڵە و کەم و کورتیەکان لەوەدایە خەڵکێک بەو بیانوانەوە بیدعە دەکا ڕەت دەکرێتەوە.

تێبینیەکی تر لە مەسەلەی بیدعە ئەویش ئەوەیە کە دینی الله تعالی تەواو بوە کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ [المائدة: ٣] کابرای کە بیدعە دەکا و شتی داهێنراو دەهێنێتە پێش و ئەنجامی دەدا (پەنا بە الله) بە کردار و عەمەلی کەئەنەهو دینی الله تەواو نەبوە ئەو دێ تەواوی دەکا! دینی الله کۆتایی پێهاتوە لە بواری عەقیدە و بیروبڕوا و عیبادەت و پەرستش و ڕێو شوێنەکان هەموی هیچی نەماوە ئینجا پێغەمبەر وەفاتی کرد (ﷺ) هەموی لای الله تعالی بۆ ئێمە هێنا بۆی ڕونکردینەوە لەسەر ڕۆژی ڕوناک ئێمەی بەجێ هێشت، کەواتە ئەگەر تۆ شتێکی لێ زیاد دەکەی لەخۆڕا بەبێ بەڵگە و دەلیلێک کە پێغەمبەر کردبێتی (ﷺ) کە خەلیفە ڕاشیدەکان کردبێتیان بەبێ بەڵگەی قورئانی ئەوە ئەو کاتە پێت وایە (پەنا بە الله) کە ئەنەهو دینی الله کەم و کورتی تێدا ماوە تۆ چاکی دەکەی و زیای دەکەی و کەم و کورتیەکان ناهێڵی.

لە پاشان بیدعە (شتە داهێنراوەکان) لە مەسئەلە مختلف فیهایەکان مەسائیلە مختلف فیهایەکانی مەسائیلی فیقهی کە موجتەهیدە گەورەکان ئیجتیهادیان کردوە و لە ئاستی ئیجتیهاد دا بونە بۆچونێکیان هەیە بەرامبەر دەقێکی ڕاستەوخۆی سەریحی دیلالەی قەتعی نیە کە لە قورئان یان لە حەدیس ئاوا جێگیر نەبوە ئاوا بەڵگەکەش ناهێنرێتەوە جێگای ئیجتیهاد و لێوردبونەوە بوە ئاستی ئیجتیهادیان هەبوە ئیختیلاف و جیاوازییان کەوتوەتە نێوان، ئەو مەسەلانە تۆ بە هەر لایەکیت کرد قەناعەتت پێهات ئاستت هەبوو

یان ئەگەر ئاستت نەبوو عەوام بوی تەقلیدی هەر لایەکیانت کرد بیدعەت نەکردوە، ئەو مەسائیله مختلف فیهایانە چونکە مەسەلەکە ئیجتیهاد بەخۆیەوە هەڵدەگرێ کەسێک ئیجتیهادی تێدا کردوە ئاستی ئیجتیهادی هەبوە.

بەو کەسە ناگوترێ بیدعەچی ئەگەر بێو: ﴿بِسمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ی بە جەهر و بە دەنگەوە خوێند لە پێش نوێژیەکان لەکاتی ئیمامەتی چونکە ئەگەر گوتت ئەو کەسە بیدعەچیە کەواتە ئیمامی شافیعی بیدعەچی بوە بە دەنگی خوێندوە و بەڵگەشی بۆ دەهێنێتەوە دەڵێ بە دەنگ خێری پترە، ابن کثیر بیدعەچی بوە ابن کثیر لە تەفسیرەکەی بەڵگە لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە کە کابرایەکی موحەدیثە متمانە پێکراوە ئەهلی سونە و جەماعەیە مەفەسیری قورئانە موجتەهیدێکی گەورەبوە دەڵێ بە دەنگ خێری پترە، ابن تیمیة لەولاوە دەفەرموێ بەبێ دەنگ خێری پترە، مەزهەبی ئیمامی مالیک دەڵێ: ﴿بِسمِ ٱللَّهِ﴾ بە جەهرەن خوێندنی هەر مەکرٖوهە بۆچونی ڕاجیحی مەزهەبی ئیمامی مالیک دەڵێ بە دەنگ بیخوێنی شتێکی ناپەسەندت کردوە بە دەنگ نەیخوێنی خێرت دەگاتێ، کەواتە ئەو ئیختیلاف و جیاوازیانەی فیقهی مەسائیله فەرعیە فیقهیەکان کە جێگای ئیجتیهاد بوە و زانایانی گەورەی موجتەهید ئیجتیهادیان تێدا کردوە و هەریەک بۆ بۆچونێکی بەڵگەی هێناوەتەوە ئەوە پێی ناگوترێ مەسائیلی بیدەعی خەڵکێک ئەگەر هەر لایەکیانی جێبەجێکرد بە بەڵگە و قەناعەتەوە یان مەقەلید بوو عەوام بوو خوێندەوار نەبوو لە شەرع و دین شارەزا نەبوو تەقلیدی هەر لایەکیانی کرد بەوە ناگوترێ بیدعەچی ئەگەر بە شتەکەش بگوترێ بیدعە.

بۆ نمونە لەلای ابن تیمیة و زانایانی ئەهلی تەحقیق سونەتی جومعە دەڵێن بە ناوی سونەتی جومعە بیدعەیە یەعنی دەڵێن شتێکی داهێنراوە دەلیلمان وایە وایە... بەڵام هەر یەکێک سونەتی جومعەی کرد بە قەناعەتەوە دوو ڕکاعەت بە نیەتی سونەتی جومعە بەوەندە نابێتە بیدعەچی چونکە مەسەلەیەکە ئیختیلافی لەسەرە مەزهەبی ئیمامی شافعی و کۆمەڵێک

لە زانایانی تر بەڵگە بەوە دەهێننەوە کە جێگیرە، جائیزە ابن تیمیة بە بەڵگە بیسەلمێنێ و موجتەهید بوە و ئیجتیهادی کردوە بڵێ ئەوە بیدعەیە بەڵام خاوەنەکەی ئەوەی ئەو ئیشە دەکا بەو ئیشە نابێتە بیدعەچی ناگاتە ئاستی ئەوەش ئەهلی سونە و جەماعە کە لە عەقیدە باسی دەکەن تۆ پشتی تێبکەی سەلامی لێنەکەی مەرحەبایی نەکەی لە کۆڕ و مەجلیسی دانەنیشی چونکە ئەو پێچەوانەی تۆ ئەو بۆچونە فیقهیەی جێبەجێ کردوە.

ئیمامی ئەحمەد و ئیمامی شافیعی دوو موجتەهید و زانای زۆر گەورەی ئەهلی سونە و جەماعەن قوتابی و ماموٚستای یەکتر بونە لە یەک سەردەم ژیاون ئینجا لە دەیەها مەسائیل پێچەوانەی یەک بونە، لەگەڵ ئەوەدا هەر لە کۆڕ و مەجلیسی یەکیش دەبون هەر سەلامیشیان لێک دەکرد هەر یەکتریشیان بە بیدعەچی دانەدەنا چونکە لە عەقیدە و بیروبڕوا تێک هەڵکێش بون لە عەقیدە و بیروبڕوا ئیختیلاف و جیاوازییان نەبوو لە مەسائیلەکانی جێی ئیجتیهاد نەبوو ئیختیلافیان نەبوو لەو مەسائیلانەی جێگای ئیجتیهاد بوو ئەو ئاستی وابوو ئاوا تێگەیشتبوو لەو مەسەلە ئەو ئاستی وابوو.

هەندێک جار هەبوە موناقەشە و گفتوگۆیان هەبوە زانایانی گەورە لە چوار چێوە و بازنەی بنەما شەرعیەکان قسەشیان بە یەک نەگوتوە لە یەکیش تورە نەبونە ئەگەر گەیشتبنە قەناعەت یەک یەکی قەناعەت پێدەهێنا ئەگەرنا هەرکەس لەسەر بۆچونی خۆشی مابێتەوە بێ ڕێزییان لەگەڵ یەک نەکردوە لە پاشان یەکتریشیان خۆشویستوە برایەتیش لە نێوانیان هەر ماوەتەوە، ئەوە گرینگ بوو پێم خۆشبوو ئەو شتانە باس لێوە بکەین و لەسەری پاس نەدەین.

## هۆکاری ناونانی ئەهلی سونە و جەماعە:

وَلِهَذَا سُمُّوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّة، وَسُمُّوا أَهْلَ الْجَمَاعَةِ؛ لأَنَّ الْجَمَاعَةَ هِيَ الاجْتِمَاعُ، وَضِدُّهَا الْفُرْقَةُ، وَإِنْ كَانَ لَفْظُ الْجَمَاعَةِ قَدْ صَارَ اسْمًا لِنَفْسِ الْقَوْمِ الْمُجْتَمِعِينَ. وَالإِجْمَاعُ هُوَ الأَصْلُ الثَّالِثُ الَّذِي يُعْتَمَدُ عَلَيْهِ فِي الْعِلْمِ وَالدِّينِ. وَهُمْ يَزِنُونَ بِهَذِهِ الأُصُولِ الثَّلاثَةِ جَمِيعَ مَا عَلَيْهِ

النَّاسُ مِنْ أَقْوَالٍ وَأَعْمَالٍ بَاطِنَةٍ أَوْ ظَاهِرَةٍ مِمَّا لَهُ تَعَلُّقٌ بِالدِّينِ. وَالإِجْمَاعُ الَّذِي يَنْضَبِطُ هُوَ مَا كَانَ عَلَيْهِ السَّلَفُ الصَّالِحُ؛ إِذْ بَعْدَهُمْ كَثُرَ الاخْتِلاَفُ، وَانْتَشَرَ فِي الأُمَّةِ.

لە پاشان ابن تیمیة دەگاتە سەر ئەوە دەڵێ (وَلِهَذَا سُمُّوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، وَسُمُّوا أَهْلَ الْجَمَاعَةِ) لەبەر ئەوەیە ئەو ناو و ناسناوە لە ئەهلی سونە و جەماعە نراوە ئەوانەی ڕێبازی پێغەمبەریان گرتوەتەبەر (ﷺ) كە خاوەن عەقیدەن وەكو پێغەمبەر (ﷺ) و وەكو عەقیدەی سەحابەكان پێیان گوتراوە خاوەنی پەرتوكە ئاسمانیەكەن كە قورئانە یانی ئەهلی قورئانن وە لە پاشان ئەهلی سونەن بە مەعنای كۆبونەتەوە لە دەوروبەری سونە دەستیان پێوە گرتوە دەستیان بە قورئانەوە گرتوە یان ناویان لێ نراوە (وَسُمُّوا أَهْلَ الْجَمَاعَةِ أَهْلَ الْجَمَاعَةِ) لێرە بە مەعنای جەماعە ئیجتیماع دێ زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوە بە مەعنای یەعنی ئیجتیماعیان كردوە و كۆبونەوە لە دەوروبەری ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) سونەتی پێغەمبەر وە دەست دەگرن بە قورئان و بە سونە (لأَنَّ الْجَمَاعَةَ هِيَ الاجْتِمَاعُ) جا جەماعە و كۆبونەوەش كۆمەڵ لەوێدا بە مەعنای ئیجماع و یەك دەنگیانە كۆبونەوەیانە (وَضِدُّهَا الْفُرْقَةُ) وە پێچەوانەی ئیجماع و یەكدەنگیش چیە؟ پەرتەوازەییە و تەفرەقەیە (وَإِنْ كَانَ لَفْظُ الْجَمَاعَةِ قَدْ صَارَ اسْمًا لِنَفْسِ الْقَوْمِ الْمُجْتَمِعِينَ) ئەگەر بێو دەڵێ جەماعە بە مەعنای كۆبونەوەش و یەك دەنگی بونیشیانە لەگەڵ ئەوە ابن تیمیة دەڵێ ئەگەر وشە و دەربڕینی جەماعە وای لێهاتوە بوەتە ناوێكیش بۆ ئەهلی سونە و جەماعە پێی بناسرێنەوە بۆ ئەو خەڵكانەی كە كۆبونەتەوە لە دەوروبەری ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ)، لە پاشان دەفەرموێ (وَالإِجْمَاعُ هُوَ الأَصْلُ الثَّالِثُ الَّذِي يُعْتَمَدُ عَلَيْهِ فِي الْعِلْمِ وَالدين) ئیجماع چیە؟ ئیجماع یەك دەنگی زانایانە لە هەر سەردەمێك لە سەردەمەكان، دوو جۆر ئیجماعیش هەیە: ئیجماعی سەڕیحمان هەیە لە (أصول الفقه) كە باس دەكرێ واتە قسەیان لێكردوە زانایەكانی هەر چین و تەبەقەیەك هەمویان كۆبونەتەوە بۆچونێكیان دەربڕیوە بە دەنگەوە بە سەڕاحەت و ڕاشكاوانەوە، وە ئیجماعی سكوتیش ئەوەیە ئەگەر هەندێكیان قسەیان لێكردبێ و ئەوانی تر خۆیان لێ

بێدەنگ کردبێ و لێی بە وەڵام نەهاتبن دیارە ڕازی بونە کە لێی بێدەنگ بونە، ئەوە کۆبونەوە و یەکدەنگی زانایانی ئومەتە وە سەحابەکان ئیجماعیان هەبوە لەسەر هەندێک شت وە تابیعی هەیان بوە تابیعی تابیعی هەیان بوە هەندێک جار ئومەت بە تێکڕا ئیجماعی هەیە لەسەر هەندێک لە شتەکان.

ئیجماع بەڵگەی سێیەمیشە لە (أصول الفقه) کە باس دەکا، ئێمە ئەهلی سونە و جەماعە یەکەم مەصدەر و سەرچاوەیان بۆ وەرگرتنی بەڵگەکان و بەڵگە هێنانەوە قورئانە، دوای ئەو سونەتی پێغەمبەرە (ﷺ) سونەتی سەحیح، لەدوای سونەت ئیجماعە یەک دەنگی و کۆدەنگی زانایانی تەبەقە و چینەکانە یان هی سەحابە هی تابیعی یان تابیعی تابیعی کە بەڵگە دەهێننەوە.

بۆ نمونە هەندێک جار نمونە هاتوەتەوە لەسەر ئەوە ئێستا نوێژە فەرزەکان بە ئایەت جێگیرە کە پێنج فەرزە نوێژمان لەسەرە هی بەیانیان و نیوەڕۆیان و عەسران و مەغریبان و عیشایان، بە سونەت و حەدیسی سەحیحی پێغەمبەریش (ﷺ) جێگیرە، ئیجماعیشی لەسەرە هەموو ئومەتی ئیسلام یەک دەنگن لە قورئان و سونە ئەوە وەرگیراوە کۆدەنگن پێنج فەرزە نوێژمان لەسەرە، هەموو ئومەتی ئیسلام یەک دەنگن زینا حەرامە ئیجماع لەسەر ئەوەیە زینا حەرامە لە ئایەتیان وەرگرتوە لە حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا لەبەر ئەوە کەواتە ئیجماع بەڵگەی سێیەمە لەدوای قورئان و سونە ئەهلی سونە و جەماعە دەستیان پێوە گرتوە.

ئینجا دەفەرموێ (وَهُمْ يَزِنُونَ بِهَذِهِ الأُصُولِ الثَّلاثَةِ جَمِيعَ مَا عَلَيْهِ النَّاسُ مِنْ أَقْوَالٍ وَأَعْمَالٍ بَاطِنَةٍ أَوْ ظَاهِرَةٍ مِمَّا لَهُ تَعَلُّقٌ بِالدِّينِ) (وَهُمْ) یەعنی ئەهلی سونە و جەماعە بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە، ئەهلی سونە و جەماعە بەو سێ بنەمایانە هەموو شتێک کێش دەکەن و لە تەرازوی دەدەن ئەوەی خەڵکی لە قسە و گوتن لە کار و کردەوە پەنهان و ئاشکراکان ئەوەی کە پەیوەستە و پەیوەندە بە دین و ئاین و ڕێباز و وە هەموی بەو سێ بنەمایانە کێش

دەکەن لە تەرازوی دەدەن، ئایە ڕاست دەردەچێ یان هەڵە دەردەچێ؟ (وَالإِجْمَاعُ الَّذِي يَنْضَبِطُ هُوَ مَا كَانَ عَلَيْهِ السَّلَفُ الصَّالِحُ) جا ئیجماع کە بە تەواوەتی جێگیر ببێ وە تەواو زەبت بکرێت و چوار چێوەی بۆ دابنرێ و لێی تێبگەین و حاڵی بین ئیجماعی سەلەفی ساڵح و پێشینانی چاکە (إِذْ بَعْدَهُمْ كَثُرَ الاخْتِلاَفُ، وَانْتَشَرَ فِي الأُمَّةِ) چونکە لە پاش سەلەفی ساڵح و سێ قەرنەکە بەڕاستی ئیختیلاف و جیاوازی زۆر زۆر بوو لە نێوان ئومەتدا وە تەواو بڵاو بوو بۆوە لەناو ئومەتدا ئەو ئیختیلاف و جیاوازییە لەنێوان ئومەتی ئیسلام ئیجماع لە پاش ئەو کاتە تەواو ضەبت ناکرێ تەواو چوار چێوەی بۆ دانانرێ وە ئیختیلاف و جیاوازیەکان یەکجار زۆرن.

بەڵگەش لەسەر ئەوانەی کە ابن تیمیة فەرمویەتی یەکەم الله تعالى دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ [النساء: ٥٩] لە هەر کار و ئیشێک ئەگەر دوبەرەکی و دوو دڵی و هەر شتێکتان بۆ دروست بوو بیگەڕێننەوە لای الله تعالى و پێغەمبەری الله (ﷺ)، لای الله تعالى و پێغەمبەری الله یەعنی چی؟ یەعنی بیگەڕێننەوە لای قورئان و سونە ئەوە لەبەر دەستاندایە، یان خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ [المائدة: ٩٢] گوێڕایەڵی فەرمانەکانی الله و پێغەمبەربن (ﷺ)، ئەوانە بەڵگەی چیە؟ بەڵگەی ئەوەیە کە قورئان و سونە بۆ ئێمە سەرچاوەیە بۆ وەرگرتنی دینمان ئاینمان بە بەڵگە دەهێنرێنەوە، وە لە پاشان هەندێک لە زانایان دەفەرمون: «لا تجتَمِعُ أمَّتي على ضَلالةٍ[١]» دەڵێن ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیجماع ئیشی پێ دەکرێ وە ئەو کاتە ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەت زاناکان و موجتەهیدەکان کۆنابنەوە لەسەر شتێکی گومڕایی و هەڵە.

[١] رواه الترمذي (٣/ ٢٠٧)، وابن ماجة (٢/ ١٣٠٣)، والحاكم في "المستدرك" (١/ ١١٥). وذكره السخاوي في "المقاصد" (٤٦٠)، وقال عنه: "وبالجملة فهو حديث مشهور المتن ذو أسانيد كثيرة وشواهد متعددة؛ في المرفوع وغيره".

## ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە:

فَصْلٌ: ثُمَّ هم مَّعَ هّذِهِ الأُصُولِ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ، وَيَنْهَونَ عَنِ الْمُنْكَرِ عَلَى مَا تُوجِبُهُ الشَّرِيعَةُ: وَيَرَوْنَ إِقَامَةَ الْحَجِّ وَالْجِهَادِ وَالْجُمَعِ وَالأَعْيَادِ مَعَ الأُمَرَاءِ أَبْرَارًا كَانُوا أَوْ فُجَّارًا، وَيُحَافِظُونَ عَلَى الْجَمَاعَاتِ. وَيَدِينُونَ بِالنَّصِيحَةِ لِلأُمَّةِ، وَيَعْتَقِدُونَ مَعْنَى قَوْلِهِ (ﷺ) : «الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ الْمَرْصُوصِ؛ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا[١]»، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، وَقَوْلِهِ (ﷺ) : «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ كَمَثَلِ الْجَسَدِ؛ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ؛ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالْحُمَّى وَالسَّهَرِ[٢]».

---

ابن تيمية گەیشتە سەر بڕگەیەکی تر باسی فەصڵ و بابەتێکی تر دەکا دەفەرمویٚ (فَصْلٌ: ثُمَّ هُم مَّعَ هّذِهِ الأُصُولِ) ئەهلی سونە و جەماعە لە پاشان لەگەڵ ئەو بنەمایانەی کە باسمان کرد (يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ) فەرمان دەکەن بە چاکە (وَيَنْهَونَ عَنِ الْمُنْكَرِ) وە قەدەغەی خراپە و تاوانەکان دەکەن (عَلَى مَا تُوجِبُهُ الشَّرِيعَةُ) لەسەر ئەو ڕێ و شوێنانەی کە شەریعەتی ئیسلام واجبی کردوە و پێویستی کردوە (وَيَرَوْنَ إِقَامَةَ الْحَجِّ وَالْجِهَادِ وَالْجُمَعِ وَالأَعْيَادِ مَعَ الأُمَرَاءِ أَبْرَارًا كَانُوا أَوْ فُجَّارًا، وَيُحَافِظُونَ عَلَى الْجَمَاعَاتِ) ئەهلی سونە و جەماعە حەج و جەنگ و جیهاد و تێکۆشان و نوێژە جمعە و هەینیەکان و جەژنەکان لەگەڵ سەرکردە و وەلی ئەمرەکانی خۆیان جا چاکبن ئەو وەلی ئەمرانە و تەواو بەینی خۆیان و الله وەکو شەخسی و کەسی خۆیان پابەندبن بە قورئان و سونە و مولتەزیم بن و دینداربن یان بێدین و گوناحکاریش بن بەو مەرجەی ئەو بەرنامەی دەستی پێوە دەگرن و ئیشی پێدەکەن قورئان و سونە بێ مەنهەجی میلەتەکە و جەماوەرەکە و ئەوەی لە حوکمەتەکە ئیش و کاری پێدەکرێ، مەبەست ئەوە نیە ڕێگایان پێبدرێ ئیش و کار بکەن بە یاسای دەستکرد

---

[١] أخرجه البخاري برقم (٦٠٢٦) في الأدب، باب: تعاون المؤمنين بعضهم بعضا . ومسلم برقم (٢٥٨٥) في البر والصلة، باب: تراحم المؤمنين وتعاطفهم وتعاضدهم عن أبي موسى رضي الله عنه.

[٢] أخرجه البخاري برقم (٦٠١١) في الأدب، باب: رحمة الناس بالبهائم . ومسلم برقم (٢٥٨٦) في البر والصلة، باب: تراحم المؤمنين وتعاطفهم وتعاضدهم . عن النعمان بن بشير رضي الله عنه.

نا ئەوانە نا ئەو سەرکردە و وەلی ئەمرانەی کە بەینی خۆیان و الله هەندێک جار باشە هەندێک جار هەڵە و کەم و کورتیان هەیە تاوانبارن بەڵام دەست دەگرن بە قورئان و سونە وەکو حوکم پێکردن لەناو جەماوەر و خەڵکەکە کەم و کورتیان هەیە پێی لە ئیسلام دەرناچن دیندار نین بەینی خۆیان و الله گوناح و تاوانی کەسی و شەخسیان هەیە، جا ئەهلی سونە و جەماعە دەبینن بەرپاکردنی حەج و جەنگ و جیهاد و نوێژە هەینی و جومعەکان و جەژنەکان لەگەڵ ئەو سەرکردە و وەلی ئەمرانە شتێکی ڕەوایە و بڕوایان پێی هەیە ئەو سەرکردە و ئەمیرانە چ کەسی زۆر بە دین و موتەقی و لە الله ترس بن ئەبڕاربن چاکەکاربن یان کەسی گوناحکاربن لە بەینی خۆیان و الله (وَيُحَافِظُونَ عَلَى الْجَمَاعَاتِ) وە پارێزەر دەبن لەسەر جەماعەت و کۆبونەوەکان بە تایبەتی لە نوێژەکان (وَيَدِينُونَ بِالنَّصِيحَةِ للأُمَّةِ) یانی پەرتەوازە نابن وە بڕوایان وایە وەکو ڕێباز و بەرنامە ئامۆژگاری بۆ ئومەت شتێکە دەستی پێوە دەگرن و نەسیحەت کار دەبن (وَيَعْتَقِدُونَ مَعْنَى قَوْلِهِ: «الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ الْمَرْصُوصِ؛ يَشُدُّ بَعْضَهُ بَعْضًا») وە بیروبڕوایان وایە ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی بڕوادار بۆ بڕوادار وەکو بینایەکی قوڕ قوشمی وایە کە بە تەواوەتی بە ڕێک و پێکی لەپاڵ یەک هەناسە بڕ بوە بینایەکە دیوارێکی پتەوە هەناسەی تێدا نیە کەلێنی تێدا نیە «يَشُدُّ بَعْضَهُ بَعْضًا» هەندێک لە خشت و بلۆکەکان ئەویتر دەبەستێتەوە و یەکتر دەگرێ و دەبێتە یەک لە پارچە دیوار «وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ» پێغەمبەر (ﷺ) بۆ نمونە هێنانەوەی ئەوە پەنجەکانی تێک هەڵکێشا و لەناو یەکی دانا بۆ ئەوەی کە بزانن ئاوا یەکتر دەبەستنەوە و توند و پندن، ئەوەشیان کە لە فەرمودەی پێغەمبەر هاتوە (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕیوایەتی تر و بە لەفزی تریش فەرمویەتی: «تراحمهم المؤمنين وتعاطفهم وتعاضدهم» بڕواداران لەگەڵ یەک ڕەحم و بەزەییان هەیە وە عەطف و سۆزیان هەیە وە تەواو پشتی یەک دەگرن و لەگەڵ یەک تێکەڵن.

(وَقَوْلِهِ) وە ئەهلی سونە و جەماعە ابن تيمية دەفەرمویٚ بڕوا و عەقیدەشیان بەو فەرمودەی پێغەمبەریش هەیە (ﷺ) کە دەفەرمویٚ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ كَمَثَلِ الْجَسَدِ» بڕواداران لەگەڵ یەکتر لە سۆز و خۆشەویستیان وە لە ڕەحم و بەزەییان بەرامبەر یەکتر وەکو یەک لاشە و جەستە وان «إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ» ئەگەر ئەندامێک ئازاری هەبێت و ئێشی هەبێ «تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بُالْحُمَّى وَالسَّهَرِ» هەموو ئەندامەکانیان پێی دێشێ و ژان دای دەگرێ، کەواتە ئەگەر موسڵمان و بڕوادارێک لە شوێنێک ئازارێکی پێبکا ناخۆشیەکی بێتە سەر زەرەر و زیانی پێبگا ئەلێرەوە و لە شوێنەکانی تر بڕواداران خەمی بۆ دەخۆن یارمەتی دەدەن سەری دەخەن ئەوە برایەتی بڕوادارییە و ئیسلامیە کە ئەهلی سونە و جەماعە بیروبڕوایان وایە.

کەواتە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە سەبارەت بە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە بەڵێ لە سنوری خۆیدا بەپێی توانایان دەیکەن و ئەنجامی دەدەن بەوەوە کۆمەڵگا پاک دەبێتەوە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمودەی هەیە و تەهدیدیشیان دەکا بەڵکو دەفەرمویٚ «لَتأمرُنَّ بالمعروفِ، ولتنهوُنَّ عن المنكرِ[1]» ئێوە یان فەرمان دەکەن بە چاکە یان ڕێگری دەکەن لە خراپە یان لە ڕیوایەتێکیان دەفەرمویٚ یان زۆر نزیکە عەزابی اللهتان بەسەردابێ یان دۆعا دەکەن و دوایە لە پاشان دەپاڕێنەوە خوای رب العالمين دۆعاکەتان گیرا ناکا.

کەواتە موسڵمان سەبارەت بە ئیماندارێش نەسیحەت و ئامۆژگاری دەکا، سەبارەت بە سەرکردە و وەلی ئەمریش سەرکردە و وەلی ئەمر لە چوار چێوە و بازنەی ئەهلی سونە و جەماعە دەبێ لایەنی کەم مواسەفاتی شەرعیەکانی لێبێتەجێ، لایەنی کەم دەبێ ئەو کەسە حوکم بکا بە قورئان و بە ئیسلام مەگەر لە بەینی خۆی و الله بە هەڵە هەندێک شتی هەبێ تاوانی هەبێ گوناحی هەبێ یان بە ئیجتیهاد و خەتەئەوە لە بڕگەیەک لە بڕگەکان لایدا یان زانی ئەوە سەرپێچیە و دەیکا نەک هەر هەموو قورئان ڕەفزکا سەدا سەد یاسایەکی

[1] صحيح الترمذي (٢١٦٩)، حسن.

دەستکرد بێنێتە شوێنی ئەو کەسە ئەو سەرکردە ئەگەر حوکمی کرد بەوە لە سەرکردەی موسڵمانان نیە وەلی ئەمر نیە نابێ حیسابی ئەوەی بۆ بکرێ گوێڕایەڵی بکرێ لە بازنەی ئەهلی سونە و جەماعە لەگەڵیدابی وە لێی نزیک بیتەوە، بەڵکو دەبێ داوای ئەوەی لێبکرێ ئەو سەرکردەیە بگەڕێتەوە بەرەو ئیسلام و قورئان وە حوکم بکا بە قورئان ئەگەر ئەگەرنا ئەو سەرکردە ئەو سەرکردە نیە کە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون سەمع و تاعەت بۆی هەبێ لە فەرمانی دەرمەچۆ سەرپێچی فەرمانەکانی مەکە ئەگەر لێیدای ئەزیەتی دای پارەی لێ خواردی وای لێکردی لە هەموو شتەکان هەر گوێڕایەڵیت هەبێ باغی مەبە بەسەریەوە لەسەری دەرمەچۆ مەیڕوخێنە، ئەوە ئەهلی سونە و جەماعە مەبەستی پێ ئەو سەرکردانەیە کە حوکم دەکەن بە قورئان ئەگەر گوناحیشیان هەبوو فسقیشیان هەبوو ئەو کاتە ئەهلی حەل و عەقد فەرمان بە چاکە ڕێگری لە خراپەیان لەگەڵ دەکەن یان جەماوەر بە ئامۆژگاری بە ڕێگای سلمیانە ئاشتیانە شەرعیانە هەواڵ و قسەکانیان پێ دەگەیەنن فەرمان بە چاکە ڕێگری لە خراپەیان لەگەڵ ئەنجام دەدەن بەڵام ئەگەر فەرمانیان کرد بە تاوان و گوناح نابێ جێبەجێی کەن هی ئەوانیشبێ، وە لە پاشان سەرکردەکانی حوکم ناکەن بە ئیسلام و قورئان بە تەواوەتی ئەوە بەلا دەنێن وە حوکم دەکەن بە یاسایە دەستکردەکان بە هیچ نەوع و شێوازێک ئەوانە سەرکردەی موسڵمانان نین ئەو سەمع و تاعەیان بۆ نابێ ئەو فەرمودە و ئایەت و حەدیسانە نایانگرێتەوە کەوا داوا لە موسڵمانان دەکرێ سەمع و تاعەت بۆیان هەبێ لەگەڵیان زۆر نەرمبی باغی نەبی بەسەریانەوە لەسەریان دەرنەچی هەوڵی ڕوخانیان نەدەی ئەوانە نایانگرێتەوە (والله أعلم بالصواب).

**ئارامگرتن و سوپاس گوزاری و ڕازیبون بە قەدەری الله:**

وَيَأْمُرُونَ بِالصَّبْرِ عِنْدَ الْبَلاءِ، وَالشُّكْرِ عِنْدَ الرَّخَاءِ وَالرِّضَا بِمُرِّ الْقَضَاءِ.

لە پاشان ابن تیمیة دەفەرموێ (وَيَأْمُرُونَ بِالصَّبْرِ عِنْدَ الْبَلاءِ، وَالشُّكْرِ عِنْدَ الرَّخَاءِ وَالرِّضَا بِمُرِّ الْقَضَاءِ) لە پاشان ئەهلی سونە و جەماعە فەرمان بە یەکتر دەکەن لە کاتی بەڵا و موسیبەت و تاقیکردنەوەکان سەبر و ئارامیان هەبێ وە شوکرانە بژێربن لە کاتی ناز و نیعمەتەکانیان کە بەسەردا دەبارێ و دەیانبێ وە ڕازی بن بە قەزاو قەدەرێک ئەگەر چەند تاڵیش بێ کە بەسەریاندا دێ ڕازی بن بە ئەمر و فەرمانی خوای رب العالمین و بە قەزاو قەدەر ئەوە ئیشی ئەهلی سونە و جەماعەیە، وەکو خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ * إِنَّ ٱلۡإِنسَـٰنَ لَفِى خُسۡرٍ * إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ﴾ ئەوە ڕاگەیاندنی یەکترە بە ئاینی ئیسلام و بە فەرمان بە چاکە و بە ڕێگری لە خراپە، و وە لە پاشان: ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ [العصر: ١-٣] یەکتر ڕاگەیاندنیشە بە سەبر و ئارامی گرتن لەسەر ناخۆشی و زەحمەتیەکان.

## ئەخلاقی بەرز و کردەوەی چاك:

وَيَدْعُونَ إِلَى مَكَارِمِ الأَخْلاقِ، وَمَحَاسِنِ الأَعْمَالِ، وَيَعْتَقِدُونَ مَعْنَى قَوْلِهِ (ﷺ) : «أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا[١]». وَيَنْدُبُونَ إِلَى أَنْ تَصِلَ مَنْ قَطَعَكَ، وَتُعْطِيَ مَنْ حَرَمَكَ، وَتَعْفُوَ عَمَّنْ ظَلَمَكَ. وَيَأْمُرُونَ بِبِرِّ الْوَالِدَيْنِ، وَصِلَةِ الأَرْحَامِ، وَحُسْنِ الْجِوَارِ، وَالإِحْسَانِ إِلَى الْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالرِّفْقِ بِالْمَمْلُوكِ. وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْفَخْرِ، وَالْخُيَلاءِ، وَالْبَغْيِ، وَالاسْتِطَالَةِ عَلَى الْخَلْقِ بِحَقٍّ أَوْ بِغَيْرِ حَقٍّ. وَيَأْمُرُونَ بِمَعَالِي الأَخْلاقِ،وَيَنْهَوْنَ عَنْ سَفْسَافِهَا.

---

لە پاشان دەفەرموێ (وَيَدْعُونَ إِلَى مَكَارِمِ الأَخْلاقِ) ئەهلی سونە و جەماعە دەعوە و بانگەوازی دەکەن هی یەکتر، بۆ چی؟ بۆ ڕەوشتە بەرز و جوانەکان کە ئەخلاقی جوانیان هەبێ (وَمَحَاسِنِ الأَعْمَالِ) وە کردەوە چاکەکان (وَيَعْتَقِدُونَ مَعْنَى قَوْلِهِ (ﷺ) : «أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا») وە بیروبڕوایان وایە عەقیدەیان وایە تێدەگەن لە مانا و

[١] أخرجه الترمذي برقم (٢٦١٢) في الإيمان. من حديث عائشة. وأبو داود برقم (٤٦٨٢) كتاب السنة. وأحمد في المسند (٢ / ٢٥٠) من حديث أبي هريرة. والحديث صححه الترمذي وهو في صحيح الجامع برقم (١٢٣٠، ١٢٣١، ١٢٣٢). وقال أحمد شاكر في تحقيق المسند (٧٣٩٦): إسناده صحيح.

واتای ئەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا» تەواوترینی بڕواداران لە ئیمان و بڕواوە ئەوانەن کە خولوق و ڕەوشتیان بەرزە و جوانە (وَيَنْدُبُونَ إِلَى أَنْ تَصِلَ مَنْ قَطَعَكَ، وَتُعْطِيَ مَنْ حَرَمَكَ، وَتَعْفُوَ عَمَّنْ ظَلَمَكَ) وە بەرەو لای ئەوە دەچن و دڵ نەرمن بۆ ئەوە کە دەست بەوەوە بگرن و پێیان خێرترە ئەگەر یەکێک سیلەی ڕەحمی لەگەڵ ئەوان بچڕاند ئەوان نایپچڕێنن لەگەڵی ئەگەر یەکێک بەوانی نەبەخشی و نەیدا ئەوان دەیبەخشن و پێیدەدەن مەحرومی ناکەن وە ئەوانە عەفو دەکەن کە زوڵم و ستەمیان لێ دەکەن لە موسڵمانان عەفو بەسەریاندا زاڵە ئەهلی سونە و جەماعە و بڕواداران (وَيَأْمُرُونَ بِبِرِّ الْوَالِدَيْنِ) ئەهلی سونە و جەماعە فەرمان دەکەن بە چاکە کردن لەگەڵ دایک و باوک (وَصِلَةِ الأَرْحَامِ) وە جێبەجێ کردنی سیلەی ڕەحم (وَحُسْنِ الْجِوَارِ) وە دراوسێ چاکێتی لەگەڵ دەر و دراوسێکان (وَالإِحْسانِ إِلَى الْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ) وە چاکە کردن لەگەڵ بێ باوکان و لەگەڵ فەقیر و هەژارەکان (وَابْنِ السَّبِيلِ) وە ئەوانەی کە لە ڕێگادا لە بازرگانی یان هەر ئیش و کارێکی تر دەچنە وڵاتێکی تر دەکەونە غەریبی و پارە و پول و شتیان لە دەست نامێنێ ئەوانە (ابن السبیل)ن (وَالرِّفْقِ بِالْمَمْلُوكِ) وە نەرم و نیان بن لە هەڵسوکەوتدا لە قسەدا لەگەڵ ئەوانەی لە ژێر دەستیانن لە جارییە و کۆیلەکان و یان ئەگەر ئەو سەرکردەیەکە ئەمیرێکە یان بڵێین ڕیش سپییەکە یان کار بە دەستێکی ماڵی خۆیەتی هی هەر شوێن و جێیەکی تر ئەوانەی لە ژێر دەستی ئەوانن لەگەڵیان نەرم و نیانن لە هەڵسوکەوت و قسە و گوتن پێغەمبەر وابوە (ﷺ) ئەهلی سونە و جەماعە وان، پاشان دەفەرموێ (وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْفَخْرِ، وَالْخُيَلاءِ) وە یەکتر قەدەغە دەکەن و خەڵکیش قەدەغە دەکەن لە فەخر و شانازی بەخۆوە کردن وە ڕۆح گەورایەتی و خۆ بە زل زانین و لاف و گەزافی لوت بەرزی لێدان (وَالْبَغْيِ) وە لە گوناح و تاوانەکانی سنور بەزێنی چ بە کردار و عەمەل چ بە دامێن چ بە زمان (وَالاسْتِطَالَةِ عَلَى الْخَلْقِ بِحَقٍّ أَوْ بِغَيْرِ حَقٍّ) یان زمان درێژی و دەست درێژی بەسەر خەڵکیەوە بە حەق یان بە ناحەق

(وَيَأْمُرُونَ بِمَعَالِي الأَخْلاَقِ) وە فەرمان بە یەکتر دەکەن بە ڕەوشتە بەرز و مەزنەکان (وَيَنْهَوْنَ عَنْ سَفْسَافِهَا) وە قەدەغەی یەکتر دەکەن لە ئەخلاق و ڕەوشتە نزمەکان و ئەوەی لە خەڵکی بەرز و بەڕێز ناوەشێتەوە.

## کۆتایی ئەم عەقیدەیە:

وَكُلُّ مَا يَقُولُونَهُ وَيَفْعَلُونَهُ مِنْ هَذَا وَغَيْرِهِ؛ فَإِنَّمَا هُمْ فِيهِ مُتَّبِعُونَ لِلْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، وَطَرِيقَتُهُمْ هِيَ دِينُ الإِسْلاَمِ الَّذِي بَعَثَ اللهُ بِهِ مُحَمَّدًا (ﷺ).

لَكِنْ لَمَّا «أَخْبَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنَّ أُمَّتَهُ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً؛ كُلُّهَا فِي النَّارِ؛ إِلاَّ وَاحِدَةً، وَهِيَ الْجَمَاعَةُ[١]». وَفِي حَدِيثٍ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: «هُمْ مَنْ كَانَ عَلَى مِثْلِ مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَومَ وَأَصْحَابِي[٢]»، صَارَ الْمُتَمَسِّكُونَ بِالإِسْلامِ الْمَحْضِ الْخَالِصِ عَنِ الشَّوْبِ هُمُ أَهْلُ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ.

وَفِيهِمُ الصِّدِّيقُونَ، وَالشُّهَدَاءِ، وَالصَّالِحُونَ، وَمِنْهُمُ أَعْلاَمُ الْهُدَى، وَمَصَابِيحُ الدُّجَى، أُولُو الْمَنَاقِبِ الْمَأْثُورَةِ، وَالْفَضَائِلِ الْمَذْكُورَةِ، وَفِيهِمُ الأَبْدَالُ، وَفِيهِمُ أَئِمَّةُ الدِّينِ، الَّذِينَ أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى هِدَايَتِهِمْ وَدِرَايَتِهِمْ، وَهُمُ الطَّائِفَةُ الْمَنْصُورَةُ الَّذِينَ قَالَ فِيهِمُ النَّبِيُّ (ﷺ): «لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ مَنْصُورَةً، لاَ يَضُرُّهُم مَّنْ خَالَفَهُمْ، وَلاَ مَنْ خَذَلَهُمْ؛ حَتَّى تَقُومَ

[١] أخرجه الترمذي برقم (٢٦٤١) في الإيمان، والحاكم في المستدرك (١ / ١٨) واللالكائي في شرح أصول اعتقاد أهل السنة (١ / ٩٩) . والاجري في الشريعة (٥ / ١٦). والمروزي في السنة ص ١٨. وابن وضاح في البدع والنهي عنها ص ١٥ من حديث عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما. قال الترمذي. حديث مفسر لا نعرفه مثل هذا إلا من هذا الوجه. وللحديث شواهد ترفعه لمرتبة الحسن. وحسنه الألباني انظر: السلسلة الصحيحة رقم (٢٠٣) ورقم (١٤٩٢). وظلال الجنة (٦٣). وصحيح الجامع (٥٣٤٣).

[٢] حديث افتراق الأمة أخرجه أبو داود برقم (٤٥٩٦) في السنة. والترمذي برقم (٢٦٤٠) في الإيمان. وابن ماجه برقم (٣٩٩١) في الفتن. وأحمد في المسند (٢ / ٣٣٢). عن أبي هريرة رضي الله عنه. قال الترمذي: حديث أبي هريرة حديث حسن صحيح. وهو في صحيح الجامع رقم (١٠٨٣). وقال أحمد شاكر في تحقيق المسند (٨٣٧٧): إسناده صحيح.

السَّاعَةُ[1]»، نَسْأَلُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنَا مِنْهُمْ وَأَنْ لاَ يُزِيغَ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَانَا، وَأَنْ يَهَبَ لَنَا مِن لَّدُنْهُ رَحْمَةً إِنَّهُ هُوَ الوَهَّابُ. وَاللهُ أَعْلَمُ.

وَصَلَّى اللهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ تَسْلِيمًا كَثِيرًا..

---

ئینجا لە ئاخیریەکەیدا ابن تیمیة دەفەرمویٚ (وَكُلُّ مَا يَقُولُونَهُ وَيَفْعَلُونَهُ مِنْ هَذَا وَغَيْرِهِ) ئەوەی ئەهلی سونە و جەماعە دەیڵێن و دەیکەن لەو قسانەی کە گوتمان و جگە لەوانەش (فَإِنَّمَا هُمْ فِيهِ مُتَّبِعُونَ لِلْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ) هەر لە خۆڕا ئەوەیان نەکردوە و ناکەن بەڵکو ئەوان شوێنکەوتەی قورئان و سونەن لەو ئیشەیان (وَطَرِيقَتُهُمْ هِيَ دِينُ الإِسْلاَمِ الَّذِي بَعَثَ اللهُ بِهِ مُحَمَّدًا (ﷺ)) ڕێباز و ڕێگاشیان ڕێباز و دینی ئیسلامە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەلای الله تعالی وە بۆی هاتوە و پێی ڕەوانە کراوە (لَكِنْ لَمَّا «أَخْبَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنَّ أُمَّتَهُ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً») بەڵام لەپاش ئەوەی کە پێغەمبەر هەواڵیدا (ﷺ) ئومەتەکەی دابەش دەبێ و پەرتەوازە دەبێ بەسەر حەفتا و سێ تاقم و کۆمەڵ «كُلُّهَا فِي النَّارِ» هەر حەفتا و سێ و هەموشیان تاقم و کۆمەڵەکان بۆناو ئاگرن (إِلاَّ وَاحِدَةً) تەنها یەکیان نەبێ «وَهِيَ الْجَمَاعَةُ[2]» ئەویش کۆمەڵە یان لە ڕیوایەتی تر فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) (وَفِي حَدِيثٍ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ) کە فەرموی «هُمْ مَنْ كَانَ عَلَى مِثْلِ مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَوْمَ وَأَصْحَابِي[3]» یان لەسەر ڕێباز

---

[1] ورد هذا الحديث بألفاظ متعددة عن جماعة من الصحابة منهم: سلمة بن نفيل الكندي، وثوبان، ومعاوية بن أبي سفيان ، وقرة بن إياس، وعمران بن حصين، وجابر ين عبد الله، وعقبة بن عامر، فهو حديث متواتر. وانظر ألفاظ هذا الحديث الجليل في جامع الأصول لابن الأثير أرقام: (١٠٤٨، ٦٧٧٦، ٦٧٧٧، ٦٧٧٨، ٦٧٧٩، ٧٤٩٦، ٧٨٣٢، ٧٩١٧، ٨٨٧٩) وقد اتفق البخاري ومسلم على بعض تلك الألفاظ وانفرد كل منهما ببعضها، وروى أصحاب السنن بعضها.

[2] أخرجه الترمذي برقم (٢٦٤١) في الإيمان، والحاكم في المستدرك (١ / ١٨) واللالكائي في شرح أصول اعتقاد أهل السنة (١ / ٩٩) . والاجري في الشريعة (٥ / ١٦). والمروزي في السنة ص ١٨. وابن وضاح في البدع والنهي عنها ص ١٥ من حديث عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما. قال الترمذي. حديث مفسر لا نعرفه مثل هذا إلا من هذا الوجه. وللحديث شواهد ترفعه لمرتبة الحسن. وحسنه الألباني انظر: السلسلة الصحيحة رقم (٢٠٣) ورقم (١٤٩٢). وظلال الجنة (٦٣). وصحيح الجامع (٥٣٤٣).

[3] حديث افتراق الأمة أخرجه أبو داود برقم (٤٥٩٦) في السنة . والترمذي برقم (٢٦٤٠) في الإيمان. وابن ماجه برقم (٣٩٩١) في الفتن. وأحمد في المسند (٢ / ٣٣٢). عن أبي هريرة رضي الله عنه. قال الترمذي: حديث أبي هريرة حديث حسن صحيح. وهو في صحيح الجامع رقم (١٠٨٣). وقال أحمد شاكر في تحقيق المسند (٨٣٧٧): إسناده صحيح.

و ڕێگای ئەوەی من لەسەریم ئەمڕۆ و سەحابەکانم لەسەرین ئەوان ڕزگاریان دەبێت لەو حەفتا و سێ فیرقەیە و ناچنە ناو ئاگری دۆزەخ (صَارَ الْمُتَمَسِّكُونَ بِالإِسْلامِ الْمَحْضِ الْخَالِصِ عَنِ الشَّوْبِ هُمُ أَهْلُ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ) ابن تيمية دەفەرموێ جا کەواتە ئەوانەی تەواو دەستیان بە ئیسلامێکی ڕوتی سەدا سەدی پاک و خاوێن بێ خڵت و غەش گرتوە ئەوانە ئەهلی سونە و جەماعەن کە ئەو ڕێبازەیان هەیە، ئەو ئەهلی سونە و جەماعانە سنفەکانیان چەندن؟ (وَفِيهِمُ الصِّدِّيقُونَ) ئەهلی تەصدیقیان تێدایە وەکو ئەبو بەکری صدیق سەدا سەد بڕوایان هەیە تەصدیقی هەموو ئەمر و فەرمانەکان دەکەن تەسلیمی تەواون بۆ کتاب و سونە (وَالشُّهَدَاءِ) ئەوانەی لەپێناو الله گیان بەخت دەکەن و شەهید دەبن (وَالصَّالِحُونَ) چاکەکارانیان هەیە (وَمِنْهُمُ أَعْلامُ الْهُدَى) هەیانە کە نیشانەی ڕێنوێنین لە دورەوە یەعنی وەکو بڵێی سونبولی ڕێنوێنین (وَمَصَابِيحُ الدُّجَى) وە هەیانە بەڕاستی ڕوناک کەرەوەن بۆ ئەوانەی کە بە شوێنیان دەکەون (أُولو الْمَنَاقِبِ الْمَأْثُورَةِ) خاوەنی چەندین پێدا هەڵگوتە و ڕێز و ئیحتیرامی لێگێڕدراوەن و بە ئەثەر بۆیان جێگیربوە (وَالْفَضَائِلِ الْمَذْكُورَةِ) چەندین پلە و پایە کە بۆیان باسکراوە (وَفِيهِمُ الأَبْدَالُ) هەیانە ئەبدالن بە مەعنای زۆر لە الله ترس و لێی نزیکن وەلیەکانن (وَفِيهِمُ أَئِمَّةُ الدِّينِ) هەیانە پێشەوای ئاینن واتە زانان (الَّذِينَ أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى هِدَايَتِهِمْ وَدِرَايَتِهِمْ) ئەو پێشەوا و زانایانەن کە موسڵمانان یەک دەنگن لەسەر ڕێنوێنی و هیدایەتیان وە لەسەر ئەو عیلم و زانستی و ڕێباز و ڕێگایەی کە گرتویانەتەبەر (وَهُمُ الطَّائِفَةُ الْمَنْصُورَةُ) ئا ئەوانەن تاقم و کۆمەڵی سەرخراو (الَّذِينَ قَالَ فِيهِمُ النَّبِيُّ (ﷺ)) کەواتە ئەهلی سونە و جەماعە تائیفەی مەنصورەن وە ئەو چین و توێژانەی کە دەڵێ باسم کرد ابن تيمية ئەهلی سونە و جەماعە پێک دەهێنن ئەوانە تائیفە و کۆمەڵی سەرخراون کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەیان فەرمویەتی «لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ مَنْصُورَةً» بەردەوام کۆمەڵ و تاقمێک لە ئومەتی من لەسەر حەق و ڕەوای سەرخراون «لاَ يَضُرُّهُم مَّنْ خَالَفَهُمْ» زەرەر و زیانیان پێ ناگەیەنێ هەر کەسان و خەڵکانێک

پێچەوانەیان بکەن «وَلاَ مَنْ خَذَلَهُمْ» هەر کەسانێک بیەوێ سەر شۆڕییان پێ بکا و بە کەمیان بزانێ کار ناکاتە سەر ئەوان «حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ[١]» هەتا قیامەت دادێ واتە هەتا نزیکی قیامەت دادێت، کە ئەو فەرمودەش بە دەیەها ڕیوایەت هاتوە وە لە سەحیحی بوخاری و موسلیمیش ئەسڵەکەی جێی دەبێتەوە وە لە پاشان خاوەنی پەرتوکەکانی سونەنیش ئیمامی ترمزی و ابن ماجە و هەر یەک بە لەفز و ڕیوایەتێک گێڕایتیەوە.

جا لە کۆتاییەکەی ابن تیمیة دۆعا دەکا و دەپاڕێتەوە دەفەرموێ (نَسْأَلُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنَا مِنْهُمْ) (ئێمەش دەڵێین ئامین) دەڵێ لە الله دەپاڕێینەوە الله تعالی ئێمە لەوان بکا لەو ئەهلی سونە و جەماعە و لەو سنفانە (وَأَنْ لاَ يُزِيغَ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَانَا) خوای رب العالمین دڵمان ڕەش نەکا زەیغی تێنەخا گومڕا نەکا لەدوای ئەوەی هیدایەت و ڕێنوێنی کردین (وَأَنْ يَهَبَ لَنَا مِن لَّدُنْهُ رَحْمَةً إِنَّهُ هُوَ الوَهَّابُ) وە لە خۆیەوە الله تعالی پێمان ببەخشێ ڕەحم و بەزەیی چونکە ئەو بەڕاستی بەخشەرە الله تعالی -جل شئنه- (وَاللهُ أَعْلَمُ) جا دەفەرموێ اللەش چاکتر دەزانێ لەو قسانەی کە کردومە.

دەش فەرموی (وَصَلَّى اللهُ عَلَى مُحَمَّدٍ) واتە داوا دەکەین لە الله الله ڕێز و سوپاس و پێداهەڵگوتنی پێغەمبەر بکا (ﷺ) لەنێو فریشتەکاندا ئەوە سەڵاواتی خواییە بۆسەر هەر کەسێک (وَآلِهِ) لەسەر ئالی پێغەمبەریش (ﷺ) ئال بە مەعنای (أهل البيت)یش دێ خزم و کەس و نزیکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەوانەی کە باسمان کرد لە ڕابردودا بە مەعنای ئەتباع و شوێنکەوتوانیشی دێ هەتا قیامەت (وَصَحْبِهِ) هاوەڵە بەڕێز و سەحابەکانیشی (وَسَلَّمَ تَسْلِيمًا كَثِيرًا) وە سەلامەتیشیان پێ ببەخشێ لە ئافەت و ناخۆشی و گیروگرفتەکانی دونیا

[١] ورد هذا الحديث بألفاظ متعددة عن جماعة من الصحابة منهم: سلمة بن نفيل الكندي، وثوبان، ومعاوية بن أبي سفيان ، وقرة بن إياس، وعمران بن حصين، وجابر ين عبد الله، وعقبة بن عامر، فهو حديث متواتر. وانظر ألفاظ هذا الحديث الجليل في جامع الأصول لابن الأثير أرقام: (١٠٤٨، ٦٧٧٦، ٦٧٧٧، ٦٧٧٨، ٦٧٧٩، ٧٤٩٦، ٧٨٣٢، ٧٩١٧، ٨٨٧٩) وقد اتفق البخاري ومسلم على بعض تلك الألفاظ وانفرد كل منهما ببعضها، وروى أصحاب السنن بعضها.

وە لە ئاگری دۆزەخیش سەلامەتیان پێ ببەخشێ سەلامەتیەکی زۆر بیانباتە بەهەشت لەگەڵ ئێمەش.

لێرەدا هاتینە کۆتایی (الواسطية)ی ابن تيمية شەرح و ڕاڤەکەی کۆتایی پێهات، هەرچەندە لەو ئاخیر و کۆتاییانە بۆ ئەوەی ویستمان وێڕا بگەین و لەو شەوەی کۆتایی ڕەمەزاندا کە بەیانی جەژنی ڕەمەزانە بە پشتیوانی الله هەموی تەواو ببێ ئەگەرنا هەندێک لە بڕگەکانی ئەو ئەخیر و کۆتاییە دەشمان توانی تۆزێکی لەسەر بڕۆین و زیاتریشی بەخۆیەوە هەڵدەگرت، لە دەرفەت و کاتێکی تر یان بە پشتیوانی الله ئەگەر الله تعالى دەرفەتی داین دامانناوە لە ماوەیەکی نزیکدا لەدوای ئەوەی خوێندنی ماستەر نامەکەمان تەواو ببێ و وە ئەو ڕیسالەی ماجستەر تەواو ببێ بەسەر ئەو کیتاب و تەئلیف و دانراونەی خۆماندا بچینەوە یەک لەوانە (الواسطية)یە وە ئەو شەرح و ڕاڤانەش کە تەسجیلسش کراوە ئەو کات لەوێوە بە نوسین بە درێژتر ڕونکردنەوەی لەسەر بدەین.

جا ئەوەی ڕاست و دروست بوو لە هەموو دەرس و وانەکان لە الله تعالى بوە ئەوەی هەڵە و کەم و کورتی بوە لە ئیبلیسی نگریس و وە لە منی بەندەی الله بوە کە پڕین لە تاوان و گوناح داوای دۆعای خەیر دەکەین هەر کەسێک ئەو دەنگەی ئێمەی بیست ئەو ڕەنگەی ئێمەی بینی سودێکی لێ وەرگرت لە دۆعای خەیر بێ بەشمان نەکا دۆعای ئەوەمان بۆ بکا بەردەوام بین لەسەر عەقیدە و بیروبڕوایەک کە الله پێی ڕازییە کە پێغەمبەر (ﷺ) هەیبوە سەحابە بەڕێزەکان هەیان بوە پێشینانی چاک هەیان بوە لەسەر ئەو بیروبڕوایە بژین و بمرین و وە زیندو بکرێینەوە ئامین.

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**